# ئەزموونەکانی
# نزیکبوونەوە لە مردن

ئامادە و کۆکردنەوەی: فاتیح شێخ محەمەد سەمیع

نۆرەی چاپ: یەکەم ٢٠٢٣

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان،

ژمارەسپاردنی (١٨١٦)ی ساڵی (٢٠٢٢)ی پێ دراوە





# پێشەکی

## بسم الله الرحمن الرحیم



الحمد لله رب العالمین والصلاة والسلام علی سیدنا موحەمەد صلی الله علیە و سلم، وعلی آله وصحبه أجمعین.

پێنج ساڵە عەوداڵی گەڕانم بەدوای ئەزموونداره‌کانی 'نزیکبوونەوە لە مردن'، بەردەوام کتێب و بەرهەمی نوێ و ڤیدیۆ و شیکاریم بینیوە و خوێندووەتەوە لەسەر ئەزمووندااران.

لەم پێشەکیەدا نامەوێت لەسەر شیکاری ئەزموونەکان و، بەڵگە زانستیەکان و بەرپەرچدانەوە و، بەڵگەی مولحید و لادینیەکان لەسەر ماددیبوونی ئەم دیاردە و وەڵامدانەوەیان لەم پێشەکیەکدا باس بکەم، چونکە لە تەواوی کتێبەکەدا بەڵگە زۆر بەهێزەکانم بە دوور و درێژی هێناوە لەسەر ئەوەی کە ئەم دیاردەیە بە تەواوی دیاردەیەکی ڕۆحیە و، ناکرێت بەناوی زانست و ماددیگەریەوە پێچلێدانی بێبنەما دروست بکەین و چەواشەی خەڵکی پێ بکەین، ئەو زانا و پسپۆڕ و ئەکادیمی و پزیشکە دەروونی و هەروەها پزیشکەکانی بەنج زۆرێکیان بەڵگەی زۆر جوان و پاڵپشت بە ژێری دێنن کە ئەم دیاردەیە هێشتا زانست لە بەردەمیدا دەستەوسانە و، دیاردەکە ڕەتدانەوە هەڵناگرێت، تەنها شیکاری پشتی ماددە و فیزک دەتوانێ وەڵامی ئەم دیاردە ڕۆحیە بێت.

زۆرینەی ئەهلی مەزهەبی شافعی و مالکی کە هەموویان ئەشعەرین و نزیکەی (٧٠٪) ئەهلی سونە و جەماعە پێک دەهێنن، مەزهەبی ئەشعەری لە ئوصولدا و شافعی لە ئەهلی فروعدا ڕایان وایە کە ئەهلی فەترە 'ئەوانەی کە ئیسلامەتیان پێ نەگەیشتوە' ئەگەر موسوڵمان نەبووبن لێیان ناگیرێت و لە قیامەت دەرباز دەبن.

چـونکه خـوای گەورەش دەفەرموێـت ﴿... وَمَـا كُنَّـا مُعَـذِّبِينَ حَتَّـىٰ نَبْعَـثَ رَسُـولاً﴾ (الإسراء: ١٥)

خوای گەورە دەفەرموێت: سـزای هـیچ کەس نادرێـت هەتـا پێغەمـبەران نەنێرێـت ﴿رُّسُلاً مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلاَّ يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى اللّهِ حُجَّةٌ بَعْدَ الرُّسُـلِ وَكَـانَ اللّهُ عَزِيـزاً حَكِيماً﴾ (النساء: ١٦٥) هەتا نەڵێن دین و ئیمان و پێغەمبەرانمان پێ نەگەیشت.

چەندین ئایەتی تریش کە باسی نەگەیشتنی دین و ئیمان دەکات بە ئەهلی فەترە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ذَٰلِكَ أَن لَّـمْ يَكُـن رَّبُّـكَ مُهْلِـكَ الْقُـرَىٰ بِظُلْـمٍ وَأَهْلُهَـا غَافِلُونَ﴾ (الأنعام : ١٣١)

ناردنی ئەو پێغەمبەرانە لەبەر ئەوەیە چاک بزانن هەرگیز پەروەدگـارت هـیچ شـار و گوندێکی بەناحەق قڕ نەکردوە و دانیشتوانیشی غافڵ و بێ ئاگـا و بـێ تـاوان بـووبن، واتە هەتا ئێمە پەیامبەر نەنێرین و ئەوانیش لێی لانەدەن، قاریان لێ ناگرین.

ئەم ئایەتانە نەفی ئەو تۆمەتانە دەکات کە دەڵێن خوا خەڵکی بە گشتی لەنـاو دەبـات و دەیانخاتە دۆزەخ، بێگومان خوا بە ڕەحمە بەرامبەر بەندەکانی.

ئیمامـی سـیوطی بە دور و درێـژی بەڵگەکـان لەسـەر ڕزگـاربونی ئەهلـی فەتـرە دەهێنێت.

ئەوەی مەبەستی بەنـدەیە بینینـی بەهەشـت و فریشـتەکان و خۆشـیەکانی بەرزەخە لەلایەن ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی جیاوازی مەسیحی و جولەکە و ڕۆژئاواییەکـان، کە ئەمەش لێکدانەوەی زۆر هەڵدەگرێت بۆیە لێرەدا چەند خاڵێکی کورت دەخەینەڕو.

**یەکەم:** خـوای گەورە 'أرحـم الـراحمین' ە، هەتـا سـەراپای ئـیمان و ئیسـلامەتی نەگەیشـتبێت بە خەڵکێکـی دوورە دەسـت لە ئیسـلام، حوکمیـان جیـاوازە لەوانەی کە موسوڵمانن و هەڵدەگەڕێتەوە 'مرتد' لە ئیسلام و دەبـنە کـافر و مولحیـد و بـێ دیـن و دووڕوو، هەروەهـا بـێ بـاوەڕی دژ بە ئیسـلام لەم سـەردەمەدا پێناسـەی ئیسـلام و

تێگەشتنی تەواوەتی لە ئیمان و ئیسلامەتی لە بیروڕا گەیاندنی دوژمنانی ئیسلام و حاقد و دڵ ڕەشەکانەوە، پێناسە و ناساندنێکی زۆر خراپە و، ئیسلام وەک ئاینی دژ بە مرۆڤایەتی و موسوڵمانان وەک تیرۆرست پێناسە دەکەن، ئەمەش لە پێناوی گەیشتن بە ئامانجەکانیان.

لە جیهانی ئەمڕۆدا هەڵمەتێکی دڕندانەی نامرۆڤانە هەیە بۆ سەر موسوڵمانان، لە وڵاتانی ئیسلامیش لە ڕێگەی بەکرێ گیراو و ڕێکخراوی گوماناوی و داڵدە دراو جۆرەها فیکری دژ بە ئیسلام و موسوڵمانان بڵاو دەکرێتەوە، بەدڕەوشتی هاوڕەگەز خوازی 'لواطە' و نێربازی و کارە قێزەونەکانی تر ڕەواجی پێ دەدرێت و لە هزر و یادگەی خەڵکیدا بە ئاسایی دەکرێت، پەروەردەی ئیسلامی لە ناخی گەنج و مناڵ و ژناندا لاواز دەکرێت، وڵات پڕ دەکرێت لە گەندەڵی و بە تاڵان بردنی سامانی موسوڵمانان و دورست کردنی جەنگ و شەڕی ناوخۆ و قەرزارکردنی وڵاتان لە پێناو سەرگرتنی پیلانەکانیان...

لە بارێکی ئاوادا تەنانەت بانگەوازی ئیسلام بە سەلامەتی ناگاتە موسوڵمانان و میلەتە موسوڵمانەکانیش، چ جای ئەوەی بگاتە وڵاتانی ڕۆژئاوادا.

لەبەرئەوە زەمینەی تێگەیشتنێکی باش و جوان لە ئیسلام لە تەواوی جیهاندا لاوازە و، جیاوازی ناو موسوڵمانان و هاتنە کایەی چەندین ڕەوت و بزاوتن وەك سەلەفیەت و بزوتنەوەی جیهادی، کە کۆمەڵگای موسوڵمانانی پێ پەرت دەکەن واقعێکی خراپی خولقاندوە بۆ ئەوەی موسوڵمانان زیاتر پەرت و بڵاوبکرێن و، بەربینە گیانی یەکتر و فیکر و مومارەسەی توندی لەسەر بنیات بنێن و فیتنە و کوشتاری گەلانی موسوڵمان بە حەڵاڵ بزانرێت، کە دیارە ئەمە ناوەڕۆکی پیلانی دوژمنانی ئیسلامەو بە موسوڵمانیش جێ بەجێ دەکرێت!

ئەمە ئەو خاڵە جەوهەریەیە کە دەبێت لەسەری ڕابوەستین و بزانین کە کەسێکی ناموسوڵمان، ئەگەر بیەوێت ببێتە موسوڵمان کێشەی زۆری بۆ پێش دێت!!



خـوای گەورە ئاگـاداری ئـاینەکەیەتی و ئیسـلام دەپارێزێـت، بەڵام بە میهرەبانیشـە بەرامبەر ئەوانەی کە ڕێگری و لەمپەرەکان ناهێڵن وەک'رحمة للعالمین' بناسرێت.

**دووەم:** ئەوانەی موسـوڵمان نـین و ئەم دیـاردەیە دەبیـنن و بەهەشـت و ڕازاوەیـی بەهەشت و خۆشیەکانی دەبینن، مەرج نیە لەدوای مردنی تەواوەتـی بەو جـۆرە ببیـنن، چونکە ئەمەی کە دەیبینین مردنی تەواوەتی نیە، بەڵکو نزیکبوونەوەیە لە مردن.

**سێهەم:** زۆرینەی ئەوانەی کە ئەزموونەکە دەبیـنن، نمایشـی کردەوەکانیـان دەبیـنن، بەڵام لێپرسـینەوە لە کردەوەکانیـان نـابینن، واتە ورد و درشـتی کردەوەکانیـان پیشـان دەدرێـتەوە، چـونکە بە تەواوی دەسـتیان لە دونیـا نەبـۆتەوە و، کۆتـایی بە ئاینـدە و کردەوەکانیان نەهاتوە.

**چـوارەم:** لە ئەزموونداراەکانـدا نمـوونە هەیە کە دۆزەخ و بەهەشـتیش دەبیـنن و پیشانیان دەدرێت، کەواتە ئەزموونەکـانی نزیـك بـونەوە لە مـردن گەشـتێکی بـۆ پەنـد وەرگرتنـی خۆیـان و خەڵکـی دونیـاش، نەوەک ئەوەی بوبـونە بەهەشـتی یـاخود دۆزەخی.

یەکێکی تـر لەو خـاڵانەی کە ناکرێـت بەسـەریدا تێپەڕین، ئەوەیە کە ئەم دیـاردەیە چۆن جیادەکرێتەوە لە خەو، وڕێنە، کەمی ئۆکسجین ... هتد.

یەکەم: وڕێـنە بەدوایەکـدا هـاتنی تیـانیە و هەڵیـت و پەڵیـتە، دیـارە زۆرێـک لەوانە لەدوای نەشـتەرگەری ئەم وڕێنەیـان هەیە، خەو بینـین ئەوەنـدە ورد و بەدوای یەکـدا هاتوو نیە، دووەم: خەو بیر دەچێـتەوە، بەڵام ئەزموونەکـان لەدوای دەیـان سـاڵ وەکـو خۆی دەیگێڕنەوە، سێیەم: کەمی ئۆکسجین دیـاردەیەکی لاوەکـی دروسـت دەکـات و نابێتە ئەزموونەکان.

کەواتە هیچ پاساوێکی مادی کە بێباوەڕان دەیهۆننەوە جـێگەی ئەرزش نـیە بـۆ کەم کردنەوەی بەهای 'ئەزموونەکانی نزیکبوونەوە لە مردن'.

لە تەواوی بەسـەرهاتەکانی نـاو ئەم پەڕتـوکەدا بە وردی وەڵامـی پرسـیارەکانت دەربارەی ئەم ئەزموونە دەست دەکەوێت، لەبەرئەوە پێم باش نیە خـوێنەر بە پێشـەکیەوە ماندوو بکەین و خۆتان یەک بە یەکی چیرۆک و بەسەرهاتە واقعیەکانی کورد و فـارس و عەرەب و ئینگلیز و ئەمریکی و ڕووسی ، موسوڵمان و گاور و بێباوەڕەکان ببیـنن و، کاریگەری ئەم بەسەرهاتانە لەوان و لە خۆشتاندا ببینن.

لێتان ناشارمەوە، من لە منالّیمەوە لەنێو بنەمـاڵە و خێزانێکـی دینـداردا گەورە بـووم بەڵام بۆ تێگەیشتنێکی باشتر لە بەرزەخ و قیامەت، زۆرترین سـوودم لەم پێـنج سـاڵەی خۆم بینی کە بەدواداچون بۆم لە مەڕ باسی نزیك بـونەوە لە مـردن و چێـژی زۆر زۆر گەورەم لێ بینی وە، کـاریگەری زۆری لەسـەر بەجـێ هـێلاوم، ترسـم لە مـردن هەتـا ئاسـتی نەمـانی تـرس کەم بـۆتەوە، تـێ دەگەم لەوەی کە مـردن جـێ گـۆڕکێیە گواستنەوەیە، مردن نیە، سەرکەوتنە بـۆ سـەرەوە نەک بـۆ نـاو گـۆڕ، زۆر دڵخۆشـم بە ژیانی دونیا چونکە بە کێڵگەی قیامەتی دەبینم، دەزانم ئەرکێکم لە دویادا هەیە دەبێـت جێ بەجێی بکەم و، هەمیشە بیرم لە لای پاشەڕۆژ و قیامەتە...

ئەمـانە و سـەدان گۆڕانکـاری گەورە دەسـت ئەزموونـداران دەکەوێـت و، دەسـتی ئەوانەش دەکەوێت کە خەریکی لێکۆڵینەوەن لە 'ئەزموونەکانی نزیکبوونەوە لە مردن'.

کاتێـك ئەم پەڕتـوکە دەخـوێنیتەوە، زۆر بە وردی بیخـوێنەرەوە، چـونکە لە کۆتاییەکەیدا تێڕوانین و بیرکردنەوە و تێگەیشتن زۆر دەگۆڕێت.

ختـوکەی هـزر و بیرکـردنەوە و سـۆز و سـۆزداریت دەکـات و دڵنیـات دەکەمەوە هەرگیز وەک پێشتر نابیت فێری خۆشەویستی خوا و قیامەت دەبیت!

دەتناسێنێت بە خۆشەویستی و سۆز و بەزەیی خودا و، دەست بەرداری نابیت!

ئەوەندەی من بەردەستم کەوتبێت ئەم ئەزموونانە لە مێژووی پەڕتـوکە ئیسـلامیەکاندا کەمتر بایەخی پێ دراوە، بەڵام ئێستا و لەم ڕۆژگارەدا خەریکە گرنگی زیـاتر بە خـۆوە دەبینێت.

ئیمام باقر لە سەرەتای سەدەکانی هاتنی ئیسلامدا باسی ئەم ئەزموونانە دەکات و دەفەرموێت: کاتێك کە دەخەویت، نەفست سەردەکەوێت بۆ ئاسمان و ڕۆحت لە جەستەکەتدا دەمێنێتەوە.

ئەوەی کە پەیوەندی دەهێڵێتەوە لە نێوان ڕۆح و نەفسی ئەم مرۆڤەدا، هۆکارێکە، وەڕایەڵێکی سپی نورانیە کە بەیەکەوەیان دەبەستێت و لێی جیانابێتەوە، هەر کاتێک ئەم مرۆڤە بمرێت ئەو ڕایەڵە دەپچڕێت و نامێنێت و، ڕۆح و نەفسی دەگەڕێنەوە بۆلای خاوەنەکەیان و ئیتر جەستەت هیچ ئەرزشێکی ئەوتۆی نامێنێت، بەڵام ئەگەر ئەو ڕایەڵە نەپچڕێت ئەوە دەگەڕێتەوە و نامرێت.

چەند جوان و گرنگ دەبێت لەگەڵ تەڵقینی مردوەکاندا چەند نموونەیەکی ئەم ئەزموونانە بۆ خەڵکی باس بکرێت لە کاتێکدا ڕۆحی مردوەکە ئاگادارە و خۆی لەناو ئەو حاڵەتەدا دەژی.

ئەم ئەزموونانە پێمان دەڵێن: ڕۆح هەمیشەییە و مردنی بەسەردا نایەت، ئێمە لە بنچینەدا ڕۆحین، ڕۆحمان خۆبەستەی مێشکمان نیە، ئێمە زۆر لەوە زیاترین کە تەنها جەستەیەکی مادی و فیزیکی بین بۆیە ڕۆحمان لەژێر خۆڵەمێشی جەستەماندا بڵێسەدارە!

پەیوەندیمان لەگەڵ گەردوون و، دەرەوەی گەردوون زیاتر و دەوڵەمەندتر و فراوانترە لەوەی کە دەیزانین، هەر ئەمەشە هۆکاری مانەوەمان لە سەر زەوی.

یەکەم بەسەرهاتی کتێبەکەم، پەیوەندییەکی ئەوتۆی بە'نزیکبوونەوە لە مردن'ەوە نییە، بەڵام دەمەوێت ڕاهێنانێک ساز بکەم هەتا پەنجەمان لەگەڵ جیهانی ڕۆح و داستانە بێ شومارەکانیدا نەرم بکەین، دەمەوێت تروسکاییەك ڕام بکەم وەك جیهانی نورانی و خواناسی عارفانە.. دەرگای ئەم ئەزموونانە بە ڕووتاندا زۆر بەزوویی دەکاتەوە و، ملیۆنان خواناسی ڕاستەقینە و موریدی حەق سکاڵا لە حاڵەتی جەزبە و فەنابون و موشاهەدە و سەیر و سلوکدا زۆر بە ئاسانی ڕێگەی ئەم ئەزموونانەیان

پێـدراوە و، وەک زۆریـنەی خەڵکـی نـین نەبیسـتراوێك ببیسـتن. دەمەوێـت بەم بەسەرهاتەی دونیای جوانی پڕ لە صـەفای تەصـەوف پێتـان بڵـێم: ئیـتر کـاتی ئەوەیە موسوڵمانان لە خەوی غەفڵەت و تەفرەقە و تەکفیر و تەبـدیع و ئیسـتعلایی و تەکەبـور و ئەنانیەت بێنە دەرەوە و، ڕوو لە حەقیقەت و جەوهەری مـوحیبەت و صـەفای ڕۆح و دونیا نەویستی بکەن.

با بەس بێت بە وەهمی عەقڵانی بوون و مەنطق، چەکوشکاری مەردانـی خـودا و مێژووی ئیسلام بکەین و شکستی ئێستامان بشارینەوە، هیچ لە بارا نەبـوونی ڕەوتە زۆر و زەبەندەکانی ئەمڕۆمان نەسەپێنین بەسەر ڕاساڵەکانی ئومەتی ئیسـلامیدا و، خۆمـانی لێ بێ بەری بکەین و وابزانین بەم خۆ مەزڵوم کردنە دەبینە پاڵەوانی مێژوو!!

**فاتح شێخ محەمەد سەمیع**

**٢٠٢٢/٨/١٤**



# سەرە خامەیەك لە چڵە پۆپەی جیهانی هەمیشەییەوە!



هەنـدێک لە وتە و ئەزمـوونە جیاوازەکـانی خەڵکـی دونیاتـان لەم سـەرەتایەوە پێشکەش دەکەین، هەتا شەوق و جۆشی ئەزمـوونە واقیعیەکـان لەم کەنـارەوە بتانـداتە دەست دەریا بێ سنورەکەی بەرزەخ و ئەزموونداره ناوازەکان.

لەوێ پێت دەوترێت: لێرە بۆ هەتا هەتایە هەڵە ناکەیت و هەڵەش نابینیت.

* پیاوێک لەو جیهانە هات و 'بەرزەخ' یـارمەتی پێشـکەش دەکـردم و پێـی دەوتـم: کاتێك دەگەڕێیتەوە بۆ دونیا، کاری گرنگـی ژیانـت ئەوەیە یـارمەتی خەڵکـی بـدەیت، لێبـوردە بیـت، ئـازادی کەس زەوت نەکەیـت، نەبیـتە زینـدان بـۆ هـیچ کەسـێک، دەسبەرداری لە هەموو شەڕ و خراپەیەک بیت، هەتا ژیانێکی پـڕ لە هێمنـی و ئاشـتیانە بەسەر بەریت، سەرکەوتنت لەم تاقی کردنەوانەدا لە بەرزەخ و قیامەت بـراوە دەبیـت و ڕزگارت دەبێت.

* سەردەکەوتم بۆ ئاسمان، بۆ سەرەوە، شوێنەکان زۆر زۆر خۆش و دڵـڕفێن بـوون، بانگکەرێک بانگی لێ کردم بوەستە!

منیش وەستام!

وام دەزانـی کە لەبەردەم ئەو دەنـگە هەیبەتـدارەدا مـن و گەردوون گەردیلەیەکـی بچووکین و هیچی تر!

* ئەو شوێنەی کە نیشتمانی ڕاستەقینەی منە، ئەوەنـدە دوورە کە هەرگیـز لە دونیـادا خەیاڵی دوریەکەشی ناکرێت!

* له کەشێکی زۆر خۆشدا بووم، نە گەرم بوو نە سارد، هەروەها هەستی ئازاری سەرما و گەرماش نەبوو!

* گوێم لە هاوار و بانگ کردن بوو لەناو تاریکیەکەدا، دەنگی دەدایەوە.

* ئەگەر دروست بێت دەڵێم: بەردێک بە قەدەر گەورەیی زەریا و دەریا گەورەکان بێت و بە قودرەتی حەق تەعالا فڕێ بدرێتە دەریا و زەریا گەورەکانەوە، چ کارەساتێک لەسەر زەوی دەخوڵقێنێت، یەک بە یەکی ئێمەی مرۆڤ ئەو بەردە گەورەیەین و، بە خێر و شەڕ شەپۆلی کاریگەری بۆ دەوروبەر و مرۆڤایەتی دروست دەکەین.

* لەوێدا زانیم ئەوەی لەوێ 'خوا نەناس' بێت، چەندە دور دەکەوێتەوە و، دەبێتە ون بووەکان و، بەختەوەری لە دەست دەدات.

* ئیمام ئەبوبەکری شبلی لەدوای کۆچی دوایی و مردنی لە خەودا دەبینرێت، پرسیاری لێ دەکرێت کە: ئەی ئیمام! خوای گەورە چۆن مامەڵەیەکی لەگەڵ کردیت؟!

ئیمام ئەبوبەکری شبلی فەرمووی: ڕەحمی پێ کردم و پاشان لێم خۆش بوو، لە پاشان ڕایگرتم و فەرمووی: ئەی ئەبوبەکر! ئایا دەزانیت بەهۆی چی یەوە ڕەحمم پێ کردیت و لێت خۆش بووم؟!

وتم: یاربي بەهۆی کردەوە چاکەکانمەوە!!

فەرمووی: نەخێر.

وتم: بەهۆی ئیخلاص و دڵسۆزیمەوە لە بەندایەتیدا.

فەرمووی: نەخێر.

وتم: بەهۆی ڕۆژوو و نوێژ و حەج کردنم!

فەرمووی: نەخێر.

وتم: بەهۆی گەڕان و کۆچ کردنم بەدوای پیاو چاکاندا.



فەرمووی: نەخێر.

وتم: بەهۆی سەفەری زۆرمەوە بەدوای زانست و زانیاریدا.

فەرمووی: نەخێر.

وتم: یاربي یاربي ئەمانە هۆکاری ڕزگار بوونن لە قیامەت، من ئومێدم پێیان هەبوو ڕزگارم بکەن.

خوای گەورە فەرمووی: ئەی ئەبوبەکر!

ئەو شەوەت لەبیرە کە لە یەکێک لە کۆڵانەکانی شاری بەغداد بوویت، پشیلەیەکت بینی سەرما هێزی لەبەر بڕیبوو، لە دیوارێکەوە دەچووە سەر دیوارێکی تر، هەتا لە سەرما و بەفر قوتاری ببێت، تۆ بەزەییت پیایا هاتەوە و هەڵتگرت و بردتەوە بۆ ماڵەوە و خستە ناو فەروەیەکی گەرمەوە هەتا بیپارێزیت لە سەرما و تیاچوونی ئەو شەو ساردە، هەر بەوەندەی تۆ بەزەییت جوڵا و خزمەتی ئەو پشیلەیەت کرد، منیش ڕەحمم بەتۆ کرد و لێت خۆش بووم.

* ئەوە بهێنە بە ئەندێشەتدا کە بیر لە هەرچی بکەیتەوە و ئەزموونی بکەیت و بێتە بەردەستت، چەندە جوان و بێ وێنە دەبێت.

* بەلاتانەوە سەیر نەبێت هەموو چارەسەرێک، هەموو ئازارێک، هەموو گرفتێک، لەوێوە چارەسەر دەکرێت، پزیشکەکان تەنها پەردەیەکن بۆ دەستی قودرەتی پەروەردگار و هیچی تر نین.

گەڕاندنەوەی ئۆتۆمبێلەکەت بۆ سەر شەقامە گشتیەکە ئەو کاتەی سوکان لە دەستدا نامێنێت، ئەوە تۆ نیت کە دەیهێنیتەوە، بەڵکو خودی ئەو کارە لە سەرەوە ئەنجام دەدرێت.

* فریشتەکان پێیان وتم: گۆڕانی ڕاستەقینە لە یەک کەسەوە دەست پێ دەکات، با ئەو کەسە تۆ بیت.

به خۆشەویستی ڕاستەقینە دەتوانیـت دونیـای بەرژەوەنـدی و سیاسـەت و فـرت و فێڵی پاوان خوازان بگۆڕیت.

* فریشـتەکان! ئەوەی لە دڵ و دەروونیشـمدا بـوو، پێیـان زانـی بـوو، هیچـی ون نەبوویـــوو، دەیـــانزانی ئەوەی لە دەرەوە دەریـــدەبڕم لە درۆ و سیاســـەت بـــازي و چەواشەکاری و ڕووپامایی، ڕووە ڕاستەقینەکەی من نەبوو!

* لەویٚ پلە و پایە و بڕوانامەی دونیایی، هیچ ئەرزشێکی نیە، چـی پـلە و پـایەیەکی سیاسی و کۆمەڵایەتیت هەبووە گرنگیەکی نیە، ئەوەی کە چۆن بوویت، ئەوە جـێگەی سەرنج و لێپرسینەوەیە.

* ئەی هاوار!

ئەمە ئەو ڕۆژە بوو کە من باوەڕم پێی نەبوو، بانگەشەی ئیلحاد و بـیٚ دینـیم دەکـرد، زینـدووبوونەوەم بە ئەفسـانە دادەنـا، خـۆم بینـی یەوە لەو جیهـانەی کە بـاوەڕم پێـی نەبوو... بانگم لیٚ دەکەن'هوراد'... هوارد... وەرە پێشەوە، ئێمە لێرەین هەتا بە تایبەتی گرنگی بەتۆ بدەین، بۆ بردنی تۆ هاتوین...

* کە دەچیتە خزمەتی پەروەردگار، وشە و ڕستەیەکت نیە بۆ وتن، وشـەی نـویٚ فێـر دەبیت، وشە و ڕستە بەسەرچووەکانی دونیا بە کەڵکی ئەویٚ نایەن.

* ژنەکەی 'دیڤید' دەڵێت: دیڤیـد دەسـتی دایە چەکەکەی و خـۆی کوشـت، دیڤیـد دەڵێت: لە ئیسعافەکەدا بـووم، دیمەنێکـی ترسـناکی دۆزەخیـان پیشـان دام، ملیۆنەهـا مرۆڤم بینی هاواریان دەکرد و داوای کۆمەکیان دەکرد...

دیڤیـد کە گەڕایەوە بە خەڵکـی دەڵێـت: قەنـاعەتم وایە ئەوە مـادە هۆشـبەرەکانن، شەیتانەکان بانگهێشتی جیهانەکەمـان دەکەن، مـن ئەگەر ئەو ئەزمـوونەم نەبینیـایە ئەوە دەگەڕامەوە سەر بەکارهێنانی مادە هۆشبەرەکان!!

* کات و زەمەن لەوێ نیە، ڕابردو ئێستا و داهـاتوو لەیەک دەسـکەواندا کـوتراون و پێکەوە شێلراون.

* ئەوەی ئەم ئەزموونانە ببینێت، دڵنیا دەبێت ژیان بـۆیەک ئامـانج دروسـت کـراوە، ئەویش موحیبەتی خودایە.

* خوای گەورە ڕێی پێ دام هەتا لە ڕێگەی خۆشەویستی ئەودا بژیم.

* دکتۆر 'باطريك تيلر' لە ساڵی (١٩٩٠) ی زاینیدا هەڵبژێرا هەتا ببێتە 'بەڕێـوەبەری نوسینگەی پزیشکی'، ئەم پرسیار و وەڵامە لە نێوان دکتۆر و ڕۆژنامە نوسێکدا ڕوویـان دا: بەڕێز دکتۆر باطریک ئایا ئەم ئەزموونەتان وڕێنە و خەیاڵن؟

د.باطریـک: مـن چـاوم بە زۆرێـک لەوانە کەوتـوە کە ئەم ئەزموونەیـان بینـی، هەمویـان دڵنیـان لەوەی کە ئەزمونەکەیـان نە خەونە نە خەیـاڵ و نە وڕێـنە، منـیش دڵنیـات دەکەمەوە کە ئەو ئەزمـوونە ڕاسـتەقینەیە و بەهـیچ جۆرێـک وڕێـنە و خەو نیە.

ئەزموونـداران حەقـیقەت دەبیـنن، ڕووداوی ڕاسـتەقینە و سـەلمێنراویان بینیـوە، شایەتحاڵەکان ڕەوشێکی جدیان هەیە، ناکرێت فەرامۆش بکرێن و بەسەریاندا تێپەڕبن و حەقیقەتێک ئەوان دەیبینن بە گرنگیەوە گوێیان بۆ نەگیرێت.

مـن بـاوەڕم بە خـوا هەیە و، ئەم ئەزموونـانە نیشـانگەلێکی خـوایین و بـۆ ئـێمەی دەنێرێت.

ئەو زاتە بێ هاوتایە دەیەوێت لە ئامێزی بەزەیی داری خۆیدا بمانلاوێنێ.

لەم سەردەمەدا دونیا ڕەنگ و ڕوخساری عەلمانیەتی گرتوە و، عەلمـانیەت لە لایەن دەوڵەتە زل هێزەکـان و، ناوەنـدە ئاشـکرا و پەنهانەکـانی نێـودەوڵەتیەوە پشـتگیری دەکرێت، هەمـوو کـار ئاسـانیەکی بـۆ دەکرێـت هەتـا تەواو کـۆنترۆڵی هـزر و بیـری خەڵکی بکەن و بیسەپێنن بەسەریاندا.

ئەم ئاماژە خواییانە ‘ئەزموونەکان‘ جێگەی وەبیر هێنانەوە و هۆش هێنانەوەی خەڵکین.

کۆمەکی باوەڕداران دەکەن، هەتا لە تاریکستانی وەهم و گاڵتە بازاڕی عەلمانیەت دەرباز بین.

ئیمان و باوەڕێک کە لیمان ڕفێنراوە و تەم و مژی بە دەوردا دروست دەکرێت، ئەزموونەکان ڕەحمەتێکی خوایین و لەم سەردەمەدا گرنگی زۆریان پێ دەدرێت، دەبنە نامەی خوایی هەتا ئادەمیزاد لە نەفامی مادی بوون ڕزگار بکەن.

ئێمەی مرۆڤی ئەم سەردەمە بە گشتی، زیادە پەیوەندیەکی لە سنور دەرچوومان هەیە بە مادی گەریەوە و، کەوتوینەتە گێژاوێکی ترسناکەوە و، دەمانەوێت خۆمان لادەین لە نامە خواییەکان، کە ئەمەش مەترسیەکی زۆر گەورەیە بۆ داهاتومان.

* بەهۆی ئەزموونەکەمەوە دڵنیابووم کە خۆکوژی ‘ئینتحار‘ ڕێگای زیاد کردنی خەم و ئازار و کێشە زۆرەکانە بۆ ڕۆحی مرۆڤ لەدوای مردن و، هەروەها لە دونیادا دروست کردنی بێ ئومێدی و ڕەشبینی یە.

* نزا و جودا جودای کەس و کار و دۆستەکانت پێ دەگات.

صەدەقە و دوعا و قورئان خوێندن و کرداری چاکەی نزیکان دەگەن بە تۆ، بە هۆکاری خێری جیاوازەوە دەبرێن بۆ کۆشک و شوێنی باڵا و ڕازاوەتر.

* ئەوەشم زانی کە هیچ کەس لە بەرزەخ و بەرزەخیەکان نازانن کەی دونیا بە کۆتا دەگات و قیامەت و مەحشەر هەڵدەستێت، ئەوە تەنها خوای گەورە دەیزانێت.

* فریشتەیەک پێی وتم: ئەم خانوو تەلارە جوانانە هی مرۆڤە صاڵحەکانە، ئەمانە میوانی خودای گەورەن هەتا ڕۆژی قیامەت دێت.

* ڕۆح پێشەنگە، چونکە هەرگیز سێبەری ون نابێت.

* ئەزموونەکان فرسەتێکن بۆ تێگەیشتن لە مردن و لەدوای مردن.

لە دونیادا زۆر دەرگای خێر هەن لێمان دەکرێنەوە، نابێت لە دەستیان بدەین، ئەوە فرسەتی ڕزگاربوونی ڕۆژانی بێ کۆتای ڕەستاخێزە.

* 'لویس' ئەزموونەکەی بینی وە و دەڵێت: لە دوای گەڕانەوەم، لە ماوەی سێ ساڵی ڕابردوودا بوم بە یەکێک لە دامەزرێنەران و سەرکردەکانی ئەو کارەی کە پێی دەوترێت 'ڕاهێنان لەسەر هەمەجۆری ڕۆشنبیری' 'تدريب التنوع الثقافي'، ئەم کارە سپێرا بەمن، بۆچی بۆ کەسێکی تر نەبوو؟!

بۆ ئەوە بوو هەتا کەلێنەکان پڕ بکەمەوە و، جیاوازیەکانمان وەکو بەخشین ببینم، ئەوەشم بۆ دەرکەوت کە هەموومان یەکێکین، هەروەها بەهرە و تواناکانمان تەنها بۆ یەک ئامانجی هاوبەشە، ئەمەش دەرگایەکمان لێ دەکاتەوە هەتا لە دونیادا جیاوازیەکان بکەین لە دونیادا و ژیان لە یەکتر ئاڵۆز نەکەین.

بەبێ ئەم ئەزموونە، نە دەگەیشتم بە زۆر شت، دەرگای خێری زۆر گەورەی لێ کردمەوە.

ڕۆح و گیان بۆ هەمیشەیی لە ناز و نیعمەتدا دەبێت و هەرگیز نامرێت.

* لە دونیادا هەموو شت بە کات دەڕوات، بەڵام لەوێ هەموو شت بە خۆشەویستی ڕاستەقینە دەڕوات.

* سورین کید کگارد (١٨١٣ - ١٨٥٥) دەڵێت: دوو ڕێگا هەیە بۆ ئەوەی فریو دراوبیت، یەکەمیان: هەست بە شتێک بکەیت کە ڕاست نەبێت.

دووەم: بەر پەرچی ڕاستی و حەقیقەت بدەیتەوە.

* هەموو شتێک دەربارەی گوڵ و درەخت و ئەستێرە و زەوی و خۆر و گەردوون فێرکرام... پرسیارێکم نەمابوو هەتا بیکەم.

* 'بام بارت' سەرۆكی حزبی دیموكراتە لە 'ئیدمانتن'، كتێبێكی دەربارەی ئەزموونەكەی نوسیوە و دەڵێت: ئەزموونی نزیكبوونەوەم لە مردن، هەموو ژیانی گۆڕیم، زۆر زەحمەتە ڕاڤەی ئەوە بكەم كە چۆن منی گۆڕیوە!!

دڵنیا بوومەوە لەوەی كە یەكەم كاری پێشینەی من لە دوای گەڕانەوەم بۆ دونیا ئەوەیە واز لە حزب و سیاسەت بێنم ئینجا بە تەواوی حاڵی دەبم.

ئەزموونەكەم سی چركەی پێ چوو، كەوتمە دوای ئەو نامەیەی پێم گەیشت و، بۆ هەتا هەتایە سەرۆكایەتی و حزبایەتی و سیاسەتم فڕێ دا و لە خۆمم دورخستەوە.

'بام مارت' دەڵێت: ڕۆح هەمیشەییە و هەموو شتێكە بۆ ئێمەی مرۆڤ، جەستەی مادیمان تەنها كراسێكە.

* هاوارمان دەكرد تەنها جارێكی تر بمانگێڕنەوە بۆ دونیا، هەرگیزاو هەرگیز هەڵەی لەم جۆرە ناكەینەوە 'خۆكوژی و ئینتحار'.

* وتەی بێباوەڕێك كە ئەزموونەكەی بەرجەستە كردوە: لە دۆزەخ ژووری تاكە كەسی بچووك بچوكم بینی، كە بەسەر یەكەوە بوون و لە تەنیشتی یەكترەوە بوون، چواردە پێ بە چواردە پێ دەبوون!

ئافرەتێكم بینی لە دۆزەخ بە شێوەیەكی زۆر ترسناك سزا دەدرا چونكە بەد ڕەوشتی ئەنجام دابو، بە شێوەیەكی زۆر ترسناک سزا دەدرا...

ئێستا بێباوەڕی و بێ ئیمانی لەلای من بۆ هەتا هەتایە سەرنگوم بووە و، پشت بەخوای گەورە ناگەڕێتەوە ناو ژیانم.

ئیمانێكی زۆر بەهێزم بە خوای گەورە و زیندووبوونەوە و قیامەت هەیە.

ئەی هاوار! ئاگادارین بەهەشت و دۆزەخ حەقیقەتێكی حاشا هەڵنەگرن.

* دەتەوێت هەندێ شوێن و ئاكامی بەرزەخیەكان بزانیت، دەتەوێت بزانیت خزمە نزیكەكانت بە چ شوێنگر و مەنزڵێك گەیشتوون.

کتێب و ئەزموونەکانی ئەزمووندااران نزیکیەکی زۆرت بۆ دروست دەکەن.

* دکتۆر ئیبن ئەلکسەندەر دەڵێت: پێویستە لەسەرم و کاری لە پێشینەی ژیانمە کە پێتان بڵێم لە پشتی ئەم زەویە مادیەوە چی دەگوزەرێت.

گرنگترین ژیان و ئەزموونی مرۆڤ دەکەوێتە دوای سەفەرێک کە بە مردن دەست پێ دەکات.

لە سایەی خوایەکدا ژیانێکی زۆر شایستە و باڵا دەست پێ دەکەیت، ئەو خوایە زۆر میهرەبانە و گرنگیت پێ دەدات!

* پێیان وتم: تەسبیحاتی خوا و نوێژکردن، دڵ و دەروون و هەستەکانت ئارام دەکەنەوە، چارەسەر نوێژ کردنە، پێیان وتم بۆ خەڵکی دونیای بگێڕەرەوە.

* ستەمکاران کە مرۆڤایەتی توشی چەوساندنەوە و نەهامەتی و برسێتی دەکەن و، بچووکترین هەتا گەورەترین کردەوەیان لەسەریان تۆمار دەکرێت و هیچی ون نابێت.

بنێشتێک کە فڕێی دەدەیتە سەر شەقامێک لەسەرت دەنوسرێت، کلێنسێک، شەخەڵێک....

خاشاکێک لە پیسە و ڕۆی دەکەیتە ڕووبارێکەوە، چەند کەس زیانی لە دەست بکات هیچی ون نابێت!

* ئەم ئەزموونە قوڵ قوڵ دەسکاری ئاکار و بیرکردنەوە و هەستەکانی کردم، فێری خۆشویستنی کردم، فێری کردم پارە پەیداکردن و پێکەوەنانی سامانی زۆروزەوەند سەرکەوتن نیە.

سەرکەوتن گرنگی دانە بە منالەکانت، ئەزموونەکەم بیرکردنەوە و ڕێگای ژیانی گۆڕیم.

دوو سەرتاپا سپیم لەگەڵدا بوو، بۆ ڕێکخستن و گۆڕینی تێگەیشتنی من لەگەڵم بوون، ئەو یاسا ورد و پڕ مانایانەیان ڕێک دەخست کە تایبەت بوون بە من.

لەوێ 'بەرزەخ' شتانێک وەردەگرین کە لێرە و عەقڵی مرۆڤەکان توانـای وەرگـرتن و لێ تێگەیشتنیان دەگاتە ئاستی سفر و مەحاڵ.

* هەموو ژیانی خۆم پیشان درایەوە، هیچ ون بوونێک بۆ هەست و خەیاڵ و کـردار و نیەت، ئاکاری هیچ کەسێک نیە.

هەرچی کـاریگەریەک لەسـەر خەڵکـی بەجـێم هێڵابـوو، بە چـاک و خـراپەوە، لە ئەستۆ و گەردنی مندا بوو.

* ئافرەتێکی چەپ دەڵێت: ئەگەر ئازادیتان دەوێـت، سـوێند بە خـودا لێـرەی دونیـا دەست ناکەوێت، دڵنیابن لەو دونیا بەبێ سنور دەستان دەکەوێت.

ئێوە نازانن دونیـا چ جـۆرە زینـدانێکە هەتـا نەگەنە بەرزەخ، خـۆزگەم بەوەی لەوێ براوەیە و بەهەشتیە.

* ئەوێ شوێنی ون بوون نیە.

من وەختێ گەڕامەوە دەگریام، هاوڕێکانم وایان دەزانی لەبەر نغرۆ بـوونم لە ئـاودا و لەبەر ترسی ئەوەی بەسـەرم هـاتبوو دەگریـام، نەخێـر مـن دەگریـام لەبەر ئەوەی لە نیشتمانی ڕاستەقینە دورخرابوومەوە، من لە گریانی خۆم حاڵی بووم، بەڵام ئەوان نا.

لەو سەفەرە هەمیشەییەدا دەچینە جیهانێک، کە نە بۆشایی بە مانای بـێ مەبەسـتی و بێ هودەیی تیایە، نە کات و زەمەن.

لەوێ زانیم ئێمە وەک ئەوەی لەسەر ڕێگایەک بووبین و تەنها پشوویەکی کورتمـان دابێت، ڕێمان کەوتۆتە دونیا، ئەگینا ئێمە دونیایی نین.

*'مـوحەمەد زەمـانی' لەدوای چـل سـاڵ ئەزمـوونەکەی دەگێـڕێتەوە، پێـنج سـاڵ ئەزمـوونی کەسـانی تـری بینـی، لە تەلەفزیـۆن و کـۆڕ و سـیمیناری تـایبەت بە 'ئەزموونەکانی نزیکبوونەوە لە مـردن'، ئینجـا بڕیـاری دا ئەزمـوونەکەی بگێـڕێتەوە، کە گێڕایەوە فرمێسکی بە چاوی ئامادەبواندا هێنایە خوارەوە.

که گەڕامەوە هەستم دەکرد بە تەنهایی خۆم، بەبێ ویستی خۆم دەستم کرد بە گریان، گریانێک کە ئارام بەخش بوو، خۆشترین ڕۆژی ژیانی دونیام ئەو گریانە بوو، لەو چرکە ساتەدابوو، ئاواتە خوازم جارێکی تر بگەڕێمەوە بۆ ئەو شوێنە، مەحاڵە بینینەکان و بیسراوەکانی ئەوێ بە کەماڵی ئەوێوە بگاتە ئێرەی فانی.

ئەو چرکە ساتانەی لێرە نەبووم، نازانم چەندین ساڵی ئەوێ بووە، من پێنج هەستەوەر و حاسەکەم لەدەست دابوو، ئینجا ئەو گەشتە مەلەکوتیەم ئەنجام دا.

* وەختێک گوناهێک، هەڵەیەک، بێ ئاگاییەک ڕووم تێ دەکات، وەک ئەوەیە گۆزەیەکی گران بەها بە دەستمەوە بشکێت.

* ئەوەی کە پیشانی ئەزموونداری دەدرێت، بۆی دیاری دەکرێت و بە هەڕەمەکی گوزەری پیا ناکات، زۆر بە وردی بۆی دیاری دەکرێت و خوای گەورە بڕیاری لەسەر دەدات.

* هەرگیز هیچ پەشیمانی و ئەسەفێک بەقەد ئەوە گەورە نیە لە ژیانمدا، کە بۆچی گەڕامەوە بۆ دونیا، کە لەو جیهانە کامڵ و پڕ لە ناز و نیعمەتە بێ شومارە دوخرامەوە و هێنرامەوە بۆ دونیا!

کە ڕۆح دەگەڕێتەوە ناو جەستە، وەک ئەوەیە کۆڵێکی سەد کیلۆیی بخەینە سەر شان و ملت.

* دەمبینی شتێک ڕایەڵ بوو لە نێوانی منی سەرەوە و جەستەی خوارەوەدا، لە دڵی خۆمدا دەموت با دەستی پێوەبگرم، بەڵام نە دەگیرا و نە دەپچڕا.

وەک گوریسێکی نورانی بوو، دەستم دەچوویە ناو جەستەمەوە، ئیتر تێگەیشتم کە من مردووم، بەڵام نەمدەزانی چەندەیە مردووم!!

* لەو دونیادا گوناهکردن حەسرەت و پەشیمانی زۆری بەدوادا دێت. بینیم هەچ کاتێک چاوم لە ئافرەتی نامەحرەم پاراستبێت، چ دەستکەوتێکی گەورەی ئەوێی پێ بەخشیوم.

چونکە ئەوە پەیوەست بووە بە شەرەف و مافی خەڵکیەوە و بۆمن نەبووە سەیری بکەم.

من لە ژیانمدا چاوەکانم لە سەیرکردنی نامەحرەم زۆر دەپاراست، شعور و هەستێکی ئەوەندە گەورەی بۆ دەستەبەر کردم کە هەرگیز پێناسەیەکی لە دونیادا نیە.

گرنگی بە مافی خەڵکی زۆر بدەن، خۆتان بپارێزن لەو شتانەی کە خەڵکی بە لاوەکی سەیری دەکەن، بە سەیارەکەت مەڕۆرە سەر خۆڵ و پێش سەیارەی تر مەکەوە!

'مافی خەڵکی' زۆر گرنگە و، پێشێل کردنی مەترسی گەورەیە بۆ بەرزەخ و قیامەت.

ئاگاتان لە ماڵی گشتی و تایبەتی خەڵکی بێت، ئەو کاتەی پارە و سامانی حەرام دەخۆیت، لەوێ ناتوانیت مافە خوارەوەکان بگێڕیتەوە، ماڵ وێران دەبیت.

* منالێک یاریەکی سادەی کۆنی هەیە، تۆ یاریەکی نوێی زۆر جوانی بۆ دێنیت، کۆنەکە فەرامۆش دەکات، ئێمەش لەدوای مردن، دوای جەستە کۆنەکەمان ناکەوین و فەرامۆشی دەکەین.

لەوێ تەنها بەدەست لێ دانی، میوەیەک تام و بۆنە سەر سوڕهێنەرەکەی دەگاتە تۆ.

* مێشک و دەماغ ئەم ئەزموونەی نەبینیوە هەتا دووبارەی بکاتەوە، هەرگیزاو هەرگیز بەرکەوتەکانی مێشک و فیزک ئەم جیهانە نەبینراوە بەرهەم ناهێنن.

* کە گەڕامەوە لە ئەزموونەکەم، زۆر سوپاسی خودام کرد کە لەژیانی ڕۆژانەمدا لێپرسراوێتی هیچ کەسێکم لە ئەستۆدا نەبووە، چونکە لێپرسراوێتی بۆ ئەو دونیا زۆر پڕ کێشە و شەرمەزاریە.

شەرمەزاریەک دێنێتە ڕێگەت کە توانای ڕوبەڕو بونەوەیت نەبێت، حزبایەتی و سیاسەت کردن و لێپرسراوێتی 'بە تایبەتیش' لەم سەردەمەدا، هەرگیز شانازی نیە بۆ ئەوێ.

ئەو داهات و پارە زۆرەی کە وەری دەگریت و شایانی نیت، دەبێتە سزا و شەرمەزاری و ئازاری بێ کۆتا.

خۆت دەبینیتەوە لە حاڵێکدا کە شایستەی دیداری خوای گەورە نیت.

* نیگەرانی لەوێ دەگۆڕێت، ئەوەی ئێستا بیری لێیدەکەیتەوە بۆ ئەوەی ئەوێت لێ تاڵ نەکات، بایەخی کەم دەکرێتەوە و بیرت نامێنێت، بۆ ئەوەی نەبێتە ئازاری ئەوێ.

* پیاوکوژ خەڵکی تر دەکوژێت، کەسی پیاوکوژ چرکە بەچرکە فرسەتی تەوبە و گەڕانەوە، هەروەها باشتر کردنی حاڵی خۆی هەیە، بە پارە و باجدان، یاخود بە تۆڵە لێ سەندنەوە و شتانی تر تۆڵەی لێ وەردەگیرێتەوە.

بەڵام کەسێک کە خۆی دەکوژێت، هەر ئەوەندەی ئەو کارە دەکات، تەواوی ئەو هەلانەی لە بەردەستن لە دەستیان دەدات، لەبەرئەوە خۆکوژی زۆر ترسناکترە لە کوشتنی خەڵکی و، چارەنوسی قیامەتیش زۆر ترسناکە. ئەوەی خۆی دەکوژێت تەواوی ئازار و فشارە دەروونیەکانی دونیای، لەگەڵ خۆی دەبات بۆ قیامەت و سزای خۆ کوژیەکەشی. ئەوەندەی تر باری گوناهی قورس و گرانتر دەکات.

* کە دەگەیتە دەرەوەی ئەم گەردوونە، دەگەیتە شوێنێکی زۆر زۆر گەورە و فراوان، گەیشتینە شوێنێک هەستم دەکرد کە هیچ یەکێک لەوانەی لەگەڵم بوون، لەوەو پێش هەرگیز نەگەیشتونەتە ئەو شوێنە.

ئێمە لە کاتێک لە کاتەکاندا لەوێ نەبووین، بە خەیاڵیش شوێنێکی ئاوامان پەی پێ نەبردوە، ئەوێ لە هێز و توانای هیچ مرۆڤێکی دونیایدا نیە پێی بگات، جەستەی بە فانی پۆشتەکراو ناگاتە ئەوێ.

* بەهۆی ئەم ئەزموونە ڕەحمەتیەوە، نەک تەنها نوێژ دەکەم، بەڵکو نوێژە لەدەستچوەکانیشم هەمووی گێڕایەوە و قەزام کردونەتەوە سوپاس بۆخوا.

سی و یەک ساڵەی تەمەنم داوە لە بێژنگ و پیا چوومەتەوە و قەرزی نوێژ و ڕۆژوەکانم گرتۆتەوە.

* فرسەتی بینینی ئەزموونەکان و، گەڕانەوە بۆ دونیا بە هەموو کەسێک نادرێت، بەڵام قەدەر بەشداریشی بە ئێوە داوە، کاتێ دەیبیستن، یاخود دەربارەیان دەخوێننەوە و، لە کەناڵەکان دەیبینن.

* کاتێك نامۆ دەبیت لە جەستەت و دور دەخرێیتەوە لێی و ڕۆح دەچێتە بەرزەخ بە یەکجاری، ئازاری گەڕانەوەی ڕۆح بۆ جەستە هەزاران جار لە ئازاری دەرچوونی زیاترە، لەبەرئەوە ڕەحمەتی خوایە بە ملیۆنەها حیکمەتی ترەوە کە نایزانین، ئەوەیە کە مردین ناگەڕێینەوە بۆ دونیا.

* لە بەرزەخ و ئەو دونیا هەنجیری زۆر جوانی لێ بوو، شوتیم بینی، کە گەڕامەوە باوکم شوتی لەت دەکرد و وتی: ڕۆڵە ئا لێمە دەچوو؟

وتم: نەخێر هەرگیز لە وێنەی ئەوەی بەهەشت لە دونیادا نیە، ئەگەر هەزار ساڵ بە سەریەکەوە بەڕۆژوو بیت و، یەک قاژ لەو شوتیە بخۆیت، تینوێتی و ماندوێتی و برسێتی هەزار ساڵەت لەبیر دەباتەوە.

* کاتێ تۆ دە خولەکێکی تر دەخەویت، ئایا هیچ دەترسیت؟

نەخێر بۆچی بترسم، پشوو دەدەم.

دەی مردن لەوە ئاسانترە، لەبەرئەوە مردن هیچ ترسێکی ناوێت.

* دەبێت ئاسایی وەری بگرین کاتێ ئەزموونەکان هەمەجۆرن، بۆ نموونە ئەزمونێکی زۆری موسوڵمانانی سونە و زیاترێکی موسوڵمانی شیعەی تیایە "چونکە گرنگیان زیاتر پێ داوە و، زۆر بەرنامەی تایبەتیان هەیە لەسەر ئەزموونەکانی نزیکبوونەوە لە مردن"، ئەزمونی گاور و بێباوەڕ و جۆرەکانی تری تیایە، دیارە تەنها لە ئەمریکا (٢٥) ملیۆن کەس ئەم ئەزموونەیان بینیوە و بەسەرهات و چیرۆکیان هەیە، لە کوردستانی خۆمان بەرنامەی 'شیرین چا' لە کەناڵی ئاسمانی پەیام یەکەم بەرنامەیە گرنگی پێ دەدات و ئەم پەرتوکەش یەکەم پەرتوکە بەو جۆرە گشتگیریە لە ئەزموونەکان بدوێت.

دەبێت ئاسایی وەری بگرین هەر کەسە و بەپێی وابەستەبونی بە بیرو باوەڕەکەیەوە خۆی هەندێک لە دیاردەکان دەبینێت، بەڵام ئەوەی جێگەی سەرنجە لە هەموو خاڵە گرنگ و جەوهەریەکاندا یەک شتن و کەمتر جیاوازی دەبینیت.

من لەم کتێبەدا ئەمانەتی گواستنەوە و، تایبەتمەندی هەر کەسەیان و بیروباوەڕیانم پاراستوە و وەک خۆی گواستومنەتەوە.

* پێش ئۆتۆمبیلێك کەوتم، ئیتر لە کاتی تێپەڕاندنیا لە دەستم وەری گرت، زۆر خێرا بووم و گەیشتبومە پێچێک، هەر ئەوەندەم لەبیرە سێ جار بانگی خێزانەکەمم کرد... ئەعزەم... ئەعزەم... ئەعزەم.

دوای ئەوە ئیتر خۆم لە جیهانێکی تردا بینیەوە. هەستم بە ئازاری برینداربوون و، پێکدادانەکە نەکرد.

یەکەم شت کە بینیم کچە مامێکم بوو، سڵاوی لێ کردم و وتی: مصطفی تۆ چی دەکەیت لێرە؟

وتم: بۆچی ئێرە شوێنێکی خراپە!

"کچە مامەکەم چەند ساڵێک بوو کۆچی دوایی کردبوو."

وتی: نا نا ئێرە زۆر جوان و شیرینە.

بەڵام تۆ لێرە چی دەکەیت؟

وتم: نازانم بۆچی لێرەم!

چونکە نەمدەزانی کە ڕووداوم بەسەردا هاتووە.

* کە ڕۆشتم بەرەو بەهەشت، زۆر زۆر جوان بوو، درەختەکانی زۆر زۆر گەورە بوون، هەمووی سەوز بوو، وتم بەڕەزا 'ڕەزا لەوێ بوو': ڕەزا ئایا مرۆڤ توشی مەلەل و وەڕس بوون و بێ تاقەتی نابێت؟

"وەختێ بۆ هەتا هەتایە لە بەهەشت دەمێنێتەوە"

"ڕەزا لەگەڵ ژمارەیەک لە خەڵکی بەهەشت پێکەوە دانیشتبوون" وتی: لەوەتەی تۆ هاتویت، ئایا توشی بێ تاقەتی و وەڕس بوون و دووبارە بوونەوە بوویت؟

وتم: نەخێر... نەخێر...

وتی: دووبارە بوونەوە و وەڕس بوون لێرە نیە!

مرۆڤ لێرە بۆ هەمیشەیی سەرقاڵی خۆشی و نیعمەتەکانە. بەهەشت لە هەموو شتێکدا بێ وێنەیە.

سیفاتەکان و خوو نەریتەکانی دونیایی مرۆڤ، سیفاتی ئەو دونیای نین و زۆر شت بەرەو باڵاتر دەگۆڕێت.

وا دەزانم گەورەترین حیکمەت لە گەڕانەوەی ئەزموونداران بۆ دونیا، ئەوەیە کە ئەزموونەکانیان بگێڕنەوە.

پەلە مەکەن لە حوکم دان بەسەر خەڵکیدا، چونکە بەرپرسیارێتیەکی گەورەیە.

پێیان وتم: گۆڕ و قەبر، تەنها جل و بەرگێکی کاتیە بۆ جەستەیەکی کاتی، گۆڕ و مەنزڵی مردوەکان نیە، ڕۆحەکان لێرەن.

وەرن هەوڵ بدەن بۆ ئەم جیابوونەوە ڕۆحیە عەزیم و گەورەیە، با لێی حاڵی ببین پێش ئەوەی پێی بگەین.

ئەگەر لە حەقیقەتی دوای مردن حاڵی ببین، چرکەیەک لە ژیانمان بەفیڕۆ نادەین، هەرگیز ئەوەم لەبیر ناچێتەوە، وەختێک لە جەستەی قورس و بارگران نەجاتم بوو بوو، ئەگەر بە دەستی خۆم بوایە هەگیز نەدەگەڕامەوە بۆ دونیا.

جەستەی مرۆڤ قەبری مرۆڤە، وەرە ئەو ڕۆحە لەو قەبرە دەربێنە بە سەلامەتی.

ئیمان و ئیسلامەتی فێرت دەکات تەعبیر بۆ ئەم ئەزموونانە دروست بکەیت.

* ئیمان بەخوا مەرجی ڕزگار بوونە لەو دونیا، ئیمان کۆت و بەندەکانمان دەکاتەوە.

* نابێت چاوەڕوانی زانستی سەردەم بکەین هەتا خوامان پێ بناسێنێت، خوای گەورە زۆر لەوە گەورەترە، کە چاوەڕوانی زانست بکەین هەتا بەڵکو شتێکی لەسەر بڵێت.

خوای گەورە ئەو کۆڵە قورس و، ئەمانەتە پڕ زەحمەتەشمان دەبینێت کە وەعدمان دا بۆ چرکەیەکیش خوا لەیاد نەکەین و، کەچی نوشوستیمان هێنا و، هێشتا زۆر زۆر بەڕەحمیشە بەرامبەرمان.

* سی ساڵ تەمەنی ڕابردووی خۆمم بینی هەمووی سڕابوویەوە و چاکەم نەبوو!

هیچ چاکەیەکم تۆمار نەکرابوو، دەست خاڵی بووم و دەستە کوتەم بوو، لەوێدا زانیم چەندە چارە ڕەشم.

لە کاتێکدا من مولتەزیم بووم بە دین و ئیسلامەتیەوە، وام دەزانی توێشووی قیامەتم زۆر پڕ چاکەیە، بەڵام بۆم دەرکەوت چاکەکانم لە دونیادا پەرش و بڵاوبوون و هەمووی لە دەست خۆشی و سوپاس نامە و پیاهەڵدانەکانی خەڵکدا وەک چاکە نەماوەتەوە و فەوتاوە...

چاکە و خێر و عیبادەت بە پیاهەڵدان و دەرکەوتن دەفەوتێت و هیچی نامێنێتەوە.

دەرخستن و پیاهەڵدانی خێرەکانتان تەنها ئەو پیاهەڵدانەی دونیاتان دەست دەخات. من سی ساڵی تەمەنم ئاوا بوو هیچم بۆ نەنوسرابوو، پێویستە بەهیچ جۆرێک چاوەڕوانی پیاهەڵدان و سوپاسی خەڵکی نەکەین، چ جای ئەوەی داوای بکەین!!

* یەکێک لە پزیشکەکانی ڕۆژئاوا کە سەرقاڵی کارکردنە لەم ئەزموونانەدا دەڵێت: هەرگیز درۆ مەکەن، بە تایبەتی لەکاتی سەرە مەرگی کەسێکتاندا درۆی لەگەڵ مەکەن و مەڵێن "هیچت نیە و چەند ڕۆژێکی تر هەڵدەستیتەوە" !!

چونکە ئەو کەسە خۆی وەکو چۆن ئێوە دەبینێت وردە وردە جیهانی غەیب دەبینێت، فریشتەکان دەبینێت، ڕۆحیانەتی مردوەکان دەبینێت، چۆن ئێوە دەبینێت، زیاتر لەوە جیهانی غەیب دەبینێت، بە تەواوی دەزانێت کە درۆی لەگەڵ دەکەن وەختێ پێی دەڵێن چاک دەبیتەوە!

ئەگەر بە واقعی لەگەڵی بدوێن، زۆربەی جارەکان وتە و ڕاسپاردەکانی فریشتەکانتان پێ دەڵێت، وەختێ بەوی دەڵێن...

"هەر بەو جۆرەش لە شەریعەتی ئیسلامدا هاتوە کە لەکاتی سەرە مەرگدا سورەتی 'یس' یان بەسەردا بخوێنین و شایەتومان "أشهد أن لا إله الا الله و أشهد أن موحەمەدا رسول الله" بخەینە سەر زمانیان، کەواتە موسوڵمان ڕاستگۆیە وەختێ بە ناڕاستەوخۆ بە کەسەکەی خۆی کە نزیکی مەرگ بووەتەوە دەڵێت، شایەتومان بێنە و یاسینی دەخوێنێت".



# مردووەکان دەدوێن



## دکتۆر عدنان إبراهیم

ئەم بابەتە وتاری هەینی مامۆستای ناودار دکتۆر 'عـدنان إبـراهیم'ە لەسـەر هەمـان بابەتی 'نزیکبوونەوە لە مردن'.

دیارە زانای بەتوانـا و لێهـاتووی جیهـانی ئیسـلامی دکتـۆر عـدنان إبـراهیم، وەک هەندێک لە زانایانی تری جیهانی ئیسـلامی خوێنـدنەوە و، وتـار و، باسـی تـایبەت بە 'نزیکبوونەوە لە مردن' یان خستۆتە بەر باس و لێکۆڵینەوەی خۆیان.

لە یەکێـک لە وتارەکـانی کە بەشـێکی زۆری لێـرەدا پێشـکەش دەکەیـن، دیـارە بـۆ دەوڵەمەند کردنی تێبینی و سەرنجەکانی باسە سەرەکیەکەی پەرتوکەکەمانە!

دکتۆر عدنان بەم ئایەتە موبارەکە دەست پێ دەکات، کە خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿مَا اتَّخَذَ اللَّهُ مِنْ وَلَدٍ وَمَا كَانَ مَعَـهُ مِـنْ إِلَٰـهٍ إِذًا لَـذَهَبَ كُـلُّ إِلَٰـهٍ بِمَـا خَلَـقَ وَلَعَـلَا بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ سُبْحَانَ اللَّهِ عَمَّا يَصِفُونَ (٩٠)﴾... لە ئایەتی نەوەدەوە بـۆ کۆتـایی المؤمنون کە ئایەتی (١١٨) ی هەمان سـورەت بەرپەرچ دانەوەی مولحیـدەکانە لەوەی کە مرۆڤ بۆ چوار ڕۆژی دونیا دروست نەکراوە!

﴿قَالَ كَمْ لَبِثْتُمْ فِي الْأَرْضِ عَدَدَ سِنِينَ (١١٢) قَالُوا لَبِثْنَا يَوْمًا أَوْ بَعْـضَ يَـوْمٍ فَاسْـأَلِ الْعَادِّينَ (١١٣) قَالَ إِنْ لَبِثْتُمْ إِلَّا قَلِيلًا لَوْ أَنَّكُـمْ كُنْـتُمْ تَعْلَمُـونَ (١١٤) أَفَحَسِـبْتُمْ أَنَّمَـا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ (١١٥) فَتَعَـالَى اللَّهُ الْمَلِـكُ الْحَـقُّ لَا إِلَٰـهَ إِلَّا هُـوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْكَرِيمِ (١١٦)﴾ (المؤمنون: ١١٢-١١٦)

واتە: خوای گەورە پرسی لە بێبـاوەڕانی پرسـی کە لە دۆزەخـدان، بە ژمـارەی سـاڵ چەند ساڵ لەسەر زەوی مانەوە و، چەند ساڵ ژیان؟

وتیان: ساڵێك نا، ڕۆژێ یان بەشێ لە ڕۆژێ لەسەر زەوی ماینەوە، لەوانە بپرسە کە ژماردن ئەکەن، ئەوان چاکی لێ دەزانن.

خـوای گەورە فەرمـووی: مـاوەیەکی کەم نەبـێ لەسـەر زەوی نەمـاونەتەوە ئەگەر بزانن.

ئاخۆ ئێوە واتان گومان دەبرد، ئێمە ئێوەمان بەبێ مەبەست دروسـت کـردوە و ئێـوە ناگەڕێنەوە بۆ لای ئێمە و هیچ پرسیار و وەڵامێک لە ئارادا نی یە؟

بەرز و باڵا خـوای پادشـای ڕاسـتەقینەیە، هـیچ خـوایەک جـگە لە الله، کە خـوای عەرشی پڕ قەدر و حورمەتە"

مرۆڤ بۆ هەتا هەتایی و مانەوە دروست کراوە، هەرچەندە بانگەشەکارانی مـادی و بێبـاوەڕان وا گومـان دەبەن بـۆ نەمـان دروسـت بـوون، بەڵام گومـانی ئەوان لەبەردەم ڕاستی ڕۆژی حەشردا هەپرون هەپرون دەبێت!

ئێمەی مرۆڤ لە ماڵ و دونیایەکەوە دەگوازرێینەوە بۆ ماڵ و حاڵێکی تر، یـان بەرەو بەختەوەری هەتا هەتایی، یاخود بەرەو دۆزەخ و نەهامەتی هەتا هەتایی.

﴿... وَمَنْ أَصْـدَقُ مِـنَ اللهِ قِـيلاً﴾ (النسـاء: ١٢٢) ڕاسـتی و حەقـیقەت لای خـوایە کە وادەی زیندووبوونەوەی داوە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿حَتَّىٰ إِذَا جَاءَ أَحَدَهُمُ الْمَوْتُ قَـالَ رَبِّ ارْجِعُـونِ (٩٩) لَعَلِّي أَعْمَلُ صَالِحًا فِيمَا تَرَكْتُ كَلَّا إِنَّهَا كَلِمَةٌ هُوَ قَائِلُهَـا وَمِـنْ وَرَائِهِـمْ بَـرْزَخٌ إِلَىٰ يَـوْمِ يُبْعَثُونَ (١٠٠)﴾ (المؤمنون: ٩٩-١٠٠)

واتە: هەرکـام لەم کـافرانە هەر لەسـەر ئەم پێـودانگە ئەڕوات هەتـا کـاتێ کە مەرگ لەپڕ دێتە سەر یەکێکیان پەشیمان دەبێتەوە لە کردار و گوفتاری بەدی خـۆی و دەڵێـت: خودایە بمگێڕەرەوە بۆ ژیان...

بە هیوای ئەوەی کردەوەیەکی چاک بکەم، لەگەڵ ئەو باوەڕەدا کە کاتی خۆی بە خۆم ئاشنام نەکردبو، واتە: باوەڕ بە خوای تاک و بێ هاوبەش بکەم و کردەوەی چاکیش لەگەڵ باوەڕداریدا ئەنجام بدەم، نەخێر ئەمە نابێ و، ئەم قسەیەی ئێستە دەیکات قسەیەکی ڕووتە دەیڵێ و، بە دەمیادێ و، بەڕاستی نیە و، ئەگەر بگەڕێتەوە بۆ ژیان هەر لەسەر پێودانەکەی جارانی ئەڕوات و، ئەمانە عالەمێکی بەرزەخی نێوان مەرگ و زیندوو کردنەوەیان لەپێشە، تا ئەو ڕۆژەی لە قیامەتدا زیندوو دەکرێنەوە درێژە دەکێشێت.

مردوو لە دوای ئەوەی لە دونیا دەست کۆتا دەبێت، دەچێتە جیهانێکی فراوان کە پێی دەوترێت 'بەرزەخ' هەتا ڕۆژی قیامەت و حەشر دێتە پێشەوە قورئان باس لە هەندێک لەوانە دەکات کە لەدوای نزیکبوونەوە لە مردن گەڕاونەتەوە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ خَرَجُوا مِنْ دِيَارِهِمْ وَهُمْ أُلُوفٌ حَذَرَ الْمَوْتِ فَقَالَ لَهُمُ اللَّهُ مُوتُوا ثُمَّ أَحْيَاهُمْ إِنَّ اللَّهَ لَذُو فَضْلٍ عَلَى النَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَشْكُرُونَ﴾ (البقرة: ٢٤٣)

واتە: ئایا تەماشای ئەوانە ناکەن کە هەزاران کەس بوون لە ماڵی خۆیان دەرچوون و لەترسی مردن بە تاعوون یان لە ترسی دوژمن ڕایان کرد! جا خودا فەرمانی کرد پێیان کە بمرن و ئەوانیش مردن، پاش مردنەکەیان خودا زیندووی کردنەوە و تێیگەیاندن کە کەس لە دەستی خوا دەرناچێت و سەرەنجام هەر لای ئەوە، بێ گومان خودا فەزڵ و ڕەحمەتی زۆرە بەسەر خەڵکیەوە، بەڵام ئەوان زۆربەیان سوپاسی خودا ناکەن و دان بە نیعمەتەکانی خوادا نانێن!

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَوْ كَالَّذِي مَرَّ عَلَىٰ قَرْيَةٍ وَهِيَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا قَالَ أَنَّىٰ يُحْيِي هَٰذِهِ اللَّهُ بَعْدَ مَوْتِهَا فَأَمَاتَهُ اللَّهُ مِائَةَ عَامٍ ثُمَّ بَعَثَهُ قَالَ كَمْ لَبِثْتَ قَالَ لَبِثْتُ يَوْمًا أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ قَالَ بَلْ لَبِثْتَ مِائَةَ عَامٍ فَانْظُرْ إِلَىٰ طَعَامِكَ وَشَرَابِكَ لَمْ

يَتَسَنَّهْ وَانْظُرْ إِلَىٰ حِمَارِكَ وَلِنَجْعَلَكَ آيَةً لِلنَّاسِ وَانْظُرْ إِلَى الْعِظَامِ كَيْفَ نُنْشِزُهَا ثُمَّ نَكْسُوهَا لَحْمًا فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُ قَالَ أَعْلَمُ أَنَّ اللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ (البقرة: ٢٥٩)

واته: ئەی سەیری عوزەیر ناکەی کە بەلای قودسدا ڕابوورد هەموو خانووەکانی تەپیبوون و هیچی بەسەر هیچەوە نەمابوو، عوزەیر سەری سوڕما و وتی: خوا چۆن ئەم کاولە وێرانە زیندوو دەکاتەوە؟

هەر لەوێدا خودا بۆ ماوەی سەد ساڵ عوزەیری مراند و، پاش ئەوە زیندووی کردەوە و لێی پرسی: چەند بەو حاڵەوە ماینەوە،

واتە: بە مردوویی؟

وتی: ڕۆژێ یا نیوە ڕۆژێ

خودا فەرمووی: نەخێر سەد ساڵە مردووی، لەگەڵ ئەوەشدا سەیری خواردەمەنی و ئاوەکەت بکە هیچ نەگۆڕاون، هەروەها سەیری گوێدرێژەکەت بکە چۆن بووە بە ئێسک و پرووسک و مردووە، یا سەیری بکە چۆن ئەم ماوە دوور و درێژە نەمردووە، ئەمانەوێ بتکەینە بەڵگە و نیشانەی دەسەڵاتمان و بە خەڵکی نیشان بدەین چۆن مردوو زیندوو دەکەینەوە و، چۆن وێرانە ئاوەدان دەکەینەوە؟

سەیری ئێسکەکان بکە، ئێسکی گوێدرێژەکەی یا هی مردووی تر؟ کە عوزەیر 'سەلامی خوای لێ بێت' ئەم ڕاستیە و ئەم دەسەڵات و توانای خودایەی بۆ دەرکەوت وتی: وا بە یەقین زانیم خودا دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا دەڕوا و دەتوانێ هەر ویستی لەسەر بێت بیکات.

یەکێک لە نیشانە و موعجیزەکانی حەزرەتی عیسا زیندوو کردنەوەی مردوو بوو بە ویستی خوا.

وە زۆر ئایەتی تری قورئان کە ئاماژە و هێمان بۆ ئەم دیاردە و حاڵەتە.

'ڕۆح' دیاری و بەخششێکی خواییە و هەرگیز فەنا بـون و مردنـی بەسـەردا نـایەت، بەڵام جەستە بەجێ دێڵێت و دەچێتە جیهانێکی تەواو جیاواز.

ئەگەر 'ڕۆح' گەیشتە بەرزەخ و شوێنێکی دیاری کراو ئیتر ناگەڕێتەوە بۆ دونیـا و بـۆ ناو جەستە هەتا ڕۆژی قیامەت.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿حَتَّى إِذا جاءَ أَحَدَهُمُ الْمَوْتُ قـالَ رَبِّ ارْجِعُـونِ (٩٩) لَعَلِّي أَعْمَلُ صالِحًا فِيما تَرَكْتُ كَلاَّ إِنَّها كَلِمَةٌ هُوَ قائِلُهـا وَمِـنْ وَرائِهِـمْ بَـرْزَخٌ إِلى يَـوْمِ يُبْعَثُونَ(١٠٠)﴾ (المؤمنون: ٩٩-١٠٠)

واتە: هەر کام لەم کافرانە هەر لەسەر ئەم پێودانە دەڕوات هەتا کاتێ کە مەرگ لەپـڕ دێتە سەر یەکێکیان پەشـیمان دەبێـتەوە لە کـردار و گوفتـاری بەدی خـۆی و دەڵێـت: خـودایە بمگێـڕەوە بـۆ ژیـان. بە هیـوای ئەوەی کردەوەیەکـی چـاک بـکەم لەگەڵ ئەو باوەڕەدا کە کاتی خۆی خۆم لێ بەری کردبو، واتە بـاوەڕ بە خـوای تەنیـا و بـێ هاوتـا بکەم و کردەوەی چـاکیش لەگەڵ بـاوەڕەکەم بـکەم. نەخێـر ئەمە نـابێ و ئەم قسـەیەی ئێستە ئەیکا قسەیەکی ڕووتە ئەیڵێ و بە دەمیادێ و بە ڕاستی نیە و ئەگەر بگێڕێتەوە بـۆ ژیانی دونیا هەر لەسەر پێـودانەکەی جـارانی دەڕوات و ئەمـانە عـالەمێکی بەرزەخـی نێـوان مەرگ و زینـدوو کردنەوەیـان لە پێشـە هەتـا ئەو ڕۆژەی لە قیامەتـا زینـدوو دەکرێنەوە درێژە دەکێشێت.

کاتێـک ڕۆح یـاخود نەفـس ئەو حـاجز و پەردەی بەرزەخ دەبڕێـت نـاگەڕێتەوە بـۆ دونیا، بەڵام ئەوانەی نایبڕن دەگەڕێنەوە دونیا، یاخود دەگونجێت مـۆڵەتی گەڕانەوەیـان بدرێت. ئەمە تەفسیرێکی قورئانیە بۆ ئەو دیاردە جیهانیەی کە پێی دەوترێت 'ئەزمـوونی نزیکبوونەوە لە مردن'.

ئەم ئەزمـوونە بە زۆری کاتێـك ڕوودەدات کە هەمـوو نیشـانەکانی زینـدوویتی لە مرۆڤدا ڕادەوستێ.

(١٢٪ بۆ ١٨٪) ی هەچ کەسێک بگاتە بێ هۆشیەکی قوڵ ئەم دیاردەیە دەبینێت.

لە نێوانی شەش کەس کە دەمرن یەکێک دەگەڕێتەوە بۆ ژیان.

بەشێکی نوێ لە 'بواری پزیشکیدا' دروست بووە بە ناوی زانستی چاودێری دوای بوژانەوە' چاودێری ئەوانە دەکات کە، دوای بوژانەوە دەگەڕێنەوە کە تایبەتە بە ئەزموونەکانی 'نزیکبوونەوە لە مردن'.

(١٥٪) ی ئەوانەی گەڕاونەتەوە لە مردن، باس لە ئەزموونەکانیان دەکەن.

لە ناوەڕاستی حەفتاکانی سەدەی ڕابردوو، واتە لە ساڵی (١٩٧٥) ی زایینی پزیشک و فەیلەسوف و زانای بەناوبانگی ئەمریکی 'رایموند مودی' کتێبێکی زۆر گەورە و سەرسوڕهێنەری نووسی لەسەر ئەزموونەکانی نزیکبوونەوە لە مردن بەناوی 'ژیان لە دوای ژیان' د.ڕایمۆند مودی پێشەنگی ئەو زانا و ئەکادیمستانەیە کە لێکۆڵینەوەی دەیان ساڵەیان هەیە لەسەر ئەزموونەکانی 'نزیکبوونەوە لە مردن' 'NDE'.

ئەوانەی هەڵگری بیری بێباوەڕین بوون دەیانوت، هیچ کەسێک لەنێو گۆڕ و لەنێو ڕۆژانی قیامەتەوە نەگەڕاوەتەوە.

بەڵام ئێستا لە ڕۆژئاوا بە زانست سەلمێنراوە و چەندەها گۆڤار و لێکۆڵینەوەی زانستی وەک 'لانست' کە زۆر زانستیە و لەلای زاناکان جێگەی باوەڕ و پایەی زانستیە ئەم ئەزموونانە باس دەکرێت و بڵاو دەکرێتەوە.

'لانست' گۆڤارێکی وەرزی تایبەتە بە نەخۆشیەکانی منداڵان، چەندین ئەزموون و حاڵەتی زۆریان تۆماکردوە و بە زانستیش سەلماندویانە، کە لە نەخۆشخانەکاندا ڕوویان داوە.

له لایەن مادی و مولحیدەکانیشەوە هەوڵێکـی زۆری بـێ بنەمـا هەیە بـۆ ئەوەی ئەم ئەزموونانە بە مادی پیشان بدرێت وەک کەمی ئۆکسجین کە دەچێت بۆ دەماغ و دەبێـتە هۆکاری ئەم دیاردانە، وەک ئەو حاڵەتانەی کە فڕۆکەوانەکـان لە کـاتی فـڕین و کەمـی ئۆکسجین بۆیان دروست دەبێت، یان هەندێک وزە بەخش و ئـارام بەخـش و کیتـامین لە کاتی بەنج و شتانی لەم جۆرە، بەڵام ئەم بە لاڕێدا بردنانە هـیچ لە بنەڕەتـی پرسـەکە ناگۆڕێت، کە دیاردە هیچ پەیوەندیەکی بە مادیگەرایی و بواری فیزکی بونەوە نیە.

مادیەکان دەڵێن لە زیـاد ڕژانـی مـادەی 'انـدوفینات' لە مێشـکدا و بەرزبـوونەوەی شەپۆلەکانی 'گاما' ئەم حاڵەتە دروسـت دەبێـت، چـونکە ئەوانەی یۆگـا دەکەن نزیـک دەبنەوە لە مـردن، ئەم بیـانوانە خـۆ لادانێکـی بـێ مانـایە لەوەی کە نایانەوێـت دان بە ڕۆحـی بـوونی ئەم دیـاردەیە دابنـێن، مادیەکـان بەوە زۆر تەنـگەلان و کەم بڕسـت دەردەکەون کە ئەوانەی ئەم ئەزموونەیـان بینیـوە هەنـدێکیان هەواڵـی داهـاتوو دەدەن، شتەکانیان بیرناچێتەوە دوای دەیـان سـاڵ، نابینـای زکـماک شـتان دەبینێـت و دوایـی دەیگێـڕێتەوە، هەواڵ لە شـوێنی زۆر دور دەدەن، شـتانی نەبیـنراو دەبیـنن، ئاسـۆی بیرکردنەوە و تێڕوانینیان دەگۆڕێـت، هـیچ نیشـانەیەکی زینـدۆتیان نامێنێـت ئینجـا ئەم دیـاردانە دەبیـنن، داهـاتووی زۆر دوور و ڕابـردووی زۆر دوور و ئێسـتای لە شـوێنی خۆی زۆر دور دەبینن و بەو جۆرەشـە، لە شـوێنی بەرزەوە لاشـەی خۆیـان دەبیـنن... دەیان و سەدان شتی تر کە هەرگیز پێودانگەکانی مادیەکان توانای لێکـدانەوەیان نـیە و ناچارن تەسلیمی واقعی ڕاستەقینەی ئەم دیـاردە و ئەزموونـانە بـبن ئەگەر بیانەوێـت!!

پرۆفیسۆر 'ملڤن مـۆریس' لەگەڵ چەنـد هاوکارێکیـدا کە هەشـت زانـای پسـپۆڕبون، ماوەیەکی دورودرێژ لێکۆڵینەوەیان ئەنجـام دا و لە گۆڤـارێکی پزیشـکی کە لە بـواری منداڵاندا بڵاوکراوەیان هەیە دەڵێن:

یەکەم: بەسەرهاتەکەی کە لە 'کیم کلارک' ەوە وەریگرتبـوو، کە هـاوڕێی خوێنـدنی بوو، تایبەت بە چارەسەری دەروونی زانستی شۆکەکان'.

'کیم کلارک' باسی نەخۆشێك دەكات كە لە نەخۆشخانە بینیـویەتی، ئەو نەخۆشـە توشی کێشەیەک بووە لە دڵیدا و، پاشـان مـردوە و لە دوای هەفـتەیەک گەڕاوەتەوە بـۆ ژیان، ئێستا دکتۆرە 'کیم کـلارک' چارەسـەری دەروونـی بـۆ دەکـات لە ئەنجـامی ئەو گرفتە دەروونیانەی بۆی دروست بووە.

'د. کیم کـلارک' دەڵێـت: ئەوەی بـوبە مـایەی سەرسـوڕمان بـۆ مـن ئەوە بـوو، کە نەخۆشـەکە نە زۆر و نە کەم ئامۆژگـاریە دەروونیەکـانی منـی بەلاوە گرنـگ نەبـوو، نەخۆشەکە زۆر بە تامەزرۆیی و شەوقەوە دەیویست باسـی ئەزمـوونی نزیکبـوونەوە لە مردنەکەی خۆیم بۆ بکات، منیش بوارم بۆ کردەوە و وتـم فەرمـوو: نەخۆشـەکە وتـی: من لە جەستەی خـۆم دەرچـووم و بـووم بە ڕۆحێکـی تەواو، زۆر بە وردی باسـی ئەو چارەسەر و سەرقاڵیانەی کرد کە لیژنە پزیشکیە تایبەتەکە بەوەوە سەرقاڵ بوون!!

چییان کرد بوو گێڕایەوە زۆر بە وردی!!

لەوەش زیاترم بینی دەفڕیم بە ئاسماندا، هەموو نەخۆشخانەکەم بینی بە تەواوەتـی، لەگەڵ دەرەوەی نەخۆشخانەکە، زۆر بە ئازادی دەسوڕامەوە بە بێ سنوور.

لە قـاتی پـانزەهەمی نەخۆشـخانەکە نوسـینگەکەی تـۆم 'د.کـلارک' بینـی، ژور و پەنجەرە و شتانی ناو ژورەکەت ئاوا و ئاوابوو...

لەسەر دۆڵابە بەرزەکەی ژورەکەت تاکێ پێڵاوی لێ بوو، "دکتۆرە کـلارک دەڵێـت: هەموو ئەوەی وتبـوی بەو جـۆرە بـوو، بەڵام تـاکێ پـێڵاو نەمـدەزانی وایە یـاخود نـا، چـونکە دۆڵابەکە بەرزبـوو لەبەر ئەوە شـتێکمان هێنـا و سـەرکەوتین و سـەیری سـەر دۆڵابەکەمان کرد، بەو جۆرە بوو تاکێ پـێڵاوی تیـابوو لە کاتێکـدا ئەم نەخۆشـە لەوەو پێش تەنانەت ژورەکەی منیشی نەبینی بوو!!"

'بـانی کـلارک' یەکەم مـرۆڤەکە دڵـی دەسـکردی بـۆ دانـراوە، ئەم ئەزمـوونەی 'نزیکبوونەوە لە مردنی' بینیوە، وە لەسەر جێگا مرد، باسی ئەوەشـی کـرد کە کـاتێ ئەو لە جەسـتەی چوبـوە دەرەوە، خێـزانەکەی لە ڕاڕەوی نەخۆشـخانە و لە دەرەوەدا چـی

کردوە، چی وتوە، چ جۆرە خەفەتێکی هەبووە، ئەوە بوو ژنەکەی زۆر سەری سوڕماو وتی بە تەواوەتی بەو جۆرە بوو!!

هەزاران ئەزموون و چیرۆکی ئەم مرۆڤانە هەیە و لە بەرزترین خاڵەوە بۆمان دەگێڕنەوە، لە کاتێکدا ئەمان بێ هۆش و مردووبوون، کە ئەم بینینانە بۆ زیندوویەکی مادی دەستەبەر نابێت چ جای مردوویەک ئەگەر بینینەکانی ڕۆح و دەرەوەی فیزک و مادە نەبێت؟!

زانا مادیەکان باس لەوە دەکەن کە بە شێوەیەکی تر وەکو بەهۆی کارەباوە ئەم حاڵەتە دروست دەکرێت بۆ مرۆڤ، ئاساییە کە لە ئەنجامی تاقی گەوە بەرهەم بهێنرێت، بەڵام هەلوەسە و شتانی هەڵیت و پڵیتی لێ پەیدا دەبێت!!

نەوەک ئەم بینن و مشاهدە زۆر ورد و بەرفراوانە کە لەلایەن ملیۆنەهاوە دەبینرێت.

'شێلادریک' کە زانا و فەیلەسوفێکی بەریتانیە و ئەم ئەزموونانە ناو دەبات بە بە ئاگابوونێکی دوور و درێژ 'الوعي المعتد'، ئەم پیاوە دینداریش نیە و دەڵێت: من پەیوەندیم بە ئاینەوە نیە و من زانایەکم کە ئەوە دەڵێم!

دەربارەی ئەزموونەکان بخوێننەوە شتانێکی زۆر زۆر سەیر دەبینن، ئێمە بێجگە لەم جەستەیە خاوەنی هۆشیاریەکی زۆر بەرفراوانین و شوێن و کات و زەمان بەشی ناکات و سنورداری ناکرێت.



## لێکۆڵینەوە زانستیەکان



یەکێکی تر لە 'لانست' دا بڵاوکراوەتەوە سیانزە ساڵ لە دە نەخۆشخانەدا لێکۆڵینەوە لە دیاردەکانی 'نزیکبوونەوە لە مردن' کراوە و زۆرێک لە حاڵەتەکان خراونەتەوە بەر باس و لێکۆڵینەوەی زانا و پزیشکەکان.

کە هەموو لێکۆڵینەوەکان دەڵێن تەفسیری مادی بۆ ئەم دیاردە و ئەزموونانە مەحاڵە و ناکرێت!!

پێویستمان بە لێکدانەوەیەکی زیاتر ڕاستگۆیانەترە لەوەی کە بە مادی تەفسیری بکرێت!!

یەکێک لەو حاڵەتانەی کە لەلێکۆڵینەوە هۆڵەندیەکاندا هاتوە، باس لەو نەخۆشە پیرە دەکات کە لە دوای نزیکبوونەوە لە مردن گەڕایەوە، لە دوای چەند ڕۆژێک!!

تیمی بوژانەوەی دڵ زۆر سەریان سوڕما کاتێک پیاوەکە پێی وتن: کە چیان کردوە و چۆن مامەڵەیان لەگەڵی کردوە وەختێ ئەو مردوە؟!

پێی وتن: فڵان دکتۆر ددانە دەستکردەکانی دەرهێنا و دای بە فڵان پەرستار و ئەویش لە فڵان شوێندا داینا.

ئیتر پزیشکەکان زانیان کە پرسەکە زۆر لە ئاستێکی بەرز و گرنگی پێدانـدایە. زانیان کە شتێک هەیە زۆر گەورەترە لە مرۆڤی مادی، کە لەم مرۆڤە جیا دەبێتەوە و هەموو شتەکان بە ئاگاییەکی تەواوەوە دەزانێت و ئاگادارە و دەبینێت.

زانستی سەردەم پێویستە واز لە پێچە بەدەورە بێنێت، تەنگیەکی گەورەیە خەڵکی فریوبدرێن و ڕاستیەکانیان بۆ باس نەکرێت.

پرۆفیسـۆر 'ملڤـن مـۆریس' کە پسـپۆڕی نەخۆشـیەکانی منـاڵان و پسپۆڕیشـە لە دیاردەی 'ئەزموونەکانی نزیکبوونەوە لە مردن' 'NDE' ئەم پزیشکە بەناوبـانگە شـتێکی سەیر دەربارەی مناڵان و ئەزموونەکان باس دەکات و دەڵێـت: ئەو منـاڵانەی لە خـوار دوانزە ساڵانەوەن کە 'نزیکبوونەوە لە مردن' دەبینن، هەمان شـتانی گەورەکـان دەبیـنن، بـێجگە لە یەک خـاڵ، گەورەکـان کە بە بەرزەخـدا تێـپەڕ دەبـن و تەکلیفـی شـەرعیان دەکەوێـتە سـەر، تەواوی چـاکە و خراپەکانیـان پیشـان دەدرێـتەوە، بەڵام منـاڵان ئەم پیشاندانی کردەوانەیان نیە!!

کە ئەمەش هەمـــان دەرەنجـــامە کە فەرمایشـــتەکانی خـــوای گەورە لە قورئـــان و حەزرەتـی رسـول الـلە ﷺ لە فەرموودەکانیـدا ئاماژەیـان پـێ دەکـات کە منـاڵ هەتـا پێنەگات هیچ ئەستۆ گرتنێکی شەرعی لەسەر نیە!!

پیاوێـک لە پـردێکەوە کەوتە خـوارەوە 'هـاوڕێی دکتـۆر عـدنانە' خـۆی گـرتەوە بە شیشێکەوە و نەمرد، بە لوتفی خوایی ڕزگاری بوو، پیاوەکە توشی شۆك بوبـو کە وتـی پێمان: شتێکی زۆر سەیرم بەسـەرهات، لەو چرکەسـاتەی کە مـن لە نێـوان ئاسـمان و زەویدا بووم، لە نێوان ژیان و مردندا بووم، هەموو کردەوەکـانی ژیـانی خـۆمم پیشـان درایەوە لە یەک چرکەدا، من ئێستا ئەزانم لە ژیانمدا چ نوێژێکم چووە و نەمکردووە!!

دەستم کردوە بە گێڕانەوەی نوێژە فەوتاوەکانم!!

مـاوەیەک لەمەوپـێش کتێبێکـی زۆر سەرسـوڕهێنەرم خوێنـدەوە، کە نوسـەرەکەی پزیشـکێکی ئەمریکـی بەناوبـانگە، هەروەهـا لێپـرسراوی بەشـی بـوژانەوەی دڵە لەو نەخۆشخانەیەی کە کاری تێدا دەکات، کە ئەویش دکتۆر 'سام پارمینـا' یە و کتێـبەکەی بەناوی سڕینەوەی مردنە 'محو الموت' ئەو زانسـتەی کە سـەر لەنـوێ سـنوری نێـوان مردن و ژیان دەکێشێتەوە.

بەشی یەکەمی کتێبەکە زۆر وروژێنەرە و سامت دەکات، کاتێ دەیخوێنیتەوە خەریکە دڵت لە ئاستیدا بوەستێت.

لە یەکەم سەر دێڕدا باسی نەخۆشێک دەکات کە دەچێت بۆ باشترین نەخۆشخانەی نیۆرک لە بوژانەوەی دڵدا، نەخۆشەکە ئەمریکی یە و بە ڕەگەز ئیتاڵیە، ناوی 'جۆتێرا لۆسیە' ئەم پیاوە بە ئۆتۆمبیلەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە، هەست بە ئازاری سەرسنگی دەکات و عارەقێکی زۆر دەکاتەوە، پەیوەندی بە ژنەکەیەوە دەکات و ئەویش پێی دەڵێت بە خێرایی خۆت بگەیەنەرە نەخۆشخانە، هاوڕێیەکی بە خێرایی دەگاتە لای و دەچنە بەشی فریاکەوتنی خێرا 'E'، ئیتر لەوێ دوای هەوڵێکی زۆری پزیشکەکان دەمرێت و مێشك و دڵ و هەناسە هیچی نامێنێت...

باشترین تیم لە ماوەی (٤٧) خولەکدا فریاکەوتنی خێرا و بوژانەوەی دڵی بۆ دەکەن، (٤٧٠٠) پەستانی سەرسنگی بۆ دەکەن و هەشت جار کارەبای لێ دەدەن و ژمارەیەکی زۆر ئەمپولی ئەدرینالینی ڕاستەوخۆی بۆ دەکەن و جەستەی سارد دەکرێتەوە، بە تایبەتی بۆ دابەزاندنی پلەی گەرمی مێشك و جەستە بە گشتی، هەتا زیان کەم بکەنەوە لەسەر خانەکانی مێشکی!!

دوای 'سی' خولەك دڵی دەستی کردەوە بە لێدان.

بۆیە خێرا قەستەرەیان بۆ کرد، هەمدیسان مردەوە و هەموو شتێک وەستایەوە، دوای پانزە خولەکی تر گەڕایەوە، دوای ئەوە خستیانە حاڵەتی کۆماوە 'غیبوبة' واتە بێ هۆشی دەسکردەوە، چوار ڕۆژ بەبێ هۆشی مایەوە، دوای ئەوە هەوڵیان دا جارێکی تر هەستێتەوە و هۆشی بێتەوە!

ئەم پیاوە گەڕایەوە، بەڵام دەتوت خەڵکی ئەم جیهانە نیە، سەری سوڕمابوو، بانگی 'دکتۆر سام بارینایان' کرد کە دکتۆر سام بەناوبانگە لەسەر ئاستی وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا و تەنانەت جیهانیش دەربارەی لێکۆڵینەوەکانی 'نزیکبوونەوە لە مردن'، دکتۆر سام کتێبی تایبەتی هەیە لەسەر ئەزموونەکان و لە حەڤدە دەزگای تایبەت بەم حاڵەتە

'نزیکبـوونەوە لە مـردن' کاردەکـات و هاوکـارە، دکتـۆر سـام دەربـارەی ئەم نەخۆشـە دەڵێت:

لە ڕۆژی چوارەم هاتم و چاوم پێ کەوت و باسی ئەمونێکی زۆر سەرنج ڕاکێشـی بۆ کردم، نەخۆشەکە دەڵێت: من مردبووم، بەڵام ئاگادار بووم دەربارەی هەمـوو ئەوەی لە چوار دەورم ڕووی دەدا، هەرچیەکیان وت و هەرچیەکیان کـرد بە هەمـووی ئاگـادار بووم، پزیشکەکان بە جوڵەی دەستیان هەرچیەکیان دەکرد من هەموویم دەبینی!!

ئەو ئەزموونەی پیایدا تێ دەپەڕیم بە تەواوەتی منی گۆڕی، ئامـانجی منـی گـۆڕی، ژیانێکی نوێم بۆ داهاتووم دۆزیەوە، ئێستا دەزانم کە چۆن بم!

من وەکو مێردێـک دەبێـت چـۆن بـم، وەک بـاوک، وەک هـاوڕێ، وەک مرۆڤێـک دەبێت چی بکەم!!

دکتۆر سام دەڵێت: نموونەی ئەم پیاوە، هەروەکو خەڵکی ترە، کاتێک دەگەڕێـنەوە و گرنگی زۆر بە ماڵی دونیا نـادەن و، زۆرتـر کەسـانێکی بەخشـندە دەبـن و، سـەرقاڵی کاری خێر دەبن و کەمتر توشی گوناه و تاوان دەبن و خۆیان لە نەخۆشیە دەروونـی و کۆمەڵایەتیەکان دەپارێزن.

ئەم پیاوە وتی: سەرتاپا سپیەکی ڕۆحانی و زۆر جـوانم بینـی، جەسـتە و شـکڵێکی تایبەتی نەبوو، زۆر زۆر خۆشەویست بوو، هەستم بە ئـارامی و مـوحیبەت و دڵنیـایی دەکرد لە گەڵیدا.

من زۆر دڵخۆشم بە ئەزموونەکەم، چـونکە دەزانـم ئەگەر بە باشـی بگەڕێـمەوە بـۆ ئەوێ 'بەرزەخ' دەچمە جیهانێکی بێ وێنە لە خۆشی و بەختەوەریدا.

بۆیە هیچ ترسێکم لە مردن نیە!!

دیارە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: 'الموت تحفـة المـؤمن' مـردن خەڵات و دیـاری و شتێکی گران بەها بۆ باوەڕدار و موسوڵمان.

ئەی حەزرەت ﷺ نافەرموێت: "دونیا زیندانە بۆ ئیماندار و بەهەشتە بۆ کافران".

'ڕایمۆند مۆدی' دەڵێت: مردن گواستنەوەیە ماهیەتە ڕاستەقینەکەت نامرێت و بوونی هەمیشەییە، دەڕۆیت بۆ جیهانێکی فراوانتر و جوانتر. وریابە ئەو گومانە دور لە ژیریە نەبەیت وابزانیت خوای گەورە ناتوانێت تۆ و خەڵکی تر زیندوو بکاتەوە!؟!

دکتۆر ڕایموند دەڵێت: ئەوانەی لێکۆڵینەوەم لەگەڵ کردون واتە 'ئەزموونداراکان' مردن دەچوێنن بە یەکێک لەمانە، هەندێکیان دەڵێن: مردن ڕزگار بوونە لە زیندان و گەیشتنە بە ئازادی.

هەندێکیان دەڵێن: ژیانی دونیا زیندانە....

'صدق رسول الله' ﷺ کە دەفەرموێت: "الدنيا سجن المؤمن و جنة الكافر".

ئیمامی گەورەی ئومەتی ئیسلامی، ئیمام أبو حامد غەزالي و زۆرێکی تر لە زانایان و پیاو چاکان و عارفەکان دەفەرموون زۆرینەی دروست کراوەکانی خودا لە ژێر سێبەری ڕەحمەتی زاتی میهرەبانیدان.

کەمینەیەک بەر خەشم و غەزەبی خوایی دەکەون، کە ئەوانەش ئەو کافرانەن کە سزا و ئازاری بەندەکانی خوایان داوە.

کەمێک لە خەڵکی کە گەڕاونەتەوە سزایان بینیوە، کە هەندێکیان دەگرین و دەڵێن: هەرچەندە بیرم دەکەوێتەوە خۆم پێ ناگیرێت و دەگریم. کە هەندێکیشیان بێ باوەڕبوون، وەک پزیشکە ڕووسیەکە باسمان کرد و بب باوەڕدار و ئیمانی بە قیامەت و زیندووبوونەوە هێنابو کە دەڵێت: کاتێک گەڕامەوە لە مردن جۆرێک لە زانست فێربووم، کە نازانم بڵێم چۆنە، تەنانەت چارەسەری سەرەتانیشی پێ دەکەم!!

فەیلەسوفی گەورەی ئینگلیزی بێ باوەڕ و مولحید 'الفردجي آيا' کە دراسەی 'باری ژیریی' کردوە و خاوەنی کتێبی 'اللغة و الحقيقة و المنطق' ە، یەکێکە لە فەیلەسوفە بەناوبانگەکانی 'وەضعیەتی مەنطقي'، زۆر بە سادەیی و ئاسایی دەڵێت: هەچ شتێک

بەڵگەی مـادی و سروشـتی لەسـەر نەبێـت ئێسـتا و لێـرە، ناکرێـت مانـای هەبێـت و وجودی هەبێت...

کە هەمـوو جیهـانی نادیـار و قیـامەت و خـوا و فریشـتەکان دەگـرێتەوە، ئەمەش فەلسەفەیەکی بێباوەڕی وێرانکەرە.

ئەم زانا و فەیلەسوفە بەناوبانگە 'الفردجي آيا' دەڵێت: لە ساڵی (١٩٨٨) ی زاینیـدا لە کاتی نـان خواردنـدا توشـی خنکـان بـووم و کەوتـم و مـردم، دەڵێـت: ئەزمـوونی 'نزیکبوونەوە لە مردن' م بینـی، کە پێشـتر ئەو بـاوەڕە ئیلحـادیەی کە هەمبـوو بە هـیچ شتێک درزی تێ نەدەبوو، بەڵام کە ئەزمـوونەکەم بینـی بیروبـاوەڕی گـۆڕیم و نـاتوانم ئیمان بە زیندوو بوونەوەی دوای مردن نەهێنم!!

خوای گەورە دەفەرموێـت: ﴿إِنَّ الَّـذِينَ آمَنُـوا وَعَمِلُـوا الصَّـالِحَاتِ يَهْـدِيهِمْ رَبُّهُـمْ بِإِيمَانِهِمْ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهِمُ الْأَنْهَارُ فِي جَنَّاتِ النَّعِيمِ﴾ (يونس: ٩)

واتە: بـێ گومـان ئەوانەی باوەڕیـان هێنـاوە و کـردەوەی باشـیان کـردوە، خـودا ڕێگـای ڕاسـت و هۆکـاری پیـرۆزی و بەختەوەریـی دونیـا و قیامەتیـان پیشـان دەدات بەهـۆی نـووری ئەو ئـیمانەی لە دڵیانـدایە و، لە قیامەتیشـدا لە بەهەشـتە پـڕ لە نـاز و نیعمەتەکانـدا ڕائەبـوێرن و جۆبـاری جـوان لە بەرپێیانـدا دەڕوات و بە خۆشی ئەژین.

موئەسرین دەفەرمـوون: بـاوەڕدار، کاتێـک دەچێـتە بەهەشـتەوە، بە شـوێنی خـۆی کۆشکی خەڵاتکراوی شارەزاترە هەتا بە ماڵەکەی دونیای.

هەر لەگەڵ یەکەم چرکەسـاتی مردنیانـدا دەڵـێن: وەک ئەوەیە کە ئـێمە لە مێـژەوە لە ماڵی خۆمان دورین و دەگەڕێینەوە بۆ بنەڕەتیەکەمان.

ئەم زانایە دەڵێت: چەندین شتی زۆر سەرسوڕهێنەرم بینی کە بـاوەڕ پـێ کردنـی بـۆ کەسێک نەیبینیبێت ئەستەمە!

هیچ بە پێویستی نازانم بۆ کەسی تری باس بکەم، ئەوە دیاریەکی خوایی بوو بۆ من هەتا لە گومڕایی و ئیلحاد دەرباز ببم.

کاتێ لە ڕیزی مردواندا بووم خۆم بینی کە لە جەستەکەم هاتمە دەرەوە، بەناو ڕووبارێکی تەنگەبەردا ڕۆشتم، لە کەناری ڕووبارەکەدا چەندین کەسم بینی کە دەمناسین و سڵاو و خۆشەویستیان بۆ دەربڕیم، ئەو کچەشم بینی کە لە دوا ناوەندیدا خۆشم دەویست، لە کۆتایی ڕووبارەکە نوور و ڕووناکیەکی سپی زۆر بەهێزم بینی، بەڵام هیچ ئازار بەخش نەبوو، پڕ بوو لە موحیبەت، هەستێکی زۆر خۆش و سەرسوڕهێنەرت بۆ دروست دەکات، داتدەپۆشێت، ئەوە بە جۆرێك بو لە ژیانمدا ئەوە یەکەم جارە باسی دەکەم[1].

هەر یەکێک لە ئاینە جیاوازەکان تەفسیری خۆیان و ڕێگەی خۆیان هەیە بۆ لێکدانەوەی 'نزیکبوونەوە لە مردن'، بەڵام ڕاستیەکەی یەک شتە و وەک خۆی دەمێنێتەوە.

زانیم کە ئەگەر بڕۆم بەرەو ئەو نور و ڕووناکیە ئیتر ناگەڕێمەوە بۆ ژیانی دونیا!

ئیتر وا گومان دەبەم کە هاوارم کرد و گەڕێنرامەوە بۆ دونیا.

بۆیە بەڕاستی پەشیمانم کە هاتمەوە!

کاتێك کتێبەکەی دەخوێنیتەوە ناتوانیت دەستنەکەیت بە گریان.

---

١-بەشێک لەوانەی ئەزموونی نزیکبوونەوە لە مردن دەبینن، ڕووبارێک دەبینن لە جیاتی تونەیلە دوور و درێژەکە.

کە ئەم مرۆڤە بێباوەڕە چەندە گۆڕاوە و بووە بە کەسێکی چاکەکار، سەروەت و سامانەکەی لە ڕێگای خێر و چاکەدا بەخشی، وازی لە هاوڕێ دووڕووەکانی هێنا و لە کانگای ژیان تێ گەیشت.

'ئەفلاطون' بەشێك لە کتێبی 'جمهورية أفلاطون' دا، باسی ژیانی قیامەت و دوای مردن دەکات، بەسەرهاتێک دەگێڕێتەوە کە سەربازێک دەکوژرێت و دە ڕۆژێک نانێژرێت و دڵنیا دەبن کە مردوە.

پاش دە ڕۆژ دەیانەوێت بینێژن، زیندوو دەبێتەوە، و باسی ئەوە دەکات کەچی بینیوە.

کوڕەکەی شێخ محمد متولي شەعراوی دەگێڕێتەوە، چوار ڕۆژ پێش کۆچی دوایی بە مناڵەکانی وتوە کەی دەمرێت!!

شێخ موحەمەد متولي ڕۆژی چوار شەممە دوای نوێژی بەیانی هاواری کرد و وتی: نا... نا...

کوڕەکەی گوێی لێ بوو دەیوت: من نا ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، من کێم هەتا تۆ تەشریف بێنیت یارسول اللە ﷺ، پاشان فەرمووی: أشهد أن لا إله إلا الله و أنك عبده و رسوله... دوای ئەوە کۆتا هەناسەی لەگەڵ کێشانی گیانیدا پێچایەوە.



# شێخ ڕازی

١٢٢٠  ١٣٣٠

مادام ئەهلی موحیبەت عەودالّی یەك خۆشەویستن، ئیتر بەڵای هەمیشەیی و ئازاری بەردەوام غەم هاوڕێی تەمەنیان دەبێت، کە دەبنە ڕێبوار و دەیزانن و، جۆری ژین سازیان دەگۆڕێت و هەناسەی ساردی خەڵکی تر لێرە دەبێتە دڵ گەرمیان، ئازار دەبێتە چێژ، درك بێزراو نییە و خونچەیە، مەینەتی و بەڵا ڕێگەی خۆشەویستیە، ئیتر هیچی ئێرە لە هەموو شتی خەڵکی دونیا پڕ بایەخترە!!

کە بەڵادار بوویت بە ڕۆژگارێك، ئادابی ئیسلامەتی و، ڕەووشتی خاوەن مورووئەتی نەفامی و خەون و خولیای مەردانەی تیا نەبوو، ئەوکات لە گەنجینەکانی ڕەحمەتەوە بارانی میهرەبانی بەسەر کیشوەری تینوێتیدا دەبارێت.

ئەگەر زیکرت لە لوتکەی بێ ئاگایدا بوو، بێئاگایی نەتۆران، ئەوا دەستی بێئاگایەکت گرتووە و بەرزە فڕ مەبە چونکە لەو باشتر نیت. تەقوادار وەك دەردەدار وایە، لە بینینی تەقوا و لە خواترسی خۆی سڵ دەکاتەوە، گەر بە دڵ و دەست سەرپێچی کار کار بیت و بە زوبان تەوبەکار، چی بە چی دەکەیت؟!

خواناس تەوبە لە پەرستشەکانی دەکات چ جای بێئاگایی و حاڵەتی و نەفامیەکانی، بە پێوانی پێگەیشتووانەی خۆت و ئاوەز و ژیریت، خەڵکی پێوانە مەکە، تیادەچیت، دەستی سواڵکەریت مەشارەوە نەوی بکە، فەزڵی خەڵکی و ئیفلاسی خۆت دەربخە.

قەدەر دەتکاتە هاوسەفەری پیاوچاکان، ونی مەکە و خۆت لە گێلی مەدە و ورێنەکانی خۆپەرستی لە کەللەی خۆت دەربکە و، چاو هەڵبڕە و مەردانی خوا ببینە وا بە سواری ئەسپەوە هاتوون بە هاناتەوە.

دکتۆر عبدالرحمن گەیلانی دەڵێت: من یەکێکم لە گەورە پزیشکە ناودارەکانی نەشتەرگەری ئێسك لە 'قەصری عەینی' لە میسر.

ماڵی باوکم دەوڵەمەندن، کە کۆلێژی پزیشکیم تەواو کرد، منیان نارد بۆ زانکۆی 'کامبردیج' لە بەریتانیا هەتا ماستەر و دکتۆرا و زەمالەی ئەویٚ بێنمەوە.

منیش لە ئێسکدا پسپۆریم بەدەست هێنا، زیاتر لە دە ساڵ لە بەریتانیا مامەوە، لەگەڵ شێوە ژیانی ئەوێدا ئاوێتە بووم، نەریت و هەڵس و کەوت و تێروانینم بۆ جیهانبینی گۆڕا و بووم بە کەسێکی ڕۆشنبیر و، وەك ئەورووپیەك بیرم دەکردەوە، دیوارێکی کۆنکرێتیم لە عەقڵانیەت و بیرکردنەوەی ژیری بۆ خۆم دروست کرد، ڕێگەم بە ڕێکەوت نەدەدا خۆی بخزێنێتە کاتەکانی ژیانمەوە، ئەم عەقڵانی بوونە چێژی پیٚ دەدام بە تایبەتیش لە میسر، ڕەنگە هۆکارەکەش ئەوە بووبێت کە من لە تەمەنێکی کەم و گەنجێتیدا ڕووم لە ئەورووپا کرد و زۆر زوو خۆم گونجاند لەگەڵ ژینگە نوێیەکەمدا بەرهەڵستی جۆری ژیانی ئەوانم نەدەکرد.

کاتێك گەڕامەوە بۆ میسر، دامەزرام بە مامۆستای زانکۆ لە 'قصر عەینی' وەك مامۆستای نەشتەرگەری ئێسك. من زۆر جدی بووم، ئاسانکاری و ناسراوی و خزم خزمێنەم نەدەزانی و هەگیز بەرتیل و واستەم قبوڵ نەدەکرد. هەندیٚ لە هاوڕێکانم وشەی 'جلیاط'یان بۆ بەکاردەهێنام، کە لە زمانی میسریەکاندا بە واتای بیٚ تام و بیٚ زەوق بەکاری دێنن!!

هەرگیز ڕوپامایم هیچ کەسێك نەدەکرد، چروك بوون هەتا دوا پلە نەریتێکی ئینگلیزەکانە و بە تەواوی منیش پێچەوانەی بووم و زۆر سەخی ڕەفتار بووم و لە ئینگلیزەکان نەدەچووم، تەنها ئەم ئاکارەم لە ڕۆژهەڵاتی یەوە بۆ مابوویەوە.

لەگەڵ هاوکار و هاوپیشەکانم خۆشەویستی و شکۆم پێکەوە گریٚ دابوو، بەو جۆرە مامەڵەم لەگەڵ دەکردن، ژیانی کەسێتی تایبەتیم هەرگیز جێگەی مامەڵە کردن نەبوو.

حەزم لە نوکتە و شۆخی کردن و سادەیی بوونی ژیان نەبوو، لەگەڵ ئەم هەموو بەند و باوەدا، خۆشەویست بووم لەناو قوتابیان و پزیشك و هاوکارەکانمدا، چونکە زانست و ماڵم دەبەخشی و چروك نەبووم، زانیاریەك کەسێك پێویستی بوو بێت بە هەموو هێزم درێخیم لێ نەکردووە.

من موسوڵمانێکی لاسایی بووم، ڕۆژووم دەگرت، حەجم کردووە و قورئانیشم دەخوێندەوە، کچە مامێکی خۆم هێنا و دەساڵ تێپەڕی بەسەر هاوسەرگیریەکەماندا و خوای گەورە مناڵی پێ نەبەخشین، هەوڵ و خەرجیەکی زۆرمان کرد، لە میسرـ و وڵاتانی تر زۆر تێکۆشاین هەتا مناڵێك بۆ خێزانەکەمان زیاد بکەین، بێ سوود بوو. ئیتر من ملکەچ بوم بە قەدەری، بەڵام بەردەوام ئەشکەنجەی دەروونی منیش و خێزانیشمی ئازار دەدا، کە ماڵەکەمان دەنگی پێکەنین و گریانی مناڵێکی تێدانەبوو، ئیتر من بە خێزانم دەوت کچم، ئەویش بە منی دەوت کوڕم وەرە، هەتا جۆرێك لە مناڵی خەیاڵی لە ماڵەکەماندا دروست بکەین!!

بانگێشت نامەیەکم پێ گەیشت لە کۆنگرەی نەشتەرکارانی ئێسك لە زانکۆی 'أسیوط'، بۆیە بە مەبەستی گەشتن بە کۆنگرەکە بە شەمەندەفەری نوێ سەرکەوتم و بابەتەکانی خۆم ئامادە کرد و بردم لەگەڵ خۆم، لەناکاو کەسێك لە تەنیشتمەوە دانیشت، بە ڕواڵەت و ڕوخساریدا وەك یەکێك لە جوتیارەکانی ئەو ناوچەیە دەچوو، یاخود کەسێکی دەشتەکی و گوند نشین، گەنم ڕەنگێکی چاو گەورە بوو، جسداشەیەکی خاکی لەبەردابوو، سەری بە چەفتە و شاڵێکی سپی داپۆشی بوو، خۆی بۆنخۆش کردبوو بە بۆنێکی تیژ! خۆی دا بەسەر دار گۆچانەکەی دەستیدا ئینجا توانی هەنگاو بنێت و دەستەکەی تری لەسەر شانی کەسێکی تر بوو، کە لە دواییدا زانیم ئەو کەسە کوڕی بوو، بە لێبوردنەوە داوای لێ کردم کە ئەو شوێنە بەجێ بهێڵم هەتا لە تەنیشت باوکیەوە دابنیشێت، بەڵام ئەو نەیدەزانی داوا لە کێ دەکات!!

بەرپەرچم دایەوە و قبوڵم نەکرد و وتم: ئەوە مافی خۆمە، تۆ دەتوانیت دوو شوێن بگریت بۆ خۆتان.

کوڕەکە ویستی دەنگ بەرز بکاتەوە، بەڵام باوکی ئاماژەیەکی بۆ کرد و بێ دەنگ بوو، ئەم پیاوە دانیشت و دەستی کرد بە خوێندنی دووعا و صلاوات و ویردی جیاواز، منیش هەستم بە وەرس بوون دەکرد، چونکە نەمدەتوانی بەباشی بیرم لە لای خوێندنەوەکەم بێت.

بە تووڕەییەوە سەیرم دەکرد، هەروەکو ئەوەی هەستم پێ بکات، بە ڕوو خۆشیەکەوە پێی وتم: دەنگم نیگەرانی کردویت؟ زۆر ڕاشکاوانە وتم: بەڵێ، تکایە دەنگ بەرز مەکەرەوە!!

ئیتر بە هێواشی دوعاکانی دەکرد و منیش هەستم بە ئارامی کرد. لە کوت و پڕێکدا ڕۆشتە خەونێکی قوڵەوە و پرخە پرخی دەست پێ کرد.

بێزار بووم لە پرخە پرخی، بەڵام بەزەییم پیایدا هاتەوە و هەڵم نەساند، لە کوت و پڕێکدا گوێم لێ بوو بە دەنگێکی نزم دەیوت: وعلیك السلام یارسول الله ﷺ، گەورە و سەردارم خۆشەویستی خوا. بەسەرچاو قوربان خوای گەورە پاداشتت بداتەوە بە هەموو خێرێك، وعلیك السلام ورحمة الله وبركاته گەورەم قوربان.

هیچ کەس ئەم وتانەی نەبیست بێجگە لە من، وەك ئەوەی کە نەیەوێت هیچ کەس گوێی لێ بێت.

بەڵام چەکوشی مەنطق و عەقڵانی بوون لە دارستانە تاریکەکانی فیکرمەوە هاتە دەرەوە...

ڕەنگە ئەم پیاوە لە لاوەعی یەوە بدوێت، دیارە ئەمە صۆفیە و جیاوازی ناکات لە نێوان واقع و حەقیقەتدا، ئەمانە خەیاڵ پڵاون و ئەندێشە و خەیاڵیان لێ دەبێتە ڕاستی

و حەقیقەت، ئەمانە خۆیان بە ئەهلی حاڵ و دورە هەنگاو دەزانن و وا گومان دەبەن کە دەتوانن نیوەڕۆ لە مەککە بن و عەسر لە قودس!!

بۆ جاری دووەم دیسانەوە کەوتەوە پرخە پرخ.

باشە خۆ ئەم پیاوە خۆی ئەم حاڵەتە دروست ناکات ڕەنگە خەونێکی ڕاست ببینێت، ئەو ئازادە چی دەبینێت با ببینێت، من بۆچی بکەومە وێزەی، خۆ هیچ پەیوەندی بە منەوە نییە.

لە دوای تۆزێ پیاوەکە لە خەو هەستا و، ڕوخساری ئەو ڕوخسارە نەبوو کە من پێشتر بینیم، یەک پارچە ڕوخساری نوری لێ دەباری، لەو کاتانەدا چاوێک هەیە لە مرۆڤدا دەبینێت جیاوازە لەو چاوەی لە ژێر فەرمانی عەقڵدایە، بۆ ساتێك ڕوخساریم جیاواز بینی، کوڕەکەی هات و ڕوخساری عارەقاوی باوکی سڕی. گوێم لێ بوو بە دەنگی نزم بە کوڕەکەی دەوت: کوڕم دکتۆر عبدالرحمن گەیلانی لەگەڵ ئێمە سەرکەوتۆتە ناو ئەم شەمەندەفەرە، هەکا بەیانی نەشتەرگەریەکەی بۆ کردم!! ئەم دەستەواژەیە حەپەساو و سەرسامی کردم، بەڵام هەر زوو عەقڵ دەستێوەردانی کرد و وتی: ڕەنگە کەسێك لە ستافی عەیادەکەم پێی وتبن کە من بە شەمەندەفەر دەچم بۆ 'أسیوط'، بەڵام خۆ ئەم باسە لای ئەم کوڕ و باوکە هیچ قسەیەکی لەسەر نەکرا هەتا ئەم خەوەی کرد، تۆ بڵێی خەونێکی ڕوون و ڕاستی نەدیبێت؟؟؟!!

بڕیارمدا ئەم جارە من خۆم بخزێنمە ناو ئەم بابەتە و هەتا کۆتایی لەگەڵی بڕۆم، بە تایبەتیش دوای ئەوەی ناوی منی هێنا و بە ورتە ورتێ کەوتینە قسە کردن.

پێی وتم: جەنابتان لە کوێ دادەبەزن؟

وتم: لە ئەسیوط.

پیاوەکە بێدەنگ بوو، ڕووی وەرچەرخاند، ئیتر من پەرۆشی ڕوو پێدانێکی ئەو بووم، چەکوشی عەقڵانیەت خاو بویەوە لە وەشاندن، ئیتر هەندێ پرسیارم لێ کرد و

ئەویش بە کورتی وەڵامی دەدامەوە، دڵم بەوەندە ئاوی نەدەخواردەوە، بڕیارم دا دوایـن کارتی دەستم بەکاربهێنم، پێم وت: تۆ دکتۆر عبدالرحمن دەناسیت؟

وتی: نەخێر بەڵام دەچم بۆ لای.

پێم وت: من دکتۆر عبدالرحمن گەیلانیم!!

سەیری ژێر پێی خۆی دەکرد و بە عەصاکەی دەسـتی ئەرزیەتـی شـەمەندەفەرەکەی دەکۆڵی هەروەکو ئەوەی هیچ گرنگ نەبوو‌بێت بەلایەوە.

من گوێم لێیە لە جیاتی ئەوەی وەڵامی من بە حەپەسان و کەیف و خۆشـی و خـۆ نزیك کردنەوە بداتەوە، صڵاوات لە حەزرەتی رسول الله ﷺ دەدات، منی بەجـێ هـێڵا هەتا بۆ خۆم لە حەپەسان و حەیرانی خۆمدا ون ببم! بێ دەنگ بـوو، وام زانـی یـاریم پێ دەکات، ئەو دەیەوێت من ئاڵای سپی هەڵبکەم و پێشەکی خۆم بدەم بە دەستەوە.

پەتی سەبرم پچڕا و وتم: لەوە دەچێـت پێغەمـبەر ﷺ پێـی ڕاگەیانـدبیت!! پیـاوەکە داچڵەکی و کاریگەر بوو بەو وتە کوت و پـڕەی مـن و ڕوخسـاری گـۆڕا. چاوەکـانی گەش بوونەوە و سەری بەرز کردەوە و بۆ ماوەیەك بە سەر سوڕمانەوە بۆمی ڕوانی!!

بە شڵەژاوی لێی پرسیم: کێ پێی وتی، چۆن ئەمەت زانی؟!

منیش لە دڵی خۆمدا پێکەنیم و وتم: کات کـاتی مـنە هەتـا بـیخەمە داوی خـۆم و هاوڕێی سەفەرم!

ئیتر کەوتە پرسیار کردن چۆن زانیت، زۆر پەرۆش بوو، لە تاوا پەشۆکا بـوو، منـیش خۆم وا پیشان دەدا کە ویقار و ئەدەب ناهێڵن پێـی بڵـێم، ڕووم لـێ وەچەرخانـد هەتـا تۆڵەی خۆمی لێ بکەمەوە و پێم وت: ئەوە فەرمانێکی تایبەتیەو پەیوەنـدی بە خـۆمەوە هەیە!!

دەمویست من ڕاوچی بم و باڵا دەستی دەریابم، عەقڵانیەت فێری خۆ بەزل زانی و من منێتی کردبووم، لەو شوێنەش زانستم نەدەچووە سەر سفرەی برسیەکان، ئەنانیەتم، خۆ بە گەورە زانیم، لێ دەبووە پرۆژەی مەنتقی و ئەسپی خۆمم تیا تاو دەدا.

بەڵام کە پیری موغان هاتە دەنگ، بە خێراییەك کە جڵەوی طۆفانی خۆ بە زل زانیمی پێچایەوە و وتی: بەڵێ بەڵێ بەڵێ ئەوە پێغەمبەری خوا بوو ﷺ پێی ڕاگەیاندم و نامەیەکیشی پیا ناردم بۆ تۆ کە کارەکەی شێخ ڕازی جێ بەجێ بکەیت 'واتە نەشتەرگەریەکەی خۆی'، منیش نیوە زەردەخەنەیەکم بۆ کرد و وتم: ﷺ.

ئیتر کاتی ئەوە بوو پیری موغان 'شێخ ڕازی' ئەم گاڵتە جارپەی من بە پایان بگەیەنێت و قوڵنگی لێ دەرهێنا و پیرە دیواری لەرزۆکی عەقڵانی بوونێک کە ساڵەها بوو بنیاتم دەنا هەپرون هەپرون کرد و دەنگی حیلەی ئەسپەکەی نەیدەکردە ئەوەی ماندوو بووبێت و بەیەك دوو جار غەزای خۆی تەواو کرد و منی ڕاپێچی حەقانیەت کرد. پرسیم: ئایا پێغەمبەر ﷺ پێی وتی کە بەیانی من نەشتەرگەریەکەت بۆ دەکەم.

بە جۆرێك سەیری کردم وەك ئەوەی پێم بڵێت ئیتر کاتی ئەوە هاتووە زۆنگاوی گومانت داپۆشم و لە شوێنی مێرگێك بنیات بنێم!!

وتی: بەڵێ حەزرەتی ڕەسول الله ﷺ پێی وتم و مژدەیشی بۆ ناردی بە مندا!!

دوێنێ تۆ لەگەڵ خێزانەکەت، لەماڵەکەی خۆت، لە بەلەکۆنەکەدا بوون، دەستت بەرز کردبوویەوە و دوعات دەکرد کە خوای گەورە منالێکتان پێ ببەخشێت هەروەکو چۆن خوای گەورە منالێکی بەخشی بە زەکەریا و ناویان لێ نا بە یەحیا، لە دوای ئەوە دەستت بەر کوپە چایەکە کەوت و دەستی سوتاندیتی و کوپەکەش کەوتە خوارەوە بۆ سەر شەقامەکە و شکا، لە تاوا چاوەکانم زەق و ئەبڵەق بوون!!

تف لە گەرووم وشك بوو، ئیتر شوێنێك بۆ گومان و دوو دڵی نەمایەوە، لەرزم لێ هات لە تاوا دەستە سوتاوەکەی خۆم گرت، ئیتر هەموو قەڵا عەقڵانیەکانم هەپرون هەپرون بوون لە بەردەم ئەم پیاوە سادە و خاکیەدا.

من دەرچووی زانکۆی 'کامبردیج' و خاوەنی بڕوانامەی بەرز و باوەڕپێکراو و دەگونجێت بەم شێوەیە بیر بکەمەوە!!

بۆیە هەستم کرد ئیتر من تەسلیم بووم، ئیتر دەبمە موسوڵمانێکی ڕاستەقینە، ڕۆژهەڵاتی بوونەکەم تیا گەشایەوە و، مەردایەتی و خاکی بوون و ئیمان لە دڵ و دەروونمدا درەوشایەوە بۆیە خۆم پێنەگیرا و دەستەکانیم ماچ کرد و بە کوڵ گریام، باکم لەوە نەبوو سەرنشینەکان دەمبینن یاخود نا، مەردی خودا دەستی هێنا بە سەرمدا و پێی وتم: ئێستا کاتی ئەوەیە مژدە تایبەتەکەی حەزرەتی رسول اللەت پێ بڵێم ﷺ، خوای گەورە وەڵامی دوعاکەی داویتەوە و دەتخاتە ژێر منەت و فەزڵی بێ پایانی خۆی بەوەی دوو کوڕت پێکەوە پێ دەبەخشێت بە هەردو ناوی 'یحی و موحەممەد'!!

خێرا دەستم برد بۆ مۆبایلەکەم و پەیوەندیم کرد بە هاوڕێیەکمەوە کە سەرۆکی نەخۆشخانەکانی 'ئەسیوط' بوو هەتا شوێنێکی تایبەتیم بۆ بگرێت بۆ ئەوەی بەیانی نەشتەرگەری بۆ "شێخ ڕازی" بکەم و هەموو خەرجیەکیشی لە ئەستۆ بگرم.

گەیشتینە 'أسیوط' و لە دوای کۆنگرەکە نەشتەرگەریەکەم ئەنجام دا و، الحمد لله زۆر سەرکەوتوو بوو.

من هەمیشە دوای نەشتەرگەری تیمی تایبەت چاودێری نەخۆشەکانم دەکەن، بەڵام بۆ شێخ ڕازی خۆم چاودێریم دەکرد هەتا وەسیەتی حەزرەتی ڕەسول الله ﷺ جێ بە جێ بکەم.

هاوڕێیەکم کە لە خوێندن پێکەوە بووین و هات و وتی بۆچی مۆبایلەکەت داخستووە، خێزانەکەت دەڵێت دەیان جار پەیوەندیم پێوە کردوە، مۆبایلەکەی داخراوە، بەپەلە مۆبایلەکەم کردەوە، خێزانم بە کوڵ دەگریا و قسەی بۆ نەدەکرا.

منیش زۆر ترسام، ئاخۆ چی ڕووی دابێت، وتم: پێم بڵێ چی بووە؟ وتی: عبدالرحمن دوگیانم، ئازارێکی زۆرم هەبوو ڕۆشتم لەسەر ڕێنمایی پزیشکەکەم، پشکنینی بۆ کردم و وتی: سوپاس بۆ خوا دوگیانیت. منیش پێ کەنیم و وتم: لەوەش

زیاتر ئەزانم، زیاتر دوانەت دەبێت من بە دڵنیـاییەوە پـێم وت: وەك کەسـێك کە لە زۆر زووەوە زانیبێتی، خێزانم وتی: ئەرێ تۆ ماندوو خەواڵو نیـت! وەك ئەوەی هـیچ گـوێم لە وتەکانی ئەو نەبووبێت وتم: دوو کوڕت دەبێت بە ناوەکانی 'موحەمەد و یحی'!

وتی: دوانەم دەبێـت؟! ئەرێ تـۆ بوویـت بە شـێخ عبـدە لە مـن، هێشـتا سـەرەتای دوگیانیمەوە و هیچ دەرنەکەوتووە، ئەم قسانە چین دەیانکەیت؟! بەڵێ خێـزانـم دوانەی بوو، 'موحەمەد و یحی'، هەتاوەکو ئێستاش خێـزانم وا دەزانـێ مـن کەرامـاتم هەیە و، وەکو موریدێك بۆ شـێخەکەی بـۆ مـن دەڕوانێـت و دەڵێـت خـوا بەرچـاوی ڕوونـاك کردویتەوە شێخ عبدە!!

منیش لە دڵی خۆمدا پێدەکەنم و ڕاستی بەسـەرهاتەکەی پـێ نـاڵێم، چـونکە شـێخ ڕازی پێی وتم بە خێزانـت و مـوحەمەد و یحـی مەڵـێ، ئێسـتا کە مـن ئەم بەسـەرهاتە ڕاستەقینەیە بـڵاو دەکەمەوە وەکـو هەمـوو خەڵـك دەیبیـنن، مـوحەمەد و یحـی ئێسـتا تەمەنیان پێنج ساڵانە، نـازانم ڕێگـای مـاددی بـوونی عەقڵگەرایـی بگـرن کە لە یەکەم ئەزموونی ژیانی مندا بەردی بەسەر بەردەوە نەما!

ڕێگەیەکی وشـك و بـێ هەسـت و سـۆز، ڕێگـایەك کە کۆتـاییەکی ڕوونـی نـیە و سەرچاوەیەکی ڕوون نیە بۆ ژیان، یاخود وازیان لـێ بێـنم وەك میسری و ڕۆژهەڵاتـی بژین و ئیمان و ڕۆحانیەت و عەقڵانـی و حـیکمەت بـکەنە هەوێنـی ژیانیـان. هێشـتا منالْن، بەڵام وا بە باش دەزانم وازیان لێ بێنم خۆیان داهاتوویان دیـاری بـکەن لە ژێـر ڕۆشنایی دوعای خێر و قەدەری خێردارە إن شاء الله.

# گەنجینەی گەیلانی
## مامۆستا جمال گەیلانی گێڕایەوە

شەوێکی هاوینی ساڵی ١٩٩٤ بوو، لە خەودا بینیم وەك ئەوەی بچمە مزگەوتی شێخ عبدالقادری گەیلانی لە شاری بەغداد، دونیا زۆر تاریك بوو، کە ڕۆشتمە حەوشی گەیلانیەوە، ئەو منارە بەرزەی کاژێرەکەی پێوە بوو کەوت بەسەرمدا، پێش ئەوەی بگاتە تەوقی سەرم تووشی ترسێکی زۆر بووم و بە هەموو هێزم هاوارم کرد 'یا الله'، ئیتر بینیم منارەکە گەڕایەوە شوێنی خۆی، دڵم کەوتە پەلە پەل و هەڵدەلەرزیم، بینیم پیاوێك دەمو چاوی دەڵێی مانگی چواردەیە و پێی وتم: جەمال مەترسە من باپیرەی تۆم، من عبدالقادری گەیلانیم، کە خەبەرم بوویەوە دەستم کرد بە گریانێکی بە کوڵ، بڕیارم دا بچم بۆ خزمەت حەزرەتی گەیلانی، ڕۆشتم و لە مزگەوتەکە دوو ڕکاعەت نوێژم کرد و دوای ئەوە ڕووم کردە مەرقەدی حەزرەتی گەیلانی و ماوەیەك دانیشتم و بە کوڵ گریام!

چونکە دەمزانی کە من چەندە گوناهبار و بێئاگام!

لە دوای ئەوە هەستام و ڕۆشتم بۆ ژوورەکەی مامۆستا مەلا عبدالکریمی مدریس 'ڕەحمەتی خوای لێ بێت' چاوەڕوانم کرد هەتا مۆڵەتی من درا بۆ پرسیار کردن، چونکە زۆر کەس بۆ پرسیاری شەرعی هاتبوون، من خۆم دواخست هەتا کۆتا کەس بم کە دەچمە خزمەتی، مامۆستا مەلا عبدالکریمی مدریس، کە گەیشتمە خزمەتی دەستم کرد بە گریان قسەم بۆ نەکرا!!

مامۆستا فەرمووی: ئەوە بۆچی دەگریت جمال الدین؟! منیش خەونەکەم بۆ گێڕایەوە، فەرمووی: جمال تۆ و کتێبەکانی 'کارل مارکس' و شوێن کەوتوانی مارکسیەت کوجا مەرحەبا!

واز بێنە لە فیکر و کتێب و ڕێـگەی چەوتـی ئەوانە! بـاپیرەت ڕازی نیـیە لێـت، مـن زیاتر گریام و لە دڵی خۆمدا دەموت مامۆستا ملا عبدالکریم ئەمەی چۆن زانیوە!!

مامۆسـتا فەرمـووی: جـمال الـدین لە کتێبەکـانی شـێخ عبـدالقادرەوە توێشـووی ڕێگات دەست دەکەوێت، بچۆرە خزمەتی کتێبەکانی، بچۆرە خزمەتی شێخ عبـدالقادر و بە ئەدەب بە لە خزمەتیدا!!

گەڕامەوە و پەیتا پەیتا تێر ئاو دەبووم لە کتێب و گەنجینەکانی گەیلانی!!

هەتا گەیشتمە چیـرۆك و بەسـەرهاتێك، کە فتـوایەکی تیـا بـوو دەربـارەی کەسـێك تەڵاقی خواردبێ بە چۆڵ بوونی کەعبە، ئایا حوکمی ئەو سوێندە چۆنە؟

منیش بیرم دەکردەوە ئاخر حەوشی حەرەمی کەعبە چۆن خاڵی دەبێت لە خەڵکـی؟ چۆن چۆڵ دەبێت؟ هەمیشە هەزاران کەسی لێیە!!

کاتێك کە چوومە خزمەتی مامۆستا ملا عبدالکریم، من و عبدالقادری برام بـووین، مامۆستا ملا عبدالکریم فەرمووی: جمال الدین ئێستا چۆنیت؟!

وتم: الحمـد لله باشـم مامۆسـتا گیـان، بەڵام پرسـیارێکم هەیە، ئایـا چـۆن و بە چ شێوەیەك دەگونجێت کە حەرەم و حەوشی کەعبە هـیچ کەسـی تیـا نەمێنێـت و خـاڵی بێتەوە لە خەڵك؟ مامۆستا گیان: شتی ئاوا دەگونجێت؟!

مامۆستا پێ کەنی و فەرمووی: ئەگەر خوای گەورە ئیرادەی لەسـەری بێـت دەبێـت و چۆڵ دەبێت!

ساڵان هاتن و چوون، هەتا لە ساڵی ڕابردوو بە هۆی 'پەتـای کۆرۆنـا'وە ئەوەی لە لای من خەیاڵ بوو، بوو بە واقع و ڕووی دا!

لەو کاتەدا من لە سەفەری بـووم، بە دیـاری کـراویش لە شـاری مەکەی پیـرۆز!! بە چاوی خۆم بینیم حەرەمی مەککە لە خەڵکی چۆڵ دەکرا و دەنگی خەڵکیان دەکـرد کە چۆڵی بکەن، بەهۆی کۆرۆناوە، بەنـدە لە حەوشـی حەرەمـی کەعـبەدا بـووم، هەمـوو

خەڵکیان کردە دەرەوە، من خۆم دواخست و بوومە کۆتا کەس کە لە حەوشی کەعبەدا بمێنمەوە، بە منیشیان وت بجۆرە دەرەوە، داوام لە ئەفسەرەکە کرد مۆڵەتم بدات بە تەنها طەوافێك بکەم و ئینجا دەچمە دەرەوە، ئەفسەرەکەش ڕازی بوو!!

سەیری چواردەوری خۆم دەکرد و، سەیری هەموو لاکانم کرد هیچ کەس لە کەعبەدا نەمابوو!! تەنها منی هەژار لە کەعبەدا بووم.

طەوافم کرد و بەردە ڕەشەکەم ماچ کرد و بە کوڵ دەگریام و بیری وتەکەی مامۆستا ملا عبدالکریمم کەوتبوویەوە!!

الله أكبر، حەمد و ستایش تەنها شایستەی زاتی تۆیە، خودایە لەم دونیایە دەرمان نەکەیت هەتا ڕەزامەندی تۆ بەدەست دێنین!!

ئەبو موحەممەدی ڕازی 'ڕەحمەتی خوای لێ بێت' جارێکیان پێی وترا: باشە زۆرینەی خەڵکی نەنگی و ناتەواویەکانی خۆیان دەزانن، کەچی وازی لێ ناهێنن و ناگەڕێنەوە بۆ ڕێگای ڕاست، فەرمووی: لەبەر ئەوەی ئەوان سەرقاڵی شانازی کردنن بە زانست و، سەرقاڵی بەکارهێنانی و جێبەجێ کردنی نین، تەنها خەریکی ڕووکەشن و وازیان لە ناوەڕۆك و بەهای ڕاستەقینە هێناوە، ئیتر خوای گەورە دڵیان تووشی نەخۆشی سەرپێچی لە حەق دەکات و، سەیری حەق و ڕاستیان بۆ ناکرێت و ئەندامەکانی جەستەیان دەبەستێتەوە لەوەی کە ئیتر ناتوانن بەندایەتی خوای پێ بکەن.

گرفتی گەورە ئەوەیە نەنگی و ناتەواوی خۆت نەبینی، ئەم دەردە بێ دەرمانە، کاتێ نەخۆش بیت و دان بە نەخۆش کەوتنی خۆتدا نەنێیت. هەتا کاتمان لەدەست دا ماوە با فریای خۆمان بکەوین و لە خەوی بێ ئاگایی بێینە دەرەوە.

# تۆ خۆشەویستی

  

'هیرمان میلغیل' (١٨١٩ - ١٨٩١) دەڵێت: نزیکبوونەوە لە مردن، هەمووان یەکسان دەکات، کاریگەری لەسەر هەمووان هەیە بە یەك شێوە، تەنها نوسەرێك لە نێوان مردواندا دەتوانێت ڕاڤەی تەواوی بکات و ڕاڤە تەواو و کامڵەکانی بەم دونیایە بگەیەنێت.

تۆ خۆشەویستی

من وەکو بێ باوکێك پێویستم بەم وشە و دەستەواژانە هەبوو، وەکو منداڵێك کە لە دایك و باوکی دوور خرابوویەوە و هەڵگیرابێتەوە، هەموومان خەڵکی سەدە و سەردەمی ماددین، ئەم حەقیقەتەمان زۆر پێویستە، مادیەت مرۆڤی بێباوك کردوە.

کاتێ سەیری سروشتی ڕاستەقینەی خۆمان دەکەین، ئەوا سەیری نیشتیمانی ڕاستەقینەمان دەکەین، بۆ ئەو شوێنەی کە دەڕۆین و کۆچ دەکەین 'بە هەڵە' وا دەزانین کە بەتەنها دەمێنینەوە و تیا دەچین، ئیتر بیرمان دەچێتەوە کە پەیوەندیە گەورەکە لەوێیە، خۆشەویستی بێ کۆتایی و دەسەڵاتی بێ سنوری حەق تعالا لە بیر دەکەین، ئیتر بە بەردەوامی وا دەزانین ون بووەکانی سەر زەوین و هەرگیز دونیا نا دۆزرێینەوە!!

من هێشتا زانا و پزیشکم، دوو ئەرکی سەرەکیم هەیە بەجێیان بگەیەنم، ئەوەی کە ڕێز لە حەقیقەت بگرم و یارمەتی خەڵکی بدەم هەتا شیفا وەردەگرن کاری منە.

بەو مانایەی کە چیرۆك و گەشتەکە بگێڕمەوە و دڵنیابم کە ئەم ئەزموونە بۆ ئامانجێکی دیاری کراو ڕووی داوە، بۆ ئەوە نا کە من کەسێکی دەستە بژێرم.

دوو شــت لە حــاڵی مــن و ئەزمونەکەمــدا ڕووی دا بەیەکەوە، ئەویــش ئەوەیە کە حەقیقەتەکــانی ئەم ئەزمــوونە، ئەو هەوڵ و پاشــخانە زانســتیەی ســەردەم بە چۆکــدا دێنێت کە دونیایان لێ پڕ کردوە بەوەی کە دونیا تەنها مادەیە و بەس!!

مادیەکان دەیانەوێت مرۆڤایەتی چەواشە بکەن بەوەی کە هۆش و ڕۆح و - ڕۆحــی من هی تۆ هی هەمووان - کرۆك و ماهیەتە قوڵەکەی گەردوون و مرۆڤ و بوون نیە!!

بەڵام چەواشەکاری حەقیقەت تەفرو تونا ناکات.

## دکتۆر ئیبین ئەلیکسەندەر(١)

لەگەڵ هەڵکردنی شەپۆلی ڕەشــاوی فیکــری بــێ بــاوەڕی و ئیلحــاد، لە کۆمەڵگــا جیاوازەکانی مرۆڤایەتیدا، شەپۆلێك کە زانستی کردە بیانووی نەبوونی خودا و، هەموو ئەوەی کە ئیمان بنیــاتی دەنێــت، بە کــارلێکی کیمیــایی و فیزیکــی جیــاواز لە قەڵەمــی دەدات و، ئیتر مرۆڤ لەبەر مەبنای ئەم تەرزە بیرکردنەوە ئیلحادیەدا دەبێتە جەســتەیەکی ڕوتی بایۆلۆژی و،وەختێ ئەم جەستە لە کــار وەســتا کۆتــایی دێــت و بــۆ هەمیشــەیی دەمرێت!!

دکتــۆر ئیبــین ئەلکســەندەر پزیشــکی مێشــك و دەمــارە و مامۆســتای زانکــۆیە لە 'هارفەرد'.

بەهۆی ڤایرۆسی 'ئیکۆلای' دەچێتە حــاڵەتی بــێ هۆشــیەکی قــوڵەوە و 'ئەزمــوونی نزیکبوونەوە لە مردن' دەبینێت.

---

١- کتێبی 'دلیل السماء' یاخود 'برهان الملکوت' د. ئیبین ئەلیکسەندەر.

گرنگی ئەم گەواهی دانە لەوەدایە، کە ئەم پزیشکە پێش گەشتەکەی بێ باوەڕی بووە و، باوەڕی بە زیندوو بوونەوەی دوای مردن نەبووە!

بەڵام لە دوای ئەزموونەکەی دەبێتە باوەڕدارێکی تەواو، مژدەی ئەوە دەدات کە گەردوونی بینراو 'کە لە تۆڕی پێنج هەستەکەدا هەستی پێ دەکەین' هەموو شتێکی بوون و وجود نیە!

دکتۆر ئیبین گەشتەکەی خۆی لە هەموو شوێنێك دەگێڕێتەوە، لە کەناڵەکانی 'وۆڵد نیوز، CNN، FOX، و کەناڵە بەناو بانگەکانی تر'.

کتێبێکی لەسەر ئەزموونەکەی نووسی بە ناوی 'دلیل السماء'، ئەم کتێبەی پلەی یەکەمی هێنا لە فرۆشتندا لە 'نیورك تایمز'.

بەسەرهاتی ئەم کتێبە، گەشتەکەیەتی لە دوای ئەوەی لە کۆماو بێ هۆشیدا بووە و هیچ تەفسیرێکی زانستی باوی سەردەم نیە بۆ بینینەکانی!

خێزانی دکتۆر ئەلکسەندەر دەڵێت: ڕۆژانە دوانزە سەعات دەینوسی، بۆ ماوەی سێ ساڵ بەردەوام بوو، من وام دەزانی یادەوەریەکانی ژیانی دەنوسێتەوە، یاخود دەربارەی زانستی پزیشکی و پسپۆڕی خۆی دەنوسێت، بەڵام ئەزموونی دوای نزیکی مردنی خۆی نووسی.

لە (٨)ی نۆڤەمبەری ساڵی (٢٠٠٨)دا بە ئازارێکی توندی سەر ئێشەوە خەبەرم بوویەوە، تەمەنم (٥٤) ساڵان بوو، تووشی نەخۆشیەکی دەگمەن بووم، حەوت ڕۆژ لە بێ هۆشیەکی تەواودا بووم، بەشی دەرەوەی مێشکم بە تەواوی لە کار کەوتبوو، ئیتر لەم حاڵەتەدا مرۆڤ بە تەواوی نادیار بێت، منیش لە ماوەی کار کردنم وەکو نەشتەرگەرێکی پسپۆڕی مێشك و دەمار، زۆرێك لە چیرۆکەکانی 'نزیکبوونەوە لە مردن'م بیستبوو، ئەو ئەزموونانەی کە کەسەکان خزمی مردووی خۆیان بینیوە و، بە خزمەت خوای گەورە گەیشتوون و فریشتەیان بینیوە و دۆزەخ و بەهەشتیان بەرچاو کەوتوە.

ئەو کاتە دەموت ئەمانە شتانێکی جوان و خۆشن و، خەون و خەیاڵ و کاریگەری نەخۆشی دروستیان دەکات، چونکە کاتێ مێشك و ژێری مرۆڤێك بەر زەبرێك بکەوێت، یاخود بەهۆی نەخۆشیەوە لە کار بکەوێت، مەحاڵە بە ئاگا بێت، بەڵام ئەوەی ڕووی دا ئەوە بوو کە من مێشکم لە کار کەوتبوو، لە هەمان کاتدا گەیشتمە جیهانێکی زۆر بەرفراوان!

مێشك ئامێرێکە بۆ بەرهەمهێنانی ئاگایی، کە لەکار کەوت بە بەئاگایی نامێنێتەوە، بۆ نمونە کاتێ پلاکی تەلەفزیۆنەکە دەردێنم، پەخش و وزە لە تەلەفزیۆنەکەدا نامێنێت.

من قەناعەت و بیر و باوەڕم بەم جۆرە بوو هەتا خۆم ئەزموونەکەم کرد و هەموو شتێك گۆڕا!!

ئەوەی بۆی ڕۆشتم و بینیم، زۆر زیاتر لێرەی دونیا واقعی تر و دامەزراوترە.

ئەو جیهانە وەك دەرگایەکی گەورە بۆ جیهانی دووهەم بوو، کە بۆم کرایەوە.

ئاو و ئاڤگە و گوڵزارێکی زۆر جوانم بینی، ئافرەتێکم بینی کە زۆر زۆری پێ وتم.

چەندین ساڵە دەمەوێت گەشتەکەم بە زانستێك کە کەم و کورتە و زانستی سەردەم بیسەلمێنم، بەڵام هێشتا نەمتوانیوە!

نەخۆشیەکەم مێشکی شڵەقاندبووم، لە هەمان کاتدا ئەوەی کە من بینیم و توانیم بیرم بمێنێت، یاخود هێڵرا بۆم بمێنێتەوە، پەیوەندی بە دەرەوەی جەستەم بوو، دەرەوەی دونیای مادیگەری و فیزیکی بوو، بەڵام دڵنیایی پێ دام هەتا خەڵکی ئاگادار بکەم کە ئەوەی بینیومە دەرەوەی دونیا و گەردوونی بینراو بووە!

ئەوێ حەقیقەت بوو، کار لێکەکانی مێشك و جەستە نەبوو، فیزیکی و ماددی نەبوو، زۆر لەسەروو زانست و مادده و بیر کردنەوەی ئێمەوە بوو.

من لە خێزانێکی زانست دۆستا گەورە بووم و گەشەم کردوە، باوکم پزیشك و نەشتەرگەری مێشك و زانایەکی ئەکادیمی بوو، خۆشم کیمیام خوێندوە و، لە

دوایشدا کـۆلێژی پزیشـکیم لە زانکـۆی 'دیـوك' تەواو کـردوە و، پزیشـك و پسـپۆڕی نەشتەرگەری مێشك و دەمارم و لە زانکۆکانی 'دیوك و هارڤەرد' وانەبێژ بوم.

پانزە ساڵ لە دەستەی وانەبێژی زانکۆی 'هارڤەرد' بووم.

کاری دەمارە خانە و مێشك دەزانم و ئەم باگراوندە زانسـتیەم هەبـوو، لە دوای ئەوە 'ئەزموونی نزیکبوونەوە لە مردن'م بینی و بە هیچ جۆرێك نەگەیشتمە ئەو گـریمانەیەی کە لێکدانەوەی زانسـتی مـادی هەڵبگرێـت بـێجگە لە دیـاردەیەکی ڕۆحـی مـوجەڕەد هیچی تر نیە.

ئیتر هەموو ئەوەی لە زانستەوە فێری بووم، لە بەردەم شەپۆلی ئەزموونەکەمدا خـۆی بۆ ڕانەگیرا و، گۆڕانی سەرتاسەری بەسەر بیر کردنەوە و ژیانی ڕۆژانەمدا هێنا.

پێش ئەزموونەکەم، هیچ ڕێگەیەکم بەدی نەدەکرد بـۆ تەفسـیری ژیـانێکی تـر دوای مردن.

ئەزموونەکەم بەم جۆرە بوو!

وەك ئەوە بوو شەمەندەفەرێك بە تەواوی خێرایی خۆی لێم بدات.

کاتژمێر (٤:٣٠) خولەکی بەیانی بوو بە ئازارێکی توندەوە بە ئاگا هاتم!

لە دوای سێ سەعات لە پەل و پۆی خستم و بێ هۆش کەوتم.

حەوت شەو و ڕۆژ بێ هۆش بووم، بەڵام بۆ منێکی دوور ڕۆشتوو، سـەدان سـاڵی دور و درێژ بوو.

هەستم کرد کە زۆر زۆرم پێ چووە!

بەڵام وا هەسـت دەکەم لە ڕۆژەکـانی پێـنجەم و شەشـەمی بـێ ئاگایەکەمـدا، بە تەواوەتی چوبێتمە قوڵاییەوە و لەو کاتەدا نزیکی مەرگ بووبێتمەوە!

مەزەندەی ئەوە دەکەم، کە ئەزموونەکەم چەند سەد ساڵێکی ئەوێ بووبێت!

به هیچ جۆرێك له بیرم نه‌مابوو که ڕۆژێ له ڕۆژان له دونیادا ژیاوم.

ده‌زانم من به ڕواڵه‌ته‌کانی ژیانی دونیاوه ڕۆشتوم، به‌ڵام به‌هۆی نه‌خۆشیه‌که‌مه‌وه، به ته‌واوه‌تی یادگه و بیرکردنه‌وه‌م سڕابۆوه، له هه‌مان کاتیشدا شتێکی تر که به‌ده‌ره له جه‌سته و مێشك و زاکیره‌ی من، زۆر زۆر به‌هێز و تواناوه ده‌رکه‌وت!

ئه‌مه‌یه وا ده‌کات لێکدانه‌وه‌ی ئه‌زموونه‌که‌م بۆ خۆم و خه‌ڵکیش ڕوونتر بکات و له ده‌ره‌وه‌ی ماده و جه‌سته‌وه بناسرێت و، یارمه‌تی ده‌ری زانستیش بێت بۆ ئه‌وه‌ی بیناسێت.

که له ئه‌زموونه‌که‌م گه‌ڕامه‌وه، نۆ گریمانه و ئه‌گه‌رم دیاریکرد، که ڕه‌نگه ئه‌مه یاخود ئه‌وه یاخود ئه‌وی تریان بێت!

به‌ڵام گه‌یشتمه ئه‌و دڵنیایه‌ی که هیچ لێکدانه‌وه‌یه‌کی مادی بۆ ناکرێت و هیچ یه‌کێك له گریمانه‌کان نه‌بووه.

هیچ په‌یوه‌ندیه‌کی به مێشك و جه‌سته‌ی مادیمه‌وه نه‌بووه، شه‌پۆلێکی زۆر گه‌وره‌تر بوو له‌وه‌ی که به‌ربه‌سته‌کانی ته‌فسیری مادی و فیزکی کورت مه‌ودای دونیایی به‌رگه‌ی بگرێت!

گه‌یشتمه دڵنیایی و یه‌قین که ئه‌زموونه‌که‌م به ته‌واوه‌تی ڕۆحی و له‌هه‌مان کاتدا واقعی بووه.

به منی سه‌لماند که هۆشی و ڕۆح هه‌میشه‌یی و نه‌مرن.

ملیۆنه‌ها مرۆڤ ئه‌م ئه‌زموونه ده‌بینن و هه‌مان ده‌ره‌نجامیان ده‌سگیر ده‌بێت.

له سه‌ره‌تادا که ده‌مگێڕایه‌وه بۆ ده‌وروبه‌رم، ده‌یانوت به‌ڵێ تۆ زۆر نه‌خۆش بوویت، هۆشت به دونیاوه نه‌بوو، یه‌عنی له من حاڵی نه‌بوون که چی ده‌ڵێم!

من به ئاگاییه‌کی ته‌واوه‌وه به‌سه‌رهاتی مرۆڤێکی کامڵ و بێ کێشه ده‌گێڕمه‌وه.

دوای ئەوەی لە نەخۆشخانە دەرچووم، دوو ڕۆژ بوو لە ماڵەوە بووم، یەکێک هات بۆ لام و پێی وتم: کاکە من حاڵیم لە ئەزموونەکەت، بۆیە بینوسەرەوە با لەدەست نەچێت.

بیست هەزار وشەم لە دوو هەفتەدا نووسی، لە دوای ئەوە ئەزموونی ئەوانەم خوێندەوە کە 'نزیکبوونەوە لە مردنیان' بینیوە.

بینیم زۆر لە یەك دەچن و ڕۆشتنە بۆ یەك شوێن و یەك مەنزڵ!

ئیتر زانیم کە من حەقیقەتم بینیوە، زانیم کە باس لە پرۆگرامێکی زۆر ورد و سەرسوڕهێنەر دەکەم!

ئێستا دەزانم ئەم بابەتە بۆ هەموو مرۆڤایەتیە!

ڕۆح عارف و زانایە، بەڵام لە دونیادا خامۆشە و داپۆشراوە، ئەوەندە بەخششێکی نازدارە بە هەموو کەس نادۆزرێتەوە!

زۆر کەس لەوانەم بینیوە کە ئەزموونەکەیان کردوە، پزیشك... ئەندازیار، خوێندەوار و نەخوێندەوار، کەسانی ئاسایی و هاوڵاتی...

بەڵام بە زانیاری تەواو ئاگاوە دەدوێن و ئەزموونەکەیان دەگێڕنەوە، دەزانیت کە زانست و زانیاری و مەعرفەیەك فێر دەبن، وەك یەکن و لەوێ پێیان دەدرێت و هی چەشتن و بینین و بیستنەکانی ڕۆحیانە، ئەو زانستە زانستی دڵی پڕ لە موحیبەتە، ڕاستە کە ڕەنگە پیشەی پزیشکی یاخود ئەدەبیات ڤارمەتی دەربێت بۆ نزیك کردنەوەی وێنەکە، بەڵام ئەوێ زۆر گەورە و بێ سنورە و قوتابخانەی فێربوونە.

بەڵام هەرگیز مرۆڤ وەك پزیشك و پیتۆڵ و ئەکادیمی ئەو گەشتە و ئەزموونە ئەنجام نادات، مرۆڤ وەك ئەو ڕۆژەی لە دایك دەبێت ڕووتە لە پلە و پایە و مەقامی دونیایی و لەوێ ئەرزشێك بۆ پلە دونیایەکان نیە!

له دونیادا زانست و زانیاریەکان سنوردارە، لەوێ بە زانست و زانیـاریەوە دەوڵەمەنـد دەبێت.

گومان کردن لە ئەزمـوونەکەم و بـاوەڕ نەبـوون بەوەی کە مـن بینیـومە و قەنـاعەتم پێیەتی، هەرگیز تورەم ناکات.

بەڵام زانست پەی بە هەموو شتێك نابات ئـێمە وەکـو پزیشـك و زانسـت خـوازان هێشتا زۆر کەم لە بێهۆشکردن (بنج)!

دەبێت بەو جۆرە بین، کە زۆر زۆرمان لە زانست بەدەست هێنا، بەڵام لە هەمانکاتـدا سەرسامیش بین بەوەی کە زۆر نەزانین!

سێسەد کتێبم دەربارەی ئەزموونەکەم خوێندۆتەوە، ئەو کتێبەی کە نوسـیم دەربـارەی ئەزموونەکەم چوار ئەوەندەی ئێستام دەبوو کە بڵاوم کردەوە، بەشـێکی تـایبەت بـوو بە ئیرادە و توانسـت، بژاردەکـانی مـرۆڤ، پەیوەنـدی زەمـان، پەیوەنـدی وزە و قـودرەت پـێکەوە، دەبـوو قـوڵ بـبمەوە هەتـا حەقـیقەتەکە زیـاتر ڕوون بـکەمەوە، بـۆ ئەوەی وەڵامێکی توند و تۆڵ بە خوێنەر بدەم، بەڵام کاتێ پەڕتوکەکە بوو بە هی گشتی، سـەیر دەکەم زۆرم نوسیوە و دەبێت کورتی بکەمەوە.

یەکەم جار کە ئەزمـوونەکەم دەسـت پـێ کـرد، هەمـوو شـتێك کە بیرکردنەوەیەکـی دونیایی بێت، کە مێشك و یادگەی مرۆڤ پڕ دەکـات، لە مـاڵ و منـاڵ و پـلەو پـایە و بڕوانامە و ژیانی دونیـایی هیچـی نەمـا، لە سـەرەتادا مـاوەیەك سەراسـیمەبوم. دەنـگە دەنگ و دروشم و هات و هاوارم دەبینی و دەمبیست.

ئاژەڵەکان هەڵبەز و دابەزیان دەکرد، دەنگە دەنگی زۆر قوڵم دەبیست.

دوای ئەوە ڕوونـاکی و نـورێکی زۆر پرشـنگدارم بینـی بەرەو ڕووم دەهـات، زۆر جوان بوو، موحیبەتی پێ بوو، هیچ هەست و نەستێکم نەبوو بۆ جەسـتەی ڕاکشـاوی نەخۆشخانەم!

دانەچڵەکیم بۆ حاڵەتێکی دژوار کە جەستەم هەیبوو!

کاتێکم زانی ڕۆشتمە ناو لاپاڵ و مێرگوزارێکی زۆر جوان، لەقەد پاڵی چیایەکی زۆر دڵڕفێندا خۆم بینیەوە!

وەك ئەوەی بەسەر باڵی پەپولەیەکی گەورەوە بم، بەسەر گوڵ و گوڵزاردا دەگەڕام، ملیۆنەها پەپولەم لێ دەرکەوت، لە ڕوبارێکی پڕا و پڕ لە ژیان و جوانی، کە دەمدا بەلای گوڵەکاندا دەپشکوتن و دەکرانەوە.

دەتوت گیانیان تێدایە و پێشوازیت لێ دەکەن، درەختەکان لەوپەڕی زیندوێتی و جوانیدا بوون، بونەوەرانێك لەوێدا بوون کە لە پەڕتوکەکەمدا ناوم لێ ناون بە 'جوتیارەکان'.

بەڵام ئێستا هەست دەکەم و قەناعەتم وایە کە ئەوانە ڕۆحانیەت بوون، ئەوانە لە خۆشی و شادمانی و زیندوێتیدا بوون.

منداڵان یاریان دەکرد، ئاژەڵی زۆر جوانم بینی، تاڤگەی ئاوی زۆر و سەرچاوەی ئاوی نایاب و دڵ ڕفێن موناجاتیان دەکرد و سروودیان دەوت.

لە کتێبەکەمدا ناوم ناون بە 'فریشتەکانی خودا'، درەخت و گوڵەکان سیمای زەویان پێوە دیار بوو، بەڵام نەبینراو و لەسەر زەوی جوانتر لە هەموو جوانیەك، ئەمانە لە دەرگای بەهەشتدا بوون، ناو بەهەشت نەبوو، لە کتێبەکەمدا بە درێژی باسم لێ کردون.

کچێکی زۆر جوانم بینی لای دەرگای بەهەشت، جل و بەرگی خەڵکی ئەوێی لەبەردا بوو، هەرگیز شێوە و ڕوخساریم بیر ناچێتەوە، زۆر جوان و ڕووخۆش بوو لەگەڵم، بیر و بۆچوون و وتەکانی بەبێ وت و وێژ پێم دەگەیشتن، پێی دەوتم تۆ بۆ خۆشەویستی دروست بوویت، لێرە لە هیچ شتێك مەترسە، ئێرە شوێنی میهرەبانیە،

ئێـره نه خـراپه‌ی تیـایه و نه خراپه‌شـی تیـا ده‌كرێـت، وشـه‌كانی ده‌ڕژانه هه‌سـت و شعوره‌وه، زۆر زیاتر بوو له‌وه‌ی كه وه‌ك دونیا به زوبان ده‌ری ببڕیایه.

ئه‌وه یه‌كه‌مین هه‌ست كردن و وه‌عیم بوو، كه هه‌ست به پاكێتی و قودسیه‌ت بكه‌م.

هه‌ستم به هێزێكی به ده‌سه‌ڵاتی بێ سنور كرد، كه ئه‌و هێزه زۆر زاڵه به‌سه‌ر هه‌مـوو دروسـتكراوه‌كانیدا و ون نابێـت، ئه‌و هێـزه‌ی بـێ سـنوره ئاگـاداری ڕابـردوو ئێسـتا و داهاتووه.

هه‌موو ئه‌مانه‌م له‌وپه‌ڕی ته‌واوه‌تی و بێ نوقصانیدا بینی.

ئینجـا كه‌وتمه حـاڵه‌تێكی تـره‌وه كه نـاوم لـێ نـاوه به بوعـدی دووه‌م، ئه‌مه‌شـیان جیهانێكی بێ كۆتایی بوو، بێ سنور، ئه‌وه بهێنه‌ره پێش چاوانـت كه هه‌مـوو بـوون، به زه‌مان و مه‌كانه‌وه بێ كۆتا به‌و جۆره بێت.

خۆت ده‌بینیته‌وه له حزوری ده‌سه‌ڵاتێكی تاك و ته‌نهای زۆر به‌هێز و به ده‌سـه‌ڵاتدا، كه له دونیادا زۆر به لاوه‌كی و كه‌م و كـورت و لای هه‌نـدێكیش زۆر لاموبـالی و بـێ بـاك به‌رامـبه‌ری ناسـیومانه و پێناسـه‌مان كـردوه، ئه‌و خـوایه‌ی كه زینـدوه و زۆر خۆشه‌ویست و پیرۆزه، ئاگای له ورد و درشتی بونه‌وه‌ران هه‌یه.

من شتێكی فیزیكی دیاری كراو باس ناكه‌م، بـاس له هێزێكـی بـێ كۆتـا ده‌كه‌م كه هیچ پێودانگێكی مادی ناتوانێت چوارچێوه‌ی بۆ دیاری بكات.

سیفه‌تێك به بیركـردنه‌وه و فه‌لسـه‌فه‌ی خۆمـان بـۆی دیـاری بكه‌یـن له دونیـادا، له زیهنه‌تی زاناترینی خه‌ڵكیشه‌وه بێت، بۆ خوای گه‌وره‌ی دیاری بكه‌ین، زۆر بـێ مانـا و كه‌م و كورت ده‌بێت!

بۆم ڕوون بوویه‌وه كه هه‌موو زانسـت و مه‌عـره‌فه‌یه‌ك مـرۆڤ به ده‌سـتی ده‌هێنێـت سنورداره، هی ئێستا و داهاتوو و ئه‌وانه‌ی ڕابردووش، له‌و دونیـا سـنورێك نـیه بـۆ ئه‌و مه‌عرفه و زانینانه‌ی كه مرۆڤ له‌و دونیادا به ده‌ستیان ده‌هێنێت.

که نوێژ ئەنجام دەدەیت بۆ خوای گەورە، هەروەها لە کاتی بیر کردنەوە لە دەسەڵاتی خوای گەورە و تەئەمول و ڕامان، دەتوانیت ئەو پەیوەندیە دروست بکەیت.

ئێمە لە زەویدا لە لیتاوێکی لیل داین، دونیا تەنگ و تاریکە، حەقیقەتی ژیان لەوێیە، ئەوەی کە بینیومە باسی دەکەم، بیرم لە کینایە نەکردۆتەوە، ئەگەر توانیبێتم ئەوەی بینیومە گەیاندومە.

لەبەر ئەوەی قەبارەی کتێبەکە گەورەتر نەبێت، زۆر شتی جەوهەری و گەورەم باس نەکردوە، لە کتێب و محازەراتی تردا باسم کردوون.

ئیمان بە خوا مەرجی ڕزگار بوونە لەو دونیا، کۆت و بەندەکانمان دەکاتەوە.

نابێت چاوەڕوانی زانستی سەردەم بکەیت هەتا خوات پێ بناسێنێت، خوای گەورە زۆر لەوە گەورەترە، کە چاوەڕوانی زانست بکەین شتێکی لەسەر بڵێت!

خەیاڵ و ئەندێشە هەرچی بکات ناتوانێت چواردەورەی گەورەیی و دەسەڵاتی ئەو زاتە بدات!

لە کاتێکدا کردەوەکانت پیشان دەدرێتەوە هەست بە پەشیمانی و خەمێکی قوڵ دەکەیت، کە بۆچی لە دونیادا بە کردەوەی باش خۆم نەڕازاندەوە، ئەو پیشاندانە لەو بوعدە ڕوون و بێ گەردەوە بۆ خۆی سزا و ئازارێکی زۆر بێ ئامانە!

من خۆشەویستی بێ سنورم بینی لە خوای گەورەوە، میهرەبانی و ڕەحمێکی بێ سنورم بینی.

ناڕەحەتی و خەم و نەخۆشیەکانی دونیا خراپ نین، شیفان بۆ گوناه و بێ ئاگایان!

ئەمانە فرسەتی چارەسەر و گەشە کردنی مرۆڤن!

ڕۆحمان هاتوەتە دونیا هەتا تاوانەکان فێر بین، ڕۆح فێریش نابێت هەتا ناڕەحەتی قبوڵ نەکات و ناخۆشیەکان تێنەپەڕێنێت!

به مەرجێك لە دونیادا بتوانین بەرامبەر بە شەڕ بیینەوە و تەسلیمی نەبین، دەبێتە هاندەر و حافزێك بۆ ڕزگار بوونی قیامەت.

خوای گەورە لە ڕێگای بەڵا و موصیبەتێك کە دەینێرێت، ئەگەر بەڵا بەخش بناسین و مامەڵەی باشی بکەین، دامان دەپۆشێت لە میهرەبانی و مەرحەمەتی خۆی.

هەموو جارێك پێیان دەوتم، تۆ هێشتا نەمردوویت و بۆ هەمیشەیی لێرە نیت و دەگەڕێیەتەوە بۆ دونیا.

هەستم بە نوێژی بوون و وجود و گەردوون دەکرد. هەست بە هەمهەمە و حەلقەی ذیکر و تەسبیحات دەکەیت، لەناو خۆشەویستیەکی ناوازەی زۆر شیریندا.

وام بینی کە نوێژ و دوعا دەکەن بۆ من هەتا چاك ببمەوە، ئەو کاتە لێی حاڵی نەبووم، بەڵام کە گەڕامەوە تێ گەشتم، کە کانگای دڵنیایی نوێژ و دوعایە.

هەزاران کەسم بینی زۆر بە جوانی نوێژیان دەکرد و دوعایان دەکرد، کە من بگەڕێمەوە بۆ ژیانی دونیا. ئەوان خەڵکی زەوی و دونیا بوون، بەڵام مەشهەدەکە ئەرزی نەبوو، نازانم چۆن وێنای بکەم بۆ ئێوە.

لەبەر ئەوەیە هەموو جار بە نەخۆشەکانم دەڵێم نوێژ و دوعا بە کەم مەزانن، زۆر زۆر گەورەیە، ئەوە دەرگای چاك بوونەوەیە، خۆ ئەگەر نەخۆشێك دوعای زۆری بۆ کراو کۆچی دوایشی کرد، مانای ئەوە نیە دوعاکانی گیرا نەبوون، نەخێر شوێنی خۆیان دەگرن.

نوێژ هێزێکی ئەوتۆی تێدایە کە لە سەروو تێگەیشتنی ئێمەوەیە.

هەر کە لە بێ هۆشیەکە هەستامەوە و چاوم کردەوە، یەکەم وتە کە بە ڕوویەکی گەشەوە وتم: هەموو شتێك زۆر باشە، مەترسن، هێشتا وام دەبینی لەوێم، ئێمە لە سەربەرزی و خۆشەویستیدا دەژین، لە ژێر چاودێری خواییداین.

ئەنانیەتم بە تەواوەتی کوژابوویەوە.

ئەو کچەی لە ئەزموونەکەمدا لەگەڵم بوو، بوو بە موفاجەئەی گەڕانەوەم، لەو دونیا نەمناسی کە کێیە و چ پەیوەندیەکی بە منەوە هەیە، بۆچی ئەوەندە گرنگیم پێ دەدات، کە لە کتێبەکەمدا ئیحساسێکم بەجێ هێڵاوە خوێنەر هەستی پێ دەکات!

ئەو کچە زۆر جوان بوو، چاوەکانی شین بوون، هەردوکمان وەك لەسەر فەرشێك بین و بفرین ئاوا بوو، ڕەنگی ئەو فەرشە زۆر زۆر جوان بوو، ملیۆنەها پەپولەی زۆر زۆر جوان لە دەورمان بوون، کراسی ئەو کچە شینێکی ئاسمانی زۆر جوانی کراوە بوو، پرتەقاڵیەکی کاڵ بوو، ڕەنگی زۆر جوان کە پڕ بوون لە ژیانەوە و جوانیەکی بێ وێنە.

سەیرێکی کردم، ئەوەی دەهێنا مرۆڤ بژی بۆ ئەوەی ئەو کچە ببینێت.

سەیر کردنی ڕۆمانسی نەبوو، هاوڕێیەتیش نەبوو، بەرزتر بوو لە هەموو سەیرکردنێك کە ئێمە لەسەر زەوی ناسیومانە، سەیر کردنێك کە هەموو جۆرەکانی خۆشەویستی کۆ کردبوویەوە، بەڵام لە هەمان کاتدا لە هەمووی زیاتر ڕاستۆگۆیانە و پاك و جوانتر بوو.

قسەی لەگەڵ کردم، بەڵام بەبێ وشە، پەیامەکانی وەك شنەبا پێم دەگەیشتن و لە هەمان کاتیشدا زانیم کە حەقیقەتە و وشەکان گریمانەیی نین هەتا من لێکیان بدەمەوە.

نامەکانی بەم جۆرە بوون کە پێی وتم:

"تۆ خۆشەویستیت و، سەربەرزی هەمیشەیت دەست دەکەوێت".

"نابێت لە هیچ شتێك بترسیت و هیچ لە دەست نادەیت".

"هەرگیز لێرە هەڵە ناکەیت".

هەروەها پێی وتم: لێرە شتانێکی زۆرت پیشان دەدەین، بەڵام لە کۆتاییدا دەگەڕێیتەوە بۆ دونیا، چونکە هێشتا کاتی ئێرەت نەهاتوە.

مـن لە لایەن ئەو دایـك و بـاوكەی كە گەورە بـووم لە ناویانـدا تەبەنـی كرابـووم، كوڕەكەم لە دوای ئەزموونەكەم گەڕا بە دوای دایك و باوكی ڕاستەقینەمدا دۆزینیەوە!

ئینجا زانیم وەختێ من لە دوای ئەوەی بە منداڵی سەر پێ كەوتوم دراوم بەم مـاڵەی كە تیا ژیاوم، ماڵی باوكە ڕاستەقینەكەم سێ منالّی تریان هەبووە، كە یەكێكیـان كچێـك بووە و، خوشكی من بووە و لە ساڵی (١٩٩٨)دا وەفـاتی كـردووە و لە مـن بچـووكتر بووە، من كەسیانم نەدەناسی و نەمبینیبوون و هیچ هەواڵێكیانم لەلا نەبوو!

ئەوەی سـەیر بـوو بەلامەوە لە ئەزموونەكەمـدا ئەوە بـوو كە بـۆچی بـاوكم ’بـاوكی بەخێوكەرم نەك باوكی ڕاستەقینەم‘ لە گەشتەكەمدا نابینم، لە كاتێكدا وەفـاتی كردبـوو، دەبوو هەر لە سەرەتای ئەزموونەكەمدا بهاتـایە بە دەمـمەوە، وەك ئەو كەسـانەی كە ئەم ئەزموونەیان بینیوە!

لە هەموو ئەمانەدا شاراوەییەكی سەیر هەبوو!

لە دوای چـوار مانـگ لە ئەزمـوونەكەم ئەو وێـنەیەم دەسـت كەوت كە ئەوەی لە ئەزموونەكەمدا بینیومە خوشكی ڕاستەقینەی من بووە و، هەرگیز لە دونیادا نەمبینـی وە و، لە ساڵی (١٩٩٨)دا وەفاتی كردووە، كە وێنەكەم بینی ویژدانم هاتە گریان، خۆم بـۆ نەگیرا، گریانم بوو بە هـاوار و بانگەوازێـك كە هەرگیـز شـینی بەو جـۆرەم نەكـردوە، ئینجا زانیم كە خوشكەكەم بۆ چركەیەكیش منی بەجێ نەهێڵا لە غەریبسـتان و پێیشـی نەوتم كە خوشكی تۆم!!

دەبوو بمزانیایە ئەو هەموو میهرەبانیە، میهرەبانی دایكمە و لە چاوی خوشـكەكەمدا دەمبینی!

یەكپارچە سۆز و ئـولفەت و مـوحیبەت بـوو بـۆ مـن، ئێسـتا دەزانـم كە ئەو پەلەی خۆناساندنی نەبوو، چ پەلەیەكیەتی كە من بۆ سـەفەرێكی كـورت لە جـاری پێشـووی ژیانم هاتومەتە دونیا.

ئەو هەمیشە لە هەتا هەتایدایە و شەفەقەتی لێ نابڕێت و دەیزانی دوای ماوەیەکی تر دەچمەوە بۆ هەتا هەتایی و ئیتر لەوێ دەمێنمەوە!

دەیزانی منێکی نەگەیشتوو بە بەرزەخ بەرگەی ئەو هەموو نهێنیە ناگرم، زۆر کەمی پێ وتم، ئەو کەمە زۆر زۆر بوو بۆ ئێرەی دونیا.

زۆر غوربەت و هەناسە ساردی دایگرتم کە زانیم ئەو وێنەیە خوشکی منە و ناوی 'پینسینە'.

بەسەرهاتێکی لەم جۆرەی من لای کەسێکی تر هەیە کە ناوی 'ئیزیفس ڕۆز'ە، کە خوێندمەوە دەڵێت: کچێك بەم ئەزموونەدا تێپەڕی و لە بێ هۆشیەکی قوڵدا بوو، لەوێ براکەی خۆی بینی بوو، زۆر کاتی خۆشیان پێکەوە بەسەر بردبوو.

کە گەڕایەوە زۆر سەرسام بوو بوو، باوکی پێی وتبوو ئەوەی کە تۆ بینیوتە برای تۆ بووە، کچەکە وتبووی ئاخر کوا من برام هەیە، باوکی وتبووی: برایەکت هەبووە پێش ئەوەی تۆ لە دایك ببیت بەسێ مانگی ئەو مردووە و هەرگیز بە تۆمان نەوتووە هەتا خەفەت نەخۆیت.

وێنەی خوشکەکەم وەك ئەوە بوو کە من لە ئەزموونەکەمدا بینیم و ناسیمەوە!

وتم: تەنانەت چاوەکانیشی شینە وەك ئەم وێنەیە، چۆن ئەمە دەبێت!

زۆر زیاتر بوو لە خەیاڵ و ئەندێشەی من، هەتا بتوانم بەرگەی ئەو حەقیقەتە گەورەیە بگرم کە بینیومە.

ئیتر دوای ئەوە هەموو هەفتەیەك پەیوەندی دەکەم بە دایك و باوك و خێزانە ڕاستەقینەکەی خۆمەوە، ئینجا تەواوی پرسیارەکانم کرد دەربارەی خوشکەکەم کە ژیانی چۆن گوزەراندوە.

وتیان: کچێکی زۆر میهرەبان و بەسۆز بووە، یارمەتی ئەوانەی داوە کە یارمەتیان پێویست بووە.

بەزەیی زۆر بە ئاژەڵ و گیانداراندا دەهاتەوە، خـواردنی پـێ دەدان، لە کـۆمەڵەیەکی خێر خوازی خۆبەخشانە کاری دەکرد، وێناکە تەواوکەری ئەوە بوو کە من بینیم!!

گرنگە ئەوە بڵێین هەموو دەرەنجـام و، قەنـاعەتێکی ئەم جـۆرە کەسـانە 'د.ئیبـین و ڕۆژئاواییەکان' مەرج نیە هەمان قەناعەتی ئیمانـی و پەروەردەی ئیسـلامی ئـێمە بێـت، وەك ئەزموونی یەکێـك لە ملیۆنەهـا کەسـی ڕۆژئـاوایی وەری دەگـرین و، تێبینـی فەزا فـراوانەکە دەکەیـن و، حـاڵەتە کەسـی و دینـی و ژینگەیەکـان تـێکەڵ بە جەوهەری حەقـیقەتە گەورەکە نـاکەین و، ڕێـز لە داسـتان و ئەزموونەکانیـان دەگـرین و لە ژێـر ڕۆشنایی ڕەحمەتـی ئیلاهیـدا زیـاتریش چـاوەڕوانیمان دەبێـت و، ئەزموونەکانیـان بە فەوزا لە قەڵەم نادەین و کرانەوەیەکی فراوان مەطلەبی تەواوی ئەم ئامانج و نوسینەیە.

دکتۆر ئیبین کتێبەکەی بۆ چینێك نوسیوە کە هیچ وابەسـتەیەکیان بە هـیچ ئـاینێکەوە نیە و، دەیەوێت نزیکیەك بۆ چینە بەرفراوانەکەی ڕۆژئاوا دروست بکات.

لەبەر ئەوە لە کتێبەکەیـدا بە ڕوونـی ئەوە دەردەکەوێـت و دەیەوێـت بڵێـت: ئـێمەی زانست خوازان کورت بینین و، وەختێ قەناعەت و فیکرمان ئـاوقەیی جیهـانی مـادی دەبێت و، دەمانەوێت تاقیگە مادیەکانمان بێ بەش بکەیـن لە مانـا و ڕۆح و کـاکڵەیەك کە جیهانی تەنیوە!!

خۆی لە دەستەواژە دینیەکـان دەپارێزێـت هەتـا بەرامـبەرەکەی نەسـڵەمێتەوە و زوو وازی لێ بێنێت.

'الکائنـات الفوقیـة' بـۆ فریشـتەکان بەکاردێنێـت، ئاسـمان بە چەق و 'مەرکەز' نـاو دەبات و، ڕۆح بە 'وەعی' ناو زەد دەکات.

گرنگی شاهیدیەکەی دکتۆر ئیبین لەوەدایە کە لە بەرەی ئیلحادە و، لە هەمـان کاتـدا دوای ئەزموونەکەی بەم دڵنیایی و ئـیمانە قـوڵە گەیشـتوە، لە ڕۆژئـاوا و لە ناوەنـدێکی فکری و زانستیەوە ئەم شاهیدیانە دەدات و دواین قەناعەتەکانی دەنوسێت!

دکتۆر ئیبین لە سەرەتای کتێبەکەیدا، وتەیەکی ئەنیشتاین دێنێت کە دەڵێت: پێویستە مرۆڤ بەو جۆرە تێی بڕوانین کە هەیە، نەك بەو جۆرەی کە دەبێت وابێت! (البرت أنیشتاین ١٨٧٩ - ١٩٥٥).

دکتۆر ئیبین دەڵێت: وەختێ منداڵ بووم، خەونم بە فڕینەوە دەبینی، لە شەواندا ورد دەبوومەوە لە ئەستێرەکان، خۆم وا دەبینیەوە کە لە ئاسمان دەفڕم و گەشت دەکەم، کە گەورەش بووم و، سواری فڕۆکە دەبووم، ڕوومەتم دەنا بە جامی فڕۆکەکەوە هەتا نزیك بم لەو فەزایەی کە خولیای منداڵیم بوو تیایدا بفڕم.

ئەزموونەکەم پێی وتم: مردنی جەستە و ژیری مرۆڤ کۆتایی نیە، گرنگترین ژیان و ئەزموونی مرۆڤ دەکەوێتە دوای سەفەرێك کە بە مردن دەست پێ دەکات.

لە سایەی خوایەکدا باڵاترینی ژیانێك دەکەیت و، دەبینیت ئەو خوایە گرنگیت پێ دەدات.

خودایەك کە هەرگیزا و هەرگیز فەرامۆشت ناکات، ئەو شوێنەی بۆی ڕۆشتم، حەقیقی و ڕاستەقینە بوو، ئەوەندە ڕاستیەکی حاشا هەڵنەگر بوو، ژیانی دونیا وەکو خەون و وڕێنەیەك لێ دەکات و زیاترێکی بۆ ناهێڵێتەوە.

نامەوێت ژیانی دونیا بێ قەدر بکەم.

من ئێستا قەدری بە باشی دەبینم و، دەزانم لە دونیا چی بکەم!

بەڵام ئەوە ڕاستیەکەیە کە ناکرێت نەوترێت، دەبێت ئەزموونە ڕاستەقینەکەم بۆ هەموو دونیا بگێڕمەوە، وەختێ حەقیقەتی پێش ئەم ئەزموونەم بینی، زانیم کە ئەم ئەزموونانە هی شاردنەوە نین!

ئیتر بوو بە پەیامی ژیانی من، بە مانای ئەوە نا کە من وازم لە کاری پزیشکی و جەراحی خۆم هێنابێت.

بەڵکو بەو مانایەی کە من دەرکم بەوە کرد کە ژیان بە مردنی جەستە کۆتایی نایەت.

پێویستە لەسەرم و کاری لە پێشینەی ژیانمە پێتان بڵێم لە پشتی ئەم زەویە مادیەوە چی دەگوزەرێت، من دەمەوێت تەواو کەری حەقیقەت و چیرۆکی ئاخیرەت بم بۆ ئەو کەسانەی کە تووشی شەلەلی فیکری بوون و ناگەنە حەقیقەتی چیرۆکی کۆتایی نەهاتووی مرۆڤ و مرۆڤایەتی، دەمەوێت دەستیان بگرم و باوەڕ بکەن کە ژیانی ڕاستەقینە لەوێیە!!

لە سەرەتادا کەوتمە جیهانێکی نوێ، تاریك بوو، تاریکیەك کە تیایدا دەبینیت، بە ئاگاییەکی زۆرت هەیە، بەڵام بەبێ مێشك و زاکیرە و پێناس، دەنگێکی قوڵ، زۆر دوور، بەڵام بەهێز دەهات.

دەنگێك دەڵێیت ئاسنگەرێکی دورە لە ژێر زەوی ئاسنێکی گەورە دەکوتێت.

من هەبووم، بەڵام جەستە نەبووم، لەوێ هیچ وشە و زمان و هەست و نوطقێك نازانی، هیچ فیکرەیەکم بۆ ئەو جیهانە نەبوو کە تیایدا بووم، ئەستەمە لەوێ کات ڕابگریت و دەرکی کات بکەیت، بەڵام هەست دەکەیت تۆ لەوێیت و بۆ هەمیشەیی لەوێ دەمێنیتەوە و بەجێی ناهێڵیت.

ئەم جۆرە سەرەتاییەی ئەم ژیانە نوێیە هیچ بێ زاری نەکردم، پەلەی ئەوەشم نەبوو یاساکانی ئەو جیهانە هەتا هەتاییە بزانم، وردە وردە ئەوەم زانی کە من هێشتا نەبوومەتە بەشێك لەو جیهانە نوێیە، بەڵام بەم جیهانە نوێیەدا هەڵواسراوم.

من نازانم ماوەی ئەو بەشە ژیانەم دیاری بکەم و بزانم چەندە بووە!!

بەڵام ئەوەندە دەزانم کە زۆر زۆر بووە، شوێنێکی ترسناك و ڕووخێنەر بوو، هەستم بە ترسی زۆر دەکرد و، دەمزانی کە من بەم شوێنە ناخۆم و دەبێت لێی دەربچم، بەڵام بۆ کوێ بچم؟

لەم کاتەدا کە من ئەم پرسیارەم لە خۆم دەکرد، شتێکی نوێم لە سەرو تاریکیەکەوە لێ دەرکەوت، زۆر جوان بوو، ئەگەر هەموو ژیانم تەرخان بکەم بۆ ستایشی ئەو جوانیە هەرگیز وشە و ڕستەم بۆ نادۆزرێتەوە هەتا مانای ئەوێ بگەیەنمە ئێرەی دونیا.

دەزولەیەکی سپی کە ڕەنگی ئاڵتونی تێیدا زاڵ بوو دەرکەوت، ئیتر تاریکی دەوری من هەمووی وەکو تەم و مژێك ڕەویەوە، دەنگێکی زیندوو، دەتوت پارچە مۆسیقایەکە، کە هەرگیز چاوەڕوانی بیستنی نەبووبیت و، ئێستا کوت و پڕ لەو شوێنەدا زاڵ بوو بەسەر دەنگی پیکێکی ناسازدا و پەیتا پەیتا لە تاریکی و ترسناکی دور دەکەوتیتەوە و لە ڕووناکیەکی زۆر پڕ شادمانی نزیك دەبوویتەوە.

لە ناوەڕاستی ڕووناکیەکەدا دەرگایەك بەدەرکەوت، ئیتر سەیری ئەو ڕووناکیەم نەکرد کە دەسوڕایەوە، چونکە کەمەندکێشی دەرگاکە کرام، کە لە تونێلە نورانیەکەوە بە خێراییەکی سەرسوڕهێنەر برام. لە ساتێکدا ئاودیوی دەرگاکە بووم و، لە جیهانێکی زۆر جیاوازدا بووم.

غەریبترین و جوانترین جیهانێك کە بینومە ئەوێ بوو.

زۆر ڕووناك، گەش گەش بە ژیان، وشەکان بەشی وەصفی ئەوێ ناکەن، هەستم کرد لە دایك ئەبم، ناڵێم لە دایك دەبوومەوە، چونکە ئەوێ ئەوەندە پڕە لە مانا و ژیان و زیندوێتی، هەست ناکەیت لەوەو پێش ژیانت بینی بێت!

کە سەیری ژێرەوەم کرد، ناوچەیەکیسەوز و پڕ لە گوڵی جۆراو جۆر بوو، دەفڕیم بەسەر تاڤگە و درەخت و مێرگەکانی دا، ڕووبارەکانی زۆر جوان بوون، خەڵکی زۆری لێ بوو، مناڵی لێ بوو، مناڵان یاریان دەکرد، پێ دەکەنین، مرۆڤەکانی ئەوێ گۆرانیان دەوت و ئاهەنگیان دەگێڕا، جل و بەرگیان سادە بوو، بەڵام زۆر جوان بوو، ڕەنگی جل و بەرگەکانیان هەمان وزە و جوانی درەخت و گوڵەکانی هەبوو، جیهانی خەونەکان بوو، بەڵام خەون نەبوو.

هەرچەندە من نەمدەزانی پێشتر لە کوێ بووم، یاخود چی بووم، بەڵام لە یەك شت زۆر دڵنیا بووم، ئەویش ئەوە بوو، کە ئەم شوێنەی منی قبوڵ کردوە حەقیقی و ڕاستەقینەیە.

بەداخەوە وشەی حەقیقی و ڕاستەقینەش ناتوانێت مانا بێت بۆ ئەو پێناسەی کە دەمەوێت بیناسێنم.

کات ئەو کاتە نیە کە لەسەر زەوی دەیناسین، ئەستەمە پێناسەی کاتی ئەوێ بکرێت.

من لە شوێنێکدا بووم، پەڵە هەوری سپی شێوە گوڵین لە چوار دەورم بوو.

باڵندە و فریشتەکان جیاوازن لەوەی کە ئێمە لەسەر زەوی پێی ئاشنا بووین، فریشتەکان زۆر باڵا و بڵندن.

دەنگی تەسبیحاتێك کە صەدا و سرودێکی ئێجگار جوان و باڵا و ناسکی هەبوو، لە کاتی جوڵە و باڵگرتنەوەی فریشتەکان دەبیسترا.

ئەو دەنگە ئەوەندە هەست پێکراو بوو، وەك باران بوو، پێستت هەستی پێ دەکرد، چ جای ئەوەی شعور و هەستەکانی تێر دەکردیت.

لەوێ بینین و بیستن دوو شتی جیاواز نین.

دەمتوانی جوانیەکان ببیستم، دەنگەکان ببینم.

ئەگەر شەڕ نەبێت ویست و ئیرادەی ئازاد نابێت، بەبێ ئیرادەی ئازادیش گەشە کردن و بەرەو پێش چوون دروست نابێت.

بەڵام خێر و خۆشەویستی هێشتا لە جیهانەکەماندا زاڵە و، لە کۆتاییدا سەردەکەوێت.

چەندین گەردوون هەیە، بەڵام مرۆڤ لەم گەردوونە و لە هەموو شـوێنێکی دونیـادا وێنەی نیە و گەورەی هەموویەتی. ئەو جیهانانە جیا نین لە ئێمە، هەمـوو شـتێ لە ژێـر سایەی خوایەکی میهرەباندایە و زاڵە بەسەر هەموویدا.

هەموو ژیانم تەرخان بکەم بۆ ئەم کارە، هێشتا کەم و کەسرە و مافی نـادەم، چـونکە حەقیقەتێك لەوێ فێری بووم حەقی نادرێت.

لەوێ وەکو وانەکانی مێژوو، بیردۆزەکان فێر نەکرام! بەڵکـو ڕاسـتەوخۆ پێشکەشـم کرا، هەتا ئێستاش هەڵگری ئەو زانیاریانەم.

ئەستەمە لە دونیا، لەوە تێ بگەیت کەچی دەگوزەرێـت لەو دونیـا. واتە لە هەمـووی حاڵی نابیت.

نامەیەکی زۆر گرنگم پێ گەیشت، کە موحیبەت بوو.

بێ گومان موحیبەت بنچینەی هەموو شـتێکە، مـوحیبەتی ڕۆژانە هەمـوو کەسـێك دەیزانێت، ئەو مـوحیبەتەی کە سـەیری هاوسـەرەکانمانی پـێ دەکەیـن، منداڵەکانمـان، لەسەر پاکترین و بەهێزترین شێوەی موحیبەت، هێشتا دڵۆپێـك نـیە لە دەریـایەکی بـێ بنی ئەوێ، خۆشەویستی ئەوێ دەستی ئەنانیەتی پێ نەگەیشتوە.

لەوێ خۆشەویستی بێ مەرجە، ئەوانەی ئەزموونی نزیکبـوونەوە لە مردنیـان بینیـوە زۆرینەیان دەزانن خۆشەویستی بێ مەرج چیە؟

بەڵام ئەوەی نەدیبێت نازانێت!!

ئەوانەی دەگەڕێنەوە بـۆ دونیـا، تەنهـا وشـەیان لەبەر دەسـتایە بـۆ تەعبیـری ئەوەی چەشتویانە و بینیویانە و ژیاون تیایدا.

ئەمەش نـاتەواو دەردەچێـت و، مانـای تەواو ناگەیەنێـت، وەك ئەوە وایە کە تـۆ بە نیوەی پیتە ئەبجەدیەکان بتەوێت کتێبێکی قەبارە گەورەی عەرەبی پڕ مانا بنوسیت!!

یەکێك لە بەربەستەکانی ئەو کەسانەی گەشتی نزیکبوونەوە لە مردنیان کردوە ئەوەیە کە ناتوانن جارێکی تر هەڵکردن و خۆ گونجاندن دروست بکەن لەگەڵ دەوروبەر و پێوەندەکانی ژیانی دونیادا، بەڵام بەربەستی گەورەیان ئەوەیە کە ناتوانن تەعبیر لە مانای ڕاستەقینەی موحیبەت بکەن، ئەو موحیبەتەی ئەوان ئەزمونیان کرد و چەشتیان.

بیرمان دەچێتەوە کە ئێمە قودرەت و توانامان هەیە، عەقڵ هەڵدەستێت بە پەردە پۆش کردنی بوعدە گەردونیە گەورەکە لێمان، هەروەکو چۆن تیشکی خۆر لە ڕۆژدا ئەستێرەکانمان لێ دەشارێتەوە.

بیر بکەنەوە چەندە تێروانینمان کورت بین دەبوو، ئەگەر لە شەودا ئاسمانی پڕ لە ئەستێرەمان نەبینیایە، ئیتر ئەو کاتە تەنها بە عەقڵ دەمانڕوانی، عەقڵیش بە تایبەتی لای چەپی مێشك کە بەرپرسە لە زمان و مەنطق، ئا لەو شوێنەی کە هەست و شعوری عەقڵانی و هەست کردن بە خود لە دایك دەبێت، ئیتر ئەوەیە دەبێتە بەربەست لە ڕێگەی مەعرفە و شارەزایی زیاترمان بەوەی کە زۆر بڵند و باڵایە، لەبەر ئەوە ئێمە وەختێ لەسەر زەوی دەژین، لە بەردەم ئاستەنگیکی گەورەداین، کاتێك بێ ئاگاین لە جیهانە نەبڕاوەکەی تر، پێویستمان بەوەیە کە مەعرەفەی گەورەتر بەدەست بێنین بۆ ژیانێکی شایستە تر کە لە پێشمانە!

ئەو کاتە دەتوانین بڵێین بە کامڵی عەقڵەوە کار دەکەین.

ئەو زانستەی کە هەموو ژیانم بۆ تەرخان کردوە، هیچ دژواریەکی نیە لەگەڵ ئەوەی کە لە سەرەوە فێری بووم.

ئەوانەی خۆیان بە عەقڵانی و زانستی دەزانن، وا دەزانن دژایەتی هەیە و پێکەوە نایان کرێت، چونکە ئەوان سنوردارن لە بازنەی مادەدا، وای دەبینن مادە و دەرەوەی مادە و ڕۆحانیەت کۆ نابنەوە.

به هەڵەدا چـوون، بـڵاو بـوونەوە و خەڵەتانـدنی زۆریـنەی خەڵکـی بە نـاوی عەقڵانیەت و زانستەوە، هۆکاری نوسینی ئەم کتێبەی منە، هەتا ڕێنموییەك بکەم.

خۆشەویستی بێ مەرج، گرنگترین شتێك بوو کە من لە گەشتەکەمدا بەدیـم کـرد و دۆزییمەوە، بڵاو کردنەوەی ئەم پەیامە بنەڕەتیە - بەو ئاسـانیە کە تەنـانەت منـاڵانیش بە ئاسانی قبوڵی بـکەن - گـرنگترین ئەرکـی سـەر شـانی مـنە کە بـیگەیەنم. ئەنیشـتاین دەڵێت: "کێشەی گەورەی ڕاستەقینەی مرۆڤ ئەوە دیاری دەکات، چەنـدە توانیـویەتی ڕزگاری ببێت لە خودی خۆی".

من ئێستا حەقیقەت دەناسم، ئێستا دڵنیام لەوەی کە من لە خزمەت خودا بووم.

هیچ شتێك ناتوانێت ئەوەم لێ زەوت بکات.

ئەو تێگەیشتنە هەڵەیەی کە دەڵێت ئێمە بە یەکێك لە ڕێگاکان دەتوانین لە خـوا جیـا ببیـنەوە، ئەم بیـر کـردنەوەیە نـاتەواوە و هەڵەیەکـی زۆر گەورەیە و بنچیـنەی هەمـوو جۆرەکانی دوو دڵی و قەلەقی و ڕاڕاییە لە بووندا، چارەسەریش تەنهـا بەوە دەبێـت، کە بە هیچ جۆرێك، هیچ شتێك نیە بتوانێت لە خوا دورمان بخاتەوە و لە خوا دور بین.

دەبێت سوپاسی خوای گەورە بکەین لەسەر نیعمەتی 'بیرچوونەوە'.

بیر چوونەوەمان لە دونیادا بۆ ئەو پێناسە باڵایەی کە لە ئاسـمان هەمـانە، ڕێگەمـان پێ دەدات لەسەر زەوی بژین، وە لە ئێستادا بـژین بەوپەڕی چـالاکی و وزەوە، ئەمەش مانای ئەوە ناگەیەنێت لە جیهانی سـەرەوە حـاڵی نەبـین و هەوڵـی بـۆ نەدەیـن، ئەگەر کەسێك باوەڕی وابێت کە گەردوون هیچە و بەرەو هیچـیش دەڕوات و ئامـانجێکی لە پشت نیە، بیر کردنەوەیەکی هەڵە و سلبیە.

لە ئەزموونەکەمـدا کـۆمەڵە زانیـاریەکم وەگـرت لەسـەر سروشـت و یاسـا گەردوونیەکان، کە زۆر زۆر لەسەرو تێگەیشتنی منەوە بوون، بەڵام لێیان حـاڵی بـووم، چونکە سەرقاڵیەکانی دونیام نەمابوو، مەیدانێکی بەرفراوانم هەبوو بۆ حاڵی بوون.

هەر چەندە ئێستا گەڕاومەتەوە بـۆ سـەر زەوی و چـواردەورە دراوم بە گەردیلەکـانی مادە و ژیانی دونیا، بەڵام هێشتا شعورێك بەوەی ئەویَ دەکەم.

دەتوانم بڵێم بۆشاییەکی گەورە هەیە لە نێوان تێگەیشتنی زانستی ئـێمە بـۆ گەردوون و، حەقیقەتی گەردوون کە من بینیم.

دڵنیام ڕۆژێك دێتە پێشەوە کە مرۆڤایەتی بە ژمارەیەکی یەکجـار زۆریـان دەگەنە ئەم ڕاستی و حەقیقەتە.

بەڵام ئێستا وای نابینم پێـی بـگەن، چـونکە وەك ئەوەیە ئـاژەڵێکی کێـوی بـۆ تەنهـا ڕۆژێـك بکەیـنە مـرۆڤ و شـارەزای هەمـوو زمـان و کلتـور و پێشـکەوتنی هەمـوو مرۆڤایەتی ببێت و، جارێکی تر ببێتەوە بە ئاژەڵە کێـویلەکە و بگەڕێـتەوە ناویـان و، ئەو شارستانیەت و پێشکەوتنی مرۆڤایەتیەیان بۆ بگێڕێتەوە، ئێمەش بەو جۆرەین!!

باشـترین ڕێـگە بـۆ تەعبیـر کـردنم ئەوەیە کە مـن نمـوونەیەك 'سـمپڵ' ێـك لە ئەزموونەکەم دەتوانم بکەمە وشە و، جۆرێك لە تێگەیشتن بە ئێوە بدات.

لەو جیهانەوە وەختیَ پرسیار دروست دەبێت، خێرا وەڵام ئامادەیە، وەك گوڵێـك کە گەشە دەکات، وەڵامەکان بەڵیَ و نەخێر نەبـوون، ڕاڤە و شـیکاری دورو درێـژ بـوون، ئەگەر بتەوێـت بە پێوەرەکـانی زەوی بپێورێـت، چەنـدین تەمەنـی یەك لە دوای یەکـی دەوێت و هێشتا بەشی وەڵامەکان ناکات.

توانیم ئەوە ببینم کە زەوی شوێنی تێکەڵ بـوونی خێـر و شـەڕە، ئەمەش یەکـێکە لە بژاردە ناوازەکانی ژیانی دونیا، بەڵام لەسەر زەوی خێر زیاتر و فـراوانترە لە شـەڕ، بەڵام ڕێگە دراوە بە شەڕ و خـراپە کـاریگەری هەبێـت، بە جۆرێـك کە ئەسـتەمە پاڵپشـت و کۆمەکی بکرێت لە جیهانی باڵاوە، بەڵام ڕێگەشی داوە کە سـەر تـوێژ و غاڵـب بـوون ببەخشێتە شەڕ لە هەندیَ کاتدا هەتـا ئەو دەرەنجـامە حەتمـیە لەکەدار نەبێـت کە ئـێمە ئازادی ویست و ئیرادەمـان پـیَ بەخشـراوە و لـێمان زەوت ناکرێـت و زۆرمـان لـیَ نەکراوە، بەڵام گرنگە بزانین بەرەکەتی ئاسمانی لەگەڵ نیە.

شـەڕ بە شـێوەی پەڵەی بچـوك و دەنـكە زیخـی بچـووك و كەم پەرش و بـڵاوە لە گەردوندا، ئەوەندە ڕێی پێـدراوە وەك زیخێـك یـاخود چەنـد دەنـكە زیخێـك بێـت لە كەنارێكی بەرفراوانی دەریادا.

ئەوانەی بۆی دەگەڕێن و دەیانەوێت، ئەو ئیختیارەیان لێ زەوت ناكرێت.

بەڵام خێر و موحیبەتی بێ مەرج و ویست و ئومێدی بێ سـنور هەمـوو گەردوونـی داگرتووە.

باجی ئەم ئازادی ویست و ئیرادەیە، هەندێ جار بریتی یە لە دوور بـوونی محـبەت و قبوڵ بوونی خەڵكی.

ئێمە ئازادین، بەڵام چواردەورە دراوین بە ژینگەیەك وامان لێ دەكـات هەسـت بەوە بكەین كە ئازاد نین.

ئازادی ئیرادەش گرنگیەكی زۆری هەیە لە دونیادا زۆر زۆر گـرنگە، ڕۆژێ لە ڕۆژان ئەوەمان بۆ دەردەكەوێت كە ئەم ئازادیە دەمـانگەیەنێتە دوریەكـی ئێجگـار دور كە ئیـتر لەوێ خاڵی دەبینەوە لە زەمەن و دەست كۆتا دەبین لە كات و زەمەن.

وا دەبینرێت كە ژیـانی دونیـا گرنـگ نـیە، چـونكە هـیچ و بچـووكە لەبەردەم هەتـا هەتایی قیامەتدا.

بەڵام دونیا زۆر گرنگە هەتا بتوانین گەشە بكەین و ڕووە و خوای گەورە بچین.

ئەم جوڵە و ویست و گەشە تەوحیدیەیە كە دەبێتە شـوێنی گرنگـی پێـدانی جیهـانە باڵاكانی ئەرواح و فریشتەكان... هەموو ئەوانەی كە من لە دەرگـای بەرفراوانـی نـوردا بینیمن، بەم جۆرە بوون.

ئێمە مەخلوقاتێكی ڕۆحین، بە شێوەیەكی كلتی دانیشـتووی عەقـڵ و جەسـتەیەكی فانی كراوین، بە جۆرێك كە بگونجێت لەگەڵ ژیانی سەر زەویدا.

ئەو بوونە ڕۆحیە باڵایەی کە هەمانە، ڕێگەمان پێدراوە و پێمان بەخشراوە کە ڕۆژێ لە ڕۆژان وەری بگرینەوە، ڕۆژێك کە بە هۆش دێینەوە و ئامادەی وەرگرتنەوەی دەبین.

دەبێت لە پەیوەندی بەردەوام دا بین هەتا ئەم بەشە گەورە و سەر سورهێنەرەمان دەگەشێتەوە و بە دەستی دەهێنینەوە و دەیخەینە بەر ڕووناکی و لە تاریکی دەربازی دەکەین.

ئەمە ئەو ماهیەت و جەوهەرەیە کە لە هەموو یەکێکماندا دەژی و، خوای گەورەش دەیەوێت لە ئێمە کە هەوڵ و ئیختیاری ئەو ئازاد بوون و بەر ڕووناکی دانە خامۆش نەکەین.

ئەمەش لە ڕێگەی موحیبەت و شەفەقەتەوە دەبێت.

موحیبەت و شەفەقەت بونیادێکی مادی هەیە، هەتا ئەوەندە باڵا دەکات، ئیتر شکڵی جیهانی ڕۆحی وەردەگرێت.

ئێمە عەوداڵی پێچەوانەکانی موحیبەت و شەفەقەتین، دەشمانەوێت دەرەنجامەکانی موحیبەت و شەفەقەتیشمان دەست بکەوێت.

خوای گەورە بە سۆزە لەگەڵ عاطفە و سێبەرەکانی موحیبەتێك کە ئێمە قوربانی بۆ دەدەین، خوای گەورە ئەوەش دەبینێت کە ئێمە بیرمان چۆتەوە!

خودا خودایە و ئەو ئەمانەتە ترسناکەش دەبینێت کە ئێمە بە نەزانی لە کۆڵمان نا، بەڵام زۆر بە بەزەییە بەرامبەرمان.

ئەو کۆمەڵە قورس و ئەمانەتە پڕ زەحمەتەشمان دەبینێت کە وەعدەمان دا بۆ چرکەیەکیش خوا لە یاد نەکەین و کەچی نوشوستیمان هێنا و هێشتا زۆر زۆر بە ڕەحمیشە بەرامبەرمان.

خوای تەعالا مرۆڤی بە جۆرێك دروست کردوە، کە بەرگەی هەڵکردن و مانەوە لە جیاواز بگرێت، نەخۆشێکی درێژ ماوە لەسەر جێگا، عەقڵ فێری ئەوە دەبێت کە

فەرامۆش کردن بسازێنێت و مرۆڤ هەڵبکات لەگەڵ صەبری درێژ خایەن، هەتا نزیک دەبێتەوە لە سروشتی بوون و ئاسایی بوونەوە.

خوای گەورە هەمووماني خۆش دەوێت، ئەم خۆشەویستیەش لەسەرو تێگەیشتنی ئێمەوەیە، ئێمە شەڕ لەسەر کەم کردنەوەی ئەو خۆشەویستیە دەکەین، ئارەزوو ویست و بەرژەوەندیمان تێکەڵ بە نزیکی و خۆشەویستی و دابڕانی غەیری خۆمان دەکەین، بەڵام ئەوە خۆشەویستی خوا نیە و، ئەو زاتە یەك یەك گرنگی تایبەتی بە مرۆڤ و دروستکراوەکانی دەدات... مادام بۆ هەموانە، دەبێت ئاوا بیناسین!

## چل هەزار بەسەرهاتی ئەزموونەکان



* 'کاندیس' دەڵێت: لە ئەزموونەکەمدا دوو فریشتە تۆماری کردەوەکانی خۆمیان پیشان دام، هەموویم بینی.

* 'کلارنس' شۆفێری ترەیلە بوو دەڵێت: بەهۆی ڕووداوی هات و چۆوە تووشی کارەسات و قەدەرێك بوومەوە!

لە سەرەوەی جەستەکەمەوە خۆم و هەموو ئەو خەڵکانەم بینی کە لە دەوری من و ئۆتۆمبیلەکەدا بوون، هاوارم لە خەڵکەکە دەکرد، من هیچم بەسەر نەهاتوە، ئەوە لێرەم و ماوم، بەڵام کەس گوێی لە من نەبوو!

* 'ڕۆشیل' هەوڵی خۆ کوژی داو دەڵێت: زۆر باش بوو کە گەڕامەوە و نەمردم، چونکە خۆمم لە سزایەکی زۆر سەختا بینیەوە، گیان لەبەرێکی ترسناکی وەك غۆرێلا بەردەوام دوام کەوتبوو ڕاوی دەنام و سزای دەدام.

* دەزگایەکی تایبەت بە ئەزموونەکانی 'نزیکبوونەوە لە مردن' هەیە، چل هەزار چیرۆك و ئەزموونی ئەو کەسانەی کۆ کردۆتەوە کە ئەزموونەکەیان بینیوە.

* ’جیفری لونغ‘ لە کتێبە تـایبەتەکەی خـۆی دەربـارەی ’ئەزمـوونی نزیکبـوونەوە لە مردن‘دا دەڵێت: ئێستا و لەم سـەردەمەدا بەڵـگە و ئامـاژەی زانسـتی زۆر هەیە لەسـەر ’نزیکبوونەوە لە مردن‘ و بینینەکانی.

دکتۆر ’جیفری لونغ‘ پسپۆڕە لە تیشکەوەری گرێ سـەرەتانیەکاندا، لە کتێبەکەیـدا کە بە ناوی ’بەڵگە لەسەر ژیانی دوای مردن‘ە، زۆر بابەتی گرنگ و فراوانی نوسیوە.

* دوایـین ڕاپـۆرتە زانسـتییەکانی تـایبەت بە ’ئەزموونەکـانی نزیکبـوونەوە لە مـردن‘ دەڵێن: ئەوانەی هەتا ئێستا ئەزموونەکانی خۆیان ڕاگەیاندووە و پێیان زانـراوە، شەسـت ملیۆن ئەزموونی تێپەڕاندووە!!

کەواتە سەدان ملیۆن مرۆڤ هەن کە ئەزموونەکانیان بینیوە و پێیان نەزانراوە!!

## دوو مامۆستا



مامۆسـتایەکی کـچ دەڵێـت: لەگەڵ مامۆسـتایەکی هاوڕێمـدا کە مامۆسـتای یەك قوتابخانە بووین، زۆر یەکتریمان خۆشدەویست و چەندین ساڵ بوو پێکەوە بـووین، سکی هەبوو، پێی وتـم: مـن کێشـەم هەیە لەگەڵ مێـردەکەم، دەمەوێـت تـۆ ئامـادەی ڕۆژی مناڵ بوونەکەم بیت و لەگەڵـم وەرە بـۆ نەخۆشـخانە، بەڵـێ ڕۆژی منـاڵ بـوون هاتە پێشەوە و لەگەڵی چووم و بەردەوام قسەی خۆشم بۆ دەکرد هەتا بـاری دەروونـی باش بێت، تەنانەت کە مناڵەکەی بوو پێم وت: ئەوە پێش تۆ مناڵەکەتم بینی!!

لە ناکاو دوای چەند مانگێك ئەم دایکە کۆچی دوایی و مناڵێکی سـاوای بـێ نـازی بەجێ هێڵا!! ئیتر دایك و باوکی کـچەکە مناڵەکەیـان بەخێـوکرد، هەتـا ئێسـتاش لای

ئەوانە و، گەورە بـووە و لە هەمـان قوتابخـانەیە کە مـن تیایـدا مامۆسـتام و دایکـی منداڵەکەش لێرە مامۆستا بوو.

ئەم منداڵە ئێستا کوڕێکی جوانە، پـۆلی چـواری سـەرەتاییە و مـن زۆر گرنگـی پـێ دەدەم، بەڵام هەرگیز پێم نەوتووە کە لە کاتی لە دایك بوونیدا من ئامادە بووم!

چونکە حەزم نەدەکرد قوتابییەکانی تر بـزانن کە مـامەڵەیەکی تـایبەتی لەگەڵ دەکەم، هەروەها پێم باش نەبوو ڕابردووی خەمناکی دایکـی وەبیـر بهێـنمەوە، ڕەنـگە داپیـرە و باپیرەی پێیان وتبێت کە من و دایکی هاوڕێ بووین، بەڵام مـن هەرگیـز هـیچ شـتێکم لەو بارەیەوە پێ نەوتوە.

ئەم منداڵە ئێستا تەمەنی نۆ ساڵ و نیوە، بەویش و بە قوتابیەکـانی هـاوپۆلی ئەو پـێم وتن کە هەچ یەکێکتان کۆنترین بیرەوەری خۆتانم بۆ بنوسن و پێمی بدەن.

هەندێ لە قوتابیەکان باسی پێش قوتابخانە و هەنـدێکیان بـاخچەی سـاوایان و ئەو یادەوەریانەیان بـۆ نووسـیبووم، بەڵام ئەم منـداڵە شـتێکی بـۆ نووسـیبووم کە سـەراپای جەستەی ڕاچڵەکاند، کە نووسیبووی: مامۆسـتا مـن کاتێـك لە سـکی دایکمـدا بـووم ئێوەم بینیوە و لەو کاتەشدا مـن لە بەهەشـت بـووم، مامۆسـتا کاتێـك تـۆ و دایکـم لە چاوەڕوانی لە دایك بوونی مندا بوون، من نەدەبیـنرام، ڕۆحێـك بـووم، تـۆ و دایکـم بینی کە هاتن بۆ نەخۆشخانەی منداڵ بوون، مامۆستا: تۆ سەیارەیەکی خۆڵەمێشیت پـێ بوو، تەسجیلی سەیارەکەش لەسەر گۆرانی زستان، بەهار، پـایز، هـاوین بـوو، نـازانم ناوی گۆرانیەکەش چی بوو، بەڵام ئەو وشانەی تیا بـوو، تـۆ و دایکـم هەتـا گەیشـتنە نەخۆشخانە گوێتان لێ گرتبوو، "من حەوتساڵیشە هیچ جۆرە سەیارەیەکم پێ نیـیە، بێجگە لە من و دایکی ئەم منـداڵە هـیچ کەس ئاگـاداری ئەوە نەبـوون کە هـاتووین بـۆ نەخۆشـخانە و لە ڕێگـادا گـوێمان لەو گـۆرانیە گرتـووە، کاتێـك ئەم منـداڵە تەمەنـی گەیشتووەتە سێ مانگان دایکی مردووە، کەواتە چۆن ئەم هەموو وردە کـاریەی زانیـوە ئەگەر بە ڕۆح ئاگای لێ نەبوویێت".

مامۆستا: من ئاگام لێ بوو لە ڕێگەش لاتدا بۆ ئەوەی بەنزین بکەیتە سەیارەکەت، پرسیارێکیشت لە کارمەندی بەنزینخانەکە کرد بەوەی کە کام ڕێگایە نزیکترینە بۆ نەخۆشخانەی مناڵ بوون "بەڕاستی سەراسیمەی کردبوم بەو هەموو زانیارە وردەی کە نووسیبووی".

مامۆستا گۆڕەپانی وەستانی سەیارەکانیش پڕ بوون لە سەیارەی خەڵکی، ئەوە بوو ناچار بوویت سەیارەکەت لە سوچێکدا بەجێ بهێڵی و گرنگیش بە خراپی شوێنەکەی نەدەیت و بە پەلە خۆت بگەیەنیتە دایکم کە لە پێشوازی نەخۆشخانەکە چاوەڕوانی تۆ بوو هەتا سەیارەکە لە شوێنێکدا جێ بکەیتەوە.

"هەرگیز هیچ کەسێك ئەم ڕووداوەی لێ نەبیستووم، تەنانەت دایکی منالەکەش نەیزانیوە سەیارەکەم لەو شوێنە لاوەکیەدا ڕاگرتووە".

مامۆستا! کاتێك من لەدایك دەبووم، دوعام دەکرد و دەموت خۆزگە مامۆستا... دایکم بوایە، چونکە هەر لەو ساتەدا دەمزانی کە دایکم زۆر ناژی و دەمرێت! بەڵام پێیان وتم: ترست نەبێت لە جیهانی نادیارەوە چاودێری تۆ دەکرێت و فەرامۆش ناکرێیت، ئەو مامۆستایە نابێت بە دایکی ڕاستەقینەی تۆ.

مامۆستا! من هەر وازم نەدەهێنا و لە تۆ دەپاڕامەوە کە ببیت بە دایکی ڕاستەقینەی من، بەڵام تۆ بە هیچ جۆرێك وەڵامت نەدامەوە چونکە منت نەدەبینی و وتەکانی منت نەدەبیست، لە دوای ئەوەی کە بێ ئومێد بووم لەوەی تۆ ئاگات لە من نیە، کەوتمە دوات، تۆ ڕۆشتی لە تەلەفونی گشتی تەلەفونت کرد، سەرمات بوو، شوێنەکەش کەسی لێ نەبوو، چاکەتێك لەوێدا بوو، خاوەنی دیار نەبوو، تۆ چاکەتەکەت لەبەر کرد، من ئەمزانی کە ئەو چاکەتە هی تۆ نییە و هی کەسێکی ترە، ئەم منالە هیچ یەکێك لەم ڕاستیانەی نەبیستووە، چونکە من بۆ هیچ کەسێکم باس نەکردووە، هەموو وتەکانیشی ڕاست بوون و بەو جۆرە بوو، تەنانەت گێڕانەوەی لەبەر کردنی ئەو

چاکەتە تووشی حەپەسانی کـردم، کەس کەس لەو شـوێنە نەبـوو کە مـن چـاکەتەکەم هەڵگرت و لەبەرم کرد!!

بەڕاستی بەسەرهاتە ڕاستەقینەکەی ئەم منالە کە خۆم شاهیدی بـووم تەواوی ژیـانی منی گۆڕی.

## یا غفور



' ا ، م ، ش ' خەڵکی وڵاتی سعودیەیە و لە تـائف دادەنیشـێت، ئەم پیـاوە دەڵێـت: هاوینی ساڵی (١٩٩٨) بوو، تەمەنم (٢٥) ساڵان بوو، تووشی حاڵەتێك بووم، شـەش شەو و ڕۆژ نەخەوتم، زۆر بە کەمـی قسەشـم دەکـرد، نـان و ئـاوم بـۆ نەدەخـورایەوە، دەچوومە سەر کارەکەم، بەڵام کەمترین دەوامـم بـۆ دەکـرا، سـەرم دەیەشـا، جەسـتەم شەکەت و ماندوو بوو، شەو و ڕۆژم لێ تێك چووبوو، شەشەم ڕۆژ بوو کەس و کـارم بردمیان بۆ لای کەسێك و قورئانی بەسەردا خوێندم و هەنـدێ دەرمـانی گیایشـی پـێ دام هەتا خەوم لێ بکەوێت، کاتژمێر یانزەی بەیـانی بـوو، دەرمـانە گیایەکـانم خـوارد، هیچ خەوم لێ نەکەوت، دایکم بۆ شەوەکەی جێگای بۆ ڕاخسـتم و پێـی وتـم: کـوڕم ئێستا شەوە و بەڵکو بخەویت، لەسەر جێگـاکە ویسـتم ڕابکشـێم، هەسـتم کـرد کۆتـا شەوی ژیانمە، بە دایکمم وت: دایکە قورئانێکم بۆ بێنە، دایکم بـۆی هێنـام و دەسـتم کرد بە خوێندنی سوورەتی 'العنكبوت' لە دواییدا دوعام کـرد و وتـم: خـودایە قورئـان بکەرە بەهاری دڵی ماندووم "اللهـم اجعـل القـرآن ربيـع قلبـي"، هەسـتم کـرد خەوم دێت، پێم خۆش بـوو، ئامـاژەیەکی بـاش بـوو، نـزیکەی (١٥) خولەکێـك خەوم لـێ کەوت، خەبەرم بویەوە دڵم زۆر بە خێرایی لێی دەدا، هەسـتم بە نزیکبـوونەوەی مەرگ دەکرد، هەستێکی زۆر جیاوازە، لە دوای ئەوە هەستم کرد کەسێك دوو بزمـاری پێـیە و

لە مل و گەردنمی گیر کردووە و دەمرم، ئیتر کت و پڕ مـن 'ڕۆحـم' لە جەسـتەم جیـا بوویەوە، خۆم لەسـەر ڕووی ماڵەکەمـانەوە بینـیەوە و لە خـوارەوەش لاشـەمم دەبینـی ڕاکشاوە، دەبینم زۆر سوکەڵە و بێ کێشەم، بەڵام زۆریش چـالاك و زینـدووم، دەبیـنم برا و خوشکەکانم دێن و دەچن، جەستەم وەك کراسێکی فەرامۆش کراو کەوتبوو!!

ئیتر سەرکەوتم بۆ ئاسمان، زۆر زۆر سەرکەوتم، زۆر جوان و دڵ ڕفێن بـوو، بانـگ کەرێک بانگی لێ کردم، من ئەوم نەبینی، وتی: بوەستە.

منیش وەستام.

وام دەزانــی لە بەردەم ئەو دەنگــی هەیـبەت دارەدا مــن و گەردوون گەردیلەیەکــی بچووکین و هیچی تر.

دەنگەکە وتی: بڵێ یا غفور

وتم: یا غفور... دیسان کەوتمەوە ڕێ.

دیسانەوە وتی: بوەستە!

منیش وەستامەوە، وتی بڵێ: یا غفور... منیش وتم: یا غفور...

ئامۆزایەکم هەبوو، زۆر هاوڕێی یەکتر بووین، ئەویش پەیدا بـوو، بەڵام ئەو نەیـوت یا غفور... ئەو بێ دەنگ بوو. دوای ئەوە من و ئـامۆزاکەم پـێکەوە سـەرکەوتین، دوای ماوەیەك بە هەردوکمانیان وتەوە بوەستن!!

هەردوکمان وەستاین، ئامۆزاکەم لێ ون بوو. ،

بە من وترا بڵێ: یا قدیر، وتم: یا قدیر...

سەرکەوتم بۆ بەرزتر، وتی: بوەستە، وەستام یاخود باشترە بڵێم وەستێنرام..

سەیری خوارەوەم کرد ئامۆزاکەم لێ دەرکەوتەوە، لەو خاڵەی کە وەستێنرا بوو سـەر نەکەوت یاخود سەریان نەخست، ئاگام لـێ بـوو جـارێکی تـر بە منـیش و ئەویشـیان وتەوە بڵێن یا قدیر!!

ئامۆزاکەم بێ دەنگ بوو بەڵام سەریان خست و ون بوویەوە لێم.

بەردەوام منیان سەر دەخست، هەتا لە شوێنکدا وەستێنرام کە ناتوانم جوانیەکەی وەسف بکەم، کەمترین وەسفێك ئەوەیە بڵێم ئەوە شوێنی ڕاستەقینەی منە!! ئەو شوێنەش بە تایبەتی بە من بەخشراوە و، خاوەنی ئەو دەنگەش منی خۆش دەوێت و لێم ڕازیە.

ئەو شوێنە باشترین شوێنە و ئەوەندەش دوورە هەرگیز لە دنیا خەیاڵی دووریەکەشی ناکرێت!

دەمزانی لەو شوێنەی من پلە و مەقامی زۆر گەورەتر هەیە، بەڵام زۆر پێی ڕازی بووم.

ئامۆزاکەم برا بۆ شوێنێکی زۆر دوور، کە شوێنی خەم و تووڕەیی بوو، شوێنی جۆرێکی تایبەتی سزا بوو، هەرگیز بەرگەی ناگیرێت. شوێنی گریانێکی ترسناك و هاوار و ناڵە و سوکایەتیەکی تاقەت پڕوکێن بوو...

بۆ من شتێکم پێ وترا، جیاواز لە ئامۆزاکەم. ئاگام لە سزا و قسە پێ وتنی ئەویش بوو، بەڵام هەردوو وتەکەم بیر چوویەوە 'یاخود بیرم برایەوە'.

ئیتر فەرمانێکی باڵا هەبوو بە گەڕانەوەم بۆ دونیا، زۆرم پێ ناخۆش بوو، وتیان کاتت ماوە، لە دواییدا دێتەوە بۆ ئێرە و هەرگیز بەجێی ناهێڵیت!!

ئیتر من بەڕێزەوە هێنرامەوە بۆ ناو جەستەکەم، بەڵام بینیم ئامۆزاکەم بە سووکایەتییەوە فڕێ درایەوە ناو دونیا و کەوتە خوارەوە، کەوتە شوێنێکی گەرم و لە بیابانێکدا دای بە زەویدا، لە کاتی هێنانەوە و فڕێ دانیدا من دەمبینی و دەمزانی لە کوێدا کەوتە خوارەوە و هاتەوە بۆ دونیا و زەوی، هۆشم هاتەوە، هەستم بە کامەرانی و دڵخۆشی و بارسوکی جەستەم دەکرد و خەوێکی خۆشم دوای ئەوە لێ کەوت و بانگی بەیانی فەرموو، خێرا خەبەرم بوویەوە و نوێژی شوکور و نوێژی بەیانیم ئەنجام

دا و لە مزگەوت گەڕامەوە، دیسانەوە خەوتمەوە، کە هەستام لە خەو بە تەواوی چاك بوومەوە و هەموو ئەزموونەکەم بۆ خزم و نزیکەکانم گێڕایەوە...

ئیتر دوای ئەوە زیاتر دەچمە خزمەتی قورئان.

کاتێك باسەکانی ئەزموونی نزیکبوونەوە لە مردنم بیست، ئینجا دڵنیا بووم کە ڕەنگە ئەو شەوە منیش بۆ ساتێکیش بوویێت دڵم وەستاوە و ئەو گەشتە زۆر سەیرەم کردووە و هەرگیزا و هەرگیز بیرم ناچێتەوە.

## زانست و زانیاریم کەمتر بوو لە یاری منالان



'ڕیتشارد کول' تەمەنی حەفتا و دوو ساڵە و باسی خۆی دەکات و دەڵێت: لە ژیانمدا هەرگیز دینداریم ئەنجام نەداوە و، دین گرنگ نەبووە لەلام، بەڵام ئێستا لە دوای ئەوەی ئەزموونی 'نزیکبوونەوە لە مردنم' بینی، هەموو شتێکی من گۆڕا و باوەڕم بە خوای گەورە هەیە.

هەموو ساڵێك دەچم بۆ سەر ڕێگای 'مونتیری' پێشبڕکێی ئۆتۆمبێل ئەنجام دەدەم، ساڵی (٢٠٠٥) بوو لەوێ بووم، ئازارێکی توند لە ملم و سنگم دروست بوو، هاوڕێیەکم هەبوو لەگەڵ خێزانی لەگەڵم بوون، وتیان: شتێك هەیە؟! دەستم ئارەقی دەکردەوە، ئەوەبوو ڕۆیشتین بۆ نەخۆشخانە، فشاری خوێنم بەرز بوو، ئیشاعەیان بۆ گرتم.

پزیشکەکە وتی: کێشەیەکی گەورەت هەیە، دەمارت تەقیوە و، خوێن بەربونت هەیە و پێویستت بە نەشتەرگەری خێرایە.

پزیشکی بەنج پێی وتم: دەبێت پلەی گەرمی جەستەت دابەزێنین، وەك ئەوەی لە بەستەڵەکەکان لە زستاندا مەلە بکەیت و بیبەستیت، پزیشکەکە ڕوون کردنەوەی زۆری پێدام، وتی: ئێمە هەموو ئەمانە بە نەخۆشەکانمان ناڵێین نەوەك بترسن و هەڵبێن، فرسەتی سەرکەوتنی نەشتەرگەریەکەش (١٠٪) یە.

کە بێ هۆش کەوتم، لە کوت و پڕێکدا ئاگام لە هەموو شتێك بوو، ویستم پێیان بڵێم من بەنج نەیگرتووم، ئاگام لە هەموو شتێکە، بەنجی زیاترم پێ بدەن، بەڵام نەمتوانی پێیان بڵێم!

سێ پزیشك و دوو پەرستیار لە نەشتەرگەریەکە کاریان دەکرد، خۆمم دەبینی، بە چەقۆیەکی نەشتەرگەری 'شلفە' سنگمیان لەت کرد و، پاشان مشاریشیان بۆ قەفەزەی سنگم بەکارهێنا، پاشان ئەوە بینیم دڵیان دەرهێنام لە شوێنی خۆم نەمام، دوای ئەوە هەموو شتێك ڕەش و تاریك داهات، بەڵام بە تەواوی ئاگام لە خۆم بوو، ئاگام لە قسە و باسەکانی هۆڵی نەشتەرگەریش بوو، دوای ئەوە دوو کەسی نورانی لە لای ڕاستم وەستابوون، ویستم لا بکەمەوە، دەنگێك بە دڵنیایی و لەسەر خۆییەوە پێی وتم: لا مەکەرەوە.

وتم: بۆچی؟!

وتی: لا بکەیتەوە و دەم و چاوم ببینی، دەمێنیتەوە، بەڵام تۆ کاتت ماوە لە دونیادا، کارت ماوە!! ئەگەر وا نەکەیت بەختەوەر نابیت.

وتم: باشە لا ناکەمەوە.

من باسی جیناتی مرۆڤم بۆ دەکرد کە چۆن زیاد دەکەن لە داهاتوودا.

پێکەنی!

وتم: بەچی پێدەکەنیت.

وتی: تۆ مامۆستای بیرکاریت، ئەم ژمارانەت لە کوێوە هێنا؟!

منیش خۆم دەرخست بەوەی کە زانست و زانیاریم هەیە، بەڵام دەرکەوت ئەوەی من شانازیم پێوە دەکرد لە یاری منالان زیاترێك نەبوو بۆ ئەو جیهانە بەرفراوانە.

ئینجا دەستی خستە سەر شانم و خۆشەویستیەکی زۆری بۆ دەربڕیم، وەسفی بە وشە و ڕستەی دونیایی ناکرێت. من دوای ئەوە گەڕامەوە ژیانی دونیا، هەرچی جارێك ئەم گەشتەم دەگێڕمەوە دەست دەکەم بە گریان، ئەم ئەزموونە تەواوی ژیانی گۆڕیم...

## دوو بڵێسەی ڕەشم بینی



زۆر نەبوو ماڵمان ڕۆیشتبوو بۆ 'میشیگان'، مناڵێکی کوڕمان هەبوو بە ناوی 'إشعیاء'.

ژنەکەی دەڵێت: 'مەسیح' هات بۆ سەردانی کردنمان، دایك و براکانیشی لەگەڵ بوو، پشوو بوو لە ئوتێل لامان دا، مەلەوانگەیەکی تیا بوو، 'سۆمیکا و مەسیح' چوون بۆ مەلەوانگەکە هەتا ئاگایان لە مناڵەکان بێت، هەشت نۆ مناڵێك دەبوون.

من قاچم خزا و سەرم بەر تیژی قەراغی مەلەوانگەکە کەوت و کەوتمە قوڵایی ئاوەکەوە و یەکسەر بێ هۆش کەوتم و ئیتر خامۆش بووم، تەنها هەستم بە چەند بڵقێکی ئاوەکە کرد و تەواو...

ئیتر ئەوە بوو پیاوێك فریا دەکەوێت و دەچێتە ناو مەلەوانگەکە و هیچی پێ ناکرێت بۆ هۆش هێنانەوەیان، کارمەندانی ئوتێلەکە تەلەفون بۆ ئۆتۆمبێلی فریاکەوتن دەکەن و دێن.

لە ئیسعافەکە دڵی مەسیح لە لێدان دەکەوێت، مەسیح دەڵێت: ئیتر لەوێدا یەکەم بینینم لە دەرەوەی جەستەم بینی، کچێکی پەرستارم بینی بەرگێکی سپی لەبەردا بوو، دەهات و دەچوو، لای کردەوە، وەك ئەوە بوو پێم بڵێت مەترسە تۆ زۆر باشیت، من سەیرم دەکرد لە شێوە و ڕوخساردا لە خێزانەکەم دەچوو، وام زانی ئەوە، دڵم زۆر خۆش بوو، بەڵام دوای ئەوە کەوتمە ناو تاریکیەکی تەواوەتی!!

گوێم لە هاوار و بانگ کردن بوو لەناو تاریکیەکە، دەنگی دەدایەوە. بە چرپە دەنگێك پێی دەوتم مەترسە ڕزگارت دەبێت.

بە دڵنیایەوە ئەوەی کە بینیم خەون و وڕێنە نەبوو، من دوای مردنم بینی، هەستم بە ون بوون و ڕووداوی ترسناك دەکرد لە پێشم، باپیرم و خزمەکانم لەوێ بوون پێیان دەوتم مەترسە، بەردەوام بە لە ڕۆیشتن بۆ پێشەوە، ئەم مەترسیە تێ دەپەڕێنیت.

گەیشتمە شوێنێك زۆر ترسناك بوو، دوو بڵێسەی ڕەشم بینی بەردەوام لێیان نزیك دەبوومەوە، بۆم دەرکەوت بڵێسەی ئاگرە، یەکپارچە پارە و سامان و ئاڵتون، فەرش و ڕاخراوی ژێر پێی ئەو ئاگرە بوو، کە زۆر نزیکی بوومەوە دەبینم سفرەی ئارەق خۆرەکانە و، گلاس و بتڵی شەراب و ئاڵتون و پارە و سامانی حەرام و لە خشتە بەرەکانی دونیان و لەوێدا دەبوونە ئاگر و مرۆڤە عاشقەکانی دونیایان دەسوتاند.

هەموو جۆرێکی دراوی دونیایی تیابوو، ترسم زۆر زۆر زیادی کرد، بینیم کەسێك لە ناوەڕاستی ئەو دۆزەخە تایبەتەی 'پارە و ئاڵتونە' لەسەر کورسیەك دانیشتوە، بەڵام لە ڕاستیدا ئەوە کورسی نەبوو، بەڵکو پارە و ئاڵتون و سامانی دونیا بوو لەسەری دانیشتبوو، سەری ئەو کەسە وەکو سەری گا بوو، زۆر زۆر ترسناك بوو، هەڕەشەی دەکرد، دەینەڕاند، ڕەنگێکی سوری خوێناوی هەبوو، زەبەلاحێکی گەورەی شاخ دار بوو، ئێجگار ترسێنەر بوو، ئەگەر مانایەك بۆ ترس هەبێت، ئەوەبوو کە من بینیم، زانیم ئەوە دەم و چاوی شەیتانە، زانیم کە من مردوم و خزاومەتە ناو ئاگری دۆزەخ.

تەنها بیست و پێنج پێیەکم مابوو بگەمە لای شەیتان، پێیان وتم: نەفرەتی لێ بکە و بڕۆ با ڕزگارت بێت.

کە زۆر نزیکی بوومەوە ڕاستەوخۆ شەیتان سەیری دەکردم گوێم لێ بوو باپیرم پێی وتم: تێ پەڕە و مەوەستە، ئیتر ئەوە بوو گەڕامەوە بۆ دونیا.

## یەکەم دان کەوتنی منالی خۆمم لەوێ بینیەوە



یانزە ساڵ بەسەر ئەزموونەکەمدا تێپەڕیوە، من ئالوودەی جۆرە حەبێک بوو بووم، تایبەت بوو بە دابەزینی کێشی جەستە و، جوانی جەستە.

دەبوو سێ مانگ ئەو جۆرە حەبە بەکاربهێنم، بەڵام درێژەی کێشا و نۆ ساڵ ئالودەی بووم، ئیتر ئەوە بوو زیانی گەورەی لە دڵ و سیەکانم دا، توانای هەناسە دانم بە باشی نەمابوو، لە هۆش خۆم دەچووم، ئیتر ئەوە بوو لە دوایین هەناسەکانمدا جەستەی خۆمم بەجێ هێڵا، لە سەرەوە جەستەی خۆمم بینی، ئەو فریا گوزاریانەی کە بۆم ئەنجام دەدرا دەمبینی، بە ڕۆح لە سەرەوە بووم و چاودێری هەموو شتێکم دەکرد، بڕیارم دا ئەو شوێنە بەجێ بهێڵم، نورێکی زۆر گەورە لە ئامێزی گرتم، چوومە ناو تونێلێکەوە و بە هێزێکی لە ڕادە بەدەر بەرەو سەرەوە سەرخرام بە خۆشەویستی و کەمەند کێشیەکەوە کە هەرگیز وسف ناکرێت پێشوازیم لێ دەکرا و سەر دەخرام، زۆر زەحمەتە کۆمەڵە وشەیەك بارتەقای ئەو پێشوازی و خۆشەویستیە بێ سنووورە بێت، چوومە خزمەتی پەروەردگار.

بەهەشت نزیك بوو، ئەستێرەکان و گەردوون لە ژێر هەیبەت و دەسەڵاتی پەروەردگارا بوون، هەستم کرد خەریکە نمایشێك پیشان دەدرێت، بینیم ئەستێرەکان

وەکـو گـوێ ڕایەڵ ڕیزیـان بەسـتبوو، وەك ئەوەی پەردەی سـەر شـانۆیەك لا بـدەیت، دەست بە پیشان دانی شریتی ژیـانی مـن کـرا، لە کـاتی لە دایـك بـوونمەوە هەتـا دوا ساتی هاتنم بۆ ئێرە هەموو شتێکی تیا بوو، تەنانەت یەکەم جار دانی ناو دەمـم کەوت، دەرچـوونم لە دوا ناوەنـدی، هەمـوو ئەو خەڵاتـانەی کە وەرم گرتبـوون، گەورە و بچـووکی ژیـانم هەمـووی تۆمـار کرابـوو، لە هەمـوو ڕووداوەکانـدا وەك ئەوەی کە بژیەمەوە، بەو جۆرە پیشانم درایەوە، دوای ئەوە دەبوو سەیری خوارەوەم بکـردایە، پـێم وترا کە ئەو چاویلکانە لە چاو بکە، من لە دونیادا چاویلکەم لە چاو نەکردبوو، وتیـان: ئەو چاویلکانە لە چاو بکە، جۆرێکی تایبەتە و ئاسایی نییە.

وتم: چۆن دەتوانم ئەوانە لە چاو بکەم، وەختێ لە چاوم کردن هیچ گرفتێك نەبـوو، وتیان: ئێستا ببینە. جارێکی تر هەموو ژیانم بە چاویلکەوە بینیەوە. ئەو جـارە بینینێکـی جیاواز بوو، بەڵام لەو ڕۆژەوە نەبوو کە لە دایك بووم هەتا مردن.

ئەم جارە ئەو شتانەم بینیەوە کە بە لای خوای گەورەوە گرنگە و مرۆڤ فەرامۆشـیان دەکات، وەك خۆشویستنی مرۆڤ و، خێر و چاکە کردن و، ڕێـز گرتنـی خەڵکێـك، کە لەلای خەڵکی بە گشتی فەرامۆش کراون، گرنگـی دان بە ئـاژەڵان، یـارمەتی کەسـێك بدەیت کە شوێن و مەنزڵێ نەبێت، کۆمەکی پیـر و پەکەوتە، هەروەهـا هەمـوو کارێـك کە مانای گەورە دروست بکات بۆ ئەو دونیا.

خۆشویسـتنی خـوام بینـی کە بـێ مەرجە و، ئەو زاتە ئـێمەی بەبـێ مەرج خـۆش دەوێت، بەسەر ژیانمدا ڕۆشتمەوە بەڵام بە جۆرێکی تر.

ئەگەر دروست بێ دەڵێم: بەردێك بە قەدەر گەورەیـی زەریـا گەورەکـان بێـت و، بە توانا و دەسەڵاتی حەق تعالی فڕێ بدرێتە دەریا و زەریا گەورەکانەوە، چ کارەسـاتێك و چ جووڵە و ڕووداوێکی وێران کەر لەسەر زەوی فەراهەم دێنێت، یەك بە یەکـی ئێـوەی مرۆڤ، ئەو بەردە گەورەیەن کە بە خێر و بە شەڕ، کـاریگەری بـۆ مرۆڤـایەتی دروسـت دەکەن.

گەشتی ژیانمان کاریگەری لەسەر تاك بە تاکی مرۆڤایەتی و گەردوون بەجێ دەهێڵێت.

مرۆڤ دەتوانێ زۆر بە ئاسانی گەلە ئەستێرە و مانگ و خۆرەکان و ئاسمانەکان بگەڕێت و هیچ زەحمەتێکی بۆ پێش نایەت.

خوای گەورە فەرمووی 'ئیریکا' لە ژیانتدا بۆ هەر یەکێك لە ئێوە جۆرێك لە ڕێنمویم ناردووە، قەدەری من ئاوایە.

کە تۆ هاتیتە دونیا، دیاری ئارامگرم پێ بەخشیت، جوانیم پێ بەخشیت.

ئێریکا دەڵێت: من بڕیاری هەڵەم دابوو، وەختێ لە جوانی و پێکهاتەی جەستەی خۆم ڕازی نەبووم و هەمیشە سەرقاڵی خۆ جوانکردن بووم.

دەمویست زۆر بێ وێنە بم لە جوانیدا، بەڵام ئەو ڕووداوەی کە بەسەرم هات جوانی ڕاستەقینەی پیشان دام.

خوای گەورە ڕایگرتم و فەرمووی: ئیریکا ئارامگری و جوانیم بە دیاری پێمبەخشیویت، ئیتر ئەو کاتە زانیم جوانی، جوانی دڵە، جوانی دەروونە، کە خوای گەورە پێی بەخشیوم ئەگەر من پێزان بم. جوانی لە دڵەوە سەردەکەوێت نەك ڕوخسار بینەخشێنێت، ئەو خۆشەویستیەی لە دڵماندا هەڵی دەگرین گەورەترین جوانیە.

بەردەوام خوای گەورە جوانیمان بۆ دەنێرێت و جوانیمان پێ دەبەخشێت.

تەنها ئەوەندەی ئێمە بتوانین هێمنی و بێ دەنگی و سکونەت و گوێ گرتنمان هەبێت، ئێمە دەبینین کە خوای گەورە دیاریەکان دەنێرێت، دەنگی دیاریەکان دەبیستین.

پێش ئەوەی بگەڕێمەوە بۆ سەر زەوی فەرمووی: بڕوانە.

منیش سەیری لای چەپم کرد، زەویم بینی.

حاڵەتێکی زۆر سەیر لە دەوری زەوی بوو، زیاتر سەیرم کرد دەبینم هەموو زەوی نغرۆی ئاگر و بڵێسەی ئاگر بووەتەوە، یەکەم جار زۆر ترسام، بیرم لە مناڵەکانم و مێرد و دایك و باوك و خوشکەکەم کردەوە.

پێم وترا: ئەم جارە بە چاویلکەکەوە سەیری ئەو دیمەنەی ئاگر و بڵێسەی سەر زەوی بکەرەوە.

چاویلکەکەی یەکەم جارم کردەوە چاوم، بینیم ئەو بڵێسانەی کە لە زەویەوە بەرەو ئاسمان بەرز دەبنەوە، نوور و ڕووناکی ئاڵتونی و سپییە بەرز دەبێتەوە نەك ئاگر!!

وتم: خودایە ئەوەی دەیبینم ڕۆحی مرۆڤەکانە بە خێر و خۆشیەوە سەر دەکەون، من پێشتر بە هەڵە حاڵی بوبووم. ئەوانە بۆ بەرزەخ و بەهەشت و ڕەزامەندی خوایی سەر دەکەون.

بەلای ئێمەدا تێپەڕین و ڕۆیشتن بۆ سەرەوە.

منیش زۆر دڵخۆش بووم بەوان و دەموت: ئەوانە لەناو ناز و نیعمەت و خێردا سەر دەکەون و زۆر باشن.

لە خزمەت خودا هەستم بە شتانێك کرد کە هەرگیز جێگەی باوەڕی خەڵکی سەر زەوی نییە، هەتا نەیبینن...

باڵاترین نیعمەتت دەست دەکەوێت.

لەوێدا زانیم ئەوەی خوا نەناسێت چەندە دوور دەکەوێتەوە و دەبێتە ون بووەکان و بەختەوەری لە دەست دەدات لە دوونیادا.

خوای گەورە هەموو یەکێکمانی زۆر خۆش دەوێت.

ویست و بژاردە دەخاتە بەردەستمان، هەتا بەرزترین پەیوەندی ببەستین و، زۆرترین بەدەست بهێنین.

خێزان و خۆشەویستانم لە دونیادا بوون، بەڵام ویستی گەڕانەوەم نەبوو، خوای گەورە خەڵاتی کردم بە زانست و بە حیکمەت هەتا گوێ لە خەڵکی بگرم و لە ناویاندا بژیم. بۆ ئەوەی کاریگەری باشە بەجێ بهێڵێت، هەرگیز دەمە دەمێ و چەلە حانێ مەکە، ئیتر ئەو کاتە ئامادەی ژیانی ئەو دونیا دەبیت.

## لەسەر گەڵای درەختەکە ناوی زیندووان نووسرابوو



من ناوم ئەحمەد عەلی‌یە و خەڵکی پاکستانم، ئێستا پێنج فەرزەی نوێژەکانم ئەنجام دەدەم، لەوە و پێش دیندار نەبووم. هەتا ڕۆژێکیان تووشی ڕووداوێك هاتم و نزیکی لە مەرگم بینی، لەسەر ماتۆڕەکەم بووم بەرەو کۆلێژ دەچووم، کاتێکم زانی گێژ بووم و لە ماتۆڕەکە کەوتمە خوارەوە، درەختێکی گەورەم بینی، فریشتیەکی زۆر جوان لە لای درەختەکە وەستابوو، پرسیم تۆ کێیت؟

وتی: من فریشتەم.

وتم: ئەی من لە کوێم و بۆچی لێرەم؟

وتی: بە فەرمانی خوای گەورە لێرەیت هەتا شتێکی ئەم درەختە ببینیت.

کە سەیری ناو درەختەکەم کرد، ناوێکی زۆرم بینی. لەسەر گەڵاکان نووسرابوون.

وتم: ئەم درەختە چی‌یە و، ئەم ناوانە چین نووسراون؟

وتی: ئەوە ناوی ئەو کەسانەیە کە هێشتا لە ژیاندا ماون.

وتم: ئەوە ناوی مردووەکانە؟!

وتی: نەخێر، ناوی زیندووەکانە، ناوی هەر کەسێکی تیا نەبێ مردووە.

وتم: ناوی منی تیا نییە، کەواتە من مردووم.

وتی: تۆ نەمردوویت و هێشتا لە دونیادا ماویت، تۆ بانگێشت کراویت هەتا ژیانی دوای مردن ببینیت. بزانیت کە زیندوو بوونەوە هەیە، هەتا ئیمانت زیاد بکات و بەهێزببیت.

پێیان وتم: چاوەکانت دابخە.

منیش چاوەکانم داخست، لە هۆش خۆم چووم، کە چاوەکانم کردەوە لە نەخۆشخانە بووم، پزیشکەکە وتی: ئەوەی کە تۆ لە ژیاندا ماویت موعجیزەیە.

## چارەسەر نوێژکردنە

ناوم 'رسلان نافیدە'یە و خەڵکی 'جەهالوم'م و سوپاس بۆ خوا موسوڵمانم، دوو ساڵ پێش ئێستا ئازارێکی تیژ لەسەر دڵم دروست بوو، لە نەخۆشخانە مامەوە.

پزیشکەکە وتی: بەهۆی خواردنەوەی وزە بەخشەکانەوە تووشی ئەم ئازار و نەخۆشیە بوویت.

من زۆرم لە وزە بەخشەکان دەخواردەوە، نەمدەزانی زیانبەخشە و دڵم تووشی نەخۆشی دەکات، حاڵم زۆر خراپ بوو، بێ هۆش کەوتم.

لەناکاو خۆم لە شوێنێکی زۆر جوانی دڵ ڕفێندا بینیەوە، ژمارەیەکی زۆر باڵندە و دار و درەختی لێ بوو تەسبیحاتی خوایان دەکرد، خۆشی و جوانیەکم بینی کە لە وەسف کردن نایەت.

باڵدارێك هات و پێی وتم: ئێمە تەسبیحاتی خوا دەکەین، بۆچی تۆش لەگەڵ ئێمە نایەیت و زیکری خوای گەورە بکەیت، منیش پێم خۆش بوو.

کاتێـك دەسـتم کـرد بە تەسـبیحات لەگەڵ باڵـدارەکان ئەوەنـدە دڵـم خـۆش بـوو، ئەوەندە دڵئارام بووم تەنانەت نەمدەتوانی لە تەسبیحات بوستمەوە.

هەتا گوێم لە فریشتەیەك بوو وتی: ئەم وشانەیە دڵ و دەروون و هەسـتەکانت ئـارام دەکەنەوە، چارەسەر نوێژ کردنە. بۆ خەڵکی دونیای باس بـکە، کە ئـارامی و ئاشـتی و خۆشی لە ژیانیاندا نابینن هەتا نوێژ نەکەن و زیکـری خـودا نەکەن، بە عیبـادەتی خـوا دڵنیایی و، دڵ ئارامیان دەست دەکەوێت.

ئێسـتا کـاتی ئەوەیە بگەڕێـتەوە و، ئەرکەکانـت جـێ بە جـێ بکەیـت، کە بە ئاگـا هاتمەوە حەمد و ستایشی پەروەردگارم زۆر کرد، دوای ئەوە هەرگیز فەرزە خواییەکـانم لە بیر نەکرد و لە پێشینەی کارەکانی ژیانم دامنان، چونکە زانـیم هێـز و ڕزگـاربوون لە عیبادەتی خوا و نوێژ کردندایە.

## بینیم کە بچووکترین کرداری خراپ زۆرترین کاریگەری لەسەر خەڵکی بەجێ دێڵێت



من خولیای کەسایەتیە بەناوبانگەکانی هۆڵیود و، ڕابەرە سیاسیەکان و، هونەرمەنـدە ناسراوەکان بووم.

سەفەریشم زۆر دەکرد، من پێش ئەزموونەکەم ئیماندار نەبـووم، خـورپەیەك لە دڵـی دابـووم کە تووشـی نەخۆشـی ئایـدز بـووم، چـونکە کێشـم کەمـی دەکـرد و لەسـەر ڕوخساریشم بەدەرکەوت و خوێنم هەڵدەهێنایەوە.

لە ئاهەنگێکدا بووم و، ئەو شەوەش جەژنی لە دایك بوونم بـوو، چـوومە دەرەوەی ئـاهەنگەکە، هەسـتم بە ئـازار دەکـرد، تووشـی خـوێن پـژان بـووم، بردمیـان بـۆ نەشتەرگەری.

لە سەروو هۆڵی نەشتەرگەریەکە خۆمم بینیەوە.

لە خوارەوە 'بیتر' و پزیشکەکانی ترم دەبینی.

دوای ئەوە بردمیـان بـۆ نـاو تونێلێـك و زۆرێـك لە خـزمە مردوەکـانم بینـی و بەخێرهاتنیان لیَ کردم.

دڵم زۆر خۆش بوو، بە خێرایـی سـەردەکەوتم. زیرەکـی هەمـوو زانـا و بیرمەنـد و فەیلەسووفەکانی دونیا کۆبکەیتەوە، ناگەنە ئەو زیرەکی و بلیمەتی و وریـاییەی کە مـن لەوێدا هەمبوو. ڕەنگ و دەنگی زۆر ناوازەم دەبینی و دەمبیست.

لە بەردەم درەختێك خۆم بینیەوە، کەسـێکی نـورانی لە ژێـر درەختەکە دانیشـتبوو، منیش لەویَ بووم، شوێنێکی زۆر هێمن بوو، دەکەویتە حاڵەتێکەوە، پێی ڕازیـت، لێـی تێدەگەیت و زۆر زوو لەگەڵی دەگونجێیت. هیچ نامۆبونێك نامێنێت، شریتی ژیـانم لە (١١:١١) خـولەکی ئێـوارەی ڕۆژی (یـانزەی/ نـۆڤەمبەری/ ١٩٨٧)ەوە دەسـتی بە دەرکەوتن و پیشان دان کرد، هەموو چرکەیەکی پیشـانم درایەوە. لەو گەشـتەیا مـن وام بینی لێپرسینەوە ناکرێت، چونکە نەمردویت، بەڵکو پیشان دەدرێـت!! واتە موحاسـەبە لە دوای مردنی تەواوەتیەوەیە، هەست بە ڕەحم و سۆز و بەزەیی دەکەیت.

بیرمە کە لە دوا ناوەندی بووم، جەژنی لە دایـك بـوونم بـوو، خوشـکەکەمم لەگەڵ بوو پـێم نەوت کە چەنـدەم خـۆش دەوێـت، هەر لەو شـەوەدا بە دەسـتی سـایەقێکی سـەرخۆش کـوژرا، کە ئەو ڕووداوەم بینـیەوە هەسـتم بە پەشـیمانی کـرد، کە نـاکریَ خۆشەویستیمان بۆ ئازیزانمان خەفە بکەین و پێیان نەڵێین، کە ئەوە وانەیەکـی گرنـگ بوو بۆ ژیانم.

جارێکیشیان پاکەتی بنێشتێکم فڕێ دایە ڕووبارێکەوە، بە جوولەیەکی خاو و لەسەرخۆ پیشانم درایەوە، کە چۆن دەکەوێتە ئاو و، ڕووبارەکەوە و ئینجا ئەو پاکەتە چۆن پیسی لە خۆی کۆ دەکردەوە و هۆکارەکەش من بووم.

دونیایەك پیسی و ژاری کیمیایی پاشەڕۆی خراپ کۆبوویەوە و ڕووبارەکەی زیاتر پیس دەکرد!

دەبینی بە جوولەیەکی بچووکی ئاسایی 'پاکەتێك بنێشت' پیسی و شوێنەوارێکی خراپی زۆر بەجێ دەهێڵێت؟!!

بینیم مناڵان چۆن تووشی نەخۆشی دەبوون و ئاوەکان بەردەوام پیس دەبوون، حکومەت بەرپرسیار بوو لەوەی مناڵانێکی زۆر دەمردن و تەواوی لێپرسراوەکان بەشی گەورەیان لەو تاوانەدا هەبوو...

من ئەوەم بینی کە بچووکترین کرداری خراپی خۆم کاریگەریەکی زۆر گەورەی لەسەر خەڵکی هەبوو.

دوای ئەوە برامە وێستگەی پاك بوونەوە و ئامادەکردن.

برامە خزمەت پەروەردگار، هەرچی خۆشەویستی دونیا هەیە کۆی بکەیتەوە ناگاتە گەردیلەیەکی ئەو خۆشەویستیەی لەوێدا هەستی پێ دەکەیت.

زاڵم و ستەمکارەکان کە مرۆڤایەتی تووشی چەوساندنەوە و نەهامەتی و برسێتی دەکەن و بچووکترین هەتا گەورەترین کردەوە لەسەریان تۆمار دەکرێت و هیچی ون نابێت.

بینیم کۆمپانیاکانی دەرمان چ کارە ساتێکی مرۆییان لە دونیادا فەراهەم هێناوە، چۆن بۆ بەرز ڕاگرتنی قازانج خراپترین جۆری فریودان و، دەرمانی بەسەرچوو، کوالێتی لاواز و ژار بە هەنگوین پیشان دان ساغ دەکەنەوە و بازەڕەکانی جیهانی پێ پڕ دەکەن و مرۆڤی پێ ژەهراوی دەکەن.

بینیم ئەوەی لە دونیا پێیان دەوت سەرکەوتن و قازانج لەوێ شکست و سەرشۆڕی و سزای دۆزەخ بوو!!

بینیم مرۆڤی دۆڕاوی ئەو دونیا، لەم دونیایەدا چەندە ناشرین پارەی کۆکردۆتەوە و گوێی بە باشیی و خراپی شمەکەکانی نەداوە و، هەزاران کاری نا مرۆڤانەی کردووە هەتا سامان و پلە و مەقامی خۆی بەرز بکاتەوە، بەڵام ڕیسوا و داماوی ئەوێ بوو.

هەموو شارستانیەتەکانی گریك و ڕۆمان و بیزەنتی و بەریتانی و فایکنج و چی ناوی تر هەیە فێری زانستێکیان نەکردووین پەند وەربگرین...

فێری ڕەحمەت و نەرم و نیانی و یارمەتی دانی خەڵکیان نەکردوین، ئەوەی ئەوان فێریان کردین بەرژەوەندی بوو، لەوێ ئەرزشێك بۆ ئەم بیرکردنەوە مادیانیەی دونیا نیە، لەوێ خۆشەویستی و ڕەحمەت هەیە و کاکڵە و کرۆك هەیە، پەشیمانی دادێکمان نادات ئەگەر بە پێوەرەکانی ئەوێ ژیانی دونیامان نەگوزەراندبێت. زۆر پێویستە پێش ئەوەی بە یەکجاری دونیا بەجێ بێڵین ئامادەی ئەوێ بین!!

## ڕۆژەکانی ژیانمان دیاری خوایین

'بوجلی' کە ئافرەتێکی بیست و یەك ساڵانە و دەڵێت: هەوکردنی میزەڵانم هەبوو، باری تەندروستیم زۆر خراپ بوو، بەڵام بەو بارەشەوە لەسەر کارەکەم بەردەوام بووم.

سێ منداڵم بووە ئەو ئازارەم نەبووە، تووشی خوێن بەربون بووم و گەیەنرامە نەخۆشخانە، لەناکاو ئازار نەما و هەستم کرد ژوورەکە گۆڕا، هیچ پەردە و دیوار و بنمیچ نەما، دەتوت چوومەتە شوێن و ژوورێکی تر، ڕووناکیەکی ئاڵتونی بێ ئازارم بینی، خۆشەویستیەکی بێ سنوور، چێژی بێ سنوور، ڕێگەت پێ دەدرێت چێژ لەو ژیانە هەمیشەییە ببینیت.

پارێزگاریەکی بێ سنورت لێ دەکرێت، فریشتەیەکی یەکپارچە نورانی و سپیم بینی، خانوەکەی خۆمم بینی، پۆشاکەکانم کە لە لای جل شۆرەکە نەمشۆردبوو، چێشتخانە شپرزەکەی خۆم بینی، زۆر بە ڕوونی دەمبینی، دەتوت دەڵێم: خواتان لەگەڵ جیهانە مادیەکەم، ئیدراکم هەبوو بۆ ماڵئاوایی و دورکەوتنەوە چی دەگەیەنێت، زانیم کە دەمرم و زۆر گرانیشە لەسەر کەس و کارم، خزمەکانم بینی کە لە ژیانی دونیادا بوون و منیش لەگەڵ ئەو فریشتەیەی کە لێم نزیك بوو بەوپەڕی دڵگەرمی و دڵخۆشی و ئازادیەوە ئامادە بووم بۆ دەرچوونی تەواوەتی و گەیشتن بە جیهانەکەی تر، بەڵام لەناکاو دایانچڵەکاندم و گەڕێنرامەوە بۆ دونیا و جەستەی خۆم!!

بەڵام گەڕانەوەم زۆر بە سۆزەوە بوو هەتا ئامادەبم بۆ ئەوێ، ئەم ئەزموونە کاریگەری زۆر باشی لەسەر ژیانم بەجێ هێڵاوە، ناترسم لە مردن، بینیم مردن چۆن گواستنەوەیەکی مرۆڤە لە جیهانی فەناوە بۆ جیهانی مانەوەی هەمیشەیی، بینیم چۆن لە جەستەمان جیا دەبینەوە.

ڕۆحی هەمووومان زۆر نموونەیی و ناوازەیە، زۆر جوان و بە توانایە، فرسەتی ئەوەم پێ درا کە بینیم ڕۆژانەی ژیانمان دیاری خواییە و، نوێیەکە سوپاس گوزاری دەوێت نەك ڕاهاتن و بێ باکی.

## ئەزموونی ئافرەتێکی جولەکە

دوگیانیم لە قۆناغەکانی کۆتایی دا بوو، خواردنێکی چینیمان دەخوارد، بیرم دێت، وەك ئەوەی فریا بکەوم و بە مناڵەکانم بڵێم خوا حافیز، زۆر ترسناکە چاوەڕوانی نادیار بکەیت. خواردنی ژەهراویم خواردبوو، ئەو شەوە لە نەخۆشخانە مامەوە، بۆ ڕۆژی دوایی ئازارێکی زۆر سەختم هەبوو، بێ هۆش کەوتم، ئەوەندە توانیم بڵێم خوا حافیز

و هەموو شتێك گۆڕا، ئازار نەما، ژووری چاودێری ورد 'I.C.U' دەبینـی، ژمـارەیەکی زۆر تیـوب و سـۆندە و وایەری جیـاوازم دەبینـی کە لـێم بەسـترابوون، بەڵام دەمبینـی فریشتەکانی خوا لە چواردەورم بوون، خەڵکی دەوروبەرم دوعایان بـۆ دەکـردم، لەنـاو تەسبیحاتی خوادا دەگەشـامەوە، خـوای گەورە پێویسـتی بە ئـێمە نیـیە، ئـێمە هەژاری دەرگای ئەوین، ئێمە هەموومان لە جەوهەردا ڕۆحـین و دەبێـت یەکترمـان زۆر خـۆش بووێت، دوای ئەوە گەڕامەوە.

## لەوێ لێت دەپرسن چۆن پارەت پەیدا کرد؟!

'شــوس' ئەو پیــاوەیە کە لە ســاڵی (٢٠٠٢) بە ڕووداوی ئۆتۆمبێــل لە ئەفریقــا ئەزموونەکەی بینی.

دەڵێت: دەبوو بێم بۆ نەشتەرگەری، لە کاتژمێر (٣-٤)ی بەیانی، بـاری تەندروسـتیم زۆر خراپ بوو، چاوەڕوانی مردنیـان لێـدەکردم، لە هـۆڵی نەشـتەرگەری ڕۆحـم بەرز بۆوە.

من لەوەو پێش هیچ گرنگیەکم بە نزیکبوونەوە لە مـردن و دیـاردەی ڕۆحـی نەدەدا. سەرخرام بۆ ناو نوور و ڕووناکیەك کە پڕ بوو لە خۆشەویستی، هەمـوو ژیـانی خـۆمم بینیەوە!

من شەش منالم هەیە، کۆمپانیام هەیە، پارە و سامانم زۆرە، بەڵام ئەوەی گـرنگە لەو دونیا ئەمانە نیە، بەڵکو ئەوەیە تۆ چۆن بەڕێوبەرێك بوویت، چـۆن پـارەت پەیـدا کـرد، چۆن باوکێك بوویت؟

لەگەڵ برا و خوشك و هاوڕێ و دایك و باوکت چۆن بوویت؟

هیچ شتێکی دونیا لەوە ناچێت کە لەوێ بینیومە.

چوار پزیشك سەرقاڵی نەشتەرگەری مـن بـوون، سـیانیان ئومێـدیان بە مـانی مـن نەمابوو، بەڵام چوارەمیان بیری خسـتمەوە کە ئومێـد هەیە و کـارێکی لە منـدا کـرد کە منیش ئاگام لێ بوو، ئەوە بوو ڕۆحم لە دوای ئەو گەڕایەوە ناو جەستەکەم.

ئاگام لێ بوو پزیشکەکان دەیان وت هـیچ ناکرێـت و سـارد بـوون لە چارەسـەرم، منیش ئاگام لێ بوو، دەموت بۆچی وا دەڵێن، ئەوە خۆ من ئاگام لەوانە!

ئەم ئەزموونە قوڵ قوڵ دەسکاری ئاکـار و بیرکـردنەوە و هەسـتەکانی کـردم، فێـری خۆش ویستنی کردم، فێری کـردم پـارە پەیـدا کـردن و سـامانی زۆر سـەرکەوتن نـیە، سـەرکەوتن گرنگـی دانە بە منـداڵەکانت، ڕێگـای ژیـانی بە تەواوی گـۆڕیم، دوای ئەزموونەکەم خێزان و مناڵەکانم بوونە یەکەم و کۆمپانیا و کارەکەم دووەم بوو.

ترسم لە مردن نەماوە، دەزانـم و دڵنیـام ئـارامی و کـامەرانی لەوێـیە و چـاوەڕێمان دەکات.

با نزیکی خـوای گەورە بـین، گەردیلەیەکـی ئەوێ هەمـوو دونیـا دەهێنێـت، لەوێ فریشتەی لێیە و چاوەڕوانمـان دەکـات، مـاوەیەك لە دوای ئەزمـوونەکەم هەسـتم کـرد هێزی ڕۆحی و ماعنەویم زیادی کردووە.

ئێمەی مرۆڤ جیاواز نین لە یەکتر، ئێمە بەشێکین لەناو یەکتریـدا، هەموومـان وەك یەك جەستەین، وەك داری قامیشین، کە هەموومان لە یەکتر دەچین، ئێمە لە دراوسـێ، کەسانی دور لە زمانی خۆمان، دوور لە نیشـتیمان و کیشـوەرمان، بە جۆرێـك مـامەڵە دەکەیـن وەك ئەوەی جیـا بـین لە یەکـتر، ئـێمەی مـرۆڤ هەمـوو تێهەڵکێشـی یەکـتر کـراوین، خـۆزگە خەڵکـی دەیـانزانی لە دوای مـردن چـی دەگوزەرێـت، ئەو کـاتە چاوچنۆکی و خۆپەرستی و خۆ خۆری نەدەما.

## قەناعەتپێکردن بە زۆر نییە، بە بەشدارییە

'بیل' دەڵێت: تەمەنم چل و یەك ساڵ بوو، وەرزشەوان بووم، لە ڕووداوێکدا بێهۆش کەوتم، بە هەلیکۆپتەر گواسترامەوە بۆ ویلایەتی 'ئەیداهو'ی ڕۆژهەڵات کە - مەڵبەندی پزیشکی هەرێمی ئەیداهۆ-ی لێبو ماوەی دوو سەعات بێ هۆش بووم لە نەخۆشخانە.

پزیشکەکان دڵنیا نەبوون لە ڕزگار بوونم، دایکم لە کالیفۆرنیا دەژیا، برا بچووکەکەشم لە 'بورتوریکو' لە سوپایا بوو، نەیتوانیبوو بێت بۆ لام، پەیوەندی کردبوو بە ئامۆزاکەمەوە کە بێت بۆ لام، کاتێك نزایان بۆ دەکردم پێم دەزانی، لە سەرەوە بووم و دەمبینی.

مرۆڤ کە وڕێنە دەکات، خەو دەبینێت، بیری دەچێتەوە، وڕێنەش بە دوای یەکدا هاتنی تیا نییە!

بەڵام من ئەم دوو ئەزموونەم بینی، ئەوە سێ ساڵە هیچیم لە بیر نەچۆتەوە و هەمووی وەك هەڵکۆڵراو لە مێشکی مندا ماوەتەوە. من ئەزموونەکەم بە دوای یەکدا هاتن و بێ وێنە بوو، من کەمێکم بینی بەڵام زانستێکی فراوانم بینی، گۆڕانێکی مەزنی لە مندا دروست کرد، کردمی بە باوەڕدارێکی بەهێز و، باوەڕدار بە خوای گەورە.

دووەم ئەزموونم: ئەوە بوو کە پزیشکەکان بێ ئومێد بوبون لە چاك بوونەوەم و خەریك بوو بڕیار بدەن ئۆکسجینم لێ ببڕن و ئامێرەکانی بوژانەوەم بوەستێنن.

ئەوە بوو من لەناو باخ و باخاتێکی زۆر جوان و دار و درەختی سەر سوڕهێنەر و گوڵ و گوڵزاری ڕەنگا و ڕەنگدا بووم، کە هەرگیز ناتوانرێت پێشبینی بکرێت.

نور و ڕوناکیەك کە لەوێدا بو و سەرسامی کردم بە خۆیەوە و کەمەندکێشی کردم.

گەیشتمە مەڕمەڕێکی بەردین، لەوێدا باوکم بینی، کە شەش ساڵ بوو کۆچی دوایی کردبوو، باوکم لەوپەڕی گەشی و جوانی و ژیانەوەدا بوو، باوەشی پیا کردم و زۆر شادمان بوو.

باوکم لە ئامێزی گرتم و وتی کوڕم مەترسە لێرە ون نابیت، بەڵام هێشتا کاتت نەهاتووە، دەگەڕێیتەوە بۆ دونیا.

ئەم ئەزموونە فێرت دەکات بە زۆر و سەپاندن قەناعەت بە خەڵکی نەکەیت، بەڵکو بەشداریان پێ بکەیت.

## لە نیشتیمانی ڕاستەقینە شارێکی بێ وێنەم بینی



'باتریکس کیلر' ژنێکە باسی ئەزموونەکەی خۆی دەکات و دەڵێت: دووەم منداڵم دەبوو، چوومە دەرەوەی جەستەم، ئەندامەکانی جەستەم بە ڕەنگی جیاواز دەبینی، هاتوچۆی خوێنم لەناو دەمارەکاندا دەبینی، کاری خانەکان، وەستانی دڵی خۆمم بینی، بینیم کە چۆن دواین شەپۆلی ڕووناکی لە سەرمەوە دەرچوو.

من جەستەی خۆمم بینی کە چۆن ڕاکشا بووم و چاوەکانم داخستبوو، پزیشکەکان هەوڵی گەڕانەوەی منیان دەدا، منیش دەموت وازم لێ بێنن، جەستەم گرنگ نەبوو بەلامەوە!!

بینیم چاوەکانم وەکو چاوەکانی دونیام کز نیە، زۆر بە باشی دەمبینی، زۆرم پێخۆش بوو بمێنمەوە، زۆر شادمان بووم کە ڕۆحم لە قەفەزەی جەستەم ڕزگاری بووە.

وتم: وازم لێ بێنن من ناگەڕێمەوە، دەستم خستە سەر شـانی پزیشـکەکە هەتـا واز بێنێت، دەستم چوو بە ناو جەستەیدا و لێی ڕەت بوو.

هیچ گوێم لە مناڵە بچووکەکەم نەبوو، کە تازە لە دایـك بووبـوو. مەفتـونی گەشـتە بێ وێنەکەی خۆم بووبووم.

گوێم لە ئاوازێکی بێ وێنەی هێمن و ناخ بزوێن بوو.

بۆ ساتێك بیری یەکەم مناڵم کەوتەوە، کە تەمەنـی دوو سـاڵان بـوو،لەلای نەنـك و باپیری بوو، کە دڵنیا بووم زۆر پەرۆشی دەبن و دڵسـۆزانە بەخێویـان دەکـرد، ئەوەبـوو یەکسەر بینیم کە خەوتوە لە لای نەنك و باپیری و زۆر ئارامن. بەشێك لە ژیـانی پـڕ لە ئارامی مناڵەکەمم بینی.

دەمویست ماڵئاوایی لە هاوسـەرەکەم بـکەم و نەگەڕێـمەوە، بەڵام گەڕامەوە هـۆڵی نەشتەرگەری و بینـیم کە منـاڵەکەم ناجوڵێـت، لێـی نزیـك بـوومەوە، دەسـتی کـرد بە گریان، گریانەکەی دڵی هەژاندم و ڕەحمـی جوڵانـدم، هەسـتم بە ئـازاری دایکـایەتی کرد، بەشێك لە ژیانی داهاتووی مناڵەکەم بینی، ئیـتر ویسـتی گەڕانەوەم بـۆ دروسـت بوو، پزیشکەکان دەستیان لێ شتبووم و دوای ئەوە گەڕێـنرامەوە... هەتـا ڕۆژت تەواو نەبێت نامریت. دوای سێ ساڵ لە ئەزموونی یەکەم ، ئەزموونی دووەمم بینی، دوگیـان بوم، لە کاتێکدا سك بۆ من خراپ بوو.

کە هەستم بە تا و ئـازارێکی زۆر کـرد، تووشـی ژەهـراوی بـونی خـوێن بووبـووم، پزیشکەکان وتیان نەخێر دەبێت نەشتەرگەری گەدەت بۆ بکرێت، پێیـان وتـم: هەمـوو هەوڵێك دەدەین بۆ سـەرکەوتنی نەشـتەرگەریەکە، بەڵام ڕێـژەی سـەرکەوتن زۆر کەمە، من ناچاربووم قبوڵم کرد.

لە کاتی نەشتەرگەریەکە حـاڵم زۆر خـراپ بـوو بـوو، سـێجار نزیکـی مـردن بـوو بوومەوە، منیش سێ جار هەستم بەدەرچوونی ڕۆحم کردبـوو، لە تـونێلەکەوە بە خێـرا ڕۆشـتم بـۆ نـاو نـوور و ڕوونـاکی، دوای ئەوە شـارێکی زۆر گەورەم لـێ دەرکەوت،

ویستم بە خێرایی بچمە ناویەوە، چونکە زانیم ئەوێ نیشتیمان و شوێنی ڕاستەقینەی منە!

بەڵام کەسێك لە پشتەوە نەیهێڵا. بچمە ناوییەوە و ڕاکێشرامەوە بۆ دونیا، سێ جار بەو شێوەیە لەو شارە ناوازەیە دوور خرامەوە.

دڵنیام ئەگەر ئەندازیارە بە تواناکان، ئەو ئەزموونە و ئەو شارە ناوازەیە ببینن، ئیلهامی زۆر زۆریان بۆ دێت.

## پێش تەقینەوەکە بە چەند چرکەیەك لە جەستەم چوومە دەرەوە

'ناتالي' ئافرەتێکی زیرەك و لێ هاتووی ڕۆژئاواییە و، لە کتێبەکەی دا بە درێژی باسی لە ئەزموونەکەی کردووە، لێرەدا تەنها هەندێ لە خاڵەکانی دەهێنین، چۆن گەیشتە نزیکبوونەوە لە مردن، ئەو گەشتە گەورەیە چۆن کاری لەسەر چاك بوونەوە و بەرز کردنەوەی ئومێدی ناتالی کرد!!

ناتالی دەڵێت: ساڵی (٢٠٠٥) بوو، لەبەر ئەوەی من زانا و شارەزای بواری شوێنەوار ناسیم و، بە خۆبەخشی کارم دەکرد لە دەرئەنجامەکانی زریانی'کاترینا'، بۆ ئەم کارەش دوو مانگ و نیوم پێ چوو، لە 'میسیسیبی' و 'لویزیانا' خەڵکێکی زۆرم ناسی، هەروەها لە بریکاری فیدڕاڵی، دوای ئەوەی سێ مانگم پێ چوو، لە 'لویزیانا'، یەکێك لەو هاوڕێیانە پەیوەندی پێوە کردم و وتی: کارمان هەیە لە عێراق، لە نیمی ئەندازیاران، دەتوانن کارمان لەگەڵ بکەن؟ لە سەرەتادا دوو دڵ بووم و لە دواییدا بڕیاری ڕۆشتنم دا بۆ عێراق لە 'ئۆگەست'ی ساڵی (٢٠٠٦) گەیشتمە عێراق.

بە ملیۆنەها دۆلار لە عێراق خەرج دەکرا بە ناوی ئەو کـارانەی کە تـایبەت بـوون بە ڕێگا و بان و کارەبا و ئاو...

ســاڵ و نیوێـك بـوو لە عێـراق بـووم، لەگەڵ هاوکارەکـانم سـەردانی بنکەیەکـی پڕۆژەکانمان کرد، لە ڕێگەی گەڕانەوەمان سەیارەکەمان کەوتە ناو تەقینەوەیەکی قەراغـی ڕێگاکە.

ئێمە چوار سەیارە بووین و هەمیشە بە ژمارەی زۆر دەر دەچـووین، دوانـی پێشـەوە پاسەوانی بـوون، سـەیارەی سـێ هەم مـن و دوو هاوکـارمی تیـا بـوو، ئەو بـنکەیەش تەسلیمی حوکومەتی عێراقی کرابوویەوە، لەبەر ئەوە پۆلیسی عێراقیشمان لەگەڵ بوو.

پێش ئەوەی تەقینەوەکە ڕوویدات بە چەند چرکەیەك، من لە جەستەی خۆم چـوومە دەرەوە، ئەو حاڵەتەش ناو دەبەم بە 'پریشك'، ئەوەندە بە خێرایی بوو کە هەرگیـز پێـوانە ناکرێت.

من لەناو سەیارەکە خەو دەیبردمەوە، لە کوت و پڕێکدا لەوێدا نەمام!!

لە شوێنکدا خۆم بینیەوە کە هەزاران سەرتاپا سپی نورانی لـێ بـوو، لە تـان و پـۆ و شێوەدا لە مرۆڤ دەچوون.

لەوێ هیچ غەم و ئـازار و خەفەتـێکم نەبـوو، تەواو تەواو ئـازاد بـووم، زانیـاریم بە نورانیەکـان دەوت، دوای ئەوە وتـم: مـن زۆر مانـدووی ڕێگـای دونیـام، نامەوێـت بگەڕێمەوە بۆ دونیا و جەستەی مادیم!

بڕیارەکەم ڕێزی لێ گیرا، بەڵام ئەوان کۆمەڵێ پێشنیاریان پێ دام هەتـا بتـوانم دوای گەڕانەوەم گەشە بە تواناکانم بدەم، ئەو پێشنیارانە بزوێنەری دوای گەڕانەوەم بوون.

دوو بوونەوەری نورانیم لەگەڵ بوو، بۆ ڕێکخستن و چاک کردنی تێگەیشـتنی مـن، ڕێکخستنی ئەو یاسا وردانەیان دەکرد کە تایبەت بوون بە من.

دوای ئەوە هەموو ژیانم پیشـان درایەوە، کـاری گەری کـارو کردەوەکـانم خەڵکـی دەگرتەوە، مادە و دوای مادەشی گرتەوە...

لەوێ شتانێك وەردەگرین کە لێرە ئاوەزی مرۆڤەکان ئاستی توانای وەرگـرتن و لێـی تێگەیشتنیان دەگاتە مەحاڵ.

دوای پێداچوونەوەی کردەوەکانی ژیانم، دوو فریشتەی ترم لەلابوو، یەکێکیـان زۆر کۆن ئاشنایەتیم لەگەڵی هەبوو، دووهەمیان وا دەرکەوت کە بۆ چاودێری دانرابێت.

وا دەرکەوت کە بفڕین بەسەر ئەو ناوچەیەدا کە تەقینەوەکە ڕووی دابوو.

وەك ئەوە بوو سەد مەترێك لەسەروو ڕووداوەکانەوە بین و هەروەها خۆشـم لەنـاو سەیارەکەدا بینیەوە.

چارەسەر و شیفای ئەو شوێنانەی کە بریندار بوو بوون، لەوێوە دیـاری دەکـرا، بـۆم ڕوون بۆوە بونی ڕاستەقینەی ئێمە لەناو خۆماندایە، ناتوانرێت بونمان ئـازار بـدرێت و لەناو ببرێت.

نۆ کەسی نورانی تر هاتن، هەموویان منیان دەناسی. ئەوانە کۆمەکیان دەکـردم. مـن لەو کاتەدا سەرنجم لە جەسـتەی مـادی خـۆم دەدا، ئیـتر دوای ئەوە گەڕامەوە بـۆ نـاو جەستەکەم.

## ئاگرێکی گەورەم بینی

'سەلیم عەباسی' پیاوێکی موسـوڵمانی پاکسـانیە و دەڵێـت: لە سـاڵی (٢٠١٣) لە مومبای کەوتم و سەرم بە توندی زەبـری بەر کەوت، ئەو کـاتە تەمەنـم بیسـت سـاڵان بوو، لەناو ئاگرێکی گەورەدا خۆم بینیەوە، هاوار و زریـکەی زۆر ترسـناکم گـوێ لـێ

بــوو، خەڵکــیم دەبینــی چەنــدین جــار دەبــوونە خــۆڵەمیش و ســەر لە نــوێ زینــدوو دەکرانەوە و دیسانەوە سوتانی بەردەوام...

کەسێکی زۆر ترسناك کە چاوەکانی سور هەڵگەڕابوون لەبەر دەممدا بە تــووڕەییەوە پێی وتم: تۆ بۆ دایکت خراپ بوویــت و ئــازارت داوە، هەســتم بە شــەرمەزاری کــرد، چونکە من دایکم بردبوو بۆ خەڵوەتگەی پیری و بە تەنها بەجێم هێڵابوو.

پێی وتم: ئێستا تۆ چی دەکەیت؟

هیچ وەڵامێکم نەدۆزیەوە پێی بڵێم، چاوەڕوانی سزام دەکــرد! کــاتێکم زانــی خــۆم بینیەوە بەســەر گــوازەرەوەیەکەوە و، پەرســتارەکان هەوڵیــان لەگەڵ دەدام هەتــا هۆشــم بێتەوە.

گوێم لێ بوو پزیشکەکان دەیانوت دڵی باش لێ نــادات ڕەنــگە پێویســتی بە کارەبــا هەبێــت!! لەســەرەوە جــارێکی تــر خــۆم بینــیەوە، دایکــم بینــی لە دەرەوەی 'I.C.U' دەپاڕایەوە لە خوای گەورە کە هۆشم بێتەوە و چاك ببمەوە!

دەستم کرد بە گریان، فریشتەکە پێی وتم: نابینیت دایکــت چەنــدە پەرۆشــی حــاڵی خراپی تۆیە، لە کاتێکدا تۆ زۆر خراپ بوویت. بگەڕێرەوە بۆ لای دایکت و داوای لــێ بووردنی لێ بکە.

کە چاوم کردەوە دایکم لە بەرامبەرمەوە ڕاوەستا بوو، وەکــو منــاڵ دەگریــام و داوای لێ بووردنم لە دایکم دەکرد، دایکم خۆش بوو لێم،لەگەڵ خێزانەکەم دایکم بــردەوە بــۆ ماڵەوە و، ئێستا سوپاس بۆ خوا ژیانێکی باش دەگوزەرێنین.



# نێوان ئاسمانەکان و زەوی چۆڵ و خاڵی نیە



'نەبیلە' ئافرەتێکی موسوڵمانە و، پیشەی مامۆستایەتیە و دەڵێت: کە نزیکبـوونەوە لە مردنم بینی، دەرکم بە ڕاستەقینەیەکی زۆر گەورە کـرد، ئەویـش ئەوە بـوو کە ژیـانێکی زۆر پڕ ماناتر لە دوای مردن هەیە.

دوگیان بوم، سکەکەم سێ مانگان بوو، لە ئۆتۆمبێلەکەم دابەزیم و سـەیارەیەکی تـر لە دواوە لە سەیارەکەمی دا و کەوت بەسەرمدا، چونکە هێشتا دور نەکەوتبوومەوە!

ڕۆشـتمە دەرەوەی جەسـتەم، تونەیـل و تەواوی ژیـانی خـۆمم بینـیەوە، نـور و ڕوناکیەکی زۆر کەمەندکێشی کـردم، هـیچ ئـازار و خەم و ناخۆشـیەك نەمـا، دەمبینـی باوکم و کەس و کارم بۆ من دەگریان، دەموت: باشـە بـۆچی دەگـرین، خـۆ مـن زۆر باشم، لە دونیای نادیار هەواڵیشیان پێ دام کە منالەکەی ناو سکم زۆر باشە و کێشـەی نیە، نامەیەکیشم پێ گەیشت کە دەبێت بگەڕێمەوە دونیا، چونکە هێشتا کارم لە دونیـادا مابوو، دەبوو کات و کاری خۆم تەواو بکەم.

شتانێکی زۆر زۆر لە نێوان ئاسـمانەکان و زەویـدا هەیە، کە ئـێمەی خەڵکـی دونیـا هیچ هیچیان دەربارە نازانین.

شارێکم بینی پڕ بوو لە خەڵکی، کۆشکی زۆر گەورەی لێ بوو.



# تێگەیشتم لەوێوە دەست بە چارەسەر کرا

'مایکل رودیچر' ئەو پیاوەی کە ساڵی (٢٠١٢) ئەزموونەکەی بینی دەڵێت: من ساڵی (٢٠١٢) لە شەقامی خێرا لە ڕێگەی گەڕانەوەم بۆ ماڵەوە لە سویسرا تووشی ڕووداوی ئۆتۆمبێل بووم، کە من کارم دەکرد لە کۆمپانیای 'ڕووشی' کاتێ بە هەلیکۆپتەر گواستمیانەوە بۆ نەخۆشخانە هەستم بە لەش سوکی و شنەیەکی جیاواز کرد، لەو کاتەدا هێلیکۆپتەرەکە بەناو دارستانێکی زۆر چڕدا تێدەپەڕی هەتا بگاتە 'فریبورگ'، ئەوان هەستیان بە من کردبوو کە مردبووم، ئەوەبوو بە ناچاری هەلیکۆپتەرەکە نیشتبوویەوە و کارەبایان لە دڵم دابوو.

من لەو کاتەدا ئاگادار بووم و لە دەرەوەی جەستەم بووم، وتە و قسەکانی ئەوانم گوێ لێ بوو، دارستانەکەم دەبینی، زۆر دڵم خۆش بوو، وەك باڵدارێك دەفڕیم و دوای ئەوە گەڕامەوە ناو جەستەکەم.

دووەم جار کە گەیشتینە نەخۆشخانە جارێکی تر لە جەستەم چوومە دەرەوە، خێرا نەشتەرگەریم بۆ کرابوو، من پزیشکەکانی نەشتەرگەریم دەبینی و دەشمزانی بیر لە چی دەکەنەوە!! دەمویست ڕێگریان لێ بکەم لەوەی بە هۆشم بێننەوە، چونکە ویستی من ئەوە بوو کە بڕۆم و نەگەڕێمەوە بۆ دونیای فانی.

بەڵام وەك موگناتیسێك کێش دەکرام، ئەستەمە بڕۆیت لە کاتێکدا بڕیاری ڕۆشتنت نەدرابێت!! بەرەو ڕووناکیەك ڕۆشتم، لە ژوورێکی گەورەدا خۆم بینیەوە، زۆر ڕوناك بوو، وەك خۆر بوو، بەڵام هیچ ئازار و نەهامەتیەکی تیا نەبوو، لەوێدا کۆمەڵێك لە نورانیەکان دەوری منیان دا، زۆر جوان بوون، هەستم دەکرد لە زۆر زووەوە دەیانناسم، قژیان زۆر درێژ بوو، ڕیشیان هەبوو، بەرگیان زۆر سپیەکی جوان بوو.

یەکێکیان جیا بوویەوە و هات بۆ لام و پێی وتم: براکەم هێشتا کاتت نەهاتووە، دوای ئەوە ئەویش گەڕایەوە ناو نورانیەکانی تر و، داوای لێ کردن دەست بکەن بە

چارەسەری من، ئەوانیش دەستیان پـێ کـرد، ئەمەی کە دەیڵـێم بـۆ ئەوێ زۆر ئاسـایی بوو.

من تێگەیشتم و دەستیان بە چارەسـەرم کـرد، چارەسـەرەکەش وەك شـێلان و بـۆن خۆشی کردن وابوو، هەتا ئێستاش ئەو بۆن خۆشیە هەست پـێ دەکەم، بە تـایبەتیش لە دوای نیوەڕوان و هەندێ جاریش لە شەواندا و، لە خەودا هەستی پێ دەکەم.

پێیان وتم: دووانی تریش خەریکی چارەسەری تۆن، مـن زۆر پـێ داگـریم کـرد کە بمێنمەوە، بەڵام ئەوان ماڵ ئاواییان لێ کردم و بە ئازارەوە هۆشم هاتەوە.

کە گەڕامەوە دەرکی ئەوەم کرد کە ئەم جـۆرە ئەزموونـانە ڕێـکەوت نـین، ئەنـدازە و وردەکاری و تەقـدیرێکی گەورە لە پشـتیەوە هەیە، زۆر جـار دەچـمە ئەو شـوێنەی کە کارەساتەکەم بەسەرهات، دەچمە ناو ئەو گژوگیا و شوێنە چـۆڵە و بیـری ئەو پەیـمانەم دەکەوێتەوە کە لەوێ دام، بەوەی کە گرنگـی بە دەروونـی خـۆم بـدەم، وە ڕێـگە نەدەم کەس یاریم پێ بکات، یاخود بێ باکانە ژیان بەسەر بەرم.

ئێستا دەزانم و دەتوانم بە قەناعەتەوە بە شتانێك بڵێم "نەخێر".

## غایفەر، ئەو پیاوەی خەڵکێکی زۆری بینی



گایفەر دەڵێت: لە ماڵەوە ڕاکشا بووم، نەخـۆش بـووم، حـاڵم زۆر خـراپ بـوو، بە ئیسعاف برام بۆ نەخۆشخانە.

ماوەیەکی زۆر بێ هۆش بووم، لە جەستەم جیـا بـوومەوە و بە ئاسـماندا دەفـڕیم و چوومە ناو تونێلەکەوە، ڕووم لە ڕووونـاکیە گەورەکە کـرد، خەڵکێکـی زۆر زۆرم بینـی، زۆریانـم دەناسی، سڵاویان لێ کردم، ئەوانە هەموو مردوو بـوون و لە جیهـانی بەرزەخ بوون، زۆرم دەبینی کە لە زۆر زووەوە مـردووە، کەچـی لەوێ بـوو، کەس ون نابێـت،



خێزانێك بەهۆی ڕووداوی سەیارەوە تیاچووبوون، هەموویانم بینیەوە، یەکێکیان لەگەڵم هات و وتی: دەتەوێت لێرە بیت یاخود دەگەڕێیتەوە بۆ دونیا؟

وتم: دەمەوێت بگەڕێمەوە، زۆر شت ماوە ئەنجامی بدەم. دوای سێ هەفتە هۆشم هاتەوە و گەڕامەوە.

## چواردەورم چیای زۆر بەرز و جوان بوو



'فابین کولر' لە 'بەرلین' لە شوقەیەکەوە کەوتە خوارەوە، ئێسکەکانی شکان، بیست نەشتەرگەری بۆ کراوە و، دوو مانگ و نیو لە 'I.C.U' ماوەتەوە چەندین جار ئەزموونەکەی بینیوە.

دەڵێت: خۆم لە ناوچەیەکی سروشتی زۆر دڵڕفێندا بینیەوە، چواردەورم چیای زۆر جوان و بەرز بوون، چەندین دەریاچەی تیا بوو، دەرگایەکی زۆر گەورە هەبوو، نزیکەی سی کەسی تریش لە لای ئەو دەرگایە بوون، ئەوەشم زانی کە ئەم سی کەسە لە ناوچەی جیاوازی دونیا و، نەتەوە و زمانی جیاوازەوە هاتبوون، هەمووشمان زانیمان کە دەکرێت لە یەکتر حاڵی ببین و، بدوێین لەگەڵ یەکتر. هەمومان سەرسام بووبووین و زۆریش دڵخۆش بووین کە پێکەوە دەدوایـن، هەمووشمان زانیمان کە مردوین و ڕەنگە ئەمە بەهەشت بێت یاخود ڕێگەی بەهەشت بێت، گومانی تێدا نەبوو کە هەمومان لە کاتێکی نزیك بە یەك مردبووین، بۆ نموونە کاتژمێر (٦:٣٠) خولەکی بەیانی و (٧:٤٠) خولەکی هەمان بەیانی و بەو جۆرە نزیك بووین لە مردنی یەکترەوە.

لە لای دەرگای بەهەشتدا بووین، بەڵام مۆڵەتی چوونە ژوورەوەمان نەبوو، لە کاتێکدا دەرگاکەشی کراوە بوو...

چیاکانی ئەو نـاوچەیە وەك چیاکـانی 'ئەلـب' جـوان و دڵـرفێن بـوون، دەریـاچە و باخچەی زۆر جوانی لـێ بـوو، دەریـاچەکەش ئەوەنـدە ڕوون و جـوان بـوو، هەسـتم دەکرد کە سەیرم دەکرد زەوی دیار بێت لە ژێرەوە.

هەندێك لەو خەڵکەی لەوێدا بوون بە سـەر سـوڕمانەوە سـەیری منیـان دەکـرد، دە کەسێکیان دەبوون کە بازنەیەکیـان دروسـت کـرد و دەسـتی یەکتریـان گـرت، بـازنەی دووەم بیست و، لە یەك ئان و سـاتدا هەموویـان سـەیری منیـان کـرد بەیەکەوە، زۆر بە خێرایی ئەمە ڕووی دا، کە پێم گەیشت: دەبێت من بگەڕێمەوە بۆ دونیا و هێشـتا کـاتی مردنم نەهاتووە، ئیتر بە خێراییەکی سەرسوڕهێنەر بەناو دەریاچەکەدا منیان هێنایەوە بـۆ دونیا، بەبێ ئەوەی تەڕ ببم!

## کچی مێردەکەمم لەوێ بینی



'فینکلار' ئەو ژنەیە کەساڵی (٢٠١٩) چارەسەری کیمیایی وەردەگـرت و خـاوەنی ئەزموونی نزیکبوونەوەیە لە مردن.

دەڵێت: شەو بوو جەسـتەی خـۆمم لە خـوارەوە بینـیەوە، نـور و ڕوونـاکیەکی زۆر جوان هەبوو، خۆشەویستیەکی زۆر، باوکم و براکەم و مردوی زۆرم بینـی، هەموویـان زۆر دڵخۆش بوون، دەتوت لە زۆر زووەوە دورم لە وڵات و نیشـتیمانی خـۆم و ئێسـتا گەڕاومەتەوە.

کچی مێردەکەمم بینی، بەهۆی خۆ کوژیەوە مردبوو.

کە منی بینی بە ڕاکردن هـات بـۆ لام هەتـا باوەشـم پیـا بکـات، منیش ویسـتم بە ڕاکردن بچم بە پیریەوە، بەڵام پێش ئەوەی ئەو بگات بە من، پـورم خێـرا لە بەردەممـدا

ڕاوەستا هەتا نەگات بە من، پورم مردووە، پورم هەردوو باڵی کردەوە وەکو ئەوەی کە نەهێڵێت پێم بگات، وتی: تۆ کارت لە دونیادا ماوە، دەبێت بگەڕێیتەوە بۆ دونیا.

کە گەڕێنرامەوە و هۆشم هاتەوە، دەستم کرد بە گریان و زۆر دڵتەنگ بووم بەوەی نەیانهێڵا لەوێ بمێنمەوە.

دوای ئەوە لە نەخۆشخانە دەرچووم، بەڵام حاڵم باش نەبوو، تام هەبوو، زوزو شیکاریم دەکرد، کێشم زۆر کەمی کردبو، کێشم بوو بە پەنجا کیلۆ، قاچەکانم توانای ڕۆشتنیان نەبوو، ئازارم زۆر بوو، وازم لە هەموو چارەسەرێکی دەرمانی کیمیایی هێنا.

چیا و دارستانێکمان لە لاوە بوو، بە پێ سەردەکەوتم بەو دارستانەدا، مانگی سێ بوو، بەری درەختێکم بینی، دەنگێك لە ناخمدا پێی دەوتم بەری ئەو درەختە کۆ بکەوە و بیکە بە شەربەت و بیخۆرەوە بۆ چارەسەری نەخۆشیەکەت!

منیش لە دڵی خۆمدا وتم: باشە بۆ بەکاری نەهێنم.

ڕۆژی دواتر زۆرم لەو بەرە کۆکردەوە، دەستم کرد بە خواردنەوەی و هەتا ئێستاش بەکاری دەهێنم.

لە دوای سێ بۆ چوار هەفتە پزیشکەکەم پەیوەندی پێوە کردم و وتی هەواڵێکی زۆر خۆشت پێ بدەم، دەرەنجامی شیکاریەکانت زۆر باشن.

ئیتر ئەوە بوو ڕۆژ لە دوای ڕۆژ باشتر دەبووم، هەتا ئەوە بوو بە تەواوی لە شێرپەنجە چاك بوومەوە سوپاس بۆ خوا!



# چەند جارێك ئەزموونەکەم بینی

فرێسن دەڵێت: چەند جارێك ئەم ئەزموونەم بینیوە، لە ساڵانی شەستەکاندا منداڵ بووم، کەوتمە ئاوێکەوە، دەستم لە خۆم شت، دوای تونێلەکە، گەیشتمە باخچەیەکی پڕ لە گوڵ و گوڵزار و دار و درەخت، دار مێو و ترێی زۆری لێ بوو، لەناو نور و ڕوناکیەکەدا، دوو نورانیم لەگەڵ بوون.

ئەوە بوو لەو کاتەدا زوو بوو، ژنێك دەچوو بۆ دەوامی فەرمانگەکەی کە منی لە ئاوەکەدا بینی بوو، دەری هێنابووم و لە دوایدا گەڕامەوە بۆ دونیا.

ئەزموونی دوەمم: تەمەنم (٣٠ - ٣١) ساڵان بوو، وەرزشی کاراتیم دەکرد لە سویسرا، ناوبانگێکی باشم هەبوو.

ڕۆیشتمە چێشتخانەیەك هەتا نان بخۆم، ماسیم خوارد، بەڵام تووشی ژەهراوی بوون بووم، چوومە ماڵەوە، کە ویستم پاڵ بکەوم هەستم کرد گیانم دەسوتێت، سەیری ئاوێنەم کرد دەبینم ڕەنگم زەرد و چاوەکانم سوور هەڵگەڕابوون، زۆر ترسام بە پێی پەتی و بە پەلە خۆم گەیاندە نەخۆشخانە.

بیرم لە منداڵەکانم دەکردەوە، ئەگەر من بمرم چیان بەسەر دێت، هەستم دەکرد کە هەموو شتێك دەچووە یەك، وەك ئەوەی بە پێچەوانەوە سەیری تەلەسکۆبێك بکەیت ئاوا بوو.

لەناکاو هەموو شتێك تاریك داهات، لەو کاتەدا هاوارم بۆ خوای گەورە برد، ئیتر دوای ئەو هەموو شتێك تەواو بوو، گەڕامەوە ناو جەستەکەم و پزیشکەکان وتیان چوار کەس لەو چێشتخانەیە بە ماسی ژەهراوی بوون! هەچ کەسێك ئەو ئەزموونە نەبینێت، بە گێڕانەوەی کەسانی تر زۆر لێی حاڵی نابێت، من زۆر زۆر ئیمانم بە قیامەت و زیندوو بوونەوە بە هێز بوو کاتێك ئەزموونەکەم بینی.

# ئەزمووونی 'کارل غورتز'

'کارل گۆرتز' ساڵی (٢٠٠٦) ئەزموونەکەی بینیـوە دەڵێـت: سـەردانی خێـزانەکەمم کرد لە ئیطالیا، هەستم بە لەرز دەکرد، وام زانی سەرمام بـووە، خێـزانەکەم بە ئیسـعاف بردبـوومی بـۆ نەخۆشـخانەی 'بورگـدوروف'، نـزیکەی دە ڕۆژ لە نەخۆشـخانە بەبـێ هۆشی مامەوە، لەو کاتەدا ئەزمـوونەکەم بینـی، دایکـم و بـاوکم و خـزمە مردووەکـانم بینی، دایکم لێی پرسیم چی دەکەیت لێرە؟

وتم: نازانم!

زۆر قسەمان کرد، هەزاران کەسی لێ بوو، هەموویان سپی پـۆش بـوون، دڵخـۆش بوون، دوو سەرتاپا سپی هاتن بۆ لام و وتیان: مەترسە.

من هیچ ترسێکم نەبوو، ئەوانە فریشتە بوون، قژیان درێژ و سپی بـوو، پێیـان وتـم: کارلی دەتەوێت لەگەڵمان بێیت؟ منیش لەگەڵیان ڕۆشتم، بۆ شوێنێك ئەسپی لێ بـوو، دوانی ڕەش بوو، باڵیان درێژ هەتا سەر زەویەکە، دوانیشیان سـپی بـوون، فریشـتەکان وتیان: دەتەوێت سواری ئەسپی سپی ببیت یان ڕەش؟!

وتم: ئەسپی سپی.

وتیـان: باشـت کـرد سـپیت هەڵبـژارد، لە دوای ئەوە بە ئەسـپە سـپیەکە گەڕامەوە و هۆشم هاتەوە.



# ئەزموونە گرنگەکەی 'ئیهاب'



'ئیهــــاب عبــــدالرحمن' پیــــاوێکی موســــوڵمانی عێــــراقیە ئەزمــــوونەکەی دەگێــڕێتەوە و دەڵێــت: منــاڵێکی شــەش ســاڵان بــووم و کــاتی ئەوەم بــوو بچــمە قوتابخــانە، لەبەر ئەوەی خۆشەویســتی نەنــک و بــاپیرم بــووم و، زۆر نازیــان پــێ دابــووم، هــار و ســەرەڕۆ بــووم، نەچووبــوومە قوتابخــانە، ســاڵی (١٩٨٣) بــوو، لە گەڕەکێکــی شــاری بەغــداد بــووین، کە ئێســتا ئەو کــۆڵان و گەڕەکە نەمــاوە و هەمــووی بــووە بە کلینکــی پزیشــکی، لە بەردەم ژوورەکەی ئــێمە کە لە ســەرەوە بــووین، بــالکۆنەیەك هەبــوو، ســێ مەتــر بەرز بــوو، لە بــاخچەی خــوارەوە داری نارنجی لێ بوو، لەگەڵ دار خورما و لیمۆ و سندی و گوڵ و گوڵزار.

دایکم تەنافی لە بالکۆنەکە دروست کردبوو، ڕۆژێکیان جلــی دەشــۆرد، لەو کاتەیــا دەرگای بــالکۆنەکەی کــردەوە هەتــا پۆشــاکەکان هەڵبخــات، مــاڵی نەنکــم لە نهــۆمی خوارەوە بوون، نەنکم دایکمی بانگ کرد، منیش فرسەتم هێنــا و چــوومە بــالکۆنەکە و دەستم درێژ کرد بۆ پەلی دار خورمایەك کە نزیك بوو لە بالکۆنەکە.

دایکم لەو کاتەدا هاتە ســەرەوە بە ترســێکەوە قیژانــدی ئیهــاب خێــرا دابەزە، منــیش داچڵەکیم و دەستم لە قەراغــی بەلەکــۆنەکە بەر بــوو، دەســتەکەی تریشــم بە پەلــی دار خورماکەوە بوو خۆم بۆ نەگیرایەوە و کەوتمە خوارەوە بۆ حەوشەکە، ئــاخرین شــت کە گوێم لێ بوو هاواری دایکم بوو، ئیتر بوو بە تاریکســتان و لەناکــاو هەســتم کــرد زۆر باش دەبینم، دایکم و نەنکم و پورەکانم بینی هەموویان دەگریــان، منــیش هــاوارم لــێ کردن بۆچی دەگرین، من زۆر باشم و هیچم نیە.

بەڵام وەك ئەوەی نەمبینن وابوو، دەمویست باوەش بە دایکمدا بکەم بەڵام ســوودی نەبوو، دایکم نە هەستی پێ دەکردم نە دەیبینیم. ئینجــا چــوومە بەرامــبەر دایکــم هەتــا بمبینێت، لەو کاتەدا جەستەی خۆمم بینی لە بەینــی دوو دەســتەیاندا بــوو، چاوەکــانم

لێـك نـابوو، سـەر و دەم و چـاوم خەڵتـانی خـوێن بـوو، هـیچ هۆشـم نەبـوو. مـن بەرامبەریان ڕاوەستا بووم و نەشدەترسام و زۆر ئاسایی بووم.

بێ دەنگیەکـی سـەیر ڕووی تـێ کـردم، لەناکـاوگوێم لە دەنگـی منـاڵان بـوو پـێ دەکەنین، کە سەیری دەورویەرم کرد هـیچ منـاڵم نەبینـی، دەنگـی پێکەنینـی مناڵەکـان زیادیان کرد، کە سەیری سەرەوەی خـۆمم کـرد، دیمەنێکـی ئەوەنـدە جـوانم بینـی کە هەرگیز بە ئەندێشە و خەیاڵیش ناتوانیت وێنای بکەیـت، منـاڵی کـوڕ و کچـی بچـوك یاریان دەکرد، دەم و چاو و ڕووخساریان یەک پارچە نور و ڕووناکی بوو، بۆ مـاوەیەك گریان و شیوەنی کەس و کارەکەمی لە بیر بردمەوە.

یەکێك لە دراوسێکانمان دکتۆر ئەحمەد بـوو، هـات بەدەم هـاوار و گریـانی مـاڵی ئێمەوە و، خێرا پێی وتن: دور بکەونەوە و مەترسن، دور بن لێی با هەناسـەیەك بـدات، ئەوە بوو 'هەناسەدانی دەستکردی' بۆ کردم و پەستانی لە سـینەم چەنـد بـارە کـردەوە و منیش لە سەرەوە دەبینم و ئاگام لێیەتی. هیچ ترسـێکم نەبـوو، بەڵام هـیچ زانیـاریەکم نەبوو لەسەر ئەوەی کە بۆچی بەم جۆرەم لێ بەسەر هاتووە، هیچ ئـازار و دڵتەنگـیەکم نەبوو، بەڵام خەمی دایکم بوو، هاوارم لێ دەکرد من زۆر باشم بەڵام سودێکی نەبوو.

جارێکی تر ڕووم کردەوە مناڵەکان، یەکێکیان بانگی لێ کـردم، منـیش وتـم: باشـە بەڵام چۆن بێم بۆ لاتان ناتوانم وەکو ئێوە بفڕم.

لەو کاتەدا ئافرەتێکی جوانی گەنجم بینـی هـاتە نـاو ماڵەکەمـانەوە زۆر زۆر جـوان بوو، سەرتاپا پۆشاکی سـپی لەبەردا بـوو، بە پـێ نەدەڕۆیشـت، بەڵکـو وەك ئەوە بـوو لەناو هەوادا بڕوات، زۆر دڵخۆش بووم کە بینـیم، بەرەو لای مـن دەهـات و بە ڕووی خۆشەوە پێی وتم: ئیهاب گیان هیچ مەترسە.

وتم: من ناترسم بەڵام خەمی دایکمە.

وتی: خەمت نەبێت ئارام دەبێتەوە.

بە سەر سوڕمانەوە پێم وت: باشـە تـۆ چـۆن مـن دەبینیـت، بـۆچی ئەوان وەك تـۆ نامبینن؟!

وتـی: ئەوان زینـدون و ئـێمە مـردوو، بەڵام مـن تێنەگەیشـتم چـۆن چـۆنی مـن مردووم؟!

بە بەرائەتێکەوە بە ئافرەتەکەم وت: ئەی نابێت ئێمە بچین بۆ ئاسمان بۆ سەرەوە؟!

زۆر بە ڕوو خۆشیەوە وتی: ڕەنگە هێشتا کاتی تۆ نەهاتبێت ئازیزم.

ڕەنگە لە دوای ساڵانێکی دور و درێژ ئینجا تۆش وەکـو ئەو منـاڵانە بەرەو ئاسـمان بڕۆیت و ژیانی هەتا هەتایی دەست پێ بکەیت.

ئەو ئافرەتە پێی وتم: هیچ ترسێکت لە مردن نەبێت، مردن خراپ نیـیە، ڕاگواسـتنە، ماچی کردم و پێی وتم: سڵاوم بگەیەنە بە دایکت.

لە دوای ئەوە ڕۆشت و تاریکی داهات.

کە چاوم کردەوە دایکم و مام و پورەکانم بینی، لە خۆشیاندا دەستیان کرد بە گریـان و وتیان خودایە سوپاس مناڵەکەمان زیندووە.

بە سەیارەکەی أبو أحمد منیان برد بۆ نەخۆشخانە، باوکم دڵی پڕ بوو، چاوەکانی پـڕ لە فرمێسك بوون، دوای ئەوە گەڕامەوە باری ئاسایی و گەڕاینەوە ماڵەوە.

ڕۆژێکیان دایکم لە چێشتخانەکە سـەرقاڵی کـارکردن بـوو، وتـم: دایـکە ئەو کـچە جوانە کێ بوو سەلامی لە تۆ دەکرد؟

دایکم وتی: کام کچە کوڕم؟

منیش هەموویم بۆ گێڕایەوە کە چیم بینیوە و چۆن بووە!

نەنکم بە سەر سوڕمانەوە سەیری دەکردم و وتی: کوڕم تۆ گوێت لە وتەکـانی ئـێمە بوو، ئێمەت دەبینی؟

باشە تۆ نە چاوت کرابوویەوە و نە هۆشت هەبوو؟!

وتم: بەڵێ ئاگام لە هەموو شتێك بوو، هەندێ لە وتەکانی خۆیانم پێ وتنەوە!!

وتەی کچەکەم پێ وتنەوە کە ئێمە مردوین و لە جیهانێکی تـرین و ئەوان زینـدووی دونیان.

پەرداخە چاکە لە دەستی دایکم کەوتە خوارەوە.

نەنکم وتی: ڕۆڵە ڕەنگە تۆ خەونت بینیبێت.

وتم: نانا نەنە گیان من خۆم دەزانم کە خەون نەبوو، کۆمەڵێ منالێشم بینی.

دایکیشم وتی: کوڕم خەو بووە!

وتم: خەو نەبوو، تەنانەت ئەبو ئەحمەدیشـم بینـی بە سـەیارەکەی بردمـی، دکتـۆر ئەحمەدیشـم بینـی کە هەوڵـی چارەسـەری دەدام لە حەوشـەکەدا و پێـی وتـن دور بکەونەوە با هەوایەك لێی بدات!!

ئیتر دایکم و نەنکم بە جۆرێك سەرسام بوون شتێکیان نەما بۆ وتن.

نەنکم دوای بێ دەنگی و سەرسـام بـوون وتـی: منـاڵە گـوێ بە وتەکـانی مەدە "بە دایکمی وت".

بۆ شەوەکەی دیار بوو دایکم بەردەوام بیـری لە وتەکـانم کردبـوویەوە، پێش ئەوەی بخەوم چپاندی بە گوێمدا و وتی: کوڕم ئەو کچە شێوەی چۆن بوو.

منیش چۆنم بینی بۆم گێڕایەوە.

دایکم لەبەر خۆیەوە وتی: باشە تۆ بڵێیت کێ بوو بێت.

ئیتر وردە وردە تەپ و تۆزی زەمانە و گەورە بـوون و شـەڕە ترسـناکەکانی عێـراق و ئێران و لە دواییدا عێراق و ئەمریکـا و داگیـر کردنـی ئەمریکـا بـۆ عێـراق و ئـابڵوقەی ئابوری و نەهامەتی گەلی عێراق ئەزموونەکەم فەرامۆش کرد!!

نەنکم 'دایکی باوکم' کۆچی دوایی کرد و لەو ماوەیەشدا چەند برا و خوشـکی تـرم بۆ دروست بوون سوپاس بۆ خوا، لە سەرەتای سـاڵی (١٩٩٠) میـرات گرانـی مـاڵی بـاپیرم خانویـان فرۆشـت و ڕۆیشـتینە خـانویەکی بچـووکتر، لە کۆتـایی سـاڵەکانی (١٩٩٠) من چوومە دەرەوەی عێراق لە یەکێك لە وڵاتانی دراوسێی عێراق ژنم هێنـا و

لەوێش دامەزرام، بەڵام دایکم و باوکم لە شاری بەغداد مانەوە، دوای چەند ساڵێك باوکیشم کۆچی دوایی کرد، ماوە ماوە دەگەڕامەوە بۆ عێراق و سەرم لە دایکم دەدا، جارێکیان کە گەڕامەوە دایکم وتی: کوڕم ئیهاب با بەیەکەوە سەردانی ماڵی پورم بکەین 'پوری دایکم' من زۆر پێم خۆش نەبوو، چونکە لەبەر کێشەی میرات و خێزانی پەیوەندیمان نەمابوو، پوری دایکم تەمەنی نەوەد ساڵ دەبوو، لەگەڵ کچەکەی دەژیا لە گەڕەکێکی شەعبی، لەبەر وتەکەی دایکم وتم باشە با بڕۆین، کە ڕۆیشتم پوری دایکم بینی، بیر و هۆشی زۆر باش بوو، یادەوەری خزمانمان گێڕایەوە، باسی ڕابردووی ئەم خێزانەمان دەکرد کە ئێستا چۆن پەرش و بڵاو بووین، پوری دایکم داوای لە کچەکەی کرد وتی ڕۆڵە ئەلبومە کۆنەکە بێنە، ئەو ئەلبومە وێنە کۆنەکانی تیا بوو، دایکم کە سەیری وێنەکانی دەکرد هەندێ جار دەیپرسی ئەو وێنەیە کێیە و ئەوەیان کێیە؟ پوری دایکیشم پێی دەوت، لاپەڕەی ئەلبومەکەیان هەڵدایەوە، من لەو کاتەدا قسەم لەگەڵ یەکێك لە نەوەکانی پوری دایکم دەکرد، ئەو کەسەش پیاوێك بوو لە تەمەنی مندا بوو.

باسی عێراق و شەڕەکانی ئەم وڵاتەمان دەکرد.

دایکم لەو کاتەیا ئەلبومەکەی لە من نزیك کردەوە و وێنەیەکی زۆر کۆنی پیشان دام، وتی: سەیری باپیرت بکە چەندە ڕێك پۆش و شیکە، قاتێکی جوان و ستارەیەکی لەسەردا بوو، چەند وێنەیەکی تری کە من نەم دەناسین، لەبەر ئەوەی دەیان ساڵ بوو پەیوەندی و هاتوچۆمان نەمابوو، وێنەیەکی تری پیشان دام، باپیرەمی تیا بوو بە گەنجی کە من نەمزانی باپیرمە چونکە باپیرەم و نەنکم من وێنەی گەنجیانم نەبینی بوو، بە پیری بینیومن، لەبەر ئەوە کە سەیرم کرد باپیرم بە هیچ جۆرێك لە سەردەمی پیریەکەی نەدەچوو، کە سەیری تەنیشتی باپیرمم کرد، تاسام وەك ئەوە بوو یەکێك بە هەموو هێزی زلەیەکم لێ بدات، داچڵەکیم و دڵم دەستی بە زیادە لێدان کرد، چونکە ئەو کچە جوانەم بینیەوە لە تەنیشتی باپیرم بوو، ئەو کچە جوانەی لە مناڵیدا لە کاتی ئەزموون و بێ هۆشیەکەمدا هات بە دەممەوە و لە دواییدا پێی وتم سەلام لە دایکت دەکەم.

ئەم چرکە ساتە زانیم ئەو کچە جوانە نەنکم بووە و دایکی دایکم بووە، من هەرگیز وێنەی گەنجێتی ئەوم نەدی بوو، من کۆتایی تەمەنی نەنکم دی بوو، وێنەی پیری لە لای دایکم هەبوو، بەڵام وێنەی کاتی شووکردن و گەنجێتیم نەبینی بوو، کە وێنەکەم بینی خێرا ناسیمەوە و هەمان کەس و هەمان تەمەنی گەنجێتی ئەو بوو، بەڵام زیاتر جوان بوو، زۆر دڵخۆش و ڕازاوە بوو کە لە گەشتەکەما بینیمەوە.

کە داچڵەکیم و ڕەنگم تێك چوو دایکم خێرا هەستی پێ کردم، وتی: هیچ بووە کوڕم؟

وتم: نا هیچ نییە، بەڵام سەرسامم بە جوانی و گەنجێتی کاتی زووی نەنکم و باپیرم.

دایکم وتی: ڕۆڵە ئەوە دونیایە، ئەگەر کاتی خۆی بتبینیایە چ جوان و شۆخێك بوون!!

بۆ ئێوارەکەی لەگەڵ دایکم گەڕاینەوە ماڵەوە، هیچم نەوت، بەڵام ئەو ڕۆژەی کە ویستم بگەڕێمەوە بۆ دەرەوەی وڵات، لەگەڵ دایکم پێکەوە بووین و دانیشتبووین سەیری تەلەفزیۆنمان دەکرد، ڕووم کردە دایکم و وتم: دایە گیان بیرتە کە مناڵ بووم و لە ماڵی باپیرەم بووین، من کەوتمە خوارەوە؟!

دایکم وتی: ئەی چۆن بیرم دەچێتەوە کوڕم!

وتم: دایە بیرتە کە وتم، کاتێك من بێ هۆش بووم کچێکی زۆر جوانم بینی و سەلامی لە تۆ دەکرد.

دایکم وتی: بەڵێ ڕۆڵە بیرمە، من وتم ئەوە خەو بووە بینیوتە و تۆ دەتوت خەون نەبووە و ڕاستەقینە بووە.

وتم: دایە گیان سوێندت بۆ دەخۆم بە خوای گەورە، ئەو ئافرەتەی کە من بینیم، هەمان ئەو ئافرەتە بوو کە لە وێنەکەدا پیشانت دام و تۆ وتت ئەوە دایکمە و نەنکی تۆیە ئیهاب...

ئیتر ئەوە کۆتا جار بوو من دایکم ببینمەوە، دوای دوو مانگ لەو بەرواره، دایکـم لە خەودا بووە و جەڵدە لێی داوە و وەفاتی کردووە، کاتێك کە پێم زانـی ئەوەنـدە گریـام، من لە وڵاتی غەریبی بووم و لە کۆچی دوایی و پرسەکەیدا ئامادە نەبووم.

زۆر حاڵم خـراپ بـوو، شـەوانە هەڵدەسـتام و دەگریـام، خێـزانەکەم و منداڵەکـانم پەرێشانم بوون و وتیان سەردانی پزیشکی دەروونی بکە.

شەوێکیان بیری ژیانی ڕابردووی خۆمم دەکردەوە، خەوم لـێ کەوت، خەوم بینـی، لە خەونمـدا لە مـاڵی نەنکـم بـووم و وەك جـاری پێشـوو کەوتمەوە خـوارەوە هەمـان خانووە کۆنەکەمان و هەمان باخچە و بەلەکۆنە بوو، هەروەکو ئەو جـارەش بـێ هـۆش کەوتم، گوێم لە پێکەنین و یاری منداڵەکان بـوو لە ئاسـمان بە هەمـان جـاری پێشـوو، بەڵام ئەم جارە بانگیان نەکردم بچم بۆ لایان، دەرگا سەرەکیەکەی ماڵی باپیرم کـرایەوە، دوو ئـافرەتی زۆر جـوان هـاتنە ژوورەوە، یەکێکیـان دایکـم بـوو لە ئەوپەڕی جـوانی و گەنجێتیدا بوو، ئەوی تریان نەنکم بوو، نەنکم بە هەمان شێوەی منـاڵی کە بینـی بـووم بینیمەوە، هەردووکیان جوانترین جلی سپیان پۆشی بـوو، دەتـوت مـانگی چـواردەن، دەتـوت دوو خوشـکی زۆر شـۆخ و شـەنگن، بە هـیچ جۆرێـك لە دایـک و کـچ نەدەچوون، نەنکم لە لای دەرگاکە ڕاوەستا و دایکم هات بۆ لام، دایکم زۆر دڵخـۆش و ڕووو شیرین بوو، منیش وەك سەردەمی منداڵی دەستم کرد بە گریان و وتم: دایە گیـان زۆر داوای لێ بوردنت لێ دەکەم، گەردنم ئازاد بکە، من زۆر تۆم خۆش دەوێت.

دایکم ماچی کردم و وتی: بۆانە کوڕی ئازیزم! من هیچ زویر و دڵگران نـیم لە تـۆ، تەنها بۆ ئەوە هاتوومەتەوە بە تۆ بڵێم "هیچ خەم مەخۆ" خەمبـاری مـن مەبە و ژیانـت ئاسایی بکەرەوە کوڕم، کوڕە شـیرینەکەم شـوێنی مـن زۆر زۆر خـۆش و بـێ وێـنەیە، لەگەڵ دۆست و خۆشەویستاندام.

وتم: دایە ئەی باوکم بارودۆخی چۆنە؟

دایکم وەڵامی ئەوەی نەدامەوە، تەنها ئەوەندەی وت: تۆ خەم مەخۆ و دڵت هێور بکەرەوە جارێکی تر ماچێکی تری کردم و ڕووی لە دایکی کرد، نەنکیشم سەلامێکی لێ کردم و ڕۆشتن.

هاوارم کرد دایە گیان مەڕۆ، توخوا پێم بڵێ دەتبینمەوە؟!

دایکم لایەکی کردەوە وتی: بەڵێ کوڕی ئازیزم، هەموومان چاوەڕوانی هاتنی ئێوە دەکەین، کوڕی خۆم زۆر باش بە لەگەڵ خێزان و منداڵەکانت و هەموو خەڵکی.

دوای ئەوە دایکم دەستی نەنکمی گرتوو بە دڵخۆشیەوە لە دەرگاکە چوونە دەرەوە.

کاتێکم زانی خێزانەکەم و کوڕە گەورەکەم خەبەریان کردمەوە...

ژیانم دوای ئەوە بە تەواوی گۆڕا و، خێزانم و منداڵەکانم گرنگترینن لە ژیانمدا و، تەواوی خەڵکیش بە خۆشەویستیەوە دەدوێنم سوپاس بۆ خوا.

## جێگەی بایەخی هەموو جیهانە



پێگەی 'BBC' هەواڵی بڵاوکردەوە کە بەڕێز 'S' دڵی وەستا و بردیان بۆ نەخۆشخانەی 'ساوفانتۆ' ئەم پیاوە دەڵێت: بە تەواوی ئاگادار بووم لە کاتی مردنمدا چی ڕوویدا، ئەوەشم گوێ لێ بوو کە دوو جار وتیان کارەبا لەسەر دڵی بدەن...

کاتێك سەیری ڕاپۆرتی پزیشکی ئەم نەخۆشە دەکەیت هەموو وتەکانی ڕاستن و ئەو کارانەی بۆ کراوە.

*ساڵی (١٩٨٢)ی زایینی زانای جیۆلۆجی سویسری 'البرت هایم' بەسەر چیاکاندا سەرکەوتبوو لە دوایدا کەوتبووە خوارەوە، 'البرت' زۆر بە وردی ئەو چرکە ساتانە باس دەکات کە لەسەر چیاکە کەتۆتە خوارەوە و، دوای ئەوە شریتی ژیانی خۆی بینیوەتەوە

و هەستێکی خۆش و بێ کێشەی هەبووە، لە کتێبەکەیدا بە ناونیشانی 'تێبینیەکانی سەبارەت بە مردن لە کاتی کەوتنە خوارەوەدا' ئەزموونەکەی هەموو یاداشت کردەوە.

* 'کارولین کول' ڕۆژنامە نووسی 'دەیلی میل'ی بەریتانی، بە هەمان شێوە باسی ئەزموونی خۆی دەکات.

* 'جیك' یەکێك بوو لە ئاگر کوژێنەوەکان، 'ئەوفن جیسون' کە ئەندازیاری ئەتۆمیە لە چاوپێکەوتنێکدا دەگێڕێتەوە و دەڵێت: 'جیك' لە دارستانەکە ئۆکسجینی کەم دەکات بەهۆی سوتانی دارستانەکە، جیك دەڵێت: من و هاوکارەکانم بەهۆی ئابڵوقەی ئاگرەکەوە تووشی خنکان بووین بەهۆی دووکەڵەوە، لەگەڵ هاوکارەکانم بێ هۆش کەوتین، یەکسەر لە جەستەم چوومە دەرەوە و ئازار و تەنگە نەفەسیم نەما، هەستم بە دڵ ئارامی و خۆشی دەکرد، هەر لە هەمان شوێن هەموو هاوکارەکانم کە وەك من بێ هۆش بوون بینیمنەوە بە ساغ و سەلامەتی و لەگەڵ یەکتر دەدوایـن، واتە ڕۆحی هەموومان لە سەرو جەستەکانمانەوە بوو، سەر دەکەوتین بەرەو ئاسمان، یەکێك لە هاوکارەکانمان قاچی تەواو نەبوو، بەڵام لەوێ هیچی نەبوو، باپیرم لەوێ بینی، کە باپیرم کۆچی دوایی کردوە.

لە دوای ئەوەی فریایان دەکەون و هەموویان دەگەڕێنەوە و هۆشیان دێتەوە، هەموویان هەمان گەشت و ئەزموون دەگێڕنەوە و ڕاستی وتەکانی 'جیك' دەسەلمێنن.

* 'نادر' گەنجێکی سعۆدیە و بە ڕووداوی سەیارە دەمرێت، دەیبەن بۆ ساردکەرەوەی مردوەکان لە 'مەیت خانە'، کەس و کارەکەی دێن هەتا لاشەکەی وەربگرنەوە، دەبینن ماوە و زیندوو دەبێتەوە، نادر دەڵێت ئەزموونی نزیکبوونەوە لە مردنم بینی و هەموو ژیانی خۆمیان پیشان دامەوە هەتا ناو ساردکەرەوەی مردووەکان.

# پرۆفیسۆر 'هوارد ستورم' بەرەو نوری باوەڕبون

لە بەرنـامە بەناوبانگەکـانی ئـۆپرا و، هەروەهـا بەرنامەکـانی تـر 'هـوارد سـتورم' چاوپێکەوتنی هەیە لەسەر ئەزمـوونی نزیکبـوونەوە لە مـردن، کتێبێکـی دەربـارەی ئەم ئەزموونە نوسیوە و فرۆشی زۆر بووە.

'هوارد ستورم' پرۆفیسۆر و مامۆستای زانکـۆ بـوو، بـێ بـاوەڕ بـوو، بەڵام لە دوای ئەزموونەکەی باوەڕی بە خوا و ڕۆژی دوایی هێنا و زۆر پەشیمان بوو کە کاری بـۆ بـێ باوەڕی کردووە.

'هوارد' دەڵێت: سـەرەتای گەورە بـوون و پێگەیشـتنم لە سـاڵانی پەنجـادا بـوو، لە خێزانێکدا گەورە بووم، پارە و سامان و داهات خوایـان بـوو، جـۆر و مـۆدێلی تـازەی ئۆتۆمبیل و جل و بەرگی گران بەها و خۆش ژیـان، لە پێشـینەی ئەرکەکـانی ژیانمـان بوو. هەموو ئەندامانی خێزانەکەمـان زۆر دژی کەنیسـە و دیـن و خـوا بـووین، بەلای ئێمەوە وابوو کە مایەی شەرمەزاری بوو لە ژینگەیەکـی دینـی و ڕۆحیـدا ژیـان بەسـەر بەریـت. ئێسـتا زۆر پەشـیمانم و زیـاتریش خەمبـارم کە ئـاوا ژیـانێکی تاریـك و بـێ بـاوەڕیمان هەڵبژاردبـوو، لە هەمـان کاتیشـدا ئەو جـۆرە بیرکـردنەوە و ئیلحادەمـان دەسەپاند بەسەر خەڵکیدا و بەسەر خەڵکانی جیاوازی جیهاندا، زۆر خەمبـارم کە مـن و خێزانەکەمان بووینەتە هۆکاری تێکدانی سەدان قوتابی زانکۆ و بێ باوەڕ کردنیـان بە خـوا و ڕۆژی دوایـی، زۆر داوای لـێ بـوردن لە خـوای گەورە دەکەم کە بـوو بـووینە مەڵبەندێکی بێ باوەڕی و سەدان خەڵکمان بەرەو تاریکیەکانی بـێ بـاوەڕی بـردوە، لە زانکۆش من لەگەڵ دەستەی وانەبێـژی سـەرۆکی کۆلێژەکەمـان بە دەسـت ئەنقەسـت کارمان دەکرد و پلانمان هەبوو بۆ بێ باوەڕ کردن و کافر کردنی خوێندکاران.

ئەو قەناعەتەم هەبوو کە بە دڵنیاییەوە لە دوای مردن ڕزین و تیاچوونی هەتا هەتاییە و، زیندوو بوونەوە نیە.

چونکە باوەڕمان وابو کە بەڵگەی زانستی نیە لەسەر زیندوو بوونەوەی دوای مردن.

هەتاوەکو خۆم ئەزموونی نزیکبوونەوە لە مردنم بینی لەساڵی (١٩٨٥)ی زاینی دا.

بەڵام لە دوای ئەزموونەکە قوڵترین و دەمەزراوترین ئیمان و باوەڕم هێنا بە خوا و زیندوو بوونەوە و قیامەت.

کتێبێکیشم لەسەر نووسی بە ناوی 'نزولي الى الموت/ فرصة ثانية للحياة'.

'هوارد' لە سەرەتای ساڵانی چلەکاندا لە دایك بووە.

قەناعەتی بە قوتابیەکانی دەکرد بە نەبوونی خوا و زیندوو بوونەوە. دەگەڕا لە ئەمریکا و ئەوروپا و ئاسیا سیمینار و کۆڕی تایبەتی هەبوو.

'هوارد' لەگەڵ خێزانەکەی و قوتابیەکانی زانکۆ گەشتێکیان کرد بۆ فەرەنسا.

لە کوت و پڕێکدا بێ هۆش کەوت و بردیان بۆ نەخۆشخانە، وتیان بڕینی ڕیخۆڵەی دوانزە گرێیەتی، پزیشکەکان بڕیاری نەشتەرگەری بەپەلەیان دا.

ئەو ڕۆژە ڕۆژی پشوو بوو، ڕۆژی شەممە بوو، پزیشکی پسپۆڕی ئەو نەشتەرگەریەی منی لێ نەبوو، لەبەر ئەوە نەشتەرگەریەکە دواخرا.

بە خێزانەکەمم وت: من لە دوا ساتەکانی ژیاندام، بۆ هەتا هەتایە ماڵئاوایتان لێ دەکەم، دەمویست بە خێزانم بڵێم زۆرم خۆش دەوێت، بەڵام فریا نەکەوتم و چاوەکانم لێك نا.

من دڵنیا بووم چاو لێك نانم و مردنم دەمباتە نەمان و نەبونەوە و خامۆش بوونی هەتا هەتایی و، ئیتر جارێکی تر بون و زیندوێتیەك بە خۆمەوە نابینم.

من بەرەو مردنێکی زۆر خێرا دەچووم و فرسەتی هیچی نەدام، بەڵام ئەوەشم بیر بوو کە نە بیرم لە نوێژ و دوعا و پاڕانەوە نەدەکردەوە، بۆ جارێکیش ناوی خوام نەهێنا،

پێشتریش هەرچی جارێك ناوی خوام بهێنایە، بە گاڵتە و شۆخی کردنەوە ناوم دەبـرد و هەرگیز بە ڕاستم نەبوو.

کە چاوم لێکنا خۆم بۆ کوژانەوە و نەمان ئامادە کرد...

مـن نـازانم چاولێکنـانەکە چەنـدەی پـێ چـوو، بەڵام کـاتێکم زانـی لە تەنیشـتی جەستەمەوە ڕاوەستاوم!!

من سەیری جەستەی بێ دەنگ و خامۆشی خۆم دەکەم.

وتم: شتی ئاوا نابێت، ئەمە شێتێتیە...

نابێت هەرگیز نابێت من لە دوای مردنی جەستەم زیندوو بم...

نابێت ڕۆح وجودێکی هەبێت، ئەمەی دەیبینم ڕاست نیە و خەونێکە!!

چۆن دەبێت من لە دەرەوەی جەستەی مادی بم و زیندووش بم.

بەڵام دڵنیـا بـووم و زانـیم کە بەڵـێ مـن بـوومەتە ڕۆح و زیندووشـم، زیـاتر لەو زیندوێتیەی کە لە جیهانی مادیدا هەمبوو!!

بینیم و دڵنیـا بـووم ئەوەی کە ئێسـتا دەیبیـنم نە خەیـاڵە نە خەوە، نە وڕێـنە نە هـیچ شتێکی تر، بەڵکو ئەمە زیندوو بوونەوەیە زیندوو بوونەوە... زیندوو بوونەوە..

بەڕاستی ئەوە منم لە دەرەوەی مادی و فیزیکی، ئیـدراك و بینـین و هەمـوو شـتێکم زۆر زۆر زیـاترە لە دونیـا... ئەی هـاوار مـن چـیم کـرد بە خـۆم... ئەی هـاوار چـۆن فریودانێك فریودرام و هەزارانیشم فریودا...

ئیتر دەستم کرد بە هاوار و بانگ کـردن لە کەسـانی دەوروبەری جەسـتەکەم بەڵکـو فریام کەون، بەڵام کەسیان گوێیان لە من نەبوو، کەسێکیان منی نەبینی، هـاوڕێیەکم لە ژوورەکەدا بوو دەمویست سەرنجێکم بدات، زۆر هەوڵم دا، بێ سـوود بـوو، ئەی داد و بێ داد چیم کرد بە خۆم...

دەمویست خەون بێت و خەبەرم بێتەوە، بەڵام بێ سوود بوو بینیم زۆر زیاتر لە دونیا بە ئاگام، زیاتر چاو کراوەم هەموو شتێکی دەوروبەرم پڕ بوو لە ژیانەوە، خاوەنی ژیانێکی ئەو تۆ بووم زیاتر لە ژیانی دونیا بە هەزاران هەزار جار.

هەستم کرد دەست و چاو و ئەندامی ڕۆحانی زۆر باڵام هەیە.

کاتێکم زانی بانگم لێ کرا... هوارد... هوارد وەرە بۆ ئێرە... ئەی هاوار ئەمە ئەو ڕۆژە بوو کە بە درۆم دەخستەوە، بۆم دەرکەوت بانگەکە لە لای دەرگاکەوە بوو، دەنگی جۆراو جۆر بانگی لێ دەکردم... هوارد... هوارد... بەڵێ بە دیاری کراوی منیان دەوێت... چی بکەم خودایە!!

وتم: ئێوە کێن، وا بە تایبەتی هاتوون بۆ من. وتیان: وەرە پێشەوە، ئێمە لێرەین هەتا گرنگی بە تۆ بدەین.

دەمویست! بەڵکو هێشتا دونیا بێت، وتم: باشە دێم بەڵام ئێوە پەرستارن یاخود پزیشك، پێم بڵێن ئێوە کێن؟!

وتیان: بە خێرایی وەرە... دەزانیت ئێمە کێین!!

ئەوان زۆر زاڵ بوون، بە خێرایی وەڵامیان دەدامەوە، بە دڵنیایی و بێ باکی بانگیان دەکردم، منیش شکست خواردوویەکی ڕاکردوو لە بەدیهێنەرەکەی... ئاخر چۆن بێم...

•

دەمزانی ڕاست دەکەن کە دەڵێن... وەرە دەزانی ئێمە کێین؟!... ئەی داد و بێ داد.

زۆر زوو شکستم خوارد لە بڕیاری نەچوون، خێرا قەناعەتیان پێ کردم کە هیچ ماتڵ بوونێك قبوڵ کراو نیە... خێرا وەرە... لەگەڵیان کەوتمە ڕێ... چۆن ڕێ کردنێك، پڕ لە ترس و دڵەڕاوکێ... چاوەڕوانی خراپ.

که ڕێمان دەکرد کەوتمە ناو کەشێکی زۆر ترسناکی تەم و مژاوی سەیرەوە، تەم و مژەکە ڕەنگی جیاوازی تیابوو، تەمەکە زۆر چڕ نەبوو چونکە من دەستی خۆمم تیا دەبینی.

ئەوانەی کە بانگیان لێ کردم و لەگەڵیان بووم لە چواردەورم بوون و لە دووری (١٥ - ٢٠) مەترێك ئابلۆقەیان دابووم و بەردەوام ڕێمان دەکرد، نەشم دەزانی بۆ کوێ، هەتا کەی بەم جۆرە لە ترس و چاوەڕوانی دا بم!!

ئەوان وەك تارمایی و شەبەحێك خۆیان پیشانی من دەدا، دەزانی چەندە بە توانا و بە دەسەڵاتن و تواناى خۆ گۆڕینیان هەیە!!

زۆرم لە خۆم دەکرد هەتا ترسم کەم بێتەوە و دەمویست زیاتر لێیان نزیك ببمەوە، بەڵام ئەوان دور دەکەوتنەوە و دەچوونە ناو تارمایی و تاریکیەکە و زیاتر ئاڵۆز دەبوون لە من.

ئەو دروستکراوە سەیرانە زیاتر سوور بوون لەسەر ئەوەی کە بەردەوام بم لە ڕۆشتن و دور نەکەومەوە لێیان، دەیانوت پەلە بکە، منیش هیچ جۆرە فرسەتێکی دەرچوون لەو دۆخەم نەبوو.

ماوەیەکی زۆر لەناو تاریکایی و تەم و مژدا ڕۆشتین، ڕێم دەدرا لا بکەمەوە و جەستەی بێ گیانی خۆم و کەس و کارم لە نەخۆشخانەکە ببینم، بەڵام قەرەباڵغی ئەوێ و گرنگی دانیان بە جەستەکەم هیچ سوودێکی بۆ من نەبوو!!

هەستێکی زۆر سەیرم هەبوو، دەسەڵاتێکی زۆر سەیر دراوە بە ڕۆح، چونکە دەمتوانی لە هەمان کاتدا بفڕم بەسەر ژوورەکەی خۆمدا و بچمە ناو کەس و کارم، بەڵام منی بنەڕەتی لە تاریکی و خەم و ترس دووری نەدەخستمەوە و، من لەگەڵ ئەو بوونەوەرە غەریبانە ڕێی چارەنووسی خۆم گرتبووە بەر و هیچ جووڵەیەکی ئازادیم نەمابوو...

داماو داماو لەگەڵیان ڕێم دەکرد...

ملیۆنەهـا ملیـۆن مـیلمان بـڕی، دڵنیـا بـووم دەسـەڵات لە لای ئەمـانە، پزیشـك و چارەسەری دونیایی هیچیان پێ ناکرێت ئەگەر مۆڵەتی ئێرە بە پایان گەیشتبێت.

قەرەبـاڵغی و خەمخـۆری دەوری جەسـتە لە لای تـۆ لە سـەرەوە دەبێـتە یـاریەکی منداڵان و هیچی تر.

ئەوەندە لە زووەوە لەگەڵیان ڕێم دەکرد و، ئەوەنـدە زۆر بـوو لە ڕووی کـاتەوە "هەر چەندە کات کاتی دونیـایی نـیە، چـونکە زەمەن بە مانـا دونیـاییەکەی لەوێ نـیە" ئیـتر هەسـتم بە سـزایەکی زەمەنـی و قەدیمـی دەکـرد، کە مـن چەنـد هەزار سـاڵە لەم سـزا سەختەدام!! هەتا زیاتر ڕێشمان دەکرد تاریکی و ترسناکی زیادی دەکرد بۆ من، شـێواز و شێوەی ئەو بوونەوەرانە بەرەو گۆڕان و ترسـناکتر دەچـوو، یەکەم جـار کە لەگەڵیـان ڕێـم کـرد بەو جـۆرە نەبـوون، دڵخـۆش دەبیـنران بەڵام هەتـا زیـاتر ڕێـمان دەکـرد دوژمنکـارانەتر دەبـوون، ئیـتر بە ڕق و تـووڕەییەوە وەڵامیـان دەدامەوە، گاڵتەیـان پـێ دەکردم، سوکایەتیان پێ دەکردم، لێیان دەدام.

ئەوەندە سزام بینی لە دەستیان، شێوەیەك لەوان نەما من بتوانم پشـتی پـێ ببەسـتم، سزاکانی بەرزەخ و قیامەت بە ملیۆنەهـایە و هەرگیـز لە دونیـا چـاوەڕوانی جیهـانێکی ئەوەندە فراوان و قوڵ ناکەیت. •

ڕووگەیەك نەما ڕووی تێ بکەم، هەموو شوێنێك تەنها تـاریکی و تەم و مـژ بـوو... بـۆم دەرکەوت کە ئەوان بە هـیچ جۆرێـك نە بەزەیـان پیامـدا دێـتەوە، نە یـارمەتیەکم دەدەن، ملی ڕێگەیەکی زۆر نا ڕوون و نادیارم گرتبوو...

لە شوێنێکدا وەستام و وتم: هێزم نەما... ئێوە ماندوو بوون ناناسن، توانـام نەمـا... ئارامم لێ بڕا... ئیتر نایەم لەگەڵتان...

هەر کە ئەوەم وت: بە جۆرێك پەلاماریان دام هەرگیز وێنەی لە دونیا نـیە و نابێـت، زۆر ڕقاوی و ترسناك بوون، زۆر زیاتر لە جاران شەڕانی بـوون، کـاتێ ئـازاری منیـان دەدا دەبوو بە دڵخۆشی و خۆشی بۆ ئەوان، لەبەر ئەوە هونەری زۆر ترسـناکیان لە سـزا دانم بەکار دەهێنا. گازیان لێ دەگرتم... بە نینۆکە تیژەکانیـان سـزای سـەختیان دەدام، کاتێ یەکێکیان دور دەکەوتەوە، پێنجی تریان دەهاتنە گیانم، دەبوون بە بیسـت و سـی و زیادیان دەکرد، ژمارەیان زۆر زۆر بوو، هەمووشیان بە تایبەتی بۆ من نێرابـوون، مـن دەمویست بەرگری لە خۆم بـکەم، سـەیرم دەکـرد هـیچ ئازارێـك بەوان نەدەگەیشـت، هێزی من وەك یاریەك بوو بۆ ئەوان...

جووڵەیەکی بچووکی من، ئەوانی زیاتر هار دەکرد..

ئەوان زۆر بێ باك بوون لە من، یاریان پێ دەکردم. جەسـتەی ئەوێـی منیـان پـارچە پارچە دەکرد کەچی نەدەمردم!! ئەوان هـیچ هەسـتێکی سـۆز و بەزەیـی و خاترانەیـان نەدەزانی.

لەناو ئەو ئازارە هەزار ساڵانەیا، لە دوای ئەوە هەستم کرد دەنگێك پێم دەڵێت: قـوڕ بەسەر هێشتا بەخەبەر نایەیت، هاوارێك لە خـوای گەورە بـکە، نـوێژ بـکە... لەو زاتە بپاڕێرەوە...

منیش وەڵامم دایەوە ئاخر مـن هەرگیـز نـوێژم نەکـردووە، نەپـاڕاومەتەوە لە خـوا، چۆن ڕووم بێت و چی بڵێم!!

بە خـۆمم دەوت نەگـبەت! تـۆ بـاوەڕت بە خـواو زینـدوو بـوونەوە نەبـوو چـۆن یارمەتیت دەدرێت، چۆن جارێکی تر مۆڵەتی گەڕانەوەت پێ ڕەوا دەبینرێت!!

لە تەنگەژەیەکی زۆر گەورەدا بووم.

ئاخر چۆن نوێژ و دوعا بکەم!

له منداڵیمدا هەندێ دوعا فێر بووبووم، بیـرم کەوتەوە و پـاڕامەوە لە خـوای گەورە، وتم: یارەبی زۆر ڕوو ڕەش و شەرمەزارم، هاتوومەتە دەرگای مەرحەمەت و بەزەیی تـۆ فریام بکەوە!

کە ئەم دوعایـانەم کـرد، ئەو بـوونەوەرانە هاواریـان دەکـرد و دەگریـان و دوور دەکەوتنەوە، هەر وەکو ئەوەی من ڕۆنـی هەڵقرچـاو و گەرمـم پیـا کـردبن، بەو جـۆرە هەڵهاتن و دیار نەمان...

هاواریان لە من دەکرد بوەستم و دوعا نەکەم!

من زیاتر دەپاڕامەوە لە خوای گەورە و میهرەبان، کە زۆر زوو هـات بە هانـامەوە... زۆر زوو فریای بەندە بێ چارەکەی خۆی کەوت. لەو شوێنەدا بـێ دەنگـیەك دروسـت بوو، سزا و ئازارم نەما...

ساڵەهای ساڵ بوو من لە سزادا بووم، ئێستا تەواو بوو سوپاس بۆ خـوا، لە شـوێنی خۆمدا پاڵ کەوتم، نازانم ئەو شـوێنە کـوێ بـوو... هەرچـی خەم و ئـازار و مەینەتـی دونیا هەیە کۆبیکەرەوە بە ئەندازەی چرکە ساتێکی ئەوێ نابێت.

هاوارم کرد، خودایە ڕزگارم بکە... ئەستێرەیەکم بینی ڕووناك بـوو، پرشـنگی دەدا، لە دورەوە دەکشا و دەهات.

هەتا نزیك دەبوویەوە ڕووناکیەکەی زیاتر و گەشتر دەبوویەوە، تیشکەکانی تـێکەڵم دەبوون، منیان لەو شوێنە بەرز کردەوە و هەرچی ئازار و برینم هەبوو هیچیان نەمان.

لە خۆشیاندا دەستم کرد بە گریان، دەستم بە خۆشەویستیەکی بێ سنور کرد.

حەزرەتی عیسـا هـات و بـوو بە شـەفاعەت کـارم و، منیش بەردەوام وەکـو منـاڵ دەگریام.

من لە دونیا بانگەشەی نەبوونی خوام دەکرد، شەرمەزاری بارەگای خوا بووم، ئێستا دەزانم هەموو دەسەڵاتێك، هەموو هێزێك، هەڵسوڕانێك خوای گەورە سازێنەریەتی.

فریشتەکانی خوام لە جوانترین شێوەدا بینی، جوانترینێك لە فریشتەکاندا کە بینیم پەیوەستیانە بە تۆوە.

بیرم لە هەر چیەك بکردایەتەوە پێیان دەزانی.

فریشتەکان پێیان دەوتم: گەورەترین بەختەوەریان ئەوەیە کە دەچنە خزمەتی پەروەردگار.

وت و وێژی زۆرمان کرد، هەرچی پلەی زانستی من هەبوو لە لای ئەوان گرنگ نەبوو، گرنگ لە لای فریشتەکان شتانێکە مۆری چاکەی لێ بدرێت.

پلە و پایەی دونیایی لەوێ هیچ گرنگیەکی نیە، ئەوەی کە من بۆ دونیام بە شانازیم دەزانی، لە لای ئەوان هیچ گرنگ نەبوو.

مامەڵەی خەڵکی چۆن دەکەیت، موحیبەت و خۆشەویستی بە خەرج دەدەیت، کۆمەکی و یارمەتی هەژار و بێ نەواکان دەکەیت، ڕۆژانە چاکە دەکەیت، گرنگ ئەمەیە لای فریشتەکان.

بەداخەوە من لە دونیادا مامەڵەم لەسەر بنچینەی بەرژەوەندی بوو نەك خۆشەویستی و ڕێز و یارمەتی دان.

کە ئەمەش لەلای فریشتەکان مامەڵەیەکی زۆر خراپ و نادروست بوو.

بۆ نموونە: من پرۆفیسۆرێك بووم، کاتێك قوتابیەك دەهات بۆ لام، من خۆم وا پیشان دەدا کە پشوو درێژم لەگەڵی و مجامەلەم دەکرد و دبلۆماسیانە و سیاسیانە لەگەڵی دەدوام و مامەڵەیەکی شیرین و باشم پیشان دەدا، بەڵام لە ناخ و دەروونمدا بێ تاقەت و وەڕس بووم لێی و حەزم دەکرد زوو بڕوات و کاتم نەگرێت، فریشتەکان ئەوەی لە ناو کرۆکی و دەروونمدا دەگوزەرا ئەوەیان لەسەر من دەنووسی و، دەیانزانی سیاسەت و بەرژەوەندی و ڕووپامایی هەمووی درۆیە و بە خراپە لەسەریان دەنوسیم.

مـن زۆربەی ژیـانم خەریکـی ئەم جـۆرە نادروسـتەی مـامەڵە کـردن بـووم. کەواتە زۆربەی ژیانم لە خراپەدا بردۆتە سەر، لە هەمان کاتیشدا بێ باوەڕ و مولحید بووم.

لەو جیهـانە خۆشەویسـتی و پەرۆشـی فریشـتەکان هێمنـت دەکـاتەوە، هەسـت بە متمانە و خۆشەویستیەکی بێ سنور دەکەیت.

خۆزگە دەمتوانی خۆشەویستی فریشتەکان بکەمە شتێکی بەرجەستە هەتا ئێـوە لێـی تێ بگەن.

فریشتەکان پێیان وتم: گۆڕینی ڕاستەقینە لە یەك کەسەوە دەست پێ دەکات، بـا ئەو کەسە تۆ بیت.

بە خۆشەویستی ڕاستەقینە دەتوانی دونیای بەرژەوەندی و سیاسەت و فڕت و فێڵـی پاوەن خوازەکان بگۆڕیت.

هواری لە دوای ئەوەی کە لە ئەزمـوونەکە گەڕایەوە، بـوو بە ئیمانـدارێکی بـاش و، ئێستا گەشت دەکات هەتا ئیمان بە خوا و زیندوو بوونەوە بۆ خەڵکی باس بکات.

هوارد لە دوای گەڕانەوەی بۆ دونیا تووشی کێشە و گرفتـی زۆر بـوویەوە، خێـزان و منداڵەکـانی لێـی جیـا بـوونەوە، لەبەر ئەوەی ئەوان بەردەوامـن لەسـەر ئیلحـاد و بـێ بـاوەڕی، تەنـانەت لە زانکـۆش دور خـرایەوە، ئەویـش بە یەکجـاری دەسـتی لە کـار کێشایەوە و درێژەی بە باوەڕداری خۆی دا و، ئێستا هواری بەختەوەرە بە ئیمانەوە.

## یەکەم جار بوو هاوار لە خوای گەورە بکەم

'میکـی ڕۆبنسـۆن' ئەو پیـاوە بـوو فـڕۆکەکەی گـڕی گـرت و کەوتە خـوارەوە و نزیکبوونەوە لە مردنی بینی، ئەم ئەزموونە هۆکاری ئیمان هێنانی بـوو بە خـوا و ڕۆژی دوایی...

یەکەم جار کە پەڕەشوتەکەت دەکرێتەوە، جێگەی سەرسوڕمان و خۆشیەکی زۆرە، هەستێکی خۆش و سەیرت هەیە کاتێك بە ئاسماندا دەفڕیت...

'میکی ڕۆبنسۆن' زۆر کارامە و لێهاتوو بوو لە خۆ فڕێدان لە فڕۆکەوە بە پەڕەشووت، زۆر حەزی لێی بوو.

ڕۆژێکیان لە دوای ئەوەی ئەو فڕۆکەیەی کە پێی دەڕۆشتنە ئاسمان، لە کاتی گەشتەکەیدا و لە بەرزاییەکی زۆرەوە لە کار کەوت!

فڕۆکەکە بە خێرایی (١٠٠) میل لە کاتژمێردا دەڕۆشت و لەگەڵ هاوڕێکەی کەوتنە خوارەوە.

'میکی' دەڵێت: هیچ ئومێدێکمان نەبوو بە ڕزگاربوون، بە چەند چرکەیەکی کەم کەوتینە سەر زەوی، فڕۆکەکەمان خۆی خشاند بە زەوییەکی تەختدا و وەستایەوە، من قاچێکم چوو بوویە دەرەوەی فڕۆکەکە، سەرتاپام گڕی گرتبوو، فریایان دەکەون و هاوڕێیەکی لەناو ئاگرەکە دەری دێنێت، 'میکی' لەناو ئازار و خوێن و سوتان دا هاوار و داوای یارمەتی لە خوای گەورە دەکات و بێ هۆش دەکەوێت.

میکی دەڵێت: بۆ یەکەم جارم بوو هاوار بکەمە خوا و داوای یارمەتی بە دڵ لێ بکەم، لەوەو پێش بە ئیرادە و توانای خۆما دەمنازی و پشتم تەنها بە خۆم دەبەست، لەوەو پێش خوا نەناس بووم. *

وتم: خودایە داوای لێبوردنت لێ دەکەم، یارمەتیم بدە، فرسەتێکی ترم پێ بدە.

لە نەخۆشخانە وتبوویان: فرسەتی ژیانی زۆر کەمە. سوتانی زۆرە و تووشی تەسەممومی خوێن بووە.

میکی دەڵێت: هەستم دەکرد ژیان لە خانە بە خانەی جەستەم دەردەهێنرێت، هەر لەو کاتەدا هەستم بە ئەزموونێکی نەبینراو کرد، لێی حاڵی نەدەبووم، لە کوت و پڕێکدا لە جەستەم چوومە دەرەوە و گەیشتمە جیهانێکی ڕۆحانی. سەیری خۆمم کرد زۆر بێ کەم و کوڕی بوم، دەمتوانی بجوڵێم و بگەڕێم بە ئاسایی. لەسەر ڕێگایەك

بووم دەڕژامە جیهانی سەرەوە بەبێ ویستی خۆم، دەرگـایەکی سـپیم بینـی، هەسـتم بە ئاشتی و ئارامی کرد، خۆشەویستی و هێمنیەکی سەیر بەرەو من دەهـات و ڕووی تـێ دەکردم.

هەستم بە پەستانێك کرد لە لای چەپمەوە، کە هێشتا نەگەیشتبوومە دەرگای ئاشـتی و خۆشەویستی، لای چەپم 'هـاویەیەك' بـوو، ڕەش و ترسـناك و ئـاگراوی "زیـاتر لە ڕەشی ڕەش بوو"، شوێنی هەتا هەتایی خراپان بوو، هەر چەندە زیـاتر سـەیرم دەکـرد، زیاتر لەسەرم توندتر دەبوو.

هەتا ئەوەندە زاڵ بوو دەرگای هێمنی لێ گرتم و کەوتمە ئاگری 'هاویەوە'.

لەوێدا هاوارێکی بێ دەسەڵاتانەم کرد.

وتـم: خودایە لێم خۆش بە، خـودایە مـن دەمەوێـت نەمـرم و لە دونیـا بمێـنم، هەر ئەوەنـدەی ئەو وشـانە لە زارم دەرچـوون، ڕۆحـم بـاڵی گـرتەوە و گەیەنـرامە دەرگـا سپیەکە.

برام بۆ خزمەتی پەروەردگـار و زانـیم کە هەرگیـزا و هەرگیـز نـامرم و ئێـرە شـوێنی نەمریە.

ئەم ئەزمـوونە لە دونیـادا هاوشـێوەی نـیە، گەورەتـرین ئەزمـوونە کە هەنـدێ لە مرۆڤەکـان ئەزمـوونی دەکەن، ئەم ئەزمـوونە لە سـەرووی خەیـاڵ و پەی پـێ بـردن و ئەندێشەوەیە.

خۆشەویسـتی خـوا دەبێـتە هـۆی پـاڵفتە کردنـی مـرۆڤ، کـامڵی دەسـتی مـرۆڤ دەخات، ئەم ئەزموونە زۆر زۆر چێژ بەخشە، من پیرۆزی و بەهای خواییم بینـی بە بـێ سنور. خۆشەویستی خوام پێ بەخشرا بەبێ ئەوەی کەم و سوکبکرێت.

کە دەچیتە خزمەتی پەروەدگار وشەیەکت نیە بـۆ وتـن، پێویسـتە وشـەی نـوێ فێـر ببیت، وشە و ڕستە بەسەر چووەکانی دونیا کەڵکی ئەو شوێنە و ئەومەقامەیان نییە.

ڕێم پێ نەدرا لە جیهانی نەمری بمێنمەوە، ئەوەبوو گەڕێنرامەوە.

میکی کتێبێکی دەربارەی ئەزموونەکەی نووسی بە ناوی 'السقوط الی السماء'.

ئێستا 'میکی' بە وڵاتانی جیهاندا دەگەڕێت و باسی موحیبەتی خوایی دەکات.

## پزیشکێکی ڕووسی و ئەزموونەکەی

'جۆرج ڕوودانا' پزیشکێکی ڕووسیە و پێش ئەزموونەکەی باوەڕی بە خوا نەبووە و بێ باوەڕ بووە، لە دوای ئەزموونەکەی باوەڕ بە خوا و زیندوو بوونەوەی دوای مردن دێنێت. لە دوای ئەزموونەکەش بوو بە پسپۆڕ لە سایکۆلۆژیای ئاینەکان.

دەزگا سیخوڕیەکان و هەواڵگری ڕووسی بە ڕووداوی ئۆتۆمبێل دەیانەوێت لەناوی بەرن و، بە ڕووداوێك سەرەونگومی بکەن و نەگاتە ئەمریکا و هەڵبێت.

لە کاتێکی دیاری کراودا لە شوێنێکی چۆڵ و شەقامێکی نزیك ماڵیان، بە شەقامەکەدا دەڕۆشت ئۆتۆمبێلێکی هەواڵگری بۆ گەڕایەوە.

دڵنیا بوون لە مردنی، چونکە سێ ڕۆژ بوو لە تەرمانە بوو، کاتێ پزیشکی شیکاری ویستی شیکاری بکات گەڕایەوە و ژیانی تێ هاتەوە.

جورج دەڵێت: پزیشکەکان نەیانتوانی ڕزگارم بکەن و مردنیان ڕاگەیاندم و ناردمیان بۆ تەرمانە.

خۆم لە تاریکاییەکی نوتەکدا بینیەوە، هیچ ئازارێکم نەبوو، من زۆر دەترسام، چونکە چاوەڕوانی ئاوا ئەزموونێکم نەدەکرد، دەمزانی بونێکم هەیە، بەڵام نەمدەزانی لە چ شوێنێکم.

لە دواییدا لە خۆم دەپرسی کە بۆچی من لەم تاریکیەدام، دڵنیا بووم لە واقیعێکی تەواو جیاوزدا باڵاترین ژیان بەسەر دەبەم، بیرم لە ئەرێنی بون و نور و ڕووناکی

کردەوە، ڕاستوخۆ خۆم لەناو نورستانێکدا بینیەوە. ئیتر هەستم بە دڵنیایی دەکرد، دەمتوانی گەردیلەکانی پڕۆتۆن و نیوترۆن ببینم کە لە هەموو لایەکەوە دەجووڵان.

یاسایەکی وردی بە ئەندازە هەبوو هەڵی دەسوڕاند، شکڵ و سروشتی ژیانی گەردونم بینی، هیچ ترس و دڵەڕاوکێیەکم بۆ جەستەکەم نەبوو، لە ڕاستیدا پێویستیم بە جەستەم نەمابوو، جەستە هیچ گرنگیەکی نەبوو لە لام، جەستەم وەك ڕێگرێك دەهاتە پێش چاو. وام دەبینی زەمەن نیە، ڕابردوو و ئێستا و داهاتوو لە دەسکەوانێکدا کوترابن بەسەر یەکدا و بووبنە یەك.

کردەوەکانی ژیانی دونیای خۆم پیشان درایەوە، هەموو یاساکانی سروشت تێ گەیشتم، ڕەزامەندیەکی بێ سنورم دەربڕی، ژیانی دونیا هیچ بایەخێکی نیە لە بەرامبەر ئەو نور و ڕوناکیە.

دەمتوانی بچم بۆ هەچ شوێنێك کە ویستی خۆمی لەسەر بوایە، ویستم پەیوەندی بە خەڵکی دونیاوە بکەمەوە بەڵام نەکرا و ڕێم پێ نەدرا، کە شیکاری جەستەم دەستی پێ کرد و، یەکەم دەست داگرتنی پزیشکەکە دەستی پێ کرد من گەڕامەوە ناو جەستەم، زۆر ئازار بەخش بوو، وەك ئەوە بوو کەسێك گەردنم بگرێت و بە هێزێکی زۆرەوە بمخاتەوە ناو جەستەکەم، بەو جۆرە بوو!

جەستەم زۆر سارد بوو، هەڵ دەلەرزیم، بە خێرایی برام بۆ نەخۆشخانە، ماوەیەك لە ژێر ئۆکسجین هێلامیانەوە، لە دواییدا باش بووم و گەڕامەوە ژیانی ئاساییم و دواتر لە ترسی کوشتن هەڵهاتم لە ڕووسیا.

لە کاتی ئەزموونەکەمدا بەڕۆح گەڕامەوە بۆ ماڵی خۆمان، بینیم هاوژینەکەم لە خەم و پەژارەیەکی قوڵدایە، مناڵەکانم هێشتا مناڵ بوون، ئاوەزی ئەوەیان نەبوو کە باوکیان بە ڕووداوی ئۆتۆمبێل مردووە...

سەردانی دراوسێکانیشم کرد خەمباری مردنی من بوون، یەکێك لە دراوسێکانم پێش مردنی من تازە مناڵێکیان بووبوو، بینیم مناڵەکەیان ئازاری هەیە و زۆر دەگریە. کە بردیان بۆ پزیشکی مناڵان وتی: ئەوە ئازاری سك ئێشیە و هیچ تر... قەترەی بۆ

نووسی، بەڵام من ئاگام لێ بوو منداڵەکەیان هەندێ جار دەخەوت و هەندێ جاریش بە ئازارەوە هەڵدەستا و بە توندی دەگریا.

من ئەوەم هەست پێ کرد، کە بە ڕۆح دەتوانم پەیوەندی بەو منداڵە بچووکەوە بکەم و بیدوێنم، ئیتر ئەوە بوو زانیم کە منداڵەکە لە کاتی لە دایک بوونی دەستی شکاوە و پێیان نەزانیوە، دەشمزانی کێشەی شکانەکە لە کوێدا بوو!

بەڵام کە من ڕۆح بووم نەم دەتوانی ئەو هەواڵە بگەیەنم بە دایک و باوکی و منداڵەکەش زمانێکی نەبوو پێیان بڵێت.

هەتا من گەڕامەوە ناو جەستەکەم و لە نەخۆشخانە دەرچووم هەواڵم دا بە دایک و باوکی منداڵەکە کە منداڵەکەیان چ کێشەیەکی هەیە، هەر چەندە زۆری بەسەردا تێپەڕیبوو کە تیشکیان بۆ گرت هەمان شکان لە هەمان شوێن بوو کە من پێم وتن. چارەسەریان کرد و چاك بوویەوە.

لەبەر ئەوەی من سێ ڕۆژ لە تەرمانە مابوومەوە زۆرم پێ چوو هەتا بە تەواوی چاك بوومەوە.

کاریگەریەکانی ئەم ئەزموونە وای لێ کردم کە بچم دکتۆرایەکی تر بخوێنم لە زانکۆی 'جۆرجیا' دەربارەی ئاینەکان و 'علم النفس'.

من ئێستا بەختەوەرم بەوەی باوەڕدارم بە خوا لە دوای ئەوەی کە بێ باوەڕ بووم، من بە پێچەوانەی ئەوانەی کە ئەزموونەکەیان بینیوە وا دەزانن ئەو نورەی کە بینیویانە خوای گەورە بووە، نا خوای گەورە زۆر زۆر گەورەترە لەوەی بە ئیدراکی ئێمە ببینرێت، خوای گەورە جوانی گەردوون و دروستکراوەکانی خۆی پیشان دام.

ئەوانەی ئەزموونەکەیان بینیوە دڵنیان کە دروست بوونی دونیا و ژیانی دونیایەك ئامانجی لە پشتە، ناسینی خوا و خۆشەویستی خودایە. ئەوەی ئەم ئەزموونە دەبینێت ناگات بە تەواوی حەقیقەت و نهێنیەکانی دوای مردن و بەرزەخ، هەتا نەمرین ناگەینە ئەو حەقیقەتە بێ سنوورە.

# نۆ خولەکی ئێرەی خایەند، بەڵام زۆری بەرزەخ بوو

•〉〉〉 ↑ 〈〈〈•

'کلاودیە' کە ژنێکی بێ باوەڕ بوو، بەهۆی نزیکبوونەوەی لە مردن باوەڕبون بە خـوا و ڕۆژی دوایی دێنێت، نۆ خولەك لە بەرزەخ بوو.

* کە چاوی کردەوە گەیشـت بە دەسـەڵاتی پەروەردگارێـك کە بەداخەوە لە هەمـوو ژیـانی دونیـادا دژایەتـی ئەو پەروەردگـارەی کـردوە، 'کـلاودیە' دەڵێـت: لە سـەردەمی منداڵیمـدا لە خێزانێکـدا گەورە بـووم، بێـزم لە ڕەفتـار و ئاکـاری خراپیـان دەکـردەوە، قەناعەتم وابوو کە خوایەك هەیە بەڵام خۆشی نـاوێم، چـونکە ڕزگـاری نەدەکـردم لەو تەنگژانەی لە ژیانمدا بەسەرم دەهاتن.

قەناعەتی دووەمم ئەوە بوو کە خودا بوونی نیە.

گەنجێتـیم پـڕی بـوو لە مەی خـواردنەوە و مـاددە هۆشـبەرەکان. سـاڵی (٢٠٠٩) پشکنینێکی ڕۆتینیان بۆ کردم، پەنکریاسم کێشەیەکی هەبوو، حاڵم باش نەبـوو، پـلەی گەرمیم بەرز بوویەوە.

لە لای خوارەوەی چرپاکەم دایکم دانیشتبوو، هەواڵم پێ دا خۆشـم دەوێـت، ئیـتر ئاگـام لە خـۆم نەمـا، دایکـم قیژانـدبووی و پەرسـتیارەکە هـاتبوو، سـەیری کردبـوو تەندروستیم خراپ بوو بوو، ئیتر دایکمی کردبووە دەرەوە، پزیشـکەکە وتبـوی دڵـی لە لێدان وەستاوە.

بۆ ماوەی نۆ خولەك لە کار وەستا بوو!

یەکەم شت هەستم پێ کرد ئەوە بوو کە ئەوە من خـۆمم و هەسـتم بە خـۆم کـرد لە دەرەوەی جەستەم.

زانیم كه ژیانی دونیام بەجێ هێڵاوە، ئەوەشم زانی كه مـن خـوای گەورە دروسـتی كردووم و له زۆر زووەوە هەم!

له نیوەی تونێلەكەدا بووم نورەكه لێم نزیك بوویەوە.

تەنها نور و ڕووناكیم بینی، بەڵام هەستێكی پـڕم هەبـوو له جـوانی و كەمـاڵ و بـێ كۆتایی، هەرگیز تێر نابیت لەو نور و ڕوناكیە.

هەموو لاكانم نور بوو، ویسـتم پرسـیار له خـوای گەورە بـكەم كه بـۆچی خۆشـی نەویستوم، بۆچی ئەو هەمووە كارەسـاتەم له ژیانـدا بەسـەر هـاتووە، دەسـتەكانم بەرز كردەوە و وتەیەكی نرم له خزمەت خوایا وت، وتـم: خودایه بۆچی من كـارم به ڕێـگەی تۆ نەكرد، بۆچی هەوڵم نەدا له خزمەتی تۆدا بم؟!

لەوێ خوای گەورەم زۆر به باشی ناسی، ناسینێك پڕ بوو له خۆشەویسـتی، مـن له دونیادا خوا پەرست نەبووم، بەڵام لەوێ كەوتم به سوژدەدا و پەرستم.

له ڕەهبەتێكـی گەورەدا ژیـام، جەمـال و جەلالـی حەق تعـالا هەمـوو شـتێكی گرتبوویەوە.

وتـم: خودایه من لەمەو دوا بۆ هەتا هەتایه دەتپەرستم.

دابەزیم بۆ تونێلێك كه دەچووە بەهەشـتەوە، له پشـتمەوە كچێكـی منـاڵی لـێ بـوو شەبقەیەكی بەسەرەوە بوو، سـەبەتەیەك سـپی بەدەسـتەوە بـوو، هەرچـی جارێـك پـێ دەكەنی و هەڵبەز و دابەزی دەكرد من زیاتر دەگەشامەوە، خوای گەورە پیشـانی دام كه ئەو كچـۆڵەیە مـن بـووم و له تەمەنـی سـێ سـاڵیدا بـووم، ئیـتر هەمـوو گومانەكـانم دەربارەی بوونی خوا ڕەویەوە و شەرمەزار بووم و ئیمانی تەواوەتـیم پـێ هێنـا، خـوای گەورە ڕێـی پـێ دام له ڕێـی خۆشەویسـتی ئەودا بـژیم، خەریـك بـوو له خۆشـیاندا دەفڕیم.

له تونێلەكەی بەهەشتەوە ڕوانیم، وام دەبینی ئەستێرەكان وەك ئەڵماس بوون.

**ئیتر دوای ئەوە گەڕامەوە ناو جەستەم.**

**خێرا بە دایکمم وت: دایە من لە بەهەشت بووم، لە خزمەت خوای گەورەدا بووم.**

**ئیتر هەموو ژیانم، بیر و باوەڕم، بیر کردنەوەم، پلانی ژیان سازیم هەمووی گۆڕا، ئەو کەسەی لەسەر چرپاکەی نەخۆشخانە نەمرد بە تەواوەتی مرد و نەگەڕایەوە.**

**مرۆڤێك هاتە ژیانەوە خۆشەویستی خوا بوو، ئەو پەیامە گرنگەی لەگەڵ خۆی هێنایەوە کە خۆشەویستی خوا گرنگترین حەقیقەتە و حەقی هەڵبژاردن و ئیختیاریشی پێ داوین.**



# مێشك تەنها وەرگرێکە



دکتۆر 'جۆن' دەگێڕێتەوە و دەڵێت: ژنێك نەشتەرگەریەکی زۆر دەگمەن و قـورس و گرانی بۆ کرا، ژنەکە گەنج بوو، هەرگیز چاوەڕوان نەدەکـرا لە ڕووی زانسـتیەوە ئەم ژنە ئەزمـوونی نزیکبـوونەوە لە مـردن ببینێـت. "کە دەڵێـین لە ڕووی زانسـتیەوە، چـونکە زۆرێك لە زاناکان باوەڕیان بە ڕۆح و کاریگەریە غەیبیەکان نیە و ئەم دیاردەیە بە کەمـی ئۆکسجینی مێشك و خەون و وڕێنە دەدەنە قەڵەم".

نەشتەرگەریەکی مەترسی داری مێشکیان بۆ ئەنجام دا، کە هەلـی کۆتـایی بـوو بـۆ ژیان و مانەوەی.

بـۆ ئەم نەشـتەرگەرییە دەبـوو جـوڵەی مێشـکی بـۆ زیـاتر لە کاژێرێـك بە تەواوی ڕابگـرن، پـلەی گەرمـی مێشـك دابەزێنـنە پـانزە پـلە، لەو پلەیەشـدا مێشـك هـیچ گۆڕانکـاریەکی کیمیـایی ئەنجـام نـادات، ئینجـا پێـوانەی تخطیطـی مێشـکی نەخۆشەکەیان دەکرد و ئیمکانیەتی بیستن بە هیچ جۆرێك نەبـوو، هـیچ گریمانەیەکـی ئەوە نەبوو کە مێشك و توانای ئیدراك و هەست پێ کردنی بە هیچ جۆرێك هەبێت.

بینین و وڕێنە کـردن و خەیـاڵ کـردن و خەو بینـین و بیسـتن بە هـیچ جۆرێـك لەم کاتەدا ڕوونادات لە ڕووی زانستی پزیشکیەوە!

لەگەڵ هەمـوو ئەمانەشـدا 'بـامێلا گینێونـت' تـوانی لە دوای هەسـتانەوە و هـۆش هـاتنەوەی، بە جـوانی و وردی هەمـوو ئەو کـارانەی وەسـف کـرد کە پزیشـکە نەشتەرگەریەکە ئەنجامی دابـوو، هەروەهـا هەرچـی وت و وێـژ و ڕاوێژێـك لە نێـوان پزیشکەکان و پزیشکی دڵدا ڕووی دابوو لەو کاژێرەی کە بە تەواوی خـامۆش کرابـوو هەمووی بە وردی گێـڕایەوە. باسـی ئەو ئامێرانەشـی کـرد کە بەکاریـان هێنـا بـوو بـۆ نەشـتەرگەریەکەی ئەو، خـودی نەخۆشـەکە لە دەرەوەی جەسـتەی بیـنەر و بیسـەرێك بووە بە تەواوی تێگەیشتن و وەعی و هەست و ئیدراکیەوە.

ئیتر ئەم 'وەك دكتۆر جۆن' دەڵێت: بەڵگەی گومـان بـڕە لەسـەر ئەوەی ژیـان دوای مردنی جەستە بەردەوامە. کەواتە هۆشی و ئاگـایی لە دەرەوەی جەسـتەیە و پەیوەسـت بوونی بە جەستەوە کاتیە.

بە دڵنیایەوە دەرکەوت مێشکی مرۆڤ تەنها وەرگرێکە.

## ئەزموونەکەم خۆشەویستی بێ مەرج بوو



'مـارلین' منالێـك بـوو، لە جەسـتەی خـۆی چـوویە دەرەوە، ڕاسـتیەك بە تونـدی بەرپەرچی بێ باوەڕی دەداتەوە.

'مارلین' ئێستا ئافرەتێکە دەڵێـت: ئەوەی ئـازارم دەدات ئەوەیە خەڵکـی بـاوەڕم پـێ ناکەن و ناتوانن ئەوە بسەلمێنن کە من لە نزیکی مردندا پێی گەیشتم.

سی ساڵ لەمەو پێش ئەزموونەکەم بینیوە، کـاریگەریە زۆرەکەی بە تەواوی لەسـەرم ماوە و کەمی نەکردوە، من تەنگە نەفەسی و ڕەبووم هەبوو لە تەمەنی دە ساڵیدا تەنگـی پێ هەڵچنیم، شەوێکی ئەو ساڵە سـەختە بـوو ئەزمـوونەکەم کـرد، کە سـاڵی (١٩٨٦) بوو، خەریك بوو دەخنکام، دایکم و باوکم زۆر بە پەلە منیان برد بـۆ نەخۆشـخانە و لە 'ICU' داخلێـان کـردم، پزیشـکەکان زۆر هەوڵیـان دا، بەڵام نەوبەی ڕەبـوەکەم زۆر ترسناك و مرێنەر بـوو، لە نێـوانی دوو دەسـتەی پزیشـکەکاندا لە دەسـت دەرچـووم و لەناکاو دڵم لە کار کەوت، ڕاستەوخۆ دوای ئەوە هەسـتم کـرد لە جەسـتەم دەردەچـم، دەمبینی ئەو کچە بچووکەی کە ڕاکشاوە چی بەسەر دێت، من لە دوو شـوێندا بـووم لە یەك کاتدا.

دورکەوتمەوە لە دیمەنەکە و بەرز بوومەوە، تونەیلەکەم بینـی و ڕۆشـتمە نـاو نـور و ڕوناکیەکی زۆر سەرسامکەرەوە، هەتا گەیشتمە شوێنێك کە پێ دەوترێت بەهەشت.

# پیاوێك لە ساڵی (١٩٩٧) ئەم ئەزموونە گرنگە دەبینێت

ئەم پیاوە بیست ساڵ پێش ئێستا بە ڕووداوی سەیارە نیوەی خێزانەکەی لە دەست دا، دوای ئەزموونی نزیکبوونەوە لە مردن ژیانی بە تەواوی گۆڕا.

خۆی و خێزانی و دوو کوڕی سەفەریان کرد بۆ 'یوطا' وەنەوزێك بردیەوە لە شەقامە گشتیەکە ترازا و دەست بەجێ وەرگەڕا و ژنەکەی کە تەمەنی (٣١) ساڵان بوو لەگەڵ کوڕە بچووکەکەی کە ساڵێك و چوار مانگ بوو دەست بەجێ گیانیان سپارد، بەڵام کوڕە حەوت ساڵانەکەی بە شێوەیەکی سەیر ڕزگاری بوو.

ئەم پیاوە دەڵێت: بۆ چرکەیەك بە ئاگا هاتمەوە، هەستم بە ئازارێکی زۆر کرد، کوڕە گەورەکەشم لە دواوە بوو دەگریا، ئیتر دوای ئەوە هەموو شت لە پێش چاوانم ڕەش داهات.

دوای ئەوە هێمنی و ئارامیەکی سەیر ڕووی تێ کردم، ئازار نەما...

خۆم لە ئۆتۆمبێلەکەماندا بینیەوە بەرەو سەرەوە دەفڕیم، هەستم کرد کەسێکی تر وەك من نزیك بوو، دەبینم خێزانەکەمە، هەردوکمان هەستمان بە ئارامی و ئاشتیەکی گەورەی دەروونی دەکرد، سەغڵەتی ئەوە نەبووین کە ڕووی داوە، بەڵام لەوێدا زانیم کە خێزانەکەم تەواو بووە و مردووە و دەستی لە دونیا پچڕاوە!!

بەڵام بە جۆرێك بینیم و هاتە پێشەوە، کە گەیشتمە ئەو حەقیقەتەی ئەو هیچ خەم و ئازار و مەینەتیەکی نەماوە و سەرفراز بووە. هەستم بە صەفا و پاکێتیەکی بێ سنور دەکرد، وتم: باشە ئێمە لە ڕێگەی گەیشتنین بە بەهەشت؟!

لەناکاو خێزانەکەم لای کردەوە بە لای مندا و زۆر بە ڕاشکاوی پێی وتم: ناکرێت تۆ لێرە بمێنیتەوە، کاتی تۆ نەهاتووە، دەبێت تۆ بگەڕێیتەوە، کوڕەکەمان لە

سەیارەکەدایە و لە ژیاندایە، منیش لەوێدا بیری هاوار و گریانی کـوڕەکەمم کەوتەوە، لە خێزانەکەم نزیك بوومەوە و پێم وت: خوات لەگەڵ، زانیم کە ئەو ناگەڕێتەوە بـۆ دونیـا و دەگاتە بەرزەخ.

ئیـتر بەرەو سـەرەوە و سـەرووی ئاسـمانەکان سـەریان خسـت، منـیش لێـی دور کەوتمەوە و خـۆم لە نەخۆشـخانە بینـیەوە، پـێش ئەوەی بچـمەوە نـاو جەسـتەکەم، بە ئازادی دەسووڕامەوە لە هۆڵەکانی نەخۆشخانە و چاودێری خەڵکـیم دەکـرد، شـێوازی ژیان کردنی خەڵکیم بینی، خۆشەویستیەکی زۆرم هەبوو بۆ یەك بە یەکیـان، لە دوایـدا ڕۆشتمە ژوورێکەوە دەبینم جەستەیەکی تیـایە، هەسـتم بە هـیچ پەیوەنـدیەك نەدەکـرد لەگەڵ ئەو جەسـتەیەدا، جەسـتەکە لە حـاڵێکی زۆر خراپـدا بـوو، پزیشـکەکان بە دڵسۆزیەوە سەرقاڵی هێنانەوەی بوون.

سکی دڕابوو،قاچەکانی شکا بوون، شان و قۆڵی شکا بوو،

وتم: باشە ئەوە منم؟!

بە دەم و چاویدا خۆم ناسیەوە، هەستم بە ترس دەکرد، نەمدەویست بگەڕێـمەوە بـۆ ئەو جەستەیە، بەڵام بیرم لە قسەی ژنەکەشم دەکـردەوە کە وتـی ئاگـاداری کوڕەکەمـان بە.

نەمتوانی دەست بەرداری جەستەم بیم!!

خـرێنرامەوە نـاو جْەسـتەکەم و ئـازار و واوەیـلا دەسـتی پـێ کـردەوە، هەسـتم بە تاوانباری خۆم دەکرد، چونکە منـاڵێکم و ژنەکەم بەو ڕووداوە مـردن، بە خـۆمم دەوت هۆکار و کەمتەرخەم من بووم!!

دوای چەند مانگێك چاك بوومەوە، شـەوێکیان لە مـاڵەوە خەوتبـووم، لە خەونمـدا خـۆم بینـیەوە لە مێـرگ و بـاخچەیەکی گەورەدا، هەمـان دڵخۆشـیم بـۆ هـاتەوە کە لە ئەزموونەکەمدا بینیم، هەستم بە بارسوکی و لەش سوکی دەکرد، هەستم کرد تونەیلێـك لە لای چەپمەوە بوو، چوومە نـاویەوە، ڕۆشـتم هەتـا کۆتـاییەکەی کـوڕە بچـووکەکەم

بینیەوە، خەوتبوو لە جێگەی خەودا، چاوم پڕ بوو لە فرمێسك، باوەشم پیا كرد و نوساندم بە خۆمەوە، هەستم بە هەناسەكانی دەكرد، ئیتر دڵتەنگی جارانم نەما.

## ئەزموونداران



یەكێك لە كارمەندانی 'ICU' بیست و یەك ساڵ لەو بەشەی نەخۆشخانە كاری كردووە، حاڵەتی زۆری نزیكبوونەوە لە مردنی بینیوە، ئەوە بوو بڕیاری دا لێكۆڵینەوە لەو ئەزموونانە بكات كە لە بەشەكەی ئەو ڕوودەدەن.

دەڵێت: لە سەرەتادا وام دەزانی هۆكاری ئەم حاڵەتە وڕێنەیە!

ڕۆژێكیان ژنێكی (٥٩) ساڵان هێنرایە بەشەكەمانەوە، تەنگە نەفەسیەكی سەختی هەبوو، ئەوە بوو بێ هۆش كەوت و لە پاشان كە هۆشی هاتەوە ئەزموونەكەی بینی بوو.

ئەو ژنە وتی: من خۆم لە سەرەوە بینیەوە، كە بڕام بۆ هۆڵی نەشتەرگەری، لە هۆڵەكە دۆلابێكی بەرزی لێ بوو، لەسەر دۆلابەكە تەڵەیەكی مشكی لێ بوو، كە ڕۆشتین و سەیرمان كرد بە هەمان جۆر بوو كە ژنەكە وتی.

باسی ئەو كەسەیشی بۆ كردین كە لەو دونیا بینیویەتی.

من لە ماوەی كاركردنم كە (١٥) ساڵە لەم بابەتە گرنگەدا و لێكۆڵینەوەی زۆرم كردووە، گەیشتوومەتە ئەو دەرئەنجامەی كە ئەزموونی نزیكبوونەوە لە مردن، ئەزموونێكی ڕاستەقینەی ڕۆحیە و پەیوەندی بە مادده و مێشك و جەستەی مرۆڤەوە نیە.

کاریگەری قوڵ لەسەر مرۆڤەکان جێ دێڵێت، شێوازی ژیـان کردنیـان دەگۆڕێـت، کەمتر لە خەڵکانی تـر مـادی دەبـن، هەموویـان دڵنیـان و دەزانـن کە مردنـی جەسـتە کۆتایی ڕێگا نیە.

* پۆلیسێك دوای ئەوەی ئەم ئەزموونەی بینی، ئەوەندە کـاریگەری لەسـەر دانـابوو، وازی لە کارەکەی هێنا و بوویە خێرخواز لە کاری خێر خوازیدا.

ئەو کەسـانەی ئەم ئەزمـوونە دەبیـنن هەرگیـز وەك ڕابردوویـان نـابن، مـرۆڤ هەتـا نەمرێت نازانێت جیهانی نادیار و بەرزەخ چەندە گەورە و بێ کۆتایی و پڕ لە جوانیە.

## مردوویەك پێنج جار هاواری بۆ هاوڕێکەی برد



هەتـا ئێسـتاش ئەو خەونە کـاریگەری لەسـەرم هەیە، هـاوڕێیەکم هەبـوو، زۆر یەکترمان خۆش دەویست، کۆچی دوایی کرد، لە دوای مردنی، پێنج جار خەونـم پێـوە بینیوە، خەوەکەش یەك شێوەیە، بە حاڵێکی خراپەوە دەمبینی.

لە خەودا بینیم لە خـانوویەکی دوو نهـۆم دا بـووم، دابەزیـم بـۆ نهـۆمی خـوارەوە، گەیشتمە دەرگایەك، لە دەرگاکە چـوومە ژورەوە. هـاوڕێکەم کە مـردووە بینـیم لەسـەر کورسیەك دانرابوو، بە شێوەیەکی ترسـناك بینـیم، دەسـت و قـاچ و هەمـوو جەسـتەی شەتەك درابوو، وەختێ منی بینی، هاواری بۆ هێنام و وتی: فڵان کەس "ناوی هێنـام" فریام بکەوە!

وتم: فڵان کەس ئەوە چیتە و، چی دەڵێیت؟!

بە هەموو هێزی، بە ماندوێتی و بێ ئومێدیەوە وتی: من ماندووم.

بە دەم سزا و ئازارەوە دەیوتەوە: من ماندووم.



وتم: بۆچی ماندوویت؟

وتی: نوێژەکانم، نوێژەکانم تەواو نین و ناتەواون.

وتی: خەبەرم بوویەوە بانگی بەیانی بوو، بە ترس و لەرزەوە هەستام بۆ نوێژی بەیانی.

خەوم لێ نەکەوتەوە، هەموو مووەکانی جەستەم ڕاست بوونەوە، نوێژەکەم بە ترس و لەرزێکەوە تەواو کرد.

ئەو کەسە هاوڕێم بوو، سازدە نوێژ بوو، زۆر چاك بوو لەگەڵ دایك و باوکی، دوو منالی بێ باوکی بەخێو دەکرد، ڕەوشت و ئاکاری زۆر بەرز بوو، بەڵام گرنگی بە نوێژەکانی نەدەدا.

جارێکی تر بینیمەوە لە خەودا، دەبینم سەری داخستبوو، پێم وت: فلان کەس سەرت بەرز بکەرەوە، زۆر زۆر دەگریا، دەیوت من ماندووم...

* هەڵەی منیشی تیا بوو، چونکە ڕاشکاوانە پێم نەدەوت، ئەو لە من گەورەتر بوو، زۆر ڕێزم لێ دەگرت...

دەبوو پێم بوتایە لە دوای شایەتومان نوێژ دێت.

* ئەم ڕووداوەم بڵاو کردەوە، هەزاران کەس دوعای خێریان بۆ دەکرد، هەتا بەڵکو خوای گەورە لێی خۆش بێت، دوای ماوەیەك خەوێکی سەیر و دڵخۆشکەرم پێوە بینی.

هەستم دەکرد خوای گەورە دوعا و پاڕانەوەکانی وەرگرتبێت و لێی خۆش بووبێت، دوای ماوەیەك لە خەونمدا بینیم کە لە شوێنێکی تاریك و، لە بیابانێکدا بووم، باڵەخانەیەکی چەند نهۆمی لێ بوو، چوومە ژوورەوە، سەرکەوتم بۆ نهۆمەکانی سەرەوە، پرسیارم لە زیندانی کراوێك کرد، هەتا گەیشتمە کۆتا نهۆم، لە دەرگاکەیم دا و لێم کرایەوە.

پیاوێکی گەنم ڕەنگی تێك سمڕاوی گەورەم بینی، لە ترساندا زۆر نەمدەوێرا سەیری بکەم، لێم پرسی کەسێك هەیە بەم ناوەوە لێرە، لێرە زیندانی بێت لە لاتان، تەنها بە دوو وشە وەڵامی دامەوە و وتی: ئازادکرا و ڕزگاری بوو.

## جیهانی خوارووم بینی



پیاوێك لە ساڵی (١٩٩٩) ئەزموونی نزیکبوونەوە لە مردنی بینی، خۆی دەیگێڕێتەوە دەڵێت: دڵم بە باشی کاری نەدەکرد، نەشتەرگەریەکی قورسی دەویست، ئەوە بوو نەشتەرگەریەکەم ئەنجام دا و دە کاژێر لە ژێر بێهۆشکردن و نەشتەرگەیدا مامەوە، خوێنبەربوونێکی ناوەکیم هەبوو، دڵم وەستا و، نیشانەکانی زیندوێتیم لە دەست دا و، لە دوای ئەوە ئەزموونەکەم بینی. خۆم لە دەرەوەی جەستەم بینیەوە، هەموو ستافی چارەسەری پزیشکیم بینی، من لە سەرەوەی هۆڵەکە دەمبینین، دەشمزانی بیر لە چی دەکەنەوە، ئەوەشم زانی کە مردووم، نەخۆشەکانی تریشم دەبینی، ئاگام لێ بوو نەخۆشێك لەگەڵ پەرستارەکە دەدوا و پێی دەوت: پزیشکەکە بڕیاری وابوو لە خوار ئەژنۆم ببڕێتەوە، کەچی لە سەرووی ئەژنۆی بڕیومەتەوە، لە دوای ئەزموونەکەم کە گەڕامەوە ئەو ڕووداوەم بە پەرستارەکە وت، ئەویش زۆر سەری سوڕما و ڕاستی وتەکانی منی سەلماند.

تونەیل و نور و، ڕوناکیم بینی، وام هەست کرد کە چوومەتە ناو دڵی گەردوونەوە.

هەستم بە خۆشەویستیەکی بێ سنور کرد، وەك ئەوە بوو سەد هەزار دایك لە یەك کاتدا پێت بڵێن 'خۆشمان دەوێت' جیهانێکە ستایش و پستایش و پێناسە و باس

کردن پێی ناگات، هەستم بەوە دەکرد کە گەڕاومەتەوە ماڵی خۆم، ئەی هاوار لە زۆر زووەوە من عەوداڵی ماڵی ڕاستقینەی خۆمم.

لەناکاو کەسێك پێی وتم: تۆ نەمردوویت.

ئێستا ژیانی ڕابردووی سەر زەویت پیشان دەدەینەوە، هەموو کردەوەکانی ژیانی خۆمم پیشان درایەوە.

منیان برد بۆ شوێنێکی تر، چەندین نورانی جوانم بینی، سروشت و دیمەنی زۆر زۆر سەر سوڕهێن، ئەوەندە ڕەنگی جیاواز جیاوازم بینی کە هەرگیز لەسەر زەوی نەمبینون، قاچ و جەستەی ئەرزی خۆمم لەوێ بینی بۆ یەکەم جار، کە بەناو گژوگیا و گولزارێکی زۆر جواندا دەڕۆشتم، دارستانی چڕ لە هەموو لاکانمەوە هەبوون، گەیشتم بە سێ بوونەوەری نورانی کە لە شێوەی مرۆڤدا بوون، ناسیمنەوە، کە دەبینم یەکێکیان هاوڕێیەکی نزیکی خۆم بوو، پێش سی ساڵ دەبوو کۆچی دوایی کردبوو، بەخێرهاتنی کردم و پێی وتم: هێشتا تۆ نەمردوویت و تۆ تەنها بۆ ئەوە هێنراویت هەتا نموونەیەکی بچووکی جیهانی کۆتایی بەریتەوە بۆ دونیا و بۆ خەڵکی بگێڕیتەوە.

لە دوایدا لەگەڵ ئەو هاوڕێیەم و دوانەکەی تر ڕۆیشتین بۆ شوێنێکی تر، زۆر بە خێرایی لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر دەچووین، وەکو پەنجەرەیەك بە ڕووماندا دەکرایەوە زۆر بە خێرایی، شتانێکی زۆر زۆرم بینی کە مانایان نازانم، ناشزانم چۆن باسیان بکەم، ناشزانم ناوەڕۆکیان چی بوو!!

یەکێك لەو شوێنە سەیرانەی کە بینیم، زەوی سوفلا بوو، دابەزین بوو بۆ خوارەوە، نموونە و دیمەنی زۆر خراپم بینی، ڕووناکی لەوێ بوونی نەبوو، زۆر زۆر تاریك و نوتەك بوو، بە هیچ جۆرێك ئاسایش و ئارامی تیا نەبوو، لوتکەی مەترسی و ناخۆشی بوو، هەستت بە ڕق و تووڕەیی و خەمۆکیەکی ترسناك دەکرد، گوێم لە هات و هاوار و پاڕانەوەی خەڵکی بوو، شوێنێکم بینی، شوێنی دور خستنەوە بوو، تاریکییەکەی دەیجور و پڕوکێنەر بوو، خەڵکێکی زۆرم لەو تاریکیەدا بینی، لەوێدا زیندانی

کرابوون، هەچ یەکێکیان لە زیندانی تاکە کەسی خۆیدا بوو، سزا و ئازاریان زۆر و جیاواز بوو، هاواریان دەگەیشتە کەشکەلانی ئاسمان، کە سەیرم دەکردن، شێوەی دەم و چاویان هەرچی شتێك لە دەوریان بوو بە بەردەوامی دەگۆڕا بۆ سزایەکی تر و شێوەیەکی ترسناکتر، هەستم بە دڵ تێکهەڵاتن و بێزار بوون دەکرد، داوام کرد کە ئەو شوێنە بەجێ بهێڵین، چونکە لە توانامدا نەما و، نەمدەتوانی بەرگەی ئەو هەموو ترسە بگرم.

سەرکەوتینەوە بۆ سەرەوە، نورێکی زۆر گەورەمان بینی، ئامۆزایەکم بینی کە کۆچی دوایی کردووە، خەڵکانێکی ترم بینی هەموویان دڵیان خۆش بوو، یاریان دەکرد، لەوێدا هاوڕێکەم پێی وتم دەبێت بگەڕێیتەوە، ئیتر گەڕێنرامەوە بۆ دونیا.

## ئەم ئەزموونەی خەڵاتی خوایە



شەوێکی سارد و کپ و بێ دەنگ بوو، کاتژمێر دەی شەو بوو، ڕووە و چیاکانی 'ئەروکی ماتس' تەنها بووم و سەیارەکەم لێ دەخوڕی، تەمەنم سی ساڵ بوو، زۆر خێرا لێم دەخوڕی، لە پێچێکدا ئاژەڵێکی کێوی وەستا بوو، زۆر کوت و پڕ بوو کە بینیم، ئەو ماوەیە هی ئەوە نەبوو کە خۆمی لێ لا بدەم، هەر ئەوەندەی لامدا، لە هێڵە گشتیەکەی شەقامەکە ترازام و دەرچووم و خۆم بۆ نەگیرایەوە، شاحینەیەکی گەورە ڕووبەڕووم دەهات، بەیەکماندا دا، لە بەشێکی زۆر کەمی چرکەیەکدا ڕووی دا، ساتی لێدانەکەشم بیر نیە، هەستم بە سەرما و ئازار دەکرد، بەڵام ئەو هەستە زۆر کەم خایەن بوو، دوای ئەوە نەما و تەواو بوو.

کەوتمە ناو خۆشیەکی زۆرەوە، من لە منالیمەوە لەسەر ئیمان بە خوا و بەهەشت و دوا ڕۆژ پەروەردە بوو بووم، وتم: ئەگەر ئەم خۆشی و دڵنیایی و بار سوکیەم هەبێت و

لێم وەرنەگرنەوە زیاترێکم ناوێت، چونکە زۆر دڵ ئارام بووم و پێـی ڕازی بـووم. وەك ئەوە بوو کە خەوێکی قوڵ بمگرێت و لە دوای ئەوە چـاو بـکەمەوە بەو جـۆرە بـوو، لە زەویەکەدا ڕاکشا بووم، بەردی زۆری لێ بوو، نور و ڕوناکیەکی بـێ ئـازاری لـێ بـوو، زۆر ڕۆشن و جوان بوو، سەیری لای چەپم کـرد تـاریکیەکی ترسـناك بـوو، نەمتـوانی هیچ ببینم، هەستامەوە و کۆمەڵێك سەرتاپا سپی نـورانیم بینـی، کە سـیانم نەدەناسـی، پێنج سەرتاپا سپی بوون، نەم دەناسین بەڵام زۆر پەیوەستیان بـووم، پەیوەسـتی بـۆیەك گونجـان بەڵام بە مانـا دوونیـاییەکەی نـا، بەڵکـو دڵئـارام بـووم بە بـوون و نزیکیـان، یەکپارچە خۆشەویستی و ڕووناکی بـوون، لە چـوار دەورم بـوون و یارمەتیـان دەدام، هەستێك بوو کە لە ژیانمدا نەمبینیوە، لە هەموو شتێك تێ دەگەیشتم.

یەکێك لە نورانیەکان پێی وتم: دەتەوێـت بگەڕێـتەوە بـۆ دونیـا ئەوە دەگەڕێـتەوە، منـیش بیـرم لە منداڵەکـانم کـردەوە و حەزم لە بینینەوەیـان بـوو، ئەو نـورانیە لە بیـر کردنەوەکەم حاڵی بوو، دوای ئەوە ڕاستەخۆ گەڕێـنرامەوە نـاو جەسـتەکەم، بە ئـازار و سەرماوە چاوم کردەوە، کە خەڵکی دەورەیان دابووم و لەو شەوە سـاردەدا لە سـەیارەکە دەریان دەهێنام.

ئەو ئەزموونە خەڵاتی خوا بوو بۆ من، چونکە هەموو ژیانی گۆڕیم.

•



# هەرگیز لە ژیانی دونیادا ئەو جۆرە خۆشەویستیەم نەبینیوە

دایکم باسی خۆ کوژی دەکرد و منیش بیرم لێ دەکردەوە، لەبەر بـار گرانـی ژیـان و ئاشـوبێك هەر بە منـاڵی ئـازارم بە دەسـتەوە دەچەشـت، لە تەمەنـی هەشـت سـاڵاندا بڕیاری خۆ کوژیم دا، سەرکەوتوو نەبووم، دووەم جاریش بە هەمان شێوە بوو.

گەورە بووم لەناو کێشە گەورەکانی ژیاندا، وازم لە مێردەکەم هێنا، دەسـتم دایە مەی و بێهۆشکەر، ئومێدم بە ژیان نەما، بێ چارە بووم، زانیم مناڵەکانم بە نەمانی من باشـتر دەبن، سەرەتانی مەمکیشم هەبوو، ئیتر بڕیارم دا کە کۆتایم بێت، حەبێکی زۆرم خوارد و بـێ هـۆش کەوتـم، لە شـوێنێکی زۆر تاریـك خـۆم بینـیەوە، لەوێ پێیـان وتـم: بە بەردەوامـی هەسـت بە موعانـات و ئـازاری ئەوانە دەکەیـت کە خەم و خەفەتیـان بـۆ لەدەست دانی تۆ خواردووە.

بەڵام کارێکت لە دونیادا ماوە ئەنجامی بدەیت، لەبەر ئەوە دەگەڕێیتەوە بـۆ دونیـا و هەڵەکانت ڕاست بکەرەوە.

هەستم بە خۆشەویستیەك کرد کە لە ژیاندا نەمبینیوە.

پێیان وتم: تۆ پێش ئەوەی بێیتە دونیا پەیمانت داوە بە خوای گەورە کە کارێـك هەیە بیکەیت، هێشتا ئەنجامت نەداوە، فرسەت ماوە کاتەکانت لە دەست مەدە.

دەستم بە قاچەکانی ئەو نورانیەوە گرت هەتا تکام بۆ بکات نەگەڕێـمەوە بـۆ دونیـا، بەڵام ئەو پێـی وتـم: نابێـت. بەڵام ئەم سـەردانەت لەبیـر بێـت و بـزانە کە زینـدوو بوونەوەی دوای مردنە حەق و ڕاستەقینەیە، وە هەرچی جارێك سەیری ئـاوێنە بکەیـت شتێکت بیر دەکەوێتەوە، ئیتر دوای ئەوە من گەڕێنرامەوە بۆ دونیا.

بە دڵنیایەوە ئەوەی بینیم بەبێ هیچ دوو دڵیەك جیهانی بەرزەخ و قیامەت بوو، سوپاس بۆ خوا لە شێرپەنجەش چاك بوومەوە و ئازاریشم نەما.

ئیتر بەهۆی ئەو ئەزموونەوە دڵنیا بووم کە خۆکوژی 'إنتحار' ڕێگای زیاد کردنی خەم و ئازار و کێشە زۆرەکانە بۆ ڕۆحی مرۆڤ لە دوای مردن و، هەروەها دروست کردنی بێ ئومێدی و ڕەشبینیە یە بۆ خێزانەکەت لە دونیادا.

لە بەرزەخ، کاتێ تۆ خۆت کووشتوە و گەیشتویتە ئەوێ، هەست بە گریان و ئازار و غەمی کەسە نزیکەکانت دەکەیت و ئەو ئازار و غەمەش بەردەوام دەبێت...

زانیم کە هەڵەیەکی گەورەم کردووە، بەڵام نەمزانی بەو جۆرە دەبێتە ئازار بۆ منداڵەکانم و بۆ نزیکەکانم.

من سی ساڵێك لەوەو پێش بە منالی هەوڵی خۆ کوژیم دابوو، ئەگەر ئەو کاتە تیا بچوومایە، ئازارم بەردەوام دەبوو.

خۆکوژی زۆر ترسناك و ئازار بەخش و تاریکە بۆ دواڕۆژی ئەوانەی ئەنجامی دەدەن.

هۆکارێك نیە بۆ ئەوەی مرۆڤ کاری خۆکوژی ئەنجا بدات، ئەوانە هۆکار نین کە مرۆڤ دەیانکاتە بیانوو.

هیچ کەس لە خۆمان رقاوی تر نیە بەرامبەر بە خۆمان.

خوای گەورە وەك خەڵات و پیرۆزیەك ژیانی پێ بەخشیوین، نابێت ژیان بە کەم سەیر بکرێت و، سوکایەتیشی پێ بکرێت، دونیا هۆکاری بردنەوەی خەڵاتە گەورەکەیە.

# ئافرەتێکی نابینا دوارۆژی بینی



مـن تەمەنـم بیسـت و دوو سـاڵانە و نابینـام، لەنـاو تەکسـیەکدا بـووم و تووشـی ڕووداوێك بووم، بەهۆی پێکدادانەوە لە جەستەی خۆم دەرچووم، سەیر ئەوە بـوو مـن خۆمم بینی، بە ڕۆح، جەستە کەوتووەکەی خۆمم بینی، کـاتێ جەسـتەی خـۆمم بینـی ترسام و سەراسیمە، چونکە من بە زکماك نابینا بـووم و هەرگیـز هـیچ شـتێکم نەبینـی بوو، دونیا و مرۆڤ و هیچ شتێکم نەبینی بوو، بەڵام زانیم کە ئەو جەسـتەیە جەسـتەی مـنە، کەوتمە گەڕان و بەرز بـوونەوە، لەسـەر باڵەخـانەیەکی گەورەی ئەو شـارەوە، سەیری شار و پێکهاتەکانی شارم دەکرد، لە هەمـان کاتـدا چـاوم لـێ بـوو، ئاگـاداری ئەوەش بووم کە پزیشکەکان چارەسەر و نەشتەرگەریان دەکردم، گوێم لێ بـوو یەکێـك لە پزیشکەکان وتی: هەر وەکـو چـۆن نابینـایە، لەمەو دوا بیسـتنیش لە دەسـت دەدات ئەگەر بمێنێت.

گوێکانم خوێن بەربونیـان هەبـو، دەترسـان پەردەی گـوێم دڕابێـت، کەچـی مـن لەسەرەوە زۆر بە باشی دەمبینی و دەشمبیست.

بینین بۆ من زۆر خۆش بوو، لە هەمان کاتیشدا ترسناك بـوو! چـونکە یەکەم جـارم بوو شتان ببینم، یەکەم جار بوو مرۆڤ ببینم، زۆر شتم دەبینی نەمدەزانی چین؟

ئێمەی نابینا کە خەویش دەبینـین، وێـنە نـابینین، تەنهـا بە دەنـگ و بیسـتن لە خەو بینین ئاگادارین.

ئەوەش ئاگادار بووم کە پزیشکەکان و کارمەندان پەرۆشی گەڕانەوەی مـن بـوون و هەوڵی زۆریان دەدا.

تواناکانم زۆر بوون، یەکەم جـار بـوو پەیـکەرە جەسـتەی خـۆم ببیـنم، بە ئەڵـقەی شوکردنەکەمدا زانیم ئەوە خۆمم.

ئەڵقەکە چەند نەخشێکی تیا بوو، بە دەست لێدان دەمزانی چۆنە، ئیتر خۆمم ناسیەوە!!

چەندە سەیرە یەکەم جار خۆت دەبینیت!!

گوێم لێ بوو، دەمبینی، پزیشکەکە دەیوت لە توانای ئێمەدا نیە بیگەڕێنینەوە بۆ ژیان، بەڵام من بانگم لێ دەکردن و نزیك دەبوومەوە لێیان، بەڵام هیچ هەستیان پێ نەدەکردم! من لە باشترین حاڵ و جۆری ژیاندا بووم، بێ زار بووم لە بینینی جەستەکەم و نەخۆشخانە، ئیتر بەرز بوومەوە بۆ ئاسمان، زۆر بەرز بوومەوە، کاتێ هەست بە ئازادی ڕەها دەکەیت زۆر چێژ بەخشە، تونەیلەکەم بینی، ئەو تونەیلە دەرگای هەبوو، لە یەکێك لە دەرگاکانی دۆزەخم بینی، دەنگ و بۆن و وێنەی شوێنێکی دۆزەخم بینی، زۆر زۆر ترسناك بوو، بۆنی کبریتی لێ دەهات، لەوێش سەرکەوتم، لە شوێنێکدا دابەزێنرام زۆر جوان و شادی هێنەر بوو، باخچەیەك بوو لە ڕادەبەدەر خۆش بوو، گوڵی زۆر گەورەی لێ بوو، دەنگی مۆسیقای هێمن و زۆر خۆش و پڕ ئاوازم بیست، لە لایەن سەرتاپا سپیەکی نورانیەوە پێشوازیم لێ کرا، لەگەڵ دوو هاوڕێم کە کۆچی دواییان کردووە و کاتی خۆی لە قوتابخانە پێکەوە بووین، چەندین کەسی تریش کە کۆچی دواییان کردووە لە ناسراو و خزم و دۆستە نزیکەکانمان.

باپیرەم پێش لە دایك بوونی من مردبوو، لەوێ بینیمەوە.

نورانیەکە پێی وتم: هێشتا کاتت نەهاتووە، دەبێت بگەڕێیتەوە بۆ ژیانی دونیا، دەبێت پشوو درێژ بیت، هەروەکو چۆن هەتا ئێستا ئارامت گرتووە و زۆر ناڕەحەتیت تێپەڕاندووە، لەمەو دواش کە گەڕایتەوە زۆری تر دەبینیت، پشوو درێژ بە.

لە ژیانتدا بە خۆشەویستی و ڕەحمەت و بەزەییەوە مامەڵە بکە.

پێی وتم: تۆڵە سەندنەوە تایبەت مەندی و کاری مرۆڤ نیە، ئەوە مافێکی خواییە، نابێت مرۆڤ دەستی بۆ ببات، چونکە مرۆڤ زیادە ڕەوی دەکات و دەبێتە ستەمکار!

وتم: من نامەوێت بگەڕێمەوە بۆ ژیانی دونیا.

وتی: کاتت ماوە دەبێت بگەڕێیتەوە.

وتم: ئاخر من لە دونیادا بیر کردنەوەم هەبوو بۆ خۆ کوژی!

نورانیەکە وتی: خراپترین کرداری مرۆڤ خۆکوشتنە، هەرچی ناخۆشیەکانی ژیانە لە ژێر چاودێری و ئاگاداری خوای گەورەدا بەڕێ دەکرێت و دەڕوات، صەبریش دەرمانی زۆر لە ئازارەکانە.

هەموو ئارامگریشی ژیانی دونیام پیشان درایەوە، بە گەورە و بچووکیەوە، چرکە بە چرکەی...

ئیتر لە پاشاندا گەڕێنرامەوە بۆ دونیا.

## عەبلە لە بەلجیکا



من بەبێ نەخۆشی و ڕووداوێك ئەزموونەکەم بینی!

لەگەڵ خێزانەکەمدا دانیشتبووم، بێ هۆشیەك هات بە سەرمدا، لە شوێنێکەوە دەچووم بۆ شوێنێکی تر هەتا گەیشتمە تونێلێك، ڕووناکیەکەی پڕا و پڕ بوو، بەڵام زۆر شیرین بوو، زۆر بێ ئازار بوو، لە چاو تروکانێکدا خۆم لەوێ بینیەوە، سێ کەسم بینی کە مردون، یەکێکیان دایکی باوکم بوو کە لە ژیاندا نەمبینی بوو، پێش لە دایك بوونی من، ئەو مردبو، دەستی گرتم و بە ناوی خۆم و باوکمەوە ناوی بردم، بردمی لەگەڵ خۆی بۆ شوێنکی زۆر خۆش و جوان، کە سەوزایەکی بێ سنوری لێ بوو، سەرەتا و کۆتایی دیار نەبوو، داری بەرزی لێ بوو، کۆشکی بەرز و دیمەنی پان و بەرینم بینی، دەرگای کۆشکەکان نەخش و نیگار کرابوون، کە سەیری کۆشکەکەم کرد هەستم بە دڵ خۆشیەکی سەیر کرد، خەڵکانێکم بەیەکەوە بینی دانیشتبوون، قسەیان دەکرد و پێ دەکەنین و دڵخۆش بوون. جل و بەرگی سپیان لەبەردا بوو، چەند کەسێکیان خزمی

من بوون، کە یەکێکیان دایکی دایکم بوو، یەکێکیان دایکی باوکم بوو، هەروەها خـاڵم لەوێ بوو.

هەستم بە بۆنێکی زۆر خۆش دەکرد، بۆن خۆشیەك لە دونیادا وێـنەی نـیە، بـۆنێکی زۆر سوك و هەست بزوێن بـوو، لە هەوا و ئۆکسـجین ئاسـانتر دەچـووە گیـانمەوە، لە شوێنێکدا بووم ترسم نەبـوو، هەسـتم بە ئـارامی و ئاشـتی و مـوحیبەتێکی بـێ سـنور دەکرد، هیچ کێشەیەکم نەبوو، هەموو ئەوانەی لەوێدا بوون منیان دەناسی، وام دەزانـی لە ماڵی خۆمانم، حەزم لە هاتنەوە نەبـوو، نەنکـم 'دایکـی دایکـم' پێـی وتـم: دەبێـت بگەڕێیتەوە، دایکی باوکیشم دەستی گرتبووم و دەیوت هـاتووە بـا بمێنێـتەوە، ئەویـش وتی: نابێت لێرە بێت، کاتی نەهاتووە و دەگەڕێتەوە.

دایکی دایکم وتی: ئێستا چۆنین، لە هەمان شوێن و سات ئێستا چـۆنین، هەر ئـاوا بەیەك دەگەینەوە و ژیانی ڕاستەقینە بەڕێ دەکەین.

دەپاڕامەوە هەتا نەگەڕێمەوە، دەموت نامەوێ بگەڕێمەوە، وتیان: کاتـت نەهـاتووە، کێشایان بە پشتما و گەڕامەوە، ئەو بـۆن خۆشـیەش لە دوای چەنـدین ڕۆژیـش لە لای من بەردەوام بوو.

## چاکە و قورئان و سوورەتی فاتیحە بە مردووەکان دەگات



من ناوم 'صەفاء'ەو موسوڵمانێکی عێراقیم، دایکم 'شیعە' مەزهەب و باوکم سـونی مەزهەب بوو، لە ماڵی ئێمەدا فەرق و جیاوازی شیعە و سونە نەبوو، لە بانگی بەیانیـدا بوو باوکم کۆچی دوایی کرد، باوکێکی زۆر خۆشەویستم لە دەست دا، غەمبار بوم بـۆ لەدەستدانی باوکم دەموت باوکم بۆ کوێ چوو؟!

دەبێت ئێستا لە کوێ بێ؟!

سێ ڕۆژ لەسەر یەك دوعام دەکرد، دەموت: خودایە منیش بمرێنە هەتا بزانم باوکم لە کوێیە.

لە ڕۆژی سێهەمی مردنیدا بوو، هەستم بە سارد بوونەوەی جەستەم دەکرد، لە کاتێکدا کەش و هەوای ئەم شار و ناوچەیەی ئێمە زۆر گەرم بوو، دەگەیشتە (٥٠) پلەی گەرما، لەگەڵ ئەوەشدا هەستم بە سەرما دەکرد، گێژ بوون و خەواڵوییەکی قورس دایگرتم، لە دوای ئەوە یەکسەر خۆم بینیەوە کە ڕاوەستاوم و جەستەم لە خوارەوە بێ جوڵەیە و کەوتووە.

هەروەکو ئەوەی کراسێکی کۆن بم و فڕێ درابم.

دەیانجوڵاندم 'لاشەکەم'، من هیچ باکێکم لێی نەبوو. هەروەکو ئەوەی جەستەی من نەبێت، لەناکاو باوکمم بینی ڕاوەستا بوو، پێم وت: بابە تۆ لێرەیت؟!

هیچ وەڵامێکی نەدامەوە.

لەوێدا خێرا سەرتاپا نورانیەك لەسەر شێوەی پیاوێکدا پەیدا بوو، پەیدا بوو، لە لای ڕاستەوە وەستا بوو، هەستم بە دڵئارامی کرد بە هۆی ئەو کەسە نورانیەوە، بەڵام ڕوخساریم نەبینی.

پێی وتم: خوای گەورە منی لەبەر تۆ ناردووە.

دەستی گرتم و وتی: فڵان کەس کاتی هاتووە.

"مەبەستی ئەوە بوو کە دەبێت بڕۆین"، لە ئاسمان دەرگایەك کرایەوە، دەرگاکە ڕەنگی سەوز بوو، لەو دەرگایەوە تونێلێکی گەورە کرایەوە، هەستم بەوە کرد ئەو نورانیە منی کێش کرد بۆ ئەو شوێنە. زۆر خێرا تر لە تیشك تێدەپەڕین بە ئاسمانەکاندا، گەیشتینە جیهانێکی تر، وتم: ئەمە کوێیە و، ئەم جیهانە چییە؟

وتی: ئەمە ژیانی بەرزەخە، هەچ کەسێك دێتە ئێرە دەبێتە میوانی خوای باڵادەست.

باوکت میوانی خوای گەورەیە.

هەستم بە میهرەبانی و دەسەڵاتی حەق تەعالا دەکرد.

خوایەکی میهرەبان و گەورە و بە بەزەیی.

لەوێـدا ئەوەم زانـی کە هەر چەنـدە عیبـادەت بکەیـت و کـردەوەی بـاش ئەنجـام بدەیت، هێشتا کەم تەرخەمیت لە ئاستی ئەو نیعمەتانەی کە خـوای گەورە لە بەرزەخ و قیامەت بۆ بەندەکانی ئامادەی کردووە.

بە نورانیەکەم وت: ئەوەی لە دونیا دەردەچێت و دەمرێت بۆ کوێ دەچێت؟!

وتی: ئەوەی دەمرێت و دەچێتە ناو گۆڕ، فریشتە دێنە سەری و پرسیاری لـێ دەکەن و پاشان دەیهێنن بۆ ئێرە، دێنە ناو ژیانی بەرزەخەوە.

لە لای چەپەوە کۆمەڵێ خەڵکی پیس و پۆخڵم بینی، بۆنیان زۆر ناخۆش بوو، زۆر خەمبار بوون.

لە نورانیەکەم پرسی: بۆچی ئەوانە بەو جۆرەن؟!

وتی: ئەوانە کرداری باشەیان فەرامۆش کرد لە دونیادا.

خەڵکانێکی ترم بینی لە لای ڕاست، جل و بەرگیان زۆر پاك و جوان بوو، هەستم دەکرد زۆر بەهێز و بەختەوەر بوون، کە چاوت پێیان دەکەوت خۆشت دەویستن.

نورانیەکە وتی: ئەمانە باوەڕدارە باشەکانن.

زانیم کە باشەکان و خراپەکانیش لە موسوڵمانان بوون. لەگەڵ نورانیەکە ڕۆشتم بـۆ شوێنێکی تر خانوو و تەلاری زۆر جوانی لێ بوو، پێی وتم: ئەم خانوو و تەلارانە هـی مرۆڤە صاڵحەکانە، ئەمانە میوانی خوای گەورەن هەتا ڕۆژی قیامەت دێت!!

ئەوەشم زانی لە ژیانی بەرزەخدا کرداری باش و خراپت پێ ناکرێت، چونکە دونیـا شوێنی کردارە و، بەرزەخ و قیامەت شوێنی پاداشت و سزایە.

هەر چیەك لە دونیـاوە پێـت نەگـات لە چـاکە و دوعـای خێـر و خێراتـی جیـاواز، هیچی تر ناگاتە تۆ.

صەدەقە و دوعا و قورئان خوێندن و کرداری چاکەی نزیکان دەگاتە تـۆ لە بەرزەخ، بە هۆکاری خێری جیاوازەوە دەبرێن بۆ کۆشك و شـوێنی خۆشـتر، ئەوەشـم زانـی کە هیچ کەس لە بەرزەخ نازانێت کەی قیامەت و حەشر هەڵدەسـتێت، ئەوە تەنهـا خـوای گەورە دەیزانێت.

بە باوکمم وت: بابە بۆچی وەڵامت نەدامەوە کە پرسیاری بەرزەخم لێ کردی.

باوکم وتی: ناتوانم هیچت دەربارەی بەرزەخ پێ بڵێم، هەر ئەوەنـدە دەزانـن کە لەم گەشت و ئەزموونەدا دەیبینن و بیرتان دەمێنێتەوە.

چونکە ئێمە کە دەگەینە بەرزەخ پەیمانمان لێ وەردەگرن، کە نابێت هـیچ نهێنیەکـی بەرزەخ بدرکێنین.

تـۆش کە دێـتە جیهـانی بەرزەخ لە دوای مـردن، هەمـان عەهـد و پەیمانـت لـێ وەردەگیرێت، کەمترین نهێنی بەرزەخ دەگاتە دونیا و پێی دەزانن!!

نورانیەکە پێی وتم: بلێ "الحَمْدُ للهِ الذي أحْيَانَا بَعْدَ ما أمَاتَنَا، وإلَيْهِ النُّشُورُ" هەسـتم کرد کە دەمگێڕنەوە بۆ دونیا - ئەوە بوو ئیتر گەڕامەوە بۆ دونیای تاقیکردنەوە.

## وتیان پێم: نابێت هەموو شتێك باس بکەیت

لەوێ پێیان وتم: هەندێ لەو شتانەی لێرە بینومن باسیان نەکەم نەیان گێڕمەوە.

من لێرەوە بە هەموو کەسێك دەڵێم کە گوێی لێمە، ژیـانێکی هەتـا هەتـایی لە دوای مردن هەیە و حەقە و ڕاستە.

سێ خولەك و بیست چرکە لەم دونیـایە دەرچـووم، مـن دەمویسـت سـیەکانم بـۆ بگۆڕن بۆ سـیەکی تـر، پـێش ئەوە چـوار نەشـتەرگەری و قەسـتەرەیان بـۆ کـردم، بـۆ دەستنیشان کردنی نەخۆشی بۆیان کردم، هەتا بزانن کە ئایا دڵـم توانـای قبـوڵ کردنـی ئەو نەشتەرگەریەی هەیە.

بەڵام لە کـاتژمێری سـێهەمی نەشـتەرگەریەکەدا دڵـم بە تەواوی لە کـار کەوت، تیمێکی تایبەتمەندیان هێنا هەتا دڵم بۆ بکەنەوە، لە دوای نەشـتەرگەریەکە پزیشـکەکان پێیان وتم: تۆ بۆ ماوەی سێ خولەك و بیست چرکە دڵت وەستاوە و مردویت.

لە بەشی بێ هۆشکاری تیمێکی تایبەت هاتن، پرسیاریان لـێ دەکـردم، لەو کـاتەی کە دڵم وەستاوە، ئایا هەستم بە هیچ شتێك نەکردووە؟!!

منیش پێم وتن: پێش ئەم نەشتەرگەریە دوو دڵ بـووم لەوەی کە ئایـا لە دوای مـردن زیندوو بوونەوە هەیە یاخود نا؟!

بەڵام ئێستا من پێتان دەڵێم: ژیان ئەو ژیانەیە کە لە دوای مردن دەست پـێ دەکـات، هەستم دەکرد کە بە خێراییەکی بێ سنور دەفڕیم، لەناو بۆشـاییەکی فراوانـدا دەڕۆشـتم و هیچی تیا نەبوو، نە زەوی، نە خاك، نە ئاسمان، نە دار نە درەخت نە هیچ شتێك...

ڕەنـگە ئەو بۆشـاییە شـتێکی گەورە بووبێـت و لەبەر خێرایـی ڕۆشـتن هەسـتم بە لاکانی نەکردبێت.

لەناکاو کۆمەڵێك خەڵکم بینی، بە پەنجەکانیان ئاماژەیان بۆ مـن دەکـرد، مـن لەوەو پێش لە دونیادا کۆمەکم کردبون و یارمەتیم دابـوون، لەناکـاو ڕووگەی ڕۆشـتنەکەمیان گۆڕی، گەڕێنرامەوە بۆ دونیـا و سـەر زەوی، هەر ئەوەنـدەی گەشـتەکەم بـاس دەکەم، هەنـدێ شـتیان پـێ وتـم کە نـاتوانم دەربارەیـان بـدوێم، هەرچـی کاتێـك بیـری ئەم ئەزموونەم دەکەوێتەوە هەستێکی سەیر و ڕۆشنم بۆ دروست دەبێت.

# یادی مردن وامان لێ دەکات کۆپیەکی باشتری خۆمان بین

• ⟫⟫ — — ↑ — — ⟪⟪ •

بە سادەیی سەیری ژیانم دەکرد، کۆکە و هەناسە توندیەکی گرانم تووش هات، پاشان ماوەیەك گرێیەکی شێرپەنجەیی لەسەر گورچیلەم دروست بوو، جۆرێك بوو بڵاو دەبوویەوە، لە سیەکانیشمدا بڵاو بوویەوە.

خێزانەکەی دەڵێت: کاتێك پزیشکەکە پێی وتم خۆم بۆ ڕانەگیرا، دانیشتم هەتا هەناسەیەك بدەم، لە دوایدا گەڕامەوە ماڵەوە، لە هەفتەی یەکەمدا هەموو خێزانەکەمان تووشی دڵتەنگی و داڕوخانێکی ترسناکی کردینەوە!

هەستم دەکرد ژیانمان وەك تەنکیەك ئاوی لێ هاتووە و وردە وردە ئاوەکە دەڕژێتە باخچەیەکەوە و تەواو دەبێت.

ئیتر گرنگیم بە دیمەن و ژیانی خۆم نەدەدا، وازم لەوە هێنا سەرکەوتووبم لە کارەکەمدا، ماڵ، سەیارە، هەموو شتێکم فەرامۆش کرد، ژیانم لێ بێزرا کاتێك 'ڕۆب'ی هاوسەرم تووشی نەخۆشیە کوشندەکە بوو، تەنها پەیوەندیە خێزانیەکەمان مایەوە، لەگەڵیان دەچوومە دەرەوە و پیاسەمان دەکرد و کاتی زیاترم بە خێزانەکەمەوە بەسەر دەبرد، ئێستا هەست دەکەم چێژی ڕۆحی چ گرنگیەکی لە ژیانمدا هەیە، ئێستا گرنگی بە سات بە ساتی ژیانم دەدەم. چونکە ڕەنگە 'ڕۆب' دوای کاتژمێرێکی تر نەمێنێت، من داهاتوو لە بیر کردنەوەمدا دەسڕمەوە، بۆ کاتی ئێستام دەژیم، حەقی تەواوەتی خۆی پێ دەدەم، هەتا لێم ون نەبێت، من گرنگی خێزانم بۆ دەرنەکەوت هەتا هەستم بە نزیکی مردن کرد لە یەکێك لە خێزانەکەمانەوە، بیر کردنەوە لە مردن کێش و بەهای بەخششە خواییەکانت پیشان دەدات...

لە دوای چوار مانگ لە بە ئاگا هاتنەوەم ڕۆب کۆچی دوایی کرد، پێش مردنـی پـێم وت: 'ڕۆب' پلانی دوا ڕۆژم بۆ دابنێ، من چیبکەم؟!

وتی: ماستەر لە پەروەردەی جەستەییدا بەدەست بهێنە، هەتا پارەی زیـاترت دەسـت بکەوێت و پارێزگاری لە ئاستی ژیان و خۆش ژیانی خۆت و منداڵەکان بکەیت!!

نەمتوانی ئەوە ئەنجام بدەم، چونکە زانـیم پێشـەنگی و سـەرکردەیی کەشـتی ژیـانم لەو کاتەدا دەبێت بدەمە دەستی گەورەیی و خۆپەرستیم، نەك ڕۆح و بەهام!!

پێشەنگی من ڕۆحە، چونکە ڕۆح هەرگیـز سـێبەری ون نابێـت، ئیـتر کەوتمە دوای مردن و سەرە مەرگ، کتێبی زۆرم خوێندەوە، گـوێم لە زۆرێـك وانەی تـایبەت گـرت، لێکۆڵینەوەی زۆرم کرد، زۆر شـتم بـۆ ڕوون بـوویەوە کە لە کـاتی سـەرە مەرگـدا ڕوو دەدەن.

بۆم دەرکەوت نـۆ لە دەی ئەوانەی نزیکـی مـردن دەبـنەوە حەز دەکەن لە ماڵەکـانی خۆیاندا بمرن نەك لە شوێنی تر و لە نەخۆشخانە.

گرنگـی دان لە سـەرە مەرگـدا زۆر زۆر گـرنگە، چـونکە بە چـرکە سـاتێکی زۆر هەستیاردا تێ دەپەڕێت، لەو گۆڕەپانەدا دەستم بە کار کرد، لە شوێنی پیـران ئەزمـوونی ئەوەم وەرگـرت، نـامەم پـێ دەگەیشـت کە دەیـوت نەخۆشـەکە لە حـاڵی مردنـدایە و کەسێکی نیە دڵی باتەوە و دڵخۆشی بکات، هەمووومان لەو چرکە سـاتەدا ئاتـاج دەبـین بە کەسانێك لە دەوروبەرمان بن، پێویستە کەسەکان بزانن چی دەکەن و چۆن مـامەڵەی ئەو حاڵەتە هەستیارە چارەنووس سازەی مرۆڤ دەکەن!!

من ئێستا ئەو کارە دەکەم، لەگەڵ خێزانێکـدا بـووم، پیـاوەکە هەفـتەیەك بـوو لە بـێ هۆشیدا بوو، خێزانەکەی وا هەستیان دەکرد وەك ئەوەی ئەم کەسە چـنکە کیـڕەی بێـت هەتا لە ژیاندا بمێنێتەوە، یاخود دەترسـێ نـازانێ بـۆ کـوێ دەچێـت؟! کە یەکەم جـار سەردانیم کرد برۆکانی هێنابوویەوە یەك و زۆر دودڵ و ڕا ڕا دیار بوو، دواهەمـین شـت کە مرۆڤ هەستی پێ بکات ئەوەیە لە ڕێگەی بیستنەوە پێی بڵێین، پـێم وت: "دەمزانـی

کە ئەو لە ناوچەیەکدا ژیاوە کە کەناری دەریا بووە" وەك ئەوەی یادەوەری دەریا و کەناری دەریای بیر بهێنمەوە، هەتا بیری شنەی شەماڵی بەیانیانی بکەوێتەوە و شەپۆلی دەریای بیر بێتەوە و، ڕای بهێنیت لەسەر گەشتە هەتا هەتاییەکەی...

پێشم وت: بەم نزیکانە سەردانت دەکەمەوە، دەستی توند گوشیم و وتی خۆشم دەوێیت، نەم دەزانی لەگەڵ کێ دەدوا...

با زۆر گرنگی بە کۆتا ساتەکانی مردوو بدەین، لە سەرە مەرگدا تەنیای نەکەین هەتا بە سەلامەتی بگاتە بەرزەخ.

مردن و یادی مردن وامان لێ دەکات هاو وێنەیەکی باشتری خۆمان بین...

## ئەزموونی پزیشکێکی شارەزا لە ئەزموونەکان



ئەم پزیشکە کەسێکی شارەزای ئەزموونەکانی نزیکبوونەوەیە لە مردن، باسی پێنج ڕووداوی سەیر دەکات کە ڕوویان داوە و جێگەی سەر سوڕمانە.

ئەم پزیشکە دەڵێت: چل ساڵە ئەزموونەکانی نزیکبوونەوە لە مردن کۆ دەکەمەوە، زانیاری دورو درێژم هەیە لەسەر هەزاران حاڵەتی نزیکی مردن، هەچ یەکێکیان تاقانەی جۆری خۆیەتی، بەڵام هەمیشە تایبەتمەندیەکی هاوبەش هەیە بۆ هەموو ئەزموونەکان.

جاری وا هەیە مێشکی یەکێکیان تووشی تێکچون و لەناوچوون و لێدانێکی خراپ دەبێتەوە، کەچی ئەزموونێکی زۆر گەورە دەبینن، پرسیارەکە لێرەدا ئەوەیە، چۆن کەسێك بەرکەوتن و تەلەفی توش دەبێت، لەگەڵ یەکێك هیچ کێشەیەکی مێشکی نیە هەمان شت دەبینن؟!

ئەم دیاردەیە زانست و مەنتیق تووشی حەیران و سەرسامی دەکات!!

'جیمس' تەمەنی بیست و پێنج ساڵان بوو، کارمەندی تەندروستی بوو، کاری پەرستار بوو، ڕۆژێکیان دڵتەنگیەکی سەختی بۆ دروست بوو، بڕیاری دا کۆتایی بە ژیانی خۆی بهێنێت، ژمارەیەك حەبی خوارد، ڕاکشا و چاوەڕوانی مردنی دەکرد، ئازارێکی سەختی سك ئێشەی بۆ دروست بوو، بڕیاری دا پەیوەندی بە یەکێکەوە بکات هەتا ڕزگاری بکات، ویستی هەستێ و تەلەفون بکات، توانای نەما، بینی کەسانێك ناهێڵن پەیوەندی تەلەفونی بکات، کاتێك گەڕایەوە ناو جەستەکەی بە هەمان شێوە ئەو کەسانەی بینیەوە، دوای ئەم ئەزموونە 'جیمس' بە تەواوی قەناعەتی کرد کە مرۆڤ تەنها مادده نیە، هۆشی یاخود ڕۆحی ئەو و جەستەی دوو شتی جیان لە یەکتر!

چۆن توانی ببینێت و لە دەرەوەی جەستەشی بێت، هەروەها چۆن مردووی خزم و ناسراو و نەناسیش دەبینن؟!

* 'جاك' تەمەنی بیست و پێنج ساڵە و، ئەندازیاری کارەبایی بوو، لە نەخۆشخانە کەوتبوو، التهابی سنگی هەبوو، پەرستارێك کە ناوی 'انیتا' بوو خزمەتی زۆری 'جاك'ی دەکرد، ڕۆژێکیان جێگاکەی بۆ چاك دەکرد، پێی وت: 'جاك' من لە کۆتایی ئەم هەفتەیە چەند ڕۆژێك پشوو وەردەگرم و نایەمەوە و دەچم بۆ سەردانی دایکم و باوکم، ڕۆژی لە دایك بوونی (٢١) ساڵەم لەم هەفتەیەدایە و دەمەوێت لە ماڵەوە بم.

دوای چەند ڕۆژێك، لە هەمان کاتی پشووەکەی 'اتینا' حاڵی 'جاك' زۆر خراپ بوو، بە زەحمەت هەناسەی بۆ دەدرا، هەستی بە خنکان دەکرد و ئەزموونی نزیکبوونەوە لە مردنی بینی، لە ئەزموونەکەیدا 'ئەتینای' پەرستاری بینی، لە کاتی ئەزموونەکەیدا 'جاك' لە 'ئەتینا'ی پرسی، تۆ چی دەکەیت لێرە؟

ئەتینا وتی: هاتووم بۆ کۆتا جار جێگاکەت بۆ چاك بکەم!! "واتە ئەم یەکتر بینینەی جاك و ئەتینا بە ڕۆح بووە" دەمەوێت بە دایکم و باوکم بڵێیت کە من زۆرم خۆش دەوێن.

داوای لێ بوردنیان لێ دەکەم سەیارە سورەکەشم بەهۆی خێـرا لێخـوڕینەوە تێـك و پێك شکا.

دوای ئەوە 'جـاك' هۆشـی دێـتەوە و دەگەڕێـتەوە دونیـا، جـاك بە پەرسـتارە جێگرەوەکەی ئەتینای وت: من أتینام بینی و دوا جار بـوو سـەردانی نەخۆشـخانەکەی بکات، پەرستارەکە تێ گەیشـت کە 'ئەتینـا' شـتێکی بەسـەر هـاتووە، دەسـتی کـرد بە گریـان و ژورەکەی بەجـێ هـێلا، نەخۆشـخانەکە پەیوەنـدی کـرد بە دایـك و بـاوکی 'ئەتینا'وە، ئەوانیش وتیان: بەڵێ 'ئەتینا' مـردووە، دایـك و بـاوکی ئەتینـا سـەیارەیەکی سوریان بۆ ئەتینا کڕیوە لە یادی لە دایك بوونیدا وەکـو دیـاری یـادی لە دایـك بـوونی بیست و یەك ساڵەی، ئەتیناش بە دڵ خۆشیەوە سەیارەکەی لێ خوڕیـوە و پیاسـەیەکی خێرای پێ کردووە، کێشاویەتی بە دیوارێکی ڕاگری چیمەنتۆدا و دەست بەجێ گیـانی سپاردووە...!!

* 'لیڤا' کە تەمەنی سی و پێنج ساڵانە و لە هۆڵەندا لە دایـك بـووە، بە سـەکتەی دڵ نزیکبـوونەوەی مردنـی بینیـوە، لە ئەزموونەکەیـدا گەیشـت بە بـاپیرەی و پیـاوێکی نەناسیشـی لەگەڵ بـوو، ئەو پیـاوە زۆر ڕوو خـۆش بـوو، بەڵام لیڤـای ئەو پیـاوەی نەدەناسی!

کە لیڤـای گەڕایەوە بـۆ دونیـا، لە دوای دە سـاڵ لە ئەزمـوونەکەی، کاتێـك دایکـی لیڤای لەسەر جێگای مردن بوو، پێی وت: کچم باوکی تـۆ ئەوە نـیە کە تـۆ دەیناسـی، باوکی تۆ جولەکەیەك بوو زیندان بوو لای نازیەکان، لە سەربازگەی نازیەکاندا کـۆچی دوایی کرد، کاتێك دایکی لیڤای وێنەی باوکی ڕاستەقینەی پیشانی لیڤـای دا، دەبینێـت ئەو پیاوە بووە کە لە ئەزموونەکەیدا بینیویەتی و ڕووی خۆش بووە لەگەڵی.

هەموو ئەمانە و هەزاران بەسەرهات و ئەزمـوونی تـر سـەلمێنەری ئەوەن کە مـرۆڤ تەنهـا بە جەسـتە مـرۆڤ نـیە و، لە دوای مردنـی جەسـتە شـتێکی زۆر گەورەی ئـێمە زیندووە و، ئەو شتەش ڕۆحە و هەمیشەییە.

# هەموو چرکەیەك ئامادەی مردنم

بیست ساڵ پێش ئێستە ئەزموونەکەم بینی!

بەڵام نەم دەوێرا باسی بکەم و بیگێڕمەوە نەوەك بە شێتم بزانن.

بەڵام بڕیارم دا باسی بکەم، چونکە من حەقیقەت و ڕاستیم بینیوە.

کاتێك منداڵی یەکەمم بوو، بە نەشتەرگەری گەورە و بەنجی گشتی منداڵەکەم بوو، ئەزموونەکەم لەو کاتەدا بینی.

لە جەستەم چوومە دەرەوە، هەموو ستافی پزیشك و کارمەندانم بینی، گوێم لێ بوو پزیشکەکە بە فەڕەنسی دەیوت: خەریکە دەمرێت و لە دەستی دەدەین، من لەوێدا بووم و چاوم لێ بوو ئاگاداریش بووم، تەنانەت دکتۆرەکە قسەی بە کارمەندی موەلیدەی کارەباکە وت، چونکە ماوەیەك کارەبا بڕا، هاوینێکی زۆر گەرم بوو، پزیشکەکە سنگی ڕووت بوو، ملوانکەیەکی لە ملدا بوو...

لە تونەیلەکە سەرکەوتم، نور و ڕوناکیەکم بینی هەرگیز وەسف و ستایشی تەواو نابێت، ڕەحمەت و هێمنی و دامەزراوی دایگرتم، گەیشتمە باخچەیەك ڕووەکەکان تەسبیحاتێکی زۆر جوانیان دەکرد، دەتوت ئەو ڕووەکانە ڕۆحیان تیایە و دەجوڵان وەك ئەوەی مرۆڤ بن.

ئاوی ئەوێ وەك دەنکۆڵەی ئەڵماس بریسکەی دەدا. وەصفی ناکرێت، هەموو وتنێك دەربارەی بۆ نزیك خستنەوەیە لە زیهنەتی مرۆڤ لە دونیادا، ئەگینا وەصفی ئەوێ ناکرێت، ئاوەکە دەجوڵا و دەیوت 'سبحان الله'.

کە ئەو دیمەنەم بینی ویستم لە دەرگاکەوە بچمە ژورەوە بۆ باخچەکە، بەڵام ڕایانگرتم و نەیانهێڵا بچم.

ڕۆحم بوو ویستی بچێتە ئەو باخچەیەی کە وێنەی نیە لە جوانیدا.

ڕۆح بنچینەیە و جەستە بەجێ دەهێڵێت، چونکە فانیە.

وتیان کاتت نەهاتووە، دەستم کرد بە گریـان هەتـا لەوێ بمێـنمەوە، بەڵام مۆڵەتیـان نەدام.

من بیست ساڵە ئەو ئەزموونەم بینیوە کەچی دەڵێی دوێنێ بینیومە...

هەرگیز بیرم ناچێتەوە، زۆر زۆر منی گۆڕی، من بیـرم نـیە دوێنـێ چـیم خـواردوە، بەڵام وردەکاریەکانی ئەو ئەزموونەم بیرە، هەموو چرکەیەك جانتای مـردنم حـازری ئەو سـەفەرە هەمیشـەیەیە، بەڵام هێشـتا خـۆم و نەفسـم حـازری ئەو سـەفەرە نـین، هـیچ کەسیش ناتوانێ بانگەشەی ئامادە بوونی خۆی بکات.

ئەوەی بە خۆ کوژی ئەو ئەزموونەی بینیبێـت هەرگیـز بیـر لە خۆکوشـتن ناکـاتەوە، چونکە ئەوەنە سزا و ناڕەحەتی پیشان دەدەن کە هەرگیز بیری لێ نەکاتەوە.

لەوێ زۆر بە ڕوونی پێیان وتم: خۆت بۆ مردن ئامادە بـکە. ئەوەی ئەو ئەزمـوونەی بینبێت و چووبێتە ناو نورەکە ترس لە جەستەیدا نامێنێت.

چـی لە کۆشـکی بەرز و پـارەی زۆر و دەسـەڵات و کورسـی دەکەیـت، کاتێـك دەزانیت هەرچی بکەیت ناتوانی لە مردن هەڵبێیت.

مردنیش مردن نیە، گواستنەوەیەکی خێرای کاتیە بۆ بەرزەخ و قیامەت.

پێویستە مرۆڤ کارێك بکات کە ڕۆژی دواییەکەی ئاوەدان بێت.

چونکە لەوێ پێت دەڵـێن لە دونیـادا چیـت کـرد، هەمـوو کردەوەیەکـی بچـووك و گەورە لێپرسینەوەی لەسەرە.

ئەزموونی نزیکبوونەوە لە مردن فەرمانێکی خواییە.

لە کاتی سەرە مەرگدا حەزت لە یـادی خـوا و قورئـان خوێنـدنە، بە هـیچ جۆرێـك ناتەوێت باسی ماڵ و سامانی دونیا بکرێت.

# من دڵخۆشم کە ئێستا لێرەم





دڵخۆشـیەکەم ئەوەیە کە هێشـتا لە ژیانـدام، چـونکە بە پێشـهات بـووایە دەبـوو وا نەبوایە، من سـاڵی (٢٠٠٦) ژیـانم بە جـێ هـێڵا، پزیشـکەکان بە خێزانەکەمیـان وت چەنـد سـەعاتێکی کەمـی مـاوە لە ژیانـدا، کە تووشـی شـێرپەنجەی لـیمفە گرێکـان بووبووم، لە قۆناغی کۆتاییدا بووم، چوار ساڵ ئـازارم چەشـت بە دەسـتیەوە، لە دوای چوار ساڵ گرێ دروست بوو لە جەستەمدا کە بە قەبـارەی لیمـۆیەك دەبـوو، لە مـل و بن باڵ و سنگ و سکمدا گـرێ دروسـت بـوو، پـێش ئەوەی بـکەومە بـێ هۆشـیەکی قوڵەوە، سنگم پڕ بوو لە ئاو، کاتێك پاڵ دەکەوتم لەسەر پشت خەریك بوو دەخنکـام، ماسولکەکانی جەستەم مانـدوو تێکشـکاو بـوو، جەسـتەم وەك پەیـکەرە ئێسـکی لـێ هاتبوو، لەسەرو ئەوەشەوە برین و کێم لە هەموو جەسـتەم دەردەچـوو، هەرسـم بـاش نەبوو، تای زۆرم هەبوو، توانای قسە کردنم نەمـا بـوو. نەمـدەتوانی بـڕۆم، هەمیشـە لە جێگادا کەوتبووم، بە ئۆکسجین هەناسەم دەدا.

لە ساڵی (٢٠٠٦)دا چوومە بێ هۆشیەوە، پزیشکەکان وتیان قۆناغی کۆتـاییەتی، چ کەسێك لە خێزانەکەتان ماوە دوعا خوازی لێ بکات، با بێت چونکە چـرکە سـاتەکانی کۆتاییەتی.

من لە بێ هۆشیەکی تەواودا بووم و چاوەکانم لێك نابوون، هـیچ کەس نەیـدەزانی کە من بە هەموو شتێك ئاگادار بووم، هەستم بە خەمی قوڵی هەمـووان دەکـرد، ئاگـام لێ بوو پزیشکەکان ئاویان لە سنگم دەردەهێنا هەتا بتوانم هەناسە بدەم.

من ئیدراك و بینینم بۆ دەرەوەی نەخۆشخانەکەش ئاسـایی بـوو، جەسـتەی خـۆمم دەبینی، دەمتوانی لە هەموو شـوێنێك بـم لە هەمـان کاتـدا، مـن لە نەخۆشـخانەیەکی 'هۆنگ کۆنگ' کەوتبووم، بەڵام براکەم دەبینـی لە هیندسـتان خەریکـی ئامـادە سـازی بوو، هەتا بە فڕۆکە بگەڕێتەوە بۆ لای من، دەیویست پێش مـردنم بمبینێـت، لە هەمـان





کاتـدا ئاگـاداری بـاوکم و هـاوڕێیەکی خۆشەویسـتم بـووم، کە هەردووکیـان کـۆچی دواییان کردووە، هەردوکیان ئاگاداری من بوون و قسەشیان لەگەڵ دەکردم، هەسـت و ئیدراکێکی زۆر زۆرم هەبوو، دەمزانی بۆچی و چۆن تووشی نەخۆشی سەرەتان بـووم، هەستم بە گەورەیی مرۆڤ دەکرد، لەوێ زۆر بە باشی ئەوەم زانی کە مـرۆڤ تەنهـا ئەم جەستە مادیە نیە، بەڵکو زۆر ڕێز لێ گیراو و گەورەیە.

هەستم بە خەم و پەژارەی پزیشك و کارمەندەکان دەکرد دەربارەی خـۆم، بەڵام مـن ئاسایی بووم دەربارەی ئەو خەمەی ئەوان کە بۆ منیان دەخوارد.

باوکم پێی وتم: هێشتا ڕۆژی تۆ تەواو نەبوە، دەبێت بگەڕێیتەوە، وام دەزانی توانـای هەڵبژاردنم هەیە بۆ هاتنەوە و نەهاتنەوە، لەبەر ئەوەی زۆر نەخـۆش بـووم بەڵکـو ئیـتر نەگەڕێمەوە بۆ دونیای پڕ لە ناهەمواری.

بەڵام بە زوویی بڕیاری چارەسەر و چاك بوونەوەم درا و ڕازییـان کـردم بە گەڕانەوە بۆ دونیا.

باوکم پێی وتم: بەبێ ترس و دڵە ڕاوکێ بگەڕێرەوە و ژیانی تەواوت تەواو بکە.

ئیتر دوای ئەو چرکەیە هەستم کـرد گەڕاومەتەوە و چاوەکـانم کـردەوە. کە گەڕامەوە دڵنیا بووم لەوەی کە چاك دەبمەوە و چارەسەرم لە جیهانی نادیار پێ بەخشرا.

لە مـاوەی پێـنج ڕۆژدا گرێکـان بچـووك بـوونەوە بە ڕێـژەی ٪٧٠، لە دوای پێـنج هەفتە لە نەخۆشخانە دەرچووم لە ٪١٠٠ چارەسەر کرام و بە تەواوی چاك بـوومەوە لە شێرپەنجە.

ئێمە لە دونیادا وەکو کەسێکین بە لایتێکی کـزەوە بچێـتە کۆگـایەکی زۆر گەورەی تاریکەوە، چەند شتێکی کەم و بەر پێی خۆی زیاتر نابینێـت، لەناکـاو کارەبـا بێـتەوە و ببێتە چراخان و هەموو کۆگاکە وەك ڕۆژی ڕووناکی لێ بێـت و هەمـوو کەلێنەکـانیش ڕووناك ببنەوە.

ئێمە لە بەرزەخ و قیامەت کۆگا گەورەکە بە تەواوی دەبینـین، چـاوی بینینـی ئێـرەی دونیامان و ئیدراکی کزۆڵی ئێرەمان تەنها لایتێکی کزۆڵە و هیچی تر...

# ترسم لە مردن نەماوە



تەنها پەتایەك دەبێتە خەمۆكی بۆ زۆرێك لە خەڵكی، ئەوەیە كە مردن میوانی ناكـات و لەناكاو بێت.

بەڵام من هیچ ترسێكم لە مردن نەماوە...

لە دوای ئەوەی ماوەی بیست خولەك مردم و ئەزموونەكەم بینی، شـتانێكم بینـی كە زۆرینەی خەڵكی پیشانیان نادرێت، ئەمەش حیكمەت و ڕەحمەتی خوایە و بەبـێ هـۆ نابینرێت.

تەمەنم بیست و هەشت ساڵان بـوو، كەمـترین كـاتم دەبەخشـیە خێـزانەكەم، بەڵام ئێسـتا و لە دوای ئەزمـوونەكەم زۆر گرنگیـان پـێ دەدەم، ئێسـتا تەمەنـم گەیشـتووەتە شەسـت و حەوت سـاڵان، لەو تەمەنە دورو درێژەمـدا كەمـترین جـار باسـی ئەزمـوونەكەمم كـردووە، خێـزانەكەم و نزیكەكـانم لـێ ئاگـادار كـردەوە، لە دوای ئەو هەموو سـاڵانە ئەو ئەزمـوونە لە یادەوەریمـدا زینـدووە، هەرگیـز بیـرم نـاچێتەوە، وەك ئەوەی دوێنێ ڕووی دابێـت، مـن خلیسـكێنەی سـەر سـەهۆڵم دەكـرد، پێكـدادانێكی سەختم تووش بوو لەگەڵ یەكێكی تر، هەر چۆن بوو ئەو ڕۆژەم لێ ڕۆشت، لە دوایـدا هەسـتم بە ئـازارێكی زۆر دەكـرد لە دەسـتمدا، ڕۆشـتم بـۆ نەخۆشـخانە و بڕیـاری نەشـتەرگەریم دا، پەنـجە گەورەم شـكا بـوو، پەرسـتارەكە لە كـاتی نەشـتەرگەریەكە هەڵەیەكی كرد، لە كردنەوەی صەمامی پەستانی خوێندا هەڵەیەكی كـرد، كـاتێكم زانـی مـن لە سـەرەوەی هـۆڵەكە بـووم، یەكێكـی تریشـم لەگەڵ بـوو كە ئەویـش سـەیری نەشـتەرگەریەكەی دەكـرد، پەرسـتارەكە لە هـۆڵی نەشـتەرگەریەكە ڕۆشـتە دەرەوە بە شڵەژاویەوە وتی: نەخۆشەكەم كوشت!!





من ئەو کەسەم نەدەناسی کە لە تەنیشتم بوو، سەیرم دەکرد و وام هەست دەکرد کە لەوە و پێش دەمناسی.

پزیشکەکەمان دەبینی کە بە دڵسۆزیەوە نەشتەرگەریەکەی ئەنجام دەدا، وردەکاری نەشتەرگەریەکەم بینی.

ڕاسپاردەیەکم پێ گەیشت کە کاتی ڕۆشتنە و دەبێت ئەوێ بەجێ بهێڵم، نەشدەبوو سەیری دواوە بکەم، فەرمانەکە بەم جۆرە بوو، گەیشتمە مێرگ و شوێنێکی زۆر جوان و خۆش، لەگەڵ هەمان کەسیشدا بووم، لە لای چەپم درەختی زۆر گەورە و بەرزم دەبینی، درەختەکان زۆر سەیر بوون، لەوەو پێش شتی بەو جۆرەم نەبینی بوو، لە لای ڕاستم گوڵی زۆرم بینی، زۆر نایاب و جوان بوون، گوڵەکان هەتا کەمەرم من دەهاتن، مێرگێکی لە بن نەهاتووی زۆر جوان بوو.

بەردەمیشم هەتا چاو بڕ بکات گیایەکی جوان بوو...

من لەوێ وەستابووم، ئەو کەسەی لەگەڵم بوو لە پاڵما نەما.

بە تەنها خۆم مامەوە، هەموو شتێك زۆر ڕوون بوو، زۆر دڵ ئارام بووم، ڕەنگەکان تۆخ و جوان بوون، لە کوت و پڕێکدا هەورێکی سپیم بینی، شریتی ژیانی خۆمم بینیەوە، لە لەدایك بوونمەوە هەتا تەمەنی بیست و هەشت ساڵی ژیانی خۆم بە تەواوی بینیەوە، هەندێ دیمەن کە دەمبینیەوە زۆر تەریقی دەکردمەوە، هەندێ دەسکەوتی پارە و سامانم زۆر جێگەی شەرمەزاری بوو چونکە حەڵاڵ نەبوون، دەبوو لە دونیادا زۆر باشتر ئاگام لە پارەی حەرام و حەڵاڵ بووایە

من حەقیقەتی ژیانی ڕاستەقینەم بینی، شتێکم پشان نەدرایەوە هی من نەبووبێت و درابێت بەسەر مندا، یەکێك پێی وتم بچۆرەوە بەرەو پەڵە هەورە سپیەکە، منیش ڕۆشتم، کە گەیشتمە ئەوێ دەستێکی گەورەی بەهێزی لێ هاتە دەرەوە، دەستی گەیشتە من، بەڵام دەنگێك لە پشتی دەستەکەوە وتی: هێشتا کاتی مردنت نەهاتوە،

دەستەکە گەڕایەوە بۆ ناو هەورەکە، من نەم دەویست بگەڕێمەوە بۆ ناو دونیـا، چـونکە لەوێ هەستم بە ژیانی ڕاستەقینە و ئارامی و ئاسایش و هێمنی دەکرد.

سێ ڕۆژ لە دوای گەڕانەوەشم ئارامی و دڵخۆشیەکەم وەك خۆی مابوو، چل سـاڵە ئەو ئەزموونەم کردووە و ئێستا بە تەواوەتی ئاشکرای دەکەم، هەموو ژیانی گۆڕیم. بیـر کردنەوە و داهاتووی گۆڕیم، ئێستا پەیوەندیەکی پتەوم بە قیـامەت و ئـاخیرەتەوە هەیە، ئیمانم بە خوا هەیە، خوایەکی تاك و تەنها و گەورە و بە دەسەڵات و بەبێ سنور، هـیچ گومانێکم دەربارەی غەیب نیە، لە مردن ناترسم چونکە قەبارەی گەورەیـی و مەزنـی و ئاشتی و موحیبەتی ئەوێ دەزانم.

## ئەزموونەکان لەسەرو زانستی مرۆڤەوەن



لە وڵاتی شیلی لە ئەمریکای باشور، 'نیل' ژێر ئاو کەوت لە ڕووبارێکدا و لە کـاتی ژێر ئاو کەوتنی بە بەلەمی پێشبڕکێی ناو ئـاو، کە تـاڤگە و شـەپۆل و پێچـاو پێچەکـان دەبڕیت و دەگەیتە کەناری ئارامی لە دوای سەختیەکی زۆر.

'نیل' بیست و چوار خولەك بەبێ ئۆکسـجین لە ژێـر ئـاودا مـایەوە، کاتێـك قـاچی گیرابوویە نێوان دوو بەرد لە کاتی وەرگەڕانی بەلەمە تاکە کەسیەکەی خۆی!

'نیل' دەڵێت: من لەو ماوەیەدا ڕۆشتم بۆ بەهەشـت، بـۆم دەرکەوت ئەم ئەزموونـانە بە هیچ جۆرێك تەفسیری ماددی هەڵنـاگرن، بیـردۆزەی خەون و کەمـی ئۆکسـجین و وڕێنە، حەقیقەتی ئەم ئەزموونە نین و ناکرێت تەفسیری مادی بکرێت.

گەڕام و شیکارە دەروونی و دەماغیەکانیشم کرد بۆ ئەم ئەزموونانە هیچیان نەبـوون، دەرەنجامەکان قەناعەت بەخشیش نەبوون.

ویستم تەفسیرێك بدۆزمەوە كە لەگەڵ عەقڵدا یەك بێتەوە، دور بێت لە شیكاریەك كە پەیوەندی بە جیهانی غەیب و نادیارەوە هەبێت، من دەمویست تەفسیرێكی مادی هەبێت بۆ ئەوەی كە بەسەرم هات، بەڵام بۆم دەركەوت كە ئەم ئەزموونانە لەسەرو زانستی مرۆڤەوەن.

فكر و بۆچوونت دەربارەی مردن و دوای مردن دارشتەی جۆری ژیان كردنت دیاری دەكەن، من بۆچوونم دەربارەی مردن لە رەگ و ریشاڵەوە گۆرا.

ساڵی (١٩٩٩) لە ئەمریكای باشور وەرزی بەلەمی خێرا بوو لە رووبارە خورەكان، لە ئەمریكای باشور، بە قوڵی دە پێ لە ژێر ئاودا وابەستە بووم، لەناو قوڵایی تاڤگەیەكدا، بە بێ ئۆكسجین نزیكەی نیو سەعاتێك لە ژێر ئاودا مامەوە، هەتا دەرهێنرام و هەناسەی دەسكردیان بۆ كردم.كاتێك هۆشم هاتەوە تووشی سەرسامی و شۆك بووبووم، تووشی دۆشدامانێكی گەورە بوومەوە.

نەوەك لەبەر ترس و بیمی رووداوەكە، نەك لەبەر ئەوەی ئێسكم شكابوو، بەڵكو لەبەر ئەوەی باوەرم بە خۆم نەدەكرد كە من گەرابێتمەوە ناو جەستەكەم، من دەزانم لە بەهەشت بووم، هەستم كرد لە ژێر ئاوەكەدا یەكێك هات دەری هێنام و بردمی بۆ بەهەشت، تەواوی ژیانی پیشان دامەوە، ئەو بینینە بۆ حوكم دان نەبوو لەسەرم، بەڵكو جۆرێك بوو لە تەفسیری حیكمەت و جوانی، لە دوای زۆرێك لە دەردی سەری و ناخۆشیەكانی ژیان پیشانت دەدرێتەوە.

خۆم بینیەوە كە رۆحێك بووم و لە دەریاچەكە هاتمە دەرەوە و بەرەو ئاسمان سەركەوتم، گەیشتمە جیهانێكی تر، لەوێ ژمارەیەك لە خەڵك پێشوازیان لێ كردم، هەستم بە خۆشەویستی دەكرد بەرامبەریان.

لەگەڵ خۆیان بردمیان و هاورێی رێم بوون، ئەو رێگایە پر بوو لە خۆشەویستی، چەندین جۆری رەنگ و، گوڵی جیاواز لەو رێگایەدا بوو، بۆنی زۆر خۆش كە هەرگیز لە دونیادا وێنەی نەبووە، لەو بەرزی و خۆشیە بێ سنورەوە سەیری خوارەوەم كرد، ئەو

ڕوبارەم بینی کە تیایدا خنکابووم، هەندێ خەڵکیشم بینی جەستەی منیان لە ئاوەکە دەردەهێنا، و چارەسەریان بۆ دەکردم، زانیم کە ئەوە جەستەی منە و مردووم، من خێزانێکی باشم هەبوو، چوار منالّم هەبوو، لە خۆم خۆشترم دەویستن، بەڵام من لەو جیهانەدا هەستم بە نامۆبون و بێزاریی نەدەکرد، وام هەست دەکرد لە ماڵی خۆمدام، نیەتی گەڕانەوەم نەبوو، پێم وترا هێشتا ئەجەلت نەهاتووە، دەبێت بگەڕێیتەوە بۆ دونیا، وتم ناگەڕێمەوە، ئەرکەکانی ژیانم دوای هاتنەوەم قورس بوون.

بە تایبەتی لە دوای ئەوەی من پرسیم کەی دەگەڕێمەوە بۆ ئێرەی هەمیشەیی، خۆزگە ئەو پرسیارەم نەکردایە!!

پێیان وتم: لە خێزانەکەتدا کوڕە گەورەکەت یەکەم کەسە دەگاتە ئێرە، دە ساڵی تر بە ڕووداوی سەیارە دەمرێت، بەو جۆرەش بوو کە ڕوویدا.

دوای گەڕانەوەشم من لە نێوان جیهانی مادی و نامادی هات و چۆم دەکرد، کێشەکە ئەوە بوو شتێکی ئەو تۆم دەربارەی مردن و دوای مردن نەدەزانی، ڕانەهاتبووم گوێ لەو یاسایانە بگرم، ئەزموونەکانیشم نەبیستبوو، ئەگەر ئاگاداریەکیشم لەسەری هەبووبێت فەرامۆشم کردووە و گرنگ نەبووە بەلامەوە، چونکە من کەسێکی دونیایی بووم و، دڵنیا بووم لە زیرەکی و تواناکانی خۆم!!

خۆم وا دەبینی کە پێویستم بە خوا نیە!

گرفتەکە ئەوە بوو کە پسپۆڕیە زانستیەکە ئەم بیرکردنەوەیەی فێر کردم.

بەڵام ئەزموونەکە ئەو وەهمانەی هەپرون هەپرون کرد و حەقیقەت و ڕاستیم بینی.

ڕاستیەکی ڕیشاڵ داری زۆر قوڵ، دەسەڵاتی خوای گەورەم بینی، ڕاستیەتی ناسینی خوام بۆ دەرکەوت، نەك وەکو ڕاستیەك، بەڵکو وەکو تەنها ڕاستیەك کە گرنگ بێت، بەڵکو گرنگترینی ژیان بێت، کە ناسینی خوای گەورەیە.

ئەوانەی بێ باوەڕن و تووشـی ڕووداو بـوون (٧٥٪)یـان ئەم ئەزموونەیـان بینیـوە و دەڵێن بە خزمەت پەروەدگار گەیشتین. چوینە خزمەت 'الله'

ئەوەی ئەم ئەزموونەی بینیبێت قەنـاعەت و بیـرو بـاوەڕی دەربـارەی مـردن و دوای مردن دەگۆڕێت بۆ هەتا هەتایە.

بە تەواوەتی ترسی لە مردنی نامێنێت، چـونکە مـردن دەرگـایەکە دەتگەیەنێـتە مـاڵی ڕاستەقینەی خۆت.

مردن ئەو دەرگایەیە کە دەکـرێتەوە بە ڕووی یەك بە یەکـی ئەوانەی تکتـی گەشـتیان وەرگرتووە و، ڕۆحیان بە یەکجاری لە جەستەیان ترازاوە.

ئەو ماڵ و نیشتیمانە ڕاستەقینەیەی ئەوێ مانا بەم ژیانە کاتیەی دونیامان دەدات.

مانا لای ئەو مرۆڤانە دروست دەبێت کە بینایـیان ئـاوێزانی ئەوێ دەبێـت و خـوای گەورە بە شایستەی ئەو سەرسامی و بینینی ئەو دەسەڵاتە ڕەهایەی خۆیـان دەبینێـت و خەڵاتیان دەکات.

ئیـتر هەمـوو بەربەسـت و ئـازار و مەینەتیەکـانی ژیـان بە سـانایی قبـوڵ دەکەن و، بەرهەڵستی و ترسی نارەزایی تەژی دڵیان نابێت.

سەیری ئەم وێنەیە بکەن، هەنـدێکتان پەرداخێکـی سـپی دەبیـنن، هەنـدێکتان دوو ڕوخسار دەبینن،



ئەمەش وابەستەی وردبونەوە و چاو خستنە سەری ئەو کەسەیە.

کە چاو دەخەیتە سەر پەرداخە سپیەکە، دوو ڕوخسارەکە نابینیت، دوو ڕوخسارەکە لە ئاست و بەرچاوی تۆ ون دەبێت و نابینیت.

ئەگەریش چاوەکانت لەسەر دوو ڕوخسارەکە بێت، پەرداخەکە لە پێش چاوت نابێت و ون دەبێت.

ئەگەر وا دابنێیت پەرداخە سپیەکە ئەو ماوەی ژیانەیە کە لە دونیا دەیبەیتە سەر، دوو ڕوخسارەکەش مانا و مەغز و ئامانجی ژیانی دونیایە، کە قیامەت و بەرزەخ و مەعاد و حەشر و بەهەشت و دۆزەخە، بەبێ ئەو دوو ڕوخسارە هەرگیز پەرداخەکە نابینیت، نەکەی ئینکاری ئەو دوو ڕوخسارە بکەیت.

کەواتە پەیوەندی نێوان پەرداخ و دو ڕوخسارەکە، هەمان ئەو دوو پەیوەندیەیە لە نێوان کاتی ئێستامان و ژیانمان لە دونیا و مەنزڵی هەتا هەتایی قیامەت و دوا ڕۆژمان و نیشتیمانی ڕاستەقینەمان.

نەبینینی تۆ بۆ یەکێکیان نەبوونی ناگەیەنێت.

## ستەمی لە ژنەکەی کرد دۆزەخی بینی

  

شەڕی بوو لەگەڵ ژنەکەی، ماوەیەکی زۆر بوو هیچ لێبوردنێکیان بەرامبەر یەکتر نەبوو، ڕۆژی هەینی بوو، دەیویست کوڕەکەی ببینێت، خێرایی ئۆتۆمبێلەکەی زۆر زیاد کرد هەتا زوو بگاتەماڵەوە، بەشێك لە خێراییەکەش وابەستەی ڕق ئەستوری بوو لە ژنەکەی، بەسەر گڵەکەدا دەڕۆشت ویستی ئیستۆپ بگرێت، بەڵام ئیستۆپی نەمابوو، خێرایی زیادی کرد و وەرگەڕا...

لە ئۆتۆمبیلەکەی دەریان هێنا حاڵی زۆر خراپ بوو، خستیانە ئیسعافەکە و ژنەکەی لەگەڵی ئامادە بوو...

دەڵێت: لە ئیسعافەکەدا دوو فریشتە نزیکبوونەوە لێم و چاوم پێیان کەوت، ویستم بە خێزانەکەم بڵێم ئەوە دوو فریشتەیە هاتوون ئایا تۆش وەك من دەیانبینیت!!

بەڵام دوو فریشتەکە ئاماژەیان بۆ کردم کە بێ دەنگ بم، ئیتر توانای قسە کردنم نەما.

دوای ئەوە خێزانەکەی دەست دەکات بە گریان، چونکە وای بینی کە مێردەکەی مردووە.

دوو فریشتەکە لەگەڵ خۆیان بردیان و لە شوێنێکی تر خۆیان بینیەوە، ئەو شوێنە ژمارەیەکی ئێجگار زۆر خەڵکی لێ بوو. شێوەیان وەك فریشتە بوو، یەك پارچە نورانی و سپی پۆش بوون، پزیشکەکە داوای لێبوردنی کرد لە ژنەکەی کە هیچی بۆ ناکرێت!! چونکە مێردەکەی کۆچی دوایی کردووە.

ژنەکەی دەیوت: مێردەکەم نەمردووە.

گوێی لە دەنگی گریان و وتەکانی ژنەکەی بوو، بەڵام فریشتەکە ڕێی لێ گرت کە سەرقاڵی جەستە و خێزان و دونیا بێت، هەموو ئەو ژمارە زۆرەی خەڵکی سەرقاڵی نزا و پاڕانەوەیەك بوون و ڕوویان لە نوورێکی زۆر گەورە بوو!

لەسەر زەویش جەستەکەی برا بۆ تەرمانە، ئەویش لە جیهانێکدا بوو، لەسەر زەوی وێنەی نەبوو لە جوانیدا.

کۆشکەکان زۆر نایاب تر بوون لەوانەی سەر زەوی، ئاسایی نەبوون، کۆشکەکان وەك زیندوو بن وابوون.

گوڵەکان سەمایان دەکرد لەگەڵ دەنگی مۆزیکدا، دەتوت هەموویان دروشمێك دەڵێنەوە، بەیەکەوە تەسبیحاتێکی زۆر سەرنج ڕاکێشی خوای گەورەیان دەکرد.

فریشتەکە پێی وت: ئێستا سەردانی دۆزەخ دەکەیت.

ئایا دەرگاکانی دۆزەخت بینیوە؟!

فریشتەکە دەستێکی بەرز کردەوە و، کاتێ دەستی داهێڵا دەرگاکانی دۆزەخ کرانەوە، گوێم لە دەنگ و هاوار و ناڵەی زۆر ترسێنەر بوو، زریکە و گریان، دەنگیان ترس و بیم و سزایەکی سەختی پیشان دەدا.

ڕووناکیەك لە فریشتەکەوە دەرچوو، هەموو ئەو تاریکستانەی دۆزەخی ڕووناك کردەوە، خەڵکانێکی زۆر زۆرم بینی، بە پێچەوانەی ئەوەی کە لە بەشەکەی تر بینیم، شکڵ و شێوەیان ئەوەی پیشان دەدا کە لە هەموو چین و نەتەوە و زوبانێکی تیا بوو، هەر یەکێکیان لە سزای خۆیدا دەتلایەوە و لە جۆرە بازنەیەکدا بوو تایبەت بە خۆی بوو، سزایان هەتا هەتایی بوو، نەشیان دەتوانی پەیوەندی بەوانی ترەوە بکەن، یان پەیوەندی بە خەڵکی دونیاوە بکەنەوە!!

ئەو خەڵکە گۆشتیان پێوە بوو، بەڵام خوێنیان لێ نەدەچۆڕا، دەسوتان بەڵام ئاگرێکی سوریشم نەبینی.

هەندێکیان گۆشتی خۆیانیان دەخوارد، ئەوەشیان بە ڕشانەوە هەڵدەهێنایەوە، جارێکی تر گۆشت و پێستیان بۆ دروست دەبوویەوە...

گێژاوی ئەو سزایە بەردەوام بوو بەبێ کۆتایی.

ئەوانەی گۆشتی خۆیانیان دەخوارد جادوگەرەکانی دونیا بوون، ئەوانەی گۆشتی خەڵکیان دەخوارد لە دونیا، ئێستا گۆشتی خۆیان دەخۆن بۆ هەتا هەتایە.

مرۆڤ ڕێز لێ گیراوی خوایە، بە دەستی خۆی، خۆی فڕێ دەداتە ڕەشایی هەتا هەتایی دۆزەخ.

ئەو شوێنە شوێنی سزا دانی شەیتانەکانە و زۆر ترسناکە، جێی داخە مرۆڤ بیرێك ناکاتەوە.

ئەو فریشتەیش شتێکی زۆر ترسناکی بە من وت:

وتـی: ئەگەر کیتـابی ژیانـت ئەمـڕۆ دابخـرایە ’بمردیتـایە‘ ئەوە ئەم شـوێنە جێگـا و مەنزڵی تۆ دەبوو!!

تۆ نکۆڵی لەگەڵ ژنەکەت نواند و لێی خۆش نەبوویت.

تۆ داوا لە خوا دەکەیت لێت خۆش بێت، بەڵام تۆ لەو خۆش نەبوویت، ئەگەر خـوا لێت خۆش نەبێت، بەری ڕەنجی خۆت وەردەگریتەوە.

بە تەواوی بـۆم ڕوون بـوویەوە کە حـوکمی خـوایی زۆر دادپەروەرانەیە و سـتەم لە هیچ کەسێك ناکرێت، ئەگەر چی بە چوونی منیش بێت بۆ دۆزەخ.

مـــن و ڕق و کیـــنە و ســـتەمم هەڵگرتبـــوو بەرامـــبەر ژنەکەم. پەیوەنـــدیم لەگەڵ پچڕاندبوو، شەوی هەینی بوو، چەندە لە دەرگای ژورەکەی دام بۆم نەکردەوە...

بـۆ بەیـانیەکەی سـڵاوی لـێ کـردم وەڵامـم نەدایەوە، لە مـاڵ چـوومە دەرەوە و لە گەڕانەوەمدا ئەو ڕووداوەم بەسەرهات.

فریشتەکە پێی وتـم: ژنەکەت داوای لێبـوردنی لـێ کردیـت، بەڵام تـۆ لێـی خـۆش نەبوویت، وەڵامت نەدایەوە.

من بیرم دەکردەوە تۆڵە لە ژنەکەم بکەمەوە!!

من کەسێکی خراپ بووم و دۆزەخ ڕایچڵەکاندم.

ئەو شوێنەی من بینیم لە دۆزەخ بۆ هیچ کەس ناشێت، بە مەرجێ خاوەنی تۆزقـاڵێ لە مرۆڤێتی بێت.

ئەگەر خوای گەورە بیەوێت کەسێ بخاتە دۆزەخەوە، هیچ کەس ناتوانێت ڕێی لـێ بگرێت.

کاتێك من و فریشتەکە قسەمان دەکرد، خەڵکیان بە هەزاران دەهێنـا و فڕێیـان دەدانە شـیوە قوڵەکـانی دۆزەخەوە، خێـزانەکەم پێـی وتـم: سـێ ڕۆژ لە مەیتخـانە مـایتەوە، شەهادەی وەفاتیان بۆ کردی، دوای ئەوە جوڵایتەوە و هۆشـت هـاتەوە، بـاش بـوو کە نەمان ناشتبوویت!!

ئەوە بـوو گەڕامەوە هەتـا خـۆم چـاك بـكەم و كارەسـاتەكانی دۆزەخ بـۆ خەڵكـی بگێڕمەوە و، جوانیەكانی بەهەشتیشیان بۆ بەیان بكەم!!

## لەوێ گەیشتم بە خزمەتی حەزرەتی موحەممەد مصطفى ﷺ

لە ساڵی (٢٠١٣) ئەزموونی نزیكی مردنم بینی، كاتی مناڵ بوونم بـوو، سـەعات نۆی شەو بوو هەستم بە ئازاری مناڵ بوون دەكرد، مێـردەكەم و خەسـوم لە لای سـەرم ڕاوەستابوون، ئـازارم زۆر بـوو، لەتـاو ئـازار بـێ هـۆش كەوتبـووم، چەنـدیان بانـگ كردبووم ئاگام لێ نەبوو بوو، هەستم كرد جەستەی خۆمم بەجێ هـێڵا، لە تـونێلێكەوە ڕۆشتم و گەیشتم بە شوێنێك كە زۆر دڵگیر و ڕووناك بوو، هەسـتم كـرد خەم و پەژارە و ترس و ئازار هیچیان نەمان، هەستم بە هێمنی و ئارامی و ئاسودەیی دەكرد، كـاتێكم زانی كەسێكی زۆر زۆر جوان و نورانی هات، لە نـاخی خۆمـدا هەسـتم كـرد كە ئەوە حەزرەتـی مـوحەممەد المصـطفى یە ﷺ قسـەی لە خزمەتـدا دەكەم، نـاتوانم وەصـفی جوانی و هەیبەتی بكەم، بەڵام دەزانم چی پێ وتم، فەرمووی: ئەو ژیانەی كە دەیـبەنە سەر و لە دونیادان بایەخێكی نیە، بێجگە لەوەی كە شوێنی تاقی كردنەوەیە.

ئەوەی كە ئێستا دەیبینیت لە ژیانی بەرزەخ، بێ كێشەیە و زۆر چێژ بەخـش و دڵگیـر و بێ وێـنەیە، هەرگیـز كێبەركـێ ناكرێـت بەوەی كە خـوای گەورە بـۆ هەچ كەسـێكی ئامادە كردوە لە بەهەشـت و ڕەزامەنـدی خـوا، بە مەرجێـك پابەنـدی ئـاین و بـاوەڕ و ئیسلام بێت.

پێی وتم: نزیك به له خـوا، نزیـك به له ئیسـلامەوە.

پاشـان حەزرەتـی مـوحەمەد ﷺ فەرمـووی: نامەوێـت لەمەودوا تـۆ بە گومـان بیـت دەربارەی ئیسلام.

ئارەزوویەکی زۆرم هەبوو بمێنمەوە لەو جیهانە فراوانە.

بەڵام حەزرەتی موحەممەد ﷺ فەرمووی: هێشتا کاتت نەهاتووە.

لە دوای ئەوە سـەرتاپا سـپی نـورانی زۆرم بینـی، کە لە دەورمـان بـوون، سـەیری خوارەوەیان دەکرد، کاتێـك سـەیری منیـان دەکـرد، مـن ئەوەنـدە بچـووك بـووم، وەك گەردیلەیەك بووم لە چاو گەورەیی ئەواندا.

دەیان زانی ئێمە لە دونیا چیمان کردووە، لە دوای ئەوە گـوێم لە بانـگ بـوو، بانـگ کردن بوو بۆ نوێژ.

حەزم دەکرد بمێنمەوە و مناڵەکانم لە دونیا بەجێ بهێڵم، بەڕاستی مـن ئامـادە بـووم ئەم ژیانەی دونیا بەجێ بهێڵم، تەنها لەبەر ئەوەی بمێنمەوە و نەیەمەوە بۆ دونیا.

بەڵام حەزرەتـی مـوحەمەد ﷺ رووی وەچەرخانـدم بەرەو تـونێلەکە و خەڵکـێکم بینی، وا هەست دەکەم کە دانیشتبوون و قورئانیان دەخوێند، زۆر دڵخۆش دیار بـوون، کـاتێ دەگەڕامەوە بـۆ دونیـا، لامـدەکردەوە و ئەوانـم دەبینـی کە بەردەوام قورئانیـان دەخوێند، هەتا وردە وردە لێیان دور کەوتمەوە.

لە دورەوە حەزرەتی موحەممەدم ﷺ بینی کە دەیفەرموو: زۆر جـوان لە بیـرت بێـت، لە خوای گەورە نزیك ببەرەوە.

وردە وردە گەڕامەوە ناو جەستەی خۆم.

گوێم لێ بوو خەسووم بە دەنگی بەرز بانگی لێ دەکردم.

هەر ئەوەندەی چاوەکانم بەرز کردەوە، بە دەنگی بەرز هاوارم کـرد 'الله اکـبر'، سـێ جار وتم: الله اکبر، الله اکبر، الله اکبر، هەسـتم کـرد خـوای گەورە ژیـانێکی نـوێی پـێ

بەخشیمەوە، فرسەتێکی تری پێ دام هەتا ژیان بە شێوەیەکی تـر بـبەمە سـەر، مـن ئەو کاتە لە ئوسترالیا دەژیام، مامانەکەم نەیدەزانی چـی ڕووی دا، لە شـوێنی خـۆی واقـی وڕما بوو، پێی وتم: ئەوە تۆ چی دەڵێیت؟

مێردەکەم تووشی تەریق بونەوە و ئیحراجی بـوو، وتـی: ئەوە دوعـا دەکـات. دوای ئەوە مناڵەکەم بوو، وێلاشەکەش ئاڵا بوو لە ملـی منـاڵەکە و شـین بووبـوویەوە، ئەگەر دوا بکەوتمایە دەخنکـا و دەمـرد، خێـرا مامـانەکە ڕێـڕەوی هەناسـەی منـاڵەکەی پـاك کردەوە و کچەکەم لە مردن ڕزگاری بوو.

ژیانی دونیا تاقی کردنەوەیە و، جێ بەجێ کردنی داواکاریەکانی شەریعەتی ئیسـلام خۆش بەختیە و زیندان نیە!

بەملاو ئەولادا مەڕۆن و ئیسلام و ئیمان بکەنە ڕۆشنایی ڕێتان ڕزگارتان دەبێت.

من پێش ئەزموونەکەم، بەهۆی چالاکی گروپە توندڕەوەکانەوە گومانم بـۆ دروسـت بوو بوو دەربارەی ئاین و بە تایبەتیش ئیسلام، ڕاگەیاندنە جیاوازەکانیش ئەو گومانەیان بۆ من زیاتر کرد، لە دڵی خۆمدا دەموت: ناکرێ ئیسلام وەك ئاینی خۆم قبوڵ بکەم!!

بەڵام دوای ئەوەی بە خزمەتی محمـد المصـطفی ﷺ گەیشـتم و فەرمـووی دونیـا شوێنی تاقی کردنەوەیە و بەس.

نابێت گومانت لە ئیمان و ئیسلام هەبێت، ئیتر مـن لە دوای ئەزمـوونەکەم بە ئـیمان و عەقیـدە و قەنـاعەتێکی تـرەوە هـاتمەوە، دڵنیـا بـووم کە نابێـت بـاوەڕ بە واتەوات و درۆی ڕاگەیاندنەکان بکەم دەربارەی ئیسلام و دژایەتی ئیسلام بکەم!!

ڕاگەیاندنە زەبەلاحەکانی دونیا و بە کرێ گیراوەکانیان ڕاستیەکان دەشێوێنن.

کە مـرۆڤ حەق و ڕاسـتەقینەی ناسـی نابێـت شـەرم بکـات لە گەیانـدنی بە خەڵکی تر.

ئارامگرتن لەسەر بەڵاکان بگرە، ئیسلام و ئیمان شایەنی ئەوەن هەمـوو شـتێکیان لە پێناودا قبوڵ بکەیت.

لە ئەزموونەکەمەوە تێ گەیشتم، بە تەنها پرسـیارم لـێ دەکرێـت، کـرداری خـۆم لە گەردنی خۆمدایە و وابەستەی کردەوەی خـۆم دەبـم، لە پێشـترینێك کە کـاری لەسـەر بکەم نەفسی خۆمە.

کاتێك لە ئەزموونەکەم گەڕامەوە بڕیـارم دا باڵاپۆشـی بـکەم و شـانازی بە ئـیمان و ئیسلامەکەمەوە بکەم.

## طۆنی

شەوێکیان ڕۆشتم بۆ دەریا و لە قوڵایـدا مەلەم کـرد، 'قەنـدیلی دەریـا' پێـوەی دام، وەك ئەوە بوو کارەبایەکی بەهێز بتگرێـت، ئـازارێکی سـەختی هەیە، مـرۆڤ بە چەنـد دەقەیەك گیان لە دەست دەدات. من گەنج بووم و مولحید و بـێ دینـیش بـووم، هـیچ زانیاری و ئیمانێکی پێش وەختەم نەبوو، بۆ زیندوو بوونەوەی دوای مردن.

لە ئیسعافەکەدا زانیم زۆرم بە دونیاوە نەماوە.

لەناکاو ڕۆحم لە جەستەم جیـا بـوویەوە و، دەم و دەسـت لە ناوەڕاسـتی دۆزەخـدا خۆم بینیەوە، لە دۆزەخدا بە پێوە ڕاوەستابووم.

وتم: ئەمە چۆن بوو؟ چۆن ڕووی دا!!

چۆن من لە دەرەوەی جەستەی خـۆمم، هەسـتم دەکـرد شـتێك لە لای ڕاسـتمە، لە پێشـمەوە چـاوێکی نەبیـنراو هەیە، وەك ئەوە بـوو شـتێك پشـکنینی بـۆ مـن دەکـرد، چاودێریم دەکات بەبـێ ئەوەی مـن بە خـۆمم زانیبێـت، تـاریکی داگیـری کردبـووم،

پرسیارم لە خۆم دەکرد من لە کوێم، گوێم لە دەنگێك بوو وتی: بێ دەنگ بە و چرکە مەکە، تۆ شایستەی ئەوەیت کە لێرە بیت، تۆ لە دۆزەخدایت!!

هەستم کرد لە ناوەڕاستی شوێنێکی ناو دۆزەخدام، ئینجا ڕووناکی و نورێك دەرکەوت، جەستە تەنکەکەم بەرز بوویەوە بۆ ناو محبەت و ڕووناکی بێ سنور، لە سەرەوەبوو لە خۆمم پرسی: ئایا ئەمە ڕاستەقینەیە، بەڕاستی ئەمە لە مندا ڕوودەدات، کەوتمە ناو تونێلێکەوە، ئەو نورە سەرچاوەکەی لەناو تونەیلەکەدا بوو... کە دەڵێم سەرچاوە واتە بێ سنور و کۆتایی...

پاك بوومەوە و شەرم تێدا نەما، پرسیارم کرد کە ئایا کەسێك لەناو ئەم نورەدا هەیە؟

یەکێك وەڵامی دامەوە، زانیم هەمان دەنگ بوو کە لە ئیسعافەکەدا گوێم لێ بوو، پێی وتم: دەتەوێت بگەڕێیتەوە؟

ئەگەر دەتەوێت بگەڕێتەوە دونیا دەبێت بە تەواوی بگۆڕێیت...

پێی وتم: خوای گەورە نوری زەوی و ئاسمانەکانە، ئیتر مەچۆرەوە سەر ڕێگای تاریکی و گومڕایی.

وتم: خودایە ئەم هەموو خۆشەویستی و میهرەبانیە چیە بەرامبەر من، من شتێکم لە دونیادا نەکردوە، هەتا شایستەی ئەم لێبوردەییەی تۆبم، من لە دونیادا هەموو گوناهێکم کردوە، من مەی خۆر بووم، تلیاك کێش بووم، من دەچوومە یانە شەوانەکان و خراپەکار بووم.

دوای ئەوە دەروازەیەکم لێ کرایەوە بەسەر باخچەیەکدا.

خۆم لە شوێنێکی زۆر جواندا بینیەوە، هەستم کرد لە دەرگای ئەبەدیەت و هەتا هەتایدام.

ئەو شوێنە درەخت و گوڵ و ڕووەك گیان و ڕووناکیان تیابوو، وزەیەك لەو جیهانەدا هەبوو سەرسام و تێرامانی دەکردی.

ڕووبارێکم بینی ئاوێکی ڕوون و جوان هەبوو، درەختێکی زۆر لە کەنارەکانی شاخەکەدا هەبوون، ئاسمانێکی زۆر جوانی شینی بێ تەم و غوبار!!

وتم: ئەمە بەهەشتە، ئەوە گەڕامەوە بۆ ماڵی خۆم بە هەمیشەیی، ویستم بچم بەرەو پێشەوە، بەڵام نەیانهێڵا و ئەو پەنجەرەیەیان لێ داخستم و، من لەو کاتەدا لە تەرمانە بووم و هۆشم هاتەوە، کە لە هەمان کاتدا بەتەمابوون منی مردووی جەستە شیکاریم بۆ بکەن و توێ کاری جەستەکەم بکەن!!

ئیتر گەڕامەوە بۆ دونیا.

## ئەو ژنەی لە ژێر چل مەتر ئاودا ئەزموونەکەی بینی



'فلۆرانس' ئەو ژنەیە، کە لە 'کۆرسیکا' بۆ مەلەی قوڵایی دەریاکان ڕۆشت، کە حەزی بەردەوامی ژیانی بوو. لەگەڵ هاوڕێکانی بڕیاری چوونە قوڵاییان دا، لە تاریکایی دەریادا بوون، چوار کەس بوون.

فلۆرانس دەڵێت: من لە دوای ئەوانەوە بووم، هەستم کرد ئۆکسجین هەڵنامژم، ئاوی سوێرم دەخواردەوە!!

بەردێکم هەڵگرت کێشام بە بتڵی ئۆکسجینەکەدا هەتا دەنگێ دروست بکات و پێم بزانن کە حاڵم باش نیە و ناتوانم هەناسە بدەم، دەستیشم خستە سەر ملم هەتا بزانن کە من ناتوانم هەناسە بدەم، یەکێکیان هات و ئۆکسجینی خۆی پێ دام، ئەو هەناسەی بۆ دەدرا لە ئۆکسجینەکەی منەوە، کەچی من لەوەی ئەویشەوە نەم دەتوانی هەناسە بدەم، هەموو ئەمانە بە خێرایی ڕوویان دا، سەیری سەرەوەم کرد زۆر دوور بوو، چل مەتر ئاو لە سەرمەوە بوو، دڵنیا بووم ناتوانم ڕزگارم ببێت، لەناکاو یەکێك لە مەلەوانەکان ئامێری ڕێکخستنی فشاری ئۆکسجینی یەدەکی کە بەکاری دێنن خستیە سەر دەمم بۆ جاری سێهەم، بەڵام هەمدیسان ئاوی سوێرم هەڵمژی، بە خۆمم وت:

فلۆرانس تۆ مردویت، بەڵام کاتێکم زانی لێشاوی ڕەحمی خـوایی هـات بە هانـامەوە، کە پڕی بوو لە خۆشەویستی!!

لە جەســتەی خــۆم دەرچــووم، هەروەك چــۆن پــولێکی بەریــدی لە بەرگەکەی دەکەیتەوە!

خۆم لە تەنیشتی جەستەکەمەوە بینیەوە، بینینم زۆر بەهێز بـوو، لە هەمـوو لایەکەوە دەمبینی، ڕۆیشتمە ناو تەم و مژێکەوە، هەستم بە ئەمـان و پشـویەکی گەورە دەکـرد، لە کاتێکدا من لە ژێر چل مەتـری دەریـاوە دەمـردم، کەوتمە نـاو هێمنـی و دڵئـارامیەکی گەورەوە، دەنگێك پێی وتم: دەتوانی جارێکی تر سـەیری جەسـتەی خـۆت بکەیـت. ئەگەر بتەوێت، بینیم دەریاوانەکان هەوڵیان دەدا جەستەم بێتەوە هۆش خۆی و بە ئاگـا بێمەوە، دوو دەستی زۆر گەورە بردمیان بـۆ نـاو تونێلێـك، بـاپیرمم بینـی، پێـی وتـم: فلۆرانس لەم ڕێگەیەوە وەرە، ئینجا ڕۆشتم، ژوورێکی زۆر گەورەی لـێ بـوو، شـوێنی دانیشــتنی لــێ بــوو، پاشــان بــوونەوەری نــورانی دەرکەوتــن و لەســەر کورســیەکان دادەنیشتن.

یەکێکیان لە ناوەڕاستدا بوو، سەیری کردم و وتی: چیت لێ بکەین؟!

وتم: دەمێنمەوە و ناگەڕێمەوە بۆ دونیا، لە کاتێکدا من سێ منـداڵ و مێـردم بەجـێ هێڵا بوو، سەیر ئەوەیە لەو کاتانەدا بیر لە کەسی بەجێ ماو ناکەیتەوە.

کەمەنـد کێشـی ئەو جیهـانە ئـارام و پـڕ لە ئاسـودەییە دەبیـت، کە دەچیـتە ئەوێ دەتەوێت هەتـا هەتـایە لە دەسـتی نەدەیـت، ئینجـا نورانیەکـان منیـان بـردەوە بـۆ نـاو جەستەکەم، لەو کاتەدا پـانزە مەتـرم مـابوو بـۆ سـەرەوەی دەریـا، کە ڕۆح و جەسـتەم بوونەوە بە یەك، لە تەوقی سەرمەوە داخڵیان کردمەوە، هەستم بە ئـازارێکی تونـد کـرد، وەك ئەوەی دەست بکەیت بە دەستکێشێکدا و بچووك بێت، ئینجا چاوەکانم کردەوە.

بینیم هاوڕێکـانم مـن سـەردەخەن بـۆ سـەرەوە، زۆر سەرسـام بـووم، چـۆن بەبـێ ئۆکسجین لە ژێر پەستان و ئاوێکی زۆردا نەمردم.

ئەم ئەزموونە بە شێوەیەکی بەرفراوان ژیانی منی گۆڕی.

# ڕابردوو و داهاتووم وەك یەك دەبینی

وەختێ لە قوتابخانەوە دەگەڕامەوە ماڵەوە، وتم: بۆچی بە نێوان ئۆتۆمبیلەکاندا نەپەڕمەوە ئەوبەری شەقامەکە!

هەندێك سەیارەم تێپەڕاند و ئۆتۆمبیلێك بەخێرایی هات و خۆی پێداکێشام.

دیمەن و ژیان و جۆری ژیانم دەست بەجێ گۆڕا، نازانم چۆن ڕووی دا، بینیم جەستەیەك لەسەر شەقامەکە دوور دەخەنەوە بۆ سەر شۆستەکە، ئەوە لە من دەچێت، ئەوە منم.

لە دیمەنێکی تردا دایکمم بینی لە نزیکی جەستەکەمدا دەگریا، پێم سەیر بوو، چونکە من زۆر باش بووم!!

من ئازاد بووم لە جەستەکەم و هیچ کێشە و ئازارێکم نەمابوو، کەسێك لە تەنیشتمەوە بوو، زۆر ئاشنای بووم، نیگەران و بێزار نەبووم لێی، کە دەڕۆیشتم لام دەکردەوە بەملاو لایدا، سەیری چاوەکانیم دەکرد، بەڵام تەرکیزم لەسەر ڕوخساری نەبوو، بینیم جەستەمیان خستە ناو ئەمبولانسەکەوە.

لەو کاتەدا من وتو وێژم دەکرد لەگەڵ ئەو کەسەی لە تەنیشتم بوو، دەمزانی من ئەو کەسە لە مێژە دەناسم، تەنانەت پێش ئەوەی لە دایك ببم و بێمە ناو جەستەی مادیەوە.

هەستم کرد پێش ئەوەی ئەم گەردوونە دروست ببێت من ناسیومە، سەیر ئەوە بوو بە ناوێکی جیاواز لە ناوی دونیاییم بانگی لێ کردم، منیش زانیم ئەو ناوە ناوی منە!!

پێی وتم: وەرە لەگەڵم، هەستم کرد ڕابردو و داهاتوو وەك یەك دەبینم، خۆم بینیەوە لە بەردەم کتێبێکی گەورەی سوردا، وتی: سەیری بکە!!

یەکەم جار زەحمەت بوو بەلامەوە کە لێی تێ بگەم.

که سەیری کەسەکەم کرد ئاسان بوو بەلامەوە کە کتێبەکە بخوێنمەوە، هەر چەندە سەیری ئەوم بکردایە ئاسانتر دەبوو لە لام.

وێنەی جوڵاوی ڕەنگا و ڕەنگ کرایەوە، یەکەم جار بوو وەك 'تەلەفزیۆنی ڕەنگاو ڕەنگ' وێنەی جوڵاوی ڕەنگاو ڕەنگ ببینم، چونکە هەتا کاتی ئەزموونەکەی من تەنها تەلەفزیۆنی ڕەش و سپی هەبوو.

وێنای ڕابردوو و داهاتووم زۆر بینی، داهاتووی زۆرم بینی، بەڵام نامەوێت لەمەودوا قوڵ ببمەوە تیایدا و لەسەری بدوێم!

شتانێکم بینی گرفتی دوا ڕۆژ بوون و، چارەسەرەکانیشیانم پیشان درا.

من وای دەبینم مرۆڤایەتی ئامادەی ئەو گۆڕانکاریانە نیە لە داهاتووی نزیکدا ڕوو دەدەن، هەستم دەکرد لە ماڵی ڕاستەقینەی خۆمدام و هەموو شتێك سروشتیە.

بەربەست و بازگەیەك هەبوو، ویستم تێی بپەڕێنم، بەڵام ڕێگەم پێ نەدرا، کاتێ گەڕێنرامەوە خۆم لە نەخۆشخانەدا بینیەوە، بە دایکمم وت: کەوا چیم بەسەر هاتووە!! هەموو ئەزموونەکەمم بۆ گێڕایەوە...

دایکم زۆر سەری سوڕما و وتی: مەیگێڕەرەوە!!

## دایکم لە ئاگر ڕزگار بکە

من ناوم ساندی‌یە، پێنج ساڵان بووم، دەریاچەیەك لە نزیکمانەوە هەبوو، بە هۆیەوە تووشی جۆرێك لە هەوکردنی مێشك بووم، بوو بە هۆکاری ئەزموونی نزیکبوونەوە لە مردنم، بەناو تاریکایەکدا ڕۆشتم، بەڵام زۆر دڵئارام بووم، هەتا ئەوە بوو گەشتمە ماڵی ڕاستەقینەی خۆم، کەوتمە ناو ڕوناکیەکەوە، هەستم بە خۆشەویستی و چێژی بێ سنور دەکرد.

له دونیادا دایکم و باوکم به هیچ جۆرێك باسی خوای گەورەیان بۆ نەکردبووم، هەستم کرد لە خزمەتی پەروەردگاردام، نورێکی خوایی ڕووی تێ کردم، ئینجا ڕووناکیەکی بچووك ڕووی تێ کردم، کچێکی منالّ بوو، تەمەنی دە سالآن دەبوو، تا ئەندازێك لە من دەچوو، ئەو منی دەناسی، باوەشی پیا کردم، پێی وتم: من خوشکی تۆم و ناوم 'سمیت'ە، 'سمیت'ی خوشکم وتی: دایکم و باوکم دەیانویست لەمەودوا باسی منت بۆ بکەن، سەری ماچ کردم، هەستم بە خۆشەویستی و گەرمی و موحیبەتی کرد، پێی وتم: ساندی دەبێت بگەڕێیتەوە بۆ دونیا، تۆ دایکم لە ئاگر ڕزگار دەکەیت، ئەمەی کە پێم وتی بە هەند وەری بگرە. زۆر ڕووی خۆش بوو لەگەڵم.

وتم: نا... نا... نامەوێت بگەڕێمەوە بۆ دونیا، دەمەوێت لێرە بم، ئەویش بە نەرم و نیانی پێی وتم: ئاخر تۆ دایکمان لە ئاگر ڕزگار دەکەیت، هاوارم دەکرد ناگەڕێمەوە، لە پاشان دایکم و باوکمم بینی لە دەوری جێگاکەم و لاشەکەم بوون لە نەخۆشخانە، ترس و خەم پەرێشانی کردبوون و دەگریان.

'جیلین'ی دراوسێمان دەرکەوت، کە منی بینی وتی: ساندی بگەڕێرەوە، دەبێت ئێستا بگەڕێیتەوە، ئیتر خێرا گەڕامەوە بۆ ناو جەستەکەم، من دایکم و باوکم لە بەهەشتەوە چۆن بینی هەر بە هەمان شێوە بوون لە نەخۆشخانە، کە چاوم کردەوە سەرەتا ئەزموونەکەم بۆ گێڕانەوە، وتیان: خەونت بینیوە ئیتر وازم هێنا و بە درێژی نەمگێڕایەوە.

کاتێك گەڕاینەوە بۆ ماڵەوە، باوکم و دایکم وتیان ساندی کاتێك تۆ بێ هۆش بوویت 'جینی' دراوسێمان مرد، پیرە پیاوێکی زۆر خۆشەویست بوو، منالآنی زۆر خۆشدەویست لە ماڵی ئەوان یاریمان دەکرد، خواردن و یاری پێشکەش دەکردین، منی زۆر خۆشدەویست، کاتێ من لەوێ بینیم زۆر سەرسام بووم، کاتێك پێیان وتم مردووە بە تەواوی سەرسام بوم، چۆن خێرا لەوێ بینیمەوە، کاتێ بۆ دایکم و باوکم باسی خوشکەکەمم گێڕایەوە سەریان سوڕما، پێیان وتم: بەڵێ ئێمە کچێکمان هەبوو

بە هۆکاری ژەهراوی بوونەوە، ساڵێك لە پێش لە دایـك بـوونی تـۆ مـردووە، بڕیاریـان دابوو بە من و براکەم نەڵێن هەتا گەورە دەبین.

وتەی خوشکەکەمم بیر کەوتەوە کە وتی: دایکم لە ئاگر ڕزگار بکە.

هەتا ئێستا نازانین مەبەستی چی بووە!!

ڕەنگە لە داهاتوودا ڕوون بێتەوە بۆمان!!

## مێژووی گەڕانەوەی بۆ نیشتیمان نووسی بوو



خێزانی 'طۆنی' کە ناوی 'پات'ە دەڵێت: لە باشوری فلۆریـداوە گەشـتمان کـرد بـۆ شاری 'ملیلیۆکی' هەتا نەشتەرگەری بۆ دڵی 'طۆنی' بکەین.

نیوەڕۆ بوو نەشتەرگەریەکەی دەستی پێ کرد، پزیشـکەکان جـارێکی تـر دڵیـان بـۆ کردەوە، چونکە خوێن بەربوونی هەبـوو، لە کـاتی نەشتەرگەریەکەشـدا تووشـی نـۆبە بوو، بۆ ماوەی سێ خـولەك ژیـانی بەجـێ هـێڵا، سـوپاس بـۆ خـوا نەشـتەرگەریەکە سەرکەوتوو بوو گەڕایەوە بۆ ژیان. لێرەوە ئەموونەکەی دەستی پێ کرد.

'طۆنی' دەڵێت: خۆم بینیەوە لە بەردەم پزیشکە نەشـتەرگەرەکاندا کە نەشـتەرگەریان بۆ کردم، ڕاوەستا بووم و سەیرم دەکـردن کە ئەوان هەوڵـی ڕزگـار کردنـی منیـان دەدا، لەناکاو خۆم بینیەوە، دەمزانـی کە چ شـتێك ڕوودەدات، لە چـاو تروکانێکـدا خـۆم لە ژوری چاوەڕوانیدا بینیەوە، خێزانەکەم بە گریانەوە پەیوەندی دەکرد بە کەس و کـارەوە، زۆر بە کوڵ دەگریا، زۆر جوان دەمبینی، بیرم لە هەچ شـوێنێك بکـردایەتەوە دەمتـوانی خێرا بچمە ئەو شـوێنە، هەمـوو نـامە پۆسـتەکانم بینـی کە خـزمەت کارەکەمـان وەری گـرت، بە تەواوی و زۆر بە وردی دەمزانـی چـی لە نامەکانـدا نـوسراوە، دەمزانـی لە گۆڤار و ڕۆژنامەکان چی نوسراوە.

من لەو جیهانەدا کۆمەڵێك دەرگام بینی.

هەموو ژیانی خۆم پیشان درایەوە، هیچ ون بوونێك نیە بۆ هەست و خەیاڵ و کردار و نیەت و ئاکاری هیچ کەسێك!

هەموو ورد و درشتێك لە تۆمارێکی زۆر وردا یاداشت دەکرێت.

فریشتەیەکم لەگەڵ بوو، وەك ڕێبەرێك بوو بۆ من، ڕۆشتین بە لای دەرگایەکدا زەنگێکی هەبوو، لە زەنگەکەم دا، نورانیەك هات و دەرگاکەی کردەوە.

وتی: من چاوەڕوانی تۆ بووم!!

بردمیە ژورەوە، کەوتە گەڕان بەناو کتێبێکی زۆر گەورەدا، بۆ ناوی من دەگەڕا، بۆنێکی زۆر خۆشم هەست پێ کرد، هیچ ئازارێکم نەمابوو، زۆر دلخۆش بووم، گوڵ و گوڵزار و ڕووبار و تاڤگەی ئاو و شاخ و باخ و بێستان، هەستم کرد چوار کەسی تر جل و بەرگی سپیان پۆشی بوو، هەوڵیان لەگەڵ من دەدا هەتا سەرکەوم بەسەر چیاکەدا، زۆر هەوڵم دا، بەڵام نەمتوانی، فریشتەکە پرسیاری لێ کردم: ئایا هیچ کێشەیەك هەیە؟ دەتەوێت بگەڕێیتەوە؟

لە کۆتاییدا پێی وتم: طۆنی تۆ کار و ئەرکت لە دونیادا ماوە دەبێت تەواویان بکەیت!!

وادەیەکی دیاری کراویشی پێ وتم!!

ژنەکەی طۆنی دەڵێت: لە لای من نەیوت ئەو فریشتەیە چی پێ وتووە، لە دوای ساڵ و نیوێك طۆنی کۆچی دوای کرد، کە ژورەکەیم پاك کردەوە، پارچە کاغەزێکم بینی مێژووی نزیکبوونەوەی مردنی خۆی نوسیبوو. مێژوی گەڕانەوەی بۆ نیشتیمان.



# ئەزموونی ڕانیڵ زۆر سەیرە!!

ڕانیـڵ دەڵێـت: لە سـاڵی (١٩٨٥) لەسـەر فڕۆکەیەکـی بچـوك گەشـتمان دەکـرد، کەوتینە ناو گەردەلولێکی بەفر، لە ناوچەی 'پوتا'، لە پاڵ چیایەکدا کەوتینـە خـوارەوە!! ئەوە بوو(٧٥٪) جەسـتەم سـووتا، هەر چۆنێـك بێـت بە سـوتاوی سـەرکەوتمە سـەر شاخەکە بۆ داوای کۆمەکی و ڕزگار بوونمـان، فریـاگوزاری لە دوای شـەش سـەعات گەیشـت، ئیـتر مـن ژیـانم بەجـێ هـێڵا و ڕۆحـم لە جەسـتەم جیـا بـوویەوە، گەلە ئەسـتێرەکانم تـێ پەڕانـد، گـوێم لە زۆرێـك لە ڕێبـوارانی ڕۆحـی وەك خـۆم بـوو سەردەکەوتن بۆ سەرووی ئاسمانەکان، زانیاریم هەبوو لەسەر کەسێك کە نزیکـی مـن بوو، تەنها بوو قسەی نەدەکرد، نەمـدەبینی، بەڵام دەمزانـی کە گەشـتیارە و بـۆ بەرزەخ دەچێت، لە دوایـدا دەنـگە دەنـگ نەمـا، ڕووداوەکـانی ژیـانم، کـار و کردەوەکـانم بە شێوەیەك بەدەرکەوتن کە زۆر زۆر سەیر بوو، هەموو بەشێکی ژیانم پـڕ بـوو لە وێـنە و وتە و فکرە و تێ گەیشتن، هەموو ئان و چرکەیەکی ژیـانی خـۆمم بینـیەوە، ئەوانەشـی کە بیرم نەمابوون، هەموییم بە دورو درێـژی بینـیەوە، هەمـوو وتە و هەڵـس و کەوت و نیەتی نێوان من و خێزانەکەم پیشان درایەوە!!

بۆچی ئەوەت وت!! بۆ ئەوەت نەوت، شـتێکی تـرت وت! هەرچـی کەریـگەریەك لەسەر خەڵکی بەجێم هێڵا بـوو، بە چـاك و خـراپەوە دەبـوو بیگـرمە ئەسـتۆی خـۆم، چونکە لە گەردنی مندا بوو، خۆمم بینیەوە تەوبەم دەکـرد لە خزمەتـی خـوای گەورەدا، داوام لە خوای گەورە دەکرد کە کۆڵی گوناهم سوك بکات.

سەرسام بووم بە خۆشەویسـتی بـێ سـنوری خـوای گەورە بـۆ بەنـدەکانی چەنـدە میهرەبانە و ڕەحمیان پێ دەکات!

بینیم کە من خەڵکێکی زۆرم لە دونیادا بێ ئومێد کردووە، ئـازاری زۆر کەسـم داوە، ئەوانە بوون بە ئازار و مەینەتی بۆ من.

تەنانەت هاوڕێیەکی خۆمم بینی کە بەهۆی منەوە لە ژیانی دونیادا تووشی سـەختی ژیان و ئازار بووبوویەوە، دەبوو باری گرانی ئەویش هەڵبگرم!!

شتانێکی باش و خێر و نیەت پاکی خۆیشم بینـیەوە، بەڵام کەم بـوون، کەمـتر بـوو لەوەی کە خۆم پێشبینیشم دەکرد، ئیتر زۆر خەفەتبار بـووم کە فرسـەتی زۆرم لە ژیانـدا لە دەست دابوو.

پێکەنینێك بە ڕووی کەسێکدا، دڵدانەوەی کەسێك، یارمەتی و کـۆمەکی مرۆڤێـك، دەبووە خاڵێکی خێر و سپی و ڕۆشنایی و، ئومێدی بۆ من زیاد دەکرد، ئیتر پەیتـا پەیتـا ئاشتی و موحیبەتم پێ دەگەیشت.

نزیك دەبوومەوە لە نـور و ڕونـاکیەکی زۆر گەورە و پـڕ لە خۆشەویسـتی، سـەرەتا ترسام، چونکە زۆر زۆر لە خۆر بەهێز تر بوو، دەترسام لە تیشکی زۆریا گڕ بگرم.

لەناو نورەکەدا بووم، زۆر شادی هێنەر و پڕ موحیبەت بوو، زۆرتـرین ڕۆحانیـات و پاکێتیم دەست کەوت، ئیتر تەسلیمی شرینیەکەی بووم، ئازارەکانی ژیانی ڕابردووم بیر چوویەوە، ئـافرەتێکم لەنـاو نـورەکەدا بینـی، دەسـتێ جلـی سـپی لەبەردا بـوو، دەم و چاوێکی سپی بریسکەداری هەبوو، زۆر جوان بوو، هاتە پێشەوە لە من و پێ دەکەنـی، وام هەست کرد پڕی کردووم لە خۆشەویستی، دەمویست بزانم ئەو ئـافرەتە کـێ بـوو، ناوی بردم و وتی: ڕانیل! سەرم سوڕما کە لێوەکانی نەدەجوڵا و بانگی لێ کردم.

دەنگی لە ناخمدا بوو نەك لە گوێمدا، زیاتر پێ داگری دەکـرد لە بانـگ کردنمـدا و دەیوت 'ڕانیل... ڕانیل'، ئیتر ئەوە بوو لەو ساتە وەختـەدا ناسـیم کە ئەوە نەنکـمە، واتە دایکی دایکم بوو، زۆر جیاواز بـوو، بە تەواوی لە گەشـی و جـوانی و شـادیدا بـوو، تەمەنی لە ٢٥ ساڵاندا بوو، بۆچی یەکەم جار نەمناسیەوە، پێ کەنی و دەستی گـرتم و وتـی: وەرە بـا بـڕۆین، دەبێـت شـتانێك هەیە ببینیـت، 'جـیم' هـاوڕێی مـن بـوو، بە

ڕووداوی هاتوچۆ مرد بوو، من زۆر زیاتر لەوەی کە لە جەستەمدا بووم زیندوو پڕ چالاکی بووم!!

زۆر تامەزرۆ بووم کە زیاتر لەو جیهانە پڕ لە جوانیە شارەزابم، فرسەت بوو بزانم 'جین' لە کوێیە و چی بەسەر هاتووە، ویستم لە نەنکم بپرسم، نەنکم دەستی گرتم و وتی: ئێستا نا!

هەستم بە دەسەڵاتێکی سەیر کرد لەوەی کە ئەو ڕێگری کرد لەوەی نزیك ببمەوە لە هاوڕێکەم!

وتم: بۆچی؟

وتی: لەبەر جۆری ژیانی 'جین' لە دونیادا.

'جین' نزیك بوویەوە لە من و، لە دوری دوانزە پێوە ڕاوەستا، بەختەوەر بوو، بەڵام ئەو نورەی کە نەنکم هەیبوو ئەو نەیبوو!

داوای لێ کردم کە دایکی واز لە خەم و خەفەت و گریان بێنێت، چونکە ئەو دڵخۆشە و زۆر بەختەوەرە.

باسی ئەوەی کرد کە لە ژیانیدا بڕیار و کرداری زۆر هەڵەی هەبووە، تلیاك و خراپەکاری هەڵبژاردووە.

ئەوەیە بووەتە تاریکی جیهانی بەرزەخی، نوری لێ وەرگرتۆتەوە.

هیچ باخچە و دارستان و مێرگێك ئەوەندەی تۆزقاڵێکی باخ و چیا و ئاوە دڵڕفێنەکانی ئەوێ نیە.

هەموو گەڵایەك پڕە لە ڕووناکی و زیندوێتی و جوانی و بەخشندەیی، هەموو درەخت و گوڵ و گوڵزارێك ئاواز و سەدایەکی هەیە.

تەسبیحاتێکی زۆر سەیری خوای گەورە دەکەن.

ئاواز و مۆزیکێك هەبوو بەڵام بە هیچ جۆرێك ئەوەی دونیا نەبوو، زۆر زۆر بـاڵا و بێ وێنە بوو.

لەگەڵ نەنکم بۆ زۆر شوێن گەڕام، گەشتی دورو درێژم دەکرد، هەمـوو شـتێك بـێ وێنە بوو، چوینە بەرزاییەك ملیۆنەها مرۆڤم بینی لەوێدا بوون.

نەنکم وتی: ئەمە شوێنی ڕۆحی ئەوانەیە کە مردوون و تازە کۆچیان کردووە بـۆ ئێـرە لە دونیا دەرچوون.

لەوێوە سەیری قەرەوێڵەیەکمان کرد، لە نەخۆشخانەیەکی سەر زەوی.

نەنکم وتی: 'ڕانیل' خەم مەخۆ، دەم و چاوت چاك دەبێتەوە و جەستەت چارەسـەر وەردەگرێت کە دەگەڕێیتەوە بۆ دونیا.

دوای چەند ساڵێك ئینجا بە تەواوی چـاك دەبیـتەوە. کە هـاوارم کـرد وتـم: بـۆچی چاوەڕێی ئەوە لە من دەکەیت کە بگەڕێمەوە بۆ دونیا؟! نامەوێت بگەڕێمەوە!!

نەنکم وتی: مناڵەکانـت پێویسـتیان بە تـۆیە، کـاری زۆری تـرت لە دونیـادا مـاوە، دەبێت بگەڕێیتەوە.

نەنکم پێی وتم: کلیلی بردنەوە موحیبەت و خۆشەویستیە 'سێ جار پێی وتمەوە'.

کە نەنکم دەستی لێ بەردام، کەوتمە جیهانێکی تاریك و زانـیم کە دەگەڕێـمەوە بـۆ دونیا، دەستم کرد بە گریـان. چـونکە جیهـانی پـڕ لە مـوحیبەت و نـور و جـوانی بـێ سنورم بەجێ هێڵا و گەڕامەوە بۆ دونیا.



# لە دیوارەکە نوسرابوو هاری لە دۆزەخە

شەوێکی تاریك، لە ڕێگەیەکی هەڵدێردا بوو، کە 'هاری' تەمەن (٣٠) ساڵان بە ئۆتۆمبیلەکەی ڕۆشت، لە شوێنێکی چۆڵدا وەرگەڕا، کاتێك بردیانە نەخۆشخانە، پزیشکەکان وتیان چەند کاژێرێکی ماوە و دەمرێت، بەڵام لە دوای ماوەیەکی زۆر مانەوە لە 'ICU' گەڕایەوە و تەندروستی باش بوو، ئینجا ئەو گەشتەی گێڕایەوە کە زۆر سەرنج ڕاکێش بوو.

هاری دەڵێت: کە بێ هۆش بووم، لە شوێنێکی ترسناکدا ڕاوەستا بووم، لەسەر شیوێك بووم، ڕووباری ئاگر و بڵێسەی ئاگر بوو، لە چوار لای ئەو ئاگرە ترسناکە جۆرەها خەڵکی دونیام بینی، خەڵکی خراپەکاری هەموو جۆرە ئاین و بیر و باوەڕێکم بینی.

هەموویان هاواریان دەکرد لەتاو سزا و ئازاردابون.

ترس و بیمێکی زۆریش منی داگرتبوو، دوای ئەوە چوار بوونەوەری زۆر ترسناکم لە دەوری خۆم بینیەوە. دیار بوو بۆ من دیاری کرابوون، کەلەپچەیان دەرهێنا و منیان شەتەك دا و دەستیان بەستمەوە، قاچەکانیان زنجیر کردم، بردمیان بۆ شوێنێك هەستم دەکرد کە خوار خۆم دەبینم، بڵێسەی ئاگر لەو شیوە ئاگرینەدا بەرز دەبوویەوە، لەوێ زانیم ئەم شوێنە تایبەتە بە سزادانی من و بۆ من ئامادە کراوە.

ژورێك شێوە و ناوەڕۆکی ئاگر بوو، هەموو کەسێکی ئەوێ شوێنی تایبەتی سزای خۆی هەبوو، فڕێیان دامە ناو ئەو چاڵە ترسناکەوە، هەستم کرد کە ئاگرم تێ بەربوو، پێست و گۆشتم بە جارێکا گریان گرت و سوتان، پێستێکی ترم بۆ دروست دەبوویەوە، هەمدیسان جەستەی نوێ و سوتانی سەر لە نوێ و بەو جۆرە بەردەوام بوو، هاوارم دەکرد و دەپاڕامەوە، هیچ کەس باکی لە پاڕانەوە و هاوارم نەبوو.

زۆر زۆر لەو شوێنە مامەوە، هەتا وامزانی کە مـن بـۆ هەتـا هەتـایە لەو شـوێنە سـزا دەدرێم، لەناکاو ڕووناکیەکی سپی هات و فڕاندمی و لەگەڵ خۆی بردمی.

ئیـتر دوای ئەوە گەڕامەوە نـاو جەسـتەکەم و هۆشـم هـاتەوە. کاتێـك هـاری لە نەخۆشـخانە دەرچـوو گەڕایەوە مـاڵەکەی خـۆی، دوای چەنـد ڕۆژێـك دراوسـێکانی پەیوەندیان کرد بە پۆلیسەوە، سکاڵایان لێ کرد لەسەر ئەوەی دەنگـی بەرزی مـۆزیکی تەسجیلەکەی 'هاری' دراوسێکانی هەراسان کردبوو، پۆلیسەکان ڕۆشتن بـۆ مـاڵەکەی 'هاری'، خۆیان گوێیان لێـی بـوو، زۆر لە دەرگایـان دا هەتـا 'هـاری' دەرگـاکەی لـێ کردنەوە، کاتێ لێیان پرسی: بۆچی بەو جۆرە دەکەیت؟

وتـی: بـوونەوەرە ترسـناکەکانی نـاو دۆزەخ کە سـزایان دەدام هـاتوون بـۆ ئێـرە و، هەوڵیان داوە بمبەنەوە بۆ دۆزەخ، منیش بە دەنگـی بەرزی مۆزیـك دوریـان دەخەمەوە لە خۆم!!

پۆلیسەکان نەڕۆشـتن هەتـا دەنگـی مـۆزیکەکەی کـز کـرد، باوەڕیـان بە قسـەکانی نەکرد، وتیان شێت بووە! واژویان لێ وەرگرت کە ئەم کارە دووبارە نەکاتەوە.

چەند کاژێرێکی پێ چـوو، دەنگـی مـۆزیکی بەرز دیسـانەوە لە ژورەکەی 'هـاری' بەرز بوویەوە.

دراوسێکان تەنها دوو کاژێر خۆیان بۆ ڕاگیرا، دیسانەوە پـۆلیس هـاتنەوە، ئەمجـارە بۆ ئەوە هاتن بیگـرن و بیـبەن، بەڵام ئەمجـارە لە دەرگایـان دا، زۆریـان لـێ دا، بۆیـان نەکرایەوە، لە دوایدا دەرگایان شکاند، بینیان 'هاری' جەستەیەکی سوتاوە و مردووە.

لێکۆڵەرەکا ن سەریان لەوە سوڕما کە هیچ دیاردەیەکی ئاگر کەوتنەوە لە شـوقەکەیدا نەبوو، ئەم ڕووداوە لە گۆڤار و ڕاگەیاندنەکان بڵاو بوویەوە، بە وێنەش بڵاو کرایەوە.

# لەباربردن زۆر ترسناکە

’لۆدمیلا‘ ژنێکی ڕووسیە و دەڵێت: لە ئەزموونەکەمدا ڕێـڕەوی زۆر ترسـناکم بینـی، خەڵکی بە قەبارە بچووکم بینی بە زنجیر بەسترا بوونەوە، زۆر نـاشرین بـوون، مـرۆڤ نەبوون، دەفری گەورە گەورەی کێم و برینیان پێ بوو، بـۆنی زۆر نـاخۆش بـوو، دڵـم پێی دەوتم ئەمە دۆزەخە، شاخێکم بینی، لە جەستەی مرۆڤ پێکهـاتبوو، لە سـەرو دڵ و قاچ و دەست پێك هاتبوو، جەستە و پارچەکانی جەستە هەموویـان زینـدوو بـوون، هاوار و گریان و ناڵەیان بوو، زۆر ترسناك بوون.

هەتاوەکو ئێسـتاش دەنـگ و هەرای ئەوێ لە گوێمـدا دەزرنگێـتەوە، هەرگیـز بیـرم ناچێتەوە، باڵـدار و گیانـداری ترسـناك لەو شـاخەدا هەبـوو، کە لەسـەر ئەو جەسـتانە دەژیان، دەموت ئەمە چی‌یە؟

کەسێك لە تەنیشتمەوە پەیدا بوو، وتی: ئەوەی دەیبینیت گوناه و تاوانەکانتە.

وتم: چ جۆرە گوناهێکم؟!

وتی: لەبار بردنی مناڵ... لەبار بردن... لەبار بردن.

لە کوت و پڕێکـدا پارچەکـانی جەسـتەی مناڵێـك کۆبـوویەوە و شـکڵی منـاڵێکی وەرگرت.

من سێ مناڵم هەیە، قژ و چاوەکانی لە مـن دەچـوو، لە کـوڕەکەم دەچـوو، دەسـتە بچووکەکانی کردەوە و دەگریا و بەرەو ڕووم هـات و دەیـوت: دایە... دایە... هەرگیـز لە ژیانمدا بیرم ناچێتەوە!!

هەرگیز ئەو ئازارە ویژدانیە جێم ناهێڵێت!!

هەستم بە خۆشەویستیەکی قوڵی دایکایەتی کرد، هەر وەکو ئەو خۆشەویستیەی بۆ منداڵەکانی ترم هەمە.

پێم وترا: ئەوە ئەو منداڵە بوو کە لە بارت برد و فڕێت دا.

ترسێکی زۆر دایگرتم، باڵدارێکی زۆر گەورە دەهات ئەو منداڵەم بفڕێنێت لە پێش چاوانم.

ئەوە چەندین جار لە پێش چاوانم دووبارە بوویەوە.

ئەویش هاواری دەکرد و دەگریا و دەیوت: دایە... دایە...

دەمویست منداڵەکە لەو باڵدارە ترسناکە ڕزگار بکەم، منداڵەکەش دەستی درێژ دەکرد بۆ ئەوەی بە من بگات، بەڵام دیوارێك کەوتە نێوانمان و ون بوو لێم.

ئەوەی لە تەنیشتمەوە بوو وتی: من بە ئیزنی خوا ڕزگاری دەکەم، بەڵام بە مەرجێ بگەڕێرەوە بۆ دونیا و بە خەڵکی بڵێ لەبار بردن چەندە ترسناکە بۆ دوا ڕۆژیان، پێیان بڵێ کە چیم بینی.

منیش بە دڵێکی پڕ لە نزا و پاڕانەوەوە وتم: خودایە ئەو منداڵە ڕزگار بکە من خەڵکی سەر زەوی لەم کارەساتە ئاگادار دەکەمەوە.

## کوتوپڕ هەموو شتێك گۆڕا

من تەمەنم بیست و شەش ساڵان بوو ئەزموونەکەم بینی، ئێستا تەمەنم شەست و پێنج ساڵە. ئەزموونەکەم بەو جۆرە بوو. پشوو بوو، سەردانی خێزانەکەمم کرد، کۆتایی شەو بوو، سەیارەم لێ دەخوڕی، سەعات دووی شەو بوو کە کەوتمە ڕێ، لەبەر قەرەباڵغی زوو هاتم، ڕێگەکە تەسك و تەنگەلان بوو، هەستم کرد ئۆتۆمبیلێك بەرەو

من دێت، خۆم ئامـادە کـرد پێکـدادان ڕوونەدات و تێـپەڕم، ڕووبەڕوو لە یەکمانـدا، لە ڕێگەکە دەرچووم و بە ترسناکی بریندار بووم، قەدەری خوا لەو کاتە درەنگەی کۆتـایی شـەودا، پاسـێکی پـڕ لە خەڵـك تێـپەڕین و وەسـتان، لە پاشـاندا منیـان گەیانـدە نەخۆشخانە،کچێکی گەنجی بیست و دوو ساڵان هاتە ژورەوە کە پەرستار بوو.

لەناکـاو هەمـوو شـتێك گـۆڕا، هەسـتم بە هێمنـی و دڵخۆشـیەکی گەورە کـرد کە دایپۆشیم.

کەماڵ و ئەوپەڕی جوانیم لە هەموو شتێکی دەوروبەرم دەبینی.

کە سەیری هەر شتێکم بکردایە، پێکهاتەکانیم بە تەواوەتی دەزانـی و، چـۆن و لەبەر چی دروست بووە!!

زانست و زانیاریم بوو بە زانستی سەرڕێژ لە هەموو بوارێکدا.

بینیم پەرستارەکە زۆر پەرێشانی حاڵی خراپی من بوو، ویستم هەواڵی پـێ بـدەم کە من زۆر باشم، هەرگیز لە ژیانمدا حاڵێکی ئەوەندە باشم بە خۆمەوە نەبینـی بـوو، وەك ئەوەی نەیمبینێ و نە هیچی من ببیستێ ئاگاداری من نەبوو، لە سەرەتادا پێم سەیر بـوو کە ئەو جەستەیە ئەوەندە لە مـن دەچێـت، لە دوایـدا زانـیم کە جەسـتەی خـۆمە، ئیـتر پرسیارم دەکرد، ئایا من مردووم، ئەگەر مـن مـردبم دایکـم زۆر مـاڵ وێـران دەبێـت و خەمی زۆرم بۆ دەخوات، هەر ئەوەندەی بیرم لە دایکم کردەوە، لە بەردەمـی دا بـووم لە ماڵی خۆمان.

لە هەمـان کاتیشـدا لە نەخۆشـخانەش بـووم، ئەم حـاڵەتە ڕاڤە ناکرێـت، دەبێـت ببینرێت نازانی چۆن بەرامبەرەکانت تێ بگەیەنیت.

بینین و تواناکانم دابەش نەبوون و کەم کردنیان بەسـەردا نەهـات، کاتێـك لە چەنـد شوێنێکی جیاواز بووم.

ڕۆشتم لە دواوە بـاوەش بە دایکمـدا بـکەم و کـوت و پـڕ بێـت، بەڵام دەسـتەکانم ڕۆشتن بە ناو جەستەی دایکمدا و بە خۆی نەزانی!!

ویستم قسەی لەگەڵ بکەم سوودی نەبوو!

ڕۆشتم بۆ لای هەندێ لە هاوڕێکانم و لە هەمان کاتیشدا لە شوێنەکانی تریشدا بووم، بیری یەکێك لە مامۆستاکانی دوا ناوەندی خۆمم دەکرد، کوت و پڕ لەلای بووم، توانیم هەموو بیر کردنەوەکانی بخوێنمەوە و لێی تێ بگەم، لەگەڵ هەموو ئەو شتانەی لە ژیانیدا دێنە ڕێگەی.

لەو ساتەدا ئەو مامۆستایە پەرێشان بوو، پەرێشانی کوڕەکەی بوو، ئیتر من بەجێم هێلا.

بیری هەر کەسێکم بکەوتایەتەوە لەلای دەبووم، بەڵام ئەو کەسە نەدەبیینم، نە گوێی لە وتەکانم دەبوو.

ئەوەبوو لە نەخۆشخانە بڕیاریان دا لەسەر ئەوەی کە من ژیانم تەواو بووە و مردوم، بردمیان بۆ تەرمانە.

زۆر بە خێرایی بەناو تونەیلێکدا ڕۆشتم. گەیشتمە ڕووناکی و نور و، چوومە شوێنێکی زۆر خۆش و جوان.

زانیم ئەمەیە ماڵ و نیشتمانی ڕاستەقینەی من، لەوێ هەست دەکەیت لە دونیادا نامۆ بوویت!!

لەسەر زەوی مرۆڤ نازانێت کە خەڵکی سەر زەوی نیە.

لەوێ دەزانیت کە ژیانی دونیا وەك ئەوە وایە لە دورگەیەکی چۆڵ و ترسناکدا بژیت و زۆریش ناساز بێت.

لەوێ هەموو شتێکی ڕێژەیی 'نسبي' مانای خۆی ون دەکات. لەوێ تەنها جەماڵ و کەماڵی ڕەها و بێ سنور دەبینیت.

هەندێ ڕۆحانی تری لێ بوو، تواناکانی هەندێکیان لە تواناکانی من زیاتر بوون، هەندێکیش کەمتر.

هیچ هەستم بە ئیرەیی نەکرد، کە بۆچی هەندێك لە من بە تواناترن!!

له هەمـوو گەشـتەکەمدا هەسـتم دەکـرد کە کەسـێك بە بەردەوامـی ئامـادەیی هەیە لەگەڵـم، بەڵام مـن مەدهۆشـی جـوانی و خۆشـیەکانی ئەو ئەزمـوونە بـووم، بیریشـم نەدەکردەوە کە ئایا ئەو کەسە کێیە؟

له کۆتاییدا زۆر گرنگ بوو بەلامەوە، کەسایەتیەك بوو، له نور دروست بوو بـوو، له شێوەی مرۆڤدا بوو، یاخود من بەو جـۆرە بینـیم، یەکپـارچە نـور و خۆشەویسـتی لـێ دەچۆڕی.

خەڵکانێکم بینـی لە دونیـادا خۆیـان کوشـتبوو، حاڵیـان زۆر خـراپ بـوو، چـوار دەوریان گیرا بوو، نەیان دەهێڵا پەیوەندی بە هیچ کەسێکەوە بکەن.

ئەوانەی خۆیان دەکوژن، وەك سـێبەرێك دێـنەوە بـۆ نـاو خـزم و کەس و کاریـان، لێیان دەپاڕێنەوە دوعایان بۆ بکەن هەتا بەڵکو ڕزگاریان ببێت لە سزا.

هەموو ژیانم دیمەن دیمەن پیشان درایەوە، کاتێك مناڵ بووم بە سەیارە دەڕۆشـتین، لە شوێنێکدا لامان دا کە ڕووبارێکی لێ بوو، کە دوور نەبوو لە ڕێگەکەوە، پێیـان وتـم کە هەندێك ئاو بێنم، منیش لە دەبەیەکدا ئاوم هێنا، لە ڕێگـادا هەسـتم کـرد کە ئـاوەکە قورسە، ئیتر هەندێ لە ئـاوەکەم کـردە ژێـر درەختێکـی تاقـانەی وشـك لەو دەشـتەدا. هەندێکم تێ کرد، تۆزێك وەستام بینـیم کە چەنـدە ئەو زەویە تینـوی ئـاو بـوو، هەڵـی دەمژی لەو دونیا ڕێز لێ نان و ئافەرینێکی زۆر زۆر و پاداشتێکی زۆرم دەسـت کەوت لەسەر ئەو کارە ئاساییە!

دەتوت هەموو ڕۆحێك لەم گەردوونەدا پڕ بووە لە خۆشی ئەو کارەی کە من کردم.

پێیان وتم: ئێمە شانازیت پێوە دەکەین.

بەڕاستی مرۆڤ کە دەگاتە بەرزەخ و قیامەت شەرمەزاری ئەو هەموو ڕێز و پاداشـتە دەبێت.

هەرچی شتێکی باش کە بۆ کەسێکم کردبوو، بینیم کە بۆ خۆمم کردبـوو، هەرچـی جارێکیش ئازاری جەستەیی یاخود دەروونی کەسێکم دابێت، ئەوە من بۆ خـۆمم ڕەوا بینیوە، سزای خۆمم داوە.

من دەمزانی و دەمبینی ئەو کەسـەی ئـازارم داوە، دیـاریەکی خـوایی پـێ دەگـات، بینیم کە سزای خۆمم داوە نەك ئەو!!

پێیان وتم: بەرپرسیارێتیت زۆر ماوە لە دونیادا دەبێت بگەڕێتەوە بۆ دونیا.

لە دوای دوانزە خولەك لەوەی کە ڕایانگەیاندبوو کە مـردووم گەڕامەوە دونیـا،ڕەنگە ئەو ماوە کەمە بۆ منێکی ئەوێ چەندین ساڵ بووبێت.

ساڵانێك ئەزمـوونەکەم شـاردەوە، چـونکە خەڵکـی بە خـراپ و گـاڵتە پـێ کـردن ڕووبەڕووم دەبوونەوە، هەتا کتێبێکم لە بارەیەوە بینی، کە بەسەرهاتی خەڵکـی تـر بـوو دەربـارەی ئەزموونەکەیـان، ئینجـا منـیش دڵخـۆش بـووم کە زۆر هەن وەك مــن حەقیقەتیان بینیوە!!

ئەم ئەزموونە ئەوەنـدە کـاریگەری لەسـەرم بەجـێ هـێڵا هەتـا ئەوە بـوو پیشـەکەی خۆمم گۆڕی و چوومە نەخۆشخانە هەتا خاوەنی ئەزموونەکـان بـدوێنم و لە نـزیکەوە ئاگاداریان بم.

## ماجیدة خەطیب

ماجیـدە خەطیـب کەسـایەتیەکی نـاسراوی دونیـای عەرەبـیە، ئەم ژنە ئەزمـوونی نزیکبوونەوە لە مردنی بینی و خۆی بۆمان دەگێڕێتەوە و دەڵێت:

من لە وڵاتی 'کوبا' لە کۆلێژی ئەندازیاری دەمخوێنـد، ئەو وڵاتە هەژارن و، منـیش لەبەر کەم خۆراکی و هەژاری و نەبوونی خۆم تووشی بەد خۆراکی و کەمـی خـوێن و ڤیتامینەکان بووم.

من لەبەر ئەوەی چەپێکی سەرسەخت بووم و کوبام لەبەر ئەوە هەڵبژارد چونکە هاوبیری خۆم بوون، باوەڕم بە خوا و ڕۆژی دوایی نەبوو، لە کوباش تووشی تێك شکانی بیرکردنەوە و هزر بووم، چونکە ئەو دروشمانەی ئێمەی لەسەر پەروەردە کراین زۆر جیاواز بوو لە حوکمڕانیدا؟!!

ئیتر ئەوە بوو بیرم لە خۆکوژی دەکردەوە و دەستبەجێش جێبەجێم کرد!

لە نهۆمی چوارەوە خۆم فڕێ دایە خوارەوە و بە ڕوودا کەوتمە سەر زەویەکە، مێشکم و قاچ و ئەندامەکانی جەستەم زۆر خراپ بەرکەوتن!

ڕاستەوخۆ خۆم بینیەوە لە سەرەوە سەیری جەستەی تێك شکاوی خۆم دەکەم و سەیری ئەو خەڵکەش کە فریا گوزاریان بۆ دەکردم.

تونەیلێکم بینی و ڕۆشتمە ناویەوە، لە جیهانێکی تەواو هێواش و هێمن و خۆش و بێ کێشەدا خۆمم بینیەوە، جیهانێکی ئەوەندە بێ وێنەم بینی کە هەرگیز وێنەی لە دونیا دەست ناکەوێت، ڕووناکیەکی بێ شومارم بینی کە بەرەو من دەهاتن. کە سەیر دەکەم خزم و کەس و کار و هاوڕێ و ناسراوەکانم بوون کە مردبوون و لەبەرزەخ بوون.

هەموویان لەوپەڕی تەندروستی باش و خۆشی و بێ کێشەیدا بوون. زۆر زۆر نورانی و پڕ لە چالاکی بوۆن.

خەم و خەفەت لەوێ نیە، بەڵام من دەترسام، چونکە من لە دونیادا کەسێکی بێ باوەڕ بووم، باوەڕم بە خوا و ئیسلام و قیامەت نەبووە، ئێستا لە شەرمەزاریدا چی بکەم و چۆن دەرباز ببم!!

دەترسام دەست بەجێ ببرێم بۆ دۆزەخ.

من وەکو موسوڵمانێك گەورە بووبووم بەڵام کە گەورە بووم ئالوودەی بیرو باوەڕی نەزۆك و شومی شیوعیەت بووم.

ئیتر نەمدەزانی لە شەرمەزاریدا چی بکەم، بۆ کوێم دەبەن؟!

ئەوەی چاوەڕوانی نەبووم ئەوە بوو بەزەییان پێمدا هاتەوە، خۆشەویستیان بۆ دەربڕیم، چ شەرمەزاری و پەشیمانیەك ڕووی تێ کردم، چونکە من باشەم کەم بوو، هەموو ژیانی خۆمیان بۆ لێ دامەوە، پێیان وتم: خۆکوژی گوناهێکی ترسناکە بۆ قیامەت و هیچ چارەسەرێکیش نیە بۆ دونیا.

بەڵام پێشیان وتم: لێرە بە ئەندازەی کێشی گەردیلەیەك لە چاکە و خراپە ون نابێت، لەبەر ئەوە چاکەت هەبووە لە دونیا، خوای گەورە ڕەحمت پێ دەکات و دەگەڕێیتەوە دونیا.

زۆر کەسی نزیکی خۆمم لەوێ بینی، تکام کرد لێم ببورن و نەگەڕێمەوە دونیا، بەڵام دەست بەجێ گێڕامیانەوە بۆ دونیا و بۆ جەستەی قەفەزی بچووك و پڕ ئازار.

ئەگەر ئازادیتان دەوێت، بەخوا لێرەی دونیا نیە، لەو دونیا بەبێ سنور دەستتان دەکەوێت، کە منیان گێڕایەوە بۆ دونیا، بەڕاستی بۆ زیندانیان هێنامەوە، ئێوە نازانن دونیا چ جۆرە زیندانێکە هەتا نەگەنە بەرزەخ، ئەوسا دەبینن و دەیزانن، خۆزگەم بەوەی لەوێ براوەیە.

بۆ ماوەی چل و پێنج دەقیقە دڵم وەستا بوو، لە دوای ئەو ماوەیە گەڕامەوە 'گەڕێنرامەوە'، دوو مانگ بێ هۆش بووم، ناوی خویشم بیر چووبوویەوە، هەتا وردە وردە ناو و بابەتەکانی تریشم بیر هاتنەوە، ئیتر ڕووداوەکانم بیر هاتنەوە و بۆ هەتا هەتایە بیرم ناچێتەوە.



# بۆ ئیماندار مردن ئاستەنگێك نیە

  

شێخ علی طەنطاوی 'ڕەحمەتی خوای لێ بێت' دەگێڕێتەوە کە لە گەشتی پیـرۆزی حەجـدا، لە ڕێگـای 'ڕیـاض' لە پاصـێکدا بـووە، شـۆفێرەکە زوو زوو سـەری دەبـردە پێشەوە بۆ جامی پێشەوە و، سەیارەکەی خاو دەکردەوە، چەند جارێـك لە ڕۆشـتندا بەو جۆرەی کـرد، هەتـا حاجیەکـان پێیـان وت: کـاکی بـرا بـۆچی بەو جـۆرە دەکەیـت و پاصەکە خاو دەکەیتەوە لە ڕۆشتن، ئەم بیابانە گەرمە و ڕامان مەگرە.

شۆفێرەکەش وتی: ئەو پیاوە ڕیش سپیە نابینن، ئەوە چەند جارە هاتە ڕێگەکەم هەتـا ڕایبگرم و سەر بکەوێت!! پاصەکەی ڕاگرت، سەرنشنیەکان وتیان: کوانێ پیاوی ڕیش سپی؟ ئێمە کەس نـابینین، کـاکە ئەوە گەرمـا و تیشـکی خـۆر کـاری تـێ کردویـت و تارمایت بۆ دروست دەکات، بڕۆ کاکە کاتمان بە فیڕۆ مەدە!!

تومەز کات زایە نەبـووە و، زەمـانی ئەو شـوفێرە تەواو بـووە و هـاتوون بە شـوێنیدا بیبەن، دەبوو پاسەکەش بوەستێ هەتا تووشی کارەستێك نەبن.

ئەوە بـوو شـۆفێرەکە پاصـەکەی وەسـتان و، دەرگـای پاصـی کـردەوە کەسـێك بە بەرچاوەوە بێت سەر نەکەوت، بەڵام گیـانی لە شـەقەی بـاڵای دا و ڕۆشـت و گیـانی سپارد.



# زۆربەی ڕاستیەکان ئێمەی مرۆڤ هیچیان لە بارەوە نازانین

'جویس هوکس' ژنە زانایەکی فیزیـاییە، لە دوای ئەوەی ئەزمـوونی نزیکبـوونەوە لە مردنی بینی، لێکۆڵینەوەکانی کرد بە پەیوەندی زانستی بە زانستی ڕۆحیەوە.

'جویس هوکس' دەڵێت: ئەرێ ئێوە سەیری خۆتان کردووە، بیرتان کردۆتەوە!!

لە ژێر پێستماندا (١٠٠) ترلیـۆن خـانە هەیە! (٢٥) ترلیۆنیـان خـڕۆکە سـورەکانی خوێنن، کە خڕۆکەی سور تەنها چوار مانگ دەژی.

بەو واتـایەی کە هەمـوو چـرکەیەك جەسـتەمان (٢ - ٣) ملیـۆن خـانەی خـڕۆکەی سوری نوێ دروست دەکات.

ئەمە یەکێکە لەو نادیار و سەرسوڕهێنەرانەی جەستەی ئێمە.

ئەم ژنە زانا و گەورەیەی زانستی فیزیا دەڵێـت: مـن وەك زانـایەکی فیزیـا خەریکـی بڵاوکراوە و، وانە وتنەوە و بەڕێوەبردنی کاری فیزیایی بووم، زانست و هەمـوو پـرس و چیرۆك و خولیای ژیانم بوو، شتێکی تـر بـوو بە قەزیەی ژیـانم، لە کاتێکـدا ژوورەکەی خۆم پاك دەکـردەوە تـابلۆیەکی قـورس کەوت بەسـەرمدا، کـوت و پـڕ مـردن بـوو بە میوانم، لە ڕەگ و ڕیشاڵەوە منی گۆڕی.

لە تـونەیلەکەوە تێـپەڕ بـووم، مـن هەرگیـز لەوەو پـێش لە ژیانمـدا ئەزمـوونەکەم نەبیستبوو، ئەگەر بیشم بیستایە باوەڕم پێ نەدەکرد!

لە ئەزموونەکەمـدا دایکـم و نەنکمـم بینـی، زۆرم خۆشدەویسـتن کـۆچی دواییـان کردبوو، نزیکەی بیست ساڵ دەبوو مردبوون.

لەناو گوڵ و گوڵزار و لاپاڵێکی ڕووناك و جواندا بوون.

نەمدەویست ئەو شوێنە بەجێ بهێڵم، ئەوەی بینیم زۆر کوت و پڕ بـوو، لە دەرەوەی زانست و بیرکردنەوە و کاری من و بیر و باوەڕم بوو.

چەندین ملیۆن حاڵەتی 'نزیکبوونەوە لە مردن' تەنهـا لە ئەمریکـا تۆمـار کـراوە، ئەم ئەزموونـانە بـووەتە ڕۆشـنبیریەکی نـوێ لە ژیانمـدا، چەنـدین وانەی گـرنگم لە ئەزموونەکەم وەرگرتووە.

دوای گەڕانەوەم کەوتمە خوێندنەوەیەکی چڕ و پڕ لەسـەر ئەزموونەکـان کە حەوت ساڵم پێ چوو، وازم لە کارەکەی خۆم هێنا و کەسی ترم لە شوێنی خۆم فێری کـارەکەم کرد و لێی وەرگرتم.

هەتا من خۆم تەرخان بکەم بۆ ئەو کارە مەزن و بێ هاوتایە.

دەگەڕام هەتا بگەمە ڕێگایەك و، نزیکیمان لە یەکتر سوودمان پێ بگەیەنێت.

زۆربەی زۆری ڕاستیەکان ئێمەی مرۆڤ هیچیان لە بارەوە نازانین.

## 'بام بارت' سەرۆکی حزبی دیموکراتیە لە 'ئیدمانتن' ئەزموونەکەی بینی

ئەم ئافرەتە بەناوبانگەی دونیای 'سیاسەت'، ویستی خۆی بۆ هەڵبژاردنەکـان ئامـادە بکات، سەردانی پزیشکی ددانی کرد هەتا خۆی ئامادە بکات لە هەموو ڕوویەکەوە.

'بام بارت' دەڵێت: کاتێك پزیشکەکە بێهۆشی کردم، هەستم کرد کە دەمرم.

ئەوەی لەم ئەزموونەدا بینیم زۆر زۆر بوو، هەمـوو مەخلوقـاتی خـوام لە بـونەوەردا بینی!

هەموو شتێك جوان و دڵڕفێن بوو، من لە خزمەتی خوای گەورەدا بووم، هەستم کرد نزیکم لە خوای گەورە، لەوەو پێش خواناس نەبووم و سەرقاڵی حزبایەتی و سیاسەت بووم!

ئەوەم زانی و دڵنیا بووم کە دەبێت واز لە سیاسەت بێنم!

کاتێك هاتمەوە سەرخۆم و، گەڕامەوە بۆ دونیا، یەکەم کاری ئەو ساتەم ئەوە بوو، وازم لە سەرۆکایەتی حزب و، تێکڕای کاری سیاسی و حزبی هێنا!

زۆر کەس پێیان وتم: چانسی گەورەت هەیە، واز لە سیاسەت مەهێنە!

وتم: من نامەیەکم بەدەست گەیشتووە، دەبێت بە دوایدا بچم.

ئەزموونەکەشم بە کاتی دونیایی، تەنها (٣٠) چرکەی پێ چووبوو.

'بام بارت' کتێبێکی لەم بارەیەوە نوسی و دەڵێت: ئەم ئەزموونە هەموو ژیانی منی گۆڕی، بەڵام زۆر گرانە بتوانم ڕاڤەی ئەو گۆڕانکاریانە بکەم.

'بام بارت' دەڵێت: ڕۆح هەموو شتێکە و، جەستەی مرۆڤ تەنها کراسێکە.

## ژیانی دونیا تەنها چاو تروکانێکە لە چاو بەرزەخ و قیامەتدا



'ئەندرۆ بیترۆ' دەڵێت: ئاهەنگی کۆتایی خوێندنم بوو، لە دەریاچەیەکدا کەوتمە ژێر ئاو، هەستم کرد کە مردم، لە پەل و پۆ کەوتم، کاتێ هیچ برە هەناسەیەکم دەست نەکەوت، خامۆش بووم و...

دەنگێك بانگی لێ کردم... ئاندی... ئاندی... وەك ئەوە بووم، کە داکوترا بم بە بنی دەریاچەکەوە!



دەنگە پێی وتم: یەك خولەك پشوو بدە، ئینجا دەست بە هەوڵ دان بکەرەوە هەتا دەرباز ببیت.

وەختێ بە گوێی دەنگەکەم کرد، کاتێکم زانی لە سەرەوەی دەریاچەکەم و، لاشەی خۆم دەبینم لە بنی ئاوەکەدا.

ئیتر هیچ هەستم بە سەرما و ئازار و ناخۆشی نەدەکرد، بەڵکو هەستێکی زۆر خۆش و پڕ لە خۆشەویستیم هەبوو، هەرگیز سەنا و ستایشی جوانی و چێژەکانی ئەوێ ناکرێت!

ئینجا ڕێگە و تونەیل و ڕووناکیەکەم بینی، کە هەزاران جار لە خۆر ڕووناکتر بوو، بەڵام بێ ئازار بوو، ترسام بمسوتێنێت، بەڵام نەرم و بەسۆز بوو، ڕایکێشام بۆ خۆی. لە گۆڕەپانێکی زۆر گەورەی نور و ڕووناکیدا بووم و، لە هەر چوار لایەوە ژیانی من پیشان دەدرایەوە، هەستم کرد کە چرکە بە چرکەی ژیانم تۆمار کراوە و هیچ شتێك ون نابێت، ئەوێ شوێنی ون بوون نیە، بڕامە شوێنێکی زۆر خۆشتر، لەوێ زۆر ناسراو بووم، بانگیان دەکردم و دەیانوت: ئاندی مەترسە، خۆشەویستیەکی بێ کۆتاییم پێ بەخشرا، هەموو شتێك دەربارەی گوڵ و درەخت و ئەستێرە و زەوی و خۆر و گەردون فێرکرام!

پرسیارێکم نەما بیکەم!

ژیانی دونیا لە چاو تروکانێك زیاتر نیە، لە چاو هەتا هەتایی ئەوێدا!

دونیا یاریەکە و هیچ جدیەتێکی تیا نیە!

وتیان: ئاندی دەبێت بگەڕێیتەوە... تۆ نەمردویت...

وتم: تکاتان لێ دەکەم ئێرە نیشتیمانی منە!

ئێرە ژیانە... ڕێم بدەن با نەگەڕێمەوە!

من نامەوێت بچمەوە جەستەی تەنگەلان!

هەر ئەوەندەی پێیان وتم: دەگەڕێیتەوە، خۆم لە جەستە فانیەکەی دونیـادا بینـیەوە و هاتمەوە!

کاتێکم زانی بە ئازار و کۆکە و ناڕەحەتیەوە لە کەناری دەریاچەکە چاوم کردۆتەوە!

من دەگریام، هاوڕێکانم وایان دەزانـی لەبەر نـوقم بـوون و تـرس دەگـریەم، بەڵام دەگریام کە من لە نیشتیمانی ڕاستەقینە دوور خراومەتەوە، من لە گریـانی خـۆم حـاڵی بووم، بەڵام ئەوان نا!

هەموو شتێك کە ڕێی بینینی بدرێت بینـیم، بەڵام بـاس و ستایشـی بە زوبـانی ئێـرە ناکرێت!

## 'نیکۆڵ' ئافرەتێکە (٤٥) چرکە ئەزموونەکەی بینیووە

**ئەم ئەزموونە لە ساڵی (١٩٦٨)دا ڕووی داوە.**

'نیکۆڵ' دەڵێت: لە نەخۆشخانەی 'منـاڵ بـوون' نەشـتەرگەریم بـۆ دەکـرا، تووشـی خوێن بەربونێکی ترسناك بوومەوە، پزیشکەکان ویستیان ڕەحمم دەربێـنن، لەو کـاتەدا بینیم و هەستم کرد لە جەستەم دەچمە دەرەوە.

لە دوایدا 'کارمەندانی بەشی نەشتەرگەری' پێیان ڕاگەیاندم کە (٤٥) چـرکە دڵـم لە کار کەوتوە و گەڕاومەتەوە!

بەڵام لەو (٤٥) چرکەیەدا هەزاران ساڵی ئەوێ ژیام، چـونکە لەو گەشـتەدا دەچیـتە جیهانێك نە بۆشایی بە مانای بێ هودەیی تیایە، نە کات و زەمەن.

من لە سەرووی مێزی ‹بێدی› نەشتەرگەریەکە خۆمم بینی یەوە کە نەشتەرگەریم بۆ دەکرا!

ئاگادار بووم کە پزیشکەکان دەیانوت خێراکەن خەریکە لە دەستی دەدەین، خێرا خوێن بێنن!

هیچ بەربەستێك نەبوو بۆ من، کاتێك خەزورم و مێردەکەمم بینی خەمبار بوون، ویستم خۆمیان پیشان بدەم، دەستم بۆ هەڵبڕین، ئاماژەم بۆ کردن سوودی نەبوو!

دەستم خستە سەر شانی مێردەکەم، دەستم چوو بە جەستەیدا و بە خۆی نەزانی!

دەمتوانی بچمە دڵی مێردەکەم، دڵی مادی و گۆشتین گرنگ نیە، دەمزانی چی بە دڵ و هزریدا دەگوزەرێت، تواناکانم زۆر زۆر زیادیان کردبوو، کەوتمە ناو رووناکیەکە، خۆشترین چرکە ساتی ژیانم بوو، ئەو نیشتیمانی من بوو، لەوێدا زانیم ئێمە وەك سەرە رێیەك رێمان کەوتووەتە دونیا، ئەو شوێنە موحیبەتی پاڵفتە بوو، لەوێدا نغرۆی موحیبەت و پاکیزەیی بوم، زانیم هەتا هەتایە دەژیم و مردن لێرە نیە.

هەموو بیرو باوەڕێکمان و کردەوەیەکی دونیامان لەوێ چارەنوس و ئایندەیەکی هەیە.

من لەوێ لەناو باخ و دارستان و کەشێکی زۆر جوان و پڕ لە ناز و نیعمەتدا دەژیام، دەنگ دەبوو بە ڕەنگ، ئاو دەبوو بە نور، بە پێچەوانەشەوە.

وتم: ئێمە لە دونیادا کاتێك خۆشەویستێکمان لە دەست دەدەین، غەمبار دەبین، کەچی ئەو کەسە مردوە ڕێگای ڕاستیی ڕەها دەگرێتە بەر و بەختەوەری دەبیات، لە ئاڵۆزیی دونیا دەربازی دەبێت.

کاتی خۆی برایەکی حەوت مانگانم بە مناڵی مردبوو، لەوێ بینیمەوە!!

براکەم ناوی ‹بییر› بوو، بەڵام لەوێ گەیشتم بە گەنجێکی زۆر جوانی نورانی، سەیر ئەوە بوو خێرا و دەست بەجێ و بەبێ پێ وتنی کەس، زانیم ئەوە ‹بییر›ی برامە!

براکەم باوەشی پیا کردم و هەستم کرد جەستەی ئەوێی هەبوو!

پـێم وت: بـرام! زۆر خۆشـحاڵم چـاوم پێـت کەوتەوە، خـۆزگە دایکـم و بـاوکم دەیانبینیت!

برای مێردەکەمم بینی کە مـن نەمدەناسـی، چـونکە ئەو کـاتەی کە 'جـاك' لە ئـاودا خنکابوو، تەمەنی (١٤) ساڵان بووە و من شوم نەکردبوو بە مێردەکەم!

لەوێ 'جاك' چۆنیەتی خنکانەکەی خۆی پیشان دامەوە، ئەوەشـی پیشـان دامەوە کە خەسوو و خەزوورم 'دایك و باوکی جاك' چەند بۆی بە پەرۆش بوون.

سەرتاپا سپی نورانی زۆر جوانم بینی، کە لەو دونیادا هەرگیز لەو جۆرەم نەبینیوە!

هەسـتم کـرد لەوەتەی مـن هەم ئەم نورانیـانە ئاگـاداری مـنن. زاتێـك هەیە دڵـمان دەیناسێت!

دوو پرسیارم لێ کرا، جێ بەجێ کردنیان قورس و گرانە!

پێیان وتم: خۆشەویستیت چۆن بە خەرج دا!

خەڵکیت خۆش ویست، ئیرەیی و ڕق و تووڕە بوون و فرت و فێڵت کرد؟!

پرسیارێکیش ئەوە بوو: چیت کرد بۆ بێجگە لە خۆت؟

چاکەکار بوویت یان خراپەکار!

تێڕوانینێکی گشتگیرت بۆ دروسـت دەبێـت دەربـارەی گەردوون، ملیارەهـا مـرۆڤـم بینی کە دەستەکانیان بەرەو سەرەوە بەرز کردبوویەوە و دەپاڕانەوە، لە دەروونـی خۆمـدا هەستم بە کێشە و ئازار و نەهامەتی هەموو جیهان دەکرد، هەستم کـرد کە ئێسـتا خـۆم بە باشی دەناسم، هەموو ژیانی خۆمم بینیەوە!

تەنانەت شەڕێکی نێوان دایکم و باوکمم بینیەوە، چیان بە یەکتر وت، لە چ کـات و شوێنێك بوو هەمووی بێ هیچ پچڕانێك!

چوومە ناو ناخی دایکم، بینیم و زانیم چەندە زویر و دڵ تەنگە بەهۆی ئەو شەڕەیانەوە!

هەستێکی قوڵ و ویستێکی بێ کۆتام هەبوو لەوێ بمێنمەوە، بەڵام ئەوەش زاڵ بوو کە من مناڵ و مێرد و کەس و کارم بەجێ هێڵاوە، بنچینەش ئەوەیە کە من ڕۆژم تەواو نەبوبو، ئەمانە دەبنە پاڵە پەستۆی گەڕانەوە!

لەوێ گەیشتم بە ئافرەتێك، بوو بە خوشکی ڕۆحی من و هاوڕێی هەمیشەییم.

ئەم دیاردەیە، نە خەو و نە خەیاڵ و نە ژیری ناوەکی، نە هیچ پەیوەندیەکی بە مێشك و جەستەوە هەیە، ئەم ئەزموونە ژیانە ڕاستەقینەکەی مرۆڤە و لە نێوان دونیا و بەرزەخ و قیامەتدایە!!

شارێکی زۆر گەورە و زۆر نایابم بینی، هەرگیز وەصف ناکرێت!

پرسیارم کرد: بۆچی خوای گەورە بەڵا و نارەحەتی دێنێتە ڕێگامان!

پێیان وتم: هەتا گەشەی ڕۆحیتان نەوەستێت!!

هەتا مەقام و پلەی گەورەی پێ بە دەست بێنن!

هەتا لێرە ڕزگارتان ببێت!

دونیا دۆزەخێکی تەواوەتی بوو، لە چاو ئەو مەنزڵە بەرزەی من بینیم!

بەڵام قەدەری من وابوو بگەڕێمەوە بۆ دونیا و، لە کاتی دیاریکراوی خواییدا ساتێك لێرە بەن نابم و دەگەڕێمەوە بۆ نیشتیمان!



# خۆکوشتن'ئینتحار' مەترسیەکی گەورەیە بۆ قیامەت



ژنێك دەگێڕێتەوە دەڵێت: دوای ئەوەی لە هاوسەرەکەم جیا بوومەوە، زۆر بێ ئومێد بووم، ئەو کارە هەڵەیە چووبوە هزر و دەروونمەوە، کە من هیچ نیم و دەبێت خۆم لەناو ببەم.

لە لاوازی و تورە بوونی خۆمدا بڕیارە هەڵەکەم دا!

پێش خۆکوشتن داوای لێخۆشبوونم کرد لە خوای گەورە و، لەناکاو گولله لە دەستم دەرچوو، سنگم و سیەکانم پڕ بوون لە خوێن!

چاوەکانم کراوە بوون، بەڵام وردە وردە بیستنم نە دەما و، هێشتا شتیشم دەبینی!

هەستم کرد دونیا بەجێ دێڵم!

بینیم کە ڕۆحم لە لاشەم جیا بوویەوە، لە شوێنێکی زۆر زۆر ترسناك و بێ چارەدا خۆم بینیەوە!

هەستم بە سوتانی جەستەم دەکرد، بووم بە بوونەوەرێکی وا کە خودی خۆم خەمۆکی بووم، بێ ئومێدی بووم.

ترسێکی ئەوتۆ ڕووی تێکردم کە لە باس کردن نایەت، سەیرم کرد لەملاو ئەولامەوە خەڵکانی تری وەك من هاواریان دەکرد و داوای یارمەتیان دەکرد، هەمومان داد و بێ دادمان بوو!

هاوارمان دەکرد تەنها جارێکی تر بمانگەڕێنەوە بۆ دونیا، هەرگیزاو هەرگیز هەڵەی لەم جۆرە ناکەینەوە.

بینیم و بۆم دەرکەوت کە ڕۆح هەتا هەتاییە و، هەق و ڕاستەقینەیەکە و ئێمە بەهـۆی ئەوەوە زیندووین، بەهەشت حەق و ڕاستە دۆزەخ حەق و ڕاستەقینەیە، الله زاتێکی بـێ هاوتایە و ڕاستەقینەیەکی حاشا هەڵنەگرە!

نیەت و کاری دونیاو دوا ڕۆژتان دیاری دەکات، بە باش و بە خراپ.

گوێ لە حەقیقەت بگرن!

هەرچـی کێشـەیەکتان هەبـوو پەنـا بـۆ خـۆ کوشـتن مەبەن، چـونکە نە پەنـایە نە چارەسەر.

بینیم و زانیم کە دەستێک لەو سزا و ناڕەحەتیە منی دەرهێنا، ڕزگاری کـردم، ئیـتر نە خەمۆکی ما، نە ترس، نە دڵەڕاوکێ، نە ئازار، نە سوتان و نە نەخۆشی!

هەمووی گۆڕا و سەرلەنوێ لە دایك بوومەوە.

بردمیـان بـۆ شـوێنێکی بەرز و زۆر جـوان و لە دڵا شـیرین، چـوومە خزمەتـی پەروەردگار، بەڵام مۆڵەتی مانەوەم نەدراو گەڕێنرامەوە بۆ دونیا.

لەو گەشتەدا بۆ یەکەمین جار بوو هەست بە بەختەوەری ڕاستەقینە بکەم.

ڕێگای ناسینی خوای تاك و تەنهـا و، خۆشەویسـتی خەڵـك و بـێ ئومێـد نەبـوون هەڵبژێرن... دەبینەوە.



# منداڵان و ئەزموونی نزیکبوونەوە لە مردن

'جیمی' منداڵێکە ئەم ئەزموونە دەبینێت و پێی دەوترێت تۆ نەمردوویت و دەگەڕێیتەوە.

دایکت منداڵێکی دەبێت و پێویستە تۆ بەدەمیەوە بیت و یارمەتی بدەیت و لە پاشاندا لەگەڵ براکەت باش بیت.

کاتێك 'جیمی' گەڕایەوە بۆ دونیا، وێنەی ئەو نورانیانەی دەکێشا کە بینیبوونی و، زۆریان خۆش ویستووە!

وێنەی ڕووداوەکانیشی دەکێشا.

* 'کوری بلێر' منداڵێك بوو تەمەنی لە نێوان (٨ - ٩) ساڵاندا بوو، لە کاتی وەرگرتنی چارەسەردا حاڵەتێکی دەبینی و بە دایکی دەوت: دایە من دەچمە شوێنێك، ئەو کاتانەی چارەسەری کیمیایی وەردەگرم، ئەو شوێنە ناوی 'سامر لاندە' و لە ئاسمانەکانە.

وێنەی ئەو شوێنەی دەکێشا و دەتوت کۆشکی شوشەیە کە لە دەرەوە ناوەوە دیارە و لە ناویشەوە دەرەوە، بۆ منداڵەکانی تریشی باس دەکرد، ئەوانەی چارەسەری کیمیاییان وەردەگرت.

'کوری' بەو منداڵیە بە دایك و باوکی وت: من سوود لە چارەسەرەکە نابینم، وازم لێ بێنن گەشتەکە نزیك بۆتەوە.

کاتێك پزیشکەکەی و خێزانەکەشی دڵنیا بوون لە بەختەوەری منداڵەکەیان بە بڕیارەکەی، پزیشکەکەش دەیزانی چارەسەری کیمیایی بۆ ئەو سوودێکی نەماوە، ئیتر کۆتاییان بە چارەسەر هێنا و، 'کوری' گەڕایەوە ماڵەوە!

لە ئـامێزی خۆشەویسـتی دایکیـدا بە ئـارامی و دڵـی خۆشـەوە گەڕایەوە خـزمەت پەروەردگاری.

'ئیدك' مناڵێکی ترە و هەمان نەخۆشی هەبوو، ئەم ئەزموونەی بینیوە و دەڵێـت: مـن دەگەڕێمەوە بۆ ئەوێ کە شوێنی ڕووناکی و دامەزراوی و دڵنیایە.

لەوێ ئازادیەکی تەواوم هەبـوو، کـاتێ ئەم ئەزمـوونەی بینـی هەتـا مـردنیش هـیچ ترسێکی نەرێنی لە مردن نەبوو.

'ئیرەك' لە (١٩٨٠/١/٢٥) لە تەمەنی دوانزەساڵیدا کۆچی دوایی کرد.

'ئیرەك' نـامەیەکی بـۆ دایـك و بـاوکی بەجێهـێڵاوە و نووسـیویەتی: خەمـی منتـان نەبێت، پێشتر ئەوێم بینیوە، جیابوونەوەی ڕۆحم لە جەستەم ئازاری نیە.

ئەزموونی نزیکبوونەوەی 'ئیرەك'، پێش چەند هەفتەیەك بوو لە مردنـی و گەڕانەوەی هەمیشەیی بۆ بەرزەخ.

## عەمیدی خانەنشینی عێراق فهد سەعدون ئەزموونەکەی بینی



عەمید 'فەهد سەعدون' دەڵێت: لە ساڵی (١٩٦٥)ی زاینی لە زیندانی بەغداد بـووم و حـوکمی لە سـێدارەدانم بـۆ دەرچووبـوو، لە دڵتەنگـی و بـێ زاری و دژواریەکـی سەختدا بووم، لە زیندانی تاکە کەسیدا بووم و، بەرگە گرتنم زۆر ئەستەم بوو.

ماوەی ساڵێك بوو لە 'زیندانی تاکە کەسیدا' بووم و پردی ئارامگریم بچڕابوو.

کاتێك زانیم کە سزاکەم بۆ سووك ناکەن و بەربوونیشـم نەبـوو، بیـرم لەوە کـردەوە، بەناوی نەخۆشیەوە، کە هەنـدێ ڕۆژ داوای پزیشـك و سـەردانی بەشـی تەندروسـتیم دەکرد، کۆمەڵە حەبێکی زۆرم لای خۆم کۆ کردبۆوە!

هەموو حەبەكانم بە جارێكدا خوارد و، پاش كەمێك گێژ بوون، كەوتم و ئاگام لە خۆم نەما.

ڕاستەوخۆ تووشی سەرسامی هاتم، كاتێك جەستەی خۆمم دەبینی لەسەر زەویەكە كەوتبوو.

هەستامەوە، دەبینم من دوانەم، یەكێك بێ هۆشە و ڕاكشاوە و خۆشم كە ئاگام لە هەموو شتێك هەیە.

لە ژوورەكە بان كەوتم و بەرز بوومەوە، سەیر دەكەم هیچ بەربەستێك نیە ڕامبگرێت.

دوای ئەوە بەرز بوومەوە بۆ ئاسمانی بەغداد و، لەشێكی سوك و سۆڵم هەبوو، بە ئاسانی بێ هیچ گرفتێك بەرەو ئاسمان دەڕۆشتم.

كەوتمە پشتی هەورەكان و ڕۆژیش بوو، خۆرەتاوەكەی زۆر گەرم بوو، كەچی من هیچ هەستم نە بە گەرمی و نە بە ناسازی كەش و هەوا نەكرد، كەشێكی زۆر خۆش و دڵڕفێن بوو.

دەبینم دوو سەرتاپا سپی چاوەڕێی من دەكەن، ئاماژەیان بۆ كردم هەتا لێیان نزیك ببمەوە، ئاماژەكەش بە ئاماژە و ڕازی دەروونی بوو، زۆر باش لە یەكتر حاڵی دەبووین، ئەو دوو نورانیەش یەكێكیان كەمێك لەوی تریان باڵای بەرزتر بوو.

ڕاستەوخۆ یەكێكیان پێی وتم: بۆچی خۆتت كوشت؟!

نازانی خۆكوشتن حەرامە و تاوانە؟!

وتم: بەڵێ دەزانم حەرامە، بەڵام بەرگەی زیندان و سزام نەگرت.

وتیان: دەگەڕێیتەوە و نامریت، لێت بوراون و دەگەڕێیتەوە بۆ جیهانی ڕابردووت، واتە دەگەڕێیتەوە بۆ دونیا.

بیــرم لە هەر چــیەك بكــردایەتەوە، نورانیەكــان هەســتیان پــێ دەكــرد و وەڵامیــان دەدامەوە.

وتی: بەر لێ خۆشـبوون كەوتـی، لەبەر ئەوە سـەیر بـكە، سـەیری خـوارەوە بـكە، منیش سەیری خوارەوەم كرد زەوی بـوو، فـڕۆكەی ژمـارە (١٧)م بینـی كە فـڕۆكەكەی خۆم بوو، من فڕۆكەوان بووم، بەسەر ناوچەی بازیـانی سـلێمانیەوە بـووم لە بـاكوری عێراق.

ئەوە كۆتا ڕۆژی باكوری 'كوردستان' عێراق بوو، كە دەبوو من بۆردومـانی لادێـیەك بكەم لە بازیان.

من لە ئاسمان پیشانیان دامەوە، كە من لەسەر ئەو كـارە گیـرام و فەرمـانی سـێدارەم بۆ دەرچوو، كە دەبوو بۆردومانی ئەو لادێیە بكەم، چونكە كۆمەڵێـك پێشـمەرگە لەوێ بوون و ئابلۆقە درابوون و دەبوو من لەناویان بەرم.

پێشمەرگەكانیش خۆیان خزاندبووە ناو خەڵكە بێ چەكەكەی ئەو لادێیە.

لەبەر ئەوە من بۆم جیا نەدەكـرایەوە، تێكەڵـی یەكـتر بوبـوون، ئـافرەت و منـاڵ و پیاوی بێ چەكیان تیا بوو، لە ترسا ڕایان دەكرد و دەهاتن بەناو یەكدا.

وەستام و بە ئامێر پەیوەندیم كرد بە سـەرووی خـۆمەوە وتـم: هـاووڵاتیەكی زۆری دانیشتووی ئەو ناوچەیە كە جلی سـور و سـپی و زەرد لەبەرن و زۆرێكیـان ئـافرەت و مناڵ تێدایە، فڕۆكەكەشم نزم كردەوە و دڵنیـا بـووم كە زۆربەی سـڤیل و بـێ چەكـن و تاوانیان نیە، زیاتر لە (٤٠٠) هاوڵاتی بێ چەكی تێدایە.

وتیان: بۆردومانیان بكە!

وتم: ئاخر مناڵ باوەش بە دایكیدا دەكات لە ترسانا، من ناتوانم خەڵكـی بـێ چەك بۆردومان بكەم!!

وتیان: دەبێت بۆردومانیان بكەیت!

منیش وتم: بۆردومانیان ناکەم.

وتیان: باشە بگەڕێرەوە، کە گەڕامەوە دەست بەجێ زیندانی کرام و حوکمی لە سێدارەدانم بۆ دەرچوو.

هەموو ئەو ڕووداو و وت و وێژانەم لە ئاسمان پیشان درایەوە.

ئەو دوو نورانیە پێیان وتم: تۆ دەگەڕێیتەوە، بەڵام ئەگەر تۆش بمردیتایە، دەبوونە دوانزە کەس!!

وتم: تێ ناگەم.

وتیان: بە کات و ڕۆژی لای ئێوە، سبەی نا دوو سبەی، یانزە کەس ڕۆحیان بەرەو ئاسمان بەرز دەبێتەوە و دەمرن.

ئەوانەن کە بەڕێوەن و سەر دەکەون، سەیریان بکە.

وتم: ڕوویان لە من نیە، نازانم کێن؟

بە ئاماژەیەک ئەو دوو سەرتاپا سپیە، سیانیان ڕوویان وەچەرخاند و ڕوویان لە من کرد، 'عبد السلام عارف' سەرۆک کۆماری عێراق و، 'موحەمەد مجید و عبداللطیف الدراج' بوون.

"کەوتنە خوارەوەی فڕۆکەکەی عبدالسلام عارف لە ١٩٦٦/٤/١٣ دا ڕووی دا".

وتیان: ئەگەر پرسیارێکت هەبێت، پێش ئەوەی بگەڕێیتەوە بۆ دونیا پێمان بڵێ؟

وتم: ئایا کات و زەمەن لە لای ئێوە هەروەکو کات و زەمەنی ئێمەیە؟

وتیان: نەخێر

وتم: ئەی چۆنە؟

وتیان: زەمەن و کات لێرە نیە.

وتیان: سەیر بکە، منیش سەیری سەر زەویم کرد، باخ و بێستانەکەی باپیرم کە ناوی 'عبدالكريم' بوو بینیم، دایکمم بینی لە تەمەنی گەنجیدا بوو، منالّی دەبوو، چەند ژنێك بە دەوریەوە بوون، منالّەکە لە دایکبو، ئەو منالّە من بووم!!

وتیان: سەیری سی سالّی تەمەنی ڕابردووی خۆت بکە، وەك شریتێك هەموو ژیانی خۆت ببینە، بە هەموو وردەکاریەکانیەوە هەر چیەك خەلّکی پێی نەزانیبوو، هەر چیەك خۆم لە بیرم نەمابوو، بە تەواوی هەموویم پیشان درایەوە.

وتیان: ئەوسی سالّ تەمەنەی تۆ لێرە شتێکی ترە چونکە لێرە کات نیە.

وتم: تەواوە، بەو جۆرەیە.

وتم: ئێستا ئێمەی وڵاتانی عەرەبی، جەنگمان هەیە لەگەڵ ئیسرائیلدا ئایا جەنگی نوێ دروست دەبێتەوە لە نێوانماندا؟

وتیان: بەڵێ، بە کاتی ئێوە، دوای نزیکەی دوو سالّی تر جەنگ دەست پێ دەکاتەوە.

وتم: ئەگەر جەنگ دروست بوویەوە ئێمەی عەرەب سەردەکەوین؟

وتیان: نەخێر، لە جەنگەکەدا ئێوە دەشکێن.

وتم: بۆچی؟

وتیان: ئێوە خۆ خۆرن و پارچە پارچەن، ئەوان یەکپارچە و پتەون.

ئیتر من بێ دەنگ بووم.

وتیان: هیچ پرسیارێکت ماوە بیکەیت؟

وتم: نەخێر.

ئیتر ئاماژەیەکیان کرد گەڕێنرامەوە ناو جەستەکەم، بۆ ژوری زیندانی تاکە کەسی.

بەیانی بوو، من بەبێ هۆش کەوتبووم، کاتی دەست پێ کردنی دەوامی کارمەندانی بەندیخانە بوو، هاتبوون و دەورەیان لێ دابووم، هەواڵیان دا بە عەقید 'ناجی سعید'

که حاڵم پەرێشانە، ئەوانیش هەواڵیان دا بە نەخۆشخانەی 'ڕەشید'، من نەمدەتوانی قسە بکەم، حاڵم زۆر خراپ بوو، بەڵام هەستم کرد کە گوێم لە وتەکانیانە، من بە شەو حەبەکانم خواردبوو، بەڵام ئەوان بۆ بەیانی و کاتی دەوام پێیان زانیبووم.

پزیشکەکەی نەخۆشخانەی 'ڕەشید' وتبوی من هیچم بۆ ناکرێت، کاتی زۆری بەسەردا ڕۆشتووە، دەمرێت.

بەڵام فەرمانی گەڕانەوەم لە ئاسمانەوە درابوو، وردە وردە چاوەکانم کردەوە و خوای گەورە بە ئاگای هێنامەوە.

یەکێك هاتە ژورەوە و وتی: من "ئەبو لەیلام".

من وام زانی ئاسایشە، یاخود پۆلیسی نهێنی ناو سوپایە، بەڵام دوایی بۆم دەرکەوت کە هیچ پەیوەندیەکی بە ئاسایش و سوپاوە نەبووە، لەبەر ئەوە هیچم لە لای ئەو نەدرکاند.

دکتۆر 'نزار النائب' هات بۆ لام، هاوڕێم بوو، دوای سڵاو و بەخێرهاتن.

وتم: دکتۆر نزار یانزە کەس، کە سیانیان 'عبدالسلام عارف و موحەمەد مجید و عبدالطیف دراج'ن دەڕۆن، نەموێرا بڵێم دەمرن، دەترسام لێپرسینەوەی بەدوادا بێت!

وتی: یانی چی دەڕۆن، بۆ کوێ دەڕۆن؟

وتم: دەچن بۆ جیهانێکی تر.

وتی: حەبەکان کاری باشیان بە مێشکت کردووە، ئەوە تۆ چی دەڵێیت؟

دکتۆر نزار باوەڕی بە قسەکانم نەکرد، یان ڕاسترە بڵێم تێ نەگەیشت لێم!!

ڕۆژی دواتر ئەبو لەیلا هات بۆ لام وتی: لە بەصرە فڕۆکەکەی سەرۆك و تاقمەکەی "کە هەموویان یانزە کەس بوون" کەوتۆتە خوارەوە و مردوون.

وتم: کەواتە ئەبو لەیلا گوێ بگرە من ئەوەم بینی، ڕووداو و ئەزموونەکەم بۆ ئەبو لەیلا گێڕایەوە، کەواتە ئەزموونەکەم ڕاست بوو.

ئەبو لەیلا وتی: بەڵێ ڕاستە، بەڵام ئاگات لە خۆت بێت مەیگێڕەڕەوە، با شتێکت بەسەر نەهێنن.

ئینجا دکتۆر نزار گەڕایەوە بۆ لام و تکای لێ کردم بە دورو درێژی ڕووداوی نزیکبوونەوە لە مردنەکەی بۆ بگێڕمەوە، دکتۆر نزار وتی: دوێنێ سەر لە بەیانیەکەی کە هۆشت هاتەوە تۆ ئەوەت وت کە سەرۆك و چەند کەسێك دەچنە جیهانێکی تر، چۆن بینیت و چیت بینی؟

منیش سوێندم بۆ خوارد کە لەو بارەیەوە هیچت پێ ناڵێم، چونکە ڕۆژی پێشووتر گاڵتەی بە قسەکەم هات و هەروەها یەکێك لە نورانیەکان لە ئاسمان پێی وتم: مەیگێڕەرەوە، چونکە خەڵکی باوەڕت پێ ناکەن! وتیشی ئێمە ڕێگەت لێ ناگرین، بەڵام خەڵکی حاڵی نابن لە گەشتەکەت.

بەڵێ ئەوە بوو جەنگی عەرەب و ئیسرائیل دامەزرایەوە و عەرەب شکستی گەورەی بەسەرهات.

## ڕووناکی هەموو ژوورەکەی داپۆشی

یەکەم جاریان کە 'ئەزموونەکەم' بینی، تەمەنم هەشت ساڵان بوو، ئەوە بوو گواسترامەوە بۆ نەخۆشخانەی 'سان خوسیە' لە 'کالیفۆرنیا' و باری تەندروستیم ناجێگیر بوو، ساڵێکی تەواوەتی لە نەخۆشخانە مامەوە!

چەندە زەحمەت و گرانە مناڵێکی هەشت ساڵانە، ساڵێکی ڕەبەق لە نەخۆشخانە و ژوورێکی تەنهادا بمێنێتەوە!

یەکەم ڕۆژ بە باوکمیان وتبوو کە ژیانم لە مەترسیدایە.

سیەکانم ئاویان تیابوو، دەرزیان دەکرد بە پشتمدا و ئاویان لێ دەردەهێنا.

مـــن هەتـــاوەکو ئەو تەمەنە هەرگیـــز لە مـــاڵی خۆمـــان و لە قەرەبـــاڵغی دوور نەکەوتبوومەوە، لە ژوورێکی تەنهای نەخۆشخانەدا دانرام سـەردانیم لـێ قەدەغە کـرا، من بەو تەنهایی و دوور لە دایك و باوکم دادەڕووخـام، بەڵام بەشـێکی زۆر گرنـگ لە مندا هەبوو گوێی پێ نەدەدا.

هەستم کرد زۆر ئاسایم و لەسەر چرپاکەم ڕاکشاوم.

دەزانم ژورەکەم تاریکە، بەڵام لەم کاتەیا زۆر ڕووناك بـۆوە! مـن دانیشـتبووم، بەڵام جەستەم نا!

بە ڕۆح دانیشـتبووم، پرسیاریشـم نەبـوو کە بـۆچی بە ڕۆح دانیشـتووم، منـی ڕۆح سەیری جەستەی ڕاکشاوم دەکەم، جەستەم لە پشتمەوە ڕاکشاوە!

ئیتر ڕوونـاکیەکە گەشـاوەتر بـوو، هەتـا بەتەواوی ژوورەکەی داپۆشـی، هەسـتم بە خۆشەویستی و ڕەحمەت دەکرد، هەستم بە دەست لە ملانی خۆشەویستی و هێزێکـی بەرفراوانی گەردوونی دەکرد، من لەناو خۆشەویستی خـوای گەورەدا بـووم، ئیـتر مـن نازانم چەندە کاتم پێ چووە.

* 'جـۆن کینیـدی'م بینـی کـوژرا، ئەو کـاتە نەمدەناسـی جەنگـی ڤێتنـامم بینـی، ڕووداوەکـانی ئەو جەنـگەم بینـی، کـۆپتەر و هەرای جەنـگەکەم دەبینـی، خـۆمم لە گۆڕەپانی جەنگەکەدا بینیەوە، ئەو خانوانەی لە داهاتوودا نیشتەجێیان دەبم بینیمن!

کار و پیشەکەمم بینی لە داهاتوودا...

خێزانەکەمم بینی، کە لە هەمان تەمەنی خۆمدا بوو، واتە هەشت ساڵان بوو، تـا ئەو کاتەش نەبینی بووم نە دەمناسی.

بەڵام کە یەکەم جار بینیم، هەمان کەس بوو کە لەو گەشتەی نزیکـی مەرگـدا بینـیم و، ناسیمەوە!

مناڵەکانی خۆمم بینی "واتە کە لە داهاتوودا لەو خێزانەم مناڵم دەبێت".

پەنجا ساڵی تەمەنی داهاتووی خۆمم بینی، زۆر زۆر شتم بینی، کە زۆر گرنگ و سەرنج ڕاکێش بوون.

کاتێك کە 'کینیدی' بوو بە سەرۆك.

وتم: ئەم پیاوە دەکوژرێت، چونکە خێرا بیرم کەوتەوە.

هەندێ شت لە گەشتەکەم هەبوو بیرم چوویەوە، یاخود بیرم برایەوە، هەتا کاتێك کە ڕووداوێك ڕوودەدات، بیرم دەکەوێتەوە کە من لە ئەزموونەکمدا بینیومە.

بینیم خەڵکانێکی زۆر لەسەر لێوارێکی ترسناك، لە هەڵدێرێکدا چاوەڕوانیان دەکرد و ڕاگیرابوون...

لە دوای شەش ساڵ لە ئەزموونەکەم خێزانەکەمم بینی، تەمەنی چواردە ساڵان بوو ئەو کاتە، منیش چواردە ساڵان بووم، دوای ئەوەی کە من لەو قوتابخانەیە نەمام، بەڵام دڵنیا بووم کە ئەو دەبێتە خێزانی داهاتوم.

من ڕۆشتمە زانکۆ و لە دوایدا جەنگی ڤێتنام و سەربازی و، جەنگی ڤێتنام چۆنم بینی هەمان شت هاتەوە ڕێگام.

هێشتا لە دوا ناوەندیدا بووم، ڕۆشتم بۆ لای بەڕێوەبەرەکەمان کە ناوی 'ستانغاغ' بوو، پێم وت: سەرۆك 'کینیدی' دەکوژرێت!!

ئەویش ترسا و وتی: بێ دەنگ بە، بچۆرەوە پۆلەکەی خۆت.

ئەوەبوو هەفتەی دواتر لەناو کەژاوەیەکی جەماوەیدا کوژرا.

ئەوە ئەگەر ئێستا بووایە، لە دەستی نوسینگەی لێکۆڵینەوەی فیدراڵی نەجاتم نەدەبوو، خێرا دەگەیشتنە سەرم و، ژیانیان لێ تاڵ دەکردم. ئەو ئەزموونە زۆر زۆری فێرکردم.

ئەو ئافرەتەش بوو بە خێزانم و پێکەوەین، هەروەکو لە ئەزموونەکەی منالیمدا بینیم.

# فریشتەی مەرگم زۆر خۆش دەوێت

ئەزمـوونی 'نزیکبـوونەوە لە مـردن' دیـاردەیەکی دێرینـی مرۆڤەکـانە. 'مـوحەمەد شەفیعی' لە مـاوەیەکی کەم و کورتـدا سەرسـام دەبێـت بە جـوانی فریشـتەکانی خـوا، فریشتەی گیان کێشان بە جوانترین شێوە و ناوەزەترین میهرەبانی دەبینێت!

'مـوحەمەد شـەفیعی' دەڵێـت: ئامـادەم هەزار جـار بمـرم، تەنهـا لەبەر ئەوەی بە خزمەتی فریشتەی مەرگ بگەمەوە.

ئەم مرۆڤـانەی 'ئەزموونەکـان' ڕاگوێزراوەکـانی جیهـانی هەمیشـەیین، هـاتونەتەوە هەتا هەواڵی جیهانی هەمیشەیمان بۆ بێننەوە.

'موحەمەد شەفیعی' دەڵێت: من خەڵکـی وڵاتـی ئێـرانم، لە شـاری 'ئەهـواز' ژیـان بەسەر دەبەم، تووشی درمی 'ئەنفلونزا' بووم، لە ساڵی (١٣٧٥) شەمسیدا.

ئێوارەی ڕۆژی هەینی بـوو، هەسـتم کـرد شـتێك ڕوودەدات، بەڵام نەمـدەزانی ئەو شتە چیە؟

لەناکاو مردنم بیر کەوتەوە، هەستم کرد کە دەمرم. خێزانەکەمم بانگ کرد.

پێم وت: منداڵەکانم بۆ کۆ بکەرەوە با بێن بۆ ئێرە.

من چوار کچم هەیە کە شویان کردووە، هەمووومان لە هۆڵەکە کۆ بـوینەوە، خێـزانم بە پێوە ڕاوەستا بوو، وەك ئەوەی باوەڕ نەکات بەم هەڵسو کەوتە سەیرەی مـن، دەیزانـی چی دەڵێم، لەبەر ئەوە وتی: ئەرێ پیاوەکە تۆ وڕێنە دەکەیت؟

وتم: نا وڕێنە ناکەم، دانیشە و گوێم بۆ بگرن، مـن دەمـرم، ئەوە و ئەوە بـکەن و.... ئیتر نازانم دوای ئەوە چی ڕووی دابوو!

دەگونجێت مرۆڤ، یاخود هەندێك لە خەڵکی، پێش مردن بە ساتێکی کەم یاخود زۆر دەرك بە مردنی خۆیان بکەن، یاخود پێی بوترێت! خێزانم دەڵێت: ئیتر دوای ئەو قسەیە بەلای ڕاستدا کەوتیت.

منیان گەیاندبووە نەخۆشخانە و لە ژێر ئۆکسجیندا دایننابووم! بیست ڕۆژ لە 'ICU' لە ژێر چاودێری وردا بووم.

لە دوایشدا چل و پێنج ڕۆژی تریشیان بۆ تازە کردبوومەوە لە 'ICU'، لە بیست ڕۆژی سەرەتادا من مردنم بینی.

سیانزەی ڕەجەب بوو، خێزانم خێری بۆ کردبووم و خواردنی بەخشیبوویەوە، خوشکەکەم تەلەفۆنی بۆ کردبوو، پێی وتبوو: موحەمەد مردووە!

من لە یەك چاو تروکاندا، بە ئازادی و بێ هیچ گرفتێك خۆم لەسەر و جەستەکەمەوە بینیەوە.

ئەگەر مرۆڤ پشتیەکی قورس بە پەستانێکی زۆر بخرێتە سەر دەمی و، نەهێڵرێت هەناسە بدات و لە کوت و پڕێکدا لاببرێت، چۆن ئازادانە هەناسە دەدات و ڕزگاری دەبێت، من بەو جۆرە چووم بە ئاسماندا و ئازاد بووم و هیچ ناخۆشی و گرفتێکم نەما. من هەموانم دەبینی، ئامادەی هەموو شوێنێك دەبووم، دوو جار کارەبایان لە دڵم دابوو، من پێم ناخۆش بوو هەوڵی گەڕانەوەم دەدەن، ئاگام لێ بوو!

ئیتر بێ ئومێد بوون لێم و چەرچەفێکیان پیادام و بە جوانی دایان پۆشیم و شەتەکیان دام، ئامادەیان دەکردم بۆ تەرمانە.

من لە سەرەوە بووم و هەموویم دەبینی.

لەو کاتەی خەریك بوو بمخەنە سەر عەرەبانەیەکو بمبەن، باوکم، دایکم، خێزانم بینی، هەموویان لەماڵەوە بوون!

خـۆم و دایـك و بـاوكم مـاوین و له ژیانـداین، له هه‌مـان كاتـدا نه‌خۆشـخانه و چاودێری ورد و خۆمم ده‌بینـی 'لاشـه‌كه‌م'، ئه‌گه‌ر بـراكه‌م له 'ئالاسـكای' جه‌مسـه‌ری زه‌وی بوایه و برایه‌كـی تـرم له جه‌مسـه‌ری بـاكوری زه‌وی بـوایه، ده‌متـوانی بـێ هـیچ گرفتێك له یه‌ك كاتدا هه‌ردوكیان ببینم.

بینیم كه له ماڵه‌وه بوو به شیوه‌ن و گریان، به‌ڵام له لای من گرنـگ نه‌بـوو! بـاوكمم بانگ كرد، به‌ڵام پێـی نه‌زانـیم و وه‌ڵامـی نه‌دامه‌وه، له دوایـدا، واته دوای ئه‌وه‌ی چـاك بوومه‌وه چاوم لێ بـوو ده‌سـه سـڕێكی له گیرفـانی ده‌رهێنـا و فرمێسـكه‌كانی چـاوی سڕی، كه هاته ڕا سه‌رم و سه‌یری ده‌كردم و ده‌گریـا، ده‌سـتی كـرد به گیرفانیـدا ده‌سـته سڕه‌كه‌ی ده‌ربێنێت.

وتم: بابه ساتێك بوه‌سته، ده‌سته سڕه‌كه‌ت ده‌رمه‌هێنه!

وتی: بۆچی كوڕم.

وتم: تـۆ ده‌ته‌وێـت ده‌سـته سـڕێك ده‌ربێنیـت، كه ڕه‌نگـی سـپیه و له گۆشـه‌یه‌كیدا بازنه‌یه‌كی تێدایه.

باوكم داچڵه‌كی و وتی: موحه‌مه‌د تۆ بێ هۆش بوویت و له چـاودێری ورد بوویـت و له‌ناوماندا نه‌بوویت، دایكت ئه‌م ده‌سته سڕه‌ی بۆ دروست كردوم، تۆ چـۆن بینیـوته، له كوێ پێت زانی؟

وتم: بابه كاتێك كه من ڕۆح بووم و هاتم بۆ لاتـان له مـاڵه‌وه، ئه‌و ده‌سـته سـڕه‌م به ده‌ستی تۆوه بینی، كه تۆ بۆم ده‌گریایت. باوكم سوپاسی خـوای گه‌وره‌ی كـرد له‌سـه‌ر گه‌ڕانه‌وه‌م.

كه كفنیان كرده به‌رم، زۆر دڵئارام و دڵخۆش بـووم، چـونكه بێـزار بـووم له بینینـی لاشه‌كه‌م.

لە ماڵی ئێمە شیوەن و گریان بوو، لە شوێنێکی تر خەریکی جەستەکەم بوون، ئەمانەم لە یەك کاتدا دەبینی.

لە چرکەیەکدا خۆم بینیەوە لە لادێکەی خۆمان بووم، لەو کاتەی لە دایك دەبووم، لادێکەمان ناوی 'جاروم'ە لە 'هفت کەلە'وە نزیکە، دوای ئەوە گەڕامەوە بە دایك و باوکم وت: من خۆم بینی کە لە ژێر درەختێکی ماڵی باپیرم لە دایك بووم، دایکم وتی: بەڵێ کوڕی خۆم چۆنت بینیەوە بەو جۆرە بوو.

بینیم باپیرەم لە خۆشی هاتنە دونیای من، تەقەی دەکرد بە ئاسماندا، نەریتی ئەوسا وابوو بۆ منداڵی یەکەم تەقە کراوە بە ئاسماندا.

باپیرەم بە سواری ئەسپێکەوە هات و دوو جار تەقەی کرد.

مریشك و کەڵەشێرم بینی لە حەوشەکەدا.

ژنی دراوسێی ماڵی باپیرم لەگەڵ دایکم دانیشتبوون. ئەو برسێتیەم هەست پێ کرد کە لە دوای لە دایك بوونم چەشتم، زانیم کە منداڵ دەگری هۆکارەکەی برسێتیە.

لە ژووری چاودێری ورد پیاوێك لە بەردەمم ڕاوەستابوو، زۆر جوان بوو!!

هەرگیز کەسی ئەوەندە جوانم نەبینیوە، پۆشاکی سپی پۆشی بوو، سپی بوو نەك کرێمی.

نازانم بە چ زمانێ قسەی لەگەڵ دەکردم، بەیەکەوە دەدواین و لە یەکتر تێ دەگەیشتین بە باشترین شێوە.

ئەو زاتە نورانیە ئیزرائیلە یان فریشتەی مەرگ یان هەر چیەك، من پەیوەندیەکی زۆر توند و تۆڵم لەگەڵی هەبوو،

پێم وت: باوکم دەوێت.

وتی: ئەوە باوکتە.

وتم: خێزان و کچەکانم دەوێت.

وتی: ئەوە خێزانت و کچەکانتە.

هەموویانم بینی، بەڵام وازم لە هەموو کەس و کـارم هێنـا و پەیوەسـتی ئەو فریشـتە ئازیزە بووم.

ئەو دڵنیایەی لەوەوە دەستم کەوت هەرگیز لای کەسی ترەوە نەمبینیوە.

خوا شاهیدە، ئاواتە خوازی ئەوەم، ڕۆژانە هەزار جار بمرم و بگەڕێمەوە بۆ دونیـا و دیسان بمرمەوە، تەنها لەبەر ئەوەی بگەمەوە بە خزمەتـی ئەو فریشـتە ئـازیزە، هێشـتا بە کەمی دەزانم!

ئەو فریشتەی مردنە زۆر جوان و مامەڵە شیرین بوو، ڕەگەزی دیـاری کـراو نەبـوو، واتە ئێمەی مرۆڤ نێر و مێین، ئەو بەو جۆرە نەبوو، زۆر ڕووخۆش بـوو، نەرم و نیـان، زۆر زوو هۆگری دەبیت.

وا دەبینم خێرایی ڕۆشتنی ڕۆح، زۆر زیاترە لە خێرایی تیشك، نە زەمـان و نە شـوێن ئەرزش و باس و خواسی نیە و نامێنێت.

پێنج ڕووناکیم بینی کە دەوری ئەو زاتە نورانیەیان دابوو، ئێمە لە ژوورێکـی وردبینـی ورد، پێنج کەس بووین بێ هۆش بووین.

چواریان مردن و تەنها من گەڕامەوە و نەمردم.

ئەم فریشتە نورانیە یەکێك لە تۆپەڵە نورانیەکانی دایە دەستی من و پێـی وتـم: وەری بگرە!

نازانم بە فارسی کە زمانی خۆمە پێی وتم: یاخود بە زمانێکی تر بوو، گرنـگ ئەوەیە زۆر باش لە یەکتر تێدەگەیشتین.

هەر ئەوەندەی تۆپەڵە نورانیەکەی دایە دەستم، نەدەسـتم سـوتا، نە ئـازاری هەبـوو، یەکسەر خۆم بینیەوە لە ژوری وردبینی و جوڵامەوە.

یەکێك لە پزیشکەکان وتی:ئەوە دەستی دەجوڵێنێ.

شاشەکە لێدانی دڵی خوێندەوە.

یەکێك لە خزمەکانم دەڵێت: من لە پەنجەرەکەوە چاودێری حاڵەتی تۆم دەکرد و ئاگادارت بووم.

یەکێك لە پەرستیارەکان دەگریا، یەکێکیان پێ دەکەنی و صەڵاواتی لە حەزرەتی ڕەسوڵ دەدا ﷺ.

دەڵێت: وتم ئەوە چی ڕووی دا؟

وتیان: مردوویەك زیندوو بوویەوە.

براکەم پەیوەندی کردبوو بە ماڵەوەمان کە موحەمەد نەمردووە و گەڕاوەتەوە.

هەرچەندە زەنگی تەلەفونی لێ دابوو، کەسێك هەڵی نەگرتبوو، چونکە هەواڵی مردنی منیان پێشتر دابوو، کە هەڵی دەگرێت دەڵێت موحەمەد نەمردووە و هۆشی هاتۆتەوە.

ئیتر هەموویان پرسەیان بەجێ هێڵا بوو، هاتبوون بۆ نەخۆشخانە.

خێزانیشم دەستی کردبوو بە بەخشینەوەی خواردنی خێر.

من تێکڕای مانەوەم لە نەخۆشخانە (٧٥) ڕۆژ بوو.

بە فریشتەکەم وت: من نامەوێت بەجێم بهێڵێت و بگەڕێمەوە دونیا.

فریشتەکە وتی: تۆ کارت لە دونیادا ماوە و هێشتا کاتی بەرزەخت نەهاتوە.

ئیتر کوت و پڕ کەوتمەوە ناو جەستەکەی خۆم.

ئەگەر مرۆڤ خۆی بکوژێت و بگەڕێتەوە بارەگای خودا حاڵی باش نابێت، جوانی لە دەست دەدات.

من ماوەی سی و پێنج ساڵ خزمەتم هەبوو لە بەڕێوەبەرایەتی کارەبا، دوای ئەوەی خانەنشین کرام، دیاریان پێ دام، لەلایەن هاوپیشەکانم و بەڕێوەبەرایەتی کارەبای

'خوزستان'، وەختێ خوای گەورە مرۆڤێك خەڵات دەكات و گیانێكی پێ دەبەخشێت و دەینێرێتە دونیا، لە دوایدا دیاری و خەڵاتێكی گەورەتری بۆ دەنێرێت، ئەویش مردنە.

مردن جوانە، شیرینە، دیاری و خەڵاتی پەروەردگارە، لە كاتی شیاو و بۆ هەر كەسێك لە كاتێكی بڕیار لێ دراودا دەینێرێت.

خراپە بە گشتی بۆ ئەو دونیا مەترسی دارە، ئەوانەی مافی خەڵكیان لایە، لە سەدا سەد بە ئاسانی قوتاریان نابێت.

زۆر بیری فریشتەی مەرگ دەكەم، ئومێد دەكەم ئێستا گوێی لێم بێت، تامەزرۆی دیداری ئەو و فریشتەكانی تریشم.

بیست و دوو ساڵ تێپەڕیوە بەسەر گەشتەكەمدا، هەرگیز لە بیرم ناچێتەوە، من ئێستا لە دوای ئەو هەموو ساڵە، لە گەرم و گوڕی و دڵ گەرمیم بۆ ئەو ئەزموونە گرنگە هەموو گیانم ئارەق دەكاتەوە، وەختێ دەیگێڕمەوە، حاڵم دەگۆڕێت دڵم تازە دەبێتەوە، هەرگیز لە بیرم ناچێتەوە.

ئەو كەسانەی وەك ئەم ئەزموونەی منیان بینیوە دەزانن من چی دەڵێم، هەست بە كرۆكی ئەو ڕاستیە دەكەن.

هەر چەندە ساڵانێكی زۆر بۆ هەموو كەسێكم نەدەگێڕایەوە، بەڵام ئێستا دەڵێم زۆر پێویستە ئەوەی ئەزموونەكەی بینیوە با بیگێڕێتەوە.



# ئەزموونی 'موحەمەد زەمانی'



'موحەمەد زەمانی' لە دوای چل ساڵ ئەزموونەکەی دەگێڕێتەوە، پێنج ساڵ ئەزموونی کەسانی تری بینی، لە تەلەفزیۆن و کۆڕ و سیمیناری تایبەت بە ئەزموونەکانی نزیکبوونەوە لە مردن، ئینجا بڕیاری دا ئەزموونەکە بگێڕێتەوە، کە گێڕایەوە فرمێسکی بە چاوی ئامادەبواندا هێنایە خوارەوە.

'موحەمەد زەمانی' دەڵێت: باشترە بڵێم، من لە دوای ئەزموونەکەم لە دایک بووم. چونکە بۆم ڕوون بویەوە کە ژیانی دونیا لە خەون و خەیاڵ و وەهمێك زیاتر نیە لە بەرامبەر قیامەتی هەتا هەتاییەوە.

لە دوای پشووەکانی جەژن، لە شاری 'مەشهەد'ەوە ویستم بگەڕێمەوە بۆ 'ئەصفەهان' کە ماڵمان لە ئەصفەهان بوو، ئەو کاتە تەمەنم (٢٧) ساڵ بوو، ژنم نەهێنابوو.

ئەزموونەکەم لە ساڵی (١٩٥٥)دا بوو.

لەسەر کارەکەم مۆڵەتم وەرگرت و، 'قۆچان'م تێ پەڕاند، ئۆتۆمبیلێکی جۆری 'لاندروزر'م بینی لە سایدەکەی تر، لە ڕێڕەوی خۆی ترازا و بە خێراییەکی زۆر ڕووی لە ئۆتۆمبیلەکەی من کرد، من چوومە سەر گڵەکە و لە دەستم دەرچوو، سەیارەکەش خۆی کێشا بە مندا و، وەرگەڕام و سەیارەکەم کەوتە سەر سەقف.

مەکینەکەی کاری دەکرد و، لایتەکانی لە کار نەکەوتبوون، منیش هەڵواسرا بووم، لەو کاتەشدا پاسێك هات و ڕووداوەکەیان بینی.

دابەزین و هاتن منیان دەرهێنا، ئەو کاتە خەڵکی گرنگی نەدەدایە پشتوێنی سەلامەتی، سەیارەیەك هات و بەرەو 'قوچان' دەچوو، شەقامەکە خاڵی بوو لە هاتوچۆکەران، منیان لە پشتەوەی سەیارەکە سەرخست، بە بەتانیەك دایان پۆشیم کە

بۆنێکی ناخۆشی لێ دەهات، چونکە ئەو سەیارەیە تایبەت بوو بە گواستنەوەی مەڕو ماڵات، من ئەوەندە پڕ ئازار و بریندار بووم، گرنگیم بە ناخۆشی شوێنەکەم نەدا، نزیکترین شار 'قوچان' بوو، بردمیان بۆ نەخۆشخانەی قوچان - بەشی نەشتەرگەری فریاکەوتن.

پزیشکەکان وایان دەبینی کە ئەگەر بێهۆش بکرێم دەمرم، لای چەپی سەر و مل و باڵم زیانی زۆری بەرکەوتبوو، هەستم دەکرد کۆتایی ژیانمە، یاخود کەم ئەندام دەبم و کارەکەم لە دەست دەدەم.

چاوێکم زیانی بەرکەوتبوو، هێشتا لەناو جەستەی خۆمدا مابووم، لە کوت و پڕا هەموو شتێك گۆڕا، هەستم بە پشوویەکی گەورە و، دڵخۆشیەکی زۆر زۆر دەکرد، هەستم بە ڕازی بوون دەکرد لەوەی کە تێی کەوتووم، ڕووناکی و نورێکی گەورە، ڕەنگێکی بێ شومار دەرکەوت، هەستم کرد زۆر بە قوڵی و بە کاملی دەبینم، لە بن میچی ژووری نەشتەرگەریەکەوە هەموو شتەکان بە باشی دەبینم، وەك ئەوە بوو بە گۆشەی (٣٦٠) پلە ببینم.

زۆر شت لە یەك کاتدا ڕووی دەدا، چوومە ناو ڕێگا و مەسارێکی زۆر جوانەوە، وەك تونەیلێك وابوو، بۆ سەرەوە سەردەکەوتم، دورو درێژ بوو، هەستم بە لاو دیوارەکانی نەکرد، وەك ئەوەی هەڵگیرابێت، لە سەرەتای تونەیلەکە ڕەنگێکی سەوزم دەبینی، بەڵام ڕەنگەکەی دەگۆڕا بە ڕەنگی تر و دەجوڵا و تێکەڵی یەکتر دەبوون، دەتوت ڕەنگەکان قسەت لەگەڵ دەکەن، هەتا زیاتر سەردەکەوتم لە تونەیلەکە شتانی جیاواز ترم دەبینی، خەڵکیم دەبینی کە هەچ یەکێکیان سەرقاڵی شتێ بوون و بە جیاواز دەجوڵان، کۆتایی تونەیلەکە ڕووناکیەکی پرشنگدار بوو، وەك ئەوە بوو سەدان خۆر لەو شوێنە هەڵقولابێتن و پرشنگ بدەن، بەڵام هیچ ئازاردان و گەرمیەکی سوتێنەری نەبوو، ئەو ڕووناکیە وەك دەرگایەك بوو بەسەر ڕووناکیەکی گەورە تردا بکرێتەوە.

لەوێـدا گەشـتم بە کـۆمەڵە خەڵکانێـك کە هەنـدێکیان دەڕۆشـتن و هەندێکیشـیان دەهاتن، وەك شەپۆلی بازنەیی دەجوڵان، هیچ یەکێك لەو کەسـانەم لە دونیـادا نەبینـی بوو، بەڵام دەمزانی ئەوانە کێن؟ دەمزانی کە چۆن کەسایەتیەکیان هەیە، دەمزانی بـنەچە و ڕەچەڵەکیان کێیە و لە کوێوە هاتون!!

تایبەتمەندی یەك بە یەکیانم دەزانی.

کە زۆر سەردەکەوتم ڕەنگی سەوزی ڕوونـاکیەکە کەمـی دەکـرد، بەڵام جـوانیەکەی ئێجگار دڵڕفێن بـوو، کە گەیشـتمە ڕوونـاکیە گەورەکە، بە تەواوی کەوتمە دڵئـارامی و پشـوو بەختەوەریەکـی بـێ سـنور، وەك ئەوەی کەسـێك بە ئـازاری دان ئێشـەیەکەوە بناڵێنێـت و لە دوایـدا حەبێکـی ئـازار شـکێن بخـوات و ئـازاری نەمێنێـت، چـۆن ئیسراحەت دەکات و ئازاری نامێنێت.

من زۆر لەوە زیاتر گەیشتمە ئارامی و دڵنیایی تەواوەوە.

کاریگەری شتەکانم دەبینی لە کاتی ڕوودانیاندا، تەنانەت بە ماوەیەکی کورت پـێش ڕوودانیان، شتانێکی زۆر وردم دەبینی دەربـارەی پزیشـك و کارمەنـدەکان کە لە ژوری نەشتەرگەریدا بـوون، یەکێـك لە پزیشـکەکانی هـۆڵی نەشـتەرگەری کە سـەیرم کـرد، سەرسام بوو.

وتم: باشە بۆچی لەوەو پێش کە من سـەیری خەڵکـیم دەکـرد تەنهـا لە یەك ڕووەوە دەمبینین!!

بەڵام ئێستا لە هەموو ڕووەکانەوە دەیانبینم!

هەستم کرد پێویستم بە لا کردنەوە نیە بۆ هیچ جۆرە بینینێك.

بینیم یەکێك لە پزیشکەکان هەموو توانای خـۆی چـڕ کردبـوویەوە، بـۆ ئەوەی مـن ڕزگار بکات.

بیر کردنەوەیم بینی، کە چۆن بیری لە ڕزگار کردنی من دەکردەوە.

هەموو گۆڕان کاریەکان لەسەر جەستەی لای من دیار بوو دەمبینی!

مۆزیك لەویٚ پڕ مانـایە، هەمـوو ڕەنگێـك، هەمـوو بـۆنێکی خـۆش و تـازەیە و لە تەواوی جوانیـدایە، هەمـوو شـت لەویٚ مانـای هەیە، دەڵێـی هەمـوو دونیـا لەگەڵـت دەدوێت، بەبیٚ ماندوو بوون و بێزار بوونێك.

هەمـوو گەردیلەیەکـی گەردوون هـاوار دەکـات کە گەورەیەك و بـیٚ هاوتـایەکی گەورەترین دروست کار و ڕێك خەر و جوڵێنەرێتی.

هەستم بە گەورەیی خوا دەکرد، لە هەموو پێکهاتەیەکی بوونمدا.

ناتوانم زۆرینەی ئەوەی لەویٚ بینیم بیگوازمەوە بۆ ئێرە، چـونکە ئەوەنـدە پـڕ مانـا و گەورەیە، ناکرێت بەناو جیهانی فانی ئێرەدا ببرێت و مانای ئەوێی بمێنێت!!

هەستم بەو هەموو خۆشەویستی و عیشقە کرد کە داپۆشیبووم.

من دەمتوانی لە تەواوی هەست و نەستەکانی هەر کەسێکی دونیادا گـوزەر بـکەم و لێی تیٚ بگەم!

بینیم پزیشکەکە کە چارەسەری منی دەکرد ڕەنگ و شێوەی گۆڕا.

واتە: پزیشکەکە بـیٚ ئومێـد بـوو لەوەی کە بتوانێـت مـن لە مـردن ڕزگـار بکـات، چونکە من حاڵی جەستەییم خـراپ بـوو، هەمـوو ئاماژەکـانی لێـدانی دڵ و هەناسـە، ئەوەی دەگەیاند کە من ژیانم بەجیٚ هێشتووە و مردوم.

بینیم ڕووناکیەك لە گۆشەیەکی دیـاری کـراوەوە هـات، زۆر ڕۆشـن بـوو، سـەرنج ڕاکیش و پرشنگدار بوو.

لەو ساتەدا بینیم هەموو ئەوانەی لە دەوری مـن بـوون، ون بـوون لە پـێش چـاوان، هێشتا من لە سەقفی ژوری نەشتەرگەری ماومەتەوە، هێشتا نەهـاتبوومەوە سـەر زەوی، لەو هەموو خۆشی و موحیبەتەوە، هاتمەوە ئەو حاڵەتەی کە هەستم دەکـرد بە تەنهـایی خۆم، بەبـیٚ ویسـتی خـۆم دەسـتم کـرد بە گریـان، گریانێـك کە ئـارام بەخـش بـوو،

خۆشترین ڕۆژی ژیانی دونیام ئەو گریانە بوو، لەو چرکەساتەدا بوو، ئاواتە خوازم جارێکی تر بگەڕێمەوە ئەو شوێنە، ئیمکان نیە بینین و ڕستەیەکی ئەویٚ بە کەماڵی ئەوێوە بگاتە ئێرەی فانی.

ئەو چرکە ساتەنەی لێرە نەبووم، نازانم چەندین ساڵی ئەویٚ بووە، ئەزموونەکان وەك خەونێك نین کە دەبینرێت.

من هەر پێنج هەستەوەرەکەم لە دەست دابوو، ئینجا ئەو گەشتە مەلەکوتیەم ئەنجام دا.

کاتێ لەویٚ سەیری گیایەکم دەکرد، دەمزانی چی دەگوزەرێت لەناو ئەو گیایەدا، ئاوی ناو ڕەگە وردیلەکانم دەبینی کە لە (١٠) ملیمەتردا دەجوڵا، ناو ڕیشاڵەکانم دەبینی!!؟

گوڵێکی ئەویٚ چێژ و جوانی و مانای زۆرت پێ دەدات بەبێ ئەوەی چاوەڕوانی هیچ بکات لە تۆ یان کەسی تر!

کە دەچوومە بەردەم گوڵێك هەستم بە هەموو هەستەکانی دەکرد، هەموو شتێکی ئەویٚ دەرخراو بوون و خزمەتەکانی خۆی دەکات، من گوێم لە بۆنی گوڵ دەگرت، لەگەڵ ڕەنگەکەی دەدوام، کە دەڵێم بینین و بیستن و وتن، بەو جۆرە نا کە لێم تێگەیشتوون و پێی ڕاهاتووین.

زۆر کردار و نیەتی خۆمم پیشان درایەوە، بەڵام هەرگیز نەمزانیوە کە ئەوەندە گەورە و پڕ بایەخ بووە!

بەش بەشی بیر کردنەوە و نیەت و کرداری باش و خراپ دەبینیتەوە و هیچی ون نابێت.

نموونەیەکتان بۆ باس دەکەم، هەتا بزانن چ مامەڵەیەکی ورد دەگوزەرێت!

کاتێك تەمەنم شانزە ساڵان بوو، یاریم لەگەڵ هاوتەمەنێکی خۆمدا دەکرد، شەڕمان بوو، بۆکسێکم لە دەم و چاوی دا.

ئەو هاواری لێ هەڵسا و، منیش ڕامکردەوە بۆ ماڵەوە.

شەقامەکە قەرەباڵغ نەبوو، زۆربەی ماڵەکان دەرگای حەوشەیان کراوە بوو، بە خێرایی لە دۆلابێکی ماڵەوەدا خۆم حەشاردا، وەك سروشتی منداڵی، وام دەزانی دێن و دەمگرن، زۆر دەترسام، لە دوای ماوەیەك کە هیچ شتێك ڕووی نەدا، هەستم بە هێمنی کرد و، لە دوایدا جارێکی تر ڕۆشتمەوە دەرەوە و دەستم کردەوە بە یاری کردن، ئەوە یەك ڕووداوە لە ڕووداوەکانی ژیانم، دوای ئەوەی ئەزموونەکەم بینی، ئەم ڕووداوەم لە هەموو ڕەهەند و گۆشەکانیەوە بینیەوە، بینیم کاتێ بۆکسەکەم لێ دا، تیشك دانەوەی گەورەم بینی لە هەموو بوون و بونەوەردا، کە بڵاو بۆوە بە هەموو جەستەیدا، وەك ڕووناك کەرەوەیەکی کارەبایی بەهێز بە هەموو لایەکدا تیشکی ڕووناکی سلبی بڵاو دەکردەوە و بەر خەڵکی تریش دەکەوت، وەك تیر بەر خەڵکی دەکەوت، کاریگەری خراپی بەجێ دەهێڵا و ئەو کەسەی بەجێ دەهێڵا و بەر یەکێکی تر دەکەوت، بەو جۆرە کاریگەری خراپ بڵاو دەبوویەوە و ئەو کەسەی بەجێ دەهێڵا و بەر یەکێکی تر دەکەوت، بینیم ئەو کارە خراپە چ ڕەنگدانەوەیەکی خراپی درێژخایەن بەجێ دەهێڵێت، چۆن کار لە ئەتۆمەکانی گەردوون دەکات، بەر دراوسێکان و نزیکەکان دەکەوت و، زیاتر بۆ ئەوان نەرێنی بوو.

لەو گەڕەکە ژنێکم بینی، لەسەری کۆڵانەکەوە هات کە پێچێك بوو، ئەو ژنە دەیویست بگاتە نزیکی ئەو شوێنەی کە من شەڕم کرد لەگەڵ هاوڕێکەم.

ئەو تیشکانەی بەر هاوڕێکەم کەوتن، ڕاستەوخۆ بەر ئەو ژنەش کەوت، چونکە کاتێ گوێی لە هات و هاواری من و هاوڕێکەم بوو خێرا هات بە دەممانەوە، لەو ژنەیا حاڵەتی بێ تاقەتی و وەڕسیم بینی، لە هەموو گیانیەوە وەك تیشکێکی نەرێنی دەردەچوو، وام دەبینی کە هەست بە پەرچە کرداری هەموو خانەیەکی ئەو ژنە دەکەم.

دەتوت من چوومەتە ناو جەستەی ئەو و، هەمان هەست دەرك پێ دەكەم كە ئەو هەیبوو.

هەستم بە هەموو ئازارەكانی كرد، لە دەرەئەنجامی ئەو كارە خراپەی من بەرهەمم هێنا، ئەو ژنە دراوسێمان بوو هات و فریای كەوت، كەواتە دەیناسین، هەتا ئەو ئەندازەیە ئەو هەست و شعورانە زۆر بە ئاسانی پەڕینەوە بۆ من، گەرد بە گەردیم هەست پێ كرد، كاتێك لە هاوڕێكەمی پرسی ئەوە چی ڕووی دا؟

ئەویش پێی وت: فڵان لێی دام.

ژنەكەش منداڵەكەی بردەوە بۆ ماڵی خۆیان "ماڵی باوكی منداڵەكە" كە ڕۆشتنە حەوشەی ماڵەوەیان، دایكی و براكانی و خوشكە بچووكەكانی شەپۆلی تیشكی نەرێنی كەوتە سەریان و كاریگەر بوون بەو ڕووداوە خراپە.

هەموویان لە دەوری كۆبوونەوە و هەستم بە هەموویان كرد، دەتوت من لە جیاتی ئەوان ئازار و هەستی ناخۆشی دەچێژم، ئیتر من ئەوان بووم.

ئەو كار و كردەوەیە ئەوەندە لێكەوتەی خراپی هەبوو، بیرم لە خۆم دەكردەوە كە ئێستا یەكێك لە فریشتەكان دێت و فڕێم دەداتە ناو دۆزەخەوە، من لەو كاتەیا دۆزەخم دەویست هەتا لەو شەرمەزاری و ئازاری ویژدانە ڕزگارم ببێت.

دەموت ئاخر من چۆن بەرگەی ئەو هەموو ئازارە دەگرم لە پای یەك تاوان، جا هەموو تاوانەكان كۆ بكەرەوە چ كارەساتێك دەخولقێنێت!!

شعوری دایكایەتی "كە ئازاری كوڕەكەیانم داوە"، ئازاری دراوسێ، شكاندنی دڵی منداڵێك و ئازاری جەستەی، زیانێكی زۆری درێژ خایەن و جێ كەوتەی خراپ كە چاك ناكرێتەوە.

هەموو ئەمانە پەیتا پەیتا دەگەیشتنە مـن، هەروەکـو ئەوەی لەو دونیـا هەمـووان پـێم بڵێن: هەموو ئەمانە تۆ هۆ کاریان بوویت، تۆ خـۆت بە دەسـتی خـۆت، ئەمەت کـردە ملی خۆت و توێشووی ئەم داهاتووەت!

ئەم هەڵەیەی من وەك نموونەیەك پیشانیان دام، هەتا پێم بڵـێن: ئەمەت بیـر نەچێـت و بیپارێزە، ئێمە پاراستومانە بۆ تۆ هەتـا ڕۆژی حەشری گەورە هەڵـی دەگـرین و لەوێ دیسانەوە پیشانت دەدرێتەوە.

بینیم ئەو هاوڕێیەی من کە بە منداڵی لێم دابوو، لەتاو ئازارە مەعنەویەکـانی چەنـدە کێشـەی تـووش بـووە، مـن یەکێـك بـووم لە هۆکارەکـانی، مـن بـوومەتە بەشـێك لە پێکهـاتەی نەرێنـی ژیـانی ئەو، لە بەشـێکی کەسـێتی ئەودا تـوڕەیی و بـێ ئومێـدی و خەمۆکی هۆ کارەکەی من بووم، لێدانی بەهـۆی بۆکسـێکی مـنەوە، بە هەزاران هەڵەی پێ کـردووە و لە هەمـوو یەکێکیانـدا دۆسـیەیەکی تـایبەت بە مـن هەبـووە و بەشـم لە هەڵەکەیدا هەبووە.

بینـیم ئێـوارەیەکی ئەو هـاوڕێیەم، تەمەنـی گەیشـتبوویە سـی سـاڵان و خێـزان و مناڵەکەی بە دڵی خۆشەوە چـاوەڕوانی گەڕانەوەی ئەویـان دەکـرد، ژنەکەی خـۆی بـۆ پیاوەکەی ڕازاندبوویەوە، خواردنی تایبەتی بۆ ئامادە کردبوو، دڵـی خـۆش بـوو، بەڵام مێردەکەی بێتاقەت بوو، لە ڕووداوێك کە بێزاری کردبوو، کە گەڕایەوە بۆ ماڵەوە، هـیچ سەرنجی نەدایە ڕازاوەیی خێزان و مناڵەکەی و گرنگی دانی خێـزانەکەی بە خـواردن و دڵخۆش کردنی مێـردەکەی، ئەم پیـاوە بیـانوویەکی لاوەکـی دۆزیەوە بـۆ شـەڕ کـردن لەگەڵ ژنەکەی و خەریك بوو هەموو خواردنەکە لەسەر مێزەکە فڕێ بداتە خوارەوە!!

ژنەکەی و مناڵەکەی هەر یەکێکیـان بە جـۆرێکی جیـاواز دڵیـان ڕەنجـا و، بینـیم لە ئازار و دڵ ڕەنجانی ئەوانیشەوە هەندێ تیشکی نەرێنی 'بەشە گوناه' مـن هۆکـارەکەی بووم و بەسەرمدا سەپا.

پیاوەکەی بە هیچ جۆرێك ئەو لێدانەی منی بیر نەمابوو، بەڵام بەشم لە نەرێنی بونی ئەو کارەی ئەودا هەبوو، بە یاسایەکی ورد و هەستیار دەنوسرا و، پێوانەکەیم بینی!

سەدان چیرۆك و تیشکی نەرێنی ئەو ئێوارەیەم بینی کە چەندەی من بەشداری بووم و دوور نەبووم لە سزادانی.

کاتێك حەزرەتی ڕەسول الله ﷺ دەفەرموێت: هیچ کەسێك کەسێکی تر بە ناحەق بکوژێت وەك ئەوە وایە هەموو دونیا و خەڵکی دونیای کوشتبێت.

هەموو ناحەقی و ستەم و تاوان و حەرامێك بە هەزاران چیرۆکی نەرێنی و تیشکی خراپ بەجێ دەهێڵێت.

بەسەرهاتێکی ئەرێنی و باشم هەبوو، گەنج بووم سەفەرم کرد، لەسەر ڕێگای کۆنی مەشهەد، واتە ڕێگەی 'سبزوار - نیشاپور' دەمانویست بگەینە مەشهەدی پیرۆز، پاسەکەمان لە ڕێگایا لەکار کەوت، تەکسی یەکێك لە ناسراوەکانم بەلاماندا تێپەڕی، لە لای ڕاستی ڕێگاکە...

لەو شوێنەی پاسەکە لە کار کەوت، چایخانەیەك و سەرچاوەیەکی ئاو و سەوزاییەکی لێ بوو. ئێمە لە لای چەپی ڕێگاکە ڕاوەستا بووین، لەو شوێنەیا گردۆڵکەیەکی بچووك و سەرچاوەیەکی ئاو هەبوو، هەندێ بەردەڵان بوو، بەڵام شاخ نەبوو، سەرچاوەی ئاوێك هەبوو، بەشێکی تری وەك شاخێکی بچووك بوو.

لەوێدا وەستاین و لە پاسەکە دابەزین، بڕیار وابوو کە پاسەکە چاك بکەن. من دابەزیم و ڕووم کردە ئەو سەیارەیەی لەگەڵ ئێمە دەڕۆشت، کە خاوەنەکەی ناسراومان بوو، ئەو جۆرەی سەیارەم زۆر حەز لێ بوو، سەیری لایت و کوشن و ناوەکەیم دەکرد، وەختێ شۆفێرەکە دابەزی، سندوقێکی داگرت و دەبەیەکی دەرهێنا، هەندێ ئاوی تیا بوو، سەیری کرد من لە نزیکی سەیارەکەی بووم.

وتی: بچۆ ئەم دەبەیە بشۆ و پڕی بکە لە ئـاو لەو کـانیە و وەرەوە، کاتێـك دەبەکەم هەڵگرت دەبینم قورسە و ئاوی تیایە، هێشتا زۆری تیا بوو، درەختێکم بینـی لە دورەوە، بە خەیاڵمدا هات کە لە جیاتی ئەوەی ئاوەکە لێرەدا برێژم، بۆچی ئـاوی ئەو درەخـتەی پێ نەدەم، ڕووم کردە درەختەکە، بۆ من خۆشی و حەزێك بوو، ئـاوی درەخـتەکەم پـێ دا، شوێنی دەوری درەختەکە لێـژ بـوو، ئـاوی تیـا نەدەوەسـتا جـۆگەلەی بەرەو خـوار بەسـت، گەڕام بـۆ دارێـك، تەخـتەیەك هەتـا هەنـدێ گـڵ لە دەوری درەخـتەکە کـۆ بکەمەوە، کەم کەم ئاوەکەم تێ دەکرد، لە دوایدا ڕۆشتمە سەرچاوەی ئاوەکە و پـڕم کـرد و گەڕامەوە، کاتێ لە جیهانەکەی تر شریتی ژیانم بۆ لێ درایەوە و گەیشـتمە ئەم بەشـە و وردە وردە ئـاوی درەخـتەکەم دەدا، هەسـتم کـرد کە وەك جـێ گـۆڕکێ ڕووبـدات چـوومە نـاو درەخـتەکە و هەسـتم بە هەمـوو هەسـتەکانی کـرد، هەرچـیەك لەنـاو ئەو درەختەدا ڕوویان دا هەستم پێ کرد، وزە و سـاردی ئـاوەکە چ کـاریگەریەکی هەبـوو، هەستم بە ئارامیەکی گەورە دەکرد.

چەنــدین ڕووگەی جیــاواز هەبــوو، وتــووێژی نــاو ئەم درەخــتە هەبــوو، کە نــاتوانم وەســف و پێناســەیان بــکەم، خۆشــترین ئــاوازی پــڕ لە جــۆش و جــوانی دەبینیــت. دەنگــی باڵنــدەی ســەیر و خــۆش خــوێن. بە ژمــارەیەکی زۆر و بــێ شــــومار مۆزیــك ژەن ئاوازیــان دەچــڕی، بەڵام دەنــگ و ئــاوازێکی هەرگیــز نەبیســتراو و زۆر چێــژدار، مۆســیقا لەوێ مانــای زۆر قــوڵ دەبەخشــێ، مــن مەبەســت بـووم لەو مانـایە و، ئەو ئـاواز و دەنـگە نیـانە مەبەسـت پێـی مـن بـوو. وەك ئەوە پێم بڵێن: ئافەرین بۆ کارێکی گەورە کە ئەنجامت داوە.

ئەوە چ بەخششێك بوو لە وزەی بـاش و کـرداری باشـە کە ئەنجامـت دا، ئـاودانی درەختێك...

جارێکیان مامۆستایەکم کە من لە پۆلی یەکەمی سەرەتایی بووم زللەیەکـی لـێ دام، لە تاو ئازار و بەهێزی ئەو زللەیە گـوێم زرنگـایەوە، لە دڵـی خۆمـدا دەمـوت ئەگەر لە

شوێنێك بۆم هەڵکەوێت پارچە پارچەی دەکەم، زۆر ڕقم لەو مامۆستایە هەڵگرتبوو، لەوێ زانیم کە ڕق و قین و بوغزاندنی کەسێك سزایەکە لەگەڵ خۆم دەیبەم بۆ قیامەت، وەك لاشەیەکی ناشرینی بۆن پیس و قێزەون دەیبینیتەوە.

من پەنجا ساڵە ئەم جەستەی ڕقەم لە گەردنم ئاڵاندوە، ئەگەر فڕێی بدەم و وازی لێ بێنم، من خۆم پشوو دەدەم...

ئەو مامۆستا هەژارە نەیدەزانی من ئەوەندە ڕقم لێیەتی، ساڵ بە ساڵ ئەم ڕقە زەبەلاحەم بەخێو دەکرد، تازەم کردۆتەوە، بە ویستی خۆم لە گەردنی خۆمم ئاڵاندووە، وەك کراسێك لەبەرم کردووە.

هەموو ئەو شتانەی من بینیم لەو ئەزموونەدا لە دەستێکدا دایینێ و، ئیدراك و هەست کردن بە گەورەیی و جوانی و فراوانی ئەو نورەی کە بینیم لە دەستێکی تردا دایبنێ، هەرگیز بەرامبەری یەك نین.

ئەو نورە عیشقێکی بێ سنورە و لە چوار چێوەیەك نانرێت.

هەزاران عیشقی لەیل و مەجنون و عاشقەکانی دونیا بە ئەندازەی سەرە دەرزیەك نابن لە بەرامبەر ئەو عیشقە بێ کۆتاییەوە.

ئەوەی من بینیم لوتکەی ڕەحمەت و سۆز و بەزەیی و میهرەبانی بوو، ئەگەر هەزاران ڕستە ڕیز بکەین ناگاتە کەمترین ماناکانی ئەوێ، ناتوانرێت وەسفی گەردێك لەو عیشقە وەکو خۆی بکرێت.

تەواوی بیست و حەوت ساڵی دونیام بە تەواوی وردەکارەکانیەوە دوو جار بەسەریا ژیامەوە و هەموویم بینیەوە.

بچووکترین پێکەنین... بە گاڵتەوە پێ کەنیوم... یان بە دڵ سافی... یان بە گێلانە بووە، یان ڕق و خۆ بە گەورە زانی، یان بێ باکی... لەوێ دونیایەك مانای بەرجەستە لە هەموو جووڵە و هەڵس و کەوت و نیەتەکانت دەبینیت.

بچووکترین خەم، خۆشی، چاکە، خراپە، کە لەبەر چینەی دونیا کۆت کردۆتەوە بـۆ ئەویٚ، دەگۆڕێت یان بە بەهەشت یاخود دۆزەخ و سزا.

بەهەشتی من بە تەواوی جیاوازە لە هی تۆ، دۆزەخیش بە هەمان شێوە.

بۆ نموونە: دوو گوڵی سورت هەیە، یاخود سـیان، گەڵاکانیـان لە یەکـتر دەچێـت، بەڵام زۆر جیاوازن.

شەریعەتی پیرۆزی ئیسلام و پێغەمبەران و حەزرەتی موحەممەد ﷺ و قورئانی پیـرۆز و فەرموودەکانی ڕەسوڵ الله ﷺ و پێشەوا و ئەولیاکانی خـودا هەمـوو شـتێکیان ڕوون کردۆتەوە بۆ کەسێك بیەوێت.

بۆ زۆر کەس ئەم ئەزمـوونە فـراوانەی خـۆمم گێـڕاوەتەوە، جارێکیـان بـۆ یەکـێکم گێڕایەوە، دەبینم شێوەی دەم و چاوی گۆڕا، وەك ئەوەی کە باوەڕ بە وتەکانم نەکات!

لە دوایدا بە ساردیەکەوە بەجێی هێڵام، زۆر بـێ تـاقەت و دڵ برینـداری کـردم، بـۆ یەکێکـی تـرم گێـڕایەوە کـردی بە بـابەتی شـۆخی کـردن و پێکەنـین لەنـاو هەنـدێ لە هاوڕێکانماندا!

ئیتر من کەمتر دەمگێڕایەوە، هەندێکیش دەیانوت ڕەنگە خەونت بینیبێت.

بەڵام من چل و دوو سـاڵ تێپەڕیـوە بەسـەر ئەو ئەزمـوونەدا و هـیچ بەشـێکیم بیـر نەچۆتەوە، زۆرترینی سەعاتەکانی تەمەنم، لە خەو و بە ئاگـا بوونمـدا بەو ئەزمـوونەوە دەژیم.

وەختـێ لەم دواییـانەدا کـرانەوەیەك هەبـوو، دەربـارەی 'نزیکبـوونەوە لە مـردن' لە کـۆڕ و سـیمینار و بەرنـامەی جیـاوازدا باسـی لـێ کـرا، ئیـتر ئومێـدم بـۆ گەڕایەوە کە خەڵکـی دەتـوانن شـتێك لە ئەزمـوونەکەم حـاڵی بـبن و، کـاتی ئەوەیە بـۆ تێکڕای خەڵکی بگێڕمەوە.

هەنـــدێ جـــار کە ئەزمـــوونەکە دەگێـــڕمەوە، بیـــرم دەچێـــتەوە لەنـــاو خەڵکیـــدا دانیشـــتوم، بە هەســـت و شـــعور دەچـــمەوە بـــۆ نیشـــتیمانێك کە تیایـــدا ژیـــاوم و چاوەڕوانم بە یەکجاری پێی بگەمەوە.

زۆر زۆر تامەزرۆی گەڕانەوەم بۆ ماڵی ڕاستەقینەی خۆم. مـن لەوێ بە فریشـتەکەم وت: باشە من بیسـت و حەوت سـاڵ چـاوەڕوانی چـیم کـردوە، دونیـا کەی شـوێنی ئەوەیە تیا بمێنیتەوە، دونیا شوێنی من نەبوو، ئێستا دەزانم نیشتیمان و مـاڵی ڕاسـتەقینە چییە!!

دەموت بە فریشتەکە: ئێوە دەتانەوێ بگەڕێمەوە بۆ دونیای دورو بێ کەسی، بـۆ نـاو نەخۆشی و هەزاران ناتەواوی، بۆ دونیای کورت و فانی!

وتیان: دەبێت بگەڕێتەوە بۆ دونیا، چونکە هێشتا کاتت نەهاتووە.

زیانت پێدەگات ئەگەر بڵێیت ناگەڕێمەوە!

وتم: هەموو شتێك قبوڵ دەکەم، بەڵام گەڕانەوە بۆ دونیا نا.

وتی: وەرە سەیر بکە.

هەموو چرکەساتی ژیانی جارێکی تر پیشان دامەوە هەتـا چرکەسـاتی ڕووداوەکە و هەتا کۆتایی ژیـانم، لە مـاوەیەکی زۆر کەمـدا، ئیـتر قەنـاعەتم گـۆڕا و قایـل بـووم بە گەڕانەوەم بۆ دونیا، زانـیم گەڕانەوەم خێـری زۆری تیـایە بـۆ قیـامەتم، گەڕامەوە هەتـا زیـاتر لێبـوردە بـم، خـوا پەرسـت بـم، ئەو کـارانە بـکەم کە بە ڕووکەش سـادەن و لە خزمەتی خەڵکدان و بۆ هاوکاری خەڵکین بەبێ مەبەستێکی دونیایی.

ئیتر وەك گڵۆڵەیەکی نورانی کۆکرامەوە و خزێنرامەوە ناو جەستەکەم، مـن ئەو کـاتە لە مەیتخـانە بـووم کە گەڕێـنرامەوە، یەکەم جـار لە قاچەکـانمەوە داخـڵ بە جەسـتەم کرامەوە، هەتا ناو قەدم و هەتا دوایی، ئاخرین شوێن تەوقی سـەرم بـوو، وەك تەقەیەك لە هەموو جەستەم بێت بەو جۆرە بوو، ئیتر بوومەوە بە جەسـتە و ڕۆح پـێکەوە، ئـا لەو

کاتەدا هەستم بە ئازارێکی زۆر کرد لە سەرمدا، چونکە هەستم وابوو کە کرۆکێکی زەبەلاحی پڕ چییەتیان کردووە بەناو جەستەیەکی بچووکی فانیدا.

چونکە لە دوایدا ئازارم هەبوو، داوای ئازار شکێنم کرد.

یەکێك لە فەرمان بەرەکانی ژووری تەرمانە گوێی لە هات و هاواری من بوو.

وتبووی دکتۆر: من گوێم لە دەنگی یەکێکیانە ،'واتە مردوەکان".

ئیتر منیان هێنایە دەرەوە و لە نەخۆشخانە دەست کرا بە چارەسەرم و گەڕامەوە.

خوای گەورە زۆر زۆر بە ڕەحمە بەرامبەرمان، زۆر نەرم و نیان و میهرەبانە، زۆر نزیکە لێمانەوە، ئاگاداری ئێستا و داهاتوو و ڕابردووی ئێمەیە، وەختێ گوناهێك، هەڵەیەك بێ ئاگاییەك ڕووم تێ دەکات وەك ئەوەیە گۆزەیەکی گران بەها بە دەستمەوە بشکێت.

## پویا باجەلانی



تەمەنم هەژدە ساڵان بوو، لەگەڵ کوڕەکەم سواری سەیارەیەك بووین و کەوتینە ڕێ لە سنەوە بۆ کامیاران. لەناکاو سەیارەیەکمان بینی بەرەو ڕوومان دەهات و بە توندی بە یەکماندا دا. سەرم بەر ئاسنی ناو سەیارەکە کەوت، کوت و پڕ دونیا لە پێش چاوانم سپی بوو، لەشێکی سوکەڵە لەناو تونەیلێکدا دەڕۆشتم، دەتوت کەسێك پاڵم پێوە دەنێت.

لە دوایدا خۆم بینیەوە لە بیابانێکی گەورەی چۆڵ و هۆڵدا، سەرگەردان و حەیران بووم، وەختێ ڕێم دەکرد، یەکێک لە خزمەکانم بینی، بینینەکەی کوت و پڕ بوو لەو بیابانە چۆڵەدا، پرسیارم لێ کرد، فلان کەس ئێمە لە کوێین؟

ئەم شوێنە کوێیە؟

وتی: ئێره شوێنێكی زۆر سەختە.

من پێم خۆش بوو ئەو خزمەمم بینی، زۆر شتمان باس كرد، ئەو خزمەم باسی بارگرانی خۆیی بۆ دەكردم لە بەرزەخ.

من لە دونیا ئەوەندە پەیوەندی و وابەستەیم نەبوو بەو خزمەمەوە.

وەختێ لێرە ئاوا وابەستەی بووم، زانیم كە جیهانێكی ترە و مردووم.

خۆم وا دەبینیەوە كە لە دژواریەكی سەختدام، بەڵام هاوار بۆ كێ ببەم هەتا لەم ناهەمواریە ڕزگارم بكات.

گەیشتمە شوێنێكی بەرز، كە كۆشك و بینای زۆر گەورەی لێ بوو، هەرگیز لە دونیادا شوێنی جوان و بێ وێنەی بەو جۆرەم نەبینیوە.

خانوو و كۆشكەكانی دونیای ئێمە وەك دڵۆپێكە لە بەرامبەر دەریایەك، دڵم خۆش بوو، چونكە لە بیابانە ترسناكەكە ڕزگارم بوو.

خەڵكێكی زۆر لە لای حەوز و سەرچاوەیەكی ئاو دانیشتبوون پۆشاكی سپیان پۆشی بوو، زۆرێك لە خزمەكانم ناسیەوە، یەك پارچە ڕوخساریان نور و ڕووناكی بوو، منیشیان بردە لای سەرچاوەی ئاوەكە، ئەو شوێنە ژن و پیاوی خواناس و چاكەكار ئاویان لێ دەخواردەوە و لەسەری دادەنیشتن، ئەو ئاوە كەوسەری ڕەسوڵ بوو الله ﷺ، دیاری و خەڵاتی ئەو زاتە بوو.

شەپۆلی ئەو حەوز و ئاوە ئەوەندە گەورە و جوان بوو لە وەسف كردن نایەت، بۆ ماوەیەك لەوێدا دانیشتم، لەناكاو ڕووم وەچەرخاند، شوێنێكی سەختی ترم بینی، شوێنێك وەك زیندان وابوو، توڵی ئاسنین لە نزیكی یەكەوە بوون، زیندانی گەورە و باریك و دور و درێژ، هەر بەشێكی كۆمەڵێك لە خەڵكی تیایدا زیندانی بوون، سەرەتا و كۆتایی دیار نەبوو، زۆر زۆر گەورە بوو، ترس چوویە دڵمەوە، چووم بەرەو ئەوێ و

حاڵی شپرزیانم بینی، لەناو سزا و ئەشکەنجەدا ئەتلانەوە، پرسیارم لە یەکێکیان کـرد کە ئایا دەمناسیت؟

ئەو کەسە خزمم بوو، بەڵام لێرەدا ناوەکەی نادرکێنم،

وتی: بەڵێ زۆر باش دەتناسم.

وتم: بۆچی تۆ لێرەیت؟ چیت کردووە؟

تـۆ نـوێژت دەکـرد، هـات و چـۆی مزگەوتـت دەکـرد، ئەهلـی ڕۆژ و چاکەکـاری بوویت، ئەهلی قورئـان بوویـت، ئـال و بەیتـی پێغەمـبەرت ﷺ خـۆش دەویسـت، چ شتێك تۆی ڕاپێچی ئەم دۆزەخە کردووە؟

بە ئـــاهو حەسرەتێکـــی زۆرەوە وەڵامـــی دامەوە، لە حەقیقەتـــدا ئەو دەنـــگە حەسرەتـاویەی کە لـێم بیسـت، ئەگەر یەکێـك لە خەڵکێکـی دونیـا بیبیسـتێت، ئیـتر جارێکی تر قسەی بۆ ناکرێت لە دونیادا، لەتـاو سەرسـامی و تـرس و بـیم و حەیـران بوون.

پێی وتم: مافی خەڵکی 'حق الناس' گیرۆدەی ئەم سزایەی کـردم، حەقـی خەڵکـی گەیاندمی بە دۆزەخ.

حسابی کردەوە چاکەکانت ناکرێت هەتا حەقی خەڵکیت لەلا بمێنێت.

ئەو خزمەم داوای لە من کرد، هەر چۆنێك بووە، حەقێـك لە گەردنیـایەتی بـا بـۆی بدەمەوە، کەسەکان ئاگادار بکەمەوە کە ئەم حەقی خواردوون و ستەمی لێ کردون.

ناونیشانی کەسێکی بە من وت، وتـی: هەر چۆنێـك بـووە، بـیکە بە خـاتری خـودا بیدۆزەرەوە و داوای لێ بکە با گەردنم ئازاد بکات.

من خۆم وا بینیەوە، کە وەك لەناو باڵۆنێکدا بم بەو جۆرە بوو.

دەچوومە شوێنێکی تر و شتێکی ترم دەبینی، جـارێکی تـر گەڕامەوە بـۆ بیابـانەکە، حەیران و سەرگەردان بوومەوە، سەیرم کـرد، لە دورەوە ئـافرەتێکی زۆر نـورانیم بینـی،

ئافرەتێك لە كەماڵی جوانی و بۆن خۆشی و بووندا بوو، كە بینیم دەست و قاچەكانم كەوتنە لەرزین، هەر وەكو ئەوە بوو كە پێشتر ناسیبێتم هەروەكو ئەوەی بانگم لێ بكات و بڵێت: وەرە پێشەوە!

بە تامەزرۆیی و ڕووخساری شیرینەوە بینیم كە هەرگیز وەسف ناكرێت، ئەو شەوقە وەك شەوقی دونیا نەبوو، دەستم كرد بە گریان، باسی ئەو ناڕەحەتیانەم بۆ دەكرد كە بینیومن، پێم وت: كەس نیە دەستم بگرێت، تكات لێ دەكەم ڕێنمایم بكە بۆ ڕزگار بوون!

ئیتر نازانم چی ڕوویدا، دوای ئەوە كەوتمە ناو نورێكی ئێجگار موبارەكەوە، ئیتر لەو شوێنە دەرچووم، دڵنیایەكی زۆر گەورە ڕووی تێ كردم، دەمویست ئەو شوێنە هەرگیز بەجێ نەهێڵم، هیچ زانیاریەكم دەربارەی ئەو شوێنە و ئەو ئافرەتەش نەبوو، یاخود بیرم برایەوە.

خۆزگە هەموو دونیایان لە من وەردەگرتەوە، بەڵام ئەو بەختەوەریەیان لە من وەرنەدەگرتەوە.

ئەم ئەزموونە هەموو ڕۆژێك وزەی تازەم پێ دەدات، من هەموو ڕۆژێك دەگریم لە پای ئەوەی لەو جیهانە دابڕام.

ئیتر دوای ئەوە گەڕامەوە و خۆم لە نەخۆشخانە بینیەوە، دایكم و باوكم و خزمەكانم و پزیشكەكان لە دەورم بوون.

یەكێك لە خزمەكانی دەڵێت: كاتێ لە حاڵی بێ هۆشیدا بوو، ئێمە چووین بۆ لای، لە حەوشەی نەخۆشخانەكە هەندێ بێچووە پشیلەی لێ بوو، شیرمان پێ دان، كە هۆشی هاتەوە وتی: ئاگام لێ بوو شیرتان دا بە بەچكە پشیلەكان!!

ئێمە زۆر سەرسام بووین، چونكە ئەو بێ هۆش بوو، پزیشكەكان بێ ئومێد بوون لە هەستانەوەی!!'

دوای ئەزمـوونەکەم بە تەواوی حـاڵم گـۆڕا بەرەو باشـی! چـونکە مـن ئەزمـوونی ژیانێکی کامڵ و پڕ مانام کرد.

خـوای باڵادەسـت بەشـێك لە جیهـانی نادیـاری پیشـان دام، ئەوەی کە پیشـانی ئەزموونداڕێك دەدرێت، بۆی دیاری دەکرێـت و بە هەڕەمەکـی گـوزەری پیـا ناکـات، زۆر بە وردی بۆی دیاری دەکرێت و خوای گەورە بڕیاری لەسەر دەدات.

لە لایەکەوە دڵ گرانم لە گەڕانەوەم و، لە لایەکی تریشەوە پـێم خۆشـە هەتـا باشـتر خۆم ئامادەی سەفەری قیامەت بکەم.

هەتا خۆم بکەمە مرۆڤێکی بۆ خوا صـوڵحاوی حەڵاڵ خـۆری کـار بەجـێ و خـوا ناسی ڕاستەقینە.

دەگەڕێـم و پرسـیار لە خـۆم دەکەم، دەبێـت مـن چـی بـکەم هەتـا میهرەبـانی و موحیبەت و خێر و ڕەحمەت بەناو خەڵکیدا بڵاو بکەمەوە.

کە لە ئەزموونەکەم گەڕامەوە، ڕۆشتم هەتا سۆراغی ئەو پیاوە بـکەم کە خـزمەکەم لە دۆزەخ ناونیشانەکەی پێ دام!!

هەمان ناو و ناونیشان کە پێی وتم بەو جۆرە بوو، دۆزیمەوە.

دانیشـتم لەگەڵـی و باسـی ئەو حەقەم بـۆ کـرد کە لە گەردنـی ئەو پیـاوەدایە و تـۆ خاوەنی حەقەکەیت.

پێم وت: گەردنی ئازاد بکە!

زۆر سەری سوڕما، هەروەکو ئەوەی باوەڕ بەوە نەکات کە پێم وت.

وتی: تۆ چۆن ئەوە دەزانیت؟

تەنها من و ئەو، ئەو وردەکاریانە دەزانین کە تۆ پێم دەڵێیت؟

بەڵێ بەو جۆرەیە و حەقی منی لە لایە!

وادیاربو لە پێش چاوی خەڵکی باسی کردبوو، سوکایەتی پێ کردبوو، شکاندبووی، هەتا کەسایەتی درۆینەی خۆی پیشانی خەڵکی بدات.

زۆر خراپ دڵی شکاندبوو.

"إنما الأعمال بالنيات" نیەتی باش و پاك بناغەی کاری باشە، دڵ شکاندنی خەڵکی زۆر سەختە، ئەو گەشتە منی گواستەوە بۆ شەوق و محبەتێکی زۆر گەورە، ئەوەی کردە خەم لە مندا کە حەماڵی خێر بم نەك شەڕ.

ئێمە خەڵکی دونیا نین. دونیا تاقیگەیە، قوتابخانەیەکە پێویستە فێر ببین، دەبێت تاقی کردنەوە ئەنجام بدەین. شوێنی هەتا هەتایی خۆمانم بینی...

قورئانی پیرۆز زۆر جوان باسی دەکات.

بە زیکری خوا دڵمان دادەمەزرێت.

الحمدلله (٨ – ٩) ساڵە ئەم ئەزموون و گەشتەم بینیوە، دڵنیایی و دڵ ئارامیەکی زۆر زۆرم بۆ دروست بووە، وابەستەیم بە دونیا و پارە و سامانەوە زۆر نەماوە، لە دوای ئەزموونەکەم، هەوڵم داوە هەرچی 'مافی خەڵکی' هەیە بیدەمەوە، یاخود گەردنی خۆم بەوانە ئازاد بکەم کە لە پشت سەرەوە بە ناشرینی باسم کردون و غەیبەت و ناحەقیم بەرامبەریان کردوە.

هەموو ئەزموونەکەم لە بیر ماوە و، هیچ بەشێکیم بیر نەچۆتەوە. شەو و ڕۆژ لەبەر چاومە. دینداری زۆر بەهێزی کردووم.

شوێنی چۆڵ و بێ مانا لە گەردوون و وجودا نیە.

هەموو شتێك بە تەواوی بەدی هاتووە.

مردنم بینی لە هەنگوین شیرینتر بوو، گەیشتنە بە حەقیقەتی شیرینی.

لە دوای ئەزموونەکەم، دوو ساڵ پیشەی من گریان بوو، بە ڕۆژدا بە ڕۆژوو دەبووم و بە شەودا شەو نوێژم دەکرد، هەتا جەستەم زۆر لاواز بوو، ئێستا لەگەڵیدا ڕاهاتووم.

ئێستا زۆرینەی بیر کردنەوەم لەوەیە کە چۆن کار لەسەر چـاك بـوونی خـۆم بـکەم، چۆن چاکتربم، نەفسم پاك بکەمەوە، زۆر لۆمەی خـۆم دەکەم، پرسـیار لە خـۆم دەکەم کە گەیشتوومەتە کوێ؟

ئەوەندە لۆمەی خۆم کرد، هەتا دایکم و باوکم بۆ حـاڵی مـن دەگریـان، دەیانپرسـی ئەم کوڕەمان بۆچی ئەوەندە دەگری؟ چی بکەین هەتا ژیر ببێتەوە!!

بەڵام من لۆمەم نەدەکردن، چونکە ئەوان دەرکیان بەوە نەدەکرد کە من بینیبوم!!

لە ڕۆژ و هەفتەکانی سەرەتای دوای ئەزمـوونەکەم، نەمـدەتوانی لەگەڵ هـیچ کەس هەڵبکەم!

تەنانەت لەگەڵ خۆشم.

هەتا وردە وردە گەیشتمە ئەو قەناعەتەی کە من بـۆ فرسـەتێکی تـر گەڕاومەتەوە بـۆ دونیا و نابێت ئەو فرسەتە لە دەست بدەم، نابێت دەستە و ئەژنۆ دابنیشم.

خوایەکی ڕەحـمان و ڕەحـیم دەبیـنم لە نوێژەکانمـدا، خۆشەویسـتی خـوا دەبیـنم، چێژی موحیبەتی دەکەم.

کاتێ خەڵکی بە مـوحیبەتەوە دەدوێـنم، کـۆمەکی ئاتاجێـك دەکەم، ئەو کـارانە دڵ ئارامی و دامەزراوی زیاترم پێ دەبەخشێت.

## دیداری ئاشناکان



'عەلی ڕەزا فەتحی پور' لە 'ساحل ئەلعاج' بوو لە شاری 'کودیـاغ'، 'عەلـی ڕەضـا' قورئان خوێنە و بینەری جیهانێکی سەیر و جوان و ناوازە بوو.

'عەلی ڕەضا' لە وڵاتی 'ساحل ئەلعاج' تووشی نەخۆشی مەلاریا بوو، ئەم وڵاتە یەکێکە لە وڵاتەکانی ئەفریقیا، لە ساڵی (١٩٩٩)ەوە مەلاریا لەو ناوچەیە زۆر بڵاوە و، ئەگەر سنورداریش نەکرێت کوشندەیە.

لە ئەفریقا وەك ئەنفلۆزایەك دەستنیشان دەکرێت و چارەسەریش دەکرێت، چارەسەرێکی ئاسایم لەوێ وەرگرت و گەڕامەوە بۆ ئێران.

هەندێك لە هاوڕێکانم پێیان وتم: مادام مەلاریا لە ئێراندا نەماوە، کە نیشانەکانی لە تۆدا دەرکەوتون، سەردانی فڵان پزیشك بکە کە پسپۆڕی نەخۆشیەکانی ناوچە گەرمەکان بوو، وتم: زۆرباشە. هەتا گەیشتمەوە ئێران، دوو جار نیشانەکانی لەسەر من دەرکەوتەوە، هەندێك لە دەرمانەکان لە ئێران نەبوون، هەواڵم نارد لە دەرەوەی ئێران بۆیان هێنام.

جەستەم بە شێوەیەکی بەرچاو لاواز بوو بوو، لە نەخۆشخانە کەوتبووم و هەندێ نیشانەی کاریگەری نەخۆشیەکەم لێ دیاری دابوو، گوێچکەم دەزرنگایەوە و دڵم بە خاوی لێی دەدا و، دەستەکانم ئارەقی دەکردەوە، توانای قسە کردنم کەم بوو بۆوە.

ئەوە بوو بانگی پزیشك و پەرستارەکانیان کرد، خێرا بردمیان بۆ 'ICU' ژووری چاودێری ورد.

لەو ڕاڕەوەی کە بردمیان هەستم کرد لە جەستەی خۆم دەرچووم. لە ناوەوە دەمار و شانە و ماسولکە و ئەندامە وردیلەکانی خۆم بینی.

هەستم کرد پارچە پارچە هاتمە دەرەوە و بۆ سەرەوە سەرکەوتم.

هەستم بە لەش سووکی کرد و لە سەرەوە بووم.

بینیم جەستەکەم بە پەلە دەبەن، سەرسام بووم بۆ کوێی دەبەن!!

سەیر نەبوو بە لامەوە کە لە جەستەم دەرچووم، هەروەکو ئەوەی ئاشنابم بەو حاڵەتە.

وا هەست دەكەم شێوەیەكی دیاری كراوم نەبوو لە سەرەوە، بەڵام لە شوێنێكی باڵایدا بووم.

كە بردمیان بۆ وردبینی ورد، گوێم لێ بوو یەكێك بە ناوی خۆمەوە بانگی لێ كردم، بەڵام بە تۆن و ئاوازی دەنگ نا، ئامادەییەك بوو بۆ وەرگرتنی زانیاری.

یەكێك پێی وتم: عەلی ڕەزا!

لەو كاتەدا من سەیری جەستەی خۆمم دەكرد لە خوارەوە، وەك ئەوەی لا بكەمەوە بزانم كێیە لە لای چەپەوە بانگم دەكات!!

خۆم لە مێرگێكی سەوزدا بینیەوە، هەستم بە خاڵی جیا بوونەوە نەكرد لە نێوان ئەو دیمەنە جوان و سەرسام كەرە و، نێوان جەستەی خوارەوەی فەرامۆش كراوم.

بەڵام كە چوومە ناو مێرگەكە، بە تەواوی لە خوارەوە دابڕام.

هەست كردن بە ژیانەوە و تەڕی و پاراوی داپۆشیم، هەموو شتێك لەوێدا ناسنامەی خۆی هەبوو، دەتناسیەوە.

بۆ نموونە: كاتێك سەیری درەختێك دەكەیت.

قەد و پەل و گەڵای هەیە، بە تەواوی دەیناسیتەوە.

بۆ نموونە گەڵای ژمارە یەك، دوو، سێ بەو جۆرە.

وەك ئەوەی پێشتر بیناسم، دەمزانی هەموو گەڵایەك لەگەڵ گەڵاكەی تردا چی جیاوازە، زانیاری تەواوەتیم هەبوو، زۆر خۆش بوو بۆ من كە كاتێك دەستم دەخستە سەر قەدی درەختێك، دەستم دەبوو بە بەشێك لە درەختەكە.

جوڵەم لە شێوەی ڕۆشتن و ڕاكردن و وەستان و فڕین نەبوو، باشترین چواندن ئەوەیە كە بڵێم، وەك ئەوەی چاوت دابخەیت و لە دوایدا چاوەكانت بكەیتەوە لە شوێنێكی تر بیت، یاخود خۆت لە چیای دەماوەند ببینیتەوە.

بمویستایە لە شوێنێكی تر بم، خێرا لەوێ دەبووم، لەگەڵ ویستا لەوێ دەبووم.

له جیهانێکدا بووم قەبارەی هەبـوو هەتـا دەسـتی لـێ بـدەم، بیناسـم. مەبەسـت له دەستلێدان دەرك کردنه.

هەرچیم دەبینی دەمتوانی بسازێم لەگەڵی.

ناسنامەی خۆیشم لەدەست نەدا، کاتێك تێکەڵی هەموو شتێك دەبووم.

هەستم کرد وەك ئەوەی له لوتکەی چیایەکەوە بانگم لێ بکرێت.

یەکسەر لەوێ بووم.

ئەشکەوتێکی لێ بوو، هەستم کرد که دەبێت بچمه نـاو ئەشـکەوتەکە، خێـرا لەوێ بووم.

ئەندازەی کات و زەمەنی نەبوو بۆ ڕۆشتن، لەناو کاتدا نەبوو.

له ئەشکەوتەکەدا ستونێکی تیا بوو، زۆر گەورە، یەکپارچه نـور بـوو، دەتـوت قەدی درەختێکی زۆر گەورەیه.

ده کەس به قەدەکەی نەدەگەیشتەوە، ڕۆشتم بزانم چیه، دەبینم زۆر جوانه.

وەك تاڤگەیەکی گەورە بوو که فوارە بکات، بەڵام ئاو نەبوو، یەک پارچه نوور بـوو، نوریش نەبوو، تیشك و پرشـنگی ورد ورد بـوو وریـجەی دەدا، وەك ئـاگر بـوو، بەڵام سوتێنەر نەبـوو، دەبێـت لەوێ بیـت و ببینیـت، ئەگینـا هـیچ دەسـتەواژە و ڕسـتەیەك ناتوانێت ئەڵقا و ئەڵقی ئەو باسه بێت.

زۆر سەراسیمه و جوان و نـاوازە بـوو، کـاتێ سـەیری سـەرەوەم کـرد کۆتـاییەکەیم نەبینی، مەیلانێك بۆ سەر باس ناکەم، بینیم ئەمه وەکو تونێلێکه، به تەواوی لێـی نزیـك بوومەوە، دەبینم ستونێکی نورانی شەفافه، سیمای ڕوخسارم له ناویـدا نەدەبینـی، واته هەندێ نا ڕونی تیابوو، که زۆر لێی نزیك بوومەوە، دەبینم خەڵکێکی زۆری تێدایه.

ئەو خەڵکه ورده ورده سەردەکەوتن و منیانِ دەبینی و سـەلامیان لـێ دەکـردم، ئەوان دەڕۆشتن و سەر دەکەوتن و ئینجا کۆمەڵێکی تر دەهاتن.

بۆ نموونه هەزار دەڕۆشتن و هەزاری تر بە دوایاندا دەهاتن، خۆشحاڵیان بە هاتنم دەردەبڕی، هەندێکیانم دەناسی، لە دونیادا نزیك و خزم و ناسراوانم بوون و کۆچی دواییان کردبوو، بۆ نموونە: دوو برام مردون کردووە لەوێ بوون، هاوڕێکانم کە شەهید بوون لەوێ بوون، بەڵام سەیر ئەوە بوو خەڵکانێکم لەوێدا ناسی کە لە دونیادا نەمناسیون!

بۆ نموونە: باپیری (٥٣) مینی خۆم لە باوکمەوە، دەست بەجێ دەمزانی کێن و لە چ پشتێکدا بە من دەگەنەوە.

هەستی ئەوەم هەبوو کە هەموویانم دەناسی.

بە هیچ جۆرێکیش تووشی سەرسامی نەدەبووم، وەك ئەوەی ئەو ناسینەوەیە ئاسایی بێت، وەك ئەوەی هاوڕێیەکی خۆم ببینمەوە، پەیوەندیەکی زۆر لە موحیبەت و تێکەڵی و نزیکی و ئاساییم لەگەڵیان هەبوو، ئەوە دیداری ئاشناکان بوو.

هەستی ئەوەم هەبوو کە ئەگەر بچمە ناو ئەو ستونەوە سەر دەکەوم و ئیتر بەختەوەر دەبم، نزیك بوومەوە، دەمویست پەردەکە لا بدەم و بچمە ناویەوە، وەك ئەوەی تۆ بتەوێت ئاوی تاڤگەیەکی گەورە لا بدەیت، دەستم درێژ کرد بچم، کوت و پڕ لە دواوە ڕایانکێشام، نیەت و ویستی ڕۆشتنم هەبوو، دەمویست وەك ئەوان بچمە ناوەوە و سەر بکەوم بۆ سەرەوە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَأْوُوا إِلَى الْكَهْفِ يَنشُرْ لَكُمْ رَبُّكُم مِّن رَّحْمَتِهِ وَيُهَيِّئْ لَكُم مِّنْ أَمْرِكُم مِّرْفَقًا﴾ من دەرکی مانای ئەو ڕەحمەتەم کردووە لەناو ئەو ئەشکەوتەدا.

سوپاس بۆ خوا پەیوەندیم لە خزمەت قورئاندا زۆرە، لوتفی خوایە، قورئان خوێنم، لە بابی ﴿وَأَمَّا بِنِعْمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثْ﴾ (الضحى: ١١) ئەمە دەڵێم، بۆ فەخر و شانازی کردن نیە.

وەها ڕایانکێشام هەروەکو ئەوەی گوریسێکی بەهێز لە کەمەرت گیر کرابێت و بۆ دواوە ڕات بکێشن، بەڵام ئازاری نەبوو، کوت و پڕ کێش کرام بۆ دواوە، کە ڕاکێشرامەوە، ئیتر چاوم کردەوە لە نەخۆشخانەدا بووم.

گوێم لێ بوو پەرستارەکە وتی: لە مردن گەڕایەوە، لەو چرکە ساتەدا هەستم بە خەم و پەژارە کرد، کە لە بەرزەخ نەمامەوە!!

ڕەنگە بوترێت ئەوەی دەیبینی ئەزموونی خۆتە و خەیاڵ و ئەندێشەی خۆتە دێتەوە ڕێگەت!!

بەڵام هەرگیز وانیە، هەرگیزا و هەرگیز لە خەودا بەو ڕوونیە باپیرە دوورەکانی خۆت نابینی، بینینی ئاسایش نا، بەڵکو لەگەڵیدا بژیت.

جۆرەها خەڵکی ناسراو و نەناسم بینی، بەڵام نەناسراوەکانیش هەموو شتێکم دەربارەیان دەزانی.

شێوە و ڕوخسارێکی تایبەتیان هەبوو.

بۆ ئەوەی بیسەلمێنم کە لە خەیاڵ و وڕێنە ئەم گەشتە دروست نابێت، کاتێ گەڕامەوە، پێش ئەوەی بگەمەوە ناو جەستەکەی خۆم، مێرگە جوانەکەم بینی، ئەسپێکی زۆر جوانم بینی، لە سەروو خەیاڵەوە بوو.

دوو باڵی هەبوو، وەك وێنەکێش 'فرشجیان' کە کارەکانی چەندە جوانن، پرچ و باڵێکی زۆر جوان و درێژی سپی هەبوو.

کە من باسی وێنەکانی 'فرشجیان' و 'منیاتور' دەکەم، دوای ئەزموونەکەم ئاشنای کارە هونەریەکانیان بووم، واتە کاریگەری ئەوان نەبوویە هۆی ئەوەی ئەندێشەم ئەو ئەسپە جوانەم بۆ بنەخشێنێت!

من دەمتوانی دەست لە هەموو بەشەکانی جەستەی ئەو ئەسپە جوانە بدەم، دەستم هێنا بە گەردنی ئەسپەکەدا، هەستێکی زۆر جوانم هەبوو، دەستم گیر کرد لە پرچ و

باڵی ئەسپەکە هەتا سەر بکەوم، چونکە ئەسپەکە بۆ ئەو مەبەستە هـاتبوو کە مـن بچـمە سەر پشتی و غار بدات.

هەستم کرد ئەو ئەسپە بۆ من دانراوە و موڵکی منە.

کە ویستم خۆم هەڵبدەمە سەر پشتی، گوێم لە دەنگێك بوو، دەنگـی کەسـێك بـوو بە ئەسپەکەی وت: 'هییی' 'بە چەپـڵەوە'، هەر کە وتـی: هەییـی ئەسـپەکە سـەری بەرز کردەوە هەتا من نەتوانم دەستم لە یاڵ و گەردنی گیر بکەم... ئیتر ئەسپەکە هەڵهـات و ملی بادا و ڕۆشت!

هەر کە ئەو ڕۆشت، من بۆ دواوە گەڕامەوە و هۆشم هاتەوە و گەڕامەوە بۆ دونیا.

ئەوەی زۆر گرنگە ئەوەیە، وەختێك من لە نەخۆشخانە دەرچووم و حاڵم باش بـوو، ئەو کاتە من و باوکی ڕەحمەتیم و براکانم، ڕۆشتین بۆ تەبریز بـۆ لای دایکـم، چـونکە دایکم نەیتـوانی بـوو بێـت بـۆ نەخۆشـخانە و، دایکـم ئاگـاداری ئەوە نەبـوو کە مـن نەخۆش بووم و حاڵم زۆر خراپ بووە، واتە پێیان نەوتبوو.

من لە تـاران بـووم و دایکـم لە شـاری تەبرێـز بـوو، ڕەوشـی تەندروسـتی دایکـم بەرگەی ئەو هەواڵە ناخۆشەی نەدەگرت.

دوای ئەوەی هەموومان لەلای دایکم کـۆ بـووینەوە، دایکـم پێـی وتـم: لە شـەوی نەخۆش کەوتن و بێ هۆشیەکەمدا 'کە ئەو پێی نەزانی بوو' وتی: کوڕم چەنـد شـەوێك لەمەوپێش 'فڵان شەو' لە خەونمدا باوکم بینی 'واتە باپیرەی من'، دایکـم وتـی: بـاوکم لە خەونمدا پێی وتم: خەمی عەلی ڕەزات نەبێت، من نەمهێڵا سواری ئەسپەکە ببێـت، خێرا 'هەییم' لە ئەسپەکە کرد و ڕۆشت!!

ئەم وشە پەنهان و نهێنیە، ئەم کلیلە، تەواوی ئەو گەشتەی من جیـا دەکـاتەوە لەوەی کە وەهم و خەیاڵ و ئەندێشە بێت، کلیلی جیهانێکی واقعتر لە دونیا بوو.

دایکم بە هیچ جۆرێك ئاگاداری نەخۆشی و سەغڵەتیەکانی من نەبوو.

هەتا ماوەیەکی زۆر دوای ئەوەش پێمان نەوت، ئینجا بۆمان گێڕایەوە و خەونەکەی دایکم بوو بە تەواوکەری ئەزموونەکەی من.

ئەو 'هەیی' کردنەی باپیرەم، لە خەونی دایکمدا لە تەبریز، کە دایکم هیچ ئاگاداری ئەوە نەبوو من لە تاران لە وردبینی ورد بێ هۆش بووم و هەمان ڕووداوم بە واقعی بینیوە، دەری دەخات کە کاری ژیرانە ئەوە نیە بەر پەرچی ئەم ئەزموونە واقیعیانە بدرێتەوە و ناو زەد بکرێت بە وەهم و خەیاڵ و کەمی ئۆکسجین و وڕێنە و ئەو نموونانە.

ئەم ئەزموونە هۆشی منی زیاتر کردووە بۆ ئەوەی ئاگام لە کاتەکانم بێت و بە فیڕۆیان نەدەم.

ژیان و چرکەکانی ئەم ژیانە خەڵاتی خودایە، نابێت زایەی بکەین. لە دوای ئەو گەشتەم تینوی گەڕانەوەم بۆ جیهانی هەتا هەتایی و نیشتیمانی ڕاستەقینە.

پێویست ناکات مرۆڤی ئیماندار لە مردن بترسێت.

ڕزگار بوون لە ڕاستگۆیدایە، هەرگیز درۆ نەبووەتە پردی پەڕینەوە، ئازار دانی خەڵکی بە هەر جۆرێك بێت ترسناکە.

پێش گەشتەکەم زۆر حەزم لەوە دەکرد لە کەشتیەکی ئاسمانیدا بچمە بۆشایی ئاسمان و، ئەستێرەکان و مەریخ ببینم، ئەم ئەزموونە ڕاستەقینەیە زۆر زیاتری پێ بەخشیم، زیاتر لەوەی کە چاوەڕوان دەکرێت لە گەشتی ئاسمانی، ئەم ئەزموونە بە هەموو کەس خەڵات ناکرێت، هیچ ئەزموونێك ناگاتە ئەم ئەزموونە لە فراوانی جوانی و گەورەیدا[1]

---

(١) 'عەلی ڕەزا فەتحی پور' لە دوای گێڕانەوەی ئەزموونەکەی بە ماوەیەك، بەرنامەکەی 'ژیان دوای ژیان'ی عەباسی موزونی لە ئێران، وەفاتی کرد و گەیشتە کاروانی بەرزەخیان. 'خوای گەورە لێی خۆش بێت'

# لەوێ دڵتەنگی نامێنێت

تەمەنم (٢٣) ساڵ بوو، وەزری زستان بوو، پێش نوێژی بەیانی هەستم بە دڵ تەنگی دەکرد، ماڵیشمان نزیکی مزگەوتی 'سەیدە مەعصومە' بوو لە 'قوم'.

بڕیارم دا بۆ نوێژی بەیانی بچم بۆ ئەو مزگەوتە و، لە دوای نوێژەکەش دوعا بکەم بەڵکو ئەو دڵتەنگیەم نەمێنێت.

لەناو مزگەتەکەدا هەستم بە دڵەکزێ کرد، شوێنێکم دیاری کرد نوێژەکەمی تیا بکەم چۆڵ بوو، ویستم تەنها بم و دەستم کرد بە قورئان خوێندن، سورەتی 'یس'م دەخوێندەوە و گەیشتمە ئایەتەکانی (٣ - ٤) هەستم بە دڵ تێکەڵ هاتن و ئازارێکی توند کرد، ئیتر جەستەم سارد بوویەوە، زۆر زۆر سەرمام بوو، کاتێکم زانی جەستەم لەسەر زەویەکە کەوتوە و من لە سەرەوە سەیری لاشەکەم دەکەم.

لە سەرەتادا وام زانی خەون دەبینم!

مجەوری مزگەوتەکە هات بە لای جەستەکەمدا و پێی وتم: ئێرە شوێنی خەوتن نیە، هەستە بڕۆ!

چەند جارێك دوبارەی کردەوە، بەڵام من نەجوڵامەوە، ئینجا بە توندی دەیجوڵاندم، بینی بێ سوودە، هەستی کرد شتێك ڕووی داوە، منیش لە سەرەوە دەبینم و دەبیستم، بانگم لێ کرد ئاغا ئەوە بۆچی ئەوەندە بانگم لێ دەکەیت، ئەی نابینیت هیچم نیە و سەلامەتم!!

هێشتا دڵنیا نەبووم کە ئەوەی دەیبینم خەون نیە!!

ئاگام لێ بوو مجەوەرەکە ڕۆشت و هاوکارەکانی ئاگادار کرد لە حاڵی من!

منیش کەوتمە دوای هەتا بزانم چی دەکات، دەبینم ڕۆشتنم بە هەنگاو نیە، من نێوەندێك بەرز بووم لە زەویەوە، ئیتر هەستم بە ترس کرد، وتم: خەون کەی بەم جۆرەیە.

من ئەم حاڵەتەم هەرگیز نەبینیوە، کە مجەوەرەکە ڕۆشت دوای کەوتم و پێم وت: ئاغا گیان من هیچم نیە، خەڵکیم لێ کۆمەکەرەوە، من زۆر باشم، تۆ بۆ کوێ دەچیت؟!

سەیرم کرد! من دەتوانم بیر کردنەوە و خەیاڵی ئەم مجەوەرە بزانم و بە ئاسانی بیخوێنمەوە، کە ئەوە بوو لە دڵی خۆیدا دەیوت: باشە ئەم بەڵایە چی بوو لە سەرە دەوامی مندا پەیدا بوو!

ئەم کابرایە سەر ئێشەیەك بۆ من دەسازێنێت!

سەیر دەکەم دەزانم پشتی ئەو گوڵدانە و، ئەو دیوارە چیان تێدایە، ئیتر شتێك بەناوی کات و زەمانەوە لەلای من نەما، تونەیلێك لەلای ڕاستمەوە بوو، زۆر گەورە بوو، نەنکم بینی، زۆر دڵخۆش بووم بە بینینی، ساڵ و نیوێك پێش ئەو ئەزموونەی من کۆچی دوایی کردبوو، خێرا لەوێدا زانیم، ئەمەی بەسەرم هاتووە خەون نیە و من مردووم.

کاتێ ڕۆشتمە تونێلەکەوە گەنجێکی زۆر سەرسوڕهێنەری جوانم بینی، بۆنێکی ئێجگار خۆشی هەبوو، زۆر سەرنج ڕاکێش و سەر سوڕهێنەر بوو. هیچ قسەیەکی لەگەڵ نەکردم، بەڵام دەستی گرتم و سەری خستم بۆ سەرەوە، هێزێکی زۆری بە دڵ و دەرونم بەخشی، هەستم بە لوتف و محبەتێکی گەورە کرد، بینیم نەنکم لە دەرەوەی تونێلەکە لەگەڵ ئێمە سەر دەکەوێت بۆ سەرەوە.

دوای ئەوە کەوتمە شوێنێکی ترەوە، ئیتر ئەو گەنجەم نەبینیەوە، باپیرە و نەنک و خاڵ و مام و خزمەکانم کە مردبوون، هەموویان لەوێدا بوون و بینیمن، هاتن بۆ بەخێر هێنانم.

من سەرسامی ئەو شوێنە دڵ ڕفێنە بووم.

سەیری هەچ شوێنێکم دەکرد سەوزاییەکی چڕ بوو، چاو لێی تێر نەدەبوو، هەرگیز شوێنی ئاوا جوانم نەبینیوە.

هەموو شت جوانی و نور بوو، هیچ ئازارێکم لەوێ نەبوو. پێش ئەزموونەکەم کێشەی خێزانیم زۆر بوو.

من تەمەنم زۆر نیە، بەڵام نەخۆشی دڵم هەبوو، ئازاری جەستەیم زۆر بوو، هەمیشە تورە و نا ئارام بووم.

لەوێ هەست کردن بە ئازار و خەم و پەژارە نیە.

وتم بە نەنکم: ئایا تۆ مردوویت؟

وتی: بەڵێ کوڕی شیرینم، ئێمە لە جیهانێکی زۆر جوان و جیاوازداین، بەڵام کاتی هاتنی تۆ نەهاتووە بۆ ئێرە.

منیش وتم: نەنە گیان، من دەمەوێت لێرە بمێنمەوە، ئێرە زۆر زۆر جوانە.

وتی: نا کوڕم! کاتی هاتنت بۆ ئێرەی هەمیشەیی نەهاتووە، دەبێت کار و ئەرکەکانی دونیات تەواو بکەیت.

وەختێ من لەگەڵ نەنکم دەدوام، خزمەکانی ترم لەگەڵم نەئەدوان، قسەی زۆرمان لەسەر کرد، لە کوت و پڕێکدا پاڵێکی پێوەنام، بەرەو دواوە گەڕامەوە ناو جەستەکەم.

هەستم کرد جەستەم گەرم بوو، ئازار دەستی پێ کردەوە و گەڕامەوە بۆ دونیا.

ڕۆژان هاتن و چوون، کەسم نەدەناسی هەتا ئەم ئەزموونەی خۆمی بۆ بگێڕمەوە، خەڵکی لەم بابەتە گرنگانە حاڵی نابن و ڕەنگە لێکدانەوەی خراپی بۆ بکەن، خۆشم نەمدەزانی چیم بەسەرهاتووە، دەمزانی خەون نەبووە و نزیکبوونەوە لە مردنیشم نەبیستبوو.

ژیان دەستی پێ کردەوە و، ژنم هێنا ماوەیەکی زۆری پێچوو، لای هیچ کەس باسم نەکرد، ساڵانێکی زۆری بەسەردا ڕۆشت، چوار ساڵ ئەزموونەکەم لە دڵی خۆمدا هێڵایەوە، زۆر جار بڕیارم دەدا کە ئیتر نایشارمەوە و باسی دەکەم.

دەترسام گاڵتەم پێ بکەن، یاخود باوەڕم پێ نەکەن. پێش ئەوەی بڕیار بدەم لەم بەرنامەیەدا باسی بکەم و ئاشکرای بکەم، خەونێکم بینی، ڕێک شەوێك پێش ئەوەی بڕیاری بەشداری ئەم بەرنامەیە بدەم.

لە خەونمدا خۆم بینیەوە لە مزگەوتی 'سیدة المعصومة' بووم، هەمان ئەو شوێنەی کە ئەزموونەکەم تێدا کرد، نەنکم بینی کە ژنێکی تری لەگەڵ بوو، ڕووخساری ژنەکەم نەبینی، یەک پارچە نور و ڕووناکی بوو، نەنکم تووڕە بوو لێم

وتم: نەنە بۆچی لێم عاجزی؟

وتی: تۆ کێیت هەتا ئەو گەشتە بشاریتەوە!!

بۆچی بۆ خەڵکیت نەگێڕاوەتەوە، سەیدە مەعصومە عاجز و نیگەرانە لێت!!

وتم: ئاخر نەمتوانیوە باسی بکەم، ئەی لای کێ باسی بکەم؟!

وتی: خۆی دێتە بەردەمت، تۆ گوێ بەوە مەدە، دەرگات پێ دەگرێ هەتا باسی بکەیت و ئاشکرای بکەیت.

ئیتر ئەوە بوو دواتر ئێوە پەیوەندیتان کرد و ئەم بەرنامەیە سازا.

"مەبەستی لەو بەرنامەیەی کەناڵێکی ئاسمانی ئێرانە کە بەرنامەکەی تیا بڵاو بوویەوە".

ئێستا ئەگەر وێنەکێش بم، یاخود وەسفی بکەم بۆ وێنە کێشێك ناتوانم جوانی ئەو گەنجە بهێنمە پێش چاوانی خەڵکی دونیا، چونکە جوانیەکانی ئەوێ نەبینراوە و ناتوانرێ لێرە ئەندێشە بکرێت.

بۆن خۆشی و هەموو شتێکی بەو جۆرەیە.

دوای ئەزموونەکەم زۆر گۆڕام، هەموو خەڵکیم خۆش دەوێت.

هەموو گیانلەبەران، ڕووەکەکان، هەموو دروستکراوێکی خوام خۆش دەوێت.

ڕقم لە هیچ شتێك نیە، تەنانەت کاتێکیش تورە دەبم یاخود لە یەکێکیش عاجز دەبم، دەمەوێت دەست بەجێ دڵم باش بێتەوە و تورەیی و ڕق هەستانم نەمێنێت.

ئەگەر ئاوا مامەڵەمان کرد، خوای تەعالا لێمان ڕازی دەبێت.

پێشتر بێ بایەخ دەمڕاوانیە زۆر شت، بەڵام ئێستا هەوڵ دەدەم بەلای کەمەوە، حەق و مافێك کە لەسەر منی داناوە جێبەجێی بکەم.

ئیمکان نیە مرۆڤ گوناه نەکات، ئێمە مرۆڤین و گوناهبار دەبین، بەڵام مرۆڤ دەتوانێت زۆر زۆر خۆی بپارێزێت، الحمدلله من خۆم زۆر لە گوناه دەپارێزم، دوای ئەزموونەکەم زۆر وریای خۆمم. پێشتر زوڵمم دەکرد، کە گەڕامەوە داوای لێبوردنم کرد لەوانەی کە ستەمم لێ کردبوون.

ئەگەر لەسەر ڕێگای 'صراط المستقيم'ی حەق تەعالا بڕۆین، مردن دەبێتە شا خەڵاتی خوایی و ڕزگار بوون لە مەینەت، چونکە ڕاستەوخۆ دەچیتە جیهانێکی بێ وێنەوە.

ئەزموونەکان خەڵاتی خوایین، هەتا بە مرۆڤ بڵێن ئەوە شتێکم لە جیهانی دوا ڕۆژ پیشان دایت، بڕۆ ئەو تەمەنەی ماوتە چاکی بکە.

شێوازی ژیانت بگۆڕە، چونکە جارێکی تر ئەچیتە ئەو جیهانە و ناگەڕێتەوە دونیای تاقی کردنەوە.

ئەگەر ئەو ئەزموونە نەبوایە، من بە حاڵی باشەوە نەدەڕۆیشتم.

# زانیم لە قەدیمەوە ئاشنای دوو فریشتەکەم



'فاتیمەی سەرکار زادە' دەڵێت: تووشی هەوکردنی جیوب بووم، ئازارێکی زۆرم هەبوو، ئارامم نەما.

سەعات دەی شەو بوو، ئازارەکەم زیادی کرد، کە بەرگەم نەدەگرت.

شەوێکی ساردی زستان بوو، هاوسەرەکەم و منداڵەکانم نوستبوون، دوو کوڕ و دوو کچم هەیە، ویستم بچمە سەر جێگەی نوستن، نازانم چۆن سەیری کاژێرەکەی پشتی خۆم کرد، کاژێر دەی شەو بوو، سەرم خستە سەر پشتیەکە.

وتم- خودایە ئەوا خۆم تەسلیمی تۆ کرد، هەر کە ئەوەم وت ئیتر نازانم چی ڕوویدا. خۆم بینیەوە لە نێوان ئاسمان و زەویدا بووم.

لە نێوان وەستان و فڕیندا بووم، وەك ئەوەی هەڵواسرابم.

سەیری جەستەی خۆمم دەکرد، سەرم لەسەر پشتیەکە بوو، دەمتوانی بە هەموو لایەکدا شت ببینم و وەسفی شتەکان بکەم.

بینیم کە هاوسەرەکەم و منداڵەکانم نوستبون، بێ دەنگیەکی قورس بوو، هیچ دەنگێك نەبوو، ئیتر زانیم کە من لە جەستەی خۆم دەرچووم، هیچ ئازار و بێتاقەتیەکم نەبوو، دڵخۆشی و هێمنیەکی ئێجگار زۆر دایپۆشیم.

وام دەبینی کە جەستەم کراسێك بووە و لەبەری خۆما نەمهێڵاوە.

ئامازەیەکی گەورەم پێ گەیشت کە بچم بەرەو پەنجەرەکە، خێرا لەوێدا بووم، دوو فریشتەم بینی، ئیلهامێك چوویە دڵمەوە کە ئەوانە فریشتەن، لە لوتکەی نورانیەت و جوانیدا بوون، زۆر نەرم و نیان بوون، زانیم کە لە تەواوی ژیانمدا ناسیومن، بەخێر هاتنیان کردم، زۆر دڵم خۆش بوو، هەستم بە سەکینە و هێمنی کرد.

پێیان وتم: دەبێت بڕۆین!

منیش لەگەڵیان ڕۆشتم، نەمپرسی بۆ کوێ بچین؟

نەمپرسی چیم بەسەردێ!!

بەناو تاریکیدا ڕۆشتین، بەڵام لەناو هێمنیەکی تەواودا بووم.

لە دوایدا ئاوازێکی ئاسمانیم بیست، ئاواز و سەدای سەر زەوی نەبوو، نەغمەیەکی بەهەشتیانە بوو، مانای هەبوو، ماناکانی عیبادەت و زیکر و پەرستنی خوای تیا بوو، ناتوانم وەکو خۆی وەسفی بکەم، ئاوازێك بوو تێکەڵ بە ڕۆح و دڵ دەبوو، شەوقی دەگەیاندە وجود و بوونم، ڕۆشتم بەرەو نورێکی زۆر گەورە، وام دەزانی لە پرشنگی ئەو نورە بەرگەی ناگرم، بەڵام پڕ بوو لە میهرەبانی و زۆر بێ عەزیەت بوو، چەندین ساڵ تێپەڕیوە بەسەر ئەزموونەکەمدا، بەڵام لە ناخی مندا هەمیشە نوێ دەبێتەوە.

لەوێ هەست دەکەیت عیشق و خۆشەویستی ئیلاهی هەموو لایەکی تۆ دەگرێتەوە، ئێمە گەردیلەیەکیش نین لە بەرامبەر ئەو عیشقە بێ سنورە.

پێیان وتم: ئەگەر نەگەڕێیتەوە بۆ دونیا، حاڵی منداڵەکانت خراپ دەبێت، ئیتر گەڕامەوە بۆ دونیا.

ئێمە لە ژێر ڕەحم و بەزەیی گەورەی خوایداین، ناکرێت ڕەحم بە یەکتری نەکەین، نابێت دەستمان لە کوشتن و جەنگدا هەبێت، بیرم کردەوە کە ئەم حەقیقەتانە بگەیەنم بە خەڵکی دونیا، بەڵام لە نزیکی زەویدا هەموویم بیر برایەوە، تەنها ئەوەندە نەبێت کە گێڕاومەتەوە، کە چاوم کردەوە دەبینم لەسەر جێگاکە دانیشتوم و سەیری منداڵەکانم و مێردەکەم دەکەم، ئەوان خەوتبوون.

بەدەنگی بەرز دەستم کرد بە گریان، ئیتر زانیم کە گەڕاومەتەوە، مێردەکەم لە دەنگی گریانی من هەستا و وتی: ئەوە چی بوو؟ بۆچی دەگریت؟

منیش ئەوەی لە بیرم مابوو، بۆم گێڕایەوە.

وتی: بخەوە، ڕەنگە خەونت ببینیت!

من زیاتر گریام و وتم: خەونی چی؟

ئاواتم ئەوەیە بگەڕێمەوە بۆ ئەو شوێنەی ئێستا لەوێ بووم!!

دەگریام و دەموت بە فریشتەکان: بۆ خاتری خوا ئێوە زۆر نزیکن لە من وەرن بمبەنەوە بۆ ئەوێ.

نامەوێت لێرەی دونیا بمێنمەوە، ئیتر هاوسەرەکەشم کەوتە ژێر کاریگەری ئەزموونە ڕاستەقینەکەم و دەستی کرد بە گریان.

من دایك بووم و گەڕامەوە، دیارە تەمەنم لە دونیادا مابووی.

بەڵام کەمەندکێشیی دایکایەتی دەگاتە ئەوێش.

ئێستا تێڕوانینم بۆ ژیان زۆر گۆڕاوە، ژیان پڕیەتی لە جوانی و لوتف و خۆشەویستی و یارمەتی دانی خەڵکی.

پێش ئەزموونەکە ڕازی نەبووم بە ژیان، لە هیچ شتێك ڕازی نەبووم، بەڵام ئێستا بە تەواوەتی گۆڕاوم، بینایم لەسەر گەرد بە گەردی ژیان کرایەوە، دونیا گۆڕەپانی تاودانی ئەسپی چاکە و خۆشەویستی و میهرەبانیە.

مردن ون بوون نیە، لە سێدارەدانی هەتا هەتایی نیە، تکتی گەشتێکە، هیچ ناهەمواریەکی تێدا نیە.

شتانی داهاتووی زۆریان پیشان دام، بەڵام پێش ئەوەی بێمە ناو جەستەکەم بیرم برایەوە، کاتێك ڕووداوێك، قەدەرێك ڕوودەدات، خێرا بیرم دەکەوێتەوە کە بینیومە، هەستم کرد ئەو دوو فریشتەیە زۆر قەدیمن لەگەڵ من، لە زۆر زووەوە ئاشنایانم.

# خزمەتی خێزان و منداڵەکانت، زەمینەیەکی بەپیتە بۆ پاداشتی قیامەت



’ئەمیر ڕەزا عەباسیان‘ دەڵێت: بەیانیەکیان بەبێ کێشە هەستام، (٩ - ١٠)ی عاشورا بوو، تکتی گەشتم بە زەحمەت دەست دەکەوت، کە دەمویست لە تارانەوە بچم بۆ ئەصفەهان، ڕۆشتم و سەرکەوتمە سەر یەکێك لە پاصەکان، یەکێك لە هاوڕێکانم لەملاوە دانیشت و، نەفەرێکیش لای ڕاستم. لە کورسی ژمارە (٢) پاصی جۆرێکی پێشکەوتوو ’VIP‘ سەرکەوتم.

کورسی ژمارە (١ - ٢) مادام لە پێشەوەیت، تەنها پلاستیکێك لە پێشتە و، پشتوێنی پارێزگاری دەبەستیت.

من لە پێشەوە بووم و قەڵەویش بووم، قسەیان لەسەر دەکردم، قەرەباڵغی بوو، تکایان لە شۆفێرەکە دەکرد هەر چۆنێك بێت جێگایان بکاتەوە هەتا بگەنە ئەصفەهان. پاصەکە دەرچوو.

نزیکی سەعات دە و پێنج خولەکی شەو بوو، من حەزم لە گەشتی شەو بوو، دەمویست بخەوم، پشتوێنی پارێزگاریم بەست لە چێشتخانەیەکی ڕێگا لاماندا، کە سەرکەوتینەوە بیرم چوو پشتوێنەکە ببەستمەوە، کەوتینە ڕێ، دەمبینی شۆفێرەکەمان هەندێ جار ئارەقی دەم و چاوی دەسڕیەوە، دوو شۆفێر بوون، بینیم شۆفێرەکە خەو دەیبردەوە و قاچی دەکەوت بەملاو لادا، سکانەکەی لە دەستی وەرگرت، سەیارەیەکی گەورە بەردی گەورەی دەگواستەوە و لە پێشمانەوە ڕووبەڕوومان دەهات، قەراغی شاحینەکە کێشای بە پێشی پاصەکەدا. پیا کێشانەکە گەیشتە ژێر پێی نەفەرەکان، گوێم لە شکانی دەعامی پاصەکە بوو، وام هەست کرد کە سەیارەی بار هەڵگرەکە پاصەکەی ئێمەی وەك کێکێك کرد بە دوو بەشەوە، من هەموو ئەم ڕووداوانە دەبینم و سەرسام

ماوم، که کێشای پیاماندا ئینجا شۆفێرەکەمان خەبەری بوویەوە و زانی کە کارەسات ڕووی دا.

یەکسەر قاچی لەسەر ئیستۆپ گیر کرد، بەڵام کاری نەکرد و هیچ سوودێکی نەبوو، پاصەکە وەك چەقۆیەك بیکات بە دوو کەرتەوە، بەو جۆرە لە ناوەڕاستیدا لەت بوو، من لەو کاتەدا کەوتبووم بەسەر کورسی دواوەدا و، کەوتبوومە دەرەوە. لە یەك چرکەدا زەمان و کات ڕاوەستا، زیرەکیەکی لە ڕادە بەدەرم بۆ دروست بوو، کورسی ژمارە (٦) ژنێك بوو، فڵان لەوبەر، ئەوی تر لەولا، دەمزانی چ ئازار و هەستێکی خراپی دەروونیان هەیە.

دەشمزانی چ هات و هاوارێکی دەرەکیشیان هەیە.

بۆچی هاتوونەتە ناو ئەم پاصەوە.

کە لە مردن گەڕامەوە، ئەو زانیاریە وردانەم لە بیر برایەوە، وا ئەزانم بۆ ئەوەش لە بیرم برایەوە هەتا بە خۆشی بژیم.

ئەگینا زەحمەتە ژیان بکەیت بەو هەموو زانیاریەی کە لەوێ وەری دەگریت.

لەو چرکەیەدا هەستم کرد، کە زانیاریەکی زۆری بەرفراوانی قوڵ دەگاتە من. کە فڕێ درام، وەکو منداڵێك بووم کە چۆن قاچ و دەستەکانی کۆ دەکاتەوە، شۆفێری دووەمم بینی سەری بەرز کردەوە بۆ سەرەوە و سەیری کردم و وتی: ئاغای عەباسیان.

هەرگیز بیرم ناچێتەوە کە دەستی بۆ درێژ کردم، نەمتوانی دەستی بگرم، چونکە لە قەدەردا نەهاتبوو.

من 'لاشەکەم' کەوتبووە سەر خۆڵی شەقامی خێرا.

سەیارەکەمان (١٢٠)کم لە سەعاتێکدا دەڕۆشت.

جەستەم لەسەر زەویەکە بوو، ڕۆحم هەستابوویەوە.

ژیان ئەو ژیانەیە کە ڕۆح لە دەستی ئەم جەستە قەفەزینە ڕزگـاری دەبێـت. بەسـەر جەستەی خۆمەوە ڕاوەستا بووم و دەموت: ئەی تەنهای قەڵەوی بێ توانا...

هەر خەسڵەتێکی کەم و کوڕ لە جەستەدا هەبـوو پـێم وت، بە جەسـتەکەی خـۆمم دەوت.

خەڵکیم بینی دەوری پاصـەکەیان دابـوو، یەکێـك لە نەفەرەکـان تەلەفـونی دەکـرد، هات و هاوار و هەموو شتێکم دەبینی، هەست و شعوری دەروونـی هەموویـان لەگەڵ پەرچە کرداری هەموویان لای من ئاشکرا بوو لە یەك کاتدا، کاتیش نەبوو، بەجیـا جیـا هەستی یەك بە یەکیانم دەبینی...

سایەقەکە تەلەفونی بۆ ئیسعاف دەکرد، دەروونیشی زۆر خەمبار بـوو، دەیـوت چـی بکەم! شکاتم لێ دەکەن! زۆر قسەی دڵی دەکرد و لای من ئاشـکرا بـوو، ژمـارەی ئەو مۆبایلانەی کە هەواڵیان پێ دەدان لای من دیار بوو ژمارەکانیان چەندەیە، بـۆ کێشـیان دەکرد بە هەمان شێوە بوو، تووشی سەرسامیش نەبووم، بەڵکو کـارێکی ئاسـایی بـوو، ئەمرێکی ئیلاهی بوو.

قسەی هەموو ئەوانەی تەلەفۆنیان دەکرد، لەگەڵ ئەوانەی وەڵامیان دەدایەوە!

بۆچی ئەمانە بوونە هـاوڕێ و خزمـی ئەوانەی تەلەفۆنیـان بـۆ دەکەن، نـاوی فـلان کەس بۆچی لە مۆبـایلی ئەم کەسـەدا هەیە، ئامـانجی یەك بە یەکیـان لە دونیـادا چـی بووە! چۆن کۆتایی بە ژیانی یەك بە یەکیان دێت، هەمووی لە لای من ڕوون و ئاشـکرا بوو!

شەوێکی تاریك بوو، من 'ڕۆحم' مێرگێك دەبینـێ، ویسـتم جەسـتەم بەئاگـا بێـنم، بەسەر لاشەی خۆمدا ڕاکشام هەتا خەبەری بێتەوە!

ڕەنــگە لەبەر ئەوە بوویێــت هێشــتا جەســتەی خــۆمم خــۆش دەویســت، بەڵام سوودێکی نەبوو.

به جەستەم وت: سەیر بکە چیت بەسەرهاتووە.

لە کـوت و پڕێکـدا نـورێکی تـایبەتی دەرکەوت، بە وزەیەکـی ئەرێنـی و پـڕ لە ڕەسـەنایەتی و تـایبەتی، مـاهیەتێکی زۆر خۆشەویسـتی هەبـوو، مـن نـاوی دەنـێم فریشتەی پارێزگاری.

لەو کـاتەدا کە مـن بەسـەر لاشـەکەی خۆمـدا ڕاکشـابووم، هـات و بە هەردوو دەستەکانی سەری منی گرت، من بۆ چرکە سـاتێك دەم و چـاو و دەسـتەکانیم بینـی، باوەشی پیا کردم، من زۆر دڵخۆش و دڵ ئارام بووم هیچ ترسێکم لە داهاتووم نەبوو.

قـوڵترین پێویسـتی و داوا کاریەکـانی دەرونـت کـۆ بـکەرەوە لەگەڵ هەمـوو ئامانجەکانی ژیانت، ئینجـا تێکەڵیـان بـکە بە یەکـتر و کەڕەتـی دە یـان هەزاری بـکە، هەرگیـز ناگـاتە یەك لەسـەر ملیـارێکی ئەو هەسـت و چێـژەی لەوێـدا هەیە، هەرگیـز بەراوردێك نیە بۆ ئەوەی لەوێیە، نە دەوترێت، نە دەنوسرێت، نە خەیاڵ دەکرێت.

کە فریشتەکە سەری خستمە سەر ئەژنۆی، سێ شتی پێ وتم: بینیت هەموو ژیانـت وەکو یاریەك بوو!

منیش بە یەك نیگا شریتی هەموو ژیانم پێش چاو خرایەوە.

وتم: بەڵێ.

وتی: ئایا دونیا هیچ بایەخێکی هەبوو؟

دووبارە ژیانم هەمووی پێش چاو خرایەوە.

هەستم بە حەسرەتێکی بێ سنور کرد، دڵم پڕ بوو، دەستم کرد بە گریان.

وتم: نەخێر.

وتی: دەبینی تەنها کردەوە باشەکان دەمێننەوە.

دوای ئەوە ئاماژەی بۆ کردم کە بڕۆم.

ئەو سەرتاپا نورانیە ئەوەندە جێگەی متمانە بوو، ئەوەندە خۆشەویست بوو، بە شێوەیەك بوو کە پێت نەدەوت بۆ کوێ بچین؟

من ژوورێکم هەبوو لەسەر ڕێگای 'بەهبودی' کە لادێیەکە.

من بەو ژورەی خۆم دەوت 'کۆشکی نیاواران'، چونکە ئەو ژورەم خۆش دەویست، خۆشەویستیەکی دونیایی، زۆر سادە و ساکار، کە دەگاتە هیچ بوون.

وتی: با بچین بۆ کۆشکی 'نیاواران'.

کە گەیشتینە ئەوێ، بینیم ئەم ژورە لە ئاسن و گەچ و خشت پێك هاتووە. کە بینیم تێ گەیشتم، وام دەزانی یەك پارچەیە. بەڵام ئێستا دەزانم یەك بە یەکی ئەم خشتانە بۆچی لێرەدا هەیە.

کێ ئەم گەچەی لێرە داناوە، وەستاکەی کێ بووە، چۆن دایناوە؟

وتی: وەرە با شتێکی ترت پیشان بدەم.

وتی: ئەوە ئۆتۆمبیلی 'مەرسیدس' گلاسە.

من لەو کاتەدا زۆر پەیوەستی ئەو جۆرە ئۆتۆمبیلە بووم.

بینیم ئەو سەیارەیە یەکپارچە ئاسن و پێستە و لاستیك بوو، ئایا ئەمە ئەو شتەیە کە زۆر بەهادار بوو لە لام!!

ئەمانە نامێننەوە، مانەوەیان دەست ناکەوێت.

دوای ئەوە فریشتەی پارێزەرم وتی: وەرە با بڕۆین.

ڕۆشتین هەتا گەیشتینە جەستەم.

وتی: بنو!

وتم پێی: سەیر بکە... پێش ئەوەی تۆ بێیت سێ جار خەوتم بەسەریدا سوودی نەبوو.

وتی: پێت دەڵێم بخەوە بەسەریدا.

من خۆم چەندین جار هەوڵم دا، بەڵام سوودێکی نەبوو.

وتی: من دەڵێم ڕاکشی بەسەر جەستەکەدا.

وتم: باشە ڕادەکشێم.

هەر کە ڕاکشـام، وەك تەزوویەکـی کارەبـایی و قورسـاییەکی تونـد و گەورە، وەك ئەوەی بەرگێکی ئاسنینی جەنگیت لەبەر بکەن. بەڵام هێشتا زیرەکیە زۆرەکەم مابوو.

فریشتەکە دور کەوتەوە و پێ دەکەنی، منیش وا هەستم کـرد کە خەوتـووم، سـەیری دەستم کرد بە تەواوی ڕەش بوو، بە هۆی لێدانەکەوە، بەرکەوتنەکە زۆر توند بوو.

دەستم وەکو باینجانی لێ هاتبوو، نینۆکەکانم شکابوون، دەستم ئاوسا بوو.

وتم بە خۆم: کەوتینە خوارەوە، ڕووداوێکی ترسناك ڕووی دا...

لە جامی سەیارەکەوە کەوتینە خوارەوە.

هێشتا زیرەکیە زۆرەکەم مابوو، نەسڕابوویەوە، هەمـوو ڕووداوەکـانی ئەم دیـو و ئەو دیووم بیر کەوتەوە.

لەو کاتەدا سەیری دەوروبەری خۆم کرد و، چەند جارێك لە خۆمم پرسـی، بـۆچی بەتەنها بوویت لە تاریکیدا؟

بۆچی ناتوانم دەستم بجوڵێنم، سـەیری دەشـتەکەم کـرد پیـاوێکم بینـی، پەیـکەر و باڵایەکی گەورەی هەبوو، ڕوخساری یەکپارچە وزەی ئەرێنی و بەختەوەری و دڵنیـایی بوو.

بەرەو ڕووم دەهات، ئەوە چوویە دڵـمەوە کە فریشـتەی مەرگ 'حەزرەتـی ئیزرائیـل سەلامی خوای لێ بێت'

ئێستا دەزانم خوای تەعالا بۆچی حەزرەتی ئیزرائیل دەنێرێت بۆ لامان. هاوشێوە و وێنەی نیە، زۆر نەرم و نیان و خۆشەویستە.

وتی: من لێرەم هەر پرسیارێکت هەبێت وەڵامت دەست دەکەوێت. بە ڕۆح دەدوام.

حەزرەتی ئیزرائیل نزیك بوو لە من، من لەو چرکە ساتەیا وتم: دایە.

وتی: دایکیشت پرچەکانی سپی دەبن.

تواناکانی لە دەست دەدات.

لەو چرکە ساتەدا هیچ شتێك کێشی لای من نەبوو.

بەڵام کە زانیم دایکم ئاوای بەسەر دێت، ترسێکی قوڵ لە دڵمدا دروست بوو، دایکم بە هۆی مردنی منەوە پرچی سپی ببێت و، ئا بەو جۆرە بە هیلاکیدا بچێت!! ئەوە بوو بە خەم و خەفەت لە دڵی مندا!

ئیتر هاوارم کرد... دایە... دایە... دایە...

ڕۆحم هاواری دەکرد، بینیم ئاسمان کرایەوە و نورێکی لێ دەرچوو، دەتوت ڕێڕەوێکە.

دەنگێکم بیست، هەروەکو ئەوەی لە پێشتر گوێم لێ بووبێت لە دونیادا... بەڵام بیرم نایەت لە کوێ بیستوومە.

وتی: وازی لێ بێنە، کە بەو جۆرەی پێ وت: حەزرەتی ئیزرائیل بە تەواوی نزیك بوویەوە لە من، سەیرم کرد و، جارێکی تریش بە ڕوومدا پێکەنی و گەڕایەوە، وەختێ حەزرەتی ئیزرائیل ڕۆشت، من بە تەواوی بە شێوەیەکی تەواو کامڵ، بەسەر جەستەی خۆمدا ڕاکشام.

بە دەنگی بەرز هاوارم دەکرد: دایە... دایە... دایە...

ئەم جارەیان بە دەنگە ژێ و جەستەم هاوارم کرد.

گوێم لێ بوو شۆفێرە زیندووەکەیان وتی: ئەوە دەنگی ئەو گەنجەیە کە لە پێشی منەوە دانیشتبوو، کەوتە خوارەوە و مرد. ئیتر هاتن بۆ لام.

هەستم بەرامبەر جەستەم دوو جۆر بوو، خۆشم دەویست چونکە بە بەشێك لە دەستکەوت و شمەکەکانی خۆمم دەزانی، هەستێکیش کە بێزاری و فەرامۆشیم بەرامبەری هەبوو، چونکە ئێستا گیرۆدەی کۆمەڵێك لێپرسینەوەی گەورە دەبیت، کە دەرەنجامی کارەکانی ئەم جەستەیەیە.

ترس لە مردن وەهمێکی قوڵە لە دڵی ئەوانەدا کە گەشت و ئەزموونی نزیکبوونەوە لە مردنیان نەبینیوە، دوای ئەزموونەکە عاشقی مردن دەبیت، چونکە ئەگەر باش بیت، ئەوە کۆتایی هەموو ئازار و کێشەکانی دونیایە.

بەڵام هەرگیز مۆڵەتی خۆکوژی نەدراوە بۆ گەیشتن بەو جیهانە، خۆکوژی باشەی بە دوادا نایەت، مردن واتە بە شێوەیەکی سروشتی و، ئەو کاتەی دەسەڵاتت لە مردنی خۆتدا نیە، بەسەرتدا دێت و دورت دەخاتەوە لە ژیان. دوای ئەو ئەزموونە ژیان بۆ من زۆر جیاوازە و، دەستکەوتێکی مەزنە، هەتا بەڵکو بتوانم خۆشەویستی دڵی مرۆڤێکی تیادا بەدەست بهێنم، هەتا لە چارەسەری کەسێکدا بەشداربم.

هەتا بە پۆشاك و بەرگێکی زستانە کۆمەکی کەسێك بکەم، ئەمانە پاداشتی بێ سنوریان هەیە.

خێزان و پارێزگاری لە خێزانداری بە هەموو گیر و گرفتەکانیەوە زەمینەیەکی بە پیتە بۆ پاداشتی قیامەت، پەروەردەی منالێك، ئاودانی درەختێك، کۆمەکی کردن و یارمەتی دانی خێزانەکەت، کۆمەکی کردنی ئاژەڵ و بەستەزمانەکان زۆر پڕ پاداشتن، لەوەو پێش ئەوانە گرنگیان لەلای من نەبوو.

نەمدەزانی ئاودانی درەختێك، خزمەتی گوڵ و ڕووەکێك، ئەوەندە پڕ بایەخ و بەهایە، هەموو گەردون بە چاوی سومبلی و سوپاس کردنەوە بۆم دەڕوانێت یان باڵندە گیر بوو بێت لە شوێنێك و من ڕزگارم کردبێت چەندە پڕ پاداشتە.

# تونەیلێکی پڕ شەپۆل



مەریەم ئەفزەل پور دەڵێت: تەمەنم بیست و یەک ساڵ بوو، شەوێکیان بەبێ ئەوەی شتێکی دیاری کراو ڕوویدابێت، یاخود نەخۆشیەکی جەستەیم هەبێت، خەوتبووم، لە خەودا بینیم !وا من لە شارێکی زۆر گەورەدا بووم، ئەو شارەش هەمووی پێك هاتبوو لە باڵەخانەیەکی زۆر گەورەی دوو نهۆم.. ئەو کۆشك و باڵەخانەیە پڕ بوو لە ڕێڕەو و پێچ و ڕێگای گەورە، هەموو ڕێڕەوێك ژمارەیەکی زۆر ژووری تیابوو، دوو کەس لە دوای منەوە بوون، دەچوونە ناو ئەو ژوورانەوە، کە دەرۆشتن، هەر یەکێك لەو ژوورانە دەنگە دەنگی لێ دەهات، هەندێکیان دەنگی پێکەنین بوو، هەندێکیان قیژە و هاوار و گریان بوو، هەندێکیش قسەو باس و مەجلیس گەرم کردن بوو. دەمزانی ژوورەکان مردوویان تیا بوو، من زۆر دەترسام، من وا گومانم دەبرد کە لەو خەونە هەستابووم !بەڵام دوایی زانیم، ئەوەی کە بینی بووم خەون نەبوو، بەڵکو بەشێك بوو لە ئەزموونەکەم .هەستم بە گەرما و وشك بوونەوەی زۆر دەکرد لە جەستەمدا، ویستم هەستم و ئاو بخۆمەوە، چونکە زۆر تینووم بوو، هەمان ئەو دوو کەسەم بینیەوە کە من پێشتر وام دەزانی لە خەونمدا بینیومن .نێوەندێك لە منەوە دوور بوون و دەربارەی من دەدوان. ئیتر زانیم هاتوون گیانم بکێشن، باسی مردنی منیان دەکرد، بینیم شلەیەکی گەرم لە قاچەکانمەوە دەرچوو بەرەو قوڕگم، لە پەنجەکانی قاچمەوە سەرکەوت و پەنجەی دەستمی بەجێ هێڵا و گەیشتە قوڕگم، ئیتر دوای ئەوە هەستم کرد عەقڵ و تێ گەیشتنم زۆر زۆر فراوان بوو ترسم نەبوو، بەڵام چاوەڕوانی ڕووداوەکانی داهاتووم دەکرد. یەکەم شتێك کە لەو چرکەیەدا هاتە دڵمەوە، ئەوە بوو کە خوای گەورە لە ڕەگی بنگوێمان نزیکترە لێمان، ئیتر لەو شوێنە دەرچووم، خۆم بینیەوە لە تونەیلێکی پڕ لەشەپۆل دا، تاریك بوو، بەڵام شەپۆلەکانی شین بوون، کۆتاییەکەی

نوور بوو، نوورێکی پڕشنگدار ئازاری نەبوو، پڕ بوو لە عیشق .لەوێدا وەڵامی ئەوەم دەست کەوت کە خوای گەورە بەندەکانی خۆش دەوێت و زۆر بە ڕەحمتر لە دایکێك بۆ منداڵەکانی دەیاندوێنێت. من خۆم ئەزموونی ئەو ڕەحمە خواییەم کرد .کە ئەوەش هەستێکی زۆر جوان و ناوازە بوو، لە کێشی وشە و باسکردندا نیە، هەموو ئیدراك و هەستەکانمان کۆ بکەینەوە ناتوانین کۆمەڵە وشە و ڕستەیەك بدۆزینەوە، هەتا وەسفی ئەوەی پێ بکەین، ئایا خۆشەویستی دایك و باوك بەڵگەی دەوێت؟!

هەموو تەمەنی بیست و یەك ساڵەی خۆمم بە تەواوی وردەکاریەکانیەوە بینیەوە، کاتێك منداڵێکی چەند مانگە بووم لە سکی دایکمدا هەتا ئاخرین چرکەی پێش ئەزموونەکەم.

ئەوەندە بە وردی پیایدا دەڕۆیتەوە لەناو ژیانتدا دەژیتەوە.

وەختێ لە دونیا درۆیەك لەگەڵ کەسێك دەکەیت، کاریگەریە خراپەکەی درۆکە یەخەت دەگرێتەوە و، لەسەر ئەو کەسە چی دروست کردووە بۆ تۆش دەگەڕێتەوە!

حەسرەتم هەبوو بۆ کارێکی باشە کە لە دونیادا نەمکردبوو، دەموت بمگێڕنەوە بۆ دونیا هەتا ئەو کارە چاکە بکەم.

من سەردانی خانەی بەساڵاچوانم دەکرد بە شێوەیەکی ڕێك و پێك.

ژنێکی پیری بەڕێزی نەرم و نیانی لێ بوو، کەم دوو بوو، مەسیحی بوو، پێم دەوت چیت پێویستە پێم بڵێ، بەڵام ئەو داوای هیچی نەدەکرد، زۆر داوام لێ کرد کە دیاریەکم لێ قبوڵ بکات هەتا لە لای بمێنێتەوە، داوای ڕادیۆیەکی کرد، منیش وەعدم پێ دا کە دوای دوو هەفتەی تر کە گەڕامەوە بۆ لایان بۆی بێنم.

ژنێکی تەنها بوو، کەسی نەبوو، حەزی لە ڕادیۆ بوو.

حەسرەتی ئەوەم بوو فریا نەکەوتم وەعدەکەم بێنمە دی، چونکە ئەزموونەکەی هات بەسەردا.

لەوێ تکام کرد بمگەڕێنەوە بۆ دونیا هەتا ئەو ئەرکە جێ بەجێ بکەم، چەند سەعاتێکم پێ بدەن هەتا ئەو ئەرکە بە پایان بگەیەنم. ئەو جیهانە بۆ چاکەکان تەواوی بەختەوەری و دڵخۆشی و دڵ ئارامیە.

بەرەو دیوارێکیان دەبردم، دیوار نەبوو، هالەیەکی نورین بوو، دەمزانی ئەگەر ئەو دیوارە تێپەڕێنم، ئەوە جارێکی تر ناگەڕێمەوە بۆ دونیا، تکام کرد کە شەفاعەتم بۆ بکەن، چاوەڕوانی وەرگیرانی شەفاعەتەکەم دەکرد، ئەوانەی داوای شەفاعەتم لێ کردن یەک پارچە نور و نورانی بوون، دەجوڵان بە دەوری مندا، هەستم کرد کە کێش دەکرێم بۆ بازنەیەکی نورانی ئەوان، ئیتر دوای ئەوە خۆم بینیەوە لەسەر چرپاکەم بووم و لە ژوورەکەی خۆمدا بووم.

ئەو دوو کەسی یەکەم جار لە سەرەتادا کەگەڵم بوون، بینیم بەردەوام هێشتا وەستاون لە هەمان شوێن.'

یەکێکیان بەوی تریانی وت: هێشتا کاتی مردنی نەهاتووە، با بڕۆین، ئیتر ون بوون لە پێش چاوانم و نەمان.

هەستم کرد هێز و توانا گەڕایەوە بۆ جەستەم و، بانگی دایکم و باوکم کرد، ویستم ئەوە بزانم کە ئایا بە گوێی جەستەییم دەبیستم یاخود بە دەرك کردن؟!

کە گوێم لە هاواری خۆم بوو، زانیم کە گەڕاومەتەوە بۆ ژیانی دونیا.

# منالی کۆچکردوو شەفاعەتکاری قیامەتە

  

من و خێزانم لە ماڵی باوکم دەگەڕاینەوە، لە شاری 'لندة'ە وە کە لە ئۆستانی 'کهکلویة بویر ئەحمەد'ە، بەرەو شاری 'سمنان'.

لە ڕێگەی گەڕانەوەمان، لە نێوان هەردوو شاری 'جساران' و 'یاسوج'دا ڕووداوی هاتوچۆ ڕووی دا.

من و خێزانم و کچە بچووکەکەمان بووین و، برایەکیشم لە دواوە سەرکەوتبوو.

سوپاس بۆ خوا براکەم بە سەختی بریندار نەبوو. بەداخەوە خێزانم زۆر ئازاری پێگەشتبوو، چەندین نەشتەرگەری بۆ کرا.

بەڵام ئەوەش لوتفی ئیلاهی بوو کە خێزانم بەهۆی ئازار و برینداری خۆی و نەشتەرگەری زۆرەوە سەرقاڵ بوو بە خۆیەوە و نەیزانی چی کارەساتێك ڕووی داوە!!

کچەکەمان لەو ڕووداوە لەدەست دا.

'مدیسا'ی کچم، تەمەنی چوار ساڵ و نیو بوو گیانی سپارد.

لە حەقیقەتدا لە ناوەڕۆکی دڵمەوە، ئێستا نارەحەتی لە دەست دانی نیم، چونکە ڕۆشتووە بۆ جیهانێکی زۆر ناوازە و بێ وێنە، من ئێستا زۆر باشم، ئەو کات زۆر پڕ ئازار بوو، مردنی منالێکی ئاوا نازدار، زۆر جەرگ بڕ بوو بۆمان.

لە ئەزموونی نزیکبوونەوە لە مردن، چرکە ساتەکانی ژیانم هێنرایەوە پێش چاوانم. نازانم لە چ چرکە ساتێکدا پیشانم درایەوە، ئایا لە بێ هۆشیەکەمدا بوو، یاخود دواتر بوو، گرنگ ئەوەیە لەو ڕووداوەدا بینیم منداڵ بووم و لە بێشکەدا بووم، نەنکم 'بە ڕەحمەت بێت' ژنێکی چاك بوو، ڕایدەژەندم، هەموو کارە گرنگەکانی ژیانم پیشان درایەوە، تەمەنی ساڵ بۆ ساڵ و نیوی خۆم بینیەوە.





هەندێکی دڵخۆشی دەکردم و هەندێکیشی دڵگران، وا ئەزانم ئەوەی کە دەمبینی لە دوری سەد مەترێکەوە بوو لە من، ئەو سەیارەیەی کە لێی دایـن و لە پێچەکەوە هـات ئەوەشم بینی، وا دەزانم ئەو شتانەی بە چاوی دونیایی نەیانبینیت، پیشانت نـادرێتەوە، بۆ من بەو جۆرە بوو، واتە من خودی پیاکدادانی سەیارەکەمانم نەبینی.

مـن بەسـەرهاتی نزیکبـوونەوە لە مـردنم لەوەو پـێش نەبیسـت بـوو، واتە هـیچ کاریگەریەکی پێشینەم نەبوو کاتێك ئەزموونم کرد.

لە دوایدا و لە ئەزموونەکە هەستم کرد کێشم زۆر سوك بوو، ئاسایش بوو.

دوای ئەوە بۆ سەرەوە سەرکەوتم و، وەك ئەوە بوو یەکێـك پـێم بڵێـت سـەیر بـکە و هەست بکە بەوەی لە دەوروبەرت ڕوودەدات.

زەوی و ئاسمان هەمان زەوی ئاسمانی دونیـا بـوو کە لێـی دەرچـووم بـۆ سـەرەوە، تێگەیشتم چیم بەسەر هاتووە، خەڵکی دونیام دەبینی دەهاتن و دەڕۆشـتن، تێگەیشـتم کە من دەستم لە دونیا بڕاوە.

بەڵام جەستەی خۆمم نەبینی، کاتێك لەسەر چرپای نەخۆشخانە ڕاکشابووم.

دەنگێك پێی وتم: سەیری ئەم بەشەی تر بکە!

کە سەیرم کرد بە وردی (١٠٠ - ٢٠٠) مەتر، کـچەکەم بینـی دانیشـتبوو، پشـتی لە من بوو، نەمتوانی بچم بۆ لای.

لە قوڵایی دڵـمەوە ڕازیـم بەو قەدەرە خـواییەی کە کچەکەمـان چـووەتە شـوێنێکی نەمری لە میهرەبانی و ڕەحمەتی خوایی دایە.

هیچ بەر پەرچدانەوە و ناڕەزایەتیەکم نەبوو لە کارە جوانەکـانی خـوای باڵادەسـتدا، من هەموو قەدەرەکان بە لوتف و ڕەحمەتی خوایی دەبینم.

لە خودی مردنم ناترسم، لە چۆنیەتی مردن دەترسم!

هەمیشە دوعا دەکەم کە لە باشترین چرکە ساتەکانی ژیانـدا بـم ئەوجـا بگەڕێـمەوە لای حەق تەعالا.

کاتێـك کـچەکەم بینـی بەو جـۆرە بـوو، نێوەنـد و مەودایەك لە نێوانمانـدا هەبـوو، هەستم کرد کە دەبێت ماڵئاوایی لە کچەکەم بکەم و بگەڕێمەوە بۆ دونیا.

هەستم کرد ئازارێکی توند هەموو بوونمی تەنیەوە.

ئازارێك باس ناکرێت، من و خێزانم ناومـان لێنـابوو بە ئـازاری بۆشـایی و خـاڵی بوونەوەی ناوەوە.

پڕ بوون دروست نابێت هەتا هەست بە خاڵی بوونی خۆت نەکەیت.

ئازارەکە جەستەیی نەبوو، کاڵ بوونەوە و خـاڵی بـوونەوەی ڕۆحیـی بـوو، ئـازاری گەڕانەوەی ڕۆح بوو بۆ جەستەی فانی دونیا.

هیچ ئازارێـك ناگـاتە ئەو ئـازارەی ڕۆح، کە لە دوای ئـازاد بـوونی دەگەڕێـتەوە بـۆ جەستەیەکی فانی دونیایی.

فەلسەفەی ژیان سازی لە لای من گـۆڕا، دەمەوێـت ویسـت و بـژاردەم ئەوە بێـت، چۆن خوای گەورە ڕازی بکەم.

مردنی کچەکەم حەز و بژاردەی من بوو، بەڵام بینیم ئەوە بـۆ ئەو باشـترین بـوو، وە منیش بۆ لای ئەو دەچم!

قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ زۆر بە جوانی ڕونیان کردۆتەوە.

کاتێ مرۆڤ صاڵح و خواپەرست و چاکەکار بێت، دوای مردنی بێ کێشەیە.

لەوەو پێش دەمزانی غەیبەت و درۆ و بوختان و خۆ بە گەورە زانـی و ئیرەیـی بـردن و ئەو شتانە گوناهن و خراپن، بەڵام نەمدەزانی چەندە خراپن!

بەڵام ئێستا ناتوانم فێـڵ لە خـۆم بـکەم، مـن جیـاوازم لەو کەسـانەی مەترسـی ئەو گوناهانە نازانن!

ئەگەر ئەزموونەکە و، لە دەست دانی کچەکەم نەبوایە ئەم گۆڕانە گەورەیە لە مندا دروست نەدەبوو.

بەبێ هودە نەهاتوینەتە دونیا، ژیان لوتف و نیعمەتی خوایە، یارمەتیمان دەدات بەرز بینەوە لە ژیانی کۆتاییدا.

خێرۆمەند بم و، کاری چاکە بکەم، لای خوا قەدرم زیاد دەکات.

سپی پێستێ، ڕەش پێستێ، هەر نەتەوە و زمانێك بم، لە کۆتاییدا من و ئێوە و هەموو مرۆڤایەتی یەك شتین، هەموومان بەندەی خواین، ڕۆح لە بەرین و یەکسانین و هاوشێوەی یەکترین.

قورئانی پیرۆز تەواوی ئەم حەقیقەتانەی ڕوون کردۆتەوە.

من هەموو ئەم ڕاستیانەم بینی، بەڵام ڕۆتینی ژیان بیرمان دەباتەوە، من نامەوێت لە بیری بکەم، ئەم حەقیقەتە کاڵ بێتەوە و فەرامۆشی بکەم. هەتا لە ژیاندا بمێنمەوە، ئەم ئەزموونە لە یاد ناکەم، چونکە ڕاستی کردمەوە.

ڕێڕەوی ژیانی گۆڕیم، کاریگەری زۆر باشی لەسەر خێزانەکەشم هەبوو، چونکە خێزانم زیاتر لە من بیری کچەکەمان دەکات.

خێزانم بیری لە خۆ کوژی دەکردەوە، بەڵام ئەزموونەکەی من بوو بە هەتوان و مەرهەم و سارێژی ئازارە مەعنەویەکانی کرد.

لە دوای ساڵێك، خوای گەورە منداڵێکی تری پێ بەخشین و، منداڵێکیشی لە قیامەت بۆ کردینە پەرژین و قەڵغان و شەفاعەتکار إن شاء الله.

# هەفتەیەك لەو دونیا بووم





'موحسن لوینەنسب' ئەزموونەکەی بەم جۆرە بوو:

ئەم جارە ڕۆحمان کەمەندکێشی کەناری ڕووباری 'دیزفولی' شیرین دەکەین، ئەزموونی برایەك، لە ئەنجامی یاری منالانە لەگەڵ برایەکی تری، دونیا بەجێ دێڵێت و ڕووە و جیهانی نادیار دەڕوات.

موحسن دەڵێت: ڕۆژی پێنج شەممە بوو، لە دواناوەندی دەمخوێند، وانەی ئاینمان خوێند و، وانەی وەرزشم فەرامۆش کرد و گەڕامەوە ماڵەوە، سەربانی ماڵەکەمان لە دوو نهۆم پێکهاتبوو، وتم: دەچم پاکی دەکەمەوە هەتا لەبەر خۆرەکە سەعی بکەم، پایز بوو، خەریك بوو سەرما دەستی پێ دەکرد، باوکم کاری بەنایی دەکرد، هەمیشە سەربانەکەمان خشت و مەوادی بینا و ئاسنی لێ بوو، خەریکی پاك کردنەوەی بووم، بوو بە نیوەڕۆ، هاتمە خوارەوە و نانم خوارد، چوومەوە سەربان و دەستم کردەوە بە کار کردن، دایکم خەریکی چێشتی ئێوارە بوو، بۆنی خواردنم کرد چوومە نهۆمی خوارتر برسیم بوو، نەوەستام هەتا ژووری چێشتخانە، سەیرم کرد بزانم دایکم چی بۆ ئامادە کردوین، برایەکم هەبوو چواردە ساڵ لە من گەورەتر بوو، باڵا بەرز و بەخۆوە بوو، برا گەورەمان بوو، چووم بە لایدا و حەزم لە شۆخی کردن بوو، دەستمان کرد بە زۆران بازی، بیست تمەنێك لە دەستی 'هادی' برامدا بوو، بەهەرۆز کە برا گەورە بوو یاری و زۆرانی لەگەڵ هادی برام دەگرت، برایەکی بچووکی سێ ساڵانەشمان هەبوو، هادی هاواری بۆ من هێنا هەتا لە دەستی بەهەرۆز ڕزگاری بکەم، من برای ناوەڕاست بووم، تیکەیەك لە دەممدا بوو، وتم: وازی لێ بێنە تۆ گەورەیت.





برا گەورەکەم لەبەر ئەوەی زۆرانی لەگەڵ بگرم، قاچی ڕاکێشام و من کەوتم بە دەمدا و، ویستم ڕابکەم، خۆی دا بەسەرمدا، دەستیشی توند کرد لە ملم، ئیتر من هەناسەم بۆ نەدرا، هاوارم کرد بەرم بدە وا خنکام، بەڵام براکەم چاوی لەسەر هادی برام بوو هەتا ئەویش ڕابکێشێت و ئاگای لە من نەبوو!

ئیتر حاڵم تێك چوو، گوێچکەم دەزرنگایەوە و نەمدەتوانی هاواریش بکەم. برا سێ ساڵانەکەم و خوشکێکیشم هەبوو، ئەوانیش خۆیان هەڵدایە سەر پشتی برا گەورەکەم، ئیتر من بە تەواوی پەکم کەوت و دڵم دەهات بەیەکدا و سنگم خەریك بوو دەتەقی، دایکیشم لە قاتی خوارەوە بوو ئاگای لێ نەبوو!

کاتێکم زانی تەنگە نەفەسیم نەما، ژیانی منالیم وەك شریتێکی سینەمایی هەموویم بینیەوە. یادەوەریەکانم بینیەوە.

جارێکیان منالٚ بووم، دایکم لەگەڵ خۆی بردمی بۆ بازاڕ، ڕۆشتمە دوکانێکی بەقاڵیەوە، لەسەر مێزەکە منی دانا، پێش ئێمە منالێك لەسەر مێزەکە بوو، منالٚتر بوو، لەگەڵ دایکی هاتبوو، منالەکە پاڵی پێوە دەنام وەکو ئەوەی پێم بڵێت: ئەمە شوێنی منە تۆ داگیرت کردووە.

من تۆزێ ئارامم گرت، پاشان پەنجەیەکیم شکاندەوە و ئازاری پێ گەیشت، دایکی ئەو منالە و دایکی منیش خەریکی شت کڕین بوون، دەستی کرد بە هات و هاوار و گریان، نەیدەزانی بڵێت لێیان داوم، هەموو ئەو بەسەرهاتانە تۆمار کرابوون، بە باش و خراپەوە.

وا دەزانم دە چرکەیەك بێ هۆش بووم.

بینیم بەهرۆز و منالەکان خۆیان دابوو بەسەر مندا.

وتم: سەیرە! چۆن ئاوا هەموویان دەبینم، لە کاتێکدا من لە ژێر ئەواندام. من لە سەقفی ژوورەکەدا بووم.

له سەرەوە بانگم لێ کردن: بەهرۆز ... هادی... هیچ کەس دەنگی منی نەبیست.

وتم: لەوانەیە من خەو ببینم، دەنگم هەڵبڕی... کەس نەیبیست. هەوڵم دا هەستم له خەو، سوودی نەبوو... ئیتر ترسام.

براکەم له پاشاندا گێڕایەوە وتی: چاوەکانت زیتەیان دەهات، وتم: سەیری موحسینی برامان بکە، چەندە ئازایە و گوێی لێ نیە و ئازاریشی نیە، ئێمە بەحساب یاریمان دەکرد.

بیرم لەوە دەکردەوە کە سوپاس بۆ خوا بەس نیە سەقفی ماڵەکەمان من گل دەداتەوە و نایەڵێت بەرز ببمەوە و تێپەڕم!

لەو کاتەدا خشت و چیمەنتۆ و ئاسنم بینی، زانیم لە سەقفی ماڵەکەشمان تێ پەڕیوم و بەرز بوومەتەوە، ویستم لە سەقفی سەربان دەست بە شتێکەوە بگرم و زیاتر بەرز نەبمەوە، ترسام، چونکە بینیم دەستم بەر هیچ شتێك ناکەوێت و بە مەیلانی سەردەکەوم، هاوارم دەکرد لە خەڵکی سەر شەقامەکە، سەیارەکان کە دەڕۆشتن، بەڵام هیچ کەس سەرنجی منی نەدەدا و گوێیان لە دەنگم نەبوو، کەس منی نەدەبینی.

شارەوانی 'ئەندیمشك' کە نزیکە لە ماڵی ئێمەوە، ستونێکی بەرزی هەیە، تاوەرێکی درێژی لەسەرە، لە لوتکەی تاوەرەکە گلۆپێکی سوری داگیرساو بوو، وتم: هەوڵ دەدەم بگەم بەو ستونە و دەستی پێوە بگرم. پەنجا مەترێك لە منەوە دور بوو، سودی نەبوو، هەروەکو ئەوەی لەسەرەوە ڕاستەوخۆ من کێش بکرێم ئاوا بوو. زۆر زۆر بەرز بوومەوە.

دەموت ئەو کەسەی بۆ سەرەوە دەمبات، ئەگەر بەرم بداتە خوارەوە پارچە پارچە دەبم. هاوارم دەکرد کەسێك نیە یارمەتیم بدات و بگەڕێمەوە بۆ سەر زەوی!!

هەستم کرد دوو کەس لەملاو و ئەولامەوە هەیە، بەڵام زۆر نزیك نەدەبوونەوە لە من، یەکێکیان دەیچرپاند بە دڵمدا و دەیوت: مەترسە موحسین، ئێمە لەگەڵ تۆین.

وتم: ئێوە کێن؟ بۆ کوێم دەبەن.

زەویم وەك تۆپێکی شین لێ دیار بوو، بە خۆم دەوت: ئومێدێك هەیە مەترسە!!

جارێکی تر لە خۆمم پرسیەوە: ئەوە من لە قوتابخانە بووم و هاتمەوە، وانەی وەرزشم نەخوێند و ڕۆشتمە سەربان و دوایی ڕۆشتم، تیکەیەك لە دەممدا بوو... هتد

دەگەیشتمە ئەم ڕووداوە و سەرم لێ دەرنەدەکرد کە چیم بەسەر هاتووە!

دەمزانی خەو بینین نیە، زۆر سوکەڵەم و هیچ گرفتێکم نیە، هەموو ئەمانەم دەزانی و بە خۆمم دەوت.

ڕۆشتم بە ناوەڕاستی دوو بەردی زۆر گەورە و زەبەلاحدا، نەمزانی ئایا ئەستێرە بوو، نیازك بوو، چی بوو!!

من بە هێواشی ڕۆشتم بە نێوانیاندا، ویستم دەستم گیر بکەم نەمتوانی، دەستم بەر هیچ شتێك نەکەوت، گەیشتمە ئەستێرەیەك، کە لەوێوە سەیری زەویم کرد، زەوی زۆر بچوك بوو، ئەوەندەی تۆپێکی دیار مابوو، وام هەست دەکرد کە هەفتەیەکە بە ڕێگاوەم.

ماوەکەی زۆر بوو، هەر چەندە کات و زەمانیش لەوێ نەبوو.

گەیشتمە سەر ئەستێرەکە و ڕۆشتم بە ناویدا، بینای گەورە گەورەی لێ بوو، دیوارێکی قەوسی لێ بوو، لە ناوەڕاستیدا کۆمەڵێك خەڵکم بینی دەجوڵان لەوێدا، دەنگی خەڵکیم دەبیست، وتم: ئەمە ئاماژەیەکی زۆر باشە، ئێرە خەڵکی لێیە و دەچم قسەشیان لەگەڵ دەکەم، دەرگایەکی زۆر گەورە کرایەوە و، شتێکی حەلەزۆنی لێ دەرچوو هاتە خوارەوە، لە کۆشکە بەرزەکان هاتە خوارەوە، کاتێك سەیرم کرد، شتێك سەرنجی ڕاکێشام، کە دەچمە پێشەوە و هەنگاوێك دەنێم، دە مەتر دەچمە پێشەوە!

زۆر خۆش بوو بۆ من، ئەمە چ شوێنێکی خۆش و جوانە.

دوو کەس لەو کەشتیە حەلەزۆنیە دابەزین، قادرمەیەکی درێژی هەبوو، ڕەنگە (٣٠٠ - ٤٠٠) مەتر بە قادرمەکەدا دابەزین.

دوان بوون لەگەڵ یەکتر دەدوان، زانیم لە ئێمەی مرۆڤ جیاوازن، جل و بەرگی سپیان لەبەردا بوو، دابەزینیان وەك ئێمە نەبوو، وادەزانم وەختێ بە هێواشی هاتن بۆ لای من، هۆکارەکەی ئەوە بوو من نەترسم و بزانم وەکو ئێمە دەڕۆن و دێن، بالآیان لە ئێمەی مرۆڤ بەرزتر بوو، سەرتاپایان سپی بوو، کە نزیکبوونەوە لێم، بوێری ئەوەم نەکرد سەیری دەم و چاویان بکەم، هەتا سەر سنگیانم بینی، وتم: بمبوورن، ئێوە کێن؟ من لێرە چی دەکەم؟

ئەرێ من خەو دەبینم، یاخود بێدارم و بە ئاگام؟

ئایا من مردووم یاخود زیندووم؟!

بیرم دەکردەوە کە من لە قوتابخانە فێری فارسی و عەرەبی و ئینگلیزی بووم، دەمویست دەم بکەمەوە و قسە بکەم بە یەکێك لەو زمانانە، قسە نەبوو، وت و وێژ جۆرێکی ترە!

'تخاطری ذهنی' دواندن بە بیر و ئەندێشە، من چەند ساڵێکە بیستومە ئەو کاتەی ئەزموونەکەم کرد نە بیستبووم، نە دەمزانی.

ئیتر بڕیارم دا بە بیر و دڵم قسەی لەگەڵ بکەم، دەبینم زۆر باشتر لە قسە کردن بە دەم دەتوانم تێیان بگەیەنم و ئەوانیش لە من تێ بگەن!

لە خۆشیاندا دەستم کرد بە گریان، هەستم کرد هاوڕێی منن، پرسیاری ناویانم نەکرد.

وتیان: هێمن بەرەوە، زۆر شت وترا و ڕووی دا، بەڵام سڕایەوە و لە یادەوەریمدا نەمایەوە، هەرچی دەکەم نایەتەوە یادم. وتیان: مەترسە.

وتیان: وەرە لەگەڵمان. زۆر بە دڵخۆشیەوە ڕۆشتم، زۆر پڕ سەعادەت و خۆشی بوو.

وتیان: تۆ مردوویت، ئایا دەترسیت؟

وتم: نەخێر.

وتیان: دە وەرە لەگەڵمان.

چووینە دەرگایەکەوە و وەستام و وتم: من دێم بۆ ئەم جیهانە خۆشەویستە و، بۆ ئەم شوێنە نەبینراوە سەرسوڕهێنەرە و بەهرۆزی براشم لە سزای ویژدان و ئەشکەنجەدا بێت و پۆلیس بیبات و بیدەن بە دادگا و زیندان و من لێرە لە خۆشیدا بم.

وتیان: بەڵێ وا دەبێت.

وتم: تاوانی ئەو برا هەژارەم چیە!

ئەی دایکم چی بکات؟ لە خەم و خەفەت و گریاندا دەمرێت.

ماڵی ئێمە چەند ساڵێك لەمەو پێش شەهیدێکمان داوە، ئێستاش من بڕۆم چی بەسەر دایکم دێت!

وتیان: وەرە ژوورەوە چەند کەسێك چاوەڕوانی تۆ دەکەن. چەند پرسیارێکیان لە تۆ هەیە و، شوێنێکی زۆر جوان بۆ تۆ دانراوە، پیرۆزت بێت.

بەڵام پێیان نەوتم کە چیم پێ دەدەن.

وتیان: تۆ بەختت باشە، شوێنەکەشت زۆر باش و جوانە.

وتم: ئایا خزمە مردووەکانم، خزمە شەهیدەکانم دەبینم.

وتیان: بەڵێ.

ئێمە بیست و دوو خزممان لە شاری ‘دزفول‘ بە صاروخ و بۆردومانی صدام شەهید بوون.

وتیان: بەڵێ دەیانبینیت.

وتم: هەتا حاڵی براکەم باش نەبێت نایەم.

چەند قادرمەیەك دابەزین، دەمزانی ئەو دابەزینە بۆ خوارەوەیە و، شوێنی سزا و ئازار و ئەشکەنجەیە.

ئەم بەشەی سەرەوەش شوێنی خۆشی و بەختەوەری و خۆشی ژیانە.

وتم: من نایەم بۆ خوارەوە.

لە دڵی خۆمدا دەموت: ئەم دوانە بە گوێی من ناکەن، بۆچی هەوڵی شتێك نەدەم، بۆچی پەلاماریان نەدەم، ئیتر ئەو کاتە ڕقیان لە من هەڵدەستێ و دەمگێڕنەوە بۆ دونیا، خۆ ئەگەر واش نەبێت ئەوا ئەوان هەر دەمبەن و دەسەڵاتم نیە!!

بەڵام ئەوان لە هەموو شتێك حاڵی دەبوون، زانیان بیر لە چی دەکەمەوە.

وتیان: ئەی بەشەری لاواز، تۆ دەتەوێت بە ڕووی ئێمەدا بوەستیتەوە.

قاچیان گرتم، ڕایانکێشام، منیش هاوارم دەکرد و دەگریام، دەمویست لە دەستیان ڕازگارم ببێت.

وتیان: تۆ دەتەوێت چی بکەیت؟

ئێمە دەمانەوێت بتبەین بۆ شوێنێکی زۆر جوان و خۆش، بۆچی دەگریەیت.

وتم: بەتەنها نایەم.

وتیان: دەبێت بێیت، کۆتایی بە ژیانت هاتووە، بەشی خۆت لە نیعمەت و چاکە وەربگرە.

ئێمە فەرمانمان پێ کراوە.

تۆ بە مناڵی بێیت بۆ ئێرە، زۆر بەختەوەر دەبیت، من هەر دەگریام، بەڵام فرمێسکیشم نەبوو، واتە هاوار و گریان وەکو دونیا نیە.

هەرچی پاڕامەوە سودێکی نەبوو، بەڵام تکایەك کاری خۆی کرد.

وتم: من تەمەنم شانزە ساڵانە، ئێوەش خوای تەعالا ناردوونی، خـوای گەورە پێـی خۆش نیە من لەسەر دەستی براکەم بکـوژرێم بەبـێ هـودە و بە خـۆڕایی، حەز دەکەم کاری خێری زۆر بکەم لە دونیادا، ئینجا بگەڕێمەوە بۆ ئێرە.

وتیان: بڕۆ، تـۆ دەگەڕێـتەوە بـۆ دونیـا، بەڵام لە دونیـا ناخۆشـی و نـاڕەحەتی زۆر دەبینیت.

ئێمە هەموو شتێك دەربارەی تۆ دەزانین.

تۆ کاتی مردنت نەهاتووە.

یەکێکیان کێشای بە پشتمدا و بەرەو دوا گەڕامەوە.

لەو ڕێگەیەی کە هاتم، بەهەمان ڕێگەدا گەڕێنرامەوە، زۆر بە خێرایی، گەڕامەوە.

هەتا گەیشتمە سەربانەکەی خۆمـان، لە سـەقفەکەوە چـوومە ژورەوە و سـەیرم کـرد منیان بردبوە بەردەم پەنجەرەکە و هێشتا زۆران بازیەکە بەردەوام بوو!

ملی من لە دەسـتی براکەمـدا بـوو، بەڵام بە دەم زۆران بـازیەوە شـوێنەکەمان گـۆڕا بوو.

کە ڕۆحم بە ڕێکی گەیشتە ڕاسەری جەسـتەکەم هەسـتم کـرد، وەك ئەوەی یەکێـك ئاوێکی گەرمم پیا بکات، هەستم بە سوتانێکی قورس کرد و، خێرا خۆم ڕزگار کـرد و هەستامەوە.

هاوارێکی توندم کرد و براکانم دور کەوتنەوە لێم.

دایکم پەرداخێ ئاوی بۆ هێنام و وتی: ڕۆڵە حاڵت باشە؟

بۆچی هاوارت کرد؟ چیتە؟

که پەرداخە ئـاوەکەم گـرت، هەسـتم کـرد زۆر قـورس بـوو، دەسـتم دەلەرزی، خواردمەوە.

وتم: دایکە تۆ لە کوێ بوویت، من هەفتەیەکە لێرە نیم!

دایکم وتی: ڕۆڵە تۆ بۆ هیچ شوێنێك نەچوویت، زۆرانت لەگەڵ براکانت گـرت و، زۆری نەبردوە کوڕم، تەنها ئەوەندە بووە تۆزێك بورایتەوە.

بەڵام من بیست و پێنج خولەك لەوێ نەبووم.

دایکم وتی: ڕۆڵە تۆ باسی هەفـتەیەك دەکەیـت کە لێـرە نەبوویـت، تەنهـا بیسـت و پێنج خولەك لێرە نەبوویت و بێ هۆش بوویت.

کە منیش سەیری جانتای قوتابخانەکەم کرد و، خشتەی وانەکانم زانی، تێ گەیشـتم کە ڕاستە هەفتەم پێ نەچووە!

ئیتر بۆم دەرکەوت کە لێرەی دونیـا کەمێـك بـووە و لەوێ زۆر زۆر بـووە، بەڵام ئەو کاتە مناڵ بووم نەمدەزانی چۆن دەگونجێت!!

## گەردەلوولێکی ترسناکم بینی

'فەرهادی سماوکی' دەگێڕێتەوە و دەڵێت: من هەتا ئێستا (٢ - ٣) جار ئەم گەشـتە لای من ڕووی داوە، بەڵام درێژترینیان، ئەوەیان بـوو کە ڕۆژێکیـان لە خەو هەسـتام و ڕۆشتم بۆ زانکۆ، کە من خوێندکاری زانکۆ بووم، هەستام و ماڵئاواییم لە خێـزانەکەم و کوڕە بچووکەکەم کرد، لە دوایدا وتم: من دەڕۆم هیچتان ناوێت؟

وتیان: نەخێر، بە سەلامەتی بگەڕێیتەوە.

وتم: نانمان پێکەوە بخواردایە باشتر بوو.

وتی: بۆچی؟

بێ تاقەت دیاریت!

وتم: نا ئاسایم!

منالەکەمم ماچ کرد و ڕۆشتم بۆ زانکۆ.

له وانەدا بووم، سەعاتێك دوو سەعات تێ پەڕی، مامۆستاکەمان هاتە لامەوە وتی: بۆچی لە وانەدا دەخەویت؟!

ماندویت یاخود، بە شەو کار دەکەیت؟

وتم: نا مامۆستا بە ئاگام و گوێم لە تۆ گرتبوو.

وتی: نا نەخێر، بۆچی ماندویت؟!

دوای ئەوە نزیکەی (١٥ - ٢٠) خولەك تێپەڕی، هەستم کرد دڵم پڕە و حاڵم باش نیە، پێش دوو ڕۆژێك، شەکرەم دابەزی و، ئەو حاڵەتەم بۆ دروست بوو.

(٥ - ٦) سەعاتێك لە نەخۆشخانە مامەوە، هەتا حاڵم باش بوو.

لە زانکۆ هاوڕێیەکم لە تەنیشتم دانیشتبوو، پێم وت: عەلی وا دەزانم حاڵم باش نەبێت!

وتی: چیتە؟

وتم: هەست بە لەرزین و داهێزرانێکی زۆر دەکەم.

وتم: ڕەنگە دووبارە شەکرەم دابەزیبێتەوە!

حاڵم زیاتر پەرێشانی پێوە دیار بوو، قاچەکانم دەلەرزین.

وتم: عەلی دەتوانیت پەیوەندی بکەیت بە ئیسعافەوە. خەریکە تووشی داهێزرانی تەواوەتی دەبم و بێ هۆش دەکەوم!

من خۆم پسپۆڕیم لە فریاکەوتنی خێرادا هەیە و لەو بەشەدا کار دەکەم، ئەوانەش لەوێ کاریان دەکرد هاوڕێم بوون و بە خێرایی هاتن بۆ لام.

شەکرە و فشاری خوێنیان بۆ گرتم.

وتیان: بەڵێ شەکرەت دابەزیوە.

خۆم هەتا ناو ئیسعافەکە لەگەڵیان ڕۆشتم، لەسەر نەقالەکە ڕاکشام.

وتم بە یەکێك لە هاوڕێکانم، بەڵکو دەرزیەکی 'دیازیپامم' بۆ ئامادە بکەیت باشترە بۆ من.

وتی: باشە، ئەو خەریکی ئامادە کردنی دەرزیەکە بوو، ئیتر دوای ئەوە نازانم چی ڕوویدا، ئەوەندە دەزانم کە بە ئاگا هاتمەوە یەك گەردەلولی زەبەلاحم بە ڕاسەری خۆمەوە بینیەوە، گەردەلولێکی ڕەش و هەندێ جاریش ڕەنگەکەی دەگۆڕا بۆ شینێکی تۆخ.

گەردەلولێکی بێ ئەنداز گەورە بوو، کۆتاییەکەی دیار نەبوو، دەبینم من لەناو چەقی گەردەلولەکەدام، لە پێشدا گەردەلولەکە لە منەوە دور بوو، لە دوایدا نزیك بوویەوە و لە ڕاسەرمدا بوو، هەستم کرد لەناو گەردەلولەکەدا زایع بووم و تێکەڵی بووم.

دەنگی نەبوو، کش و مات بوو، بەڵام پڕ بوو لە دەهشەت و ترس بۆ دڵی من.

ئێستاکە دەیگێڕمەوە هەست بە ترسێکی زۆر دەکەم.

ماوەیەکیش دوای گەشتەکەم ترسەکەی لە دڵمدا مابوویەوە، هەست دەکەم ئێستاش ترسەکەم لێی ماوە.

دوای ئەوەی گەردەلولەکە زۆر نزیك بوویەوە لە من دیمەنەکە گۆڕا، وەك ئەوەی منی بۆ شوێنێکی تر بردبێت.

لە ناوچەیەکی سەوزی بەرین و خۆشدا خۆم بینیەوە، شێوە و قامەتی گەورەم بینی، کەسانێکی زۆر جیاوازم بینی، ترسناك بوون، هەڵهاتم لێیان، هەتا گەشتمە شوێنێکی سپی ڕووناکەوە، نەمدەزانی من لە کوێم! دەمویست بپرسم کە من لە کوێم، چۆن هاتم، چی دەکەم لەم شوێنە، ئەمە چ حاڵەتێکە منی لە خۆ گرتووە، لەم کاتەدا گوێم لە دەنگێك بوو، بەناوی خۆمەوە بانگی لێ کردم و وتی: مەشڵەژێ و مەترسە.

دەنگەکە زیاتر لێم نزیك بوویەوە، دەبینم نەنکمە.

نەنکم ماوەیەك بوو وەفاتی کردبوو، تووشی حەپەسان بووم، دەمزانی مردووە.

وتی: مەترسە من لێرەم، باپیریشت لێرەیە، تەنها نیت.

جارێکی تر گێژەڵۆکەکە هاتەوە، هەمدیسان بە تەواوی لێم نزیك بوویەوە، ترس دایگرتمەوە، دەنگێکی ترم بیست، دەیوت: نەخێر لەو شوێنەوە لێی وەرمەگرە، ورد بوومەوە لە دەنگەکە هەتا بزانم چیە و، باسی چی دەکات؟

باسی منیان دەکرد، بەڵام گوێم لەو دەنگە بوو، لە هەمان کاتیشدا گەردەلولەکە بە ڕاسەرمەوە بوو، دەترسام، چونکە دوو شوێنم گۆڕی بوو، دەمزانی کە بۆ شوێنێکی ترم دەبەن، نەمدەزانی کە ئایا وەکو شوێنی یەکەمم ترسناك بوو، یان وەکو دووهەم کە نەنکمم بینی و خۆش بوو، لەگەڵ ئەو دەنگانەدا ڕۆشتمە شوێنێکی تر.

من ژن و پیاوێکم بینی، کە سەدریەیەی شینیان لەبەردا بوو، لەلای چرپایەك وەستابوون، نەمزانی کێ لەسەر چرپاکە بوو پرسیارم لە خۆم دەکرد، کێیە لەسەر ئەو قەرەوێڵە و چرپایە ڕاکشاوە، ئەوان لە بەردەمم ڕاوەستابوون و پشتیان لە من بوو، یەکێکیان نەیدەهێڵا ببینم.

یەکێکیان وتی: شەکرەی دابەزیوە، کلۆکۆزی بدەنێ، گوێم لێ بوو لەگەڵ یەکتر دەدوان، سەرم لەوە سوڕ مابوو کە چارەسەری یەکێ دەکەن و نەخۆشەکەم لێ دیار نیە.

یەکێك گرتبوومی و نەیدەهێلا بچم سەیری ئەو کەسە بکەم کە لەسەر قەرەوێڵەکە کەوتبوو، من لەو حاڵەتەیا بووم، جارێکی تر چوومەوە بۆ ناوچە سپیەکە.

هەر چەندێ دەچوومە پێشەوە، شتێکی ئەوتۆم بۆ دەرنەدەکەوت، ئەو ناوە یەکپارچە سپی بوو.

لە پێشمەوە خەڵکانێکی زۆرم بینی، لە حاڵی سوژدەیا بوون، پۆشاك و بەرگیان یەکپارچە سپی بوو، زۆر پاك و جوان بوون هەڵدەستان و لە دوایدا سوژدەیان دەبردەوە، پەرش و بڵاو نەبوون، زۆر بە تەرتیب و ڕێك و پێك بوون، کە من سەیرم دەکردن، بینیم یەکێکیان هەستا و لەناو ئەو کۆمەڵە هاتە دەرەوە و هات بۆ لای من، بە ناوی خۆمەوە بانگی لێ کردم.

نزیك بوویەوە لە من، بەڵام دەمو چاویم نەبینی، دەمزانی کێیە. دەستی درێژ کرد بۆ من، هەستم کرد لەسەر چرپایەکم وەکو چرپاکانی نەخۆشخانە. نەمدەزانی ئەو لە کوێیە.

ئەو دەستی درێژ کرد، ویستم دەستی بگرم بەڵام نەمتوانی، من وا هەستم کرد کە ئەو دەستی درێژ کرد، بۆ ئەوە بێت داوای کۆمەکی لە من بکات، یان بیەوێت من ببات بۆ شوێنێکی تر، بەڵام دور کەوتەوە و دەستم بە دەستی نەدەگەیشت، لەو شوێنە بووم، جارێکی تر گەردەلولەکە هاتەوە، زیاتر لە جارەکانی تر شین باو بوو، هەچ کاتێك باسی ئەو گەردەلولە دەکەم حاڵم دەگۆڕێت، ترسێکی زۆر دامدەگرێت.

لە هەندێ شوێندا باش بوو، وەك ئەو شوێنەی کە نەنکمم تیا بینی.

ئەم جارەیان گەردەلولەکە زۆر بەهێزتر و نزیکتر بوو لە من، جارێکی تر ڕایکێشامەوە بۆ ناو خۆی، ڕۆشتمە ناوچەیەکی تر، ئەو ناوچەیە یەکپارچە ڕەش بوو، وەك ئەوەی بمخاتە زیندانی خۆیەوە، لەو ناوچە ڕەشاییەوە بردمی بۆ ناوچەیەکی سەوزایی، وەك ئەوەی لەناو پەڵە گەنم و خەرمانێکی جواندا بم، لە سەرەتادا ترسام، باشە ئەمە بۆ کوێ دەچم، ئەم حاڵەتە چیە بەسەر مندا دێت!!

جارێکی تر ئەو ئافرەتەم بینیەوە، بە هەمان وەسف و شێوە بینیمەوە لەناو پەڵە گەنمەکەدا بوو، جارێکی تر بە ناوی خۆمەوە بانگی لێ کردم و وتی: وەرە، منیش بەرەو رووی ڕۆشتم، هەرچیم کرد پێی نەگەیشتم، من بە دوایدا ڕۆشتم هەتا گەیشتینە شوێنێك پڕ بوو لە گیا و دار و درەختی زۆر جوان.

ئیتر لە کوت و پڕێکدا ئەو ئافرەتەم لێ ون بوو، من بە دوایدا دەگەڕام، گەیشتمە شوێنێك کە زۆر جوان بوو، هەستم بە پشوویەکی دەروونی گەورە کرد، هەستم کرد ترسەکەم کەم دەبوویەوە و نەدەما.

ئەوە بوو گەیشتمە ڕووبارێك کە لەناو درەختەکاندا گوزەری دەکرد، وتم: یاسای ئەم شوێنە زۆر جوان و دڵ ڕفێنە.

کوێیە و من لە کوێم!!

شوێنێکی زۆر هێمن و جوان بوو، باڵدارەکان بە جۆرەها ئاواز دەیانخوێند.

من زۆر لە خۆم دەکەم کاتێك باسی شوێنە ترسناکەکانی دەکەم، ئێستاش ئەوەندە ئازاراوی و ترسناکە تووشی بێ قەراریم دەکات، دەبوو لەو شوێنە دەرچم و جارێکی تریش بچمەوە ناو گەردەلولە ترسناکەکە.

هەستم بە تینوێتی کرد، لە ئاوی ڕووبارەکەم خواردەوە زۆر شیرین و خۆش بوو، بەڵام هەستم نەکرد کە دەستم بەو ئاوە تەڕ ببێت، خۆمم لە ئاوەکەدا دەبینییەوە.

لەو شوێنە دەرچووم و دیسانەوە گەردەلولەکە هاتەوە بۆم.

کەشەکە یەکپارچە ڕەش بوو، کەسم نەدەبینی، ئاواتم دەخواست کە جارێکی تر بگەڕێمەوە بۆ سەر ڕووبارەکە و ئاو بخۆمەوە، گوێم لە دەنگە دەنگ بوو، بەڵام کەسم نەبینی، هەتا ئەوە بوو دوو ئافرەتم لە پێش دەمم بینیەوە، من ترسم زۆر بوو، هەتا ئەوە بوو یەکێکیان وتی: دکتۆر... دکتۆر... وەرە فەرهاد چاوەکانی کردەوە.

هاوڕێکەم وتی: چی بوو، چی ڕوویدا؟

هیچم پێ نەوت.

پزیشکەکەم هات و، خۆی پێ ناساندم و وتی پێم بڵێ: چی ڕوویدا، بۆم باسبکە، لەبەر ئەوەی تۆ بیست و هەشت ڕۆژە لە بێ هۆشی دایت و هیچ ئاگات لە دونیا نەبووە.

دوو نەخۆشخانەت گۆڕیوە، لە یەکەمدا بە هیچ جۆرێك هۆشت نەهاتوەتەوە و حاڵت خراپتر بووە، باوکم دوایی پێی وتم کە داوایان لێ کردوە ئەندامەکانی جەستەم بکات بە خێر و هیچ ئومێدێکیان پێم نەماوە، باوکم ڕازی نەبوو بوو.

بەردەوام بووبوون لەسەر چارەسەرم، ئیتر حاڵم بەرەو باشی ڕۆشتبوو.

من بە براکەمم وت: ئەو دەمارەی کە لە قاچم دەریانهێنا زۆر ئازاری پێ گەیاندم.

وتی: کەی و چۆن؟

وتم: دوو پەرستاری کچ بوون کە هاتن، یەکێکیان بۆ ئەوەی چارەسەرم لە دەمارەکەوە پێ بدەن، زۆر ئازاری دام، چونکە دەمارم دیار نەمابوو.

براکەم تۆزێك بێ دەنگ بوو، لە دوایدا وتی: باشە تۆ لەو کاتەدا بێ هۆش بوویت و، هیچ ئاگایەکت لە دونیا نەبوو، چۆن ئەمەت زانی؟

تۆ لە ژێر ئامێری هەناسەدانی دەستکردا بوویت و هیچ ئاگایەکت لە خۆت نەبوو، چونکە تۆ بیست ڕۆژی تەواو بە ئامێری هەناسەدانی کارەبایی هەناسەت داوە.

ئەو ئافرەتەش کە دەهات و ڕزگاری دەکردم، فریشتە نەجات بوو، لەو شێوەیەدا دەمبینی، من ئاوای دەبینم.



# ژیان بەخششی خوایە



'لەیلا جەلیلیان' ئەزموونەکەی بەم جۆرە دەگێڕێتەوە و دەڵێت: هەر لە منداڵیمەوە دەمناڵاند بە دەستی نەخۆشیەوە، لە زانکۆ بووم دەستم بە دیوارەوە دەگرت هەتا بڕۆم، دوو ڕۆژ سێ ڕۆژ لە جێگەدا مامەوە و نەشم دەزانی هۆکار چی‌یە.

پزیشکەکان دەیانوت ئەگەر نەشتەرگەری فەقەراتت بۆ بکەین حاڵت خراپتر دەبێت، لەبەر ئەوە بەرگەی ئەم حاڵەتە بگریت باشترە بۆ تۆ.

دەیانوت بەڵکو چارەسەر و توانا پزیشکیەکان زیاتر پێش بکەوێت و چارەسەر بکرێیت.

حاڵم وابوو لە کاتی خەودا، یاخود جوڵەیا ئازارەکەم بۆ دەهات، زۆربەی کات بە ئازارەوە دەبووم، جارێکیان لە پڕێکدا هەستم کرد زۆر سوکەڵە بووم و هیچ ئازارێکم نەما. زۆر زیاتر لە کەسێك کە بە جەستەیەکی سوکەڵەوە جووڵە دەکات، من زیاتر سوکەڵە بووم، هەر وەکو ئەوەی بارستاییەکی سوکەڵە بم بە دەم شەپۆلەوە بڕۆم بەبێ هیچ زەحمەتێك بوو.

وەك بڵقێکی ئاو بە ئاسانی سەر دەکەوتم.

وا دەزانم (٣٠ - ٤٠) مەترێك بەرز بوومەوە و زۆر خۆش و بێ کێشە بووم، ئاگایم زۆر بەرفراوان بوو، بینیم زۆر فراوان بوو، لە یەك کاتدا لە ماڵی باوکم بە ئاگا بووم و چیاکانی دەوری ماڵی باوکیشم هەموویم بە تەواوی دەبینی کە لە لادێ بوون، شەوێکی تاریك بوو، بەڵام تاریکی ڕێگر نەبوو لە بینینم، هیچێك نەبوو لە دیدگای من ون ببێت.

چێژم لە توانای بینینم دەبینی، هەرگیز لە ژیاندا بینینێك ئا بەو جۆرە بەرفراوان بۆ ڕۆژ دەستەبەر نابێت.

ئەو چیایانە هەرگیز بەو جۆرە بە جوانی و وردی و درشتی نەمبینیـوە، لە کاتێکیشـدا شەو بوو تاریك بوو!

دەمزانی جەستە نیم، بەڵام بەلاشمەوە سەیر بوو ئەمە چ توانەیەکە من بەدی دەکەم.

تۆ بڵێی ئەمە من بم.

هەر ئەوەندەی وتم: ئەی باشە جەستەم لە کوێیە؟

چاوم چوویە سەر جەستەم و سەر سەقفەکە، هیچ بەربەستێك نەبوو لە پێش بینینـی مندا.

خۆم بینی دەمم و چاوم نیوە کراوە بـوون، کەسـم لەلا نەبـوو، لەسـەر قەرەوێـڵەکە کەوتبوومە خوارەوە، جەستەی خۆمم لە هەموو لایەکەوە دەبینی، وام دەزانی جەسـتەم کراسێکی کۆنە و فڕێم داوە، دەنگێك لە ناخمدا بانگی لێ کردم وازی لـێ بێـنە، لەمەو دوا بۆ تۆ نابێت. زۆر ئـازارم لەو جەسـتەیەدا چەشـتبوو، هەسـتم دەکـرد کە لەمەو دوا هی من نیە.

دەمزانـی کە بـاوکم و دایکـم و خۆشەویسـتانم، ئامـادەن لە مـاڵەکەدا بەڵام هـیچ پەیوەندیەکم پێیانەوە نەبوو.

دەمزانی کە من لە حاڵەتێکی تری جـۆرە ژیـانێکی تـردام. نەك وەکـو جـاران، بەڵام زۆر دڵنیا بووم و هیچ گرنگ نەبوو بە لامەوە کە دونیام بەجێ هێڵاوە.

هیچ ترسێکم لە مردن نیە، من یەکێك لە خۆشەویستانم کۆچی دوایی کردوە، بیـری دەکەم، بەڵام دڵنیام لەوەی ماوەیەکی تر پێیان دەگەمەوە.

لە حاڵی تەسلیم بوونی تەواودا بـووم بەو ڕاگـوزاریە، وام دەزانـی مـن لەوەو پـێش پەرش و بڵاو بووم و ئێستا کۆ کراومەتەوە، بەڵام نەمدەزانی چـۆن کـۆ کـراومەتەوە، لە دوایدا گوێم لە دەنگێك بـوو وەکـو هەورە بروسـکە بـوو، لە مـاوەیەکی زۆر کەمـتر لە چرکەیەکدا کۆ کرامەوە و بە تیژ ڕەویەکی زۆر بەرەو سەرەوە سەر خرام.

ئیتر دڵنیا بووم لەوەی کە مردووم.

هەستم دەکرد ویست و بژاردەیەکم نەماوە، ئازادی ئەوەم هەبوو بۆ بینینی هەر چیەك، دڵنیا بووم کە لە ژیاندا نەماوم. لەوەو پێش لە جەستەی مردوو، لە کفن دەترسام، زۆر دەترسام، بەڵام ئێستا بە لوتفی خوا مردوو دەشۆم.

لە دوایدا برامە شوێنێك، کە وەك وێستگەیەك بوو، وەك ئەوەی ئامادە بکرێم، نەمدەزانی چیم بەسەر دێت. شوێنەکە نە سپی بوو نە ڕەش، شکڵێکی نەبوو.

وەك ڕەحمی دایك شوێنێکی ئەمین بوو، هیچ ترسێکم نەبوو، وام دەبینی لە زۆر زووەوە لەوێ بووم.

وەك ئەوەبوو ئامادە بکرێم بۆ قۆناغی داهاتوو. بێ دەنگیەکی چێژدار هەبوو، دەنگێك کە هەیبەتێکی هەبوو پێی وتم: با بڕۆین بۆ شوێنێك.

هەموو ژیانم پیشان درایەوە، لە هەندێ وێستگەی ژیانمدا وەستام، ئەو دەستانەش کاریگەری نەبوو لەسەر خێرایی و تێپەڕینی ژیانم.

دەچوومە ناو وردەکاریەکانی ژیانمەوە، لە دونیا کە دڵت تەنگ دەبێت، بە هەندێ گریان و فرمێسك ڕشتن دڵت ئۆقرە دەگرێت و پشوو دەدەیت، بەڵام لەوێ حاڵێکە نازانم چۆن وەسفی بکەم.

لەوێ هەستێکی زۆر زیندوت هەیە، ڕۆحانیەتێکی باڵات هەیە، کاتێك دیمەنێکی خراپی ژیانی خۆمم دەبینیەوە شەرمەزار دەبووم، تەریق بوونەوەی ئەوێ هەموو بونت دەگرێتەوە، ژیانم وەکو دەفتەرێکی گەورە کرایەوە. زۆر پەشیمان بووم لە بەفیڕۆدانی کاتەکانم. لە گوناهەکانم، زۆر شەرمم لە خۆم دەکرد، نەدەبوو بەو جۆرە ژیانی دونیام بەسەر ببەم، لە حەسرەت و پەشیمانیدا دەکوڵام، بەبێ کۆتا خەجاڵەتیم دەکێشا.

به هەزاران ساڵ سزا دەبینی 'بۆ گوناهێك'، جۆرێکی سزای ئاسان ئەوەیە دەبیتە بەرد، سەیری جوڵەی تەواوی دروستکراوەکان دەکەیت، لە مرۆڤ و ئاژەڵ و جانەوەری گەورە و بچوك، بەبێ لێ تێك چوون و خەوتن.

ئەم جۆرە مانەوەیە زۆر ئازار بەخش بوو، چونکە سەختە بۆ مرۆڤێك، مرۆڤ بوون ببینێت و ببێتە بەرد بۆ ماوەیەك کە بڕیاری لەسەر دەدرێت!!

دوای تەواو بوونی ئەو جۆرە سزایە، هاتن و پێیان وتم: کەسێك بووەتە شەفاعەتکاری تۆ هەتا ڕزگارت بێت.

زۆر زۆر دڵم خۆش بوو.

بەڵام ئایا ئەو کەسەی بووەتە شەفاعەتکارم کێیە؟!

چ مەردێکی مەزنە، چ کەسێکی جیهانی بەرزەخە.

وتیان: ئەو کەسە پێی وتوین کە ناوەکەیت پێ نەڵێین.

وتم: من ژیانم پڕیەتی لە هەڵە و بێ ئاگایی و گوناه، چ کەسێکی ئەوەندە بە ڕەحمە شەفاعەتم بۆ دەکات.

تەنها ئەوەندەیان پێ وتم: ئەو مەردە گەورەیە بە پلە و مەقامی شەهادەت 'شەهید'ی لە دونیا دەرچووە.

لە دوایدا بووم بە تۆپەڵەیەکی نورانی و، وەك ئەوەی لە دەمی دەمانچەیەکەوە دەربچم، بە خێراییەکی زۆر گەڕامەوە ناو جەستەکەم، بەڵام بە ئازارەوە گەیشتمەوە جەستەم.

زۆربەی ئەوەی لە ئەزموونەکەمدا بینیم بیرم چوویەوە.

ئەوەی بینیم ناوی مردن بوو، بەڵام لە ڕاستیدا زیندوێتی بوو، تا دوو مانگ دوای گەڕانەوەم قسەم بۆ نەدەکرا.

دە ساڵ تێپەڕیوە بەسەر ئەزموونەکەمدا و، هیچ ئازارێکی فەقەراتم نەماوە.

تەنها لە بێ توێشویی دەترسم، نەك خودی مردن. ژیان کاروان سەرایەکە و، هەمـوو چرکەیەك فەیزی ئیلاهی تیا بەدەست دێنین.

## دوای ئەزموونەکەم، زۆر باش بووم بۆ خێزانم

أبو القاسم 'زهیری هاشم ئابادي' ئەزمـوونەکەی دەگێـڕێتەوە و دەڵێـت: لە مـانگی یەنـــایەری ســـاڵی (٢٠١٦)ی زایینـــی، ڕۆشـــتم بـــۆ ســـوریا، لەگەڵ هەنـــدێك لە هاوڕێکانمدا، هەتا بەرگری لە سەیدە 'زینب' بکەین 'ڕەحمەتی خوای لێ بێت'.

ڕۆژێکیان دەمەو ئێوارە بوو، ڕایانسپاردین بە ئەرکێـك، لەگەڵ چەنـد هەنگاوەرێـك دەرچووین، من شـۆفێریم دەکـرد، لەگەڵ دوانـی تـردا بـووم، بەڕێـوە بـووین، هێشـتا سەعاتێکی مابوو بۆ بانگی ئێوارە.

تەنها (٢٠٠) مەترێکمان مابوو بگەیـنە ئەو بـنکەیەی کە کارمـان پێـی هەبـوو، هەر ئەوەنـــدەمان زانـــی، ڕۆکێـــت بـــوو یـــاخود تـــۆپ و هـــاوەن، لە لایەن داعشـــەکانەوە ئاراستەمان کرا و پێکراین.

سەیارەکە چوو بە ئاسماندا و لە دەست دەرچوو، لەبەر ئەوەی پارچەکان بەر تـایەی سەیارەکە کەوتن، سەیارەکە کەوتە سەر زەوی و وەستایەوە.

پارچە لە جام و دەرگاکـانەوە دابـارین بەسـەرماندا، پـارچەم زۆر بەرکەوتبـوو، ئەو پارچانەی لە پشتی منەوە دەرچـوون دابـووی لە شـەهید 'مهـدی صـاغیان'، سەریشـم بەرکەوت، بەڵام برینداریەکەی زۆر نەبوو، ئیتر هەر لەوێـدا مەهـدی صـاغیان شـەهید بوو.

من ویستم قاچ بنێم بە ئیستۆپدا، کەچی دەبینم قـاچم توانـای جـوڵەی نـیە. تەنهـا پێنج خولەکێك ئاگام لە خۆم بوو، ئەو مـاوە کـورتە خەم و پەژارە دایگـرتم، بیـرم لای ئەوە بوو، هەموو تەمەنم بە شەلەل و داماوی بەسەر دەبەم، هێشتا جەسـتەم گەرم بـوو، ئاگام لە خۆم بوو، دەمزانی چی لە دەوروبەرەکەمدا دەگوزەرێت.

هەرچەندە سەیارەکەمان بەهۆی تەقینی تایەکانیەوە وەسـتا بـوویەوە، بەڵام جەسـتەم کەوت بەسەر دەرگاکەدا، ئەو شـەهیدەش کەوت بەلای منـدا، لەو کـاتەدا گـوێمان لە چەند عێراقیەك بوو، کە لە هەمان بەرەی جەنگ بوون خێـرا بە سـەیارەکەیان هـاتن بـۆ لای ئێمە، ویستیان من دابگرن، مـن بـانگی کەسـی سـێهەمم کـرد کە مـوحەمەد بـوو زیندوو بوو، دەگریا، چونکە زانی کە مەهدی شەهید بووە، منیش لە سەرە مەرگدام!

عێراقیەکان ئێمەیان خستە ناو توێتاکەی خۆیانەوە و، من شایەتومانم دەهێنا و ئاگام لە خۆم نەما.

لە نەخۆشخانە سێ جار ڕۆحم جەستەمی بەجێ هێڵا.

جارێکیان لە نیوە شەودا بوو، منیان بە ئیسعاف دەبرد بـۆ نەخۆشـخانە، زۆر کـورت خایەن بوو، خۆم بینی لە دوای ئیسعافەکەوە دەفڕیم.

جارێکیشیان لە نیوەی ڕێگای نەخۆشخانە، بە ڕۆح ئاگام لە بەشێکی بوو.

جـارێکی تـر کە ئەزمـوونەکەم زۆر سـەخت بـوو، بـۆ کەسـانێکی دیـاری کـراوم گێڕاوەتەوە، لە سەرەتادا بۆ خێزانیشـم نەگێـڕایەوە، هەتـا بە هەڵە لـێم حـاڵی نەبـن، لە جەستەم هاتمە دەرەوە، کەوتمە ناو سزا و ئازارێکی زۆرەوە، شتێکم بینـی کە جەسـتەم بوو، بەڵام ڕۆحم بۆ سزا بـرا، مـن عـادەتم وابـوو لە دوای هەمـوو نـوێژێکی فەرز، بە تایبەتی کە لە مزگەوت بوومایە قورئانم دەخوێند، کاتێك سزایان دەدام و هاوارم دەکـرد فریام بکەون!

وازم لێ بێنن، کەسێك نەبوو ڕزگارم بکات.

دەستم بە هیچ کەسێك نەدەگەیشت.

دەموت: ئاخر من زۆر قورئانم دەخوێند، بۆچی ئاوام لێ دەکەن، ڕەحمێکم پێ بکەن؟!

کە بەو جۆرەم دەوت نیو مەترێك دور دەکەوتنەوە لێم. زۆر ترسناك بوون، من بینیمن، شێوەیان وەك مرۆڤ بوو، بەڵام زۆر ترسناك، دەست و قاچیان زۆر گەورە بوو، وەختێ دەمەوێت وێنایان بکەم و وەسفیان بکەم ناتوانم.

سزایەکی زۆر سەختیان دەدام، خەریك بوو دەخنکام و دەیانویست بمخنکێنن، بەبێ ئەوەی بمرم!

کە باسی ئەوەم دەکرد من قورئان خوێن بووم، دایکم و باوکم لە بەردەممدا پەیدا بوون، قورئان شەفاعەتی بۆ دەکردم. باوکم دەیویست هەر چۆنێك بێت لە دەستیان ڕزگارم بکات، بەڵام نەیدەتوانی، بەڵام کە دایکم دەهات وازیان لێ دەهێنام.

دە مەترێك دور دەکەوتنەوە لێم و وازیان لێ دەهێنام.

چەندین جار بەم جۆرە بوو.

دوعای دایك و باوك پارێزگاریمان لێ دەکات لە دونیا و قیامەتدا.

کە گەڕامەوە بۆ دونیا، وتم: ئەو کاتەی من بێ حاڵ بووم، دایکم چی دەکرد؟

وتیان: دایکت هەموو ڕەمەزان "من هەموو مانگی ڕەمەزان لە نەخۆشخانە مامەوە" دایکم بەردەوام نان و خواردنی کردبوو بە خێر و، گریا بوو، داوای لە خەڵك کردبوو کە دوعای خێرت بۆ بکەن.

دڵنیام دوعا و خێرەکانی دایکم بوو بە هۆکاری دور کەوتنەوەی ئەوان لە سزادانی من.

ئەوان بەردەوام سزای منیان دەدا، نەشمتوانی چاوەکانم دابخەم هەتا نەیانبینم، هیچ شتێك سودی نەبوو، هەرچیت بکردایە سوودی نەبوو دەتبینین.

ویستم هەڵبێم، هیچ سوودێکی نەبوو، دەتوت لە بـۆریەکی تەسـکدام، نە ئەوەبـوو بمرم، نە ئەوەبوو بژیم،

بەردەوام وەك حاڵەتی کەسێك بووم کە بخنکێت!!

دەیانزانی بە چ شتێك دەترسیت بەوە سزایان دەدایت.

دکتۆ' سـام' شـاهیدی ئەوەیە کە مـن دە خـولەك دڵـم لە کـار وەسـتاوە و بە کارەبـا گەڕاومەتەوە، خەریـك بـوو وەك تەرمێـك بمنێـرنەوە بـۆ ئێـران، بەڵام جـارێکی تـر گەڕاومەتەوە بۆ ژیان.

من کە لە جەستەی خۆم دەرچوبـووم، دکتـۆر سـامرم دەبینـی کە عەرەب بـوو، لە گۆشەیەکی هۆڵی نەشتەرگەریەکە بوو، وە من بێ هۆش بووم.

دکتۆر سامرم بینی چوو بۆ لای ئەبو عەلـی، بە ڕۆح کەوتمە دوای ئـارەقی دەکـرد و بێ تاقەت بوو، پەرداخێك ئاوی تێ کـرد و خـواردیەوە، مـن پـێش ئەوەی بـێ هـۆش بکەوم داوای ئـاوم دەکـرد و زۆرم تینـوو بـوو، بەڵام وەختـێ بینـیم دکتـۆر سـامر ئـاو دەخواتەوە، هیچ هەستی تینوێتیم نەبوو!

دەگەڕام بە نەخۆشخانەکەدا، کەسێك بێ هۆش بـووایە دەمزانـی کێشـەی چیـیە وە بۆچی بەو جۆرەی بەسەرهاتووە.

وەختێکم زانی چوومە دەرەوەی نەخۆشخانەکە، وەك ئەوەی یەکێك لە پشتەوە منـی گرتبێـت، ئەو کەسـە قسـەی لەگەڵ دەکـردم، مانـای پـێ دەگەیانـدم، دەشـتێکی زۆر فراوانی پڕ لە گوڵ و گوڵزارم بینی، درەخـت و جـوانی زۆر سەرسـوڕهێنەری تیـابوو، جۆرەها پەپولەی جـوانی لـێ بـوو، ئەوەی کە زۆربـاش بیـرم دەکەوێـتەوە ئەوەبـوو کە فریشتەکە پێی وتم: ئەو شوێنەی بۆی دەچین 'زهراء'ی کچت لەوێ نیە!

گوڵەکانی ئەوێ لەسەر شـێوەی دەسـت و پەنـجەدا بـوون، سـپی بـوون، زۆر زۆر گەڕام و گەشتم کـرد، کاتێـك منیـان گێـڕایەوە، لە هەمـان سـەقف و شـوێنەوە منیـان گێڕایەوە.

دوای ئەزموونەکەم زۆر گۆڕاوم، دڵم بە خەڵکی دەسوتێ، ڕەحم و بەزەیم زۆر زۆر بووە، تەنانەت بووەتە ڕەخنە لەسەرم. کێشەی خەڵکی دور دەبێتە خەمم و، خەفەتی پێ دەخۆم. زۆر بە باشی گۆڕاوم، بە تایبەتی لەگەڵ خێزانەکەم.

## قەیتان بەستنی پێڵاوی دونیای خۆمم بینیەوە



'موحەمەد قوبادی' ئەزموونەکەی باس دەکات و دەڵێت: ساڵی (٢٠٠٢) بوو، گەشتم کرد بۆ شاری ئەرومیە، ویستم بگەڕێمەوە بۆ ئەصفەهان، باوکم وتی کە تۆ دەڕۆیت و منیش لەگەڵت دێم.

ڕۆیشتینە تەرمیناڵ، لە بەشی دووەمی پاسێکدا سەرکەوتین، باوکم وتی: ئەم دەرگایە زوو زوو دەکەنەوە و دایدەخەن، زۆریش سارد بوو، با بچین لە بەشی سێ و چوار دانیشین کەمتر ساردە، چوینە ئەوێ، جانتایەکی دبلۆماسیم پێ بوو، وتم: بابە: تۆ بڵێی ئەم جانتایە بکەوێت بەسەرماندا.

باوکم وتی: مەگەر وەربگەڕێت!!

پاصەکە پێنج سەعات ڕێی کرد، لە ئەرومیەوە و کوردستانەوە ڕۆشتین و گەیشتینە شیوی دیوان و بیجاڕ، سەعات دووی شەو بوو، من لە خۆمم پرسی کە بۆچی شۆفێرەکە نەگۆڕا، لە دەرەوەش هەورە بروسکە و باران و بەفر دەباری، ئیمکانیەتی بینینی شیو و دۆڵەکە نەبوو، هات بە خەیاڵمدا، ئەگەر ئەم پاصە بکەوێتە ئەم شیوەوە بەچی خۆمان بگرینەوە هەتا کەمتر زیان ببینین.

وتم: ئەگەر مرۆڤ دەست بە توندی بگرێت بە کورسیەکەی بەردەمیەوە، ئەوە زیانی گەورەی بەرناکەوێت، بیرم لەوە دەکردەوە و چاوەکانم داخست، لە کوت و پڕێکدا گوێم لە هاواری شۆفێرەکە بوو، یەکێك هاواری کرد، پێ بە ئیستۆپدا نەنێیت

دەکەوینە شیوەکەوە، پاسەکە لایدا و دواکەی دابەزی بۆ ناو شیوەکە، پاسەکە جۆری کۆنەکان بوو، جامی سەیارەکە یەکپارچە بوون، شوشەکەی کەوت بەسەر باوکمدا و پاسەکە کەوت بە لایەکی گلەکەدا، باوکم کەوتبووە دەرەوەی پاصەکە و خەریك بوو پاصەکە دەکەوت بە سەریدا.

'باوکی دەڵێت': وتم تەواو هەموو شت تەواو بوو، گوێم لە شکانی جامەکان بوو، لە کۆی شانزە سەرنشین سێ کەس بە سەلامەتی دەرچوون.

لە پاسەکەدا بووم وەختێ کەوتە خوارەوە، بەڵام تێبینی ئەوەم کرد، من پاصەکە لە دەرەوە دەبینم، پاسەکە وەرگەڕا و بە تەپاو تل کەوتە چاڵەکە، ڕۆحم لە سەرەوە بوو، جەستەشم بە ڕاست و چەپدا ئەمدیو و ئەودیوی دەکرد لە خوارەوە، دایکێك لەگەڵ منالەکەی لە پێشمانەوە دانیشتبوو، کە پاسەکە وەرگەڕا و کەوتە خوارەوە، ئەو ئافرەتەم بینی توند باوەشی کردبوو بە منالەکەیدا، خوای گەورە منالەکەی بە سەلامەتی هێلایەوە، بەڵام دایکەکە پشتی شکابوو، بەهۆی پەستان و کەوتنی زۆرەوە.

ئەو دایکە خەمی منالەکەی بوو، خۆی لەبیر کردبوو، دەستی بە کورسیەکەی پشتەوە نەگرتبوو.

من لە سەرەوە دەمبینی کە لە پاسەکەدا چی ڕووی دەدا، ئیتر لەو کاتەدا هەموو ژیانی خۆمم لە منالیەوە هەتا هەموویم بینیەوە.

دایکی دەڵێت: وەختێ تەمەنی یانزە مانگان بوو، لە ماڵی 'ئیحترام خانم' بووین و لە فلان کۆلان بوون.

وتم: کورم تۆ زۆر منال بوویت، چۆن بیرت ماوە. وتی: دایکە لە فلان کۆلان بووین و بە قادرمەکانیاندا سەرکەوتین و ئاوا و ئاوا ڕووی دا. سەرم سوڕما.

دایکم دەبینی خەریکی چێشت بوو لەماڵەوە، پیازی پـاك دەکـرد، ئەو ئـافرەتەی کە حەزم دەکرد بیخوازم، ئەو چۆن بیری دەکردەوە، دایکم تەعزێ باری من بوو، گـوێم لە نزای دایکم بوو کە دەیوت، خودایە ئەم کوڕەمان نەمرێت و جەرگ سوتاو نەبێت.

گوێم لە باوکم بوو، کە لە دۆڵەکەدا بوو، لەناو پاسەکەدا مابوو، نەمرد بوو، هـاواری بۆ من دەکرد و دەیوت... موحەمەد... موحەمەد لە یەك کاتدا بە ئاسـانی بە چـوار لادا ئاگادار بووم، لە پاسەکە، خۆم، داهاتوو، تەعزیە و ماڵی بـاوکم، ڕووداوەکـانی ژیـانی ڕابردووم.

لەو کـاتەدا پێیـان وتـم: کاتـت نەهـاتوە، دەگەڕێیـتەوە بـۆ نـاو جەسـتەکەت. ئیـتر گەڕامەوە و تەواوی ئازارەکانی دونیاش لەگەڵ ڕۆحم گەڕایەوە ناو جەستەم.

ئەوەی بینیم، نازانم چۆن بیگێڕمەوە، وەك پانکەیەکی ژینەرەوە بوو 'مـنعش' کە زۆر فێنك بێت و، پرت بکات لە ژیان و ژیـانەوە و فێنکیەکـی هەرگیـز نەبیـنراو بە ڕۆحـت بگەیەنێت، مۆسیقایەکی هێمن و لەسەرخۆ بگاتە تۆ و، ئارامیەکی زۆر گەورە و نـاوازە بێنێتە ژیانتەوە، ئا لێرەوە بۆ ئەو ئەزموونەم بڕوانن.

کە گوێم لە دایکم بوو دەیوت: خودایە جەرگ بڕا و دڵ سوتاوم مەکە.

هەرگیز بۆ چرکە ساتێکیش ویست و ئارەزووی گەڕانەوەی دونیام نەبوو.

هەرگیز هـیچ ئەسـەفێك بەقەد ئەوە گەورە نـیە لە ژیانمـدا، کە بـۆچی گەڕامەوە بـۆ دونیا، لەو جیهانە پڕ لە نیعمەتە بێ شومارە دور کەوتمەوە، بازنە نـورانیەکە زۆر شـادی هێنەر بوو، کاتێ ڕووە و ئاسمان سـەرکەوتم، نەڕەهەنـدی کـات هەبـوو، نەڕەهەنـدی شوێن هەبوو.

من لەوە و پێش مرۆڤێکـی سـەرکەش و ئاکـار خـراپ بـووم، بەڵام دوای ئەوە زۆر عاطفی و بەسۆز بووم، چرکە بە چرکەی ژیانم بوو بە وانە و پەند بۆ من.

وازم لە خۆ بە گەورە زانی و سەرکەشی هێنا، هێشتا ئەو نەریتە خراپانەم بە تەواوی نەڕۆشتون.

که داهاتوم بینی، دایکم لە پرسەکەیدا دەیوت... موحەمەد... موحەمەد...

زۆر بەزەیم بە دایکمدا دەهاتەوە، من لە تونەیلە نورانیەکەدا بووم.

ئەوەی من بینیم بەو جۆرەیە کە کاتێك فڕۆکەیەك دەکەوێتە خوارەوە، پیاکدادانی دوو سەیارە ڕوودەدات، بێ ئازار ڕۆحیان دەردەچێت، خێرا دەکەونە فەزایەکی زۆر جوان و نورانیەوە، لەگەڵ شنەیەکی پڕ لە ژیانەوە و، ئاوازێکی ناسك و ئاوازێکی خۆشی هێنەر سەر دەکەویت.

من نەمزانی کە ئایا ئەو نورە نوری خوایی بوو، یاخود هی فریشتە بوو، یان ڕووناکی پێشوازی بەهەشتیانە بوو پێم دەگەیشت.

هەر چیەك بێت زۆر زۆر بێ وێنەیە، زۆر شیرینە، بەڵام من وای دەبینم کە داپۆشراون بە ڕەحمەتی خوا و، گەیشتن بەو مەقامە بەرزە، لەو نور و ڕووناکیە شیرینترە.

بە واتای ئەوەی کە ڕەحمەتی خوا زۆر زۆر فراوانە، ئەو نورەش لە ڕەحمەتی خواییە کە وەسف ناکرێت، چونکە ئێمە لە ڕەحمەتی خوا ئاگادار نین و هەرچیش بزانین زۆر زۆر کەمە.

ڕەحم و ڕەحمەتی ئیلاهی بێ کۆتاییە و، ئەو زاتە ڕەحمان و ڕەحیمە.

هەژدە ساڵ بەسەر ئەزموونەکەمدا تێپەڕیوە، هەمویم بیر ماوە، وادەزانم خوای گەورە منی خۆش ویست کە من ئەو ئەزموونەم بینی.

من تەواوی وردەکاریەکانی ژیانی خۆمم بینیەوە لە (٨ :١٠) خولەکدا، کە هەرگیز شیکاری مرۆڤ ناتوانێت پێی بگات.

تەنانەت قەیتان بەستنی پێڵاوەکانم بینیەوە، چەند جـار ئەنجـامم دابێـت هەمـوویم بینیەوە!!

شەرمەزاری بینینی گوناهی خۆت دەبیت، زۆر زۆر شەرمەزاریە.

کاتێ کردەوەیەکی باشی خۆشت پیشان دەدرێتەوە، دڵخۆش دەبیـت، سـەرت بەرز دەکەیتەوە، دڵخۆشیەك کە وەسف ناکرێت.

## دوعای دایکێك بۆ گەڕانەوەی کوڕەکەی



'حەمید ئەسەدی' ئەزموونی نزیکبوونەوە لە مردنی بینی و بەم جۆرە دەیگێڕێتەوە.

دەڵێت: ساڵی (٢٠٠٧) بوو، ڕۆژێکیان خێزانم برد بـۆ مـاڵی دایکـی، پـێش ئەوەی من ببم بە زاوایان باوك و دوو برای خێزانم کۆچی دواییان کردبـوو، گەیشـتمە ڕێگـای خێرای شەهید 'بەهەشت' لە 'بوشوریە'، من ماتۆڕێکم پێ بوو، کە خێزانەکەم گەیانـد، خۆم گەڕامەوە شەقامی شـەهید بەهەشـتی و سـەیارەیەکی شـاحنەی گەورە لە دورەوە هات، ڕووە و من دەهات، سایەقی شاحینەکە دوایـی وتـی: تـۆ وەسـتایت و سـەیری منت دەکرد، هەر چەندە هۆڕینم لێ دا، تۆ نەجوڵایت، سـەیری منـت دەکـرد، ویسـتم لێت نەدەم، خۆم لادا، بەڵام فارغۆنی سەیارەکەم لە دەست دەرچـوو، مـاتۆڕەکەی مـن تەنها کورسی و خەزانی بەنزینەکەی مابوویەوە، هیچی نەمایەوە.

منیـان بردبـوو بـۆ نەخۆشـخانەی شـارەکەی خـۆم، لەبەر کەمـی ئیمکـانیەتی ئەو نەخۆشـخانەیە، منیـان بـرد بـۆ نەخۆشـخانەی 'دکتـۆر جەمـران'، کە سـەد و بیسـت کیلۆمەتر لە شاری ئێمەوە دور بوو.

دایکم هەواڵەکە دەبیستێت، کە دایکم (١٥ - ٢٠) ساڵ دەبوو تووشی شەلەل بوو بوو، بە عەرەبانە دەڕوات.

باوکم و دایکم و خوشکەکەم و زاواکەمان 'مێردی خوشکەکەم' تەکسیەکیان گرتبوو، هاتبوون بۆ نەخۆشخانەکە، دایکم دەڵێت: کە گەیشتمە نەخۆشخانەکە تۆم بینی بە گوازەرەوە داخڵی سەیارەی ئیسعافەکەیان کردی.

دایکم دەڵێت: تکام کرد و داوام لێ کردن کە لەگەڵ تۆ سەرم بخەن، هاتنیشی چیرۆکێکی تری هەیە، کە دەبوو بە ئیسعافەکە بێت.

دایکم دەڵێت: من لەسەرخۆ و بە هێمنی دانیشتبووم، دەستم بە ستونی ڕایەڵی ئیسعافەکەوە گرتبوو، سەیری تۆم دەکرد، فرمێسکم دەڕشت.

دایکی دەڵێت: دەستم لە قاچەکانی کوڕەکەم دا، زۆر سارد بوو، ئاوی موغەزیەکەش دەهاتە خوارەوە بۆ ناو جەستەی.

لەو کاتەی دایکم دەستی لەسەر جەستەم دانابوو، جەستەم سارد بوویەوە، هەمان هەستم هەبوو، کاتێ دەستم لە کوڕە پورەکەت دا، کە بە ڕووداوێك کۆچی دوایی کرد، دەڵێت بیرم لەوە دەکردەوە، پەرستارەکەش گومانی بۆ دروست بوو، سەماعەی خستە سەر سنگی و شتێکی بە پزیشکەکەی وت، پزیشکەکە هات و دەرگای دواوەی ئیسعافەکەی کردەوە و، لەو کاتەدا یادی ئیمام ڕەزا هات بە بیرما کە دوعایەکمان بۆ بکات...

باوکم و خوشکەکەم و مێردی خوشکەکەم بە تەکسیەك لە دوای ئیسعافەکەوە بوون، دەڵێت: کە ئیسعافەکە ڕاوەستا، ئێمەش ڕاوەستاین، دکتۆرەکە وتبووی تەبەلە و وەرەقەی نەخۆشەکەم بیر چووە با بگەڕێینەوە، وتوبیان: وەرەقە و تەبەلە لە پێشی ئیسعافەکەدایە.

دکتۆرەکە وتبوی: جەماعەت، خۆتان خۆش بن، نەخۆشەکەمان مردووە و تەواو بووە، با بگەڕێینەوە.

خوشکەکەم دەڵێت: هەر ئەوەندەی پزیشکەکە بەو جۆرەی وت، باوکم خۆڵی دەکرد بە سەری خۆیدا و، هاواری دەکرد کوڕەکەم مرد...

دایکی دەڵێت: خۆم دا بەسەر کوڕەکەمدا و وتم: ئەی خوایە گیان کوڕەکەم لە تۆ دەوێتەوە.

من لەو کاتەدا 'جەستەکەم' لەسەر نەقالەکە کەوتبووم.

دایکم دەڵێت: کاتێك کەوتیت، دەنگێك لە تیوبی ناو قورگتەوە هات، دکتۆرەکە تۆی خستەوە سەر نەقالەکە.

ئینجا وتی: بێ دەنگ بن، خوای گەورە فریای کەوت گێڕایەوە.

هاوڕێیەکم وتی: کاتێك دایکت لە ئیسعافەکەدا بوو هاواری بۆ خوا برد، خوای گەورە بەزەیی پیایا هاتەوە و بەخشیەوە پێتان.

کە منیان برد بۆ نەخۆشخانەی 'ئیمام ڕەزا' لە شاری 'بیر جند' منیان لە 'ICU' دانابوو.

ئەوەی کە بیرم دەکەوێتەوە ئەوەیە کە من لەسەر چرپایەك ڕاکشابووم.

ڕۆحم سەرکەوت و لە نزیکی قاچمەوە ڕاوەستا و، سەیری جەستەم دەکرد کە ڕاکشابوو.

سەیری خۆمم دەکرد و دەمپرسی، ئەوە من چی دەکەم لە نەخۆشخانە!!

'باندجێکی' سپی بەسەرمەوە بەسترابوو، پۆشاك و چەرچەفی سەوزیان بۆ دانابووم، ئین جی تیوبێك لە لوتمدا بوو، مۆنیتەرێك لە لای چەپم بوو، کۆمەڵێ وایەرم بینی کە بە سنگمەوە نوسێنرابوو، کە لەسەر شاشەکە حاڵەتی دڵی منی دەخوێندەوە.

لەو کاتەی سەیری جەستەی خۆمم دەکرد، پەنجەرەیەك لەسەر ژورەکەم هەبوو، ڕووناکی و نورێك سەرنجی ڕاکێشام، لە پەنجەرەکەوە زۆر بە ئاسانی ڕۆشتمە دەرەوە، هیچ شتێك ڕێگر نەبوو بۆ من.

خۆم لە حەوشی نەخۆشخانەکەدا بینیەوە، دوای ئەوە لە تونەیلەکە بووم، تاریك بوو، ڕووناکیەك لە کۆتایی تونەیلەکەدا بوو، بۆ من لە ژیانی سی و پێنج ساڵی تەمەنمدا ئەو ئازار و ناهەمواریەم نەچەشتووە کە لەو تونەیلەدا چەشتم، دەنگێك پێی دەوتم کە دەبێت خۆت بگەیەنیتە ئەو نورە گەورەیە. ڕێگر هەبوو، دەکەوتم. لە دوایدا هەڵدەستامەوە... هەر چەندێك دەڕۆشتم ئەو دورتر دیار بوو، هەموو شتێك نور و ڕووناکی بوو، نورێکی سپی، سپی بە ڕەنگی تێری ئەوێ.

هەستی سوپاس گوزاریم هەبوو، کە لە کۆتایدا گەیشتم بە نور و ڕزگاربوون.

کە گەیشتمە ناو نورەکە، خۆم لە بەردەم دەرگای مزگەوتی 'صاحب الزمان' بینیەوە لە شارەکەی خۆمان.

دەرگاکە کراوە بوو، وزە یەك کەمەند کێشی دەکردم، بۆ چوونە ناو مزگەوتەکە، ڕۆشتمە ناو مزگەوتەکە، لە لای ڕاست یەکێك لە براکانی خێزانمی لێ بوو، لە تەنیشتی باوکی خێزانم بوو، من ئەوانم لە ژیانمدا نەبینی بوو، پێش ئەوەی خێزانم بهێنم ئەوان کۆچی دواییان کردبوو، لەوەو پێش نەمبینی بوون، لە لای چەپ برایەکی تری خێزانم بوو، کە ئەویش مردبو کردبوو، لە تەنیشتی کوڕە پورەکەم بوو، هەموویان دەستیان لەسەر سنگیان بوو بە مەبەستی ڕێز و ئیحتیرام. باوکی خێزانم ڕووخۆش و دەم بە خەندە بوو، ئێستا وێنەی پێکەنینەکەی لە هەست و بیرمدا هەڵکۆڵراوە.

ئەوەنە هات بە بیرمدا کە باوکی خێزانم مردوە و بۆچی لەوێ دەیبینم!

پەنجەرەکان هەندێکیان ڕووناکی سەوز بوون، هەندێك زەرد و، هەندێکیش سپی.

بەڵام نورە سەوزەکە زۆر پڕ و تیشك زۆر بوو.

کوڕە پورەکەم وتی: فەرموو وەرە ژورەوە، هەتا ئێستاش ئەو دەنگەی دەزرنگێتەوە لە گوێمدا، واش دەزانم هەتا کۆتایی تەمەنم لە گوێمدا دەزرنگێتەوە.

لەناو مزگەوتەکە پیرە مێردێکم بینی، بینی بووم، کە لە ژیانیدا بوو پیاوێکی ئەسمەر بوو.

بەڵام کاتێك هاتە بەردەمم، بینیم کە ئەو پیرە پیاوەی دونیا، لێرە زۆر گەنج و جوان بوو، زۆر نورانی بوو، وەستا بوو سەرقاڵی نورانیەتی خۆی بوو، چی شتێك وای لەم پیاوە کردوە؟

من سەرقاڵی سەیر کردنی بووم، دەستی خستە سەر شانی چەپم، ڕووی وەچەرخاندم بۆ ئەو شوێنەی لێوەی هاتبووم.

وتی: بڕۆ.

کە وتی بڕۆ بە گۆچانەکەی دەستی لێی دام و کێشای بە پشتم و پشتی سەرمدا.

هەر ئێستا کە دەست دەدەم لە سەرم، هەست بە ئازار دەکەم، بەبێ ئومێدانە گەڕامەوە، سەرم داخست، بۆچی ڕێی پێ نەدام بچمە ژورەوە و بمێنمەوە!

ئەگەر یەکێك پێی بڵێن دەمریت، ئەبێ چۆن دونیای بەسەردا بروخێت.

وەختێ بە منیان وت بگەڕێرەوە بۆ دونیا زۆر زیاتر بێ ئومێد و نارەحەت بووم!

کە هەست و هۆشم بۆ گەڕایەوە، شەوی جومعە بوو، ئەوە بوو گەڕامەوە بۆ دونیا.



## ئەزموونی دوای کەوتنە خوارەوەم

  

'ڕەزا ئێران شاهی' دەڵێت: 'ئەزموونی یەکەم' ساڵی (١٩٨٧) بوو، تەمەنم ٨ ساڵان بوو، یاری تۆپی پێم دەکرد، تۆپەکە لەسەر دیوارەکە وەستایەوە، هەوڵم دا دایبگرم، لە کوت و پڕێکدا دونیا لە پێش چاوانم ڕەش بوو، بینیم جەستەم کەوتووە و بێ دەنگم، سێ بۆ چوار مەترێك لە سەرووی جەستەمەوە بووم، کەم کەم زیاتر سەردەکەوتم، هەتا زۆر بەرز بوومەوە و هەموو شوێنێکم دەبینی، بینین بە چاوی دونیایی زۆر جیاوازە لە بینینی ئەوێ.

پشتی دیوارەکەم زۆر بە ئاسانی دەبینی.

کە زۆر بەرز بوومەوە خاڵێکی نورانیم بینی، دەترسام بکەومە خوارەوە، بە شێوەی حەلەزۆنی بوو، حەلقەی نورانی بوو دەسوڕایەوە، من کێشی ئەوێ کرام.

دوای ئەوە کێشی جەستە کرامەوە و گەڕێنرامەوە.

کە چاوم کردەوە دونیا ڕۆشن بووبوویەوە و نیوەڕۆ بوو، زانیم کات زۆری نەبردووە، بەڵام گەشتەکە لەوێ زۆر تولانی بوو.

ئەو کاتە گێڕامەوە بۆ دایکم و باوکم، تووڕە بوون لێم و، سەریان سوڕما لە وتەکەم، زەحمەتە بۆ کەسێك خۆی ئەزموونەکەی نەبینی بێت و بە تەواوی لێی تێ بگات!

کەس و کارم خەمباری جەستەم بوون، بەڵام لە نەخۆشخانە پزیشکەکە سەری سوڕما لەوەی کە من لەسەر دیوارەکە کەوتبوومە خوارەوە و کەوتبوومە سەر شۆستەکە و تووشی شکان یاخود خوێن بەربوونی ناوەوە نەبووبووم، تەنها چاوم هەندێ زیانی پێ گەیشتبوو.

# ئەزموونی دووەمی 'ڕەزا ئێران شاهی'



زستانی ساڵی (٢٠٠٦)ی زایینی بوو، سەفەرێکم هاتە پێش کە بۆ کار و خوێندنیش بوو، لە یەکێك لە دەوڵەتەکانی کەنداوی عەرەبی.

ویستم لە یەکێك لە زانکۆکانیان بخوێنم و لە هەمان کاتیشدا کار بکەم.

ڕۆژێکی خۆرەتاو بوو، هاوڕێیەکم بە سەفەرەکەی زانیبووم، وتی: خۆم دەتگەیەنمە فڕۆکەخانە.

وتم: تەکسیم گرتووە، زۆر پێداگری کرد لەوەی کە خۆی دێت بە شوێنمدا، گەشتەکەی من بە شەو بوو، عەسر هات بە شوێنمدا، کەش و هەوا وەکو نیوەڕۆ نەمایەوە، بوو بە هەور و تەم و مژ، باران و هەورە بروسکە دەستی پێ کرد.

هەردوکیشمان یەکەم جارمان بوو بچین بۆ فڕۆکە خانەی ئیمام خومەینی، ڕێگاکەمان بە باشی نەدەزانی، دوو جار بوو یان سێ جار ڕێگەی چوونە ناوەوەمان لێ تێك چوو.

بەهۆی بارینی بەفرەوە، تابلۆ مرۆیەکان داپۆشرابوون، ڕێگاکەمان لێ ون بوو.

سێهەم جار پرسیارمان لە خێرۆ مەندێ کرد، ڕێگاکەی پیشان داین، بینین تا ئەندازێك شلۆق بوو بوو.

کە ڕۆشتین وتم هەست بە شتێکی نا ئاسایی ناکەیت، ڕۆشنایی لایتی سەیارە بەرەو ڕومان دەهات.

وتی: بەڵێ ڕاست دەکەیت، کە نزیك بوویەوە، سەیارەیەکی شەحنی سەیارە ڕێگاکەی لێ تێك چوو بوو، بە ناوەڕاستی ڕێگاکەدا هاتبوو، زانی هەڵەی کردوە بەڵام نەیتوانی کۆنترۆڵی سەیارەکە بکات و سوڕایەوە، شوێنی من بە تەواوی کەوتە ژێر

شاحنەکە، پێش ئەوەی پێکداداان ڕوو بدات بە چەند چرکەیەك، من لە جەستەی خۆم چوومە دەرەوە.

خاوەنی شاحنەکە و شۆفێرەکەی من و خەڵکێکی زۆر کۆبوونەوە لە ڕووداوەکە، من لە سەرەوە دەمبینی.

سەیر ئەوە بوو کە خێرا من ڕوودانی پێکدادانەکەم بینی، بەبێ ئەوەی هەست بە ئازار، یاخود سەرما، یان ترس و بیم بکەم.

ترسێکم هەبوو کە ئۆتۆمبیلەکە هی باوکی هاوڕێیەکم بوو بە ئەمانەت هێنابووی، ئەوەش وەك 'مافی خەڵکی' لێی دەترسام.

گوێم لێ بوو خەڵکی هاواریان دەکرد، یارمەتیان بدەن.

بەڵام من نەمدەزانی یارمەتی کێ دەدەن لە کاتێکدا من زۆر باشم و هیچم نیە، دەمویست یارمەتیەك پێشکەش بکەم، یان بڵێم پێیان کە هیچ نیە و قوربانی تیا نیە!

بەڵام بینیم کە کەس گوێی لە من نیە و ناتوانم وەك ئەوان بدوێم.

ئیتر دوای ئەوە ڕۆحم دابڕا و، دەستی کرد بە سەرکەوتن بۆ سەرەوە. هەستم کرد دوای ئەوەی هەندێ بەرز بوومەوە، شوێنی ڕووداوەکەم دەبینی کە خەڵکی هەوڵیان دەدا جەستەم لەناو ئۆتۆمبیلە تێك شکاوەکەدا دەربێنن.

کاتێ دەگەڕێینەوە جەستە، هەست دەکەین بەرگێکی قورینی قورسی پڕ لە هەژاری و زۆر لە داواکاری دەکەینە بەرمان... بەڵام جارێکی تر پۆشیمان، وەك ئەمەیە تۆ بە شێوەیەکی سروشتی ڕێ دەکەیت و لە کوت و پڕێکدا کۆڵێکی سەد کیلۆیی دەخەنە سەر شان و ملت.

'موحەمەد واحدی' ئەزموونەکەی بەم جۆرە دەگێڕێتەوە: لە ساڵی ١٩٨٨دا بوو ئەم ئەزموونەم بینی، لە پڕتاوترین کاتەکانی جەنگ و دابارینی گولە تۆپ و هاوەن و ئاربیجی و موشکەکانی سوپای سەدام بەسەرماندا، بەیانی بوو، ڕۆژی یەکەمی جەنگی 'بیت المقدس ٧' بوو، لە شەلامچە، لە کەناری باکوری دەریاچەی ماسی، لە نێوان سەعات (٩ - ١٠)ی بەیانی بوو.

باوەڕمان بەوە هەبوو کە ئەگەر ڕۆژت تەواو نەبوبێت ئاربیجی و تۆپەکان ناتمرێنن!

هەستمان بە قوڵایی ئەو باوەڕە دەکرد، دەتوانن ناوی لێ بنێن عیرفان، یان نەترسان لە مردن، یان مەعرفە و بڕوای تەواوی بە قەزاو قەدەر و خوازیاری شەهیدبون و عاشقی شەهید بوون لە ڕێی خودا و پیرۆزیەکانی ئیسلامدا.

کە دەچووینە بەرەکانی جەنگ، من لە هەموویان کەمتر گیانی قوربانیم تیا بوو، هەرگیز من وەکو ئەو پاڵەوانانە نەبووم کە بینیمن، من هاوڕێ و سەرکردە و ئەفسەرەکانی خۆمانم دەبینی لە ناوەڕاستی ویزەی گولە و هاژەی تۆپ و قریشکەی تەقینەوەکاندا بوون و وەك کێو لە ناوەڕاستی ئەو ئاگر بارانەدا وەستابوون و دەچوونە پێش و هیچ ترسێکیان نەبوو.

لە نێوان سەعات (٩ - ١٠)ی بەیانی بوو، من و دوان لە هاوڕێکانم، کە یەکێکیان ئێستا بەناوبانگە بە مەهدەوی، ئێمە لە یەکێك لە چاڵ و پەناگەکانی سوپای عێراقیدا دانیشتبووین، کە ئێمە دەستمان بەسەرا گرتبوون، پاکسازی ئەو ناوەمان کردبوو، لە حاڵەتی هێمنی و ئارامیدا بووین، دوای ئەوە سوپای عێراق لە سێ لاوە تۆپ بارانی کردین.

لە پەناگەیەکدا دامەزراین و ماینەوە، جوڵەمان زۆر کەم بوو، جانتایەکی دەستی لە ساتری ئەوبەرەوە بوو، وتم بە هاوڕێکانم: ئایە ئەو جانتایە دەبینن؟!

سەریان دەرهێنا و وتیان: بەڵێ دەیبینین!

وتیان: کێ دەچێت بیهێنێت؟

وتم: من دەچم.

هەر ئەوەندەی دەرچووم و قاچم چووە سەر چاڵە گڵێنەکە و هەنگاوی سێهەمم نا کەوتمە سەر زەویەکە.

دەست بەجێ هەستم کرد لە ئاسمانم و جەستەی خۆم دەبینم لە بەرزی (٦٠ - ٧٠) مەتر بەرزیەوە دەمڕوانی بۆ جەستەم، سەرم سوڕما لەوەی من چی دەکەم لەم ئاسمانەوە، ئەی ئەوە کێیە لە خوارەوە کەوتوە!

لە چرکە ساتێکدا هەستم بە کرانەوەی بینایم کرد، بێ دەنگیەکی تەواوەتی بوو لە چواردەورم، لە دوری شەست مەترەوە هەستم کرد لە سەرەوە شتێك هات.

کە گولە تۆپێک بوو، زۆر بە هێواشی هات، دەرک کردن بە هاتنی، بە پێوانەی دونیایی نەبوو!! هەستم کرد ئەو گولە تۆپە زۆر بە ئاڕاستەی جەستەی من دەهات، واتە منێک کە پێشتر من بووم، لە خوارەوە بووم!

لەو کاتەدا دەنگێکی مەلەکویتم گوێ لێ بوو، بەڵام دەنگ نەبوو بۆ گوێیەک کە بیبیستی، لە هەموو لایەکەوە ئەو دەنگە دەهات، دەنگ دەتوانی بەرزی بکەیتەوە، دەتوانیت دایبەزێنیت.

پێی وتم: دەتوانی بییت لەگەڵمان!

پێش ئەوەی وەڵامی ئەو پرسیارە بدەمەوە، وە پێش ئەوەش بیر لە وەڵامی بکەمەوە، لە چرکە ساتێکدا وەک ئەوەی پەردەیەک لابدرێت لە بەردەمم ئیتر تەرکیزم چوویە سەر ئەو دیمەنە، ئیتر تەنها سەرقاڵی ئەوە بووم و گوێم لە جەستەم و چوار دەورم نەما.

ئەو دیمەنە و دوای ئەو پەردەیە زۆر قوڵ بوو، دەمتوانی لە قوڵایی ماهیەتدا شت ببینم، تێ گەیشتم کە دەیانەوێت هەموو ژیانم پیشان بدەنەوە و بیبینم.

یەکەم دیمەن بینیم، کە وەک فلمێک پیشانم درا، دوای تەمەنی باڵغ بوونم بوو، تێ گەیەنرام، یەکەم کارێک کە حیسابی هەیە و لێپرسینەوەت لەگەڵ دەکرێت لە باڵغ بوونەوەیە، ئیتر من بە کردەوەکانم حوکم لەسەر خۆم دەدەم، دەبوو ئەوە شی بکەمەوە کە بۆچی ئەو کارەم کردووە و، بۆچی ئەوەی ترم نەکردوە!

شیکردنەوەی ئەویش لای ئەوان زانراو بوو!

خۆم موحاسەبەی نەفسی خۆم دەکرد، هەروەها لە هەمان کاتیشدا بە ناونیشانی بینەر لەوێ بووم!

لە هەمووشیاندا مونصف بووم و ملە جیڕێم نەبوو.

هەموو ئەو کردەوانەی لێپرسینەوەم لەگەڵ کرا لەسەری، هەمووی کردەوەی خراپ بوون!

گەیشتمە ئەو دەرەنجامەی کە 'مافی خەڵکی' هەڵسەنگاندنێکی زۆر وردی لەگەڵدا دەکرێت.

گەیشتمە حاڵەتێک کە داوا لە خوای گەورە بکەم و بپارێمەوە مۆڵەتم بدات و بگەڕێمەوە هەتا ناتەواویەکانم چاک بکەمەوە، مافەکان بدەمەوە.

ئیلهامێکم پێ دەگەیشت، کە ئەو گولە تۆپەی بە ئاسمانەوە دەهاتە خوارەوە بۆمن دەهات، ئەگەر بگەیشتایەتە ئامانجی خۆی ئەوە ژیانم بە تەواوی کۆتای دەهات و دەمردم.

هەموو ئەم ڕوداوانە لە کەمتر لە چرکەیەکدا ڕوویان دا پێش مردنم.

دەپاڕامەوە خودایە هەلێکم پێ بدە هەتا بگەڕێمەوە بۆ دونیا و خراپەکانم چاک بکەمەوە.

دەنگێک هات، دەنـگ نەبـوو، بیسـتم، لە هەمـوو لایەکەوە بیسـتم، وەک ئەوەی لە سـتۆدیۆیەکدا سـەدان بڵنـدگۆی گەورە هەبێـت و هیچیـان دەنگـی لەوی تـر بەرزتـر نەبێت.

بەیەک تۆن و دەنگ و ئاستی بەرز، ئەو دەنگەم لە بونی خۆمدا دەبیست.

زۆر ڕوون و ئاشکرابوو، نازانم ئەو دەنگە کێ بوو!

کە پێی وتم: مۆڵەت درایت.

ئیتر دوای ئەوەی پێم وتـرا مـۆڵەت درایـت، هـیچ پرسـیارێکیان دەربـارەی هیچـی کردەوەکانم لێ نەکردم.

تەنها ئەوەندەیان وت: بیگێڕنەوە!

لەو چرکەیەدا کە وایان پێ وتم: دڵنیـابووم کە مـن بەم ڕووداوە هـیچم لـێ نـایەت، ئەو گولە تۆپەی کە بە پێی زانینی من بەرەو ڕووی من دەهات، بینـیم گۆشـەی هـاتنی گۆڕا، چرکە بە چرکە هاتنی ئەو گولە تۆپە و جەستەی برینداری خـۆم لەسـەر زەویەکە دەزانی و دەمتوانی لەو بەرزیەوە تەقدیری هاتنی بکەم!

دەمزانی ئەو گولە تۆپە لە کوێوە هاوێژراوە، دەمزانی لە چ وڵاتێک دروسـت کـراوە، لەو کاتەدا دڵم دەسوتا بۆ ئەو کەسەی گولە تۆپەکەی دەهاویشت.

کە فەرمـــان کـــرا بە گەڕانەوەم، زۆر بە خێرایـــی گەڕێـــنرامەوە، خێراتـــر لەوەی کە بپێورێت، کە گەیشتمەوە ناو جەستەم هەموو ڕووداوەکانم بیر چوویەوە.

ڕۆشتن و مەساری خۆم بۆ گەیشتن بە جانتاکە تێک نەدا، ئەو جانتایەی کە سـەربازە عێراقیەکان بە جێیان هێڵابوو. واتە بەردەوام بووم لە ڕاکردن بۆ جانتـاکە، هەڵـم گرتـوو گەڕامەوە چاڵ و پەناگەکەی خۆم.

جانتاکەم کردەوە، تۆپەکەش لە پشتی ساترەکانەوە دای لە زەوی.

هەردوکمان گەڕاینەوە بۆ زەوی، من بۆ پەناگەکەم "جەستەی خۆم"، تۆپەکەش بۆ شوێنێکی تر کە زیانی بۆ من نەبوو!

بەڵام هەموویم بیر چوویەوە، جانتاکەم کردەوە بزانم چی تێدایە، پۆشاکێکی سەربازی عێراقی تێدابوو، بێریەکی سەوزی تیابوو کە تایبەت بوو بە هێزە تایبەتەکانی 'قواة الخاصة'ی عێراق، بێجگە لەوە هیچی تری تێدا نەبوو، لەبەر ئەوەش بووە سەربازە عێراقیەکە گرنگ نەبووە بەلایەوە و فڕێی داوە.

دوای ئەوە تۆپێکی تر لە زەوی داو، بەداخەوە پارچەکانی ڕوە و لای چاڵ و حەشارگەکەی ئێمە هات.

هاوڕێی عەزیزم 'میر بلوج' بریندار بوو، مەهدەویش پارچەیەک لە ڕانی داو، ڕانی قرتاند، هەرسێکمان بریندار بووین، بەهۆی سەرقاڵیم بەو دوانەی ترەوە و فریاکەوتنیان ئەو ڕووداوەم بیرچوویەوە.

ڕۆژی دووەم فەرمانمان پێ گەیشت کە پاشەشە بکەین و کشاینەوە.

لە ناوچەی شەلامچە پشومان دا، عەسری ڕۆژی داهاتوو بوو، لە نزیکی ساترە گڵینەکە دانیشتبوین، من و هاوڕێکانم عادەتمان وابوو، هەموو ڕۆژێک لەو کاتەدا قورئانمان دەخوێند، من قورئانەکەی خۆمم هەڵگرتوو، لەسەر تەپۆلەکە گڵینەکە دانیشتم، سەیری غورووبی خۆرم دەکرد و قورئانیشم دەخوێند، هەر ئەوەندەی دەستم کرد بە خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز، لە کوت و پڕێکدا وەک یەکێک بە گوێمدا بیچڕێنێت، پێی وتم: ڕووداوەکەی دوێنێت بیر دەکەوێتەوە.

هەروەکو ئەوەی لە خەو بەخەبەرم بێنێت، من قورئانەکەم دەخوێند و ڕووداوەکانی پشتی جەستەمم بیر دەهاتەوە، دوێنێ بە چرکەساتێك بیرم برایەوە و ئێستا بە چرکە ساتێک بیرم خرایەوە.

لە چرکەیەکدا ژیان کرایەوە بە یادگەمدا و بیرم کەوتەوە.

هەموو ئەوەی بەسەرم هات، هاتەوە یادم و، لۆمەی نەفسی خۆمم کرد، کە بۆچی من خێرا بێئاگا بووم لێی.

بۆچی من لە ژیانمدا ئەو هەمووە هەڵەیەم کردوە، من داوام لە خوای باڵادەست بمگێڕێتەوە بۆ دونیا هەتا ئەوەی خراپم کردوە چاکی بکەمەوە، حەقی خەڵکی بدەمەوە!

قورئان خوێندنەکەم تەواوکرد و گەڕامەوە شوێنەکەی خۆم، دڵم پڕ بوو، گەڕامەوە بۆلای ئەو بێریە سەوزەی دوێنێ کە ئێستا لە ژوورەکە هەڵمواسی بوو، قسەم لەگەڵ بێریەکەدا دەکرد و پێم دەوت:

تۆ شاهیدی ئەوە بوویت کە دوێنێ ڕووی دا، ئەوەی بەسەرم هات.

هەتا ئێستاش پاراستومە، بۆ ئەوەیە بیرم نەچێتەوە، هەر چەندێک دڵتەنگ ببم دەیهێنم و باسی خەمەکانی خۆمی لەلا دەکەم!

بیری ئەو چەند چرکە زیندوانەی ژیانم دەکەمەوە کە زۆر زۆری ئەو دونیابوون و زۆریان فێرکردم.

من لە مردن ناترسم، لە چارەنوسی کردارەکانم دەترسم، لە شوێنەواره قوڵەکانی ڕەفتار و ئاکاری خراپم دەترسم، مەرگ گواستنەوەیە لە جیهانێکی بچووک بۆ جیهانێکی زۆر زۆر فراوان.

لەو ئەزموونەدا بۆم دەرکەوت کە دونیا ستۆدیۆیەکە وێنەی تیا دەگیرێت، ئێمەی مرۆڤیش بیرچوونەوەیە وێرانمان دەکات، ئەو کردارانەمان بیر دەچێتەوە کە کردومانە، لە دوا ڕۆژیشدا پیشانی خۆمان و خەڵکی تریش دەدرێتەوە.

بەهۆی بیرچوونەوە و بێ ئاگاییەوە گوناهم وەکو جارانە و، زۆریش جێگەی مەترسیە.

من ئەوێم بینی، حسابم بینی، بەڵام لە بیری دەکەم، زۆر پەشیمانم کە لە بیری دەکەم.

ئەم ئەزموونە لە ڕۆح و گیانمدا هەڵگیراوە و بیرناچێتەوە، ئەگەر لە یادەوەری جەستە و مێشکدا بوایە بیر دەچوویەوە، بەڵام ڕۆح ئەزموونێ ببینێ، چەندەی مۆڵەتی بیر کەوتنەوەی بدرێت بیرناچێتەوە.

من کە هاتمەوە جەستەم، هەموویم بیر برایەوە، بۆ ڕۆژی دواتر هەموویم بیر هێنرایەوە، هەتا ئێستا و هەتا ئەو کاتەی خوای گەورە ویستی لەسەرە بیرم ناچێتەوە.

## دورگەی 'کیش'



شەهنازی ئەنصاری، خەڵکی دورگەی 'کیش'ە لە ئێران، ئەزموونەکەی بەم جۆرە دەگێڕێتەوە بۆمان کە دەڵێت: من کوڕێکی گەنجی جوانم لەدەستدا، هەستم بەبێ ئومێدی دەکرد لە نیوە دورگەی 'کیش' و بێ هیوا بووم.

من کێشەم هەبوو، کێ منداڵەکانم بەخێو بکات، ئەوە بوو کچەکانم لە خەم ڕەخسین، کچەکانم شویان کرد.

من بەتەنها مامەوە، کارم دەکرد و ژیانی خۆم بەڕێوە دەبرد، بەڵام دوای مردنی کوڕەکەم، ژیان بۆ من زۆر قورس و گران بوو، باری دەروونیم زۆر خراپ بوو، هەستم دەکرد کە خەریکە بخنکێم، چەند جارێک سەردانی نەخۆشخانەم کرد، هەندێک داو و دەرمانم وەرگرت و گەڕامەوە ماڵەوە، کێشەی دڵ و، کێشەی دەروونیشم هەبوو.

شەوێکیان درەنگانێک گەڕامەوە بۆ ماڵەوە، لەسەر کارەکەم زۆر ماندوو دەبووم، نزیک کاژێر یەکی شەو بوو،ئیش و کار لەم دورگەی ئێمە هەتا درەنگانێکی شەو بەردەوام دەبێت، کە گەڕامەوە ماڵەوە هەستم کرد ناتوانم هەناسە بدەم، حەبی ژێرزمانم بەکارهێنا، دوای ئەوە خەوتم، بۆ من شەوێکی قورس و زەحمەت بوو، شەوی دواتریش هەمان حاڵەتم بەسەرهات و نەچووم بۆ نەخۆشخانە.

دوای ئەوە بە سێ ڕۆژ، ژنێکی هاوڕێم هات بۆلام، بە دراوسسێیەکم وت: ئەگەر گڵۆپی شوقەکەم داگیرسابوو لە نیوەشەودا، بزانە حاڵم باش نیە وفریام بکەوە، ئەویش وەک ئەوەی بزانێت ڕەوشێکی خراپ ڕووی لێ دەنێت، شەوێکیان لە دوای سەعات یەکی شەو گەڕامەوە، هەستم کرد کە بە هیچ جۆرێک هەناسەم بۆ نادرێت، هەوڵم دەدا لە چێشتخانەکە بێمە دەرەوە و بچم بۆ ژوورەکەی خۆم، دەستم گرت بە دیوارەکانەوە و زۆر بە زەحمەت ڕێم کرد، نەمتوانی بگەمە ژوری نوستنەکەم و لەوێدا دانیشتم، دەسکی تەلەفۆنەکەم هەڵگرت، ژمارەی دراوسێکەمانم لێ داو وتم: فریام بکەوە، ئیتر ئاگام لە خۆم نەما، ئەوەش لەساڵی (٢٠٠٥)ی زاینی دابوو.

کە چاوم کردەوە لە نەخۆشخانە بووم، نەوبەی سێهەمی دڵم ترسناک بوو کە لێی دابووم، لەبەر ئەوە بوو داخل بووم لە نەخۆشخانە، نەمدەزانی ئەو حاڵەتەم چەندەی پێ چووە و، چۆن ڕووی داوە؟!

بەڵام لە چرکە ساتێکدا خۆم لە سەقفی نەخۆشخانەکەدا بینیەوە، پۆشاکێکی سپی درێژم لەبەردا بوو، پۆشاکەکان زۆر جوان بوون، ئەو نەخۆشخانەیەی کە من تیایدا کەوتبووم و ئەوەش کە من لە سەرەوە بینیم زۆر جیاواز بوون لەیەکتر.

ئەم نەخۆشخانەیەی 'کیش' پزیشکی تایبەتمەندی کەمی لێیە، لە تارانەوە بە نۆبە دێنە ئێرە.

له دوایـدا پێیـان وتمەوە کە پەیوەنـدیان کـردوە بە پزیشـکێکی پسـپۆڕەوە، کە لەوەو پێش لە سەفەربووە و لەوێ نەبووە، سەرپەرشتی منی دەکـرد لە نەخۆشـخانە، مـن ئەو پزیشکەم نەبینی، چونکە بێ هۆش بووم.

بەڵام من خۆم لە سەروی نەخۆشخانەکەوە بینی یەوە، زۆر فراوانتر و پێشکەوتو تـر هاتە پێش چاوانم.

من خەڵکێکم بە پۆشاك و بەرگی سپی یەوە دەبینی.

دوای ئەوە کوت و پڕ هاتمە ناو گۆڕەپانی نەخۆشـخانەکەوە، نەوەی خـۆمم بینـی، لە کاتێکدا هێشتا من نەوەم نەبوو، چونکە ئەو نەخۆشیەم لە ساڵی (٢٠٠٥)دا بوو.

من لە دوای (٢٠٠٧)ەوە نەوەم هەبوو.

مناڵێکی نەوەی خۆمم بینی کە تەمەنی (٣-٤)ساڵان بوو، یاری دەکـرد لەگەڵ مـن لە گۆڕەپانی نەخۆشخانەکە.

پێی دەوتم: نەنە دەمەوێت گوڵێک لێ بکەمەوە.

پێم وت: کارێکی باش ناکەیت، چونکە گوڵیش وەکو ئـێمە ڕۆح لەبەرە، سـەیربکە کاتێک من دەستی تۆ دەگوشم ئازارت پێ دەگات، ئەو گوڵەش بەهەمان شێوە ئـازاری پێ دەگات.

پێم وت: بۆنی پێوە بکە و لەلایا بوەستە هەتا وێنەیەکت لە تەنیشـتیا بگـرم، لە دوای ئەوە کچەکەم هاتە پاڵم و ڕاوەسـتا، لە کـوت و پڕێکـدا خـۆم لەنـاو نەخۆشـخانەکەدا بینیەوە، پزیشک و کارمەندەکانم دەبینی هات و چۆیان دەکرد و سەرقاڵ بـوون، مـن بە ڕووی هەموویاندا پێ دەکەنیم، سەرنجی ئەوەم دا ژوری (١٢٤) سەقفی نیە.

سەیری جەستەی خـۆمم دەکـرد، لەسـەر چرپـاکە ڕاکشـابووم، پزیشـکەکە بـانگی دەکردم و چەند کارمەندێکی تریشی لێ بوو، بەئاگا هاتنەوەم زۆری خایاندبوو.

کاتێک لە سەرەوە بووم، گوێم لێ بوو کە دەیانوت (٢٥٠)!

مەبەستیان پلە و دەرەجەی ئەو کارەبایە بوو کە لە دڵی منی بدەن!

پزیشکەکە زۆر تورە بوو.

من لە سەرەوە بانگم لێ کرد "بەڵام نەیبیست،": دکتۆر بۆچی تورە دەبیت؟ خۆ من زیندووم!

یەکێکیان دەیوت هەوڵی چی دەدەن تەواو بووە و مردوە.

دوای ئەوە لە شوێنێکی تر خۆم بینی یەوە.

من دورگەی 'کیش'م بینی بە شێوەیەک کە هێشتا بەو جۆرەی لێ نەهاتووە!

زۆر زیاتر لە ئێستا پێشکەوتووتر بوو، خەڵکەکەشی لە ئێستا باشتر بوون.

دەموت: باشە ئەم نەخۆشخانەیە کەی ئاوا جوان و پێشکەوتوو پر لە گوڵ و گوڵزار بووە.

ڕۆشتمەوە بۆ ژوری چاودێری ورد (١٢٤)، گوێم لێ بوو وتیان: پلەکەی بکەن بە (٢٦٠)!

تێنەدەگەیشتم باشە من چۆن دەتوانم ئاوا بە ئاسانی ئەو هەمووە جوڵەیە بکەم، کات و زەمان نەبوو.

کلێنسم بینی، دەستم برد کلێنسێک دەربێنم و نێوچاوانی پزیشکەکە بسرم!

دەموت: دکتۆر بۆچی ئاوا دوو دڵ و بێ تاقەت و خەمباریت، دوو پزیشکەکەی تر پێیان دەوت: وازی لێ بێنە دکتۆر، مردوە و تەواو بووە.

بەڵام ئەو پزیشکە قەناعەتی بە وتەی ئەوان نەبوو، بەردەوام بوو لە هەوڵی خۆی.

شوێنی هەر یەکێکیان دەزانم لە کوێدابووە.

وتم: من نەمردوم، تەنانەت دەمم لە گوێچکەیان نزیک کردەوە و وتم: من زیندووم.

من بەردەوام ئارەقیم دەسڕی، بەڵام دەستی مـن بەری نەدەکەوت و ئـارەقی زیـاتری دەکرد.

وتیان: پلەکەی بکەن بە (٢٦٥) پلە.

کە ئەوەم بیست، ئیتر دوای ئەوە هەستم بە هیچی تر نەکرد.

وتیان: (٢٧٠) و ئیتر هەستم پێ نەکردن.

دوای ئەوە گەڕامەوە جەستەی خۆم.

مـن بەخـۆمم دەوت، وادیـارە مـن مـردووم، بەڵام خـۆمن ئێسـتا زۆر جـوان و خۆشحاڵم.

جل و بەرگم زۆر جوانە، ویستی گەڕانەوەم بۆ دونیا نەبوو، بەڵام منیان گێڕایەوە.

خۆشترین کات و ژیانی من ئەوەبوو لە ئەزموونەکەمدا بینیم.

هەست و خۆشی و ژیانی ئەوێ هەرگیز بە وەسف لە بیـری خەڵکـی دونیـادا قەرار ناگرێت.

هەستێک لەم ژیانەی دونیا پێی ڕاهاتووین، توانای خەیاڵ و ئەندێشـەکردنی ئەوێـی نیە و ناتوانرێت وێنەکانی ئەوێ لێرە بکێشرێت.

لە دوای ئەوەی نەشتەرگەری دڵم بۆ کرا و، ئینجا بە پزیشکەکانم وت کە چیم بینـی وە.

بەڵام لە دوای ئەوەی لە نەخۆشـانە دەرچـووم بـۆ خەڵکـی تـرم نەگێـڕایەوە، هەتـا نەزەری خراپم لێ نەگرن.

دوای ئەوەی دکتۆر لە 'کیش'ەوە ناردمی بۆ تاران هەتـا نەشـتەرگەریم بـۆ بکرێـت، یەک مانـگ لە نەخۆشـخانە مـامەوە، قەسـتەرەیان بـۆ کـردم و سـەرکەوتوو نەبـوو، لە دوایـدا نەشـتەرگەریم بـۆ کـرا، یەکەمـین کەس لە دوای پزیشـکەکانی 'کـیش' کە ئەزموونەکەم بۆ گێڕایەوە دکتۆر 'نوری' بوو، کە بەڕێـوبەری نەخۆشـخانەی دڵ بـوو لە

تاران، که پزیشکی من بوو، له ڕاسەرمدا ڕاوەستا و پێی وتم: واهەست دەکەم ژیان بە نیسبەت تۆوە خۆش و چێژدارە!

وتم: چۆن دکتۆر گیان؟

وتی: هە چ نەخۆشێک، کاتێک پێی دەڵێین نەشتەرگەریت بۆ دەکەین، دەترسێت و، حاڵیان دوو دڵی و ناجێگیری پێوە دەبینرێت، پرسیار لە تەواوی نەشتەرگەیەکە دەکەن کە چۆن بۆیان دەکرێت!

بەڵام تۆ زۆر دڵخۆش و بەختەوەر دەبینم!

پێم وت: ئاخر دکتۆر! من لە 'کیش' سەکتەی دڵ لێی دام.

دکتۆر خێرا پێی وتم: ئاخیرەت و بەرزەخت بینی؟!

وتم: بەڵێ بینیم! جوانتر بوو لە جوانی.

وتی: پێم بڵێ چیت بینی؟!

منیش بە کورتی بۆم گێڕایەوە و وتم: من خەمبار نیم، ئەگەر بشمرم، دەگەڕێمەوە بۆ ئەو شوێنەی کە زۆرم خۆشدەوێت.

ئەو شوێنەی بینیم زۆر زۆر جوان و ئارام بەخش بوو، دکتۆر بۆچی دڵگرانی جێهێڵانی ئەم دونیایە بم!

من دەزانم بۆ کوێ دەچم!

کە پێم وت، دکتۆر وتی: إن شاءالله باش دەبیت و دەمێنیت.

کە لە نەخۆشخانەی تاران دەرچووم و گەڕامەوە 'کیش'، ڕۆشتم بۆ نەخۆشخانەی 'کیش' هەتا سوپاسیان بکەم. ئینجا بۆ ئەوانیشم گێڕایەوە.

ئینجا کارمەند و ستافی نەخۆشخانەکە و پزیشکەکانی کیش وتیان ئەو هەمووە زانیاریەت چۆن زانی، خۆتۆ بێ هۆش بوویت!

وتم: من لە ڕاسەری جەستەکەمدا ڕاوەستابووم و شوێن و وتە و ئارەق کردن و هەموو شتێکی هەموویانم پێ وتن.

وتیان: هەموو وتەکانت ڕاستن و ڕاستیت بینیوە!!

## لە تەرمگە زیندوو بوومەوە



حاجی 'حسن زەریفی' ئەزموونەکەیمان بۆ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: من لە کار خانەیەکی شاری مەشهەد کارم دەکرد، لە ساڵی (١٩٥٣)ی زاینی لەو کارخانەیە دامەزرام.

لە ساڵی (١٩٥٨) سەرقاڵی کارکردن بووم، هەستم کرد دڵم ئازارێکی تێدایە.

لەو سەردەمەشدا بیمەی تەندروستی نەبوو، پزیشکەکانیش ژمارەیان زۆر نەبوو، لە کارخانەکەدا پزیشکێک هەبوو، ناوی دکتۆر 'رادبور' بوو، باوکی پرۆفیسۆر ڕاوبوری تا ئەمڕۆش لە ژیاندایە، ئەم پزیشکە پەیماننامەیەکی لەگەڵ کارگەدا هەبوو، کە ڕۆژانە سەعاتێک، یاخود دوو سەعات نەخۆش ببینێت.

ڕۆشتم بۆلای و وتم: دکتۆر دڵم زۆر دێشێت.

دەرمانی بۆ نوسیم و لە دەرمانخانە وەرم گرت.

بەڵام بۆ شەوەکەی حاڵم زۆر خراپتر بوو.

بۆ ڕۆژی دواتر بردمیان بۆ نەخۆشخانەی ئیمام 'ڕەزا' و پێنج مانگ و نیو مامەوە.

چەند ڕۆژێک لە ژورێکدا مامەوە کە هەشت نەخۆشی تری لێ بوو، دوای ئەوە گواسترامەوە بۆ ژورێکی تاکە کەسی، هەموو ڕۆژێک موغەزی و دەرمانی پێویستیان

پێ دەدام، دەستم کرد بە گریان و پاڕانەوە و دەموت: خودایە فریام بکەوە، ئیمام ڕەزام کرد بە شەفاعەتکار لای خوای تەعالا هەتا بەڵکو خوای گەورە شیفام بدات، بڕیاری ئەوەشم دا کە دوو تمەن بۆ مەمرقەدەکەی دابنێم.

وتم: ئەگەر شەفاعەتم بۆ نەکەیت، لای سەیدە فاتمەی خوشکت شکاتت لێ دەکەم.

لە ڕاستیدا نازانم چەندجار ئەو وتەیەم دووبارە کردۆتەوە، زۆر زۆرم دوبارە کردەوە.

دوای ئەوە بینیم دەرگای ژورەکەم کرایەوە.

دکتۆرەکان هاتنە ژورەوە و دەوری منیان دا.

پشکنینیان بۆ کردم، قسەیان لەسەر نەخۆشیەکەم کرد و دەرچوون.

دکتۆرێکیان سەرۆکی ئەو بەشەبوو، ئێستاش وێنەکەیم لاماوە، کاتێک ویستی بڕوات وتم: دکتۆر ئەگەر لەسەر ڕێگای مردنم، بمنێرنەوە بۆ ماڵەوە، هەتا لە ماڵەوە بمرم.

گەڕایەوە و وتی: کێ دەڵێت دەمریت؟

وتم: کەس نەیوتوە، بەڵام زۆر ئاشکرایە کە حاڵم زۆر خراپە.

دەستی هێنا بە سەرمدا و چاوەکانی خۆی سڕی و ڕۆشتە دەرەوە.

بە پەرستارەکانی وت: کە قەرەوێڵەکەم ڕووە و قیبلە لێ بکەن، زانیم کە کارم تەواو بووە.

دەستم کرد بە گریان و دەپاڕامەوە!!

لە کوت و پڕێکدا گەنجێکی زۆر جوانم بینی لەلای قەرەوێڵەکەم ڕاوەستابوو، بەڵام من نەمتوانی قسەی لەگەڵ بکەم، ئەویش هیچی نەوت، تەنها پێکەنی بە دەممەوە.

هەر ئەوەندەی بەڕوما پێکەنی، ڕۆحم لە جەستەم دەرچوو، کە گەڕامەوە لە دوایدا لە ئایەتوالله میلانیم پرسی، وتی: فریشتەی مەرگ 'عیزرائیل' بە شێوەی جیاواز دێت بۆ لای مرۆڤەکان، کەواتە ئەو گەنجە جوانە فریشتەی مەرگ بووە.

ڕۆحم لەلای جەستەمەوە بوو، لەدوای ئەوە پەرستارەکە هات و چاوەکانی داخستم و قاچ و ڕانی بەستم، ئیتر دوای ئەوە ئیزرائیلم نەبینی.

من هاوارم لێ دەکردن کە ئاوانەکەن، بەڵام نە منیان دەبینی و نە دەنگی منیان دەبیست.

منیان برد بۆ ساردکەرەوەی مردوەکان و لەسەر تەختەیەک دایاننام.

کاتی خۆی ساردکەرەوە وەک ئێستا نەبوو بۆ مردوو.

ساردکەرەوەی ئەو کاتە بۆ مردوو، بریتی بوو لە چەند قاڵبێک لە سەهۆڵ لەسەر جەستەی مردوەکە دایاندەنا.

من هاوام لێ دەکردن کە من نەمردوم بەو جۆرە نەکەن، بەڵام گوێیان لێ نەبوو.

بەفرەکەیان ڕۆکردە سەرم و ڕۆشتن.

هەندێ سەیری جەستەی خۆم کرد و، لە دوای ئەوە ڕۆشتم بۆ ماڵی خۆمان، هەواڵ گەیشتبو کە کوڕەکەتان مردوە، کاتی خۆی ماڵمان لە هەمان بازاڕی ئیمام ڕەزادا بوو کە ئێستا بازاڕە. گەڕەکەکەمان ناوی 'ئیدکاهـ' بوو، ژمارە (٩).

ئەو سەردەمە نە ئیسعاف بەم جۆرەی ئێستا هەبوو نە تەلەفۆن.

عادەت وابوو کە یەکێک بمردایە، تابوتێکیان دەهێنا و لە بەردەم ماڵەکەیاندا تەرمەکەیان دادەنا، هەتا خەڵکی بیزانیایە یەکێک لەم ماڵەدا مردوە، بۆ ئەوەی پرسەکەی بڵاوبێتەوە و خەڵکی بێن بۆ سەرەخۆشی.

من 'ڕۆح'م بە خێرایی گەیشتە لای ماڵەوە و بینیم باوکم دەکێشێت بەسەری خۆیدا و، دایکم و خوشکەکانم دەگرین، ماڵەکەشمان پڕبوو بوو لە خەڵکی.

من قسمم بۆ باوکم و دایکم و خوشکەکانم دەکرد، بەڵام بێ سوود بوو.

دەموت: ئەوە من لێرەم، هیچم نیە، سوودی نەبوو.

دوای ئەوە گەڕامەوە بـۆ لای جەسـتەکەم و چەنـد جارێـک وەسـتام لەسـەروی جەستەکەمەوە.

دوای ئەوە دوونەوەی حەزرەتی ڕەسول اللەم بینی ﷺ کە دەسـتنوێژیان دەگـرت، لە شوێنێک بوون، پڕبوو لە دار و درەخت و ئاو و سەرچاوە و ئاو و باغ و باغات.

وتم: ڕزگارم بکەن.

وتیان: بڕۆ بۆلای ئەوانە "ئاماژەیان کرد" دوان دانیشتبون.

وتم: ئەمانە کێن؟

وتیان: باپیرەمان موسای کوڕی جەعفەر و عەلی کوڕی موسان 'ڕەحمەتی خوایـان لێ بێت'.

چووم بۆلای ئیمام جەعـفەر کە دانیشـتبوو، بەدەسـتی موبـارەکی دەسـتی هێنـا بە جەستەمدا، شتێک لە دەستی کەوتە خوارەوە کەتووە فەرەنگـی بـوو، منـیش خەریکـی کۆکردنەوەی بووم.

شتێکی تریشیان پێ دام، دوای ئەوە ڕۆحم گەڕایەوە بۆ جەستەم.

ئیتر نازانم کێ دەست و قاچی کردمەوە کاتێک بە مردوویی شەتەک درابووم.

بەڵام ئەوە دەزانم کە من خۆم لە ناو سـەهۆڵدانەکەدا هـاتمە دەرەوە و شـوێنەکە زۆر تاریک بوو، دەستە کوتەم بوو هەتـا ڕێـگەکە بـدۆزمەوە، دەسـتم بەر چەنـد مـردویەك کەوت.

کە دەستم بەر جەنازەی سێهەم کەوت ترسم زۆر زیادی کرد، جارێکی تـر کەوتـم و بورامەوە، دیسانەوە ئیمام عەلی کوڕی موسای ڕەزا گەڕایەوە بۆلام.

منیش وەک ڕەخنە و گلەییەک پێم وت: بۆچی ڕزگارت نەکردم؟!

دەستی درێژکرد و وتی: ئەو دوو تمەنەیە بگرە، کە تۆ نەزرت کرد بۆ مەرقەدەکەی من، بیخەرەوە مەرقەدەکەم و ئیتر سکاڵای من مەبەرەوە لای خوشکەکەم.

ئیتر دوو تمەنەکەم هەڵگرت و، ئەو شوێنە کە زۆر تاریک بوو، یەک پارچە ڕۆشن بوویەوە، وەک ئەوەی گڵۆپێک داگیرسابێت ئاوابوو، هیچ گڵۆپێکی زاهیریش دانەگیرسابوو.

ئەو کاتە بینیم کە پێنج تەرمی مردوو لە ژێر بەفر و سەهۆڵدا بوون.

دەرگاکەم بینی، دەرگاکە کۆنەکان بوو، لە تەختە دروست کرابوو، ڕەنگی شین بوو، لە دەرگام دەدا و هاوارم دەکرد هەتا یەکێک بێت بە دەممەوە.

پاسەوانێکی شەوانە هەبوو لەوێ بوو، کە لە دوایدا لە ڕۆژنامەکان دەربارەی ئەو ڕووداوەی من چاوپێکەوتنیان لەگەڵ کرد، کە ناونیشانی یەکێک لە ڕۆژنامەکانی ئەو کاتەی ئێران ئەوەبوو 'زیندووبوونەوەی مناڵێک لە دوای مردنی لە نەخۆشخانەی ئیمام ڕەزا'.

کە گەورە بووم و ژنم هێنا، کۆپیەك لەو ڕۆژنامەیەم دەستکەوت.

پاسەوانەکە هاتە لای دەرگاکەوە و وتی: کێیە لە ژورەوە؟

منیش وتم: دەرگاکەم بۆ بکەرەوە، خوای گەورە زیندووی کردومەتەوە و شیفای بۆ ناردووم.

وتی: کلیلم پێ نیە بوەستە ئێستا دێمەوە.

دوای چەند خولەکێك گوێم لە دەنگی خەڵکی تریش بوو نزیک دەبوونەوە لە دەرگاکە و چرای فانۆسیان بەدەستەوە بوو.

لەژێر دەرگاکەوە دیاربوو کە خەڵکەکە دەجوڵان.

دەرگاکەیان کردەوە، من خۆم فڕێ دایە ئامێزیانەوە.

پاسەوانەکە ناوی حاجی موحەمەدی سەقی بـوو، باوەشـی پیـا کـردم وبردمـی بـۆ ژورەکەیان و پۆشاکیان لەبەر کردم.

دوای ئەوە هەموو یەکێکیان دەیوت ئەو دوو تمەنەمـان پـێ بـدە، بەڵام دەنگێـک لە گوێمدا بوو دەیوت، نەیدەیت بە کەسیان.

من لەوێدا وتم: ئەوە ئیمام ڕەزا پێی داوم.

ئیتر دونیا ڕۆشن بوویەوە و پزیشکەکە هات.

دکتۆرەکە دەیزانی کە من دوێنێ مردبووم و ئێسـتا زینـدوو بـوومەتەوە، سـێ و سـێ سەعات بەسەر مردنمدا تێپەڕی بوو.

دکتۆرەکە وتی: ماڵی خۆتان بەڵەدی 'شارەزای'؟

وتم: بەڵێ.

ئۆتۆمبیلێکیان هێنا و، من و دکتۆرەکە سەرکەوتین.

کە لە دەوری مـاڵی خۆمـان، منیـان بینـی، بـوو بە هەرا و قەرەبـاڵغیەکی گەورە، خەڵکەکە لە دەوری ئۆتۆبیلەکە کۆبوونەوە.

دکتۆر وتی: ئەوە خوای گەورە زینـدوی کـردۆتەوە و شـیفای بـۆ نـاردوە و منـیش هێناومەتەوە بۆلای دایک و باوکی.

ئێمە هێنامانەوە بۆ ئێـرە، هەتـا ئێـوە نەیەن بـۆ تەرمـگە و نەخۆشـخانە و قەرەبـاڵغی لەوێ دروست بێت!!

پیاوێکی بەتەمەنی ناوچەکە هەبوو، خەڵـکەکەی بـێ دەنـگ کـرد و لای دیوارێـک خەڵکەکەی ڕاوەستاند.

منیان بردە ماڵی خۆمان و بـاوکم و دایکـم و بـرا و خوشـکەکانم دەسـتیان کـرد بە گریان و باوەشیان پیا کردم!

هەر کەسێک داوای دوو تمەنەکەی لێ دەکردم پێم نەدەدا.

دایکم داوای کرد، دامە دەستی و لێم وەرگرتەوە.

لە دوایدا منیان بـرد بـۆلای ’ئـایەتوالله مەیلانـی‘، باوەشـی پیـا کـردم و لە نزیکـی خۆیەوە داینام.

کە بەسـەرهاتەکەم بـۆ گێـڕایەوە، وتـم: قوربـان! ئـیمام ڕەزا خـاڵێکی جـوان لە ڕوخساریدایە.

ئەویش زۆر گریا، دەستی درێژ کرد بۆ دوو تمەنەکە، منیش پێم دا.

دکتۆر وتـی: لە بەیـانیەوە هەمومـان داوای لـێ دەکەیـن ئەو دوو تمەنەی نەداوە بە کەسمان.

وتم: دەنگێک پێی دەوتم مەیدە بە کەس، بەڵام بۆ دایکم و ئایەتوالله هیچ دەنگێـک نەبوو ڕێگریم لێ بکات!

ئیتر ’ئایەتوالله مەیلانی‘ وتی: تمەنەکان مەگۆڕە، بیانبە بیانخەرە ناو مەرقەدی ئـیمام ڕەزا، منیش بەو جۆرەم کرد.

## دوای مردن ژیان بەردەوامە، بەڵام بۆ قۆناغێکی زۆر باڵاتر



’مەنصـوری ئەعلەمـی فەڕ‘، ئەزمـوونەکەیمان بـۆ دەگێـڕێتەوە و دەڵێـت: مـن زۆر چوست و چالاک بووم، هەستم بە تافی لاوێتی خۆم دەکـرد، هەرگیـز پێشـبینی ئەوەم نەدەکرد شتێک لەمندا ڕووبدات و لاوازی و کەمی بێت بۆ جەستەم و تواناکانم!!

ڕۆژێکیان وەرزشم دەکرد و دوو کیلۆمەتر، یاخود کەمێک زیاتر لە ماڵەوە دور کەوتبوومەوە، هەستم بە ئازارێکی توند کرد لە سەرو قەفەسەی سنگمەوە دەستی پێ کرد، لە دوایدا بە هەموو سنگ و گیانمدا بڵاو بوویەوە، گەیشتە شادەماری مل و گەردنم، ئینجا دەستی ڕاستی گرتمەوە، ئیتر نەمتوانی هەنگاوێک زیاتر بنیم!

ڕۆژەکەش، ئێوارەیەکی ڕەمەزان بوو، نزیکی بانگی ئێوارە بوو، پیاوێک لەوێدا ئاوی باخچەیەکی دەدا، سۆندەی ئاوەکەم لێ وەرگرت و هەندێ ئاوم خواردەوە و پشوویەکم دا، لە دوایدا ڕۆشتمەوە ماڵەوە.

من بە شێوەیەکی ئاسایی ڕۆژانە (١٠ - ١٥)کم بە پێ ڕێ دەکەم.

ڕۆژی دواتر ڕۆشتمە دەرەوە و تەنها (١٥٠ - ٢٠٠) مەترێک ڕۆشتم و ئازارەکە دەستی پێ کردەوە.

دانیشتمە سەر زەویەکە، ئازارەکە دووسێ جار دووبارە بوویەوە، ئیتر بڕیارم دا بچم بۆلای پزیشک.

لەکاتی وەرزشدا هێڵکاریەکی دڵیان بۆ گرتم، دەرەنجام دکتۆر وتی: دەبێت بە زوترین کات قەستەرەی دڵی بۆ بکرێت، ئەمەش لە ساڵی (٢٠١٠)دا بوو، تەمەنم پەنجا و نۆ ساڵان بوو.

زۆر سەیر تامەزرۆیم بۆ گەیشتن بە مەعشوقی خۆم بۆ دروست بووبوو، زۆر هەستم بە خۆشی گەیشتن بە خوا دەکرد!

ڕۆشتم بۆ قەستەرە، دەرەنجامەکان ئەوە دەرچوو کە چوار دەماری دڵم گیراوە و، ئیمکانی بەکارهێنانی باڵۆن نیە بۆ کردنەوەی، لەبەر ئەوە نەشتەرگەری دڵ حەتمی بوو!

منیش لە نەشتەرگەریەکە نەدەترسام، بەتەمەنەکان لەو قاوشەدا دەهاتن و دەچوون و دەیانوت: نەشتەرگەریمان بۆ بکەن چی ڕوودەدات؟!

منیش دەموت: یان ئاسۆیی دەڕۆین یاخود ستونی!

نزیکەی دوانزە کـاژێر لە ژووری نەشـتەرگەریدا مـامەوە، لە دوای دوو سـەعات کە هاتمە دەرەوە حاڵم تێک چـوو بـوو، وام لێهـات لەسـەر ڕانـم دەمنوسـی و وەسـیەتم دەکرد، وشە بە وشەی وەسیەت نامەکەم نووسی.

پزیشکەکان کۆبوونەوە و وتیان: خوێن بەربوونی ناوەوەت هەیە 'نزیف داخلـی'، لە دوای ئەوە بێ هۆش کەوتمەوە، لە نیوە شەودا بـوو، دەمەو بەیـانی بـوو بەئاگـا هـاتم، دەبینم جارێکی تر نەشتەرگەریان بۆ کردومەتەوە.

وتیان: دەبێت سێ مانگ پشو بدەیت، بەتایبەتی مانگ و نیوی یەکەم زۆر گرنگە.

دوای ماوەیەک من زۆر حەزم لە پێ ڕۆشتن دەکرد، نیو سـەعاتێک ڕێـم کـرد، وەک پێشتر هەستم بە ئازاری سنگم کرد، هەمان حاڵەت دووبـارە بـوویەوە، بە خێـزانەکەمم وت: حاڵم خراپ بووەتەوە، ئیتر حاڵم تێکچوو، نازانم چی ڕووی دا.

لەو ساتەوە ئەزموونەکەم دەستی پێ کـرد، لەو چـرکە سـاتەی کە مـن بـێ هـۆش و گۆش کەوتبووم، ئاسمانم بینی بە ڕەنگی شینێکی زۆر جوان و بەیەک شێوە، ئاسـمانم بینی پڕ بوو لە باڵداری زۆر جوان، کە هەر یەکێکیان نیـومەتر دەبـوون، شـێوەی دەم و چاویان لە مرۆڤ دەچوو، باڵیـان زۆر گەورە بـوو، سـەوز بـوون، بەڵام سـەوزێک کە هەرگیز لەو ڕەنگەم نەبینیوە.

ئەو دیمەنە دڵ و دەروونی دەکردەوە و ئارامی پێ دەبەخشیت.

بەبێ سنور دەم و چاوەکان زۆر بـوون، باڵنـدەکان لە ژمـارە نەدەهـاتن، هەموویـان بانگیان لێ دەکردم... وەرە....وەرە.... لەگەڵ هەموو وەرەیەکـدا مـن بەرز دەبـوومەوە بۆ ئاسمان.

لەو چرکە ساتەشدا تەرمی خۆمم دەبینی کە دانەپۆشرابوو، هەستم بە لەش سوکی و خۆشیەکی زۆر دەکرد، بەردەوام سەردەکەوتم و لەناکاو ڕاوەستام، ئەو فەرمانە زۆر ئازاری دام کە ڕایانگرتم، کە لە ئاسمان بووم هەستم بە هیچ ناخۆشیەک نەدەکرد، زۆری پێ چوو، دەنگی وەرە وەرەکە ڕاوەستا و ئیتر لە نێوان ئاسمان و زەویدا مابوومەوە، لە نێوان بانگکردنی ئاسمان و، نزای خێزانەکەمدا ڕاگیرابووم، کە چاوم کردەوە نزیکەی سەد کەسێک لە دەورمان کۆبووبوویەوە.

................ ................

ئەزموونێکی ترم هەبوو، لە ساڵی (١٩٨٥)ی زاینی لە دەریادا نوقم بووم، چوار گەنج بووین، سەرقاڵی یاری تۆپی پێ بووین، هێدی هێدی لە قوڵایی دەریا نزیک بووینەوە، کاتمان فەرامۆش کرد، یەکێکمان لە دەریا هاتە دەرەوە و سیانمان لەناو ئاوەکەدا ماینەوە یاریمان دەکرد، لەناکاو هەستم بە گێژبوون کرد، کە دەبوو خۆم بگەیەنمە کەنار دەریا، هەستم کرد ناتوانم بگەمە کەنارەکە.

وتم: هەندێ ڕادەوەستم و هێزی خۆم کۆدەکەمەوە و خۆم دەگەیەنمە کەنار دەریا.

سەیرم کرد ئاوێکی زۆر لەسەرمەوەیە و نابێت ڕابوەستم، هەوڵم دا بێمە سەرەوەی دەریا و داوای کۆمەکیم لە هاوڕێکانم کرد، وایان زانی گاڵتە و شۆخیان لەگەڵ دەکەم.

هیچ کەسێکیان گوێیان پێ نەدام، خۆ ئەگەر بهاتنایە هەموومان دەخنکاین.

سەیرم کرد نەدەستم و نەقاچم یارمەتیم نادەن هەتا بگەمە کەنارەکە، ئیتر ئاوەکە زیادی کرد لەسەر سەرم و هێواش هێواش نوقم دەبووم، لە ماوەیەکی کەمدا، لە تەمەنی پێنج مانگیەوە هەتا ساتی نوقم بوونەکەم بە خێرایی بینیەوە، بەڵام خێرایی تێپەڕبوون و کورتی ماوەکەی وای نەکرد نەیانبینم، هەموو وردەکاریەکانم بینیەوە، ئەزموونێکی زۆر جوان بوو بۆ من.

ئەو کاتە تەمەنم (٣٤) ساڵان بوو، ئەوەی بینیم و بە تایبەتی دیمەنێکی منداڵی کە تەمەنم یەک ساڵان بووە و، پزیشکەکان دەیانوت ئەم منداڵە ناژی، باوکیشم سوربوو

لەسەر ئەوەی کە بمبات بۆ مەشهەد، کە دەبوو لە تارانەوە بچین بۆ مەشهەد، شـوێنێکم بینی کە هێشتا شەقامەکەی قیرتاو نەکرابوو، گڵ و چەوو بوو، دوایـی بە دایکمـم وت: کاتێ منتان برد بۆ لای دکتۆر ڕێگاکەی بەو جۆرە بوو؟!

دایکم وتی: بەڵێ بەو جۆرە بوو کە تۆ دەیڵێیت.

وتم: دایە تۆو براکەم لە خوارەوە مانەوە، پێش ئەوەی بە پیلکانەکاندا سەربکەون بـۆ سەرەوە، باوکم منی برد بۆ سـەرەوە و دوو دەرزیـان بـۆ کـردم، لەسـەر قەرەوێڵەیەکـی سپی داینـام و دەرزیەکانیان بۆ کردم.

من تەمەنم لە ساڵێک کەمتر بوو کە ئەوەیان پیشان دامەوە، لەنـاو سـکی دەریاشـدا بووم و هەموو ژیانیشم پیشان درایەوە، یەکێکیـان ئەم بەسـەرهاتە بـوو، هەمووشـی لە چەند چرکەیەکدا بوو!! هەر لەو کاتەدا بینـیم بـاوکم لەسـەر بەرمـاڵێکی سـور نـوێژی دەکرد لە مەشهەد.دایکم وتی: هەمـووی بەو جـۆرە بـوو، تـۆ لە قوماتەیابوویـت هەتـا سەرمات نەبێت.

براکەم لەگەڵ دایکم و باوکم بوون، چـوار سـاڵ لەمـن گەورەتـرە، دەبەیەک ئـاوی بەدەستەوە بوو، من لەو کاتەدا دەستم کرد بە گریان 'بەبێ هۆ'، باوکم لەناو نوێژەکەیـدا بوو ئاماژەی بۆ براکەم کرد دەبەکە دابنێت و من هەڵبگرێت هەتا ژیر ببمەوە.

بەدایکمم وت کە لە کوێی پاسەکەدا سەرکەوتوین!!

کە دەستم بە گریان کرد و دایکم شیری پێ دام، دایکم زۆر سەری سوڕما کە چـۆن ئەوەم زانیوە.

شـەوێک چـاوم لەسـەر ڕوونـاکی چـراکە بـوو، کە سێبەری دروسـت دەکـرد لە دیوارەکەدا.

دایکم دەڵێت: دەمانوت ئەوە کۆتا شەوی ژیانتە بەهۆی خراپی حاڵتەوە.

ئینجا باوکم ڕۆشت بۆ زیارەتی ئیمام ڕەزا لە مەشـهەد و زۆر پـاڕایەوە لە خـوا هەتـا شیفام بدات، دایکم لەلای من مایەوە.

دایکم دەڵێت: باوکت هاتەوە و وتی: إن شاء الله منداڵەکەمان حاڵی باش دەبێت.

دایکم وتی: چۆن دەزانیت؟

باوکم وتی: خەو زۆری بۆ هێنام و خەونێکم بینی.

بینیم کە تەمەنێکی نوێ بۆ منداڵەکەمان نوسرایەوە.

دایکیشم خەونێکی لەو جۆرەی بینی بوو.

ئیتر ئەوە بوو کە لە مەشهەد گەڕاینەوە و منیش چاک بوومەوە.

لە ڕێگادا پاسەکە ڕاوەستاو لەسەر ئاوێک لایاندا، خەڵکێکی تر لەسەر ئەو ئاوە شتیان دەشۆرد.

دوو مانگاش هاتن ئاو بخۆنەوە، یەکێکیان کەوتە ئاوەکەوە.

خەڵکی ناو پاسەکە یارمەتیان داو دەریانهێنا، دایکم بە باوکمی وت: تۆ مەڕۆ....

هەموو ئەمانەم لە کاتێکدا بینییەوە کە من لە حاڵەتی نوقم بوون و ژێر ئاو کەوتندا بووم، هیچ نارەحەت و بێ تاقەتیش نەبووم بەوەی کە دەمرم، ئێمەی مرۆڤ لە دەرەوەی ئاو دەترسین بخنکێین، بەڵام لەو چرکە ساتەدا هیچ ترسێکم نەبوو، ترسێک هەمبوبێت ئەوە بوو کە خێزانەکەم چاوەڕوانی جەستەی مردووی من بکەن.

من لەم ئەزموونەیاندا لە جەستەی خۆم دەرنەچووم، بەڵام زۆر نزیک بوومەوە لە مردن، وام دەبینی پاش چەند خولەکێکی تر لە جەستەم دەردەچم و دەمرم.

بەڵام قەدەری خوای تەعالا وابوو کە لە کوت و پڕێکدا، خۆم لە نزیکی کەنارەکە بینیەوە و ئاوەکەش هەتا سەر سنگم دەبوو لە کەنارەکە، لەسەر شتێکیش وەستابووم و نەمدەوێرا دەربچم.

هەتا چەند هەناسەیەکم داو، ئینجا هەوڵی هاتنە دەرەوەم دا.

ئێمە کە خەون دەبینین، دەڵێین خەونمان بینی، بەڵام لە ئەزموونی نزیکبوونەوە لە مردندا ژیان دەکەین، بەڵکو ئەزموونی باشترین جۆری ژیان دەکەین!

ژیان دوای مردن بەردەوامە، بەڵام بۆ قۆناغێکی زۆر باڵاتری ژیان دەچین.

## پارەی حەرام لە دونیا ماڵ وێرانت دەکات

لە سەرەتای ساڵی (٢٠٠١)ی زاینیدابوو، بەهۆی کێشەی ئابووریەوە بڕیاری خۆکوژیم دا، دەترسام لە خواردنی حەبی زۆریش و پاشان مردن، بیستبوم کە ئەگەر 'تریاک'ی زۆر و حەبی موخەدەرات بخۆم، ئەوە لە خەودا دەمرم!! بە یەکێک لە هاوڕێکانم وت: بڕێکی زۆری بۆ پەیدا کردم و هەموویم خوارد، نیو سەعات بۆ چل دەقەی پێ چوو، دەبینم من لە سەرو جەستەکەمەوەم بە دوری دوومەتر و نیو، جەستەکەشم لە خوارەوە کەوتوە و ڕاکشاوە.

دەمبینی شتێک ڕایەڵ بوو، لە نێوان منی سەرەوە و جەستەی خوارەوەدا، لە دڵی خۆمدا دەموت با دەستی پێوەبگرم، بەڵام نەدەگیرا و نەدەپچڕا! وەک گوریسێک بوو.

دەستم دەچوویە ناو جەستەکەمەوە، ئیتر تێگەیشتم کە من مردووم، نەمدەزانی چەندەیە مردوم، بەڵام ڕۆژێکی تەواوەتی جەستەم بێ هۆش بووە، بەڵام ڕۆحم هەستی بە بار سوکیەکی زۆر سەیر دەکرد.

کاتێك زانیم مردووم هەستم بە ترس کرد، هەستم بە پەشیمانی کرد، هەموو ژیانی خۆم پیشان درایەوە، کات و زەمان تەنها لە دونیادا هەیە، لەوێ هەتا هەتاییە.

خۆم بینیەوە وەختێ تەمەنم دوو ساڵان بووە و بە باوەشی خاڵمەوە بووم و کەوتومەتە خوارەوە!

ئەو چرکەیەی کەوتم بە ڕۆح ئاگام لێ بوو ئازارەکەیم پێ گەیشتەوە، ترسی خاڵیشم گەیشت بە من، کە هەڵی گرتمەوە و ڕای کرد هەتا باوکم و دایکم نەزانن کە من لە دەستی ئەودا کەوتومەتە خوارەوە.

هەست و شعور لەوێ زۆر بەهێزترە لە هی دونیا.

ترسی ئەوێ وەسف ناکرێت!!

دڵخۆشیشی بەهەمان شێوەیە...

زۆر شت هەبوو لە دونیادا کردبووم، کە نەدەبوو بمکردایە.

هەستم کرد ستەمم لەخۆم کردەوە.

جارێکیان لە ڕێگەیەکدا گەیشتم بە پیاوێکی پیر، ئارەقی کردبوو لە ماندوێتیدا، سواری ئۆتۆمبیلەکەمم کرد و گەیاندمە شوێنی خۆی، لەو جیهانەدا بینیم کە ئەو کردەوەیە چ بەختەوەری و پاداشتێکی بۆ من تیابوو.

گوناهیش سزا و حەسرەت و پەشیمانی لەدوایە.

بینیم هەچ کاتێک چاوم لە ئافرەتی نامەحرەم پاراستبێت، چ دەستکەوتێکی گەورەی ئەوێی پێ بەخشیوم!

چونکە ئەوە پەیوەست بووە بە شەرەف و مافی خەڵکیەوە و بۆ من نەبووە سەیری بکەم.

من لە ژیانمدا چاوەکانم لە نەزەرەی حەرام زۆر دەپاراست، شعور و هەستێکی ئەوەندە گەورەی بۆ دەستەبەر کردم کە هەرگیز پێناسەیەکی لە دونیادا نیە.

کردەوەیەکی خۆمم بینی یەوە، دوای ئەوەی هاوسەرگیرم کرد، ساڵێکیان سەفەرم کرد، خێزانم چاوی بە ژنێکی هاوڕێی دێرینی خۆی کەوت، کە لە خوێندن پێکەوە بوون.

ئەو ئافرەتە مێردەکەی لەسەر جێگابوو، نەیدەتوانی هەستێ و هیچ کارێـک بکـات، لە سۆپەرمارکێتێک بینیمان.

دووسەد هەزار تمەنم پێ بوو بەخشـیمان بەو ژنە بـۆ خـۆی و هاوسـەرەکەی و بـۆ خەرجـی ماڵەوەیـان، خێـزانم بـردی بـۆ هـاوڕێکەی و پێـی دا، کە ئەو بـڕە پـارەیە بـۆ گەشتمان دانابوو.

لەو جیهانە ئەو کارەم بینیەوە، کـاتێ خێـزانم پـارەکەی خسـتە دەسـتی هـاوڕێکەی بەختەوەریەکی ئەوەندە مەزن دروست بوو کە هەرگیـز لەبـاس کـردن نـایەت، هەمـوو کارێکی ئێرە دوو مانای هەیە لەوێ.

یان دڵخۆشی و بەخـتەوەری زۆر و بـێ شـومار، یـاخود خەمێکـی قـوڵ و سـزای سەخت.

کە چاکەیەک دەکەن، مـنەت بەسـەر خـوای گەورەدا مەکەن، لەو دونیـا دەبیـنن کە تەواوی ئەو چاکانە بۆ خۆتان بووە و، مرۆڤ زۆر شـەرمەزار دەبێـت لە کـاڵ و کرچـی چاکەکانی دونیای.

کە خواردن و پێویسـتی مـاڵ بـۆ خێـزانەکەت دەهێنیـتەوە، منەتیـان بەسـەردا مەکە، زۆربەی چاکەکان لەم شێوەیەن و پێیان نازانین و بە منەت کردن دەیانفەوتێنین.

یەکێک لە کارە خراپەکانم باس دەکەم کە بینیمەوە!

دایکـم و خوشـکە بچـووکەکەم بەتەنهـا دەخەوتـن لەمـاڵەوە، منـیش زۆربەی شـەوەکان، درەنگـانێکی شـەو دەگەڕامەوە بـۆ مـاڵەوە، دایکـم زۆر نـاڕازی بـوو لەو کردەوەیەم، ناڕەزایەتی دایکم بۆ ئەوێم زۆر قورس و گران بوو.

هەستم بە خنکان و سزا و ئازاری زۆر دەکرد لەپای ناڕەزایەتی دایکم.

من بیرم چووبوو کلیلەکان لەگەڵ خۆم ببەم.

لە دیواری ماڵەوەمان خۆم فڕێ دایە حەوشەکەوە.

له سەرەتادا دایکم وایزانی من دزم، له ترسانا دانیشت و توشی تەنگە نەفەسی بـوو، ڕامکرد بۆلای دایکم و وتم: دایە ئەوە منم مەترسە.

قسەی پێ وتم و وتی: دەتەوێت لەوە زیاتر چی بکەیت!

لەو جیهانە بە تەواوی هەستم بەو ناڕەحەتی و ترسەکەی دایکم کرد.

ئەگەر دایک نەفرەتت لێ بکات، لەوێ نەفرەت لێ کراو دەبیت و گیـرۆدەی سـزای قورس دەبیت.

ناتوانیت هیچ بکەیت.

له هەر چوار لاوە سزا و عەزاب هێرشت بۆ دێنن.

کردارێکی ترم کە خراپ بوو، کرێکارێک هەبوو لەلای من کـاری دەکـرد، ڕۆژێـك زیانێکی پێگەیاندم بۆیە، بەشێک له موچەکەیم بڕی.

دەمزانی کە ئەو کرێکارە نەیدەتوانی مافی خۆیم لێ وەربگرێتەوە، له بێ دەسـەڵاتی ئەو سودم وەرگرت، ئیتر ئەوەبوو بە سزا و ئازارێکی گەورە بۆمن.

سزای ئەو کارەم بینی زۆر خراپ سزادرام، هەستم بە ژێر پـێ کەوتـن و پلیشـانەوە کرد، هەستم بەوە کرد له فڕنی ئاگریندا سزا دەدرام.

وەک ئەوەی بەرخێک بە زیندووی دابماڵیت....

ڕۆژی دووهەمی 'هەرچەندە کـات لەوێ نـیە' ئەو ئـازارە زۆر قورسـتر بـوو لەسـەر هەمان کردار.

ئازارێک بەرگەی ناگیرێت.

جارێکیان ئۆتۆمبیلێك له تەنیشتی ئۆتـۆمبیلەکەم ڕاوەسـتا منـیش خێـزانەکەمم پـێ بـوو، گەنجێـک له سـەیارەکەی تـر ڕووە خێـزانەکەم سـەیری دەکـرد، چـاوی لەسـەر خێزانەکەم نەبوو من بە هەڵە حاڵی بووم، بەبێ ئەوەی پێی بڵێم، ڕۆشتم و زلەیەکم لـێ دا، لەوێ هەستم بە ئازاری ئەو زلەیە کـرد لەسـەر ڕوخسـارم، زۆر خەمبـاری کـردم و ویژدارن کوژبوو ئەو کارە نالەبارەی من کردم.

من هەموو ئەم کارانەی دونیام بیر چووبوویەوە، بەڵام لەوێ هیچ شتێک فەرامۆش ناکرێت.

من لە سی ساڵیدا بوو بڕیاری خۆکوژیم دا، لەو چرکە ساتەدا هەموو ژیانم بینییەوە و پیایدا گوزەرم کردەوە، وەک ئەوەی دووبارە بێت.

چرکە بە چرکە و، خەیاڵ و ئەندێشە و ختورەیەک ون نەبووبوو، بەڵام بە هەستێکی جیاوازەوە.

بە داخەوە زۆربەی ژیانم هۆکاری سزا بوو بۆ ئەوێ.

دەمویست لە خوای گەورە بپاڕێمەوە ڕزگارم بکات، نەمدەتوانی، ناوی خوای گەورە نەدەگەیشتە ناخمەوە و بە شایانی ئەوە نەدەبینرام کە لە خوا بپاڕێمەوە.

باوکمم بیر کەوتەوە، کە پێش بیست و دوو ساڵ کۆچی دوایی کردبوو.

هەر ئەوەندەی بیرم کەوتەوە هات بۆلام، خۆم لە باخ و بێستانێکدا بینیەوە، پڕبوو لە گوڵی زەرد و زۆر جوان، یەکپارچە زەردی دەکردەوە.

کەسێکم بینی ڕووەو من دەهات، هەستم کرد کە باوکمە! کە نزیک بوویەوە، لێم پرسی: ئایا تۆ باوکم نیت؟

وتی: بەڵێ کوڕم من باوکتم.

بەڵام بە خەمباری و پەشیمانیەوە وتی و سەری داخست.

توڕە نەبوو لێم، بەڵام نیشانەی ڕازی بوونیش نەبوو، پێی وتم: بگەڕێرەوە.

هەر ئەوەندەی وتی: بگەڕێرەوە، من خۆم لە ژورەکەی خۆمدا بینیەوە.

فرسەتی قسەکردنم نەدرا هەتا قسەی تری لەگەڵ بکەم، کە هاتمەوە ناو جەستەکەم، هەستم بە لەش قورسیەکی زۆرکرد، هەستم بە پەستان و خنکان و تەنگەبەری دەکرد، لە ماوەی فلاشی کامێرایەکدا هەموو شتێک وەکو خۆی لێ هاتەوە.

پێش ئەو ئەزموونە بـاوەڕدار نەبـووم، سـوپاس بـۆ خـوا ئێسـتا بـاوەڕدارم بەخـوای گەورە، گرنگی بە مافی خەڵکی زۆر دەدەم.

تەنـانەت خـۆت بپـارێزە لەو شـتانەی کە خەڵکـی بە لاوەکـی سـەیری دەکەن، بە سەیارەکەت مەڕۆرە سەر خۆڵ و پـێش سـەیارەی تـر بکەویـت، 'مـافی خەڵکـی' زۆر گرنگە بیپارێزێت.

ئاگاتـان لە مـاڵی خەڵکـی و، مـاڵی حەرام بێـت، لەو دونیـا ناتوانیـت مـافەکەی بدەیتەوە، ماڵ وێران دەبیت.

## ئەزموونی 'سەعیدخانی'

'سـەعید خـانی' ئەنـدازیاری میکـانیکیە و لە سـاڵی (٢٠٠٩)ی زاینـی بـوو، ئەزموونەکەیمان بۆ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: لە کارەکەم تەواو بووم و ڕۆشتمەوە، کـاتژمێر شەش و هەژدە خولەکی ئێوارە بوو، کەش و ئـاو و هەوا تەم و مژبـوو، دەمانویسـت لە شەقامەکە بپەڕینەوە، شـاحینەیەک زۆر بە خێرایـی بەرەو ڕوومـان هـات، هاوڕێکـانم پەڕینەوە، بەڵام من نەپەڕیمەوە.

ئۆتۆمبیلێکی تر خۆی لە شاحنەکە لادا و بەرەو ڕووی من هات، هەستم پێ کـرد و لێی دام...

وا دەزانم زۆر بەهێز لێی دام.

هەر ئەوەندەی جانتاکەی دەستم لە دەستم پەڕی، ئیتر هەستم بە هیچ نەکرد، دوایـی پێیان وتم: دوای لێدانەکە دوومەتر هەتا سێ مەتر بە ئاسماندا فڕێـی داوم و، لە دوایـدا کەوتومەتە سەر زەویەکە.

ئیتر هەستم کرد من دەچمە قۆناغێکی تری ژیان، هەموو شتێک تاریک داهات، دەمویست بجوڵێم، بەڵام نەمدەتوانی، ئیتر ئۆتۆمبیلێکی ئیسعاف هاتبوو، دەنگی زەنگی سەیارەکە زۆر بێ تاقەتی کردبووم، لە پڕ وەک ئەوەی ڕابچڵەکم بە دەنگێکی بەهێز بەو جۆرەم لێ هات، لە نەخۆشخانە وتبویان تەواو بوە و ناتوانین هیچی بۆ بکەین، بردبومیان بۆ نەخۆشخانەیەکی تر، ئیتر لە ئیسعافەکەدا نەمدەزانی کێیە لەگەڵم دەدوێت.

خێزانەکەم بە پۆشاك و بەرگەکەمدا منی ناسی بوویەوە، چونکە ڕوخسارم خەڵتانی خوێن بوو بوو، بردبومیان بۆ (١٢٤) سنگیان کون کردبووم بۆ ئەوەی پیسی و خوێنی لێ دەربێنن.

هەستم کرد لاشەم سوک بوو، هەستم بە پشوویەکی زۆر سەیر و خۆش دەکرد، ئیتر کەمەن و کێشی لاکەی تر بووم، دوو کارمەندی تەندروستی قسەیان دەکرد و باسی 'بۆ ڕۆژی لە دایك بونی'ی منالەکەیان دەکرد.

یەکێکیان وتی: ئەم نەخۆشە حاڵی زۆر خراپە، ئەگەری چاک بوونەوەی نیە.

مێشکی بەرکەوتەی زۆرە، خزمەکانم چاوەڕوانی مردنی منیان دەکرد، نەک چاک بوونەوەم.

منیش دەمپرسی لەخۆم، بۆچی خزم و کەس و کارم بێ تاقەتی منن؟!

من دەچوومە نهۆمەکانی سەرەوەی خۆم و بە ناو نەخۆشخانەکەدا دەگەڕام، بێ تاقەت بووم لەو جل و بەرگەی کە خێزانەکەم لەبەری کردبوو، چونکە من پێشتر پێم وتبوو ئەو ڕەنگ و بەرگەم بەدڵ نیە.

بە خێرایی دەگەڕام بە هەموو شوێنێکدا.

جەستەم هەمووی پێچرابوو، لەفاف بەسەر و چاو و گوێچکەمەوە بوو، هەوڵی ئەوە دەدرا خوێن بەربوونەکە بوەستێنن.

دڵم زۆر هێواش لێی دەدا.

که دەچوومەماڵەوە دەموت ئەوە مناڵەکان بـۆچی هەرچـی یاریەکانیـان هەیە پەرش و بڵاویان کردوەتەوە و کەس کۆی ناکاتەوە.

هەموو ئامێرەکانم دەبینی و تەنانەت مارکەکانیشم دەبینی.

دوای ئەوە سیفەتی خۆ هەڵقورتانم کەمی کرد تیامدا، تواناکانم زۆر زیادیان دەکـرد، کات و مەودا نەبوو، تەنها بە نیەت و ویست بمویستایە شتێک بکەم، بۆ شـوێنێ بچـم خێرا ئەوە ڕووی دەدا کە دەمویست.

که لە سەرەوە سەیری ئۆتۆمبیل و قەرەباڵغی و ترافیک لایت و تەنگەلانی شـارەکەم دەکرد، دەموت ئەوە کەی ژیانە، ئازادی لێرەیە، خۆش گوزەرانی لێـرەیە، ئەوە چ جـۆرە ژیانێکە! ئەوانە بۆچی بۆ من دەگرین، با بۆ خۆیان بگرین لە چ ژیانێکدان!

هەموو شتێک پەیوەستی جەستەکەم بێت، من فەرامۆشم دەکـرد، تەنـانەت کەس و کار، خێزانەکەم دەبینی لەلای سەری جەسـتەمەوە قورئـانی دەخوێنـد و دەپـاڕایەوە کە خوای گەورە ڕزگارم بکات!

زۆر بەلامەوە سەیربوو، باشە خۆمن قووتار بووم!!

مناڵێـک یـاریەکی سـادەی کـۆنی هەیە، تـۆ یـاریەکی نـوێی زۆر جـوان و سـەرنج ڕاکێشی بۆ دێنیت، کۆنەکە فەرامۆش دەکـات، ئـێمەش لە دوای مـردن، دوای جەسـتە کۆنەکەمان ناکەوین و فەرامۆشی دەکەین.

دەچیتە دونیایەکی تەواو جیاواز لە دونیـای فیزکـی و، دەچیـتە قۆنـاغێکی ئەوەنـدە نوێ و پێشکەوتوو، کە هەرگیز بیری ئێرەت نامێنێت.

ئەو کەس و شـتانەی لە دونیـادا، لە پێشـەوەی گرنگـی پێـدانەکانی تـۆن، لەوێ ڕیزبەندیەکە دەگۆڕێت، گرنگی زۆر لە پێشینەت بۆ دێتەپێش کە لە دونیادا نەتبینیوە.

شتە نوێیەکانی ئەوێ زۆر جێگەی سەرنجن.

لەویٚ تەنها بەدەست لێدان و، لەمس کردنی میوەیەک تام و بـۆنە سەرسـوڕهێنەکەی دەگاتە تۆ.

ڕووناکی و نوریٚ دونیا تاریکە لە چاو نوری ئەوێـدا، ئەو نـور و ڕوونـاکیەی ئەویٚ، گەرمیەکی نیە هەتا ئازار و نیگەرانت بکات.

ئاگری دونیاش لە چاو دۆزەخی ئەویٚ ئاگرێکی ساردە.

وادابنـێ تـۆ لە وەرزی زسـتاندایت، ڕێگـاش قەرەبـاڵغیەکی زۆری ئۆتۆمبیلەکـانی تیابێت، کەش و هەوا و ئاسمان، تەپ و تۆز خنکێنەر بێت.

هەتا ئەوەی دەوڵەت بڕیـار بـدات کە چـوونە دەرەوە قەدەغەیە و، کەش و هەوا زۆر خراپ و کارەساتبارە، هەتا... ئەوەی بچیتە سـەرقەڵاو تـاوەرێکی بەرز و بـۆ خـوارەوە مەترێک نەبینی، ئەوەندە گێژەڵۆکە و خۆڵ بارین بێت.

وادابنێ گەردەلولێـک دێـت و هەمـوو تەپ و تـۆز و خـۆڵ و نـاجۆریەکی کەش و هەوا دور دەخاتەوە و پاکی دەکاتەوە و، بارانێکی نەرم دەبارێـت و سروشـت و چیـا و دار و درەخت لە جوانترین شێوەدا خۆی پیشان دەدات.

وەرز ببێتە وەرزی بەهارێکی زۆر شین پۆش و، سروەی فێنـک و دەنگـی بولبـول و نەغمەی جوان و هاژەی ئاوێکی سازگار.

ئەو کات دەبینی درەخت و گوڵەکان بە ئاشکرا پیٚ دەکەنـن و جـوانترین و سـازگار ترین کەش دروست دەکەن، جوانترین و نایابترین شـوێنی دونیـا لە ڕوی سروشـتەوە، لە چاو ئەوێی بەهەشتی بەرزەخدا ناخۆشترین و ناسازترین شوێنە.

کـاتیٚ خێـزانەکەم قورئـانی دەخوێنـد لەلام، هەسـتم دەکـرد نورێـک چـوار دەوری دەگرتم، ئارامی و هێمنیەکی بیٚ وێنە دایدەپۆشیم، زۆر زۆر باش بـووم، ئەو قورئـان و نزایانە بوون بە وزەی ئیجابی و بەدوای یەکـدا دەهـاتن، کە وای لەمـن کـرد گەڕانەوەم لەلا ئاسایی بێت و، زانیم کە هێشتا کاتی مردنم نەهاتووە.

ئەو قورئان و نزایانەی کە بۆ کەسێکی دەخوێنیت، کە کەسەکە مردبێت یاخود لەسەر ڕێگای مردن بێت، وەک خواردنێک دەیبینم، کە دەگاتە منداڵێکی کۆرپەی ناو سکی دایک لە ڕێگەی وێلاشەوە!

ئەو خواردنە بەختەوەری دەکات، گەورەی دەکات، گەشەی زیاد دەکات.

وورده ورده بۆت ڕوون دەبێتەوە کە نزا و قورئانێک کە بە نیەتی تۆ دەخوێنرێت، پێت دەگات و دەشزانی کێ بە دیاری پێشکەشی کردویت.

خێزانم بە خاڵێکی خۆی وتبوو کە نزام بۆ بکات، ئەو خاڵەی باوەڕدارێکی بە تەقوای خواپەرستە.

ئەویش بۆ شەوەکەی هەتا بەیانی قورئان و نزای تایبەتی بۆ خوێندبووم، لە خوای گەورە پاڕابوویەوە کە ڕزگارم ببێت، من لەوێ هەستم کرد کە یەکێک زۆر زۆرم بۆ دەنێرێت، نزام بۆ دەکات، من لەوێ دەگریام و دەموت: تۆ بڵێیت ئەگەر من بگەڕێمەوە بۆ دونیا، ئا بەو جۆرە قورئان خوێن و دیندارێکی باشم لێ دەربچێت.

ئاواتم بەوە دەخواست، چونکە ئەوەی لەوەوە پێم دەگەیشت زۆر شادی هێنەر بوو، دەبێت خۆی چ گەنجینەیەکی نەبڕاوەی دەست بکەوێت.

لەهەمان کاتیشدا دەشترسام لە گەڕانەوە بۆ دونیایەک کە پڕە لە جەنجاڵی و دونیا ویستی و، گوناه و تاوان و بێ ئاگایی و داهاتوویەکی ون کە نازانم چۆن کۆتاییم پێ دێت.

من بەو ئەزموونەی خۆم بۆم دەرکەوت، کە ئێمە لە دونیادا دەژین، لە خەون و خەیاڵێکی دوردا دەژین.

کە گەیشتینە ئەو دونیا ئینجا بە ئاگا دێنیتەوە.

ئەزموونی ئەوەم کرد کە ژیان لەو دونیا دەست پێ دەکات.

تۆ لێرە ملیۆنێک دۆلار دەدەیت بە باشترین و خێراترین ئۆتۆمبیل، کە دونیایەک مەترسی و کۆن بوون و، پەک کەوتنی لەپێشدایە.

لەو دونیا فڕین و ڕێ کردن لەسەرو خێرایی تیشکەوە بێت و هیچ خەرجی و مەترسی و لەدەست دانێک لە ئارادا نەبێت.

ئەبێ چ بەختەوەریەکی نەبڕاوە بێت!

ئێمە لە دونیادا، وەک ماسیەکی گەورەین کە لە دەفرێک نرابێت و سەری لەناو ئاو و کلک و جەستەی لە دەرەوەی دەفر و ئاوەکەوە بێت، ئێمە بەو جۆرەین لە چاو ژیانی هەمیشەیی ئەوێ.

من ئەزموونی ئەوەم کرد کە لە دونیادا خەوتوین و لە ئاخیرەت بەخەبەر دێین.

فەرموودەی حەزرەتی موحەممەد ﷺ کە دەفەرموێت: "الناس نيام إذا ماتوا إنتبهوا".

"ئەم فەرموودەیە پێشکەشکاری بەرنامەکە 'عەباسی مەوزون' پێی وت، ئەو نەیبیستبوو، لە پێشترا هیچی، دەربارەی نزیکبوونەوە لە مردن نەبیستبوو".

*کە گەڕامەوە بۆ ناو جەستەکەم، زۆر بە وردی ئاگادارم کە چۆن بوو!

زۆر پڕ ئازار بوو، وا هەستم دەکرد ئەندامەکانی جەستەم لەتاو ئازار لەیەکتر دەترازێن.

ئەوەندە نا ئارام بووم، دەترسام لە چوونەوە ناو جەستەکەم و دەمویست بگەڕێمەوە بۆ سەروی ئاسمانەکان.

بەڵام تازە ئەو کارە مەحاڵ بوو، چونکە کاتی نەهاتبوو.

کەس و کارم زۆر دڵ خۆش بوون بە گەڕانەوەم، بەڵام من لەو ساتەیا زۆر خەمبار بووم، لە جیهانی هەمیشە جوان دابڕام و کەوتمەوە دونیای تاقی کردنەوە.

تەنها ئومێدێک منداڵەکانم و خێزانم بوو کە منی گل خواردوی جیهانی خوارەوەی دونیا کرد، ئەگینا تاقەت پڕوکێنە بگەڕێیتەوە دونیای پڕ لە ئازار.

دەســتەواژەیەکم زۆر دەوتەوە 'یــاذالجلال و الأکــرام'، دەتــوت پــێم دەڵێــت زۆر بیڵێرەوە.

کە چاک بوومەوە ڕۆشتم بۆ چیایەکی زۆر بەرز، کە هەرگیـز نەمیبینـی بـوو، بەڵام هەمان شوێن لەکـاتی بـێ هۆشـیەکەمدا بینـیم، کاتێـک سـەرکەوتم بـۆ ئاسـمان، ئەو چیایەم بە هەموو جوانی و وردەکاریەکانیەوە بینی.

تیمی شاخڕەوی، کە مـن لەگەڵیـان سـەردەکەوتم، پرسـیان: بـۆچی ئەوەنـدە وێـنە دەگرم؟!

وتم: بۆ ئەوەی لە بەرامـبەر وێنەکـانی نـاخی خۆمـدا دایـانبنێم، کـاتێ لە گەشـتی نزیکبوونەوە لە مردن ئێرەم بۆ یەکەم جار بینی.

## دیمەنی سەرەتای دروستبوونی گەردوونم بینی



'مەریەم جەعفەری' لەدایک بـووی سـاڵی (١٩٧٩)ی زایـنـیە و، شـووی کـردوە و، ماستەری هەیە لە شانۆ- زانکۆی تاران، ئەزموونەکەی بەم جۆرە بوو.

مانگی دووی (٢٠٠٣)، پێش ئەم بەرواره بوو بەماوەیەک، نـامەم بـۆ :حەق تعـالی 'جل جلاله' دەنوسی.

لە هەموو نامەکاندا عیشقی ئیلاهی دەیسوتاندم.

دەموت: فیدات بم خودایە

شەو و ڕۆژ من خەریکی ئەو نامانە دەبووم، ئەو نامانەم هەرگیز پیشانی کەسـی تـر نەداوە و، لە دوایشدا لەناوم دان.

وام دەبینی و هەروەها پێشیان وتم: کە ئەو نامانە هی بڵاو کردنەوە نین، ئەوەیە کە پەیوەندیت بە خوداوە بەهێز دەکات، پێویست ناکات خەڵکی ئاگادار بکەیت.

لە سەرەتادا من دەمویست بگەمە عیشقی خوایی و دونیا بەجێ بهێڵم، نەیشم دەزانی بەرهەم و سەمەرەی ئەم کارەی من چی دەبێت؟!

لە سەرەتای تاقیکردنەوەکانی کۆرسی کۆتایی قۆناغی ماستەردا بوو، کە هەفتەیەکم مابوو بۆ تاقی کردنەوەکان، هەواڵی کۆچی دوایی هاوڕێکەمم پێ گەیشت.

بە بیستنی هەواڵەکە هەموو جەستەم کەوتە لەرزین.

کاتێك گەڕامەوە ماڵەوە حاڵم زۆر خراپ بوو، دایکم ئەو هاوڕێیەمی دەناسی، هەواڵەکەم پێ دا، دڵی دامەوە و زۆر کاریگەر نەبوو وەک من، بەڵام من هەموو گیان و جەستەم کەوتە ژانێکی ئەو تۆ، وەک ئەوەی سوتابێتم وابوو.

دەموت: خودایە بۆچی ئەوە ڕوی دا؟

وتەی خراپ و کوفر و ناشایستە بەرامبەر خوا دەهاتە مێشکم و حاڵم خراپتر بوو.

من ئەو کاتە تەمەنم بیست و چوار ساڵان بوو، بەناو ساڵۆنی ماڵەکەماندا دەهاتم و دەچووم و ئارامم لێ بڕابوو، هاوڕێکەم کەسێکی زۆر بەهێز و کاریگەر بوو، یەکێک بوو لە خوێندکارە زیرەک و وریا و چالاکەکانی زانکۆ.

حەوت کاژێر دەهاتم و دەچووم و، وتووێژم لە خزمەت خوادا دەکرد، بۆچی ئەمە ڕوویدا، لە کاتێکدا من لە ماڵێکی عیرفانیدا دەژیم.

هاوڕێکانم دەیانوت: ماڵی ئێوە شوێنی دڵئارامی و هێمنیە.

منیش دەگریام موناجاتی پرسە داری ئیمام ڕەزام بەزمانی ئازەری دەخستە سەر و بەکاسێت گوێم لێ دەگرت.

من دایکم و باوکم ئازەرین و، زۆر چێژی مەعنەویم لە موناجات و ئاوازە ئیمانیەکان دەبینی.

هەستم دەکرد ئاگرێک لە چواردەورم نزیک دەبێتەوە.

وەک ئەوەی نامەکـانم بێـت لە خـزمەت حەق تعـالادا و بە عیشـقی خـۆی بمسوتێنێت.

نازانم لەو کاتەدا بۆچی ئەوە ڕووی دا؟!

مـن بەردەوام دەگریـام و موناجـاتم دەکـرد، سـەعات یەک و نیـوی نیـوەڕۆ بـوو گەڕامەوە مـاڵەوە و، حەوت کـاژێر بەو جـۆرە بەردەوام بـووم، دوای ئەوە توشـی داهێزران و ماندوو بوون بووم و کەوتم بە زەویـدا، دڵـم هـات بەیەکـدا و بـێ هـۆش کەوتم.

وام هەست کرد دەرزیەک لە مێشکی سەرم درا، وەک ئاوێکی خەسـت بـوو، بەنـاو هەمـوو ئەنـدامەکانی جەسـتەمدا ڕۆشـت و پـاکی کـردمەوە، لافاوێـک بکەوێـتە نـاو شیوێک و پاکی بکاتەوە.

ئیـتر هەسـتامەوە و دانیشـتم، هەسـتم بە شـنەیەکی زۆر فێنـک کـرد، پەنجەرەکـان داخرابوون، بەڵام نەسیمێکی زۆر فێنک و خۆش دەهات، شنەیەک کە دەبینرا.

زۆر شادی هێنەربوو، دەموت من چۆن ئەمە دەبینم لە کاتێکـدا مـردوم، نەمـدەزانی ڕۆحم ئەم حاڵەتە دەبینێت هێشتا ئیدراکی ئەوەم نەکردبوو.

پەردەکان لادران و نورێکی زۆر جوان و سەیر لە ناوەندی پەردەکانەوە هات.

بە تەواوی دیوار و بەربەستەکان نەمـان، نـورێکی سـپی و زەرد دروسـت بـوو، زۆر جوان بوو، هەرگیز لە دونیادا لەو ڕەنگ و ڕوناکیەم نەبینیـوە، ئەو نـورە لەگەڵـم دەدوا، مانا دەهات و دەبوو بە دەنگ لە ڕۆحمدا.

پێی وتم:• دەتەوێت بتبەین بۆ لای خۆمان!

وتم: بڵێ بمبەن، لەم دونیا ڕزگارم بکەن.

ئیتر ڕاکێشرام بۆ سەرەوە.

باوکم دەبینی دەگریا بۆمن کە مردبـووم، هەسـتم بە وشـەی ‘نـا‘ دەکـرد لە قـوڵایی خۆمدا.

ئیتر زۆر بە هێمنی هێنرامەوە بۆ دونیا، زۆررر بە لـوتفەوە تەسـلیمی نـاو جەسـتەکەم کرامەوە.

هەستم بە بوونی پێکەنین و دڵخۆشی باڵا دەکرد.

وتم: خودایە بمبەخشە! کەسەکانم زۆر بێ تاقەت و پەژارەی حـاڵی مـنن، نـاتوانم ئێستا بـێمە خزمەتـت، چەنـدین ڕێگـای مردنـی خـۆمم بـۆ پێشـنیار کـرا، یەکێکیـانم هەڵبژارد، بەڵام هەموویم بیر چوویەوە.

وەک گوڵێـک بـوو کە پەڕەکـانی لە دەسـت دەدات و ڕووت دەبێـتەوە لەژیـان، ئەو جۆرە مردنەم پێ باش بوو.

دەموت: یارەبی دەمەوێت لە ڕێگەی تۆدا بمرم، جۆری هەڵبژاردنەکەشم بیر بـرایەوە ”ئەو جۆرە کە من هەڵمدەبژارد، هەر ئەوەش بوو بڕیاری لەسەر درابوو“.

پێم وترا لە دوای دایکم و باوکم دەمرم، هەتا مەرگی من ئازاریان نەدات، ئەم نهێنـیە ماوەیەکی زۆر هەڵم گرت و باسم نەکرد.

دوو فریشتە هـاتن بـۆلام، شـتێکیان پـێ بـوو وەکـو سـوراحی بـو، بەڵام لە نـوور دروست کرابوو، هاتن و لەلای جەستەکەم ڕاوەستان، ئەو نورەیان کرد بەسەری منـدا، دوو فریشتەکە وەک منداڵ بوون، باڵیان هەبوو، ئەو نورە وەک ئاو ڕژاندیان بەسـەرمدا و من چاوەکانم داخست.

کە سەرم بەرز کردەوە، دەتوت نورەکە لە منەوە دەچێتە دەرەوە، خوشکەکەم هەسـتی بەوەکرد و وتی: چەندە جوان بوویت، ئەوە لوتفی خوایی بوو لەگەڵ من.

سەرم بەرز کردەوە و وتم: سەر لەنوێ لەدایک بوومەوە خوای گەورە ژیانێکی نـوێ و جیاوازی پێ بەخشیمەوە.

ئاوی ژیانی ڕژاندەوە بەسەرمدا.

هەتا بانگی ئێوارە سوجدەم دەبرد بۆ خوای گەورە و سەنا و ستایشی خودام دەکرد.

خودایە تۆ چەندە گەورە و میهرەبانیت!

بەشێک لەو نورە لە سوچێکی ماڵەکمدا مایەوە، زۆر قوڵ و پڕمانا بوو، توشی دڵخۆشیەکی کردم لەوەسف کردن نایەت، خوشکەکەشم بەشێک لەو نورەی بینی و دەگریا و پێی وتم: بۆ هیچ کەسێکی باس مەکە!

ئەو شەوە نانم بۆ نەخورا، دوای ئەوە بە تەواوی حاڵم گۆڕا، وەک ئەوەبوو هاوڕێکەم چل ساڵ بێت کۆچی دوایی کردبێت و لەبیرم کردبێت!!

چل ساڵ تەمەنم زیادی کردبێت و هێمن و ئارامم گرتبێت.

هەندێ جار ئەو نور و ڕوناکیەم دەبینی یەوە، هەتا داوام لە خوای گەورە کرد ئەو حاڵەتەم نەمێنێت و ئاسایی ببمەوە، چونکە ئەو شەوق و ئیشتیاقە ئاگری تێ بەردەدام و لە دونیای دەکردم و بەرگەیم نەدەگرت،

دەموت وا دڵم دەسوتێت ئاوم بۆ بێنن، هەستم بە تینوێتیەکی زۆر زۆر دەکرد، هۆنراوەم دەربارەی دەنوسی، باسی ئەو مردنەم دەکرد کە بینیم، حاڵەتێکی عیرفانی و تەصەوفی زۆر خۆش و سەیر دایدەگرتم.

تەنانەت تەواوی باڵندە و گیانداران منیان خۆش دەویست، باڵندە دەهاتنە ژورەکەم و نەدەترسان و هات و چۆیان دەکرد.

تووشی 'کۆرۆنا' بووم، وامزانی ئەنفلۆنزایە سێ ڕۆژ ئاوی خۆراکیم وەرگرت و لە دوایدا گەڕامەوە بۆ ماڵەوە.

ڕۆژێ تا دایدەگرتم و ڕۆژی دواتر لەش سوک دەبووم، لە ڕۆژی شەشەمدا تەندروستیم زۆر خراپ بوو.

وتم: ئەمشەو دەچم بۆلای دایکم، ڕۆژی چوارشەممە بوو، بە بەڕێوبەری کارەکەم وت کە نایەم بۆ دەوام.

دوای ئەوە زانیم کە توشی 'کۆرۆنا بووم.

نەمزانی بوو لە (٧٠٪)ی سیەکانم توشی بووبوون، هیچ کۆکەیەکم نەبوو، دەرمانەکانم خواردوو پلەی گەرمی جەستەشم دابەزی و حاڵم باش بوو، من و هاوسەرەکەم و خوشکەکەم و مناڵەکانی ڕۆشتین بۆ شیمالی ئێران، هەستم بە بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی جەستەم دەکرد، کۆکەیەکی توندم بۆ دروست بوو، لەرز و تایەکی بەهێز، لەتاو هەناسە توندی و ئازار هەناسەم بۆ نەدەدرا.

بۆ بەیانیەکەی ڕۆشتین بۆلای پزیشک، تیشکمان گرت، من و هاوسەرم کۆرۆنامان گرتبوو، بەڵام من حاڵم خراپ بوو، (٧٠٪) سیەکانمی گرتبویەوە. هاوسەرم تەنها تای هەبوو، بۆ بەیانیەکەی بە خێرایی گەڕاینەوە بۆ تاران.

با دوو مانگ بچینە دواوە، پێش ئەوە من پەیوەندیم کرد بە بەرنامەی 'نزیکبوونەوە لە مردن' لە تەلەفزیۆن و، ڤیدیۆ و تۆماری دەنگیم نارد و، دەموت: خودایە لێم خۆش بە، مرۆڤ زۆر زوو نیعمەتەکانی بیر دەچێتەوە، ١٧ ساڵ تێپەڕی بوو بەسەر ئەزموونی پێشومدا، کە سەفەرمان کرد بۆ ڕامسەر و شیمال، شەوەکەی دەپاڕامەوە لە خوای گەورە کە لێم خۆش بێت و دەگریام و داوای لێ بوردنم دەکرد لە خوای گەورە، ئەو شەوە دڵم پێی دەوتم: کە جارێکی تر ئەزموونەکە دەبینمەوە.

منیش قبوڵم کرد، هەرچی لەلای خۆشەویستەوە بێت خۆشەویستە، خودایە تۆ چەندە بە لوتفیت لەگەڵ بەندەکانت.

هەموو هەڵەکانی ژیانم دەهاتەوە پێش چاوانم،

ئەو شەوە زۆر گریام، گەڕاینەوە تاران، مێردەکەم وتی: با بتبەم بۆلای پزیشک، وتم: جارێ بوەستە هەتا وەسیەت دەنوسم.

"هەردوو ئەزموونەکە بەیەکەوە دەگێڕێتەوە، کاتێک کە گەڕایەوە" من کەغەزێکی سپیم بە دەستەوە گرتبوو، دەمزانی ئەزموونەکە دەبینمەوە، ناوی دایکم و باوکم و خوشکەکەمم بەشاهید نوسی، بە مێردەکەمم وت: ئەگەر ئەمشەو مردم با واژو لەسەر ئەم وەسیەتە بکەن و بە فەرمی بیناسن.

ئەگەر نەشمردم پیشانیان مەدەن.

من ئامادەی نورەکە بووم لەگەڵی بڕۆم.

ئەوە بوو ئیسعاف هات و بردمی.

لە نەخۆشخانەکە کارە ڕۆتینیەکانیان بۆ کردین و تیشك و پشکنین هەموویان بۆ کردین، دوای ئەوە هەناسەم بە تەواوی توند بوو، وام زانی مردنە، وتم: "أشهد أن لا إله إلا الله..." هەناسەم بۆ گەڕایەوە.

وتم: نا هێشتا مردن نەهاتووە، توشی کۆکەیەکی قورس و گران بووم، هەتا بێ هۆش کەوتم، وامزانی ئەمەیان مردنە.

شایەتومانم هێنا و چاوەکانم نابەیەکدا، دوای ئەوە ئامێری هەناسەدانیان بۆ دانابووم.

بۆ بەیانیەکەی بە مێردەکەم وت: تۆ بڕۆ بۆ ماڵەوە پشوو بدە و بێ خەم بە، حاڵی مێردەکەشم خراپ بوو، من وام پیشان دا کە حاڵم باشە، هەتا ئەو بڕواتەوە و بخەوێت.

دوای ئەو کۆکەیەکی زۆرم بۆهات، خوێنی لەگەڵدا بوو، ئەوە جاری سێهەم بوو وتم: ئەمەیان کۆتاییە و شایەتومانم هێناو وتم: خودایە وەرم بگرە و قبوڵم بکە، ئیتر دونیا لە پێش چاوانم ڕەش بوو، بە تەواوی ڕەش بوو، هەرگیز ڕەشی بەو جۆرەم نەبینیوە لە ژیانی دونیادا، ئەم جارەیان گەشتەکەم بۆ خزمەتی خوای گەورەیە، لە

ڕێگەی نورێکەوە بوو بە ڕەنگــی ڕەش. نــورێکی ســاردی ڕەش بــوو، دەمـوت ئەمەش نورە لە جۆرێکی تر.

﴿اللَّهُ نُورُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ...﴾ (النور: ٣٥)

تەنها ڕووناکی نورنیە، تاریکی نوتەکیش نورە.

ئینجا خوای گەورە نورێکی تر لە نورەکانی خۆی پیشان دام.

کاتێ لە شەوێکی تاریکی نوتەکدا، هیچ ئەستێرەیەکیش لە ئاسـمان نەبینیـت، بەڵام لەو تاریکیەدا بە باشترین شێوە بیبینیت، هەست بە بونی نـورێکی ئاشـکرا دەکەیـت لە دڵی ئەو تاریکستانەدا.

ئاستەمە وەسـفی ئەوە بکرێـت، تـاریکیەکە نـور بـوو، بیروهۆشـی مـادی دونیـایی ناتوانێت وێنای بکات.

مەحاڵە نیە ئەم ئەزمونە لە کارخانەی مێشـک و مـادە و فیـزکەوە سـەر دەربێنێـت، نــورێکی تاریـک و نــوتەک هەرگیــز بە زیهنیەتــی مـادی نابینرێـت، کەی دەمــاغ لەم ئاسمانەی بینیوە!

مێشک و دەماغ ئەم ئەزموونەی نەبینیوە هەتا دوبارەی بکـاتەوە، هەرگیـزا و هەرگیـز ڕژێنەکانی مێشک و فیزیک ئەم جیهانە نەبینراوە بەرهەم ناهێنن.

وتم: خودایە من ڕازیم بە جۆرێکی مردن کە هەڵبژاردەی لای تۆیە.

کە هۆشم هاتەوە پێم ناخۆش بوو، چونکە مـن چـاوەڕوانی نـوری ئیلاهـیم دەکـرد هەتا بە خزمەتی بگەم.

بەڵام خوای گەورە جۆرێکی تر لە نوری پیشان دام.

دوای ئەوە گەشتێکم پێ کرا، حەق تەعالا دروسـت بـوونی گەردونـی پیشـان دام، دروست بوونی بەردێک وەک گیایەک گەشـەی دەکـرد، پەتـاتەیەک چـۆن دڕ بەگـڵ و بەرد دەدات و سەردەردێنێت! بەردەکانیش لە دڵی یەکترەوە دەردەهاتن.

نموونەیەک بوو لە قودرەتی خوایی، کە چۆن دروست کردن بە ئاسانی بەدی دێنێت، وەک گوڵێک چۆن دەپشکوێت.

هەر وەکو ئەوەی ئەوە سەرەتای خەلق و دروست کردن بوویێت و من بینیبێتم!

ئەو کارخانەی دروستکردنە زۆر ترسێنەر و گەورە و مەدهۆش کەر بوو، ببینە چیایەک لە چیایەکی تر ببێت.

ئەگەر بتەوێت، بینین و زیهینیەت وەک تەلەسکۆب نزیکیت بۆ دروست دەکات، دەشتوانیت دوریکەویتەوە بەبێ ئەوەی خۆت دوربخەیتەوە.

خوای گەورە بردمی بۆ شوێنێکی تر، لە خزمەتی خوای باڵادەستا بووم و هیچ ترس و خەمێکم نەبوو، زۆر سەرسوڕهێنەر بوو، شوێنەکەش شوێنی گەشەی بەرد و چیاکان بوو، بەردەکان گەرم بوون، دەتوانەوە و قاڵبیان دەگرت، زۆر نزیک بوومەوە لێیان، ئاوەکە دەکوڵا.

پێم وترا: دەتەوێت لێرە بمریت؟

وتم: نانا... نامەوێت لێرە بمرم.

وتیان: دەتەوێت لەناو گەرمی بورکانەکاندا بمریت.

وتم: بەهیچ جۆرێک نامەوێت لەسەر زەوی بمرم!! بەڵام خۆبەدەستی من نیە.

لە گەشەکردنی گیاو، ڕەگی درەختە زەبەلاحەکاندا، لە ناو دڵی بەردە گەورەکان، دیمەنێکی ترسناکی هەبوو، نەمدەویست لەوێدا بمرم، دەترسام ئەو ڕەگانە هێرشم بۆ بێنن و بئاڵێن بە مل و جەستەمدا.

ڕۆشتمە زەویەکی شەق بردووی بیابان.

ئیتر گەڕامەوە بۆ دونیا، چەندین جار بەو جۆرە، بە کارەبا دەگەڕامەوە و دەمردمەوە.

دایکم و خوشکەکەم دەیانکێشا بە سەریاندا و دەگریان و هاواریان دەکرد لە قاوشەکەدا.

پزیشکەکان بە دایکمیان وتبوو کچەکەتـان توشـی سـەکتەی مێشـک بـووە، ڕەنـگە بگەڕێتەوە و، ڕەنگە بیشمرێت.

بڕۆن لەماڵەوە نزای بۆ بکەن.

لە ماڵەوە هەموو خێزانەکەمان قورئانیان دەخوێند، باوکم و ئەهلی مـزگەوت نزایـان بۆ دەکردم.

سێ ڕۆژ لە بێ هۆشیدا مامەوە و، کاژێر (٥:٠٠) خولەك بوو، سومەیەی خوشـکم لەلای سەرمەوە قورئانی بەسەردا دەخوێندم، هەموویان نزایـان بـۆ دەکـردم، دوای ئەوە چاوەکانم کردەوە و گەڕامەوە.

پێتان دەڵێم: " موتوا قبل أن تموتوا"، بمرن پێش ئەوەی بمرن، بیر لە مردن بـکەنەوە، ئاگات لە قیامەت بێت، پێش ئەوەی بگەنە ئەوێ.

با ژیانی دونیا بکەینە ڕێگایەکی نزیـک و ڕێـک و پـڕ لە داهـات بـۆ هەتـا هەتـایی قیامەت....

## لەو دونیا بە ئاگا هاتمەوە



بەهارە حوسەینی، ئافرەتێکی ئێرانیە و ئەزموونەکەی بەم جـۆرە دەگێـڕێتەوە، سـاڵی (٢٠٠٩)ی زاینی بوو، من نەخۆشی دڵم هەبوو، هەمـوو ڕۆژێـک دەبـوو حەبـی ژێـر زمان بخۆم.

گرێیەکی شێرپەنجەم هەبـوو، کە پێیـان دەوتـم دەبێـت نەشـتەرگەری بـۆ بکەیـت، دەبوو دەربهێنرێت و ببرێت بۆ پشکنین.

دوای نەشتەرگەریەکە وازم لە حەبی دڵەکەم هێناو پرسیشم بە پزیشکی تایبەتی دڵ نەکرد.

شەوێکیان ڕۆشتم نوستم، کچەکەم و مێردەکەم خەوتبون، ویستم بچم بخەوم، دەست بەجێ لە جەستەم ڕۆشتمە دەرەوە، گەیشتمە سەقفیماڵەکەمان، مێردەکەم و مناڵەکانم دەبینی بیرم لەوە دەکردەوە کە خۆم بگەیەنمەوە ناو جەستەکەم، وەک ئەوەی یەکێک بیەوێت بە زۆر کەسێک لە خەو هەستێنێت.

جەستەم کەوتبوو، چاوەکانم داخرابوون، لە ڕێگەی دەمەوە گەڕامەوە بۆ ناو جەستەکەم، ترسام و هەستم بە شتێکی زۆر جیاواز کرد کە لە مندا ڕوویدا!

ڕۆشتم ئاوم خواردەوە و دیسان گەڕامەوە سەر جێگاکە بخەوم، هەمدیسان لە جەستەم جیابوومەوە و خۆم لە هۆڵەکەدا بینیەوە، دیسانەوە بەبێ هیچ بەربەستێک و زۆر بە ڕوونی مێردەکەم و مناڵەکەمم بینیەوە کە نوستبوون

ماڵەکانی ترم بینی کە لە شوقەکەماندا بوون.

پیاوێکم بینی لەسەر مێزەکەی دانیشتبوو شتی دەنوسی، 'بیرکردنەوەکەشم بینی'، بیری لە کاری کۆمپانیاکەی دەکردەوە و زۆر بێتاقەت بوو، هەست و نەستەکانیم دەبینی!

باڵەخانەکەمان پێنج قات بوو، هەموویم دەبینی و سەرسام بووبووم. بەبێ ویستی خۆم دەمبینین، خۆم حەزم نەدەکرد لە ماڵی خۆیاندا بەو جۆرە بیانبینم!

دەمەوێت ئەم ئەزموونەم بۆ کچەکەم بگێڕمەوە، هەموو ڕەهەند و سەرنجە وردەکانی بۆ باس بکەم، بەڵام وشە گەلێک دروست نەبووە کە تەعبیر لەو جیهانە بێ سنورە بکات.

لە هیچ زمان و ئەدەبیات و ڕۆشنبیریەکدا دەستەواژە و تەعبیرێک دەست ناکەوێت، مانا و جوانیەکانی ئەوێ بێرەی دونیا بگەیەنێت.

ماناکانی نور و عیشق و جوانی و هەتا هەتایی تەعبیر ناکرێن.

مـن وێنەکێشـم و زۆرێـک لە ڕەنگەکـان بەکـار دەهێـنم، هەرگیـز نـاتوانم وێـنەی جوانیەکانی تونەیلەکە بکێشم.

ساڵەهایەک هەوڵم دا.... بەهیچ چوو.

جەستەی ئەوێم زۆر سوکەڵە بوو، سەرچاوەی هەمـوو ڕەنگەکـان لەوێـوە هـاتووە، ڕەنگەکان ژیانێکی باڵا و زیندوویان هەیە، خەڵکی کە ئەم گەشتانە دەبیسـتن، نـاتوانن لەوە تێ بگەن کە ئەزموونداران چیان بینیوە.

ئەزموونەکـانیش مانایـان بـۆ نـاکرێتە ڕسـتە و، وشـە لای ئەزموونـدارەکانیش ون دەبیت، ڕستە ناتوانێت کەمەر بۆ ئەم گەشتە دروست بکات.

تـۆپێکی نـورانی لە دورەوە دەرکەوت و دەهـات و هەتـا زیـاتر نزیـک دەبـوویەوە گەورەتر دەردەکەوت، ڕووخۆشـی و بەختـەوەری پێـوە دەبیـنرا، بـۆ بەخێرهـاتنی مـن هاتبوو، هەتا پێشوازیم لێ بکات.

کە دەڵێم پێکەنین، بە لێوو ڕوخسار نا، بە جیاوازیەکی زۆر فراوانتر.

کاتێک هـات و هەسـتم بە نزیکبـوونەوەی خۆشەویسـتیەک کـرد کە زیـاتر بـوو لە هەزاران دایـك، هەزاران بـاوک، هێمنیەکـی کـاملم بینـی، هەسـتم کـرد بەوەی گەیشتومەوە بە ماڵ و نیشتیمانە ڕاستەقینەکەی خۆم.

لە قوڵایی بوونی خۆمەوە قەناعەتێکی زۆر گەورەم هەیە کە نیشتیمانی ڕاسـتەقینەی ئێمە لەوێیە.

ئەگەر لە دونیادا پاشا و سەرۆکی دەوڵەت بیت، خۆش ژیاوێکی وابیـت کە تەواوی چێژەکانی دونیا بۆ تۆ سانا بێت، هەست دەکەیت لە یاریەکی مناڵانەی زۆر نـزم زیـاتر نەبووە!

هەرگیز ڕووی باس کردن و گێڕانەوە و شانازی کردنی ئەوێی نیە.

که من گەڕامەوە لە ئەزموونەکەم زۆر سوپاسی خـوام کـرد کە لە ژیـانی ڕۆژانەمـدا لێپرسراوێتی هیچ کەسێکم لە ئەستۆدا نەبووە، چونکە لێپرسراوی بۆ ئەویَ زۆر پڕکێشـە و شەرمەزاریە.

شەرمەزاریەک دێنێتە ڕێگەت کە توانای ڕوبەڕو بونەوەیت نیە.

حزبایەتی و سیاسەت کـردن و لێپرسراوێتـی 'بەتـایبەتی' لەم سـەردەمەدا، هەرگیـز شانازی نیە بۆ ئەویَ.

شـەرمەزاریەک دێنێـت بەسـەر مرۆڤـدا، خـۆت وا دەبینیـت کە شایسـتەی بەیەکگەیشتنی خوای گەورەنیت، سەیری گوڵێکی پلاستیک بـکە و بەراوردی بـکە بە باخێکی گەورەی گوڵستان.

هەتا ئەو نورە زیاتر لە تۆوە نزیک بێتەوە، هەستی ئەوەت بۆ زیـاد دەبێـت کە لە زۆر زووەوە لە نامۆیی بونی دونیادا ژیاویت و دورە دەستی ئەم بەختەوەریە کراویت.

تۆ لەدوای ساڵانێکی زۆر لە زیندانی و بێ کەسـی بە دایـک و بـاوک و عەزیزانـت بگەیتەوە، چەندە دڵخۆش و شادمان دەبیت، هەزاران هەزار جار لەوە زیـاتر دڵخـۆش دەبیـت، هێشـتا دوای ئەوەش ئەو دڵخۆشـیە بارتەقـای ئەو ئەمـان و خۆشەویسـتییەی ئەویَ نیە.

کە نزیک بوومەوە وتم: وەک ئەوەیە کە من ئەم نـورە بناسـم، کە لە تەواوی ژیانمـدا لەگەڵم بووە .

لەگەڵ ئەو لەو تونەیلەکە سەرکەوتم بەرەو سەرەوە، لەو سەری تـونەیلەکە، نـورێکم بینی هەزاران جار درەوشاوەتر بوو لە خۆری ئاسمان، بەبێ ئازار و گەرمی.

ئەو نورەی لەگەڵم بو، ڕێـگەی پیشـان دەدام کـاتێ دەگەیشـت و، ئاگـادار بـوو بە هەموو هەستێک کە من هەمبـوو، لەبەر ئەوە پێـی وتـم: تـۆ دەگەیـت بەو نـورە، بەڵام دەبێت لە پێشدا بچین بۆ شوێنێکی تر، بە ڕوخۆشی و محبەتەوە دەدوا لەگەڵم.

لەناکاو، دیواری تونەیلەکە کرایەوە، ئاسمانێک دەرکەوت، وەک ئاسمانی دونیا بوو، شەفاف و ڕوون بوو، نە ئاو بوو نە شوشە و نە هەوا، شتێکم بینی وەک هەڵگەڕانەوەی لاپەڕە وابوو.

لە منداڵیمەوە ژیانم پیشان درایەوە هەتا کۆتایی ژیانم.

هەرچییەک لە ژیانی من و خێزانەکەمدا ڕوویان دابوو، بیرم لە هەرچییەک کردبوویەوە، هەموویم پیشان درایەوە.

بینیم کەمن لە نەخۆشخانەیەک لەدایک بووم و، پاسەوانێک لە ژوورێکدا بوو، باوکم بەو نیوەشەوە لە بەردەم نەخۆشخانەکە ڕاوەستابوو، لێپرسراوی پرسگەکە نەیدەهێڵا باوکم بچێتە ژوورەوە، لە کۆتاییدا ئەو بە باوکمی وت کە کچێکتان بووە، باوکم دڵی خۆش بوو، بەڵام ئەوەشم زانی کە باوکم حەزی دەکرد مناڵەکە کوڕبێت، لەوکاتەدا نمەنمە باران دەباری، بینیم باوکم سوژدەی شوکری برد بۆ خودا... داوای تەکسیشی کرد هەتا بچێتەوە بۆماڵەوە.

منێکی گوناهبار، بە کرداری خۆم شایستەی ئەو هەموو لوتفەی خوا نەبووم، ویستی من ئەوەبوو کە پیشان دانی کردارەکان تەواو ببێت و، بڕۆم بەرەو ئەو هێزی کێش کردنەی کە ئەو نورە خواییە پێی بەخشیم، نوری سەرەتا و کۆتا دەڵێم، کە وێنەی نیە، نەلە دونیا و نەلە تونەیلەکەدا و، نە ئەو نورەش کە لەگەڵتدایە دەگاتە ئەو نورە ڕەحمەتیە 'إنا لله و إنا إليه راجعون'.

ڕۆشتم بەلای یەکێک لە خزمەکانمدا، کە ئەو هێشتا لە ژیانی دونیادا ماوە، زۆر کەسێکی نالەبار و خراپە بۆ خێزانەکەی و دەوروبەری و خەڵکی بە گشتی، خۆی زۆر بە گەورە دەزانێت و لە هیچ کەسێک ڕازی نیە.

ئەو نورە پێی وتم: حەز دەکەیت بیبینیت؟.

لەبەرئەوەی من پەلەی ئەوەم بوو بگەم بە نورە گەورەکە، ویستی ئەوەم نەبـوو کە ئەو کەسە ببینم.

لە شریتی ژیانمدا ئەوەی تیابوو کە دەبێت ببینم!

ویستی نەبینینیم نەدەبووە بەربەست و دەبوو ببینم.

ئیـــتر ئەوەبـــوو مـــن لە ڕێـــگەی تـــونەیلەکەوە نەگەڕامەوە، بەڵکـــو یەک یەک بە ئاسمانەکاندا هـاتمەوە. ئاسـمانەکان زۆر زۆر جـوان و دڵـرفێن بـوو بـۆ مـن، بەڵام بە ئەندازەی تونەیلەکە جوان نەبـوو، خـۆر و مانـگ و ئەسـتێرەکانم لە نـزیکەوە دەبینـی، ئاسـمانەکان یەک بە یەکیـان، لەگەڵ هەمـوو ئەمـانە، نـورانی زۆر زۆرم دەبینـی، ئەو نورانیە جوان و گەورە و بەهێزانە پەیوەندیان بە زەوی و دونیای ئێمەوە هەبوو.

خەڵکـی سـەر زەوی ئەو نورانیـانە نـابینن، چـواردەوری زەویـان داوە و فەرمـان لە خوای گەورەوە وەردەگرن.

زەوی چەند دانەیەک لەم نورانیانە، بە شێوەی حەلقەی زیکـر چـواردەورەی زەویـان گرتوە و کاریان لە بازنەیی زەویدایە.

زۆر زۆر گەورەن، لە دوورەوە کە هـاتمەوە دیـار بـوون، زۆر زۆر جـوان بـوون، کە نزیک بوومەوە، لە نزیکەوە بینیمن، مرۆڤ بە چاوی دونیایی ناتوانێت بیانبینێت، زانـیم کە ئەم بینینە تایبەتە و بۆ هەموو خەڵکی نیە بە گشتی.

کاریان پارێزگاری و چاودێری زەوی یە.

لە دە دانە کەمتر بوون، ڕەنگە ژمارەکە زیاتر بووبێت و من نەمبینی بێت.

وەکو ئاڵتون دەبریسکانەوە، ڕەنگیان زەردێکی ئاڵتونی بوو.

وەک ئەو نورە بوون کە لەگەڵم بوو، زۆر زۆر زیرەک و هوشیار و بە ئیدراکن.

هەسـتم کـرد کە تەواوی ڕووداو و کـردار و نیەتەکـانی مـن و تەواوی خەڵکـی تۆمارکراوە لەلایەن ئەمانەوە.

هێز و توانایەکی زۆر بێ ئەندازەیان هەیە.

دوای ئەوە هاتمەوە بۆ ئەو ماڵەی کە پیاوەکەی تیابوو، کەسێکی خراپ بوو، ئەو پیاوەم بینی لە هۆڵەکەدا دانیشتبوو.

خێزانەکەی و باوکی و دایکی و کوڕەکەی لەولاتر دانیشتبوون.

ئەو پیاوە لە ڕواڵەتەدا گوێی لە وتەکانیان دەگرت، بەڵام ئەو پیاوە بیری لە شتێکی تر دەکردەوە، ئەو نورە پێی وتم: دەتەوێت بزانیت کەسایەتی و بیرکردنەوەی ئەم پیاوە چۆنە؟.

من خۆم پێم خۆش نەبوو، چونکە ئەم پیاوەم خۆش نەدەویست، بەڵام ویستەکە لە دەستی مندا نەبوو، وتم: باشە.

ئیتر من بە شێوەیەکی تەواوەتی بووم بە زیهن و فیکری ئەو کەسە.

ئەو پیاوە لە ڕواڵەتدا خۆبەزل زان و لوت بەرز بوو، بەڵام من ناوەوەی ئەو مرۆڤەم بینی و ئاشکرا بوو بۆم، ئەو هەستی بە بچووکی دەکرد، ئەو کەسە لە بچووک بوونەوەی خۆیدا ئاوا کاری خراپی دەکرد و، خۆی پێ گەورەبوو.

هەستی بە بێ نرخی و ئیرەیی و ناخ پیسی دەکرد، ئابلۆقەدرابوو بە دەردەکانی دەروون خراپی و بێئاگایی و تاوان.

من هەستم بە هەمووی دەکرد، زۆر خراپ گیرۆدە بوو بوو.

ئەوەم بینی کە ئەگەر من بوومایە و، ئەو هەمووە پەستانە دەروونییەم لەسەربوایە خراپتر مامەڵەم دەکرد!

من ڕۆشتمە ناو کەسایەتی ئەوەوە و، هەموو فیکر و خەیاڵ و شاراوەکانی دڵی لەلای من ئامادە بوو، لە پێش چاوانم بوو.

دڵم بۆی سوتا، مـن لەوەو پـێش ئەو کەسـەم خـۆش نەدەویسـت بەڵام لەو کـاتەدا ئاواتەخواز بووم بگەڕێمەوە بۆ خزمەتی خـوای تەعـالا و داوای لـێ بـکەم لەو کەسـە خۆشبێت.

دوای ئەوە من لە بونی ئەو کەسە دەرچـووم، لە کاتێکـدا لەنـاو کرۆکـی و نـاوەوەی ئەو مرۆڤەدا بووم، ئیتر پـێم وت: ئەوا مـن بە تەواوی بـوونی خـۆم لەتـۆ بـورام و لـێم بوریت لەسەر هەڵە و ناحەقیە زۆرەکانت.

من ئێستا لە جیـاتی ڕق ئەو مـرۆڤەم خـۆش دەوێـت، چـونکە بینـیم کە چەنـدە لە ناخەوە پڕ ئازار و نەخۆشیە.

ناوچاوانیم ماچ کرد.

ئەو نورانیەی کە لەگەڵم بوو، من ناوی دەبەم بە ڕێبەر و دەلیل، بـۆمن پـێ کەنـی و هەستم بە حاڵی ئەو کرد بەرامبەرم.

هەستم بە ئارامی و سەکینەت کرد، چـونکە ئەو مـرۆڤەم بەخشـی. ئیـتر دوای ئەوە سەرنەکەوتمەوە بۆ ئاسمان.

لەناکاو خۆم لە تونەیلەکەدا بینیەوە، ئیتر سوپاسی خـوای گەورەم کـرد، کە دەتـوانم گەشتەکەم بە خۆشحاڵیەوە تەواو بکەم، بەختەوەریەکی زۆر گەورەم بینی.

نورانیەکە هەستی بە بەختەوەریم کـرد، منـیش هەسـتم بەو کـرد، زۆر بەسـۆز بـوو لەگەڵم، کاتێک گەیشتمە کۆتایی ڕووناکیەکە گەیشـتمە سـەرەتای ڕۆشـتنە نـاو نـور و ڕوونـاکی گەورە، ئـا لەوێـدا یەکێـک پێـی وتـم: ڕابوەسـتە، چـونکە لەو کۆتـاییەدا خشـتەیەک هەبـوو، لەوێشـەوە بەرزاییـەک هەبـوو، لەو بەرزاییەوە دەیڕوانـی بەسـەر ناوچەیەکی بەرفراوانی هەرگیز نەبینراوی زۆر زۆر خۆشدا، من وەستام و نـورانیەکەش وەستا، مۆڵەتی چوونە خزمەتی نـوری گەورەم نەبـوو، دەمـوت بـۆچی ڕێـم نادرێـت بچمە خزمەتی، من گەیشتم!!

ئەو نورەی لەگەڵم بوو پێی وتم: بوەستە، ئەگەر ئەم سنورە ببەزێنیت، ئیتر ناتوانیت بگەڕێیتەوە بۆ ژیانی دونیات.

وتم: ئەوە زۆر جوانە و من ئەوەم دەوێت، نامەوێت بگەڕێمەوە بۆ دونیا، دەشمزانی منداڵ و مێرد و کەس و کارم بەجێ هێڵاوە، بەڵام هیچ نیگەرانی ئەوە نەبووم.

چونکە لەوێ زۆریی تامەزرۆیی و خۆشەویستی و بەختەوەری، بەشی بژاردە و ویستی گەڕانەوەت بۆ ناهێڵێتەوە.

هەموو کەس و کارێکی دونیات بیر دەباتەوە.

ئەوەش لە خۆپەرستی و خۆشەویستی خودەوە نیە، لەوێ ئەوەندە ئارامی و دڵنیایی هەیە، ئەو کەسەی لە دونیادا خاوەنی گەورەترین قوربانی بێت بۆ دەوروبەری، ناتوانێت دەست لەوێ هەڵبگرێ و، ویستی گەڕانەوەی دونیای بە دڵ قبوڵ بێت.

ڕوونتر بڵێم: نیگەرانی لەوێ دەگۆڕێت، ئەوەی ئێستا بیری لێ دەکەیتەوە، بۆ ئەوەی ئەوێت لێ تاڵ نەکات، بایەخی کەم دەکرێتەوە و لەبیرت نامێنێت، هەتا نەبێتە ئازاری ئەوێ، من لەوێ لەناو نور و، کەناری نور و، ناوەڕۆکی نوردا بووم، زۆر کەسم بینی پشتیان لەمن بوو، بەڵام دەمزانی ناویان چی یە، کەسایەتیان چۆنە، چەند ساڵ لە دونیادا ژیاون، چەند منداڵی هەبووە، ئایا کەسێکی باش بووە لە دونیادا، یاخود کەسێکی خراپ بووە، هەر ئەوەندەی سەیری یەکێکیانم بکردایە، بەبێ ئەوەی ڕووی لە منیش بێت، هەموو زانیاریەک لەسەر ژیانی بە کاملی لەلای من هەبوو، لەوێ دەموت: ئەوانەی پێش من هاتوون بۆ ئێرە، واتە پێشتر مردوون، زیاتریان بینیوە و زۆرتر شارەزا و، فراوانتر دەزانن، هەتا منێک کە درەنگتر هاتووم، بەڵام ئەوەی سەیر بوو، ئەوانیش لە فێربوونی زانیاری زیاتردا بوون و سەرقاڵی ئەوە بوون.

بەڵام نەمزانی چی بوو؟

یاخود پلە و مەقامی جیاوازی ئەوێ بوو.

نەنكم و پورمم لەوێ بینی كە دانیشتبوون و خۆش حاڵ بوون.

لە زووەوە چاوەڕوانی منیان دەكرد، زانیم كە پێیان وتراوە فڵانەكەس بەڕێوەیە بـۆ ئێـرە دێت، بچن بە پێشوازیەوە.

خەریكی شتێک بوون، وەک ئامادەكردنی شـیر بـوو، مـن بـاوەڕم نەكـرد بەوەی كە دەیبینم نەنک و پورمن!!

زۆر زۆر دڵخۆش و بەختەوەر بوون.

تەمەنی نەنكم سی ساڵ كەمتر بوو لەوەی كە لەدونیادا بینی بووم.

جوانترین جل و بەرگی لەبەردا بـوو، بەڵام هەسـتم بە خەمێـک كـرد لە نەنكمـدا و پێی وتم: 'بە زمانی كوردی وتی' مناڵێكی بچووكت هەیە لە دونیادا.

وتی: ئەو مناڵی هەیە، ئێستا كاتی ئەوە نیە.

كە نەنكم ئەوەی وت: هەستم بە بێ تاقەتیەكی مناڵانە كرد، بۆچی نەنكم جیـاوازی دەكات لە نێوان نەوەكانیدا؟!.

بۆچی واز لەمـن نـاهێنێ هەتـا لێـرە بمێـنمەوە، نـورانیەكەش بـۆ ئەوەی شـتێک لە نێوانماندا بڵێت، وتی: نارەحەت مەبە، نەنكت لەبەر كچەكەت ئەوەت پێ دەڵێت.

وتم: باشە خۆ كچەكەم حاڵی باشە.

فریشتەكە وتی: ئاخر ئەگەر لەو سنورە دەربچیت، ناتوانیت بگەڕێیتەوە بۆ دونیا.

وتم: هیچ گرفتێک نیە. دەمویست بڕۆم و نەگەڕێمەوە بۆ دونیا.

وتی: دەتەوێت داهاتووی كچەكەت ببینیت.

بە بێ ویستی من پەنجەرەیەک لە تونەیلەكە كرایەوە.

داهاتووی سارای كچمیان پیشان دام، بەڵام بە بێ مـن، یـاخود دوای مردنـی مـن، هەتا تەمەنی دەگەیشتە كچێكی پێگەیشتوو پیشانیان دام.

وتیان: ئەگەر نەگەڕێیتەوە، ئەوە داهاتووی كچەكەت دەبێت.

ئەو کاتە کچەکەم حەوت ساڵان بوو، زۆر جوان و خۆشەویست بوو، بینیم کە ژیانی کچەکەم چەندە پڕ کێشە و زەحمەت دەبێت.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا وتم: بەوەشەوە ڕازیم نەگەڕێمەوە بۆ دونیا.

وتم: کچەکەم خوا دەیپارێزێت، باوکی هەیە و کەس و کارم هەیە و چاویان لێی دەبێت.

بەڵام نەنکم و پورەکەم بەم بڕیارەی من بێ تاقەت بوون، نەیاندەویست من بگەمە بەرزەخ، لەبەر کچەکەم.

فریشتەکە وتی: دەتەوێت بزانیت، ئەگەر بگەڕێیتەوە بۆ دونیا، ژیانت لەگەڵ کچەکەت چۆن دەبێت و کچەکەشت چەندە لە کێشە گەورەکان دور دەبێت؟!

بە خەمبارییەکەوە وتم: بەڵێ.

بەڵام بەردەوام ئەوەم دوبارە دەکردەوە کە من نامەوێت بگەڕێمەوە بۆ دونیا.

فریشتەکە بە سۆز و خۆشەویستیەکەوە پێکەنی و، ژیانی داهاتووی کچەکەمی پیشان دام، بەو جۆرەی کە بگەڕێمەوە بۆ دونیا و لەگەڵ کچەکەم بم.

هەندێ ئاستەنگ دەهاتە ڕێگای، بەڵام هەزاران جار باشتر بوو لەوەی بەبێ من بێت!!

ئیتر قبوڵی گەڕانەوەم کرد بۆ دونیا، زۆریشم پێ ناخۆش بوو، وەک ئەوە بوو بەفراوێک بکەن بە سەرمدا.

وتیان: هەموو جوانی و بەختەوەریە بێ سنورەکەی ئێرە بەجێ بهێڵە و لە بیری خۆتی ببەرەوە، هەتا دوای چەندین ساڵی تر دەگەڕێتەوە بۆ ئێرە بە هەتا هەتایی.

بە بێ ئەوەی جارێکی تر بەجێ هێڵان و مردن ببینیت.

من ئیرەیم دەبرد بەوانەی لەوێ بوون و، ژیانی دونیایان بەجێ هێڵابوو گەیشتبوونە بەرزەخ.

وتم: بە مەرجێک پەیمانم پێ بدەن لە دوایدا بگەڕێمەوە بۆ ئێرە.

وتیان: بە تەواوی خۆشەویستی و لوتف و گەرم و گوڕیەوە دەگەڕێیتەوە بۆ ئێرە.

دوای ئەوە بە دڵنیاییەوە لەگەڵ فریشتەکە زۆر بە خێرایی گەڕێنرامەوە بۆ ناو جەستەکەم.

کە ڕۆشتمەوە جەستەکەشم، هێشتا فریشتەکەم دەبینی.

دڵنیایی پێ دەبەخشیم هەتا نەترسم.

فریشتەکان هەمیشە پاسەوانێکی ڕاستەقینەی ئێمەن.

من پێش ئەوەی ئەو سەفەرە ڕۆحیە بکەم بۆ بەرزەخ، گڵۆپەکانی ژوری نوستنەکەم هەڵکردبوو، ڕۆشن بوو، بەڵام کە ئەو فریشتە لە سوچی سەقفی ژورەکە وەستابوو، ئەوەندە زیاتر نورانی و ڕۆشن بوو، دەتوت ژورەکە تاریکە و هیچ ڕووناکیەکی تێدا نیە. نوری ئەو نوری ژورەکەی خامۆش کردبوو.

کچەکەم و مێردەکەم لەو ڕوناکیە زۆر بێ خەبەر بوون.

من لەتاو ئەوەی گەڕاومەتەوە، خەریک بوو هاوار و گریانم هەموو لایەک بگرێتەوە.

بەڵام کاتێک گەڕامەوە ناو جەستەکەم، وتووێژ و لێک تێگەیشتنم نەما لەگەڵ فریشتەکە.

کاتێک دڵنیابوو لە حاڵی من، لای پەنجەرەکەوە وەستابوو، وردە وردە دورکەوتەوە و دیار نەما.

کوت و پڕ ون بوو، هەستم بە ناڕەحەتی و تەنیایی دەکرد.

هەموو دونیا بۆ من وەک سندوقێکی پڕ لە تەقەمەنی ترسناکی لێ هات.

بۆ یەکێک ئەو جیهانەی نەبینیبێت دونیا جوان دێتە پێش چاوانی. ئەو کەسەی ئەو ئەزموونەی کردبێت، دونیا لە پێش چاوانی لە ماتەمینگایەک زیاتر نیە!

دەبینێت دونیا دڵۆپێکی زۆر بچووکە، لە جیهانێکی زۆر گەورەی نادیاردا.

دونیا زۆر بچووکترە لەوەی بچوێنرێت بە دایەنگایەک.

ئێمە هاتوین لە دونیا سەرەتایەک دەست پێ بکەین، هەتا ئامادەیی ژیانێکی هەتا هەتایی زۆر قوڵ و بێ برانەوە بین.

کاتی خۆی پێش ئەوەی ئەو ئەزموونە ببینم، کەسێک لە زستاندا بمردایە زۆر پەرۆشی حاڵی دەبووم، دەموت بەم بەستەڵەک و سەرمایە چی بەسەر ئەو داماوەدا دێت، لەژێر خاک و تەڕیدا!!

بەڵام نیگەرانی ناوێت و هیچ زەحمەتێک بۆ ڕۆح نیە و، جەستەی ژێر خاک گرنگیەکی نامێنێت.

مانای خراپ و نا شایستە لە مەرگ مەنێن، من خەڵکانێکم بینی، ڕەنگە لە ژێر خاک جەستەیان هیچێکی نەمابێت، بەڵام زۆر جوان و زیندوو تربوون لە ئێمەی خەڵکی دونیا.

لەناو بەختەوەریەکدا بوون، هەرگیز لە وەسف کردن نایەت.

دوانزە ساڵ بەسەر ئەزموونەمدا تێ پەڕیوە، تەنها بۆ ژمارەیەکی کەمی کەسە نزیکەکانم باس کردوە، من کە لەوێ بووم، وام زانی لە یاریەکی منداڵانە هاتومەتە دەرەوە و ڕووم لە ژیانێکی ڕاستەقینە کردەوە، من لەوێ خەبەرم بوویەوە لەو خەونەی کە پێی دەوترێت ژیان.

بەخەبەر هاتنی تەواوەتی لەوێیە.

یەکەم چاوکردنەوەت لەو دونیا، مانایەک بۆ دونیای ئێرە نامێنێتەوە.

ژیانی دونیا نزمترین جۆری ژیانە.

هەمیشە بە شەوق و تاسەوە یادی ژیانی هەتا هەتایی دەکەم.

# ئەوەی نەیبینێت نازانێت

•〉〉〉 — ↑ — 〈〈〈•

'بەهرۆزی ئەعزەمی' ئەزموونێکی زۆر گرنگی هەیە و بۆمان دەگێڕێتەوە و دەڵێت:

بیست ساڵە ژنم هێناوە، پێش ئەزموونەکەم زۆر خراپ بووم بۆ خێزانەکەم، خێزانم هەموو جارێک پێی دەوتم: من هیچم پێ ناکرێت بەرامبەر بە تۆ، سکاڵای خۆم دەبەمە بارەگای حەق تەعالا!

ئەم سکاڵا و دەستەواژەیە هەزاران جار لە خێزانمم بیستوە.

زۆر ستەم کاربووم.

لە سەرەتادا باش بووم بۆ خێزانم، لە دوایدا ستەمم ناو نا بە پیاوەتی و مەردایەتی.

ژن و پیاو پێویستە ڕاوێژ بە یەکتر بکەن، ڕێز و خۆشەویستی یەکتریان لەلا بێت.

هەموو جارێک پێم دەوت: باشە تۆ من تەسلیمی خوا دەکەیت.

کێ دوای مردن هاتۆتەوە، هەتا بزانین لە دوای مردن چی ڕوودەدات؟!

کێ دەڵێت زیندوو بوونەوەی دوای مردن هەیە!

خۆزگە زووتر ئەو ئەزموونەم بکردایە.

من بیست ساڵ ستەمم لە ژنەکەم کرد!

ئەوەش قەدەرێکی خوایە و، ڕاچڵەکاندیشم قەدرێکی خوایی بوو بۆمن.دەمەوێت ئەزموونەکەم لە هەموو شوێنێک بگێڕمەوە، چونکە لەو دونیا بە منیان وت: کاتێ گەڕایتەوە بۆ دونیا ئەزموونەکەت بگێڕەرەوە.

دوای ئەوەی مەرجەکەم قبوڵ کرد، ڕێگایان پێ دام بگەڕێمەوە. هەتا بە خەڵکی ڕابگەیەنم کە ژیانێکی کامڵ و باڵا و هەرگیز نەبینراوی زۆر جوان لەودیو مردنەوە هەیە.

من تەختە بەستی دەکەم لە شوێنە بەرزەکاندا، لەسەر کار بووم و لە بەرزاییەکەوە کەوتمە خوارەوە و زیانی زۆر گەورە بە فەقەرات و پشتم گەیشت.

لە نەخۆشخانە وتیان: سبەینێ نەشتەرگەری بۆ پشتت دەکەین.

سەعات دەی بەیانی برام بۆ نەشتەرگەری و سەعات چوار و نیو لە نەشتەرگەری دەرچووم. ئەزموونەکەم لەو چەند سەعاتەدا بینی.

یاخوا ئەوەی من بینیم هیچ کەسێک نەیبینێت. ئێمەی مرۆڤ خۆزگە لە ئەزموونی یەکتر سوودمەند دەبووین. ئەوەی نەیبینێت نازانێت.

کە بێهۆشکردنەکە بەری دام لەتاو ئازار هاوارم دەکرد، ئازارێک کە ناتوانم وەسفی بکەم، دەموت دەرزیەکی ئازار شکێنم بۆ بکەن هەتا نەمرم!

ئەگەر بمرم زۆر خراپم بەسەر دێنن.

نەمتوانی لەوێدا باسی ئەوە بکەم کە چیم بینیوە، دڵنیابووم دەڵێن یان شێت بووە یاخود وڕێنە دەکات و لە ژێر کاریگەری بێهۆشکردنەکەدایە، یاخود خەوی بینیوە و جیای ناکاتەوە لە واقع، زانیم ئەوەی کە بینیبوم لە کاتی بێ هۆشیدا بووە.

دوای نەشتەرگەریەکە ڕۆشتین، ڕۆشتین بۆ شاری 'ڕەشت' یەکەم کەس کە هەواڵەکەم پێ دا خێزانم بوو.

لە ڕێگەدا پێش ئەوەی بگەینە ڕەشت بە خێزانم وت.

وتم: شتانێکی زۆرم بینیوە و تایبەتیشە بە تۆ.

دەمەوێت پێتی بڵێم!

بەختی باشی من ئەوە بوو کە گەڕامەوە بۆ دونیا و فرسەتی باش کردنم پێ درا، باش کردنی ئەوەی کە خراپم کردبوو، بۆ خێزانم گێڕایەوە، چەندین ساڵ ئەم ئەزموونەم بۆ ژمارەیەکی کەم لە خەڵکی گێڕایەوە، هەتا ئەم بەرنامەیەی ئێوەم بینی، لە بەرزەخ بە مەرج دانرا لە سەرم کە گەڕامەوە بۆ دونیا ئەزموونەکەم بگێڕمەوە، بۆ هەچ

کەسێکم باس کردوە، سوودی باشی لێ بینیوە، دەربارەی ستەم کردن، حەرام خـۆری، تاوان کردن هەرچی کەسێک بە جۆرێک گیـرۆدەی تـاوان و سـتەم و هەڵەیە، دەتـوانم بڵێم هەر کەسێک بیەوێت چارەسەری خۆی لەم ئەزموونەی مندا بینیوەتەوە.

بۆ ئەوانەم گێڕایەوە کە باوەڕێکی بەهێزیان هەیە بە زیندووبوونەوەی لە قیـامەت، بە حساب و لێپرسینەوەی دوای مردن.

باوەڕبون بە زمان و بانگەشە نیە، بە دڵ و کردارە.

لە هۆڵی نەشتەرگەری بێهۆش کرام، تەنیا یەک پزیشکم لەلابوو کە بێهۆشی کـردم، ڕاسـتەوخۆ دوای ئەوەی بێهـۆش کەوتـم، لەسـەرەوە خـۆم بینـیەوە، کە دەمەو ڕوو بە دەمدا کەوتبووم و نەشتەرگەریم بۆ دەکرا.

'دکتۆر علی خانی' لە لایەک بوو، دوانی تـریش لە بەرامـبەری بـوون و یارمەتیـان دەدا.

"عەباسـی مەوزون کە خـاوەنی بەرنـامە تەلەفزیـۆنیەکەیە، چـاوپێکەوتن دەکـات لەگەڵ د. علی خانی و کارمەندەکانی نەشتەرگەری".

عەزیمـی دەڵێـت: مـن پزیشـک و کارمەنـدەکانم بە ماسـکەوە نەبینـی، تەنـانەت ڕووخسار و پێستی ڕووخساریان لە پێش چاوانم لابرابوو، من لەسەر شێوەی دەمـار و شـانە و ماسـولکەکانیان دەمبینـین، تەنـانەت خۆیشـم وەک و زنجیـرەیەک لە دەمـار ماسولکە بینیەوە، پلاتین و کاری نەشتەرگەریەکەی پشتی خۆشم بینی.

دەمزانی ئەوە نەشتەرگەریم بۆ دەکرێت، خۆمم دەناسیەوە، دەمزانی لە جەستەم جیابوومەتەوە، زانیم ئازادبووم، هیچ هەستێکم بۆ جەستەکەم نەبوو، دەمبینی کە چۆن خوێن بە دەمارەکاندا هات و چۆی دەکرد، جوڵەی بۆری سکۆڵەکانی دڵم دەبینی، ئەوەم بەلاوە سەیر نەبوو، وەک ئەوەی پێشتر بینیبێتم.

هیچ ترسم نەبوو، زۆر دڵئارام بووم.

هێواش هێواش ڕۆحم سەرنەکەوت، کوت و پڕ بوو لەبەرئەوە هەستم بە مردنی خۆم نەکرد.

هەستم کرد ڕاکێشرام، ڕۆشتنەکەم بژاردەی خۆم نەبوو، دەبوو بڕۆشتمایە، نەمدەتوانی بڵێم تۆزێکی تر دێم، خێرا و کت و پڕبوو.

هەموو شت گۆڕا، شوێن و دیمەن و نەشتەرگەری هیچی نەما، چوومە ناو جیهانێک، ناو تونەیلێکی سپی، زەرە زەرەی نور و ڕۆشنایی ئەو تونێلەم بینی، ئەوەی کە دەیبردم بۆ ئەوێ کەمێک لە پێش منەوە بوو، ڕاکێشانی وەک دونیا نەبوو، ڕۆشتن بوو بەبێ ئازادی تۆ، ناو تونەیلەکە ڕۆشن بوو.

ڕەنگی سپی ئەوێ زۆر جیاواز بوو لە سپی دونیا. هەموو زەرەیەکی پێک هاتوە لە عیشق، ئەو نور و ڕووناکیە لە ڕەگەزی عیشق بوو.

من کە لەگەڵ فریشتەی مەرگ لە تونەیلەکە سەردەکەوتم، سەیری هەموو لایەکیم دەکرد، ناو تونێلەکە زۆر زۆر ڕووناک بوو، بەڵام دەرەوەی تونێلەکە زۆر تاریک بوو، تاریکی ڕووت، مەحاڵە لەو جۆرە تاریکیە لە دونیادا هەبێت، ڕەنگی ڕەشی دونیا، لە چاو ڕەشی و تاریکی ئەوێدا کراوەیە.

ئەوەندە تاریک بوو، ئەگەر من لە خزمەتی حەزرەتی ئیزرائیلدا نەبومایە، حەتمەن لەو تونەیلە ڕووناکە دەر دەچووم و وون دەبووم، دەمزانی ئەو نورەی کۆتایی

تونەیلەکە دەبێت ئێمە بەرەو ئەوێ بچین، بە لاری سـەردەکەوتین، دوای ئەوە تونەیـل و تاریکیش کۆتایی هات.

ڕۆشتمە جیهانێکی ترەوە، جیهانێکی سپی نورانیەوە، سپیەکی بـێ ئـازار و هەرگیـز نەبینراو، ڕووناکیەک کە زۆر زۆر ئارام بەخش بوو.

زەڕە زەڕەی ئەو نورە عیشقی خوایی بوو.

هەست بە نور و فەیز و بەرەکەتی خوایی دەکەیت بە تەواوەتـی، ئەزمـوونەکەی مـن ئەزموونێکی سەخت و خـراپ بـوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشـدا دڵنیـایی بەخـش بـوو، بە جۆرێک حەز بە گەڕانەوەی دەکەم تامەزرۆیم زۆر زۆرە بۆ چەندین بارەی ئەو دڵنیـایی و بەختەوەری و خۆشیە بێ سنورە، هەتاوەکو ئێرە، ئەو نورانیە لەگەڵـم بـوو، ئیـتر لێـرە بەدواوە لەگەڵم نەهات، سـەیری هەمـوو لاکـانم دەکـرد، تەنهـا خـۆمی خـۆم بـووم، دەمویست بزانم نورانیەکە بۆکوێ چـوو؟ مـن هـاتم بـۆ کـوێ؟! هەمـوو جیهانەکـانم دەبینی.

کەسێک هات و، پاشان زانیم کە لێپرسینەوە دەستی پێ کرد، دەرکـی ئەوەم کـرد کە من لەکوێم، بە نەزەری ئیعتیبار مێزێک وەربگرە لە سەر شـێوەی ئێـڵ 'L'، چـوار کەس لە بەشـە گەورەکەی سـەر مێـزەکە دانیشـتبون، یەک کەسـیش لە بەشـە بچـووکەکەی دانیشتبوو، هەستا و هەستم کرد بەرەو ڕووی من دێت، ئەوانـی تـر شـێوەیانم نەبینـی، واتە ڕوخساریان بۆ من ڕوون نەبوو، بەڵام پێنجەم کەسیان بوو هات بەرەو ڕووی مـن، زۆر ترسناک بوو، زۆر زۆر، ئێجگار ترسناک و ترسێنەر بوو، لەسـەر شـێوەی گـورگ بوو، بەڵام گورگی دونیا لەچاو ئەودا زۆر جوانە.

ئێجگار ئێجگار ترسناک بـوو، هەرچـی بـکەم بـۆ ئەوەی لای ئێـوە وێنـای بـکەم، ناتوانن وێنای بکەن، زۆر ترسێنەر بوو، ئەو گـورگە عەمەل و کردارەکـانی مـن بـوون، ئەو مەخلوقە زەڕە زەڕەی کردەوە خراپەکانی من بـوو، بـوو بـوویە گـورگێکی ئێجگـار

ترسناک و دڕندە، زۆر زۆر ترسناک بوو، لە هەموو ژیانی دونیامدا شێوەیەك بەو جۆرە ترسناکم نەبینیوە.

فیلمی ترسناک هەر هیچ ترسناک نیە، ئەوەی من بینیم لوتکەی ترسێک بوو کە ڕۆحێکی نەمری بەرزەخی بەرگەی دەگرێت و نامرێت، مرۆڤی فانی دونیایی هەرگیز بەرگەی ساتێکی ئەو ترسە ناگرێت!

ئەوەندە ترسناک بوو، لەو شوێنەدا کە من بینیم موەکانی سەرم لە ترسانا درێژ بوون و کەوتنە سەر زەوی و هەموویشی لە هەمان کاتدا سپی بوون.

بینیم بە سپێتی قژ و پرچی سپیم بەسەر زەویدا کشا. تەنها توانیم سەیری بکەم، نەمتوانی هیچی تر بکەم و هیچ بڵێم، زانیم کە حیسابم تەواو بوو.

گورگێکی مووڕەشی زۆر ترسناک بوو، دانەکانی زۆر ترسناک، لە سەرەوە بۆ خوارەوەی سەیرم کرد، تەنها سەیرم کرد، کە سەیری قاچەکانیم کرد، نینۆکی زۆر درێژ بوو، نەمبیستوە گورگ نینۆکی هەبێت. بەڵام من نینۆکی درێژی ئەوم بینی.

هەموو گوناهێکتان پارچەیەکی ترسناکی جەستەی دوڕندەیەکی ئەو دونیایە.

جەستەی بەمووی درێژی زۆر ترسناک داپۆشرابوو. تەنها یەک پرسیاری لێ کردم، یەک شتی وت!!

خێزانم ناوی 'فریبا'یە.

ئاماژەی بۆ کردم 'پەنجەی شایەتومانی وەک هەڕەشە تێ کردم'، زۆر جوان بیرمە، بە تەواوی ڕووی تێ کردم و وتی: بۆچی ئەوەندە بەد کردار بوویت بەرامبەر 'فریبا'، بۆچی تا ئەو ئەندازە خراپ و بەد ڕەفتار بوویت!!؟

"بترسە لەو کەسەی بێ دەنگە، وەختێ تۆ دڵت شکاندوە".

"بترسە لەو پیاوەی بە حەیای خۆیەوە بێ دەنگ دەبێت و گیرۆدەی ژنێکی بێ شەرم و بێ ڕووە".

"بترسە لەو ژنەی کە لەبەر مناڵەکانی، لەبەر نەبوونی دایک و بـاوکی دڵسـۆز، لەبەر شەرم و شکۆی خۆی، لەبەر تـرس، ناتوانێـت دەنـگ هەڵبڕێـت، نـاوێرێ لە بەرامـبەر پیاوێکی نامەرد سکاڵای بگەیەنێتە دونیـا، بترسـە فرسـەتی هەناسـەیەکی ئـارامی ئەو دونیات نادات و بە دۆزەخت دەگەیەنێت، زوڵم زوڵمات و تاریکی یە".

بترسە لەو کەسەی کە تۆ زوڵمی لێ دەکەیت و ئەویش ڕووی وەڵامی ناکـاتە تـۆ و، ڕووی تکا و شکاتی دەکاتە حەق تعالا 'جل جلاله'.

خوای گەورەش وتەکانی دەبیستێ، ئازاری دڵی دەبینێـت، فەرامۆشـی ناکـات ﴿إِنَّ رَبَّكَ لَبِالْمِرْصَادِ﴾ (الفجـر: ١٤) لە کـوت و پڕێکـدا دەتگرێـت و، هـیچ شـتێک دادت نادات.

حەق تعالا لای دڵ شکاوەکانە و، ڕازی دڵ شکستە ڕازی مەلەئی ئەعلایە.

ڕۆژێـک دێـتە پێشـەوە، خـوای تەعـالا هەمـوو وتەکانـت بیـر دەهێنێـتەوە و، دەیبیستیتەوە. ئیتر لەوێ ناتوانیت وەڵام بدەیتەوە. دەرکی ئەو ڕۆژە دەکەیت.

بۆچی ئەوەندە بەد ڕەوشتیت نواند بەرامبەر 'فریبا'.

بۆچی هەتا ئەو ئەندازە خراپە ڕۆشتیت و خراپەت کرد بەرامبەر خێزانەکەت؟!

ئەو بەو پەڕی ئارامیەوە پێی وتم، بەڵام من دەبوو لە ترسانا بمردمایە.

زۆر زۆر ترساندمی.

هەیبەت و وتنەکەی تۆقاندمی.

سەرسامی و ترسێکی بێ ئامانی خستە دڵمەوە.

خێزانم ئاگادارە و دەزانێت کە من لەو ڕۆژەوە سەرم بۆ ئاسمان بەرز نەکردۆتەوە.

من سەیری ئاسمان ناکەم، پێنج ساڵە سەیری ئاسمانم نەکـردوە، دەترسـم جـارێکی تر بیبینمەوە.

"عەباسی مەوزونی دەڵێت بە بەهرۆزی ئەعزەمی: من و تۆ کاتێ لە دارستانەکانی شیمالی ئێران دەگەڕاین و فڕۆکەی 'درۆن' وێنەی دەگرتین، سەیری ئاسمانت نەدەکرد، منیش پێم وتی: سەیری ئاسمان بکە هەتا وێنەکە باش دەرچێت. من وام زانی فەقەراتی ملت هەیە و ناتوانی سەرهەڵبڕیت. ئێستا دەزانم کە بۆچی تۆ سەیری ئاسمانت نەکرد؟!"

بەهرۆزی عەزیمی: ناوێرم سەیری ئاسمان بکەم.

ئەستەمە بتوانم وێنەی ئەو بونەوەرەی من بینیم بیهێنمە پێش چاوی ئێوە، ئەوەندە ترسناکێکی نەبینراو بوو بینیم.

ئاواتە خوازم هیچ کەسێک نەیبینێت.

من لە هەموو چرکەساتێکی تەمەنم دا داوای لێبوردن لە هاوژینەکەم دەکەم، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا جورئەتی ئەوەم نیە سەیری ئاسمان بکەم.

هەرگیز سەیری ئاسمان ناکەم، "کڵاوێکی لەسەردایە کە سێبەر بۆ دەم و چاوی دەکات" ئەم کڵاوەش کە لەسەر دەکەم بۆ ئەوەیە کە ئاسمان نەبینم.

ئەگەر بەبێ مەبەست چاوم بە ئاسمان بکەوێت، تووشی دڵەڕاوکێ و ترس و شەرمەزاری دەبم.

ئەوەی بینیم کردارەکانی خۆم بوون، بوو بوونە بە دوڕندە بۆ گیانی من.

خەڵکی پێم دەڵێن: عەیبە و نەنگیە دان بە هەڵەی خۆتدا دەنێیت لەلای خەڵکی، بەڵام من ئیعتراف دەکەم و ڕاشیدەگەیەنم بەناو هەموو خەڵکیدا کە زۆر بەهەڵەدا چوو بووم.

خەڵکی دەڵێن: ئاخر سەرنجی خەڵکی بەرامبەرت باش نابێت. بەڵام سەرنجی خەڵکی هیچ بایەخێکی نیە، من دەزانم کە بایەخی نیە، لە کاتێکدا کە تۆ لە گوناه و تاوان و بێ ئاگایدابیت، خەڵکی باشەت بڵێن چ سودێک بەتۆ دەگات؟!

گرنگترین بۆمن ئەوە بوو کە خوای باڵادەست فرسەتی دایەوە بە من، هەتا دڵ شکاوێک ڕازی بکەم و گەردنی خۆمی پێ ئازاد بکەم.

کە دەڵێم 'ترسناک' بوو، کەمترینم وتوە بۆ ئەو دوڕندەیەی کە لە کردەوە خراپەکانی من دروست کرابوو!

گورگ و هەموو دوڕندەکانی دونیا زۆر جوان و بێ ئەزیەتن لە چاو ئەوەی من بینیم.

دەمویست بەرگری لەخۆم بکەم، بۆم دەرکەوت تەنها لە دونیادا بژاردەی بەرگری کردن لەخۆتت هەیە و لەوێ هیچت پێ ناکرێت.

ئەگەر خراپەت بەرامبەر کەسێک کردوە، هەوڵ بدە گەردنت ئازاد بکات، لەوێ حیساب و وردەکاریەکی بێ ئەنداز هەیە.

لە بەشێکی زۆر کەمی چرکەیەکی دونیادا 'بەڵام لەوێ کات نیە' تەواوی ژیانی هاوسەرێتیم، هەتا مردن پیشان درایەوە، هەرچیم لەگەڵ ژنەکەم کردبوو، بێ کەم و زیاد، ئەو کارە خراپیانەی لە دەرەنجامی مامەڵەی بەدی من هاتبوونە ڕێگەی خێزان و کوڕەکەم پیشانم درایەوە، دەبوو بمبەخشن هەتا بگەڕێمەوە و ئەو وێرانەیەی حاڵی خۆم چاک بکەمەوە.

دەستم کرد بە هاوار و گریان و پاڕانەوە لە خوای گەورە، دەموت: تەنها بمگێڕنەوە، چونکە ئەگەر لەوێ بمامایەتەوە تیادەچووم و سزا و ئاگر شوێنم دەبوو.

تەنها بیرم لە پاڕانەوە دەکردەوە.

ئەگەر ئەو تکا و پاڕانەوە و هاوارانەم بگەیشتایەتە دونیا، هەموو خەڵکی دونیای کەڕ و کاس دەکرد.

ئەو بونەوەرە ترسناکە بەو هاوار و پاڕانەوانەی من هیچ کاردانەوەیەکی نەبوو، هیچ ڕەحمی نەبوو، تەنانەت برۆککانی نەجوڵاند و نەهاتەوەیەک، زۆر بێ باک بوو.

زەڕەیەک نەرمی و ڕەحم لە دڵیدا نەبوو، هەروەکو خۆی بوو.

من دەمزانی کە ئەو فەرمانی خوای تەعالا جێ بەجێ دەکات، دەبوو بەو جۆرە بکات.

ئێمە ئەگەر یەکێک لە بەرامبەرمانەوە بگری، بپاڕێتەوە، خێرا کارمان تێ دەکات و ڕەحمی پێ دەکەین.

ئەو بونەوەرانە لە زەڕە زەڕەی کرداری خراپی من دروست بوو بوو، بە خوێن ساردی سەیری دەکردم.

جگە لە من و ئەو گورگە، هیچ کەس و شتێکی تر بونی نەما، تەنها من و ئەو بووین.

پەنجەی بەرزکردەوە و مۆڵەتی دام بە گەڕانەوە و وتی: دەتوانیت بگەڕێیتەوە بۆ دونیا، بەمەرجێک بە خەڵکی ڕابگەیەنیت کە قیامەت هەیە، حیساب و لێپرسینەوە و دۆزەخ و تۆڵەی خوایی هەیە، بەهەشت و ڕەزامەندی خوا هەیە.

من جاران دەموت، ئەگەر حیساب و کیتاب و عیقاب هەیە، ئەی بۆچی کەسێک نەگەڕاوەتەوە و باسی نەکردوە؟!

بەڵام ئێستا پێتان دەڵێم: بەڵێ لێپرسینەوە و سزا و تۆڵە هەیە، ڕاستەوخۆ دوای مردن دەچیتە ئەو جیهانە و دەستت لە دونیا دەبڕێت، ئەوێ بۆ خراپەکاران زۆر زۆر ترسناکە.

وتی: بە مەرجێک دەگەڕێیتەوە بۆ دونیا هەتا بۆ خەڵکی باس بکەیت.

من هەتا ماوەیەک بە گشتی بۆ هەموو کەسێکم باس نەدەکرد.

گرنگ نیە خەڵکی پێم بڵێن خراپ بووە بۆ خێزانی.

خێزانم ئەو هەموو ساڵە زۆرانە بەهیچ جۆرێک بە هیچ کەسێکی نەوتوە، کە من خراپ بووم و مامەڵەم خراپ بووە، وەختێ بۆ باوکم باس کرد، زۆر سەری سوڕما لەوەی کە چۆن نەیانزانیوە.

خێزانم بە دایک و باوکی خۆیشی نەوتبوو.

تەنها دەیوت: من سکاڵام دەبەمە خزمەتی خوای گەورە، من تەنها خوام هەیە و بەس.

ئیتر دوای ئەوە لە نەخۆشخانە هۆشم هاتەوە و گەڕامەوە، کرداری خراپی من ڕێگر بوو لەوەی بگەم بە عیشقی خوایی، هەرگیز خوای گەورە زیانی بەندەکانی ناوێت، ئەو دروستکراوە ترسێنەرە نێراوی خوابوو هەتا من بگۆڕێم و بکەومە سەر چاکەکردن. هەتا پاک ببمەوە لە گوناهو ئینجا بگەمە خزمەتی خوای تعالا.

مەرگ پلەیەکی بەرزی سەرکەوتنە بۆ ژیانێکی بەرز و باڵا، دونیا فرسەتی بەرزبوونەوەیە بۆ مەقامی بەرز و بینینی خوای تەعالا.

ئەگەر دەتوانن ژن و پیاوێکی صاڵح و باش و دادپەروەر و بەوەفابن بۆ یەکتر، ئەوە ژن بێنن و شوو بکەن، ئەگەر نا مەچنە ژیانی هاوژینی، هەتا لە دونیادایین با داوای لێ بوردن لە یەکتر بکەین و چاک بین لەگەڵ یەکتر. هیوادارم ئەزموونەکەم شوێنەواری باشە لەسەر ئێوە بەجێ بهێڵێت.



# مێردەکەم دەزانێت کە من هەرگیز درۆ ناکەم

ئەعظەم سادات موسوي ئافرەتێکی ئێرانیە و لە ساڵی (١٩٦٢) ی زایینی لەدایک بووە و، شوی کردوە و ئەزموونی نزیکبوونەوە لە مردنی بینیوە و بەم جۆرە بۆمان دەگێڕێتەوە و دەڵێت:

ساڵی (٢٠٠٣) بە نەخۆشیەوە دەمناڵاند، هەشتی بەیانی بوو، موناجاتم لە خزمەتی خوای گەورەدا دەکرد و دەموت: یاربي... ئیلاهی من چی بکەم لەگەڵ ئەم دەرد و نەخۆشی و کێشەیەمدا؟!

من لە ماڵەوە بووم و، مێردەکەم چوو بوو بۆ سەر کار و، کچەکەشم ڕۆشتبوو بۆ قوتابخانە.

منیش لەسەر چرپاکەم ڕاکشابووم و، بیرم دەکردەوە لەوەی کە چۆن دەگەمە چاک بوونەوە و چارەسەر.

تووشی نەخۆشی سەرەتان بوو بووم و دەمزانی کە دەمرم.

دەترسام لەوەی کە چیم بەسەردێت، داوام لە خوای گەورە دەکرد کە فریام بکەوێت و منداڵەکانم بەختەوەر بن.

وەختێ داوای یارمەتیم لە خوای گەورەکرد، دانیشتبوم، کاتژێر هەشت و پانزە خولەك بوو، بینیم ماڵەکەمان بنمیچی نیە و ئاسمان سەقفمانە، کە من پاڕامەوە لە خوای گەورە، ئاسمان بە ڕوومدا کرایەوە، گوریسێك لە ئاسمانەوە هاتە خوارەوە، ئاسمان زۆر ڕۆشن بوو، لە ژیانمدا جوانیەک بەو ئەندازەم نەبینیی بوو، لەبەر ئەوە ناتوانم وەصفی بکەم.

باڵەکانی کرابوونەوە، ڕێک بوون، بە ئەندازەی ئەسپێکی مام ناوەنـد دەبـوو، پێشـتر دەترسام، دەترسام لە مردنێک کە نزیکە لەمن، دوای ئەوەی ئەسپەکەم بینی ترسم نەمـا، دوو هەتا سێ مەتر لە سەرووی منەوە بوو، لە بەختەوەریدا بووم و نەدەترسام، هەرگیـز چـاوەڕوانی بینینـی ئـاوا مەخلوقێـک نەبـووم. کە گەیشـتە لای مـن هەردوو دەسـتی پێشـەوەی نوشـتانەوە بـۆمن وەکـو ڕێـز و تەوازوع پیشـان دان، کە سـەیری چـاوی ئەسپەکەم کرد، بینیم لـێم تـێ دەگـات، وەک گیانـداری سـەر زەوی نەبـوو، دەمزانـی ئەویش چ هەستێکی هەیە.

کە دەستەکانی دانا ڕێزی گرتم، زۆر ڕێز و خۆشەویسـتی دەربـڕی، هەسـتم کـرد لە لایەن جیهانی نادیارەوە نێراوە بۆلای من.

گوێم لە سەدایەکی مەلەکوتی بوو، یەک ڕستەم پێ وترا: مژدە بێـت... بە هێمنـی و سەلامەتی دەچیتە ژیانی هەتا هەتـاییەوە، دوای ئەوە ئیـتر ڕۆحـم لە جەسـتەم چـوویە دەرەوە. خۆمم بینیەوە لە سەرەوە بووم. هەستم بە ئازادی بێ سـنور و قـودرەتێکی زۆر دەکرد. خاڵی بوومەوە لە هەموو ئێش و ئازار و ناخۆشیەک.

زانیم ڕۆحم لە لاشەم جیـا بـوویەوە، دوای ئەوە گۆڕسـتانم بینـی، لەلای ڕاسـتەوە گۆڕی یەکەم هـی مـن بـوو، ئاشـنا نەبـووم بە گۆڕسـتانەکە، بە خێرایـی چـوومە نـاو گۆڕەکەم.

بە بەرزی (٣-٤) مەتــر لە گــۆڕەکەمەوە وەســتابووم و لە دوایــدا ڕۆشــتمە نــاو گۆڕەکەمەوە، زۆر بە خێرایی ڕۆشتمە ناویەوە و بەهەمان خێرایی لێی دەرچووم.

ئەو مانایەم دەست کەوت کە ئێمەی مرۆڤ لە نـاو گۆڕەکانمـان نـامێنینەوە و بەرەو سەرەوە دەڕۆین.

ئێمەی مرۆڤ لەوە دەترسین کە لەناو گۆڕ دەمێنینەوە، بەڵام بەو جـۆرە نـیە کە ئـێمە لێی دەترسین.

هێزێکی گەورە کێشی دەکردم بۆ سەرەوە.

ئەو سەرکەوتنەش زۆر جوان و سەرنج ڕاکێش بوو.

گەیشتمە ئاسمانێکی پڕ لە ئەستێرە، نورانی زۆر بەلامدا تێ پەڕین، من زۆر بە خێرایی تێ دەپەڕیم و هەستی فڕینم هەبوو بە ئاسماندا، هیچ ترسی ئەوەم نەبوو بەر نیازەکێک یاخود ئەستێرەیەک بکەوم.

وادەزانم کاتێکی زۆرم پێ چوو، هەرچەندە ناتوانین بە کات پێوانەی بکەین.

گەیشتمە بۆشاییەکی زۆر فراوان، کۆتایی نەبوو، هەمووی لە نور و ڕوناکی دروستکرا بوو بوو، کاتێک گەیشتمە ئەوێ، هەستم بە خۆشەویستیەکی زۆر قوڵ و ڕاستەقینە کرد، باڵاترین و چڕترین جۆری ڕەنگەکان لەوێ یە و، ناکرێت نیگارکێشێک بە ڕەنگەکان و فڵچەکانی ئێرە بیەوێت ڕەنگ ڕێژی وێنەیەکی ئەوێ بکات.

پێش ئەزموونەکەم، هیچ زانیاریەکم لەسەر گەشتی ڕۆح و ئەزموونی دەرچوون لە جەستەم نەبوو، وەختێ ئەزموونەکەم کرد، دەمپرسی من لەکوێم، بۆکوێ دەچم، من چی دەبینم؟

لە ئەزموونەکەمدا هەستم کرد کە من گەڕاومەتەوە بۆ بنچینەی خۆم، بۆ نیشتمانی ڕاستەقینەی خۆم.

خۆشەویستی بێ سنور و، چێژی بێ سنور، جوانی بێ سنور لەوێ دەبینیت.

لەوێ ڕوون دەبێتەوە کە خوای تەعالا بەندەکانی خۆی خۆش دەوێت.

لەناو نور و ڕەحمەتی خوادا دەژیام.

دوای ئەوە ڕۆشتمە بێستان و باخێکی زۆر گەورەوە و زۆر بێ سنوور، درەختەکانی گەورە و بە خزمەت بوون، لە نزیکی درەختەکان جۆگە ئاوێکی شیرین و زۆر جوانی لێ بوو، حەوزێکی زۆر جوان لە ناوەڕاستی باخەکەدا بوو، بنی ئاوەکە دیار بوو، وەختێ ڕۆشتمە ناو باخەکەوە، هەستم کرد جەستە و لاشەم هەیە، ئاوەکە زۆر زۆر

پاک بوو، دەمویست بۆ سەرەوەی ئاوەکە سەربکەوم، پیاوێکی باڵابەرزی چوارشانەم بینی، جل و بەرگەکەی وەکو هی ڕاهیبەکان وابوو، ڕووپۆشێکی دابوو بەسەر خۆیدا، لەبەر ئەوە ڕوخساریم نەبینی.

وەستابوو، ئاوی درەختەکانی دەدا، ئەو شوێنە ناسراو و 'مألوف' بوو بۆمن، هەروەکو ئەوە بوو کە من چەندین ساڵ لەوێدا ژیابم، زۆر دڵخۆش بووم، من لەناو ئەو باخ و بێستانە بێ برانەوەیەدا دەگەڕام.

کە ئەو پیاوەم بینی زیاتر هەستم بە ئارامی و دڵخۆشی کرد، نازانم، مرۆڤ بوو یاخود فریشتە بوو.

ئاوی ئەوێ زۆر لە ئاوی دونیا شیرینتر و ڕوونتر و نایابترە.

ڕەنگێکی زۆر جوانی هەیە، لە بەرامبەر ئەو باخە کۆشک و تەلار و شەقامی زۆر جوان هەبوو، وەک شارێکی گەورە بوو، خەڵکی زۆری تیابوو، شەقامەکانی زۆر جوان و بێ دەنگ بوون، سەیارە و شتی ئیزعاج کەری تیا نەبوو، شارێکی دڵگیری زۆر ئارام.

تەنها دەنگی ئاوازێکی لەسەرخۆی، زۆر خۆش دەبیسترا، کە هەموو شارەکەی پڕ کردبوو لە دەنگی خۆش و سازگار، وەک مۆزیکەکانی دونیا نەبوو، بە شەقامەکانی شارەکەدا دەگەڕام، من تەنها یەک پیاوم بینی، لە کاتێکدا دەمزانی ماڵەکان پڕبوون لە خەڵکی.

ئەو پیاوە وادەزانم فریشتە بوو، چونکە زۆر باڵا بەرز و جوان و ڕێک پۆش و بێ وێنە بوو، وەک بڵێیت لە تەمەنی سی و پێنج ساڵاندا بێت ئاوابوو. سپی پۆش بوو، دەفرێکی گەورەی پێ بوو، سێوی سور و زەردی تیابوو، سێوەکان لە نور بوون، ڕوناکی و نوری ئەو سێوانە سەرنجی زۆر ڕاکێشام، بانگی دەکرد کێ سێوی دەوێت؟

پیاوێک لە ماڵەکەی خۆی هاتە دەرەوە، بانگی لە خەڵکی ئەوێ دەکرد، چاوم زیاتر لەسەر ئەو نور و ڕوناکیە بوو کە لە دەفرەکەوە دەر دەچوو، هەستم کرد شارێکی زۆر بێ دەنگ و پڕ لە ئارامییە.

سەلامی هەتا هەتایی لەوێ بوو، ماڵەکان و خانوەکان زۆر پێشکەوتوبوون، دوای ئەوە ئەو بەشەی بۆ من دانرابوو بینیم، خوشکەکەم و کچەکەم لەلای یەکتردا دانیشتبوون، دوای ئەوە گەڕێنرامەوە و، لە سەرەوە جەستەی خۆمم بینیەوە، بینینم زۆر بەهێز بوو، خانە سەرەتانیەکانی خۆم دەبینی.

کە گەڕامەوە ناو جەستەکەم، سەعات هەشت و چل و پێنج خولەك بوو، واتە بە کاتی دونیا نیو کاژێرم پێ چوو بوو.

کە گەڕامەوە وتم: أستغفر الله ربي و أتوب إليه.

خوای گەورە بە بێ کۆتا بەڕەحم و بەبەزەییە.

ووشەی خۆشەویستی تەنها شایان بە زاتی الله یە.

مێردەکەم دەیزانی کە من هەرگیز درۆ ناکەم، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەم ئەزموونەی نەبیست بوو، دەیوت ڕەنگە خەون بێت!!

خوای گەورە ڕێگەی گەیشتن پێی، ڕێگەی عیشق و نور و جوانیە... ئیلاهی ئەی مەولا و خۆشەویستم بمبەرەوە بۆ لای خۆت.



# ئەزموونەکان پڕن لە نهێنی و پەنهانی ورد

'ئەمیر کمرگی خمین' لە ساڵی (١٩٨٦) لەدایک بووە و، ژنی هێناوە و خاوەنی دوو منداڵە و ئەزموونەکەی بەم جۆرە دەگێڕێتەوە و دەڵێت:

ساڵی (٢٠٠٦) سەرباز بووم، لە ڕێگەی ماڵەوە بۆ سەربازگەکە تووشی ڕووداوێک هاتم.

ڕێک چواردە ساڵ پێش ئێستا دەکات.

لێدراویەکە بەر سەرم کەوتبوو، ئازارێکی تاقەت پڕوکێن بوو، بەرچاوم ڕەش بوو، نازانم چەندەی پێ چوو، من برابووم بۆ نەخۆشخانەی شاری 'خمین'، لە دوایدا برابووم بۆ نەخۆشخانەی 'ولي عصر' لە شاری 'ئاراک'.

سەعات شەش و نیو برابووم بۆ نەشتەرگەری، نەشتەرگەری مێشکم بۆ کرابوو، چل و پێنج ڕۆژ بێ هۆش بووم.

دوای ئەوەی دونیا لە پێش چاوانم ڕەش بوو، جەستەی خۆمم بینیەوە.

دەمپرسی باشە ئەوە منم و ئەمەش هەر منم!!

سەرسام بوو بووم!

لە دوای ئەوە تێ گەیشتم کە لە جەستەی خۆم چوومەتە دەرەوە.

دایکم و باوکم و براکانم دەهاتن و دەگریان، پێم دەوتن: بۆچی دەگرین؟

بەڵام ئەوان وەڵامیان نەدەدامەوە.

باپیرم بینی، کە هەفتەیەک لە پێش ڕووداوەکەی من ئەو وەفاتی کردبوو.

سیانزە ساڵ دەبوو لە جێگادا کەوتبوو، بەهۆی شکانی قاچیەوە و چاک نەدەبوویەوە، بەڵام لەوێ بینیم، حاڵی زۆر باش بوو، جل و بەرگێکی زۆر جوانی

لەبەردا بوو، بە ئاسانی و بە بێ هیچ گرفتێک ڕێی دەکرد، من گەنجێتی ئەوم نەبینیوە، بەڵام باپیرم زۆر گەنج بوو لەوێ، وەک وێنە کۆنەکانی بوو.

وتم: باپیرە ئازارت نیە؟

وتی: نەخێر هەموو ئازارێک تەواو بوو، ئێستا من زۆر زۆر باشم.

لەناو باخ و سەوزاییەکی زۆر جواندا باپیرەمم بینیەوە.

من لە یەک کاتدا ناو نەخۆشخانەکە و، ئەو باخ و سەوزاییە زۆر جوانەشم دەبینی.

من دڵنیام ئەو شوێنەی باپیرەمم تیا بینی سەر زەوی نەبوو. هاوشێوەشی لەسەر ڕووی زەویدا نیە.

من بەهۆی دوعای کەس و کارمەوە هاتمەوە و گەڕامەوە، ئەوەی ناڕەحەتی دەکردم گریانی کەس و کارم بوو، لەگەڵ وێنەی گوناهەکانم کە لە ماوەی بیست ساڵدا ئەنجامم دابوون.

کە دەمبینی تەرکی نوێژم کردوە و بێ ئاگا بووم، هەستم بە شەرمەزاری دەکرد، گوناهێک بەزمان کردبێتم دەبووە ئاگر و لە دەمم دەردەچوو... منی ئەمیر، ئەمیری ئەصڵی ئەوە بووم کە لەسەرەوە بووم، نەک جەستەکەم.

مامەڵەی جوان و ڕێزدارانە لەگەڵ جەستەی نەخۆش و کۆما بکەن، لەگەڵ جەستەی مردوو زۆر بەڕێز بن، چونکە ئەوان هەست بەبێ ڕێزی دەکەن و دەبنە عەزیەت بۆیان.

هەرچیەکت لە دونیا کردبێت ناتوانی بەرپەرچی بدەیتەوە.

ناتوانیت بە ناڕەوا تۆمەتێک بخەیتە سەر یەکێکی تر، ناتوانیت لە ڕاستی لابدەیت.

حەقیقەت ناشاردرێتەوە.

دوو کەسی تر وەکو من لەبێ هۆشیدا بوون، کە بە ئاگایی و لە ژیانی دونیادا نەمبینیون، یەکێکیان ناوی 'ئەمیری موسەوی' بوو، ئەوی تریان 'علی مروتی' یەکێکیان قوتابی زانکۆ بوو، ئەمیری موسەوی خەڵکی شاری 'الیکودرز' بوو.

یەکترمان بە هیچ جۆرێک لە دونیادا نەبینی بـوو، لە نەخۆشـخانەش هەرسـێکمان بـێ هۆش بووین، بەڵام بەناو و شوێن و هەموو شتێکیان ئاگادار بووم!

لە بێ هۆشیدا ڕۆحەکانمان بە یەکتر گەیشتن و یەکترمان ناسی، پێکەوە دەدوایـن لە نەخۆشخانەی 'ولی عصر' لە 'ئاراک'.

ئەو ڕووداوەش ١٥ساڵی بەسەردا تـێ پەڕیـوە، لەوێ زانـیم کە 'ئەمیـر موسـەوی' دایکی کۆچی دوایی کردبو، خەفەتی ئەوەی هەبوو کە دایکـی لە نەخۆشـخانە نەبـوو، بەڵام من دایکم لەلای جەستەکەمەوە بوو، ئەوە دەبوویە حەسرەت بـۆ ئەو، مـن لەنـاو تـونەیلەکەدا بـووم کە وتیـان: دەبێـت ئەو بگەڕێـتەوە، بەهـۆی دوعـای دایکـمەوە گەڕێنرامەوە، وتیان: ئەمیـر دەبێـت بگەڕێـتەوە بـۆ دونیـا، لەبەرئەوەی دایکـی دوعـای زۆری بۆ دەکات.

ئەوەبوو پەرستیارەکە هاواری کرد بۆ دایکم و کەس و کـارم و وتـی: ئەمیـر هۆشـی هاتەوە و گەڕایەوە!

ئیتربوو بە گریان و خۆشی و نزای خێر.

من وادەزانم کە ژیان لەدوای مردنەوە دەست پێ دەکات.

شتانێک مەکەن کە دوایی لێی پەشیمان بن.

داوای لێ بوردن بکەن لەوانەی کە پێویستە داوای لێ بوردنیان لێ بکەن.

'عەباسی مەوزونی' پێشکەشکاری بەرنامەکە دەڵێت: ئەو دوو کەسەی ئەمیر باسـی کردن لە ساڵی (٢٠٢١)ی زایینـی دۆزیمانـنەوە و 'مـریم مـوحەمەد' ڕاگەیەنکـارە و لە شـاری ئـاراکە و موتـابعی بەرنـامەی 'حیـاة بعـد الحیـاة'ە و لەبەر لەگەڵ مێـردەکەی 'سیامک یادگاری' دانیشتوی شاری 'ئاراکن' کە سیامیک شارەزای پەیوەندی گشـتی یە و لە زانکۆی زانستی سروشتیە لە شاری 'ئاراک'.

ویستمان دڵنیایی بـدەین لەسـەر ئەو کەسـەی لە بەرنـامەکەدا نـاوی هـاتوە، لەگەڵ بەڕێوەبەری تەندروسـتی و، هەروەهـا نەخۆشـخانەی 'ولي عصـر' و ئەم زانکـۆیەش

بەدوایدا ڕۆشتین، دۆسیەکانی پانزە ساڵ لەمەو پێشمان هەڵدایەوە، هەموو ئەوەی ئەمیر گومرگی وتی: بە تەواوی وەک زانیاریەکانی لای ئێمەیە و بە دۆسیە پارێزراوە، بە ڕاستی جێگەی سەرامیمان بوو!

ئەزموونەکان پڕن لە نهێنی و پەنهانی زۆر سەیر.

## جارێکی تر نغرۆی ناو جەستە بوومەوە

'زوهرە موحەمەد زەکی' ژنێکە و سێ منداڵی هەیە، ئەزموونەکەی دەگێڕێتەوە و دەڵێت: ساڵی (١٩٩١) لەگەڵ خێزانەکەمان ڕۆشتینە دەرەوە، کە پێک هاتبوین لە باوکم و دایکم و براکانم، لە گەشتێکی خێزانیدا بووین، لە چێشتخانەیەک نانمان خوارد، من کەبابم خوارد، هەستم کرد تامی کەبابەکە باش نیە، وتم بە خێزانەکەمان: وادیارە گۆشتی ئەم کەبابە خراپ بووە.

وتیان: نەخێر ئاساییە، ئیتر ئەوە بوو نانەکەمان خوارد. لە گەشتەکە گەڕاینەوە و، باوکم گوێزی سەوزی بۆ کڕین، من زۆرم لێ خوارد، ئیتر دوای ئەوە گەڕاینەوە بۆماڵەوە، لە دوای ئێوارە هەستم کرد سەرم گێژ دەخوات، کە خەریک بوو بکەوم بە زەویدا.

چووم بۆلای دایکم و وتم: دایە هەست بە گێژ بوون دەکەم.

دایکم وتی: چاوەکانت سور بووە، ڕەنگە سەرمات بووبێت، حەبێکی پێدام و وتی: بڕۆ بخەوە و پشو بدە. خێزانەکەمان دوای سەعات یانزە دەخەوتین، بەڵام من سەعات هەشت و سی خولەکی شەو خەوتم، ئیتر دوای ئەوە نازانم چی ڕوویدا.

"باوکی دەڵێت: خوشکەکەی بەئاگا بوە و بینیویەتی، ئینجا بە دایکی وت: زوهرە حاڵی خراپە".

"دایکی دەڵێت: کە ڕۆشتم بینیم زوهرەی کچم بە تەواوی لێ بووەتەوە و لە ژیاندا نەماوە، نە هەناسەی دەدا، نە وەڵامی دەدایەوە، ڕامکرد بۆلای هاوسەرەکەم و وتم حاجی هەستە کچەکە مرد. "

وتی: یەعنی چی کچەکە مرد؟

وتم: هەناسە نادات و ڕەنگی مردوی گرتوە!

هەرچەند ڕامانوەشاند، هیچ سوودی نەبوو.

زوهرە دەڵێت: من هەستم بە هیچ نەدەکرد، ئەوە نەبێت کە ڕۆحم لە جەستەم جیابوو بوویەوە.

خۆم لە سوچێکی ژوری نەخۆشخانە بینیەوە.

بینیم دایکم و نەنکم لەلای جەستەکەم ڕاوەستاون.

دایکم زۆر بەکوڵ دەگری و بانگم لێ دەکات.

دەرگای ژورەکەش لەلای قەرەوێڵەکەی منەوە بوو، لە پشتی دەرگاکە مێردی پورم لەگەڵ باوکم قسەیان دەکرد لەگەڵ پزیشکەکە.

پزیشکەکە وتی: هەموو شتێکمان بۆ کردوە، توانای ئێمە هەر ئەوەندەیە.

"دایکی دەڵێت: داوای چاک بوونەوەم لا خوای گەورە کرد".

"باوکی زوهرە دەڵێت: یەکەم شت گوێم لە بانگ بوو، وتم: خودایە! تۆ ئەم کچەت پێ خەڵات کردین، تەنها تۆش دەتوانیت پێمانی ببەخشیتەوە، خودایە ئەگەر حیکمەتیش لەوەدایە کە بگەڕێتەوە بارەگای حەقی تۆ، تۆ زاناتری و لە هەموو بەڕەحمێک بە ڕەحمتری!! "

زوهره دەڵێت: من سەرسام بووم، بەڵام هیچ ترسێکم نەبوو، دەموت: من لە ماڵەوە بووم، چ شتێک منی هێنایە نەخۆشخانە.

هەستم دەکرد زوهره ئەوەی سەرەوەیە، نەک جەستەکەم!

چرپاکەی لەسەری ڕاکشابووم لەگەڵ جەستەکەم وەک یەک گرنگ بوو لەلای من!

بەڵام باوکم و دایکم و پزیشکەکان هەرچیەکیان وت، من ئاگاداری بووم و دوایش کە لێم پرسین هەمان شت بوو، دایکم لەلای من بوو، باوکم و مێردی پورم لەگەڵ پزیشکەکە دور بوون و بە هێواشیش قسەیان دەکرد، هەتا دایکم گوێی لێ نەبێت.

بەڵام بۆمن زۆر ئاسایی گوێم لە وتەکانیان بوو.

هەستم بە شنەیەکی فێنک دەکرد لە پشتەوە، دەبینم بۆشاییەکی هەرگیز نەبینراوی بێ سنورە!

بۆشاییەکەی ڕەش، بەڵام ترسێنەر نەبوو، هۆکاری ترس و دودڵی نەبوو، ئارامی و هێمنی بوو.

من تەمەنم دوانزە ساڵان بوو، دەترسام لە تاریکی بەڵام لەوێدا هیچ باکێکم نەبوو.

نورێکی سپیم بینی لەسەرەوە، ئارەزوومەندی ئەوە بووم بزانم چیە!! زۆر دڵخۆش بووم.

من هەمیشە نموونەیەک بۆ ئەو دڵخۆشیە دێنمەوە، خوانەکردە هەرسێ مناڵەکەم توشی شێرپەنجە ببن و چارەیان نەبێت، لە کوت و پڕێکدا هەرسێکیان بە دەرمانێک چاک ببنەوە، چ دڵخۆشیەک ڕووم تێ دەکات، ئەو ساتەی کە من لەوێدا بووم، دڵخۆشیەک خۆشحاڵیەك، کەیفێکم هەبوو، هەزاران هەزار جار زیاتر بوو لە دڵخۆشی شیفای مناڵەکانم. هەرگیز وەسف ناکرێت هەستم بە ڕۆحی تر دەکرد لە هەموو لاکانمەوە، بەڵام من ڕووم لە نووری گەورە بوو، یەکێک وەک من لە تەنیشتمەوە سەر دەکەوت، کاتێک لە تونێلەکەدا بووین، تەمەنی مام ناوەند بوو، قەڵەو

بوو، قژی سەری کەم بوو، تازە بەهۆی سوتانەوە مردبوو، بەڵام زۆر سەرنجم نەدا و گرنگ نەبوو بەلامەوە، پیاوێکی ئەسمەر بوو، دەموت چەند جوانە، بە سوتان مردوە و، کەچی ئێستا هیچ ئازارێکی سوتاوی پێوە دیار نیە، ئەو جەستەکەی سوتابوو، خۆی هیچی نەبوو!

کچێک لەولای پیاوەکەوە بوو سەر دەکەوت، چوار ساڵان بوو، بە ڕووداوی هاتوچۆ مردبوو، هەر هەموومان زۆر دڵخۆش و کامەران بووین.

ئیدراکی ڕۆح وەک تۆپێکە لە هەموو لایەکەوە ڕووناکی بداتەوە، بۆ بینین و هەموو شتێک بەو جۆرە بوو.

وردبونەوە بۆ هەموو شت و هەموو لایەک بوو، نەک یەک ڕوو.

دوای ئەوە نزیکی پەنجەرەی نور بووینەوە، وەک پەنجەرەیەکی گەورە کە دێتە ناو نورەوە.

دوایی دەبێتە دەرگایەک، هەتا نزیکتر بیتەوە لێی گەورەتر دێتە پێش چاوانت، مەبەستم دەرگاکەیە، من وادەزانم دەرگایەکی بازنەیی گەورەیە، لەوێوە دەچیتە جیهانێکی گەورەتر و فراوانتر.

ئیتر ڕەنگی زۆر زۆر دەبینیت کە لە دونیا ئەو ڕەنگانە نەبووە.

ڕەنگەکان ڕۆحیان تیابوو، ئەو ڕووناکیانە دەیانەوێت هەرچی جوانیان هەیە دەری بخەن و پیشانتی بدەن.

ئەوان بەختەوەرن بە وجودی خۆیان، بەوەی کە خولقێنراون، تەنها بۆ ئەوە نا کە ئێمە ببینین، ئەوان کاریان ئەوەیە و زۆر بەختەوەرن بەوەی ئەنجامی دەدەن.

یەک شت بوو بوویە خەم بۆمن، دایکم لە تەنیشتی جەستەکەم دانیشتبوو، بەردەوام بەناوی خۆمەوە بانگی لێ دەکردم.

لە کاتی ئەو ئەزموونەدا بەردەوام دەنگی دایکم پێ دەگەیشت.

دەموت: دایە تکات لێ دەکەم بانگم مەکە. چونکە ئەو دەنگە نەیدەهێڵا بە ئـارامی سەربکەوم، کە ناوی خۆمم لەسەر زمانی دایکی ئـازیزم دەبیسـت نـاڕەحەت دەبـووم، دەنگی گریانیم نەبیست.

چـونکە نەمدەویسـت بە ئەنـدازەی گەردێـك لەو نـورە دابـڕێم. هەتـا گەیشـتە ئەو نورەی کە لە دورەوە تەنها بریسکەیەک بوو، لە نـزیکەوە بۆشـاییەکی زۆر بـێ کۆتـایی بوو.

خەڵکانێکی زۆر زۆرم بینی کە پێش ئێمە گەیشتبونە ئەوێ، یەکەم شـتێک سـەرنجی ڕاکێشام جوانی و قەشەنگی پۆشاك و بەرگەکانیان بـوو، پۆشـاك و بەرگیشـیان ژیـانی تیابوو، هەموو ساتێک دەگۆڕان، هەتا جـوانی زیـاتر پیشـان بـدەن، ڕەنگیـان لە نێـوان سپیەکی زۆر سپی و، سەوزێکی کراوەی زۆر جواندا بوو.

ئەو خەڵکە زۆر دڵخـۆش بـوون، زۆر بە گەرمـی پێشـبڕکێیان دەکـرد بـۆ پێشـوازی لێکردنمان، گوێم لێ بوو دەیانوت: ئەوا هاتن، هاتن.

زۆر بەپەلە بوون هەتا ئێمە لە ئـامێز بگـرن و نزیـک ببـنەوە لـێمان. سـەلامیان لـێ دەکردین.

جوانترین وەسف لە سورەتی واقعەدا هاتووە:

﴿لاَ يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْواً وَلاَ تَأْثِيماً لاَ يَسْـمَعُونَ فِيهَـا لَغْـواً وَلاَ تَـأْثِيماً(٢٥) إِلاَّ قِـيلاً سَلاَماً﴾ (الواقعة: ٢٥-٢٦)

ئەو وەسفەی قورئان باسی دەکات، بە تەواوەتی لەوێ بینیم و پێشوازیان بەو جـۆرە لێ کردین.

ئێمە نـامۆ بـووین بە یەکـتریش، بەڵام دەمـانزانی لەو شـوێنەیە، یەک پـلە و مەقـام بوون.

که مـن ویسـتم بچـم بـۆ لایـان و به تەواوی تێکەڵیـان بـبم و بـڕۆمه نـاو بـاخ و کۆشکەکەیان هەستم به هێزێک کرد، 'بۆ دونیا دەبێت نـاوی لـێ بنـێم دوو دەسـت که گرتمی' لەوێ به ناونیشانی دەست نەبوو، هێزێک گرتمـی و به هێزێکـی زۆرەوە منـی گێڕایەوە.

هاوارم دەکرد ئەوە لەگەڵ من مەکەن، من نامەوێت بگەڕێمەوە، بەڵام ئەو هێزە منـی گێڕایەوە که فەرمانی پێ کرابوو من بگێڕێتەوە.

هەر ئەوەندەی گەڕێنرامەوە، هەستم به ڕۆحم کرد خـرایه نێـو جەسـتەم، مـن وەکـو ئەوەی له ئاو و زۆنگاوێکدا بم هەوڵـی دەربـاز بـوونم دەدا، دەمویسـت هەر چۆنێـک هەیه له جەستەم دەرچم و نەگەڕێمەوە ناوی، ئەو زۆنگاوە جەستەی خـۆم بـوو، بەڵام سەرکەوتوو نەبووم، ئیتر نغرۆی ناو جەستەم بوومەوە.

که نغرۆی زۆنگـاوە مەترسـی دارەکه بـوومەوە 'جەسـتە' یەکسـەر چـاوم کـردەوە و دایکم بینی فرمێسک به چاوەکانیدا دەهاته خوارەوە و بانگی دەکردم بەناوی خـۆمەوە. باپیرەشم بینی لەلای چەپم بوو، چاویلکەیەکی گەورەی لەچاودا بوو سەیری دەکـردم، ئیتر دەستم به گریـان کـرد، بەهـۆی ئەو ئەزمـوونەوە دەدوێـم بـۆ ئەوانەی باوەڕیـان به زیندوو بوونەوە نیه، بۆ ئەوانەی نەخۆشی شێرپەنجه و ترسناکیان هەیه پێیـان دەڵـێم که لێرە دەرچوون و ڕۆشتن هیچ ئازار و خەم و خەفەتێکتان لەگەڵ نایەت.

ئێستا زۆر بەجوانی و به دڵسۆزیەوە کارەکانم دەکەم، چـونکه کـاری قبـوڵ کـراوی ئەوێ دەبێت پڕ دڵسۆزی بێت.

عەزیزێکی زۆر خۆشەویستم کۆچی دوایی کرد، زۆر پـاڕامەوە له خـوای گەورە که نەمرێت و بگەڕێتەوە ناومان، بەڵام کاتێـک مـرد دڵئـارام بـووم و چپانـدم به گوێیـدا و وتم: ئیزعاجت ناکەم، ئەزانـم له گۆشـەیەکی ئەم شـوێنەوە ئاگـاداری ئێمەیـت، بەڵام دڵنیام له باشترین حاڵدایت، داواکارم عاقیبەت خێر بیت.

ئیتر باوەشم پیا کرد و له ژورەکه ڕۆشتمه دەرەوە.

بەڕاستی دوای ئەو ئەزموونە حەزم بە دیداری ئەوانە نیە کە باوەڕیان بە زیندوو بوونەوە و قیامەت نیە!

تەنانەت ئەگەر منالی خۆشم بێت.

خوای گەورە دەفەرمویت: ﴿لَا تَجِدُ قَوْماً يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ يُوَادُّونَ مَنْ حَادَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَلَوْ كَانُوا آبَاءَهُمْ أَوْ أَبْنَاءَهُمْ أَوْ إِخْوَانَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ﴾ (المجادلة: ٢٢)

بە تەواوەتی حالی من وەک تەفسیری ئەو ئایەتەیە.

من نالێم بەندەیەکی صالحم، بەڵام ئومێد دەکەم شوێن پێیان هەڵبگرم. ئەمەش دەمارگیری نیە، بەڵکو هەڵقوڵاوی هەست و دەرك کردنێکە کە لە خۆمدا بەرجەستەم کردوە و شهودی بووە و، بینیومە و چێژم کردوە.

دروستکراوی ئەزەلی و ئەبەدی و تاک و تەنها هەیە، لەو دونیا جیهانێکی بێ سنوری بۆ بەندەکانی دروست کردوە و، مردن تەنها ناوێکە و، ڕێگەیەکە بۆ گواستنەوە لێرەی فانی یەوە بۆ ئەوێی هەتا هەتایی ماوە.

هەرگیز ناتوانم ڕوپامایی و پێکەوە ژیان لەگەڵ ئەوانەدا سازبدەم کە ئیمانیان بە خوا و بە قیامەت نیە. ئێمە و ئەوان زۆر زۆر جیاوازین.

## من ئازاری ڕۆح دەرچوونم هەبوو

'حامید طە هماسبی' ئەندازیاری میکانیکی یە و سالی (١٩٩٣) لەدایک بووە و خاوەنی ئەزموونێکی زۆر گرنگە.

حامید ئەزموونەکەیمان بۆ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: سالی (٢٠١٣) بوو، نانی نیوەڕۆمان دەخوارد، لەگەڵ براکەم بوو بە شەڕمان و، من توڕەبووم و چوومە دەرەوە و

ویستم ئۆتۆمبیلەکەی باوکم بشۆم، من یەکـێکم لەوانەی کە پێشـبڕکێی ماتۆڕسـواری و پاسکیل دەکەن، چاوم چوویە سەر پاسکیلەکەم، شەوی پێشتر من خۆم ئامـادە دەکـرد بۆ تیمی نیشتمانی پاسکیل سواری، وتـم بـابچم بـۆ ڕاهێنـان، هەمـوو پێویسـتیەکانیم ئامادەکرد و دەرچـووم، دایکـم هـات و وتـی: حامـد ئەمـڕۆ مەڕۆ، دەچـین بـۆ مـاڵی باپیرت.

وتم: خەمت نەبێت زوو دەگەڕێمەوە.

باوکیشم وتی: حامد مەڕۆ.

باوکم وتی: ئەو برە پارەیە ببە بۆ سندوقی سەدەقە و خێـر، ئینجـا کلیلـی ماڵەوەیـان پێ دام هەتا ئەگەر پێش ئەوان هاتمەوە، ئەوا بێمەوە بۆ ماڵەوە.

'آية الكرسي' و دوعای گەشتم خوێند و، پاسکیلەکەم برد و لەماڵ دەرچووم.

پەنجا مەترێک ڕۆشتبووم، ڕازێک هات بە دڵمدا و پێی وتم: حامیـد ئەمـڕۆ لەمـاڵ دەرمەچۆ.

خۆم وەڵامی ڕازەکەمم دایەوە و وتم: گرنگ نیە، دەڕۆم و هەنـدێ وەرزش دەکەم و لە دوایدا دەگەڕێمەوە.

پارەکەم برد بۆ سندوقی خێرات و دامنا.

نزیکەی هەشت سەد مەترێک ڕۆشتم، گـوێم لـێ بـوو یەکێـک لەوانەی خـواردنی بەبۆنەی وەفاتی ئیمام جەعفەری صادقەوە دەبەخشیەوە، لاواندنەوەی دەکـرد بەو بـۆنە پیرۆزەوە.

خەڵکی سەیریان دەکردم، چونکە پۆشاکی ڕەنگاوڕەنگم لەبەردابـوو لە ڕۆژێکـی وا پیرۆزی ماتەمینیدا!

دیسانەوە ئەوە لە دڵمدا دروسـت بـوویەوە کە حامیـد سـەیری خەڵکـی بـکە چـۆن سەیرت دەکەن، بگەڕێـرەوە بـۆ مـاڵەوە. شـوێنی ڕاهێنـانەکەم بیسـت و دوو کیلـۆمەتر

دوربـوو. لە 'ترقبـة' ی مەشـهەد، سـەگێکم بینـی هەمـوو کاتێـک خـواردنم پـێ دەدا، سەگەکە دوام کەوت، من ئەو جارە تەنها شەکرم پێ بوو، هەندێکم پێ دا و ڕۆشتم.

سـەگەکە بەردەوام بـوو بەدوامـدا دەهـات، سـێ کیلـۆمەتری تـر ڕۆشـتم، سـێ ماتۆڕسوار تەنگیان پێ هەڵچنیم، یەکێکیان لە پێشمەوە و ئەوانی تـر لە دوامەوە بـوون، یەکێکیان زلەیەکی لە پێشی سەرم دا و کەوتم.

هەرسێکیان وەستان و، دەستیان کرد بە گاڵتە پێ کردن و پێکەنین پێم.

قسەیان پێ وتم و دڵم زۆر خەمبار بوو. بڕیارم دا بڕۆم و بەردەوام بم، کەمێکـی تـر ڕۆشتم و ویستم بگەڕێمەوە، گەیشتمە سێ ڕیانێک، لەسەر ڕێگەی 'مەشـهەد و تەرقـیە و شاندیز'، ڕووم کردە مەشهەد، دوو سێ خولەك ڕۆشـتم، گەیشـتمە دوو ڕیانێـک، کە یەکێکیان بۆ ناوچەی 'کەوسەر' دەچوو، ئەوی تر بـۆ نـاوچەی 'وکیـل ئابـاد' دەچـوو، لەبەرئەوەی ڕێگەکەی خۆش بوو، بە خێراییەکی زۆر ڕۆشتم، تەکسیەک لە دواوە پەیـدا بـوو، لەلاوە پیاکێشـام، پەنجـا مەتـر بەدوای خۆیـدا ڕایکێشـابووم، دوای ئەوەش کەوتبوومە ژێر تەکسیەکە.

تەکسـیەکەش شـڵەژابوو، لە جیـاتی ئیسـتۆپ قـاچی بە بەنزینـدا نـابوو، خێراتـر بووبوو، جانتاکەی پشتم لەژێر تەکسـیەکە گیـر بووبـوو، لەسـەر ڕوو پەنجـا مەترێـک بەدەما ڕایکێشا بووم بەدوای خۆیدا!

دەم و چاو و ڕوخسارم هەمـوو شـێوابوو، جانتـاکەم و لایەکـی جەستەشـم گـڕی گرتبوو، دوای ئەوە سەیارەکە کێشابووی بە کۆنکرێت و بەرزاییەکدا و وەستا بوویەوە.

چاوەکانم لە شوێنی خۆی نەمـابوو، ئێسـکی سـەرم هەمـووی شـکابوو، هەرچـی کەسێک دەیبینیم یان دەبورایەوە یاخود حاڵی تێک دەچوو، هەناسەم زۆر توند بوو.

چەند چرکەیەک پێش ئەوەی ڕۆحم جەستەم بەجێ بهێڵێت گوێم لە هـات و هـاوار بـوو، دەیانکوژانـدمەوە، وەختـێ دەریانهێنـابووم لەژێـر تەکسـیەکە چەنـد کەسـێک بورابوونەوە.

ئاگام لێ بوو هەندێک کە لەوێـدا بـوون دەیـانوت خـودا لێـی خـۆش بێـت، تەواو بووە.

هەستم بە ترسێکی زۆرکرد.

ویستم شـایەتومان بهێـنم، لە کـوت و پڕێکـدا ئـازارم هـیچ نەمـا، هەسـتم کـرد لە ناوەڕاسـتی جەسـتەمەوە کـێش دەکـرێم بـۆ سـەرەوە، هەمـان هێـزیش 'لە ناوەڕاسـتی جەستەمەوە' بۆ خوارەوە ڕامدەکێشێت!

زۆر زۆر ئازارم پێ گەیشت، وەک ئەوە بوو بزمار ڕێژی پەنجەکانت بکرێت، بەڵکو زیاتریش بوو.

هەتا گەیشتە تەوقـی سـەرم، ئیـتر لەو کـاتەدا هەسـتم بە ئـازاری جەسـتەم نەکـرد، بەڕاستی وەک خۆم ئازاری ڕۆح دەرچوونم هەبوو.

دەتوت جەستەی مـن بـووە بە قـامچیەک و لە ئاسـمانەوە بە تونـدی و بە زەبـر بەر زەوی دەکەوێت.

لەو کاتەدا تەواوی کردەوە و هەڵسوکەوت و گوناهەکانم بینیەوە.

چاکە و خراپەم بینیەوە.

هەزاران ڕووداو لەپێش چاوانمدا تێپەڕین.

دڵ ڕەقی و، دڵ شکاندنی خەڵکی و، بێ باکی و، لە خۆبایی بونی خۆمم بینیەوە.

ئەمە حاڵەتی گیان کێشان و فڕینی گیانی من بو لە قەفەسەی جەستەم.

حامیدێک ڕووداو و قەدەری بەسەر هاتبوو، تەعزیبی هەبوو، مـن لەوەو پـێش زۆر گرنگیم بەجوانی خۆم دەدا.

ئەگەر زیپکەیەک لە دەم و چاوم بهاتایە، هەفتەیەک نەدەچوومە دەرەوە هەتا چارەسەری بکەم، ئێستا کە توشی ئەم قەدەرە گەورە بوومەوە، هەستم دەکرد ڕوخسارم لە سەرم جیابوەتەوە، وەختێ سەیری ئاوێنە دەکەم هیچم لە حامیدەکەی جاران ناچێت!!

شڵەقانی جەستەم ئەو پەیامەی پێ دەوتم کە:

حامید ئەم ئەندامانەی جەستەت بە جوانترین شێوە بەخشیمان بەتۆ، ئێستا لێت وەردەگرینەوە.

خوای گەورە ئەو جوانیەی پێ بەخشیت، شوکرت نەکرد، شایستەی نەبوویت، هەستم بەو مانایە دەکرد، هەموو ئەمانە لە چرکەساتی گیان کێشانی بو دا ڕوویان دا.

وام هەست کرد، زاتێک فەرمان دەکات بەیەکێکی تر کە بەڕەحم و بەزەیی یە لەکاتی گیان کێشاندا.

ئیتر ئەوەبوو هەناسەیەکی قوڵم هەڵکێشا، ئیتر ئەوەی دوای ئێرە باسی دەکەم، دەکەوێتە دوای جیهانی مردن. ئیتر ڕۆحم لە جەستەم ڕۆشتە دەرەوە. شتانێکی زۆر جوان ڕوویان دا، هەندێ سەختیش هاتە ڕێگەم، ئەزموونەکەم زۆر قوڵ بوو.

باسی سێ هەڵوێستیان دەکەم، کە خۆشم ویستن و پەیوەستیان بووم. ڕۆحم لە سنگمەوە هاتە دەرەوە.

لە دوری (٣-٤) مەتر لە سەرووی خۆمەوە بووم. ڕۆحم حامیدێکی قامەت بەرزی ڕاوەستاو بوو.

وەختێ ڕۆح دەردەچێت، وەکو سروە و شەماڵی بەیانیەکی فێنکی زۆر زووە. هەست بە بۆنخۆشیەکی زۆر زۆر سەرسوڕهێنەر دەکەیت. ئیتر هەموو شتێکم لە سەرەوە دەبینی، جانتاکەی شانم بینی کە بەشێکی سوتابوو، شتەکانی ناو جانتاکەم

دەدزران، جەستەی خۆم، ئەو خەڵکەی لەوێدا بوون، کەسێکم بینی خەریکی دزینی شتەکانم بوو، ڕقم لێی نەبوو، حەزم کرد شتەکانی برد، بۆ ئەوەی دایکم نەیانبینێت.

مۆبایل و شت و مەکی خۆمی تیابوو، سایەقی ئەو تەکسیە و خێزانەکەیم بینی، بینیم کە خێزانەکەی بێ هۆش کەوتبوو، کاتێک منی بینی خەڵتانی خوێن و سوتان و نەمانی ڕوخسارم بووم.

لە هەمان کاتدا دایکم و باوکم دەبینی کە لە مزگەوتی زەهراء دەرسیان دەوتەوە. هەزاران شتم لە شوێنی جیاواز دەبینی، لە کاتێکدا مزگەوتی 'زەهراء' سی کیلۆمەتر لەو شوێنە دور بوو.

بەشێک لە ژیانی خاوەن تەکسیەکەم بینی، پێش ڕوودانی کارەساتەکە، خاوەنی تەکسیەکە شەڕی بوو لەگەڵ خێزانەکەی، دوو کەسی تریشیان لەگەڵ بوو لەناو تەکسیەکەدا، ڕابردوویانم بینی.

ئاگاداری هەموو شتێکیان بووم، ئامانجیان و ژیانیان. ژن و پیاوێک لەلای جەستەکەم بوون، ڕابوردویانم بینی، ئەو ژن و پیاوە دەیانویست بوژانەوەی دڵم بۆ بکەن.

بەڵام نەیانتوانی هیچ بکەن، من لەناو ترس و سەرسوڕماندا بووم.

تونەیلەکە زۆر زۆر جوان بوو، لە ئاو دەچوو.

ڕوخساری دزەکەم لەبیرماوە، بەڵام هەرگیز سکاڵای لێ ناکەم.

دەمتوانی ڕابردووی هەموویان بزانم و زانیشم، زانینی زۆر ئاسایی بوو.

لەوێ بە ئەندازەی زەریاکان زانیاری وەردەگریت، بەڵام تەنها دڵۆپێکی دێنیتەوە بۆ ئێرەی دونیا.

زۆر هەوڵم دا بچمەوە ناو جەستەکەی خۆم، بەڵام بێ سوود بوو.

دوای ئەوە شـوێنی ڕووداوەکە ون بـوو، لە دوورەوە ڕوخسـارێکی نـورانی ئێجگـار جوان و بەویقار و زۆر ڕێک پۆشم بینی.

لێی نزیک دەبوومەوە، خەریک بوو بترسم!

پێیان وتم: ئازارت پـێ ناگـات، میهرەبـانی دادەپۆشـێت، ئینجـا ڕۆشـتمەوە بەلای جەسـتەکەمەوە 'جـارێکی تـر' ئەو نـور و ڕونـاکیە بە هەیـبەتەش دەیزانــی مــن زۆر پەیوەسـتی جەسـتەکەمم، ڕۆشـت بەلایەوە و دەسـتی پیادەهێنـا و، ڕوخسـاری پـاک دەکردمەوە لە خوێن و خۆڵ و پیسی، کە دەستی پیاهێنا وەکو جـاران جـوان بـوومەوە، وام هەست کرد کە من چاک بوومەتەوە، ویستم بچمەوە ناو جەسـتەکەم، بەڵام نەکـرا، هەستم کرد لە جاران باشترم و جوانترم وتم: بە نورانیەکە، باشە چۆن ئەوەت کرد؟

وتی: خوای گەورە بەڕەحمە.

وتم: واتە من ئەهلی دۆزەخ نیم.

وتی: کردەوە خراپەکانت دۆزەخین.

وتم: دەچمە بەهەشت.

وتی: کردارە باشەکانت بەهەشتین.

وتم: بۆ کوێم دەبەن. 'لەناو تونەیلەکەدا بووین'.

دوای ئەوە ڕۆشتمە ناو دڵخۆشــی و کـامەرانیەوە. ئەو نـورانیە زۆر زۆر موحیبـانە و خۆشەویستانە سەیری دەکردم. دووبـارە هەروەکـو کـاتی گیـان دەرچـوونم دیسـانەوە کردارەکانم بە باش و خراپەوە پیشان درایەوە، ئەو نورانیە بردمی بۆ وێسـتگەیەکی تـری ژیانم، من کاتێک دە ساڵان بووم پیاوێکی بەساڵاچوو لە مـزگەوتەکە دەهـاتە دەرەوە و بۆ پێڵاوەکانی دەگەڕا، من کارێکی سـادەم ئەنجـام دا، پێڵاوەکـانم بـۆ هێنـا و لەپـێش قاچی بۆم دانا، پیاوە پیرەکە پێی وتم: ئەی گەنج یاخوا قاچەکانت سەلامەت بن، ئیـتر ڕۆشت.

ئەم کارەمیـان لەو دونیـا بە فراوانـی پیشـان دامەوە. بردمیـان بـۆ ئەو شـوێنەی کە پێڵاوەکەی تێدا دروست دەکرا، هەرچـی کەسـێک کـۆمەکی کردبـوو، ئەو پیـاوەی کە پێڵاوەکەی فرۆشت بەم پیرە پیاوە، ئەوەشم زانی کە کوڕی پیاوە پیرەکە پێڵاوەکـانی بـۆ باوکی کڕی بوو.

منیان برد بۆ ناو ژیانی پێڵاو فرۆشەکە، ئەو بەشەی ژیانی ئەو پیـاوە کە پیشـانم درا، ئەوە بوو پارچە قوماشێک ڕاخرابوو، تەواوی خێزانەکە لە دەوری بوون، کە هەموویـان بەشداریان دەکرد لە دروست کردنـی پـێڵاودا، یەکێـک دەیـدوری، یەکێـک بنـاغەکەی دادەنا، یەکێک بۆیاخ و کەتیرەی لێ دەدا و... بەو جـۆرە کە پێڵاوێکیـان تەواو دەکـرد، دەیانخستە کەنارەوە و هەموویان دڵخـۆش دەبـوون. لەو کاتەشـدا ژمـارەیەک فریشـتە دادەبەزین و بەشداری ئەو دڵخۆشـیەی ئەو ماڵەیـان دەکـرد. خۆشـیەکی وا ڕووی تـێ دەکردن کە فریشتەکان حاڵەتی شادمانی ڕووی دەدا لێیان.

تەنانەت گوڵەکانیش لەو ماڵەدا بەدڵخۆشی ئەوان دڵخۆش دەبوون.

پێیان وتم: سـێ جـار بەهـۆی دوعـای ئەو پیـاوە پیـرەوە خـوای گەورە لایـداویت لەوەی قاچت توشی دەرد و بەڵایەکی وابیێت، کە ببێتە هۆی بڕینەوەی!

کە من پێڵاوەکانم بۆ دانا هەمـوو خەم و پەژارە و هەسـتێکی خـراپ دورکەوتەوە لە پیاوە بەتەمەنەکە.

ئەوەشیان پیشان دامەوە، کاتێك ئەو پیاوە دەچێتەوە ماڵەوە... نزای بۆمن دەکرد.

کە کاریگەری زۆری لە ژیانی مندا بەجێ هێڵا.

نورانیەکە منـی بـردە ویسـتگەیەکی تـر، کە خـۆمم بینـیەوە 'پـێش ئەزمـوونەکەم' لە پۆشاك و بەرگی پێشبڕکێدا.

لە شەقامی سەجاد بـووم لە مەشـهەد، ئامـاژەی تـرافیکەکە سـوربوو، ئۆتۆمبیلێـک وەستابوو، مناڵە بچووکەکەیان سەری لە سەقفی سـەیارەکە دەرهێنـابوو، مـن هەسـتام

بەوەی مولاتەفە و خۆشەویستم بۆ منالەکە دەربڕی، منالەکە دەستی کردن بە پێکەنین بۆمن و دەستی دەکێشا بە سەرشانی دایکی و باوکیدا و ئاماژەی بۆمن دەکرد، کە من دەمخستە پێکەنین.

باوک و دایکیشی دەستیان کرد بە پێکەنین. ئیتر ئاماژەکە سەوز بوو، هەموو ئۆتۆمبیلەکان ڕۆشتن. من بە هیچ جۆرێک دوای کاتێکی کەم بیرم نەما!

لەو دونیا پیشانم درایەوە "ولوا أن تلقى أخاك بوجه طليق"[1].

بەهیچ جۆرێک نەمزانیوە ڕووخۆشی و پێکەنینێک ئەوەندە کاریگەری گەورەی دەبێت.

پێیان وتم: ئەو منالەی کە تۆ خستتە پێکەنین لە فلان ڕۆژ و فلان کاتدا، دایک و باوکی خەریکی ئەوە بوون جیابنەوە لە یەکتر، پیشانیان دام کە پیاوەکە لای گوڵ فرۆشێکدا ڕاوەستا و، گوڵێکی وەک لاپەڕەی نوێ و نیاز پاکی و سەرەتای باش پێشکەشی خێزانەکەی کرد و پێ وت: هەوڵ دەدەم بەختەوەرت بکەم و جارێکی تر دڵت نەڕەنجێنم.

ئیتر پێکهاتنەوە و پەیوەندیان باش بوویەوە، لەوێ ئەو چرکەساتە جوانانەیان پیشان دامەوە.

وتیان: حامد بزانە بەیەک پێکەنین، چ بەهەشتێکی بێ سنورت بۆخۆت والاکرد، جوانی و بەختەوەریەکی بێ سنورمان بە ڕووتاکردەوە بەبێ کۆتا بیر لە هەرچی جوانیەک بکەیتەوە پێت دەبەخشرێت.

ئەو پێکەنینە لەسەر ئەو منالە ئەوەندە کاریگەر بوو، تەنانەت هەرچی جارێک ئەو منالە سەیری باوک و دایکی بکات و دڵی خۆش ببێت، لەوێ 'لەو دونیا' بەختەوەری و وزە و خێری زیادە دەستی من دەکەوێت کە لە ژماردن نایەت.

---

[1]- صحيح مسلم.

هەرچی جارێک ئەو ژن و پیاوە بە عیشق و خۆشەویستیەوە یەکتر بدوێنن، بەشێک لە خێر بێ کۆتا بۆمن دەنوسرێت. تەنانەت بردمیان بۆ بینینی داهاتووی ئەو منداڵە کە گەورە بوو بوو، هەرچی کارێکی چاکەی دەکرد، بە ئەندازەی کاری چاکەی ئەو منداڵە بۆ منیش دەنوسرا کاردانەوەی باشی ئەو ژن و پیاوە ئەوەندە لەسەر دەور و پشتیشیان هەبوو، کە لە خێری ئەوانیشدا بەشدار بووم.

لەو کاتەوەی لە ئەزموونەکەم گەڕاومەتەوە، هەمیشە شکولاتە و بسکیت و شتی جوان بۆ منداڵان دەکرم و دڵیان خۆش دەکەم، زۆرجار لێم ترساون، لەبەر ناشیرین بوونی ڕووخسارم، کاتێک کە منیان دەبینی دەگریان.

من ئێستا لەدوای هەژدە نەشتەرگەری ڕوخسار و لوت و دەم و چاوم، هەندێ ڕوخسارم بەرەو باشی چووە.

تەنانەت خوشکەزاکەشم لێم دەترسا، بە لوتفی خوا ئێستا باشم.

لە ویستگەیەکی تری سەردەمی منداڵیمدا چەندین ڕووداوم پیشان درایەوە، وەک فلیمێک هەموو ژیانم بە وردەکاریەکانیەوە بینیەوە.

پیاوێکی پیر لە کۆڵانەکەماندا هەبوو، خوا لێی خۆش بێت کۆچی دوایی کردوە، ئەو کاتە من جیاکاریم دەکرد لە نێوان چاک و خراپدا، دەڕۆشتم لە دوکانەکەی چپسی پەتاتەم لێ دەدزی و دەمخوارد، هەموو یەکێک لەو چیپسانە، بوون بە شتێک کە چواندن و 'تشبیە' ی زۆر ئاستەمە، دەبووە هۆی شێواندن و تێک دانی قورگ، هەموو جوانیەکی وێران دەکرد.

ئەگەر جەستەی ئێمە کەشتیەک بێت، یەک دانە لەو چیپسە حەرامانە دەبنە هۆی هەڵوەشاندنەوەی تەواوی ئەو کەشتیە جوان و پڕ بایەخە.

تەواوی مەکینە و ڕازاوەیی ئەو کەشتیە وێران ببێت بە تەنها یەک چیپسی حەرام.

''ئەبێت ئەو هەموو پارە حەرامەی کە بە ئاشکرا و بەناوی جیاوازی موچەی قەبەی حزب و سیاسی و سەرکردە جیاوازەکانی نەتەوەیی و علمانی و حزبی ئیسلامی، کە

خوێن و داهاتی وڵاتێکه و تاڵان و بڕۆ دەکرێـت و کـۆمەڵێکی کەمـی پـێ دەوڵەمەنـد دەبێت لەسەر حسابی خەڵکی هەژاری ئەم وڵاتە ستەم لێ کـراوە، دەبێـت دنیـا- دنیـا- بست بە بستی زەوی و کۆمپانیا و ڤێلا و... پارەکانیان بـۆ قیـامەت چیـان لـێ بکـات، سوپاس بۆ خـوای گەورە لە سیاسـەت و حزبـایەتی و خەڵاتانـدن و پـارەی حەرامـی لێپرسراوی و مەنصەب و پلە و پارە و پارەوەکانیان پاراستینی".

لەوێدا هەستم بە خراپی خۆم دەکـرد، بێـزم لەخـۆم دەهـاتەوە، ئـاواتە خـواز بـووم هەزاران کیلۆمەتر هەڵبێم لەو ڕووداوانەی کە حەرام خۆری بەرهەم دەهێنا.

﴿يَوْمَ تَجِدُ كُلُّ نَفْسٍ مَّا عَمِلَتْ مِنْ خَيْرٍ مُّحْضَراً وَمَا عَمِلَتْ مِن سُوَءٍ تَوَدُّ لَوْ أَنَّ بَيْنَهَا وَبَيْنَهُ أَمَداً بَعِيداً وَيُحَذِّرُكُمُ اللَّهُ نَفْسَهُ وَاللَّهُ رَؤُوفُ بِالْعِبَادِ﴾ (آل عمران: ٣٠)

خوای گەورە نایەوێت سزامان بدات، ئاگادارمان دەکـاتەوە هەتـا دەسـت لە حەرام خۆری هەڵبگرین.

﴿... وَيُحَذِّرُكُمُ اللَّهُ نَفْسَـهُ وَاللَّهُ رَؤُوفُ بِالْعِبَـادِ﴾ دوای ئەوەی ئەو حـاڵەتەم بینـی، حاڵم زۆر خـراپ تێـک چـوو، کـاتێ لە بەردەم ئەو پیـاوە دوکانـدارەدا وەسـتاندمیان، هەرچی هەستی خراپی ئەو هەبوو دایان بەسەر منـدا، مـن سـێ مەترێـک لەو پیـاوەوە دور بووم، هەرچی گوناهی هەیە هـات بـۆ مـن، چاکەکـانی منـیش ڕۆشـتن بـۆ ئەو، دووبارە دەبویەوە، ڕوخساری بێ تاقەتی ئەو پیاوە پیـرە، بـوو بە ڕوخسـارێکی جـوانی بێ خەم و پێ دەکەنی.

ڕۆحی خەڵکانێکی ترم لەوێدا بینی، بێجگە لەو پیاوە دوکاندارە، هەموویـان لە سـزا و ناڕەحەتیدا بوون.

هەچ یەکێکیان سەرقاڵی سزای خۆی بوو.

هیچ کەسێک نەیدەپەرژایە سەر کەسی تر.

حاڵی هەمووومان زۆر خراپ بوو، تەنها یەک کەس نەبێت ئێمە سزای گوناهەکـانی خۆمانمان وەردەگرتەوە، دۆزەخێک کە خۆمان بۆ خۆمانمان سازاندبوو.

ئەو پیـاوە جـوانیەکی دەسـت کەوت، کە هەرگیـز لە دونیـادا دەسـتی هـیچ کەس ناکەوێت.

کوڕی ئەو پیاوە خێری زۆری بۆ باوکی دەکرد و پێی دەگەیشت.

یەک لەفەی قـاورمە و گەص، پـاروە نـانێ، قـومێ ئـاو، قەڵەمێـک، خـواردن بـۆ هەژاران، دەبێتە ملیارەها بۆ ئاخرەت و قیامەت.

لەو ساتەدا نـازانم بـونی مـن چـی بەسـەرهات، وتـم: خـودایە هـاوار دەهێـنم بـۆ خزمەتی زاتی گەورە و میهرەبانت ئەم سزا و ناهەمواریەم لەسەر هەڵبگرە.

هەتاوەکو ئەو پیاوە بەختەوەر و دڵ خۆش بم، پەیمانت پێ دەدەم تەنهـا بگەڕێـمەوە بۆ دونیا هیچ خێر و چاکە و بەخشینێک لە کیسی خۆم نەدەم.

نازانم چی بوو ڕوویـدا، هەر ئەوەنـدەی هـاوارم گەیانـدە بارەگـای حەق تەعـالا و پەیمانم دا، هەموو سزا و ناڕەحەتیەکم لەسەر نەما، هەستم بە دڵئارامیەکی زۆر تـایبەت کرد.

نورانیەکە دەستی خستە سەرشانم و وتی: بڕۆ کردارت باش بـکە و، ئەو پەیـمانەت داوتە بەخوا بیبەرە سەر، ئیتر ڕۆحم گەڕایەوە ناو جەستەکەم.

با بەجۆرێک مامەڵە بکەین کە خەڵکی کەمەندکێشی دین و ئیمان و ئیسلام بکەیـن، خەڵکی بەناوی ئاینەوە فریو نەچن و مەبەستمان دونیا و دەستکەوتی دونیـایی خۆمـان بێت، با خەڵکی لە ئاین و ئیمان نەتۆرێنین.

خەڵکـی هەرچـی دیـن و مەزهەبێکـی جیـاوازی هەیە ڕێـزی لـێ بگـرە. پـاڵفتەی ئەزمـوونەکەم ئەوەیە، خـوای گەورە زۆر بەڕەحـمە. خـوای گەورە ئاگـاداری هەمـوو شتێکمانە، چی بە دەرونیشماندا دەگوزەرێت ئاگـاداریەتی، ئەگەر ئـێمە خۆشەویسـتی خوابین هیچ خەم و ئازار و ناخۆشیەک پێمان ناوێرێت.

داوا لە زانایانی ئاین و بانگخوازان دەکەم نموونەی ڕاست و جوان بن، هەتا خەڵکی بەهۆی ئەوانەوە لە دین نەتۆرێن. باوەکو موگناتیس بن خەڵکی بۆ لای ئیمان و ئیسلام کێش بکەن، مادام بەناوی دینەوە دەدوێن نابێت برسی کورسی و پارە و پۆست بن، زۆر زۆر خۆیان لە پارەی حەرام بپارێزن.

## نزیکبوونەوە لە مردن
## خۆشیەکانی ئەوێ هەستی دایکایەتی لێ گرتمەوە

'طەیبە موجەرەد بەهجەت' لە شاری 'مەشهەد' ژیان بەسەر دەبات، لە ناوچەی 'بوجنورد' لە خۆراسان دەژی.

ئەزموونەکەی دەگێڕێتەوە و دەڵێت: ماوەیەک بوو 'هوما' لەدایک بووبوو، ڕۆشتمەوە بۆماڵی باوکم، نزیکەی دە ڕۆژێک مامەوە، لە کاتێکدا شوێنی نیشتەجێ بوونم شاری 'بوجنورد'دە. پێش ئەوەی دکتۆر وادەی منداڵ بوونەکەم بۆ دیاری بکات، من ڕۆشتمەوە بۆ ماڵی باوکم.

ڕۆژی پێنجەمی مانگی 'بەهمەن' ڕۆشتین بۆ نەخۆشخانە، من و باوکم و دایکم و برا و خوشکەکەم بووین، هەموو شتێک ئاسایی بوو، پزیشکەکان دڵنیایان کردینەوە کە باری منداڵەکە و خۆم ئاساییە و هیچ کێشەیەک نیە. لە ژوری چاوەڕوانی منداڵ بووندا بوو، هەتا هەموو پێداویستیەکانی پێش نەشتەرگەری تەواو ببێت و منداڵەکەم لە ئامێز بگرم.

هەستیاریم بە دەرمانێک هەیە، کاتێک پەرستارەکە دەرزیەکەی بۆ کردم وتی: هەندێک گێژبوونت بۆ دروست دەکات، بەڵام ئاساییە، بەڵام من حەساسیەتێکی قورسم بەو دەرمانە هەبوو، ئیتر هەستیاریەکەم بەدەرکەوت و زیادی کرد، هاوارم کرد و وتم بە پەرستارەکە: من هیچ نابینم!.

سەرم گێژ دەخوات!

بۆچی ئاوام لێ هات!

هێشتا ئاگام لە خۆم بوو، دەمتوانی قسە بکەم، بەڵام هەستم کرد ستافە پزیشکیەکە پەرێشان بوون، لە دوای گەڕانەوەم و باش بوونم زانیم، کە پەیوەندیان کردبوو بە پزیشکی تایبەتی منەوە، ئەویش عەیادەکەی بەجێ هێڵابوو بە خێرایی هاتبوو بۆ نەخۆشخانە، ئەزموونەکەم لێرەوە دەستی پێ کرد.

وورده ورده دونیا لە پێش چاوانم گۆڕا، هاوار و شپرزەیی و نائارامی نەما، نەمدەزانی من لە کوێم! هاوار و ناڵە و ترسی منیش هیچی نەما، لە دوای ئەوە زانیم کە من جیابومەتەوە لەو کەشەی پێشووتر، هەستم نەدەکرد کە من پەیوەندیم بە نەخۆشی و نەخۆشخانەوە هەیە، لە شوێنێک بووم بە تەواوی نوێ بوو، من هێواش هێواش کەوتمە قۆناغە جیاوازەکانی ئەزموونەکەم، ڕۆشتمە ناو نورێکی ڕەنگاو ڕەنگەوە، لە شێوەی تونێلێکدا بوو، ڕەنگەکانی دونیا ناتەواون، ناتوانن نەخشی ئەوێ پیشان بدەن.

من خودی خۆم بووم، بەڵام هەستی ئەوەم نەبوو دایکم.

پەیوەندیم بە ڕابردووی خۆمەوە نەمابوو.

بەڵام بیرم لەوە دەکردەوە کە من بۆ کوێ دەچم، چی ڕوودەدات، وەصفێکی چڕ و پڕی ئەو بارە ناکرێت کە تیایدابووم، زمان کولە لە وەصف کردنی.

لە شوێنێکی تاریکی ڕەشەوە ڕۆشتمە شوێنێکی زۆر ڕووناکی پڕ ڕەنگ.

تەسەوری ناوەکی بۆ وێناکردنی ئەوێ ئەستەمە!

ئەوەی دەتوانێ وێنای بکات لە زیهنی خۆیدا تەنها ئەوانەن کە ئەزموونەکەیان بینیوە.

ئەو سەرکەوتنەی ناو تونێلەکە زۆر پڕ لە سەعادەت بوو.

هەستی ئەوەم نەبوو کە ڕابوەستم و کۆتایی بێت، ڕازی بووم، نەدەترسام، حاڵم بەرەو باشی زیاتر دەڕۆشت.

من حەزم لە وێنەکێشان هەیە، وێنەی زۆریشم بینیوە، ڕەنگی زۆریشم بەکارهێناوە، بەڵام ناتوانم بە ڕەنگێک، وێنەیەک بۆ ئەوێ بکێشم.

کە دەڵێم شین و نیلی، شین و نیلی دونیانیە.

گەیشتمە جیهانێکی تەواو جیاواز، نورێکی بەرفراوان بوو، وەک تەمێکی چڕ بوو، بەڵام تەمەکە ڕێگەی بینینی نەدەگرت.

نورێک بوو تەواوی قوڵایی ئەوێی ڕاگتبوو، لە هەموو شوێنێکدا جیاوازبوو.

کە ڕۆشتمە ئەو جیهانە هەستم بە جوانترین هەست و نەست کرد، پڕبوو لە دڵنیایی و بەختەوەری، کە لە دونیادا هەرگیز ئەو هەستەم بۆ دروست نەبوو بوو.

زۆر زۆر دڵخۆش و بەختەوەر بووم، لە خەوە نوچکەدا هەستێکی خۆشی هەیە، ئەو خۆشیە بکەرە بێ کۆتایی.

دەتوت پەڕی کۆترێکم، ئەوەندە سوك و سوکەڵە بووم، لەوێ شتێکی بچووک دەبینیت، بەڵام زۆر گەورەیە.

هەستی بینین لەوێ زۆر چێژدارە، بەڵام وەختێ چاوم کردەوە لەو جیهانە بێ وێنەیە بووم و گەڕامەوە.

دەبینم منداڵەکەم پۆشاکی لەبەر دەکەن، دەستم کرد بە گریان، کە بۆچی گەڕاومەتەوە بۆ دونیا.

لەو چرکە ساتەدا ئەو منداڵە بۆ من گرنگ نەبوو، چونکە من تێری ئەو جیهانە بێ سنورە بووم!

من هەموو چرکەیەکی ژیانم بە هەستی گەڕانەوە بۆ ئەوێ دەژیم.

تەنانەت سەیری ڕەخساری منداڵەکەشم نەکرد، ڕازی بووم هەموو دونیا بەجێ بهێڵم و بگەڕێمەوە بۆ ئەو جیهانە ئەبەدیە، دایکم دەیوت: ڕۆڵە منداڵەکەت دەگری، برسیەتی، لە باوەشی بگرە، منیش هەروەکو منداڵەکە دەگریام و دەموت وازم لێ بێنن.

وتم: دایە من لە جیهانێکی تەواو جیاوازدا بووم.

دایکم وتی: هەر کەسێک بچێتە ژووری منداڵ بوون، دەترسێ و لە دوایدا تەندروستی باش و جێگیر دەبێتەوە!

دایکم نەیدەزانی من باس لە چی دەکەم.

هەر کاتێک ئەزموونەکەم دەگێڕمەوە، هەموو گیانم دێتە لەرزین و خۆم بۆ ناگیرێت.

ئێستا لەناو خێزانەکەمدام و کوڕەکەم لە ئامێز دەگرم، بەڵام ئەوێ شتێکی ترە، هەرگیز شتەکانی ئەوێ بە ئێرەی دونیا پێوانە مەکەن.

من پسپۆڕیم هەیە لە زانستی 'دەرون ناسی'دا، لە تەواوی سی و پێنج ساڵی تەمەنمدا، ئەزموونی وڕێنە و خەیاڵاتم نەکردووە، ئەو ئەزموونی نزیکیەی مەرگ یەک جار ئەزموونم کردوە و بینیومە.

ساڵی پاڕ ڕووداوێکم بەسەر هات و، ڕەوانە بە هۆڵی نەشتەرگەری کرام، هەشت جار بێ هۆش کەوتم و نەشتەرگەریم بۆ کرا، بەڵام ئەزموونی نزیکبوونەوە لە مردنم نەبینیەوە.

من تەنها جارێک ئەزموونەکەم بینیوە و زۆر دورە لە وڕێنە و خەیاڵ و دیاردە فیزیکی و مادیەکان، ئەزموونێکی ڕاستەقینەیە بۆ جیهانی نادیار و بەهیچ جۆرێک تەفسیری مادی هەڵناگرێت. حەقیقەت و ڕاستەقینە ئەوە بوو کە بینیم.

من ڕازی نابم، بەناوی زانستەوە وەصفی ئەزموونەکەم بکەن بە وەهم و خەیاڵ، نەخێر ڕاستیەکی حاشا هەڵنەگرە و بینینی جیهانی نادیار و ژیانی ناو گۆڕە.

ئەوانەی لێکدانەوەی مادی و دور لە واقع و ڕاستی بۆ ئەم ئەزموونـانە دەکەن، وەک کەسێکن لەلای نەخۆشێکی توش بوو بە گرانەتـا دانیشـتبێت، نەخۆشـەکە زۆر بـاری تەندروستی ناجێگیر بێت، پلەی گەرمی لەشی زۆر بەرزبێت، سەر ئێشەیەکی هەبێـت، هیچی بۆ نەخورێت، لە هۆش خۆی بچێت، لە هەمان کاتدا ئەو کەسەی کە لەلایەتـی لە وەڵامی میوان و خەڵکی کە دێن بۆ لای و هەواڵـی دەپرسـن بڵێـت: والـلە زۆر زۆر باشە و، لە ئێمە باشترە و، هیچی نیە!! چەند جێگەی تورە بـوون و نـارەزایەتیە لەلایەن نەخۆشەکە و واقعی حاڵی نەخۆشەکە.

ئەم لێکدانەوە و وەڵام دانەوەیە دورە لە ڕاستیەوە!! لێکـدانەوەی مـادی و بێبـاوەڕ و بـێ دینەکـانیش بە نـاوی زانسـتەوە بەو جـۆرە جـێگەی ڕەخـنە و نـابەجێیە لە لایەن کەسانێک کە ئەزموونەکەیان بینیوە و، لە ڕووی واقع و زانستی ڕاستەقینەشەوە وەڵامـی بەو جۆرە بۆ ئەزموونێک، هەرگیز نابێتە گومـانێکی بچـووکیش لەسـەر حەقیقەتـی ئەو جیهانە بێ سنورەی بینیوەتی.

من هەتا بیست ڕۆژیش مناڵەکەم نەدەویست، هەتـا ئەوەبـوو لـۆمە و سەرزەنشـتیان دەکردم، بەڵام من مەدهۆشی جیهانێکی تر بووم، لەو بیست ڕۆژەدا هەستی دایکـایەتی لێ گرتبوومەوە.

من ئەو جیهانەم لێ ون بوو بوو، زۆر جاریش بە دڵ و ئەندێشەی قوڵ دەچمەوە بـۆ ئەو جیهانە شـیرینەی کە دوای دونیـا دەگەڕێـمەوە بـۆی، پشـت بە خـوا بە کـردەوەی باشەوە چاوەڕوانی بەختەوەری ئەوێ دەکەم.



# عبدالأمين لورستانی

ئەو پیاوەی ئێستا تەمەنـی شەسـت و دوو سـاڵە، خـاوەنی دوو کـوڕ و کچـێکە و، شەهادەی دبلۆمی باڵای هەیە لە زمانی 'ئیطـالی'دا. ئەزموونەکەمـان بـۆ دەگێـڕێتەوە و دەڵێت: لە شەوی یەڵدا، کە درێژترین شەوی ساڵەو، ئێرانیەکان ئاهەنگی تیـا دەگێـڕن، من ئەزموونەکەم بەسەرهات.

چەند ڕۆژێک بوو حاڵم باش نەبوو، من دانیشتووی شاری 'عەبـادانم'، خێـزانەکەم زۆریان پێ وتم کە بچم بۆ نەخۆشخانە، بۆ ڕشانەوە و دڵ تێکهەڵهاتنەکەم دەرزیەکیـان بۆ کردم، خێزانم پێی وتبون کە هەستیاریم بەو دەرزیە هەیە.

وتبویان: خەمتان نەبێت، لە ژێر چاودێریدا دەرزیەکەی بۆ دەکەین، دەرزیەکەیان بـۆ کردم و بردمیانەوە بۆ ماڵەوە.

شەوێکی باراناوی بوو، ڕۆشتم نوستم، دوای یەك دوو کاژێر هـاتبوون هەتـا حـاڵم بزانن، بینیبوویان جێگـاکە هەمـووی خەڵتـانی خـوێنە، لە گـوێچکە و لـوتەوە خـوێن بەربوونـم هەبووە و هەستم بە هیچ نەکردوە و بێ هۆش بووم.

منیان بردبووە حەمام و، زۆر ترسابوون لە باری تەندروستیم، ئیتر منیـان بردبـوو بـۆ نەخۆشخانە.

پزیشکەکە وتبووی درەنگ هێناوتانە؟

وتبویـان هەر چیمان پـێ بکرێـت بـۆی دەکەیـن، بـۆ مـاوەیەکی زۆرکەم نـیمچە هۆشێکم هەبووە، بەڵام کەسم نەناسیوەتەوە، دوای ئەوە ئیتر کەوتومەتە بێ هۆشـیەکی قوڵەوە.

هەموو شتێک تاریک داهات، هیچم نەدەبیست و هیچیشم نەدەبینی.

خێزانم دەڵێت: دوای ئەوە حاڵم بە تەواوی خراپ بوو.

دکتۆر 'زینلی' دەستنیشانی نەخۆشیەکەی کردبووم، وتبووی توشی جەڵدەی مێشک بووە، هەروەها خوێن بەربونی گەدە و سیەکانیشم هەبووە، دڵیشم باش کاری نەکردوە.

وام هەست دەکرد تازە لە خەو هەستاوم، هەستم بە کات و شوێن نەدەکرد، لەسەر چرپاکە دابەزیم و سەیری ناو نەخۆشخانەکەم دەکرد.

وتم: باشە لە کەیەوە منیان هێناوە بۆ ئێرە، بیرم کەوتەوە کە لە ماڵەوە باری تەندروستیم تێک چوو.

وتم: سوپاس بۆ خوا ئێستا حاڵم زۆر باشە.

هەستامە سەرپێ و ڕووم لە دەرگاکە کرد بچمە دەرەوە، هەستم بەوەکرد هیچ کەس سەرنجم نادات و ڕێگریم لێ ناکات، لەو کاتەدا براکەم و کوڕەکەم لە ڕێڕەوەکەی (١٢٤)وە دەهاتن بەرەو ڕووم، لەو کاتەدا پێڵاوەکانیان دادەنا هەتا نەعلی پاک لەپێ بکەن بۆ هاتنە ژوورەوە.

بانگم لە کەمالی کوڕم کرد.... کەمال.... بەڵام هیچ سەرنجی نەدایە من، بەلای مندا تێ پەڕین و بێ باکانە ڕۆشتن.

هاوارم لێ کرد: کەمال، کوڕی من، زۆر باشم!

هەستم بە تووڕە بوون دەکرد، بۆچی کەمال وەڵام ناداتەوە، کەمال هەرگیز بەو جۆرە بێ گوێ نەبووە!

پەروەردەی خێزانیمان هەرگیز بەو جۆرە نەبووە کە مناڵ گوێت بۆ نەگرێت.

براکەشم بە هەمان شێوە سەیری نەکردم.

وتم: سەیرە، ڕەنگە بە هۆی منەوە زۆر ئازاریان چەشتبێت و توڕە بن لە من.

که لام کردەوە بەلای چرپاکەدا، دەبینم کەسێک ڕاکشاوە، زۆر سەیر بوو بەلامەوە، ئەو کەسە جەستەی من بوو!

ڕووخسارم زەرد هەڵگەڕابوو، چاوەکانم لێک نابوو، جەستەیەکی سارد و سڕ، سۆندە و تیوب لە دەم و لوتمدا بوو، چاوەکانم بە پلاستەر داخرابوون، دوو کەس لەلای لاشەکەمەوە دەگریان.

وتم: بۆچی دەگیرن، من زۆر باشم، خەریک بوو دەکەوتمە گومانەوە، من زۆر باشم و جەستەشم حاڵی خراپە!! بینیم کوڕەکەم دانەویەوە هەتا نێوچاوانم ماچ بکات 'جەستەکەم'، فرمێسک لە چاوەکانی دەتکایە سەر ڕوومەتم 'جەستەم'، من دەستم دەبرد بۆ ڕوخسارم 'ڕۆحم' هیچ فرمێسکم نەدەبینی و هەستم بە تەڕی نەدەکرد!

ئیتر دڵنیا بووم ئەو کەسەی سەر چرپاکە منم!

خەمبار بووم کە گوێیان لە من نیە و هیچ هەستم پێ ناکەن.

تۆ بڵێیت من مردبم!

براکەم دەگریا، پێم وت: برام من زۆر باشم بۆچی دەگریت؟!

هەستم بە دڵخۆشیەکی زۆر دەکرد، هەستم بە لەش سوکی دەکرد، بەڵام دڵم بۆ ئەوان دەسوتا.

ناچار بووم باوەڕ بکەم کە مردوم.

لە دەرگای نەخۆشخانەکە ڕۆشتمە دەرەوە، ویستم دوای کەس و کارم کەوم، لە هەمان کاتیشدا دەترسام لە لاشەکەم دوربکەومەوە، دەترسام هەرگیز نەگەڕێمەوە ناو جەستەکەم.

لە حەوشەی نەخۆشخانە، سێ سەد کەسێک دەبوون بڵاو بووبوونەوە، کەسێکی مردویان پێ بوو، نازانم ئەو شەوە، یاخود پێشتر مردبوو!

هەنـدێکیان دانیشـتبوون و دەگریـان، هەنـدێکیان بەپێـوە بـوون، هەندێکیشـیان لە ڕاڕەوی نەخۆشخانەکە بۆ تەرمەکە هاتبون و نزیکی بوون.

کە ئەوەم بینی جارێکی تر گەڕامەوە و سەیری لاشەکەی خۆم کردەوە.

دوای ئەوە بارەکە بۆ من ئاسایی بوویەوە، بینیم کەسێک کە لەسـەر چرپـای ژمـارە یەک ڕاکشابوو 'جەستە'ی، هات بۆلام، من پێشتر نەمدەناسـی، سـەلامی لـێ کـردم و خۆی پێ ناسانم و وتی من ناوم موحەمەدە.

منیش خێرا لێم پرسی: تۆ من دەبینیت؟!

وتی: بەڵێ بەڕێزم من تۆ دەبینم.

وتم: ئایا مۆڵەتیان داویت لە نەخۆشخانەکە بچیتە دەرەوە

دەستی کرد بە پێکەنین وتی: بەڕێزم! تۆ چی دەڵێیت و مۆڵەتی چی؟

قسەمان زۆر کرد بەڵام زۆریـم بیـر نەمـاوە، دوای ئەوە ڕۆشـت، چەرچەفێکیـان دا بەسەر لاشەکەیداو، خوا حافیزی لەمن کرد و ڕۆشت!

جەستەکەیان بە گوازەرەوەیەك بردە دەرەوە.

دوای ئەو ڕۆژانەی کە هۆشم هاتەوە، وتم: کەمـاڵ ئەو پیـاوەی لەسـەر قەرەوێـڵەی ژمارە یەک بوو، ئایا بردیان بۆ قاوشی گشتی نەخۆشەکان؟!

وتی: بابە، دوای دوو ڕۆژ کە تۆیان هێنا بۆ ئێرە و، تۆ بێ هۆش بوویـت، ئەو پیـاوە کۆچی دوایی کرد!

تۆ دەتناسی؟!

ئەی چۆن دەزانی لێرە بووە، خۆ تۆ بێ هۆش بوویت؟

وتم: لەقەب و نازناوی موحەمەدی نەبوو؟

وتی: بەڵێ موحەمەدی ناو بوو.

وتم: له مۆڵەکە دوکانی هەیە.

کەمال وتی: چۆن دەزانیت بابە گیان؟

وتم: قسەمان کرد و خۆی پێی وتم.

وتی: باوکە ئەو مرد و بردیان بۆ مەیتخانە و لەوێشەوە بۆ گۆڕستان.

وتم: زۆر بە یەکەوە بووین و قسەمان کرد و لە دوایدا ئەو ماڵئاوایی کرد و ڕۆشت.

کەمالی کوڕی دەگێڕێتەوە و دەڵێت: من لەگەڵ کوڕەکانی ئاغای موحەمەدی بووم بە هاوڕێ لە نەخۆشخانە و ئەو چەند ڕۆژە بە یەکەوە بووین.

ڕۆژی سێهەم باوکیان مرد، باوکم وتی: من لەوێ ئاغای موحەمەدیم بینی و نیشانەیەکیشی پێ وتم، کە وتی: فڵان شەو کە تۆیان هێنا، فڵان سیستەر نەیهێڵا تۆ بهێننە ژوری ئێمە لە (١٢٤).

وتم: بابە ئاغای موحەمەدی بێ هۆش بوو، هیچ نیشانەیەکی ژیانی پێوە دیارنەبوو، بەو جۆرەش مایەوە هەتا کۆچی دوایی کرد، بە ئۆکسجین هەناسەی دەدا؟!

باوکم وتی: نەخێر.. ئاغای موحەمەدی لە تەنیشتی منەوە بوو، بەیەکەوە زۆر قسەمان کرد.

تەنانەت ئاغای موحەمەدی وتی: منالەکانم دوکانی جل و بەرگیان هەیە لە بازاڕی کوەیتیەکان لە عەبادان.

..................

من لە چرکە ساتێکدا بیری ماڵەوەم کرد، وتم: بابچم بزانم لە ماڵەوە خەریکی چین، هەر ئەوەندەی بیرم لێ کردەوە، لەبەر دەرگای ماڵەوە بووم.

دراوسێیەکمان هەبوو ناوی 'حویزاوی' بوو، کیسەیەکی پێ بوو، کیسەکە ڕەنگی سەوز بوو، لەبەر دەمی دیواری ماڵەکەماندا داینا، کە زەویەکی خاڵی بوو.

پێم وت: سلام علیکم ئاغای حویزاوی، دەستم بـرد تەوقەی لەگەڵ بـکەم، کەچـی ئەو کیسەکەی دانـا و ڕۆشـت و ئاگـای لە مـن نەبـوو، دوای ئەوەی کە گەڕامەوە پـێم وت: لە فلان کاتدا کیسە سەوزەکەت پێ بوو، ئا لەوێدا داتنا. وتـی: ڕاسـت دەکەیـت، ئەوە جل و بەرگی کوڕەکەمی تیابوو، کە پێش ساڵێک لەمەوبەر مردوە، ئیـتر وتـم بـا لە پاڵ ئەو دیوارەدا دایبنێم.

وتی: تۆ چۆن ئەوەت زانی! من لەو کاتەدا گوێم لێ بـوو، لە مـاڵی ئێـوە گریـان و شیوەن بوو!

وتم: من دەستیشم درێژکرد بۆ تەوقە کردن لەگەڵ تۆ، بەڵام تۆ منت نەبینی، سـەری سوڕما!

وتی: ڕاستە تۆ لە نەخۆشخانە بوویت و هەموو گەڕەکەکە دەیـانوت مـردوە و تەواو بووە!

من لەو کاتەدا بێ تاقەت بووم لە دەنگـی گریـان و شـیوەنەکە، کە لە مـاڵی ئـێمەوە بەرز دەبوویەوە.

وەستابووم، زاتی ئەوەم نەدەکرد کە بچمە مـاڵەوە و بەو جـۆرە گریـان و شـیوەنیش بێت بۆ من.

لەو حاڵەتەدا مناڵێکم بینی سەیری منی دەکرد و پێی وتم: مامە سەلامی خوات لـێ بێت!

وتم: تۆ من دەبینیت؟

وتی: بەڵێ دەتبینم!!

منیش سڵاو لە هەچ کەسێکی تر دەکەم نامبینێت.

بە مناڵەکەم وت: ماڵتان لە کوێیە؟!

وتی: لەم شارەین 'عبادان' لە گەڕەکی 'لاین' لە لاینی هەشتین، لە ئەحمەد ئاباد.

ئاماژەی بە ماڵەکەشیان کرد و وتی: لەوێداین.

کە سەیرم کرد دەبینم سەیارەی ئەمبولانس لە بەردەم ماڵەکەیان ڕاوەستاوە، کەسێکیان دەخستە ئەمبولانسەکەوە و خەڵکێکیش لە دەوری بوون و دەگریان.

مناڵەکە پێی وتم: ئەوە ماڵەکەمانە و ئیتر وردە وردە لێم دورکەوتەوە، وا دەزانم بۆ ئاسمان سەرکەوت، یان بۆ شوێنێک کە نازانم کوێ بووە، ئیتر نەمبینیەوە.

لە چوار دەوری ئەو مناڵە هالەیەکی نور هەبوو، هەتا دوریش کەوتەوە بینیم، ئیتر دوای ئەوە لە پێش چاوانم نەما، وەک ئەستێرەیەک لە دورەوە تەنها ڕووناکیەکەیم دەبینی و دیار نەما لە منەوە.

کە گەڕامەوە لە ئەزموونەکەم لە کوڕەکەم پرسی: ئایا لەو ماڵە و لەو شوێن و ناونیشانە کەسێک مردوە؟

وتی: بەڵێ تەعزیە نامەکەیم بینی هەڵواسرابوو، کاتێ تۆ بێ هۆش بوویت ئەو مناڵە کۆچی دوایی کرد.

وتم: کە بەڕۆح هاتمەوە بۆ ماڵەوە، ئەو مناڵەم بینی.

لە کاتێکدا ئەو ماڵە لە ئێرەشەوە دوربوو؟ پەیوەندیشمان نەبوو.

چوومە ماڵی خۆمانەوە، زۆر بە ئاسانی دەرگا و دیوارەکانم بڕی، بینیم مەڕێکیان لەلای ژمێرەی ئاوەکەدا بەستبوویەوە، مەڕەکە سپی بوو، سەری ڕەش بوو، مەڕەکە زۆر سەیری منی دەکرد، وەک ئەوە بوو بمبینێ، کە دەچوومە ئەم دیوو ئەو دیویەوە سەری دەجوڵاند و سەیری دەکردم.

زانیم خێریان کردووە و سەری دەبڕن.

کە گەڕامەوە هەمووی بەو جۆرە بوو، خوشکەکەم خێری بۆ کردبووم.

کە هۆشم هاتەوە و خوشکەکەم هات بۆ بیمارستان بەڵام یەکەم شت لێم پرسی ئەوە بوو، کە ئایا مەڕەکەی کە لە ماڵەوە لە فڵان شوێن بەستبوتانەوە سەرتان بڕی؟!

ناونیشانی مەڕەکەشم باس کرد.

وتیان: برام چۆن دەزانیت؟

وتم: هاتمەوە ماڵەوە و بینیم.

خوشکێکم وتی: وەی.. بەڕاستی وامان لێ دەکەیت بترسین، چۆن زانیت؟

عاطفەی لوڕستانی خوشکی ئەم پیاوەیە و دەڵێت: "زۆر سەرسام بووین کە چۆن ئەوەی زانیوە، لە کاتێکدا بێ هۆش بووە و هەموو گۆشتی قوربانیەکەشمان دابەش کردوە و ، ئەو هیچ ئاگایەکی لێی نەبووە.

مووی سەرم هەمووی ڕاست بوویەوە، چونکە لە ماوەی چل و هەشت ساڵی تەمەنمدا هەرگیز شتێکی ئەوەندە سەیر و ڕاستم نەبینی بوو!

کەسێک ئەو هەمووە ڕووداوانە ببینێت، لە کاتێکیشدا لە ژووری (١٢٤) بێ هۆش بێت.

کە ڕۆشتمەوە بۆ ماڵەوە و ژوورەکەم، هەندێ لە ژنەکان ئەساسی ماڵەکەیان دەبردە قاتی سەرەوە، ماڵەکەیان بۆ پرسە و مەجلیسی فاتحە خوێندن ئامادە دەکرد، خێزانم لە ژوورەکەی خۆیدا بوو، زۆر خەمبار بوو، تەنها بوو لە ژوورەکەی خۆمان، دەبینم قاتێ پۆشاکی منی دەرهێناوە، ئەو قاتە ئەو بۆی کری بووم و دیاری خێزانم بوو بۆمن؟ هێشتا لەبەرم نەکردبوو، لەبەردەمی خۆیدا دایناوبوو، دەگریا بە سەریدا و، زۆر گریان و لاوانەوەی کرد و دەم و چاوی خۆشی ڕنی!

ژنەکەی ناوی 'فەرەح ناز چهارلنگی' یە دەڵێت: "بەڵێ بەو جۆرە بوو، من دەرگای ژوورەکەمانم لەسەر خۆم داخست و ئەو قاتەی کە بۆ جەژنی باوك بۆم کری بوو، لەبەری نەکردبوو، دەرم هێناو بەسەریدا دەگریام و دەم و چاوی خۆمم دەڕنی! چونکە هەچ کەسێک لە نەخۆشخانەوە دەهات، دەیانوت حاڵی زۆر خراپە و، خۆتان ئامادە بکەن بۆ قەرەباڵغی!

پزیشکەکان بێ ئومێد بووبوون لێی و دەیانویست ئامێر و ئۆکسجینی لێ بکەنەوە. منیش نەمدەویست لەلای مناڵەکان بگریم و شیوەن بکەم'

دڵنیا بووم کە ئەوان نامبینن، کچە مامەکەم بینی چای دابەش دەکرد بەسەر میوانەکاندا و دەگریا، سەیری میوانەکانم کرد هەموویان بێ تاقەت بوون.

وتم: یانی ئێستا من ئامادەی مەراسیمی پرسە و فاتحەی خۆم دەبم، چەندە سەیرە؟

سینیە چایەکە لە دەستی کچە مامەکەم کەوت و، چاکەیان ڕژاند بە قاچی ئامۆژنمدا 'دایکی ئامۆزاکەم'.

لە دوای گەڕانەوەم، کە گێڕامەوە وتیان: بەڵێ هەمووی بەو جۆرە بوو کە تۆ دەیڵێیت، ئەرێ تۆ یەک پارچە ڕۆح بوویت و ئێرەت بەجێ نەهێڵاوە؟!!

ئامۆژنم تورەبوو لە کچەکەی و وتی: ڕۆڵە قاچی من و ئەو خەڵکەت سوتاند.

کە هۆشم هاتەوە بە خێزانم وت: ئادەی ئەو سەرپۆشە لەسەر ڕوخسارت لابە، با شوێنی ڕنینی فلان ڕۆژت ببینم کە لە ژوری خۆماندا بەتەنها بەسەر قاتە پۆشاکەکەمدا دەگریایت، کەلای برد شوێنی نینۆک و ڕنینەکەی پێوە مابوو، بە وردی ڕۆژ و کاژێرەکەم پێ دەوتن، هەرچی کەسێک بۆ ماڵمان هاتبێت، چی ڕووی دابێت گێڕاومەتەوە.

تەنانەت ڕۆژێکیان برایەکم لەگەڵ خێزانەکەم طەبەلە و وەرەقەکانیان برد بۆلای دکتۆر 'بارسافر'، کە من ئەوەم بینی و دوایش بۆم گێڕانەوە.

پێش ئەوەی هۆشم بێتەوە و بگەڕێمەوە بۆ دونیا بە چەند ڕۆژێک، برایەکی خۆمم بینی کە لەگەڵ ئامۆزایەکم هاتن بۆلام بۆ نەخۆشخانە، ئامۆزاکەم ناوی 'غولام'ە، پۆلیسی بەر دەرگاکە نەیهێڵابوو ئامۆزاکەم بێتە ژورەوە، براکەم بەتەنها هاتبوو لەسەر جەستەکەم دەگریا.

که گەڕامەوە و هۆشم هاتەوە، بۆ هەموو یەکێکیان پێم دەوت کەی و لەکوێ هاتوون بۆلام.

بە براکەم وت: تۆ و غولام هاتن بۆلام، بەڵام ڕێگەیان نەدا غولام بێتە ژورەوە، براکەم موحەمەد ڕەزای ناوە، لەماڵ نەبوو بوو، کە بیستبووی، هاتبوویەوە و لەگەڵ غولامی ئامۆزام هاتبوون بۆلام.

یەک ڕۆژی مابوو، ئیتر بڕیاری پزیشکەکان بوو ئامێرەکان لەسەرم لابەن و بمبەن بۆ ساردکەرەوەی مردوەکان.

باوکم و برا گەورەکەم بڕیاریان دابوو کە واژوی بکەن، ئامێرەکان بکوژێننەوە و بڕیاری کۆتاییان دابوو، چونکە هیچ ئومێدێک نەمابوو، بەڵام برایەکم ڕازی نەبوو بوو، وتبووی من هەرگیز ناهێڵم شتی وابکەن.

ئەو برایەشم بینی، کە ڕۆشتمە حەوشەی نەخۆشخانەکە و لەبەر بارانەکەدا دەگریا بۆ ئەو وەزع و بارەی تێی کەوتون.

منیش لەگەڵی ڕۆشتم 'بەڕۆح'، لەلای سەربازێکدا ڕاوەستا، سەربازەکە ئاگرێکی کردبوویەوە و خۆیان وشک دەکردەوە.

بەڵام من هیچ باکم لە باران و سەرما نەبوو، لەلای سەربازەکە وەستا و دەردەدڵی خۆی دەکرد، سەربازەکەش پێی وت: إن شاءالله حاڵی باش دەبێت خەمتان نەبێت.

براکەشم پێی وت: ئاخر ئەمڕۆ من نەمهێڵاوە جیهازەکانی لێ بکەنەوە، بەڵام ڕەنگە بەیانی بڕیاری کۆتایی بدەن و کۆتایی بێت.

'براکەشی هەمان شاهیدی دەدات!'

خاتوو صەدیقەی صادیقیم بینی بە ڕۆح، خاتوو صەدیقە خوشکی ئامۆژنێکمە، لەهەمان نەخۆشخانە - بەشی منداڵان- کار دەکات، کە دەهاتە لای من لە (١٢٤) قورئانی بەسەردا دەخوێندم، دەیزانی کە کۆتایی ژیانمە، هەستم بە شتێکی زۆر سەیر

دەکرد، کاتێک وەکو ڕۆح نزیکی لاشەکەم و ئامێرەکان دەبـوومەوە، حـاڵی جەسـتەکەم بەرەو ئاسایی بوونەوە دەچوو، کاتێکیش دور دەکەوتمەوە، لێـدانی دڵ و ئامێرەکـانیش خراپیان دەخوێندەوە.

گوێم لێ بوو پەرستارەکە دەیوت کاتێ کارەبایان لـێ داوە' ئەوە گەڕایەوە، کارەبـای تری لێ مەدەن، من لەو کاتانەدا بە تەواوی نزیکی جەستەکەم دەبوومەوە.

ڕۆژێکیان کوڕێکیان هێنا لەسەر چرپای ژمـارە دوو دایاننـا، کـوڕێکی گەنـج بـوو، سەیریم دەکرد، ئەوانەی لە دەوری بـوون وتیـان: ڕێژەیەکـی زۆری تریـاکی خـواردوە، لەبەر ئەوەیە ئاوا بێ هۆشە.

ڕۆشتمە یەکێک لە قاوشەکان، دکتۆرێکی لێ بوو، کە نامەوێت لێـرەدا نـاوی بێـنم، کە باوەڕی بە قیامەت و زینـدوبوونەوە لاوازبـوو، یەکێـک لە هاوڕێیـان وتـی: دکتـۆر گیان بڕۆ لە پشتی شوشەکەی (١٢٤)ەوە گەردنی ئازادبکە، 'چونکە خەڵکی دەهـاتن و گەردنیان ئازاد دەکردم'.

دکتۆریش وتی: وادەی گەشتم هەیە بە فڕۆکە، فریا ناکەوم بچم بۆ لای.

دەچم بۆ تاران و ناشتوانم سەیری بکەم و بەو بارودۆخەوە ببینم.

ئێمە ساڵانێك بوو بە یەکەوە هاوڕێ بووین، شۆخی و خۆشـیمان زۆر بـووە، بەڵام نەهات و گەردنی ئازاد نەکردم.

دانیشت و پاڵی دا بە دیـوارەکەوە، منـیش بە داخـێکەوە سـەیرم دەکـرد وتـم: ئەگەر دەزانی ئێستا من حاڵم چەندە باشە، خۆزگە هاوبەشی ئەم خۆشیەی منت دەکرد.

دوای گەڕانەوەم وتم فڵانە کەس.. لە فڵان ڕۆژدا نەتویست چاوت بەمن بکەوێت، وتت لە فڕۆکە دوا دەکەوم.

دکتۆرەکە وتی: خودایە لێم ببورە!

ڕەنگە لەبەر ئەوە وتبێتی چونکە باوەڕێکی تەواوی بە قیامەت نەبو و پەشیمان بوو‌بێتەوە.

هەموو قسەکانیم بۆ گێڕایەوە.

گەنجەکە تەمەنی (١٩ - ٢٠) ساڵان دەبوو، لەسەر قەرەوێڵەکە بوو، هەستایەوە و دانیشت و منی بینی، سەیری شوێنی پەرستیارەکانی دەکرد، هاواری دەکرد بە سەر پەرستیارەکاندا، بەڵام ئەوان گوێیان لێ نەبوو، ئەوان سەرقاڵی کاری خۆیان بوون، ترس و شڵەژانی پێوە دیار بوو، پێم وت کوڕی باش ئا وەرە بزانم!!

ئەویش بە کوڵ دەگریا. وتم: بۆچی ئاوا پەرێشانی.

وتی: توشی چ بەڵایەك بووم!

لە ڕاستیدا کۆمەڵێک حەبی زۆرم خوارد وە هەتا خۆم بکوژم.

وتم: چ جۆرە حەبێکت خواردوە؟

وتی: حەبی هێمن کەرەوە، سەد و دە حەبم خواردوە، ئەو حابانەش دکتۆر بۆ دایکمی نوسیوە!! دوای ئەوەی خواردم، خەوم لێ کەوت و بێ هۆش بووم، شیتی 'پارچە' حەبەکانیشم بە خاڵێتی خستۆتە ژێر دۆشەکی سیستەمەکەم، ئێستا ئا بەم جۆرەم لێ بەسەر هاتوە!

وتم: بۆچی ئاوات بەخۆت کردوە؟

وتی: کچی دراوسێیەکەمانم خۆش دەوێت، کچەکە شووی کرد.

وتم: داماو، بۆچی ئاوات لەخۆت کردووە!!

دوو ڕۆژ دوای ئەوە هۆشم هاتەوە، بە خێزانەکەمم وت: بڕۆ قسە لەگەڵ دایکی ئەو کوڕە بکە، کوڕەکەی بە تەواوی بێ هۆش بوو، حاڵی تەندروستی زۆر خراپ بوو.

خێزانم وتی: خزمەکانی دەڵێن، ئەوە نۆبەی مێشک لێی داوە!

وتم: نەخێر وانی یە، ئەوە حەبی هێور کەرەوەی دەروونی خواردوە.

وتی: چۆن دەزانیت؟ دایک و کەسەکانی نازانن.

وتم: من دەزانم، سەد و دە حەبی خواردوە، لە جۆری فڵان حەب و، پارچە خاڵیەکانیشی کردوە بەژێر دۆشەکی سیستەمەکەیەوە لە ماڵەوە و یانزە پارچەیەکی خواردوە.

ئەو خۆی پێی وتم کە خۆکوژی کردوە، لەبەر ئەوەی خۆشەویستەکەی کە دراوسێیانە شووی کردوە.

بە خێزانمم وت: برۆ پێیان بڵێ.

خێزانم وتی: چۆن پێیان بڵێم، بە شێتم دەزانن و دەڵێن چۆن ئەم زانیاریانە دەزانێت!

خێزانەکەی هەمان شت دەگێڕێتەوە و دەڵێت: منیش ڕۆشتم مێردەکەم وتی: ئەگەر باوەڕیشیان نەکرد بڵێ پارچە خاڵیەکانی حەبەکان لە ژێر دۆشەکی سیستەمەکەی ماڵەوەیاندایە.

ڕۆشتم و دەوری یانزە کەس لە دەوری بوون لە خزم و کەس و کاری، وتم: کێ لە ئێوە دایکی ئەو کوڕەیە؟!

ژنێک وتی: من دایکی ئەو کوڕەم فەرموو!

وتم: بە یارمەتیت هەندێ کارم پێتە!

بردمە لایەکەوە، وتم: نەوەک خزمەکانی قسەکەی منیان بەلاوە پەسەند نەبێت!

وتم: مێردەکەی من بە هۆش خۆی هاتوەتەوە.

وتی: دەزانم، بەڵێ بینیم.

وتم: هەر شتێکی باس کردوە و هەواڵی هەرچی داوە ڕاست دەرچووە.

باسی خۆمم بۆ کرد کە دەم و چاوم ڕنیوە و پێی زانیوە، هەتا دایکی ئەو کوڕە بـاوەڕ بکات!

وتم: مێردەکەم دەڵێت کوڕەکەی ئێوە حەبەکانی تۆی خـواردووە و یـانزە پـارچەیە و لە فڵان شوین پارچەکانی داناوە لە ماڵەوە!

ژنەکە وتی: بەڵێ دکتۆریش دەڵێت حەبی خواردوە، بەڵام ئێمە بەرپەرچی دکتۆرمـان دایەوە کە کوڕی ئێمە تلیاک و حەبی خراپ ناخوات و، ئەو خوەی نەبووە!

دایکـی لە بەردەمـی منـدا تەلەفـۆنی بـۆ کـچەکەی کـرد و پێـی وت سـەیری ژێـر دۆشەکی سیستەمی کوڕەکەمان بکە!!

کـچەکەی پێـی وت: بەڵـێ دایە ڕاسـتە، شـیتی خـاڵی حەبەکـانی تـۆ لە هەمـان شوێندایە.

کاتێک دایکی بۆی ڕوون بوویەوە کە بەو جۆرەیە، باوەشی کرد بە مندا و لە ئـامێزی گرتم.

پارچە خاڵیەکانی حەبەکانیان هێنا بـۆ دکتـۆر، ئینجـا زانیـان کە چ جـۆرە حەبێکـی خواردووە و چارەسەری نوێیان بۆ دانا،

*پێشکەشکاری بەرنـامەکە 'عەباسـی مەوزونـی' دەڵێـت: هەوڵـمان دا ئەو گەنـجە بدۆزینەوە، کە پێش پانزە سـاڵ ئەو ڕووداوەی بەسـەر هـاتبوو، کە سـوپاس بـۆ خـودا چاک بووبوویەوە و حاڵی باش بوو بوو، کە ڕەنگە شاری عەبادانیان بەجـێ هێڵابێـت، یاخود ناوچەکەیان گۆڕی بێت و ڕۆشتبن.

هیوادارم ئەو خێزانە بەڕێزە ئەگەر دەمـانبینن و ئاگایـان لە بەرنامەکەمـانە هەواڵـمان پێ بدەن.

*هەستم کرد بە هێواشی بەرز دەبمەوە بۆ سەرەوە و دەگریام.

وتم: بۆ کوێم دەبەن؟ ئایا دەمبەن بۆ دۆزەخ؟ یاخود بۆ بەهەشتم دەبەن.

ژیانی خۆمم بینیەوە، جارێکیان لە ئاودا خەریـک بـو بخنکـێم و ڕزگاریـان کـردم، ئەوەم بینی یەوە..

دایکم بەڕەحمەتی خودا ڕۆشتوە، لە نزیکەوە بینیم.

سەیری ماڵەکەی خۆمانم دەکرد، دایکم منداڵێکی دەبوو، منداڵەکە لە دایک بوو، ژنـان دەستیان کرد بە هاوار و دەنگە دەنگ و شپرزەبوون، کە نزیک بـوومەوە دەبیـنم ژنێکـی پیری قژ سور، خاڵێک لەسەر ڕوومەتی لای ڕاستی بـوو، دوای ئەوەی هۆشـم هـاتەوە و گەڕامەوە، پرسیارم لە ژنە بەتەمەنەکانی خزمی خۆم کرد دەربارەی ئەو ژنە!

وتیان: ئەوە زوبێدەی مامان بووە.

پێیشیان دەوت 'بی بی ماما'، کە لە ناوچەکەدا ئەو مامانە بەناوبانگەی لێ بوو.

وتیان: تۆ زوبیەیدەی مامانت نەبینیوە، چۆن ئاوا وەصفی دەزانیت؟

وتم: لە گەشتەکەمدا بە جوانی بینیم!

ئەو ژنە هاواری لە ژنەکان دەکرد، شپرزە مەبن.

دایکم بەمن و براکانمی دەوت: پێش ئەوەی من بێمە دونیا لە دایک بـبم، شـەوان بە ترسەوە هەڵدەستام.

چونکە هەستم دەکرد ئەم منداڵەم بۆ نامێنێت و دەچێت بۆ ئاسمان، وا هەستم دەکـرد کە جەسـتەی نـاتەواو بێـت، مـن بەم بیـر کـردنەوە خراپـانەوە لەدایـک بـووم، وەک کیسەیەک پڕبێت لە خوێن ئاوا بووم، هەموویان ترسابوون و هەڵهـاتبون، کە مامـانەکە کیسەکەی دڕیبوو، خوێن و ئـاوی پیـاڕژابوو، ژنەکـان ترسـابوون، یەکسـەر منـاڵێکی

جوان لە نـاو ئەو پەردە تەنـک و کیسـەیە هـاتبووە دەرەوە و سـاغ و سـەلیم بـوو بەبـێ ناتەواوی!

ئەو منداڵەش من بووم!

من لەو جیهانە، ئەو شێوە لە دایک بوون و کیسە و ئاو و سـەیر و سـەمەرە و ترسـی ئافرەتانەم جارێکی تر پیشان درایەوە، دەتوت لەناو ئاوێکی زۆردام و سەر دەردەهێنم.

لە شاری 'خورم ئاباد'، لە دەریـاچەی 'کیـو'، ڕۆشـتم بـۆ ئەوێ، لەگەڵ هەنـدێ لە خزم و دۆستاندا، مەلەوانێکی باش هات و چوپێکی بۆ هێنـام، کاتێـک خەریـک بـوو بخنکێم قژی گرتم و ڕایکێشام و چوپەکەی پێ دام و بەخێرایی دەریهێنام لە ئاوەکە،

لە تونێلە نورانیەکە ئەوەشم بینیەوە.

سەردەمی تاقیکردنەوەکان هەموویم بینیەوە، ئینجا ڕۆشتمە شـوێنێکەوە کە درەختـی زۆر جوان و ڕوباری گەورە و گژوگیای زۆر جوانی لێ بوو.

باڵداری جوان دەفڕین و دەهاتن و دەڕۆیشتن.

باڵندەکان پەڕ و باڵ و کلکیان زۆر ڕەنگاو ڕەنگ و درێژ بوو.

هەستم نەدەکـرد جەسـتەیەکم هەبێـت، چەنـدەت لە ئـاوی ئەوێـت بخـواردایەتەوە تێرت لێ نەدەخوارد و زیاتر تامەزرۆی دەبوویت، ئاوێکی زۆر ڕوون و شیرین و بەتـام بوو، دەتوت بەردەکان لەسەرەوەن، کە دەستم خستە ناویەوە ئینجا زانـیم کە ئـاوە، مـن برسی و تینوم نەبوو، بەڵام حەزم دەکرد لێی بخۆمەوە، هیچ کەس ناتوانێت وێـنەی ئەو ڕەنگە جوان و شوێنە سەرسوڕهێنەرانە بکێشێت.

من سەرسام و مەدهۆشی ئەو هەمووە جوانیە بووبووم.

نور و ڕووناکی دەچووە ناو گەڵاو درەختەکان، ناو سەوزایی، ناو ڕەنگەکـان و لێـی دەردەچوو، من وێنەکێشـم، تەنـانەت هەوڵـم دا وێـنەی یەکێـک لەو باڵنـدانە بکێشـم، کێشام.

بەڵام دەستەوسانم لەوەی بتوانم وێنەی ئەوێ بهێنمە ئێرە.

من لەوێ سەیری ئەو باڵندەم دەکرد، هەستم کرد کەسێک لە پشتمەوە ڕاوەستاوە و دەستی خستەسەر شانم.

دەبینم ئەو کەسە دایکی ڕەحمەتیمە، وتم: دایە ئەوە تۆ چی دەکەیت لێرە؟

وتی: ئەی تۆ چی دەکەیت لێرە کوڕم؟!

بەسەر سوڕمانەوە وتم: دایە ئەمە جیهانی بەرزەخ و قیامەتە، هیچی نەوت، بەڵام فرمێسک لە چاوەکانی هاتنە خوارەوە، دڵی زۆر پڕ و خەمبار بوو، وام هەست کرد سێ پارچەی سپی پۆشی بوو، دەتوت ئیحرامە، وەک ئەو ئیحرامەی لە مەکە دەیپۆشن، وەک هێڵێکی نورانی جوان ئەو هێڵەم بینی لەسەر سنگی دایکم کە نەشتەرگەری دڵمان بۆ کرد بوو، دایکم تاسابوو، وا دیار بوو چاوەڕوانی منی دەکرد، بەڵام نە ماچی کردم و، نە هێڵاشی کە من دەستی لێ بدەم و ماچی بکەم.

بەڵام یەک داوای لێ کردم، نازانم چۆن بوو لەو داوایە تێ گەیشتم و بیرم نەچۆتەوە، وتی: کوڕی من... ئێستا 'بی بی جان' یەکێک بوو لەو ژنانەی کە لە کاتی لەدایک بوونتدا ئامادەبوو دێت بۆلات، هەروەها فڵان و فڵان دێن بۆ لات.

ئەو بی بی جانە ئامۆژنی باوکم بووە، کە لەو ماڵەدا ژیاوە، لەگەڵ فڵان پورت و فڵان کەسیش دێن بۆلات، کە هەموویان کۆچی دواییان کردبوو، ئەگەر پرسیاریان لێ کردیت وەڵامیان مەدەرەوە، وتم: ئەم باڵدارانە چین؟

وتی: ئەوە منداڵە بچووکەکانن کە بە منداڵی لە دونیادا دەمرن و لێرە یاری دەکەن و چاودێری دەکرێن.

حەز بکەن بینە هە چ شتێک دەبن و ڕێگە لە خۆشیەکانیان ناگیرێت، ئێستا بوونەتە باڵندە و.... جاری تر یاری لەگەڵ یەکتر دەکەن و ، بەو جۆرە، دایکم وتی: تۆ کارت بەوانەوە نەبێت، وەرە لەگەڵ من بە!

دایکم زۆر پەلەی بوو، وتم: دایە لێرە خۆشتر کوێیە؟! بۆ کوێ بچین؟

دایکم ماڵ و خانویەکی پیشان دام ’دونیا‘، نازانم، دەتوت ئەو خانوە لەناو ئـاودایە، درێژەی ئەوە نازانم و بیرم نەماوە، خانوەکە سەقفی نەبـوو، لەهەمـان کاتـدا مـن مـاڵی خۆمانم لەسەر زەوی دەبینی، کە خێزانم لەگەڵ ژنێکی تر قسەی دەکرد، کە بڕیـار بـوو بۆ بەیانی ’بەیانی دونیا‘ من ببەن بۆ ساردکەرەوەی مردوەکان و ئومێد بـڕاو بـبن لە مـن، دەتوت ماڵی خۆمان لە ناو ئاودا دەبینم.

دایکم وتی: کوڕم هێشتا کاتی ئێرەت نەهاتوە بگەڕێرەوە.

وتـم: دایە، خەڵکـی دونیـا دوای چـل ڕۆژ مردوەکانیـان لەبیـر دەچێـتەوە، منـیش یەکەمین کەس و دواهەمین کەس نیم، سەبوریان بۆ دێت و منیـان بیـر نامێنێـت، ئیـتر بۆچی بگەڕێمەوە بۆ دونیا.

دایکم وتی: نابێت، دەبێت بگەڕێیتەوە بۆ دونیا.

بنەماڵەی ئێمە فەرمانی دایـک وەکـو هـی بـاوک وایە لە لایـان، دەبێـت جێبەجێـی بکەین و بە فەرمانی دەزانن.

دایکم وتـی: دەبێـت بگەڕێیـتەوە، بەڵام وەرە بـا شـوێنێکت پیشـان بـدەم، پێکەوە ڕۆشتین و خانویەکم بینی، کچە خاڵێکی دایکمم بینی، دایکـم وتـی: ڕۆڵە مـن تەنهـا ئەم کچە خاڵەم هەیە سەردانی بکە، ئەو ئافرەتەش هەمیشە عەبایەکی سـپی دەپۆشـی و نوێژی دەکرد، دەهاتە نەخۆشخانە و دوعای بۆ من دەکرد کە چاک ببمەوە، کاتێـک کە نوێژی دەکرد، کوڕێکی هەبوو نـاوی ’سروش‘ بـوو یـاری بە تـۆپ دەکـرد، تـۆپەکەی کێشا بە دەم و چاوی دایکیدا، دایکی لەو کاتەدا نوێژی دەکرد، لەو کاتەدا دایکـی وتـی ’الله اکبر‘، کاتێک کە گەڕامەوە و هۆشم هاتەوە ئەو کچە خاڵەی دایکم هـات بـۆ لام، پێم وت: فڵان کەس من و دایکم ئەو ڕۆژە لە ماڵی ئێوە بووین و ئاگاداری حاڵی ئێـوە بووین، هەموویم بۆ گێڕایەوە کە چـۆن نـوێژی کـردوە و، کـوڕەکەی تـۆپەکەی داوە لە دەم و چاوی و، ئەویش چی وتوە؟

لەلای خێـزانمەوە دانیشـتبوو، دەسـتی کـرد بە گریـان و بە سروشـی کـوڕی وت: ڕۆڵەکەم کە تۆ تۆپەکەت لە دەم و چاو و ڕوخساری مـن دا، مـن لە نـاو نـوێژدا بـووم، ئەم خزمەمان لەگەڵ دایکی لەماڵی ئێمە بوون.

وتم: دایکم ئامۆژگاری کردم کە پێ لە ئێوە نەبڕم و سیلەی ڕەحم بەجێ بێنم.

ئیتر ئەو بەردەوام دەگریا.

دایکم وتی: کوڕم ئیتر تەواو تۆ دەگەڕێیتەوە بۆ دونیا. بڕۆ خوای تەعالا بتپارێزێت.

هەر کەوای وت، خێرا جیهازەکان ئاماژەی ژیـانەوەی منیـان گەیانـد. هەتـا لێـدانی دڵم بە سروشتی گەڕایەوە.

دوای ئەوە من گەڕامەوە ناو جەستەکەم.

خاتوو صادقی لە نزیک منەوە قورئانی بەسەردا دەخوێندم، ئیتر هـاواری کـرد وەرن نەخۆشی ژمارە 'سێ' گەڕایەوە بۆ ژیان.

بە قاوشەکەدا هاواری دەکرد، دکتۆر و پەرستارەکان هاتن و زانیان گەڕاومەتەوە.

دکتۆر موحەمەدی هات وتی: ئەگەر دوو ڕۆژ پێش ئێستا تۆمـان بگواسـتایەتەوە بـۆ مەیتخانە، من ئازاری ویژدان دەیکوشـتم، لە (١٪) ئومێـدی ژیانـت نەمـابوو، خـوای گەورە تۆی گێڕایەوە.

خێزانم دەڵێت سەعات چـواری بەیـانی بـوو، تەلەفۆنمـان بـۆ کـرا، وتمـان ڕەنـگە ئاگادارمان بکەن بەوەی کە تەواو بووە و مردوە، کەچی پێیان وتین: مژدەتان لـێ بێـت، ئەوە ئێستا گەڕاوەتەوە و هۆشی هاتوەتەوە و چاوەکانی کردۆتەوە.

زاوایەکمان هەبوو، هەموو خزمەکانمان باسیان دەکرد و گلەییان لـێ دەکـرد بەوەی کە نەهاتووە بۆ سەردانم.

وتم: وانیە ئەو هات بۆلام!!

که دوایی خۆی هات بۆلام، پێم وت: تۆم بینی که هاتی بۆلام، له دەرگای نەخۆشخانەکە زۆر ڕاوەستایت و نەیانهێڵا بێیتە ژورەوە!!

له دکتۆر و پەرستارەکەت پرسی حاڵی نەخۆشی ژمارە 'سێ' چۆنە؟!

وتیان: دەی خۆت بچۆ سەردانی بکە، تۆش وتت من ناتوانم سەردانی بکەم، بەڵام ئێوە هەواڵێکم پێ بدەن.

وتیان: حاڵی چۆن بێت!!؟

'تا ئەندازەیەکیش بەبێ باکیەوە وتیان': مردوە و لێ بووەتەوە.

ئەو زاوایەمان ناوی 'فرشاد'ە، برا و کەس و کاری ئێمە کەسیان نەیانبینی بوو، ئەویش بە کەسی نەوتبوو سەردانیم کردوە، بارانێکی زۆریش دەباری، ئیتر 'فرشاد' لە دەرەوە بووە لەبەر بارانەکە و، بە کەسیشی نەوتوە هاتوە، لێی دابوو ڕۆشت بوو.

بەڵام من 'بەڕۆح' ڕۆشتنەکەیم بینی و بۆشم گێڕایەوە.

ئەو زاوایەمان وتی: واللە هەموو مووی جەستەم ڕاست بوویەوە، بێجگە لە خوای گەورە، خزم و کەس هیچ کەسێکیان بە هاتنی منیان نەزانیوە، منیش بۆ کەسم باس نەکردوە.

وتم: منیش تەنها بۆ ئەوە گێڕامەوە، هەتا بزانن بە ڕۆح تۆم بینی وە.

*'عەباسی مەوزونی' دەڵێت: بەڕێز ئاغای لورستانی مەسەلەیەکی تری هەیە کە ساڵانێکی دورودرێژە دەری نەخستوە و باسی نەکردوە.

ئەم باسەش پێش ئەزموونەکە و دوای ئەزموونەکەش شاراوە بووە، کە من ڕۆشتم بە میوانی ئاغای لورستانی لە 'عبادان'، من و لورستانی بە تەنها بووین لەناو باخەکانی عەباداندا، منی بردە کەنارێکەوە و، دوور لە چاوی خەڵکی و کامێرا، کە من پرسیارێکم لێ کرد، هەست دەکەیت بۆچی خوای گەورە ئەوەندە بە لوتف و میهرەبان بووە لەگەڵ تۆ هەتا بتگێڕێتەوە بۆ ژیانی دونیا، هۆکارەکەی چیە؟

لە وەڵامدا ئاغای لوڕستانی نهێنیەکی بۆ ئاشکرا کـردم و وتـی: کە ئێـوە هـاتون بـۆ وێنەگرتنی بەرنامەکە ئینجا بە خێزانم وتـوە، ئەگینـا منالّەکانیشـم مەگەر لە تەلەفزیـۆن وەکو خەڵکی ئەو نهێنیە بزانن.

ئاغای لوڕستانی نهێنیەکی زۆر جوان و پڕ لە پەنـد بـۆ ئێـوە و هەمووم‌ـان ئاشـکرا دەکات، ساڵانێکی زۆرە شاردویەتیەوە، لوتفێکی ئیلاهی دەدرەوشێتەوە.

ئاغای لوڕستانی وتی: ئەوەی هەستی پـێ دەکەم، لە ژیانمـدا جارێـک یـان چەنـد جارێک هەستاوم بەکارێک، کە دەبوو هەر بەو جۆرە ئەنجام بدەم.

چونکە ئەگەر بەو جۆرەم نەکردایە، شەرمەزاری لای خوای گەورە دەبووم.

یەکێکیان ئەوەبوو، پێنج شـەش سـاڵێک پـێش ئەزمـوونەکەم بـوو، دایکـی خێـزانم 'خەسووم' نەخۆش بـوو، لە لادێ بـوون، خێـزانم و منالّەکـانم ڕۆشـتن بـۆ سـەردانی کردنی، ڕۆژێکی گەرم بوو، بێ تاقەت بـووم لە ژورەوە، ڕۆشـتمە نـاو باخچەکەمـان و ئاو پرژێنی ئەو ناوەم دەکرد، هەتا کاتم لێ بڕوات.

لەو کاتەدا ژنێکی زۆر جوان پەیـدابوو، گەڕەک و شـوێنەکەش چـۆڵ و بـێ دەنـگ بوو، داوای ئاوی خواردنەوەی لە من کرد و وتی: دەتوانیت بە منالّەکانت بڵێیت تـۆزێ ئاوم بۆ بهێنن!

من بەبێ مەبەست وتم: منالّەکانم لەماڵ نین، خۆم ئێستا بۆت دەهێنم.

لە دەرگـــای دەرەوە بـــۆ نـــاو مـــاڵەکە ڕاڕەو و حەوشـــەیەکی گەورەیە، ڕۆشـــتم لە ساردکەرەوەکە ئاوی بـۆ بهێـنم، گـوێم لـێ بـوو دەرگـای حەوشـەکەمان داخـرا، مـن گومانی ئەوەم بـرد ڕەشـەبا دایخسـتبێت، کە لام کـردەوە دەبیـنم ژنەکە لە دوای مـنەوە هاتوەتە ژورەوە و!!

هەڵوێستەیەکم کرد کە بینیم.

لەبەر ئەوەی زۆر جوان بوو، هەروەهـا خەمبـاریش بـوو، پـێم وت: بـۆچی هـاتیتە ژورەوە؟!

مۆڵەتت لە کێ وەرگرت؟!

هیچی نەوت و لە شوێنی خۆی دانیشت.

وتم: ڕەنگە بەهۆی خواردنەوەی ئاوە ساردەکەوە دانیشتبێت.

شەیتانیش هانـدەرێکی خـراپ بـوو بـۆ مـن، کە بـا لێـرە بێـت و نەچێـتە دەرەوە و کەسیش ئاگای لێ نـیە؟! کە پەرداخەکەی دایەوە دەسـتم، عەبـاکەی سەرشـانی کەوتە خوارەوە و دەستی کرد بە گریان.

من ئەوەم بە بیردا هات، کە ئەگەر ئەم ژنە دڵ شکاو و پڕ ئازار نەبێت ناگری.

بە دڵنیاییەوە کێشەیەکی هەیە و بەرگەی ناگرێت!

وتم: بۆچی دەگریت.

وتی: ماوەیەکە مێردەکەم بە جێی هێڵاوم و کەوتۆتە داوی ئافرەتێکی تـرەوە و چـووە بۆ لای ئەو، من و ئەم منداڵە شیرە خۆرە دوو مانگـانەیەی بەجـێ هـێڵاوە، ئەم منـاڵەش سێ ڕۆژە شیری نەماوە و، هیچ پارەیەکم پێ نیە شیری بۆ بکڕم.

ئیتر بڕیارم دا وتم: خـودایە مـن ئێسـتا دەچـمە دەرەوە لەمـاڵ، یەکەم مـاڵ، یـاخود یەکەم کەس کە پێـی دەگەم، تەنـانەت ئەگەر تووشـی گونـاه و تـاوانیش بـبم، بە مەرجێک پارەم پێ بدات بۆ شیری مناڵەکەم ڕازی دەبم.

وتم: ئەی خانەوادە و براو کەست نیە؟

وتی: سێ برام شەهید بوون لە جەنگ و، برای چوارەمم لە وڵاتی کوەیت دەژی.

دووجار یاخود سێ جار تەلەفۆنم بۆ ئەو تاقە برایەم کردوە، هەتا یارمەتیەکم بـدات، هەموو جارەکان قسەی پێ وتـوم و دڵـی ڕەنجانـدووم، بـراکەم لە مێـردەکەم خـراپترە،

براکەشم دڵی پێم ناسوتیێ، چونکە نەدەگونجا لەگەڵ مێـردەکەم و قسـەیان لەگەڵ یەک نەبوو.

براکەم پێی وتم: برۆ چی دەکەیت بیکە و پـارە پەیـدابکە! ئەو بـێ ئومێـدیە پـاڵی بە منەوە نا، هەتا ئاوا سەرگەردان بم و هیچ کەس نەبێت لایەکم لی بکاتەوە.

منیش دەستم برد عەباکەم دایەوە بەسەریدا و وتم:

ئێستا براکەت لە کوەیتە؟

وتی: بەڵێ، زۆر دەوڵەمەندە، بەڵام زۆر نامەردە، ڕیاڵێکی بۆ نەناردم.

مێـردەکەم لەو نـامەردترە، خـانویەکمان هەبـوو، فرۆشـتی و پـارەکەی هەڵگرتـوە و ڕۆشتوە، منیش لە دوایدا زانیم کە خانوەکەش فرۆشراوە، هەتا ئەوە بوو خاوەن خـانوو هاتە سەرم و، مۆڵەتی ماوەیەکی کەمی پێ دام چۆڵی بکەم.

منیش لە گیرفانمدا تەنها سێ یاخود چوار تمەنی تیابوو پێم دا، ئەو کاتە، ئەو چەنـد تمەنە بۆ کڕینی شیر و پێداویستی کەم سوودی هەبوو.

وتم: ئەو پارەیە بگرە و شیری پێ بکڕە بۆ مناڵەکەت، بەیانیش وەرە کارم پێتە.

زۆر دڵی خۆش بوو، وتی: تۆ بڵێیت ئەمە خەون نەبێـت؟ پـێم وت: خوشـکم مـن یەکەم کەسم خوای گەورە لەسەر ڕێگای تۆ دایناوم، إن شاءالله درێخیت لێ ناکەم.

من تەنها ئەرکێك جێ بەجێ دەکەم.

بۆ ڕۆژی دواتر ژنەکە کـاتژێر هەشـت ئامـادەبوو، لەگەڵـی ڕۆشـتم بـۆ یەکێـک لە بانکەکـان، کە بەڕێـوەبەرەکەی هـاوڕێم بـوو، پـێم وت: ئەم ژنە خێزانـی یەکێـک لە هاوڕێکانمە و، مێردەکەی توشی ڕووداوێک هاتووە، حیسابێکی بانگی هاوبەشـی بـۆ کردینەوە.

بە ژنەکەم وت: ئەم حسابە بانکیە هـی تـۆیە، سەرپشـک بەو بەکـاری بهێـنە و لێـی سەرف بکە، هەتا مناڵەکەت گەورە دەبێت و هەتا پێویستیت بە پارەی من نامێنێت.

من پیاوێکی دەوڵەمەند نیم، بەڵام دەتوانم یارمەتی تۆ بدەم و ئاسانکاریت بۆ بکەم.

ژنەکە وتی: بۆچی ئەمە لەگەڵ من دەکەیت؟

وتم: تۆ حەقی ئەوەت نەبێت.

ئیتر منیش حیسابێکی بانکیم بۆ کردەوە.

پارەی پێویستم لە بەشی خۆی بۆ دادەنا، داهاتێکی مانگانەی مام ناوەندم هەبوو، خوای گەورە بەرەکەت داری کرد، تەنانەت من لەو کاتەدا حەوت ملیۆن قەرزدار بووم، بەهۆی بەرەکەتەوە قەرزەکانم دایەوە و، هەندێکی تریشم خستە سەر حساباتی ئەو ژنە.

هەر ئەو ڕۆژە بە ژنەکەم وت: خوشکم دوای ئەمڕۆ، نامەوێت بتبینم، لەبەر ئەوەی زۆر جوان بوو، نەمدەویست بیبینمەوە، ئەگەر ئێستا ئەو ئافرەتە، ئەم بەرنامەیە ببینێت پێی دەڵێم: ئەوەی کە من ئەنجامم دا بەهۆی پاکی و قوربانی دانی تۆ بوو بۆ منداڵەکەت، لەو ڕێگەیەشەوە بوو خوای تەعالا ئەو فەزڵەشی بەمن دا، ئەگینا من هەرگیز ئەهلیەتی ئەو چاکەیەم نەبوو، وە خاوەنی ئەو چاکەش نەبووم.

ئیتر ژنەکەماڵئاوایی کرد و ڕۆیشت.

منیش ڕۆشتمەوە بۆماڵەوە، جارێکی تر نەمبینیەوە، تەنها حەوت مانگ پارەی لە بانگ ڕاکێشابوو، دوای ئەوە بەڕێوبەری بانگ بانگی کردم و وتی: ژنی هاوڕێکەت نایەت بۆ ڕاکێشانی پارەکەی، نازانی بۆچی نایەت؟

منیش پێم وت: کێشەکەی چارەسەر بووە، لەبەر ئەوەیە نایەت.

لە دڵی خۆشما دەموت: تۆ بڵێیت شتێکی بەسەر نەهاتبێت.

هیچ ناونیشانێکی ئەو ژنەشم لەلا نەبوو.

ئیتر بیری خۆم بردەوە.

دوای ساڵانێک کە بێ هۆش کەوتم و دوای ئەزموونەکەم کە گەڕامەوە، بە 'سینا'ی کوڕە بچوکی خۆمم وت: کوڕم، کورسیەکەم لە نزیکی ئەو دوکانەی بەرامبەرمان بۆ دابنێ، با تۆزێک لەماڵ بێمە دەرەوە، لەو کاتەدا قسەم لەگەڵ خاوەنی دوکانەکە دەکرد، باسی ڕابردووی گەڕەکەکەمان و خەڵکی قەدیمیمان دەکرد، دوکاندارەکە پێی وتم: هەموو دراوسێکان خێریان بۆ کردیت هەتا چاک ببیتەوە، تۆ پیاوێکی باشیت و خەڵکی خۆشیان دەوێت.

وتم: دراوسێکان خۆیان باشن، من هیچ نیم.

لەو کاتەدا بوو ژنێک بەرەو ڕووی من دەهات، لەدوای (٨-٩) ساڵ ئەوە یەکەم جار بوو ببینمەوە، ژنەکە وتی: الحمدلله خوای گەورە شیفای بۆ ناردی، من حاڵی تۆم دەزانی و زۆر پەرێشانت بووم.

ئیتر کەوتینە هەواڵ پرسی یەکتر و وتم: چۆن زانیت؟

وتی: ئاغای لوڕستانی، ماوەیەک پێش ئێستا لێرەوە تێ پەڕیم و بەم دوکاندارەم وت: ئەو گریان و هاوار هاوارە چی یە لەم ماڵە بەرز دەبێتەوە 'ماڵی ئێوە'.

ئەویش وتی: ئاغای لوڕستانی لە لێواری مەرگ و ژیاندایە.

ئیتر منیش دەستی منداڵەکەم گرت و بە گریانەوە گەڕامەوە ماڵەوە، هەموو ئەو شەوەم ڕۆژکردەوە بە نوێژ و دوعاکردن بۆ تۆ.

هەتا زانیم کە شوکر بۆ خوا حاڵت باش بووە.

وتم: باشە، بۆچی دوای ئەو چەند مانگەی ئەوەڵ ئیتر نەهاتیتەوە بۆ ڕاکێشانی پارە لە بانک؟

وتی: خوای گەورە بەرەکەت بخاتە ڕزق و ماڵ و منداڵت، دوای ئەوە لە سەفارەتی کوەیتەوە، پەیوەندیان پێوە کردم کە براکەم کۆچی دوایی کردوە و، پارە و سامانێکی زۆری لێ بەجێ ماوە، تەنها میراتگری براکەشم من بووم.

هەموو پارە و سامانەکەیان نارد بـۆ مـن، ئێسـتا سـوپاس بـۆ خـودا یەکـێکم لە ژنە دەوڵەمەندەکان.

داواشم لە پارێزەرەکە کردوە سەیری حسابی بانکی تـۆ بکـات، هەتـا چەنـد قەرزت لەسەرە بۆت بدەمەوە، تۆ سوێندیشـت دام کە نەتبیـنمەوە، حەوت ملیـۆن تمەن قەرزار بوویت و بۆم دایتەوە.

بەڕێوبەری بانک پێی وتم: قەرزەکانت بە تەواوی لەسەر نەماوە.

وتم: تۆ بزانن هەڵەیەک لە حیساباتدا نیە؟

ئەو ژنە هەموو قەرزەکەی بۆ دابوومەوە و پێشی نەوتبووم.

ئافرەتەکە وتی: ئەوە قەرز بوو لە گەردنی مندابوو.

دوای ئەوە وتم: ڕەنگە خوای گەورە کە منی گێڕایەوە بۆ دونیـای 'دار العمـل' لەبەر کردەوەیەکی بەو جۆرە بوویێت هەرچەندە کارەکە ئاسایی و سادە بوویێت، بەڵام ڕەنـگە ڕێز لێنانی ئەو هەڵوێستە بوویێت.

## مەعصومەی شەفیعی

مەعصومە دەڵێت: ساڵی '٢٠١٦)ی زاینی بـوو، لە مـاڵی بـاوکم بـووم، شـەوێکی هاوین بوو، ویستم بخەوم، هەر ئەوەندەی سەرم خستە سـەر جێگـای خەو، ڕۆحـم لە لاشەم جیابوویەوە، لە ڕێگایەکی گەورە و فراوانـدا خـۆم بینـیەوە، کـاتەکە شـەو بـوو، بەڵام ئەو ڕێگا فراوانەی کە خۆمم تیا بینیەوە ڕۆژی ڕوونـاک بـوو، بەخـۆم وت: بـا لە ڕێگەکە دور بکەومەوە، ڕەنگە سەیارەی لەسـەر بێـت، لە قەراغـی ڕێگـاکەوە ڕۆشـتم، جـۆگەلەیەکی ئـاو بە قەراغەکەدا دەڕۆیشـت، ویسـتم بە جـۆگەکەدا بـپەڕمەوە، کـاتێ

پەڕیمەوە، خۆم لە بیابانێکی کاکی بە کاکی دا بینیەوە، بیابانێکی وشک و برنگ و فراوان بوو، زۆر تاریک بوو، شەق و پەق بوو بوو، لە درزەکانیەوە بڵێسەی ئاگر دەهاتە دەرەوە.

تەنها رۆشناییەک ڕووناکی ئاگرەکان بوو، شوێنێکی زۆر ترسناک بوو، ویستم بگەڕێمەوە بۆ ئەو شوینەی لێوەی هاتبووم، دوان لە پشتمەوە بوون و پاڵیان پێوە دەنام بۆ پێشەوە، دوو بونەوەر بوون کە نەمتوانی بیانبینم.

لە ترساندا هەستم دەکرد کە ناتوانم قسە بکەم، ئەو شوێنەش داخراوبوو، ترسم لەو ئاگرەی درزەکان بوو! هەتا کاتێکم زانی کەسێك پەیدا بوو، دەم و چاوو ڕەخساریم نەبینی، جلی سپی لەبەردابوو، پێی وتم: لە دوای منەوە وەرە، وتم: ناتوانم!!

وتی: قاچت لە شوێن پێکانی من دابنێ و بە قاچی ڕاستت دەست پێ بکە، منیش بەو جۆرەم کرد، هەستم کرد پێم هەبوو، بەڵام پێم نەدەبینی.

لام کردەوە هەتا ئەو بوونەوەرەی دوای خۆم ببینم، لەو کاتەدا زەوی ڕۆچوو، بەرەو خوار شۆڕبوومەوە، کە زەوی ژێر پێم ڕۆچوو، بورکان و ئاگرەکان بۆ سەرەوە بەرز دەبوونەوە.

وتم: سوپاس بۆ خوا کە نەکەوتمە ناو ئاگرەکە.

ترسم بەردەوام بوو، چونکە دەبوو ئەو بیابانە ببڕم، هەنگاوەکانی ئەو پیاوە زۆر گەورە بوون، وتم: شوێن پێکانی من بچوکن، چۆن بچمە شوێن پێکانی ئەو کە گەورەیە.

من دەترسام کە قاچم نەگاتە شوێن پێکانی ئەو و بکەومە ناو ئاگرەکەوە، هەتا گەیشتینە کۆڵانێک، کە ڕێڕەوێک بوو لە نێوان دوو دیواردا، زۆر تەسک بوو، پێیان وتم: دەبێت لە نێوانی ئەو دوو دیوارەدا ڕێ بکەیت.

وتم: ناتوانم، من دەترسم.

وتیان: دەبێت لەوێوە بڕۆیت.

پیاوەکە لە سەرەتای ڕێڕەوەکە ڕاوەستاو وتی: من نـاتوانم یارمەتیـت بـدەم، دەبێـت خودی خۆت ئەوە ئەنجام بدەیت، کە بە نێوان دیوارەکە دا ڕۆیشـتم زۆر تەسـک بـوو، سەختی زۆر بوو، زۆر باریک بوومەوە هەتا بەو ڕێگایەدا بڕۆم، دیـوارەکە زۆر سـەخت و ڕەق بوو، زۆر ڕەش بوو، ڕێگای گەڕانەوەشـی نەبـوو، چـونکە دیـوارەکە لە دوامەوە تەسک دەبوویەوە و دادەخرا، ئاگریش هەبوو.

کە داوام کرد لە پیاوەکە یارمەتیم بدات بۆ بڕینی ڕێگاکە، وتـی: کەس لەو ڕێگـایەدا یارمەتیت نادات، دەبێت خۆت ئەو کارە بکەیت، ئیتر من بەردەوام بـووم لە ڕێ کـردن، هاوارم دەکرد بەتەنها ناتوانم ئەم ڕێگا سەخت و تەسک و تروسکە ببڕم.

یەکێک یارمەتیم بات کەس نەبوو!

دەنگێک پێی وتم: دەبێت خۆت هەوڵ بدەیت ئەم قۆناغە ببڕیـت، لەوێ زانـیم ئەم ناڕەحەتیانە کە هاتونەتە ڕێگام بەهۆی ئەوەوە بـووە کە هەوڵـی خـۆ کـوژیم دا، بە هەچ هەوڵ و ناڕەحەتیەک بوو ئەو شوێن و دیوارە تەسکەم بڕی.

هەستم دەکرد لە بەینی ئەو دوو دیـوارەدا ئێسـکەکانم دەشـکێت، چـونکە دیـوارەکە بەردەوام تەنگتر دەبوویەوە، نە بۆم دەکرایەوە، نەگەڕانەوە بۆ دواوە.

ئەو ڕێگا و قۆناغەش تەواو بوو.

ئەو پیاوەی کە لەگەڵم بوو، بە ئاسانی لە دیـوارەکە دەرچووبـوو، نـورێکی هیلالـی لەوێدا هەبوو، کە ئومێد و هەستێکی زۆر جوانی پێ دام، ئیـتر لەوێ بەرگ و پۆشـاکی پیاوەکە یەکپارچە نور بوو، پۆشاکە خاکیەکەی لەبەردا نەبوو، زۆر نورانی بوو.

کاتێك پیاوەکەم بینی، لەلای چەپی تاڤگەیەکی ئاوم بینی، دەنگی ئەو تـاڤگەیە زۆر شیرین بوو، ئەو شوێنە هەمووی دەنگی باڵندە بوو.

پیاوەکە لە پێشدا کە بینیم بەهۆی دوکەڵ و ئاگرەکەی پێشوەوە پۆشاکەکەی خاکی و ڕوومادی بوو، بەڵام کە تێپەڕی و گەیشتینە نور و شوێنە دڵڕفێنەکە، بۆنێکی زۆر خۆشی لێ دەهات، دەم و چاوی داپۆشی بوو، لەبەر ئەوە نەمتوانی ڕوخساری ببینم، هەستم کرد کە مرۆڤ بێت، وەک ئەوە بوو بە ڕوومدا پێ بکەنێت. هەستم کرد پیرۆزبایم لێ بکات، لەسەر سەرکەوتنم لە تاقی کردنەوەکاندا.

لەلای چەپی تاڤگەیەکی ئاو هەبوو، لەگەڵ چیایەکدا، لەگەڵ ڕووناکیەک، هەستم بە بەختەوەری دەکرد، باڵندەکان دەتوت گۆرانی دەڵێن، هەستێکی زۆر جوان بوو هەستم کرد کە مۆڵەتیان دام کە لا بکەمەوە بۆ دواوە و تاریکی و ئاگر و دیوارە تەنگەکەم بینیەوە، بڕیارم دا ئیتر سەیری ئەو شوێنە نەکەمەوە، نێوەندێک هەبوو لە نێوان ئەو شوینە خۆش و نورانیە و ئەو شوێنە تاریکەدا، وام هەست دەکرد لە نێوان بەهەشت و دۆزەخدام.

گوڵەکانی پڕبوو لە پەپولەی ڕەنگاوڕەنگ و جوان و گوڵی جوان، درەخت و گەڵاکانیان زۆر جیاوازبوون.

کە ئەو جوانی و ئاوازە نەبیسراوانە دەبینیت مەدهۆشی دەبیت، هەرگیز لە زەویدا لەو جۆرانە بوونی نیە.

ئاوی زۆر جیاوازە لە ئاوی سەر زەوی، ئارامیەکی سەیرت پێ دەدات، نورانی و زوڵاڵ و پاک و ڕوونە.

بەردەکانی ناوی بە جوانی دیارە، پیاوەکە ئاماژەی بۆ کردم کە بەرەو لای ڕاست بڕۆم، کە سەیری لای ڕاستم کرد، دەشتێکی پڕ لە گژوگیا و گوڵ و گوڵزرم بینی.

گوڵەکانی زۆر جیاواز بوون، درەختەکانی جۆرێک لە وت و وێژیان لەگەڵ دەکردی، هەستم دەکرد سەلامیان لێ دەکردم، دڵخۆش بوون بە بوونمان لەگەڵیان.

هەست بە شنەیەکی زۆر فێنک دەکەیت، جەستەشت نیە، کە نزیک دەبوومەوە لە گوڵەکان، باڵندەکان هەڵدەفڕین و بە دەورمدا دەسوڕانەوە.

پیاوەکە ئاماژەی کرد کە سەیری گردۆلکەیەک بکەم، داپۆشرابوو بە گژوگیا و سەوزی، زۆر نەرم بوو، لەگەڵ شنەی باکەدا لەنجە و لاری دەکرد، ئافرەتێک بەسەر گردۆلکەکەوە ڕاوەستابوو، ڕوخساریم نەبینی، بەڵام جل و بەرگی حەریری سپی بوو، هەستم بە عەبیر و عەتر و بۆنخۆشیەکی زۆر خۆش دەکرد، بۆنی خۆشی ئافرەتەکە لە بۆن خۆشی ئەو دەشت و کێوانە زیاتر بوو، جیاوازیش بوو.

بەبێ ئیرادە ڕۆیشتم قاچیم ماچ کرد، هەستیشم کرد کە قاچی ماچ دەکەم، ئەگینا وەک قاچ نا....

دەستی لە ناو پۆشاکە ئاوریشمەکەدا دەرهێنا و هێنای بە جەستەمدا، هەستم بە دڵئارامیەکی زۆر زۆر کرد، هەستم کرد لە خۆشیاندا دەگریام.

نەمدەویست لەو شوێنە بڕۆم، دوو کەس سەرتاپا سپی، نەمزانی ئایا پیاو بوون یاخود ژن، هاتن و وتیان بەمن هەستە، دوایی ئەو ژنە قسەی لەگەڵ کردم و بەخێرهاتنی لێ کردم و قسەی خۆشی بۆ کردم، پیرۆزبایی لێ کردم، ئومێدی پێ دام، دەتوت تازە لەدایک بووم.

هەستم کرد کەمن پەیوەندی دارم بەو شوێنەوە.

واتە ئێمە خەڵکی ئەوێین.

ئەوێ دەناسین و دەماناسێت، لە قەدیمدا من لەوێ بووم.

ئەو دوو کەسە منیان لەوێ هەستاند و پێیان وتم: دەبێت بگەڕێیتەوە بۆ دونیا، من پەنام برد بۆ ئەو ئافرەتە کە بەڵکو شەفاعەتم بۆ بکات و من نەگێڕنەوە بۆ دونیا.

دەمەوێت لە نزیکی تۆ، لێرەی هەمیشە جوان و هەمیشەیی بمێنمەوە، بەڵام ئافرەتەکەش وتی: پێویستە بگەڕێیتەوە، چونکە تۆ نامە و پەیامێکت پێیە بۆ سەر زەوی، کە پەیامەکەتت گەیاند دەگەڕێیتەوە بۆ ئێرەی هەمیشەیی.

کە ئاماژەی کرد بە دەستی ڕاستی، من سەیرم کرد، زەویم بینی، شاخەکان چوار دەوری زەویان دابوو، لە ناوەڕاستدا ماڵ و شارەکانم بینی.

وتم: نا... تکاتان لێ دەکەم، ڕێگەم بدەن با لێرە بمێنمەوە، بە تکا و پاڕانەوەوە دەموت مەمگێڕنەوە بۆ دونیا، زۆر ترسام کە دەیانگێڕامەوە بۆ زەوی، دەمزانی کە بگەڕیمەوە دیسانەوە کێشەکانم سەرهەڵدەدەنەوە لە دونیادا. بەڵام ئەو دوو کەسە بە زۆر منیان هێنایەوە، من خۆم هیچ ویستێکی گەڕانەوەم نەبوو، ڕوخساری ئەو دوانەم نەبینی، سەیری ئافرەتەکەم دەکرد، کە بەڵکو دڵی نەرم ببێت و پێیان بڵێت وازم لێ بێنن، بەڵام ئەوە ڕووی نەدا کە من دەمویست، گەڕێنرامەوە بۆ دونیا.

کە گەڕامەوە خۆم لەسەر چرپاکەم بینیەوە، کاتێ ڕۆحم گەڕایەوە بۆ ناو جەستەکەم و هەستامەوە، دەبینم ڕوخسارم هەمووی تەڕ بووە، ئەوەندە گریاوم، جارێکی تر گەڕامەوە سەر جێگای نوستنەکەم، هەتا بەڵکو ئەو ئەزموونە ببینمەوە و بگەڕێمەوە بۆ ئەو شوێنە.

لە ماڵی دایکم بووم، ڕۆژ بوویەوە دانیشتم بۆ نان خواردنی بەیانی، دایکم پێی وتم: مەعصومە بۆچی قژت سپی بووە.

دایکی دەڵێت: کچەکەم لە ژوورەکەی هاتە دەرەوە، ڕەنگ و ڕوخساری تێک چووبوو، حاڵی پەشێو دیار بوو، هەروەکو ئەوەی لە شتێک بترسێت.

وتم: کچم چیتە؟

وتی: هیچ نیە.

من لەگەڵی دەدوام و، ئەو وەڵامـی نەدامەوە ، وەک ئەوەبـوو بیەوێـت شـتێکم پـێ بڵێت، بەڵام هیچـی نەدەوت. کە جـوان سـەیرم کـرد، وتـم: مەعصـومە بـۆچی قـژی سەرت سپی بووە.

سەری سوڕماو وتی: بەڕاستە دایە؟

ڕۆشتمە ژورەوە و سەیری ئاوێنەکەم کـرد و وتـم: دایە ڕەنـگە بە هـۆی ئەو ترسـەوە بووبێت کە لە ئەزموونی ئەمشەومدا هاتەڕێم.

وتم: دایە سەیربکە، تەنانەت برۆشم سپی بووە، ئێستا هەردوو برۆم بۆیە دەکەم.

ناڕەحەتیەکانی ئەوێ ڕوخساریان سپی کردم.

کوڕەکەم کە ناوی 'موحەمەد یاسین'ە دەڵێت دایە بۆچی ئـاوا زوو پیـر بوویـت، لەو جیهانە ئەو پەیامەشیان پێ دام، نـاوی مـوحەمەد یاسـینی کوڕیـان پـێ دام، کە هێشـتا لەدایک نەبووبوو، مردن زۆر جوانە، جـونکە سـەرلەنوێ لەدایـک بـوونێکە کە مردنـی بەدوادا نایەت.

## ئەزموونەکەی ئاوایی 'ئاب سەرد'



مەهدی ئەسفەندیاری لەساڵی (١٩٨٥)ی زاینـی لەدایـک بـووە، ئەزمـوونەکەیمان بەم جۆرە بۆ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: لە ناوچەکەی ئێمە بەفر و باران زۆر دەبارێت، ئـێمە لە : 'ئابسەردین' قەزای 'خفر' لە پارێزگاری 'فارس'.

ساڵی (٢٠٠٥) بوو، شـەوێکی بەفـراوی سـاردبوو، کـاتژمێر دوانـزەی شـەو بـوو، ویستم بچم دەرگای حەوشە دابخەم، جوتێ نەعلم لەپـێ کـرد و بە خێرایـی ڕامکـرد، هەتا دەرگاکە دابخەم و زوو بگەڕێمەوە ژورەوە.

ته‌مه‌نـم سـه‌رو حه‌ڤـده سـاڵان بـوو، كه‌وتـم له‌ حه‌وشـه‌كه‌داو، سـه‌رم كێشـای به‌ چیمه‌نتۆی حه‌وشه‌كه‌دا، هه‌ر ئه‌وه‌نده‌ی تاسام و سـه‌رم دای به‌ زه‌ویه‌كه‌دا، كـوت و پـڕ باوكم له‌گه‌ڵ دوو كه‌سی تردا بینی، باوكم كۆچی دوایی كردبـوو، وام هه‌سـت كـرد كه‌ باوكم ده‌ستی خسته‌ ژێر سه‌رم و ڕاستی كردمه‌وه‌.

خوشـكه‌كه‌ی مه‌هـدی ده‌ڵێـت: دایكـم شـڵه‌ژاو وتـی: مه‌هـدی له‌ حه‌وشـه‌كه‌دا خلیسكاو كه‌وت.

مه‌هدی ده‌ڵێت: باوكم له‌ ساڵی (٢٠٠٠) وه‌فاتی كردوه‌، كه‌ باوكم هه‌ڵـی سـاندم و ده‌ستی گرتم، هه‌ستم كرد زۆر سوكه‌ڵه‌ بووم.

جه‌سته‌ی خۆمم بینی كه‌ له‌سه‌ر زه‌ویه‌كه‌ كه‌وتبـوو، كه‌ هه‌سـتامه‌وه‌ ’رۆحـم‘، خـۆم بینیه‌وه‌ كه‌ له‌گه‌ڵ باوكم بووم له‌ نزیكی گۆڕستانی ’ئابسه‌رد‘.

له‌لای دره‌ختێكـی گه‌وره‌ی گۆڕسـتانه‌كه‌دا خـۆم بینـیه‌وه‌ له‌وێـدا هه‌مـوو مـردوی گۆڕستانه‌كه‌م بینی، كه‌ به‌ پێوه‌ وه‌ستابوون و چاوه‌ڕوانی منیان ده‌كـرد، له‌سـه‌ر شـێوه‌ی دونیایان بـوون، بـاوكم ناسـاندمی به‌ بـاپیرم و بـاوكی دایكـم كه‌ له‌ سـاڵی (١٩٦٣)دا وه‌فاتی كردوه‌.

كۆمه‌ڵێك له‌ مردوه‌كان ڕواڵه‌تێكی جوان و ڕێك و پێكیان هه‌بوو.

جل و به‌رگیان جوان بوو، خۆیان زۆر جوان بـوون، دیـاربوو له‌ نـاو ژیـانێكی زۆر خۆش و هێمن و جوانیدا ده‌ژیان، له‌ باشترین حاڵدا بینیمن.

كۆمه‌ڵێكیشـیان شـێوه‌ و شـكڵیان ڕه‌ش بـوو، ده‌سـوتان، له‌ ته‌وقـی سـه‌ریانه‌وه‌ بـۆ قاچه‌كانیان وه‌ك خه‌ڵـوز ڕه‌ش بـوون، ته‌نهـا ددانه‌كانیـان سـپی بـوو، له‌گه‌ڵ سـپیایی چاوه‌كانیان، ده‌سوڕانه‌وه‌ و خولیان ده‌خوارد به‌ ده‌وری خۆیاندا، له‌ تاو ئـازاری سـوتان ده‌سوڕانه‌وه‌ و سه‌یری منیشیان ده‌كرد!!

هه‌رسێ چینه‌كه‌ش خه‌ڵكی ئاواییه‌كه‌ی ئێمه‌ بوون و له‌و گۆڕستانه‌ نێژرابوون.

ئەوان کە دەسوتان، نەدەناسرانەوە.

ئاگرەکەیان ڕەش بوو، وەک ئاگری دونیانەبوو.

دوکەڵ لە جەستەیان بەرز دەبوویەوە.

یەکێکیان زۆر سەیری کردم و منیش سەیری ئەوم کرد، من زۆر ترسام، باوکم دەستی گرتم و ڕایکێشام و وتی: سەیری ئەوانە مەکە.

هەندێک لەگەڵ باوکم ڕێمان کرد و ڕۆشتین، گۆڕێکی هەڵکەندراومان بینی، من و باوکم لە لێواری گۆڕەکەدا ڕاوەستاین، ویستم پرسیار لە باوکم بکەم، ئەم گۆڕە چی یە؟

ئێمە لە کوێین؟

ئەمە چی یە ڕوودەدات؟

گوێم لێ بوو پیاوێک لەناو گۆڕەکەوە قسەی دەکرد، بەڵام نەمبینی، بە دەنگێکی لەرزۆک و خەماوی سێ جار پرسی: ئایا تۆ نوێژت دەکرد یاخود نا؟

شوێنی گۆڕەکە، ئێستا بووەتە گۆڕی کەسێک و پڕ بوەتەوە.

باوکم هیچ پەرچەکرداری نەبوو، هیچی نەوت لەوێدا. سێ چوار جار بە دەنگێکی پڕ لە هەیبەتەوە وتی: تۆ نوێژدەکەیت یاخود نا؟!

منیش لە ترساندا دەلەرزیم، نەمدەتەوانی وشەیەکیش بڵێم!

دوای ئەوە زانیم کە ناتوانم وەڵامی بدەمەوە!!

باوکم هیچ بەرگریەکی لێ نەکردم!

خوای گەورە ئاگادارە! دەستێک لە گۆڕەکە هاتە دەرەوە و نامەیەکی لە دڵی من دەرهێنا و، هەرچی کردارێک لە ژیانمدا ئەنجامم دابوو، هەمووی لەو نامەیەدا نوسرابوو، ئەو نوێژانەی کە ئەنجامم دابوون، بە ڕەنگی سەوز نوسرابوون، ئەو

کردەوانەی کە خراپ بـوون، خـراپم ئەنجـام دابـوو بە ڕەنگـی ڕەش نوسرابـوون، ئەو کردەوەکانی دەخوێندەوە و منیش دەمبینـی و دەمخوێنـدەوە، شـێوازی دەنگـی گـۆڕاو وتی: تۆ نوێژت کردوە!

دوای ئەوە شێوازی وتنەکەی هێمن بوویەوە، نەرم و نیان و میهرەبـان بـوو لەگەڵـم، بەڵێ تۆ نوێژت کردوە.

کە ئەمەی وت: هەموو شتێکی جوانیان پێ دام، هەستی ئارامی و دڵنیایی، هەسـتی بەختەوەری.

قورئانی پیرۆز دەفەرموێت: ﴿فَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ بِيَمِينِهِ﴾ (الأنشقاق: ٧)

تۆزێ پێش ئێستا هاواری دەکرد بەسەرمدا و بە دەنگـی دەیترسـاندم، کەچـی ئێسـتا زۆر گۆڕاوە لەگەڵم.

پێی وتم: ئەم دوو رکاتە نوێژە چی یە؟

وتم: من لە دوای هەموو نـوێژێکی فەرزەوە، دوو ڕکـاعەت نـوێژی سـونەت دەکەم و، بە دیاری دەینێـرم 'پاداشـتەکەی' بـۆ ڕۆحیـانەتی مردوەکـان و شـەهیدان و ئـیمامە گەورەکانمان کە وەفاتیان کردوە.

وتی: بەهۆی ئەو دوو ڕکاعەت نوێژەوە دەگەڕێیتەوە بۆ ژیانی دونیا.

من بەردەوام لە تەمەنی چواردەساڵیەوە ئەو دوو ڕکاعەت نوێژم ئەنجام داوە.

باوکم هاندەرمان بوو لە سەر ئەوەی نوێژەکانمان بە باشی بکەین. بە تایبەتی نـوێژی بەیانی.

ئیتر دوای ئەوە وتیان: بیگێڕنەوە بۆ دونیا، چونکە دایکی چاوەڕوانیەتی.

دوای ئەوە من و باوکم لەو گـۆڕە دورکەوتیـنەوە و ڕوومـان لە شـوێنێکی تـر کـرد، کۆمەڵێک مردومان بینی، کە زانیان من دەگەڕێمەوە بۆ دونیا، هاتن بـۆلام و وەسـیەتیان

بۆ کردم بە هەندێ لە کـاری تـایبەتی خۆیـان، یەکێـک لە مردوەکـان لەلای گـۆڕەکەی دانیشتبوو، پێی وتم: مەهدی.

وتم: بەڵێ.

وتی: وەرە بۆ ئێرە.

منیش ڕۆشتم، ئەو پیاوە ماوەیەکی کەم بـوو بە هـۆی ڕووداوی هـاتوچۆوە کـۆچی دوایی کردبوو.

وتی: دەمەوێت ڕاسپاردەیەکم هەیە بیگەیەنیت بە خێزانەکەم.

وتم: باشە، چی یە؟

وتی: پێیان بڵێ کە ڕۆژانی پێنج شەمە دێن بۆ سەر گۆڕەکەم، بـانەیکەن بە گریـان و شیوەن.

ئەگەر دەیانەوێت من بەختەوەر و دڵخۆش بکەن با قورئانم بۆ بخوێنن.

دوای ڕاسپاردەکەی، هەندێک لە مردوەکانی تر هاتن بەهەمان شێوە ڕاسـپاردەم پێـا بنێرن.

هەنـدێکیان حەقـی خەڵکیـان لەلابـوو، هەنـدێکیان کێشـەی تریـان هەبـوو لەگەڵ خەڵکی دونیا.

بۆ نموونە: یەکێک لەو خێزانانە، باوکیان قەرزێکـی لە گەردنـدا بـوو، پێـی وتـم: بە خێزانەکەم بڵـێ قەرزێـک لە گەردنمـدا هەیە، بـا بەو جـۆرە، کە ئەو دەستنیشـانی کـرد بیدەنەوە.

من بە خێزانەکەیم وت: ئیتر نازانم بۆیان دایەوە، یاخود فەرامۆشیان کرد!

دوای ئەوە ڕۆشتین بۆ شوێنێکی تر.

باوکم وتی: لە کەنارێکەوە ڕابوەستە، وتم: باشە.

هەموو ئەو مردوانەی شێوە و ڕوخسariyan باش بــوو، لەگەڵ ئەوانەی کە هەیـئەت و ئەندامیان ئاسایی بوو، لەسەر شێوەی وەستان بـۆ نـوێژ ڕاوەسـتان، ئەوەی سـەرنجی ڕاکێشام ئەوە بـوو کە یەکێک لە هاوڕێکـانم کە گەنـج بـوو، لە تەمەنـی پـانزە سـاڵیدا کۆچی دوایی کرد، ئەو گەنجە ئیمامیان بوو بۆ نوێژکردن.

دوایی کە گەڕامەوە، قسەم لەگەڵ خێزانەکەیـدا کـرد، وتـم: ئەم کـوڕەی ئێـوە چـی کردوە، هەتا ئەوەندە پلە و مەنزلەی بەرزتربێت لەوانی تـر... کـوڕەکەی ئێـوە بووبـووە ئیمام و نوێژی بۆ ئەوانی تر دەکرد.

ئیتر کەس و کاری باسی تایبەتمەندی کوڕەکەیان بۆ کردم، قەنـاعەتم بە قسـەکانیان هەبوو، ئەوەی من بینیم، زۆر واقعی تر بوو لەم دونیایەی کە ئێمەی تێدا دەژین.

مەشهەدی ئەو ڕیز بەستنە زۆر جوان بوو، قاچیان وەکو شەپۆلی دەریابوو، نـوور و ڕووناکی دەدرەوشایەوە، مەشـهەد و وێنـاکە زۆر زۆر نایـاب بـوو، هەنـدێکیان جـل و بەرگـی سـەوزیان پۆشـی بـوو، موناجـات و پـاڕانەوەیەکی زۆر جوانیـان لە خـزمەت خوای تەعالادا دەکرد، من لە لایەکەوە ڕاوەستابووم و سەیری ئەوانـم دەکـرد، لە دوای ئەوەی نوێژ و موناجاتەکەیان تەواو کرد.

بینیم فەرش و ڕاخەرێک کە لەسـەری بـوون زۆر جـوان و ڕۆشـن و نـورانی بـوو، وەک شەپۆلی دەریا شەپۆلی دەدا، چەنـدین ڕەنگـی جـوانی تیـابوو، وەک ئەوانەی کە لەسەری وەستابوون جێگیر و بێ شەپۆل نەبوو، فەرشەکە جوڵاوو شەپۆلاوی بوو.

لە سـاڵی (٢٠٠٠)ی زاینـی بـاوکم لەسـەر هۆکـاری زەوی کـوژرا، هەمیشـە ئەو پرسیارە دەهاتە بیر و هۆشی من، کە ئایا بە چ شێوەیەک و لەبەر چی باوکم کوژرا؟

کەس ئەوەی بۆ ڕوون نەکردمەوە.

لە باوکم پرسی: بابە بۆچی بەو جۆرە کوژرایت؟!

خێرا لەو چرکەیەدا باوکمم بینی جەستەی لەسەر زەویەکە کەوتبوو، لەهەمـان کاتـدا باوکم لەلای من ڕاوەستابوو، هەموو ڕووداوەکانی کوژرانی باوکم بینی.

هەمووی بۆ ڕوون بوویەوە کە چۆن ڕووداوەکە ڕووی داوە.

وەکـو ڕووداوێکـی واقعـی لەبەر چـاوم ڕوویـدات، ئـاوا پیشـانم درایەوە، بـاوکم لەلامەوە بوو، بۆی باس دەکردم، کە لە فلان شوێن ئەوە بوو، ئـاوا ڕووی دا، هەمـووی بۆ شی کردمەوە.

بەو مانایەی کە من و باوکم لە شوێنی ڕوودانـی کوشـتنەکە بـووین و لەبەر چـاوی ئێمە دا ڕووی دا و هەموویمان بینی.

ئـێمە لەسـەر کـوژرانی بـاوکم تەنازولمـان کـرد و لێیـان خـۆش بـووین، ئێسـتا پەیوەندیمان لەگەڵ خێزانی بکوژەکەدا باشە، خەڵکی لادێکەمـان زۆر پەنـد و وانەیـان لەو لێخۆشبونە وەرگـرت و، بـوو بەهـۆی ئەوەی کە کێشـەیەک ئەگەر لە لادێکەمانـدا ڕوویـدات، هەمـوو بەرەو ئاشـتەوایی بـڕۆین و دور بکەویـنەوە لە گەورە کردنـی کێشەکان.

خوای گەورە ئاگادارە، ئەوەندە بەین خۆشی دروست بووە لە نێـوانی خێزانـی ئـێمە و بکـوژی بـاوکم، کە ژن و ژنخـوازی کەوتـۆتە نێوانمـان، یەکێـک لە کوڕەکـانی ناحەزەکانی ئەوسامان، کچە مامێکی ئـێمەی هێنـاوە و خەڵکـی دەپرسـن ئەم هەمـوو لوتف و موحیبەتە چۆن لە نێوانتاندا دروست بووە؟

منیش دەڵێم بۆچی نابێت؟.

دڵ شوێنی عیبادەتی خودایە و، نابێت بیکەیـنە شـوێنی کینە و ڕق و دوژمنـایەتی، ئەوە ڕووداوێـک بـوو لە ڕابـوردودا ڕووی دا، پێویسـت ناکـات هەتـا قیـامەت ئـێمە خەریکـی بەخێـوکردنی دوژمنـایەتی و ئیرەیـی بـین، کینە و ڕق مـرۆڤ خـۆی ئـازار دەدات.

ئێمە لەبەر خاتری خوا وازمان لە دوژمنایەتی هێنا.

دڵ شوێنی خۆشەویستی خودایە و شوێنی ڕق و ئیرەیی بردن نیە.

دوای ئەوە ڕۆشتین بۆ شوێنێکی تر، ساڵێک لە ساڵان زۆر وشکە ساڵی بوو، ئەو ساڵە ئاستەنگمان زۆر هاتەبەر.

ئێمە باخێکی هانجیرمان هەبوو، کە بەهۆی بارانەوە ئاومان دەدا.

وتم بە باوکم: بابە پێویستمان بە بیرێکە هەتا ئاوی باخە هەنجیرەکەی پێ بدەین، ئەم ساڵ وشکە ساڵی زۆر ئازاری داوین، هەرچەندە سەردانی ئەندازیاران و پسپۆڕانمان کردوە دەڵێن ئەم باخەی ئێمە لە ژێرەوە خەزانی ئاوی تێدانیە و، بیر لێدان سوودی نیە.

ئەم باخی هەنجیرەش تەمەنی سەد ساڵ دەبوو، باپیرەم ئەو باخەی ڕواندبوو.

باوکم بردمی بۆ سەر زەویەکە و شوێنێکی دیاری کراوی پیشان دام و پێی وتم: ئا لێرەدا بیرێک لێ بدەن دەگاتە ئاو، ئاوێک فوارە دەکات و سەردەکەوێت.

دوای ئەوەی لە 'گەشتی نزیکبوونەوە لە مردن' گەڕامەوە لەسەر ڕاسپاردەی باوکم لەو شوێنەی پێی وتم: بیرێکمان لێ دا، سوپاس بۆ خودا گەیشتە ئاو و بەو جۆرە بوو کە باوکم پێی وتم.

ئەندازیارەکان وتیان: نابێت لێرەدا بیر لێ بدەن، خاڵێکی تریان بۆ دەستنیشان کردین، کە دووسەد مەتر لەوێوە دور بوو، بەڵام لەو شوێنەی ئەندازیارەکان وتیان ئاو نەبوو!

بەڵام ئەو شوێنەی کە باوکم لە بەرزەخ بۆی دەستنیشان کردبووین، باپیرم کاتی خۆی بەری هەنجیری ئەو شوێنەی وەقف کردبوو بۆ خێری ئیمام حوسین، کە ژمارەی دار هەنجیرە وەقفەکان بیست و پێنج دار هەنجیر بوون، ژمارەی تەواوی باخەکەمان هەزار و سێ سەد دار هەنجیر بوو.

بیرەکەمان لەو شوێنە لێدا کە باوکم پێی وتین، الحمدلله ئاوێکی باشی تێ هات، ئەم ناوچەیە پێی دەوترێت 'مارن' واتە سێ مەتر هەڵ دەکەنیت، تەنها گڵی وشکە.

ئەندازیارەکان (٦-٧) جار هاتن و گەڕان لە ناو باخەکەدا، بەڵام ئاویان نەدۆزیەوە.

بەڵام ئەوە سەیر بوو کە ڕۆحی باوکم شوێنی بیرەکەی پێ وتین و بەو جۆرەش دەرچوو، ئێستا ئاوێکی زۆر زۆری هەیە و بەشی باخەکە دەکات، هەرچی جارێک دێمەوە ئێرە وێنەی باوکم دێتەوە بیرم، صەڵاوات لەسەر ڕۆحی حەزرەتی موحەمەد مصطفى ﷺ لێ دەدەم و پاداشتەکەی دەنێرم بۆ ڕۆحی باوکم.

چونکە خێرێکی گەورەمان دەسکەوت، بیرەکە ئاوێکی زۆر باشی هەیە و، بۆ دوای خۆشمان دەمێنێتەوە إن شاءالله.

کە لەگەڵ باوکمدا گەڕاینەوە بۆ گۆڕستانەکە، چەند پرسیارێکی تر هاتنە بیرم کە لە باوکمی بپرسم!

خوشکەزایەکم هەیە زمان ناگرێت و تەمەنی لە سێ بۆ چوار ساڵانە و، کە دەیەوێت قسە بکات ناتوانێت.

هەموو خێزانەکەمانی خەمبار کردوە.

منداڵەکە ناوی موحەمەدە، وتم: بابە گیان هەموومان خەمبارین بۆ موحەمەد!!

باوکم موحەمەدی پیشان دام لە تەمەنی حەوت ساڵیدا.

کە دەچێتە قوتابخانە و، جامتای قوتابخانەی پێیە و، دەیەوێت بچێت بۆ قوتابخانە.

خوا شاهیدە بەو جۆرەی بینیم، موحەمەد ڕۆشت بۆ قوتابخانە و زمانی بەر بوو چاک بوویەوە.

ناتوانم ئەوە بە وشە تەعبیر بکەم، کە چەندە بە ڕوونی ئەو منداڵەم بینی، پاش چەند ساڵێکی تر چۆن دەبێت و چاک دەبێتەوە.

الحمدلله ئەو منالە لە تەمەنی حەوت ساڵاندا چوویە قوتابخانە و هـیچ کێشـەیەکی قسەکردنی نەماوە و ئاسایی بووەتەوە. دوای ئەوە لە گۆڕستانەکەوە چاوم چـوویە سـەر گردەکە، وتم: بابە ئەوە چی یە؟

دوکەڵێکی خەست لە پشتی گـردەکە بەرز دەبـوویەوە، دوکەڵەکە بەڵگەبـوو لەسـەر ئەوەی لە پشتی ئەو گردە ڕووداوێکی ترسناک ڕوودەدات.

باوکم وتی: کۆمەڵە خەڵکێک لەوێن، کاتێک لە دونیادا بوون، دەچـوون بـۆ بڕینـی شانەی هەنگ، شانەکانیان دەسوتاند، هەتا بە ئاسانی هەنگوینەکە بێنـنەوە بـۆ مـاڵەوە، ئەم کەسانە سزا دەدرێن لەسەر ئەو کارە خراپەیـان کە مـن بینیم، ئەو گـردە لە پشـتەوە دوکەڵێکی ڕەشـی ترسـناکی لـێ بەرز دەبـوویەوە، سـزا دەدران، چـونکە ئەوان سـزای هەنگیان دابوو، سزای گیانداران سزای سـەختی لەسـەرە لە دوا ڕۆژدا، مـن بە چـاوی خۆم بینیم.

کە زۆرێک لە فەرموودەکانی حەزرەتی رسول الله ﷺ ئامـاژە بەم بـابەتە دەکەن، ئەو شوێنەی کە ئەوان سزای هەنگەکانیـان تیـادەدا، مـن لە هەمـان شـوێندا سـزای ئەوانـم بینی، دوای ئەوە هەستم کرد کە دەبێت ماڵئاوایی لە مردوەکان بکەم، هەتـا بگەڕێـمەوە بۆ دونیا، تامەزرۆییەکی سەیرم بۆ ئەو جیهانەی ئەوان هەبوو، جیهـانێکی زۆر جـوان و جیاواز بوو، هەرگیز ناتوانرێت وەسف و ستایشی ئەو جوانیە بکرێت.

کە سـەیری خەڵکـی ئەو جیهـانەت دەکـرد هەسـتت بە پشـوو، زینـدوێتی و، بەختەوەری دەکرد، بە بینینیان دڵخۆش و ئارام دەبوویت.

بەجۆرێک بوو کە ویست و ئارەزوی ئەوەت نەبوو هەرگیز بگەڕێیتەوە بـۆ دونیـا، لە دونیادا تەنها خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز ئەو ئارامیەت پێ دەبەخشێت.

کە ویستم ماڵئـاوایی لە بـاوکم بـکەم و بگەڕێـمەوە بـۆ دونیـا، تـامەزرۆییەکی زۆر گرتمی بۆ باوکم و زۆرم خـۆش ویسـت، خـوا ئاگـادارە نەمدەویسـت بگەڕێـمەوە و، نەشمەتوانی ماڵئاوایی لە باوکم بکەم.

چونکه ئەویٚ شوێنی هەتا هەتایی و ئارامی و بەختەوەری هەمیشەییە، ئیتر چۆن دەتوانیت بگەڕێیتەوە.

که هەستم کرد بەو تامەزرۆیی و شادمانیە، باوکم ئاماژەی کرد بۆ دەستێک له ئاسمانەوە.

وتم: بابە من بگەڕێمەوە بیرت دەکەم، چی بکەم؟

وتی: سەیری ئاسمان بکە، که سەیرم کرد دەستێکم بینی، هەستم کرد هەرچی کارێک دەکەم، دەستێک هەیە چاودێریم دەکات و یارمەتیم دەدات له هەموو کارەکانی ژیانمدا.

ئەو پیاوەش کە بکوژی باوکم بوو، خۆی هات بۆ ماڵمان و وتی: نەمدەویست ئەوە ڕووبدات، تورەبوون پێی کردم، زۆر زۆر پەشیمانم!

هەستی بە خەم و خەفەتێکی زۆر دەکرد لەسەر ئەو کارە خراپانەی کە کردبوونی.

وتی: تکاتان لیٚ دەکەم لێم ببورن.

ئێمەش لێی خۆش بووین.

وتمان: ئێمە هەرچی بەرامبەر تۆ بکەین، باوکمان ناگەڕێتەوە بۆ دونیا، بەهۆی ئەو لیٚ بوردنەوە خێزانەکانمان تێکەڵی یەکتر بوون و، پەیوەندیەکانمان زۆر باش بوو، نەسەب و خزمایەتی کەوتە نێوانمان.

هیچ شتێک لە لێخۆشبون و لێبوردن باشتر نیە و خۆشتریش نیە.

قورئانی پیرۆز باسی ئەوە دەکات کە دەتوانن حەقی خۆتان وەربگرنەوە و کەسەکە بکوژنەوە، بەڵام لیٚ بوردن دەبێتە کەفارەت بۆتان.

﴿وكَتَبْنَا عَلَيْهِمْ فِيهَا أَنَّ النَّفْسَ بِالنَّفْسِ وَالْعَيْنَ بِالْعَيْنِ وَالْأَنفَ بِالْأَنفِ وَالْأُذُنَ بِالْأُذُنِ وَالسِّنَّ بِالسِّنِّ وَالْجُرُوحَ قِصَاصٌ فَمَن تَصَدَّقَ بِهِ فَهُوَ كَفَّارَةٌ لَّهُ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ﴾ (المائدة: ٤٥)

خوای گەورە بە لوتفی خۆی ئێمەی خستە سەر ئەو کارە باشەی لێ بوردن، لێ بوردنمان هەڵبژاردو قورئانی پیرۆزیش ڕێنمای کردین.

هەموو لادێکەمان لێ بوردن بووە بە نەریتی ڕۆژانەی و ئاکاری خێزانەکانمانە و زۆر سودمان لێ بینیوە.

وازمان لە کینە و ئیرەیی بردن و تۆڵە سەندنەوە هێناوە و زۆر بەختەوەرین.

بۆچی لەسەر بابەتی هیچی دونیا ڕقاوی بین!!

لادێکەمان و هاوڕێکانم و ئەهلی مزگەوتەکەمان زۆر کاریگەر بوون بە ئەزموونەکەم و زۆر ئاکاری خراپی ئێمە و خەڵکی گۆڕیوە. تۆوی خۆشەویستی و قیامەت ویستی لە لادێکەماندا بڵاو بووەتەوە.

دوای ئەو ڕووداوەی بەسەر من هات و لە ئەزموونەکەم گەڕامەوە، لادێکەمان 'ئاب سەرد' ئاکار و داهێنانێکی زۆر جوانیان داهێناوە و، جێ بەجێی دەکەین و هیوادارم خەڵکی تریش چاومان لێ بکەن، ئەویش ئەوەیە کە لە پرسە هیچ خواردن و میوەیەک نەگێڕین، تەنها چا و ئاو بگێڕین، جاران بەو جۆرەمان نەدەکرد و پرسەکەیان زۆر پڕ مەسرەف بوون، بەڵام ئێستا دەوڵەمەند و هەژار یەکسان دەبن و کەس دڵی لەخۆی دانامێنێت، خوای باڵادەست زۆر جەخت لەسەر نوێژ دەکاتەوە، نوێژ تەنها چەند جوڵەیەکی ئاسایی نیە.

﴿... إِنَّ الصَّلَاةَ تَنْهَى عَنِ الْفَحْشَاءِ وَالْمُنكَرِ ...﴾ (العنكبوت: ٤٥)

ئێستا هیچ ترسێکم لە مردن نیە، ئەگەر خۆ کوشتن تاوانێکی گەورە نەبوایە، خۆم دەکوشت هەتا زوو بگەمەوە بە بەرزەخ و هەتاهەتایی.

بەڵام دڵنیابن خۆکوژی 'ئینتحار' سەخترین گوناه و تاوانە.

بکوژ خەڵکی تر دەکوژێت، دوای قەتڵەکەی، کەسی بکوژ چرکە بە چرکە فرسەتی تەوبە و لێخۆشبون، باشتر کردنی حاڵی خۆی هەیە، بە پارە و دیە، یاخود بە تۆڵە لێ سەندنەوە و شتانی تر تۆڵەی لێ وەردەگیرێتەوە.

بەڵام کەسێک کە خۆی دەکوژێت، هەر ئەوەندەی ئەو کارە دەکات، تەواوی ئەو فرسەتانەی لەبەر دەستن لە دەستیان دەدات، لەبەر ئەوە خۆکوژی زۆر ترسناکترە لە کوشتنی خەڵکی و، چارەنوسی قیامەتیشی زۆر ترسناکە.

ئەوەی خۆی دەکوژێت تەواوی ئازار و فشارە دەروونیەکانی دونیای، لەگەڵ خۆی دەبات بۆ قیامەت و سزای خۆکوژیەکەش ئەوەندەی تر باری گوناهی قورس و گرانتر دەکات.

ئامۆژگاری ئازیزانم دەکەم، سورەتی (یس)ن بخوێنن.

من زۆر سوودم لێ بینیوە، ئامۆژگاریەکی ترم ئەوەیە دونیا ئەبڕێتەوە، بەڵام ئاخیرەت و قیامەت هەتا هەتاییە و نابڕێتەوە، موڵکی حەزرەتی سولەیمان بڕایەوە، ستەمی فرعەونیش کۆتایی هات.

دونیای پێش ئێمەش کۆتایی هات، دونیای ئێمەش کۆتایی دێت.

ئێستا لە ژیانداین و دەتوانین زۆر شت بگۆڕین، خوای گەورە دەستمان لێ بەرنادات.

ناماندانە دەستی خۆمان، چونکە خۆمان ناتوانین پارێزگاری لە خودی خۆمان بکەین، چ جای خەڵکی تر بتوانن بمانپارێزن!!.

# سەید صادقی

  

'سەید صادقی' لە ساڵی (٢٠١١)ی زاینی ئەزموونی 'نزیکبوونەوە لە مردن'ی بینیوە، دەگێڕێتەوە و دەڵێت: ساڵی (٢٠١١) وەک کاریی دیبلۆماسی نێرام بۆ شاری 'ئیسلام ئاباد' لە پاکستان، پێش ئەوە من نیشانەکانی گیرانی بۆریەکانی دڵم هەبوو، سنگم ئازاری هەبوو.

ڕۆژی لەدایک بوونی حەزرەتی فاطمەی زەهراء بوو 'خوای لێ ڕازی بێت'، بڕیار بوو ئەو ساڵە بچم بۆ گەشتی موبارەکی حەج، پێش ئەزموونەکەم بە چەند ڕۆژێک، لە خەودا بینیم، خەڵکی هەموو ڕۆیشتن بۆ حەج، کەچی من مامەوە و نەمتوانی بچم لەگەڵیان.

لە خەوەکەمدا زۆر دڵتەنگ بووم و دەگریام، چونکە نەمتوانی بڕۆم، کە بڕیار بوو من و خێزانم پێکەوە بچین.

تەفسیری ئەو خەوەم لە ڕێگەی بەسەرهاتەکەمەوە بوو.

چونکە وادەی حەج کردنم، بە ماوەیەک بوو دوای ئەو ئەزموونە، ئەوە بوو نەمتوانی بچم بۆ سەفەری حەج.

چەند ڕۆژێک مامەوە لەبەر ئازاری سنگم و دەستم.

من وام دەزانی سەرمام بووە، لەبەر ئەوە نەچووم بۆلای دکتۆر هەتا هۆکارەکەی بزانم.

لە باڵیۆزخانە بووم، هەستم کرد حاڵم خراپتر بوو، ئازار لەسەر سنگم زیادی کرد، ئەو ڕۆژەش پشوو بوو لە باڵیۆزخانە و، هیچ یەکێک لە هاوکارەکانمی لێ نەبوو، ئیتر پەلەم کرد لەوەی کە بچمەوە بۆ ماڵەوە، وتیان: با بتبەین بۆلای پزیشک.

وتم: با هەندێک پشوو بدەم، بەڵکو تەنها سەرمام بوو بێت و لە دوایدا باش ببم.

ڕۆژی یەک شەممە بوو، لە دوای نـوێژی عیشـا، نـۆبەی دڵ لێـی دام، بردمیـان بـۆ نەخۆشخانە، بـۆ ڕۆژی دواتـر بردمیـان بـۆ ژووری نەشـتەرگەری هەتـا قەسـتەرەم بـۆ بکەن.

بە دکتـۆرەکەم وت: ئەگەر پێویسـتم بە نەشـتەرگەریە دەگەڕێـمەوە بـۆ ئێـران لەوێ ئەنجامی دەدەم.

کە قەستەرەکەیان بۆ کردم، هەستم بە ئازار دەکرد.

بە ئینگلیزی بە هاوکارەکەی وت: کارەکەمان سەرکەوتوو نەبووە، دەمـارەکەی وەڵام ناداتەوە و سەرکەوتوو نەبووین.

واتە نەمانتوانیوە دەمارەکە لە گیران ڕزگار بکەین.

بردمیان بۆ ژووری چاودێری چڕ، خێزانم و ئاغای ئەفراسیابی لێ بـوو، دەمـارێکی دڵـم (٩٩٪)ی گیرابـوو، دوو دەمـاری تـریش (٧٥٪)ی گیرابـوو. وتیـان: دەبێـت بە زوترین کات نەشتەرگەریت بۆ بکرێت، دوای چەنـد دەقـیقەیەک قاچەکـانم دەسـتیان کرد بە لەرزین.

هەستم بە سەرماش نەدەکرد، لەرزینەکە سەرکەوت هەتا گەیشتە سەر سـنگم، ئیـتر هەستم بە ئازارێکی توند کرد، بە جۆرێک هەستم بە بروسکە و هەورە گـرمە دەکـرد، لە کوت و پڕێکدا خۆم لە سەقفی ژورەکەدا بینیەوە، جەسـتەی خـۆم لەسـەر قەرەوێـڵەکە بینی یەوە، من لە سـەرەوە چـاودێریم دەکـرد، نـزیکەی بیسـت چـرکە ئـازاری سـنگم بەردەوام بوو، دوای ئەوە ڕۆحـم بەرز بـوویەوە و لە سـەقفەکەدا بـووم، هەسـتی ئەوەم کرد کە من مردوم و هەموو شتێک تەواو بـوو، ئەوە ڕۆشـتە هەسـت و خەیـاڵمەوە، کە خودایە چارەنوسی مناڵەکانم چیان بەسەر دێت؟

چونکە هێشتا مناڵ بوون.

هەستم کرد دوانم لەگەڵدایە و منیان گرتوە، بەرزیان کردمەوە، چەند چرکەیەکی کەم سەیری جەستەی خۆمم کرد و لە دوای ئەوە بە ناو تونەیلێکدا بۆ سەرەوە سەرکەوتین، تونەیلێکی ڕەش بوو، هیچم تیا نەدەبینی، کاتێک لەوێوە بەرزکرامەوە گوێم لە قیژە و هاوار بوو، بەڵام نەمدەبینین، داوای یارمەتیان دەکرد، فریامانکەون، دەگریان... وەک ئەوە بوو کە بیانەوێت من سەرنەکەوم بۆ ئاسمان و لای خۆیان بمهێڵنەوە واتە هەوڵی ئەوەیان دەدا، نزیکەی بیست بۆ سی کەس دەبوون کە من بە دەنگیاندا زانیم، وا هەست دەکەم مرۆڤ بووبن، من ئەو کاتەی دڵم وەستابوو تەنها چوار خولەك بوو، بەڵام وا دەزانم لەو تونێلە دا زۆرم پێ چوو، گەیشتینە سەرەوەی تونەیلەکە، کۆتایی یەکەی نوور و ڕوناکیەکی گەورەی سپی بوو، کە گەیشتینە ئەوێ هەستم بە دڵ ئارامی و هێمنی و ئاشتی کرد، ئەو شوێنە زۆر نورانی بوو، تاریکی تەواو بوو نەما، هەستم کرد خەڵکێکی زۆرم لە دەورە، بەڵام نەمبینین.

هەستم کرد ژێر زەوی نەبوو، شوێنێک بوو لە سەرو هەورەکانەوە بوو، ئینجا ئەو دوانەی کە لەگەڵم بوون منیان برد بۆ شوێنێک کە مێزێکی لێ بوو، گەیشتمە ئەوێ.

وتم من ناگەڕێمەوە بۆ دونیا و نامەوێت ئێرە بەجێ بهێڵم.

هەستم کرد وەک جەژن و ئاهەنگێک لەوێ هەبێت، کۆمەڵە خەڵکێک لە لاکانەوە وەستابوون و دڵخۆش بوون.

مێزێک دانرابوو، وەک مێزی نان خواردن بوو، ئافرەتێک لەلای مێزەکەوە دانیشتبوو، من لەوێ دانیشتم و هەستم بە دڵئارامی و خۆشی دەکرد، ئافرەتەکە پشتی لە من بوو، بە پشتی دەستی ئاماژەیەکی کرد بۆ دواوە، واتە ئەم کەسە بیگێڕنەوە بۆ دونیا، لە چاو تروکانێکدا چاوەکانم کردەوە و پزیشکی بێهۆشکرام، دەبینم لە هۆڵی نەشتەرگەریدام، ئیتر چاوەکانم لێک نا بە هۆی دەرمانی بێ هۆشیەوە و لە ڕۆژی دواتردا هۆشم هاتەوە.

ئەوە حاڵی بووم کە یارمەتی خەڵکی بدەین و، هەڵپەی ماڵی دونیامان نەبێت.

ئامۆژگاری مناڵەکانم دەکەم کە هەرگیز خوای گەورەیان لە بیر نەچێت، بزانن خوای گەورە خاوەنی دونیا و قیامەتە، ئاگادارمانە، ڕۆژ و کاتەکانی ژیان و مردنمان بە دەستی خوای گەورەن.

## لە بنەڕەتدا من ئەمە بووم کە پێی گەیشتم



'مەهدی حەسەن نەجاد' لە ساڵی (١٩٩٨)ی زاینی لە شاری 'کەرەج' لەدایک بووە و ئەزموونەکەی بەم جۆرەیە کە دەیگێڕێتەوە و دەڵێت:

پێش ئەزموونەکەم کەسایەتیەکی ترم هەبوو، نەمدەزانی نوێژ چی یە؟ نوێژ و عیبادەت هیچ گرنگیەکی لەلام نەبوو، لە دونیایەکی زۆر جیاوازدا دەژیام. حەزم لە هەرچیەک بکردایە ئەنجامم دەدا، زۆر بەدوای مۆدێلەوە بووم، جل و بەرگی مارکەم دەپۆشی، لەو جۆرە کەسانە بووم کە هەموو شتێکم ئەزموون دەکرد، تەنانەت پێش ئەزموونەکەم ڕۆشتم بۆ مزگەوت، هەتا تاقی بکەمەوە.

ڕۆژێکیان لەگەڵ هاوڕێکانم لە دەرەوە بووم، هەستم کرد کە حاڵم باش نیە، دڵم بە خێرایی لێی دەدا، ڕۆشتم بۆ ماڵەوە هەتا پشوویەک بدەم، کە بە پلیکانەکاندا سەرکەوتمە سەرەوە دڵم زیاتر لێی دەدا، وام هەست دەکرد دڵم لە سنگمەوە دێتە دەرەوە، من هەرگیز بیرم لە خۆم نەدەکردەوە و، بیریشم لە مردن نەدەکردەوە.

ڕۆشتمە ژورەکەی خۆم و ویستم هەندێ پشوو بدەم.

بە جلەکانمەوە پاڵ کەوتم، هەستم کرد حاڵم خراپتر بوو، دڵم سێ جار بە توندی لێی دا، ئیتر دوای ئەوە هەستم کرد کە دڵم لە لێدان کەوت و ڕاوەستا.

دوای ئەوە حاڵم گۆڕا.... دەتوت من لەوێ نیم.



هیچ ئازارێکم نەما، چاوەکانم لێک نا هەتا پشوویەک بدەم، بەڵام زۆر بە ئاگا خـۆم بینیەوە، بەسەرهاتەکانی ژیانم بینـیەوە، لە ڕۆژی لەدایـک بـوونمەوە هەتـا ئەو سـاتەی ئەزموونەکەم.

سروشتی مرۆڤ وایە لە دوای پێنج سـاڵانی بیـر دەکەوێـتەوە، بەڵام مـن هەمـوویم بینیەوە.

بۆ نموونە: بە تەکسیەک ڕۆشـتم بـۆ شـوێنێک و پـانزە خـولەکم پـێ چـوو، لەگەڵ شـۆفێرەکە هەرچـیم وتـوە و، هەرچـیم بینـی وە، لە کـوێ ڕاوەسـتاوە و هەتـا دوایـی هەموویم بینیوەتەوە.

ئەو کاتە تەمەنم لە نێوانی (١٧ - ١٨) ساڵان دا بوو.

لەویدا زانیم ئەمە پێداچوونەوەی کردار و ڕووداوەکانی ژیانمە.

پێیان وتم: تۆ بەو شێوەیە ژیاویت، ناتوانیت ڕابـردوت بگۆڕیـت، هەسـتم کـرد کە ژیانێکی خراپم بەسەر بردووە، زەمەن و کاتیش لەوێ نەبوو.

هەستیشم کرد کە ئەگەر لە دونیاشدا، هەشتا ساڵ یاخود زیاتریش بژیت، بۆ ئەوێـی بەرزەخ و قیامەت مانایەکی نیە، چونکە وەک چەند چرکەیەک ژیان بووە و تەواو.

داوام کرد کە خودایە بمگێڕەرەوە بۆ دونیا، هەتا خـۆم چـاک بـکەم، گەڕامەوە سـەر جەستەکەم، دەبینم وەکو چۆن ئامێرێک بکوژێنیتەوە، بەو جۆرە کوژاومەتەوە.

من پێشتر باوەڕم بە قیامەت و زیندو بوونەوە نەبووە.

وەک ئەوە بوو پێم بڵێن: ژیانـت لێـرە و لە دونیـاش چەنـد جـوان و نایـاب دەبـوو ئەگەر صـاڵحانە بژیایەیـت، بەڵام تـۆ سـودت لە دونیـا نەبینـی، ئەوە حەسرەت و پەشیمانی زۆری بۆ دروست دەکردم.

کە ئەوەیان پیشان دام، حاڵم زۆر خراپ بوو، زانـیم کە دەمتـوانی بـبمە کەسـێکی زۆر باش و، بەڵام ئێستا لە دەستم دەرچوو!

گەڕامەوە بۆ جەستەکەم و زانیم کە جەستەشم شوێنی شیاوی من نی یە، من بە ویستی خۆم ناتوانم جارێکی تر بچمەوە ناو جەستەی خۆم.

جەستە و لاشەی خۆمم لێ بووبوو بە دێو و درنج و لێی دەترسام، شتێکی ترسناک بوو بەلامەوە!

وام هەست دەکرد کە هەموو ڕۆژێک من لە جەستەم جیا بوومەتەوە، بەڵام کە هاتومەتەوە ناو جەستەکەم بیرم چۆتەوە.

بەڵام ئەم جارەیان وا هەستم دەکرد کە کۆتا جارە جەستەم دەبینمەوە. حەسرەتم هەبوو، ئێمە لە خەودا هەموو شەوێک ڕۆحمان دەڕوات، بەڵام ئەمجارە گەڕامەوە بۆ بنچینە و بنەڕەتی خۆم.

لە بنەڕەتدا من ئەمە بووم کە پێی گەیشتم.

ئازاد بووم بە تەواوەتی، دەگەڕام بە ماڵەکاندا، هەستم بەوە کرد کە جەستە قەفەزی ڕۆحە و، زیندانە لە دونیادا، دڵنیا بووم کە ئەمەی ئێستا منم و، ئەو جەستەیە من نیم!

ڕەنگەکانم زۆر جیاواز دەبینی، نازانم بڵێم لەوێ چ ڕەنگێکم بینیوە!

کاتژمێر هەشتی شەوبوو، لە داڵانەکەی ماڵەوەمان دایکم و باوکم دانیشتبوون سەیری تەلەفزیۆنیان دەکرد، لە بەردەمی باوکم ڕاوەستام هیچ هەستی پێ نەکردم، دوای ئەوە کەوتمە تاریکاییەکی نوتەکەوە، ئیتر لە ماڵەوە نەبووم، بەڵکو کەوتمە جیهانێکی ترەوە، وا هەستم کرد کە شتێک هات و منی برد، وام هەست کرد کە تەنها من لەوێم دوای ئەوە نورێکی زۆر جوان هات، لە زۆر دورەوە دەهات بەڵام زۆر جوان و سەرنج ڕاکێش بوو، ناتوانم وەصفی بکەم.

بەڵام زۆر جیاوازە لە ڕەنگەکانی ئێرە، لە دیمەنەکانی ئێرە.

من ڕۆشتم بەرەو ڕووی تونەیلەکە، هەستم کرد لە ناو تونەیلێکدا دەجوڵێم، زۆر تەسک بوو، بە خێراییەکی زۆر دەجوڵام ڕووەو نور و ڕوناکیەکە.

گوێم لە دەنگێکی گەورە و ترسناک بوو بانگی لێ دەکردم و پێی دەوتم: دایکت.

دوای ئەوە لە تونەیلەکە دەرچووم، جارێکی تر شریتی هەموو ژیانمیان پیشان دامەوە، دیسان کە گەیشتمەوە کۆتایی وتم: من مردوم، ئەوە جاری سێهەم بوو پێیان وتمەوە: دایکت.

جارێکی تریش هەموو کردەوەکانی ژیانمیان پیشان دامەوە.

وام هەست کرد کە پێیان وتم: تۆ چ سوودێکت بینی لەو فریشتەیەی کە لەلای تۆ بوو، واتە دایکت.

ئینجا لە مەبەستەکە تێ گەیشتم و وتم: باشە من چ نیعمەتێکم لە دونیادا هەبووە و، کەچی بەدوای چ شتێکی ترەوە بووم!

هەستم بە گەورەیی و سوودەکانی دایک نەکردوە لە دونیادا!

بۆچی بەرامبەر بە دایکم دانەنیشتووم و سەیری ڕوخساری بکەم، وەکو پێویست ئەوەم ئەنجام نەداوە، بۆچی زۆر لە لای نەدەمامەوە؟!

بۆچی گرنگیم بە دڵسۆزی و ماندوو بوونی ئەو نەدەدا.

بۆچی دڵم خۆش نەکردوە؟.

بۆچی لەگەڵ باوکم دانەنیشتوم و، بۆچی هاوڕێیەتی باوکمم نەکرد، لەو ئەزموونەدا زانیم بەختەوەری ئەو کارانە چەندە بێ کۆتاییە، بۆچی بۆ جارێکیش دەستی دایکمم ماچ نەکرد، دایکت لە تایەکدا دابنێ و هەموو خەڵکی تریش لە تاکەی تردا دابنێ!

هەستم کرد ئێمە لە تاقی کردنەوەی دونیادا یەک جار فرسەتمان پێ دەدرێت و دەڕۆین.

وەک ئەوە بوو پێم بڵێن: بۆ یەک جار لەگەڵ دایکت بژی و بەختەوەری تەواوەتی بەدەست بهێنە.

که ژیانت تەواو دەبێت، هەل و فرسەتت تەواو دەبێت، ڕۆژەکان ناگەڕێنەوە هەتا قەرەبوو'تعويض' بکرێنەوە.

دوای ئەوە گەڕامەوە بۆ تونێلەکە، لە ژیانمدا گریاوم بە هۆی ئازارەوە، بەهۆی خەمەوە، بەهۆی کێشەوە، بەڵام هەموو کێشەکانی ژیانم بەخەرە تایەکەوە و ، ئەوەش کە جارێکی تر دایکم نەبینمەوە لە تایەکی تردا دابنێ!

کە گەڕامەوە ناو تونێلەکە، لە قوڵایی دڵمەوە دەمناڵاند، بۆچی لە نزیکی دایکمەوە بۆ جارێکیش دانەنیشتم.

ڕووەو نوری گەورە کەوتمە ڕێ، حاڵم زۆر خراپ بوو، دڵم خەریک بوو دەپچڕا، خێزانەکانمان عەزیزترین شتێکە کە هەمانبێت.

دوای ئەوە دەنگە ترسناکەکە بانگی لێ کردمەوە: باوکت.... جارێکی تر شریتی ژیانم لە مناڵیمەوە پیشان درایەوە.... مادام باسەکە باسی باوکە....

ماندووبوونی باوکم بینی لە پێناوی ئێمەدا، هەروەکو ئەوەی من بچمە ژیانی باوکمەوە و ژیانی ئەو پیادە بکەمەوە.

دەموت ئەوە من چ جۆرە مرۆڤێک بووم، کە قەدری ماندوو بوونی باوکم نەدەزانی، بۆچی ئا بەو جۆرەم کرد، دڵم پڕ بوو لە تامەزرۆیی و خۆشەویستی بۆ باوکم.

بەو واتایەی کە ئەمە کۆتا جارە باوکمی تیا ببینم.

نەمتوانی لە دونیادا سوود لە بینینیان وەربگرم.

لە دوایدا گەڕامەوە بۆ هەمان تونەیل.

سەکەوتمەوە بەرەو نورر و ڕوناکیەکە.

دەنگە ترسناکەکە پێی وتم: براکەت...

بە هەمان شێوە ژیانی براکەشم بینیەوە، لە دوای ئەوە خەریک بوو دڵم پارچە پارچە دەبوو لەبەر خێزانەکەم، لەو ماوەیەدا چەندین جار هەموو تەمەن و ژیانمیان پیشان

دامەوە، واتە ئەو هەژدە ساڵەی کە لە دونیادا ژیابووم چەندین جـار تیایـدا ژیـامەوە. بە ئەندازەی سەد ساڵی دونیا ژیامەوە لە ناو کردارەکانی دونیامدا!!

دوای بینینەوەی ژیانی براکەم و خوشکەکەم، گەیشتمە شـوێنێک، نـور و ڕوونـاکی لێ نەبوو، خۆم لە شوێنێکی تاریکدا بینـیەوە، زۆر زۆر فـراوان و گەورە بـوو، کۆتـایی نەبوو، هەر چەندێک بڕۆشـتمایە نەدەگەیشـتمە کۆتـاییەکەی، هەمـووی تاریـک بـوو، بەڵام من ڕووناکی و نورم پێ بوو، وەک ئەوە بوو کە چەندین ساڵ لەوێدا ڕاوەستابم.

کاتێکی زۆرم لەوێ بردەسەر 'لە کاتێکدا کات نیە'، دوای ئەوە شتێک هـات و منـی لەو تاریکیە دەرهێنا، ڕووە و ئاسمان دەچووم، بەڵام ئەم جـارە لە ڕێـگەی تـونەیلەکەوە نەبوو، من ئاسمانم دەبینی، ئەستێرەکانم دەبینی، دوایی نزیک بوومەوە لە ئەسـتێرەکان، زەویم لە دورەوە بینی، هەروەکو ئەوەبـوو لە زەوی و مـاڵی خۆمـان دوربـکەومەوە. کە سەیری زەویم کرد هەموو شتێکی بچووک و گەورەی دونیا تێ گەیشتم.

وتم: ئەی هاوار من بە دوای چیدا ڕام دەکرد و، دەشبوو من چی بکەم!

من فرسەت و کاتێکم لە زەویدا پێ درا، بەڵام بە خراپ تێمپەڕاند!

کە زۆر سەرکەوتم و دورکەوتمەوە هەستم کرد لە بۆشاییەکی تەواودام.

هەروەکو ئەوەی لەوێ دام ببڕن، دورم بخەنەوە و دەست بەسەر بـم، بە خێراییەکـی زۆر زۆر سەردەکەوتم، بەڵام هەستیشم دەکرد لە قەفەز ڕزگـار بـووم و ئێسـتا زۆر زۆر ئازادم، دەمتوانی بچـم بـۆ هەچ شـوێنێک کە بمویسـتایە، بەبـێ هـیچ گرفتێـک، بەڵام دەستم بەوەکرد کە ئاسمان زۆر دورە، لە دوایدا برام بـۆ شـوێنێک، مـاوەیەکی زۆر زۆر هێڵامیانەوە.

هەروەکو ئەوە بوو، لە یەکەمین مرۆڤەوە من دەست بەسەر کـرابم هەتـا کۆتـاهەمین مرۆڤی دونیا، بەکاتی سەر زەوی و دونیا.

دوای ئەوە هەستم کرد جوڵێنرامەوە. وەک ئەوەی دامبگیرسێننەوە، دەستم کردەوە بە جوڵە و بینین و بیرکردنەوە و شعور.

بینیم زۆر زۆر لە زەویەوە دەرکەوتومەتەوە.

دوای ئەوە هەستم کرد کە من سەیری ئایندەدەکەم، وەک ئەوەی چووبێتمە ئایندەوە، کە سەیری زەویم کرد، یەکپارچە وێرانە و تێک درابوو، دوکەڵی لێ بەرز دەبوویەوە، وام هەست کرد، سەر زەوی هیچ کەسی تیا نەماوە، هەستم کرد کە ڕۆژی هەستانەوە و قیامەتە..ئەو ڕۆژەی کە خوای گەورە هەموو خەڵکی کۆدەکاتەوە لە مەحشەر.

بە نەفسی خۆم دەوت: باشە بۆچی باوەڕت بەم ڕۆژە نەدەکرد، لە کاتێکدا زۆرت لەسەر دەبیست، کە دەموت نەمزانی، پێیان دەوتم: نەتزانی!! ئایا فلان ئیمام، فلان ڕێ پیشاندەر، فلان مامۆستا ئەوەی پێ نەوتیت!!

یەکێک لەوانەی پیشانم درایەوە ئەوەبوو، یەکێک لە مامۆستاکانم وتی: حەزرەتی نوح تەمەن درێژترین پێغەمبەر بوو 'سەلامی خوای لێ بێت'، کاتێک فریشتەی مەرگ هات بۆلای ڕۆحی بکێشێت، بینی لە خانوویەکی بچوکدا خەوتوە و قاچەکانی لە ژورەکە هاتبوونە دەرەوە، لێی نزیک بوویەوە و پێی وت: دەمەوێت ڕۆحت بکێشم!!

حەزرەتی نوح فەرمووی: باشە با هەستم و هەندێ قسە بکەین.

وتی: نا لە شوێنی خۆت بمێنەرەوە... من هاتووم گیانت بکێشم، حەزرەتی ئیزرائیل فەرمووی: ئەم تەمەنە دور و درێژە ژیایت، بۆچی خانوویەکی ڕێک و پێکت بۆخۆت دروست نەکرد؟

حەزرەتی نوح دەستی کرد بە پێکەنین و فەرمووی: بۆچی من چەندە ژیاووم؟

حەزرەتی ئیزرائیل فەرمووی: خەڵکانێک لە ئاخر زەماندا دێن، خانووی ئەوەندە گەورە دروست دەکەن، کە جێگای خەڵکی شارێکی تیا دەبێتەوە!!

کەچی ئەوان بەتەنها تیادا دەژین، لەگەڵ ئەوەشدا بەختەوەرنین، فکر و دڵیان بێ ئاگا و غافڵە.

حەزرەتی نوح فەرمووی: باشە ئەوانە چەند دەژین، هەتا ئاوا خانووی گەورە دروست دەکەن؟!

حەزرەتی ئیزرائیل فەرمووی: تەمەنیان لە ٨٠-١٠٠ ساڵ تێپەڕ ناکات.

حەزرەتی نوح پێکەنی و فەرمووی: من (٨٠) ساڵ لە سوجدەیەکدا بەسەر دەبەم، من ئەو کاتەی مامۆستاکەمان وتی: هەشتا ساڵ لە سوجدەیەکدا بەسەر دەبەم.

وتم: ئەم مامۆستایە زۆر خەرافیە و ئەفسانەی لێ نابڕێت!!

شتی بەو جۆرە چۆن دەگونجێت؟!

بەڵام لەو دونیا تێ گەیشتم کە زەمەن و کات بوونی نیە لە بەهەشت.

تەنانەت لە دونیاشدا بوونی نیە بۆ کەسێک خاوەنی ئیدراکی ڕاستەقینە بێت، دەزانێت کە کات و زەمەن بۆ ئێرەی دونیاش هەڵدەگیرێت بۆ کەسێ خوا بیەوێت!

حەزرەتی ئیزرائیل فەرمووی: تەمەن چۆن دەبینیت، ئەو تەمەنەی کە ژیاویت؟

حەزرەتی نوح فەرمووی: وەک ئەوەیە لە دەرگایەکەوە بچیتە ژورەوە و لە دەرگایەکی تریشەوە بچیتە دەرەوە، کاتێ وتم: نازانم، ئەم باسەرهاتەیان پیشان دامەوە، وتیان: ئەی ئەوە نیە مامۆستاکەت پێی وتویت!!

بۆچی ئەو وتانە گرنگ نەبوو بە لاتەوە، تۆ زیاتر گرنگیت دەدا بە سوعبەت و نوکتەیەک، لەوەی گوێ بۆ حەقیقەتەکان بگریت.

خەریکی دوو گوڵی ویاری بوویت، بە دوای حەقیقەتی ئاخرەتەوە نەبوویت، هەموو شتێکیان پیشان دامەوە، نەمدەتوانی بڵێم ڕاست نیە، من لە دونیادا هەموویم دەزانی، بەڵام خۆمم فریودەدا.

بەڵگەت بەسەردا دەهێنرێتەوە، ناتوانیت بڵێیت ئەوەم ئەنجام نەداوە، پێت دەوترێـت دەبوو بیرت بکـردایەتەوە، دەبـو بە دوای حەقیقەتـدا بگەڕایتـایە دوای ئەوە کە سـەیری سەر زەویم کرد، دەبینم هەمووی بەرەو ڕووی من دێن.

ژمارەیەکی زۆر لە ئەرواحم بینی بەرەو من دەهاتن.

ژمارەیەکی زۆریانیشم بینی بە تەنیشـتی مـنەوە سـەردەکەوتن، ئەوانەی لە تەنیشـتی منەوە بوون، ئەوانە بوون وەک مـن خـامۆش کرابـوون و ئێسـتا کەوتبـوونەوە جـوڵە و حەرەکەت، ئەمانە هاتبوون هەتا پێکەوە بین، لە یەکەمین مرۆڤەوە بۆ کۆتا مرۆڤ.

هەموو وەک یەک وابووین، لە نـور و ڕوونـاکی دەچـوون، هەنـدێکیان نورەکەیـان ئەوەندە جوان بوو، حەزت دەکرد دابنیشی لەگەڵی و سەیری بکەیت.

هەندێکیشیان زۆر زۆر تاریک بوون، بە زۆری و کەمی نورەکەیان دەتـوانی بزانیـت لە دونیادا چیان کردوە و چۆن بوون.

هەمووان ئیرەییان دەبرد بەوانەی کە زۆر زۆر نورانی بوون، هەمـوو دەیـانزانی کە لە دونیادا دەیانتوانی وەک ئەو نورانیانە بن بەڵام لە دەستیان چوو.

هەمووان دەیانوت: ئێمە بۆ ئەرکێک کە خوای گورە خستیە سەر شانمان بە جـوانی ئەنجاممان نەدا، ئەوانەیان کە زۆر زۆر نورانی بوون ژمارەیان کەم بوو لە چـاو ئەوانـی تردا، چونکە کۆبوونەوەی هەموو مرۆڤایەتی بوو، مرۆڤی هەموو شوێن و سـەردەمێکی لێ بوو، (٥٪)ی لە سەدا پێنجیـان زۆر نـورانی بـوون، (٥٪)یـان زۆر تاریـک بـوون، (٩٠٪) لە سەدا ناوەدیان خۆڵەمێشی بـوون و بەرزی و نزمـی مەقـام و پـلە و پایەیـان هەبـوو، هەنـدێکیان بەلای ڕەش و خۆڵەمێشـیدا و، هەنـدێکیش بەرەو نـورانی بـوون دەچوون.

هەمومان بەڕیزی زۆر دوورودرێـژ ڕاوەسـتابووین، ئەوانەی زۆر نـورانی بـوون لە پێشەوە ڕاوەستان، تاریکەکانیش لە دوای دواوە بوون، ئەمانە هیچ چاکەیەکیان نەبووە.

وەک چۆن ئەستێرەیەک دەکشێت، ئاوا هەموومان کشاین و دەرچووین، نورانیەکـان لە پێشـەوە بـوون و بەرەو ئاسـمان کشـان و کەوتـنە ڕێ، هەسـتم کـرد لە تیشـک زۆر خیراتر بووم، لە تاو خێراییەکەم هاوارم لێ هەستابوو، هەستێک بوو پـڕ بـوو لە چێـژ و ترس و سەرکێشی..

بەڵام بە گشتی زۆر زۆر چێژداربوو.

کە دەگەیـتە دەرەوەی ئەم گەردوونە، دەگەیـتە شـوێنێکی زۆر زۆر گەورە و فـراوان، گەیشتینە شوێنێک هەستم دەکرد کە هیچ یەکێک لەوانەی لەگەڵم بوون پێشـتر هەرگیـز نەگەیشتبوونە ئەو شوێنە.

ئێمە لە کاتێک لە کاتەکاندا لەوێ نەبووین، بە خەیاڵیش شوێنێکی ئاوامان پەی پـێ نەبردوە، زاناکان هەندێک لە گەلە ئەسـتێرەکانیان دۆزیـوەتەوە، بەڵام ئەوێ لە قـوەت و قودرەتی هیچ مرۆڤێکی دونیادا نیە پێی بگـات، جەسـتەی بە فـانی پۆشـتەکراو ناگـاتە ئەوێ.

لەوێ بەردێکم بینی کە هەموو ڕەنگێکی جوانی تیابوو، ئەو ڕەنگـانەم نەبینـی بـوو، زۆر سەرنج ڕاکیش بوون.

ڕەنگی ئاسمانی ئەوێ لە پرتەقاڵیەوە نزیک بوو، هەستم کـرد کە بـۆ شـوێنێکی زۆر تایبەت دەبرێین، گەیشتینە شوێنێک کە نـورێکی زۆر گەورەی لـێ بـوو، کۆتـاییەکەیم نەبینی، زۆر دووریش بوو لە ئێمەوە، نێوانمان زۆر زۆر بوو.

هەموومان سـەیری ئەو نورەمـان دەکـرد، ئەوەنـدە بە هەیـبەت بـوو، نەمانـدەتوانی سـەرهەڵبڕین و سـەیری بکەیـن، خەجـاڵەتی ئێـرەی دونیـا جیـاوازە لە خەجـاڵەتی ئاخیرەت.

هەندێک سەریان بەرز بوو، زۆر نورانی بوون، شەرمیان لە خـوای گەورە زۆر بـوو، بەڵام ڕوو سور بوون، چاکەیـان زۆر زۆر بـوو، دەیـانوت: خـودایە! ئـێمە ژیانمـان لە پێناوی تۆدابوو!!

هەندێکی تر زۆر شەرمەزار بوون، سەریان شۆڕ بوو.

لە دوای ئەوە یەکێک لە ئێمە جیابوویەوە، نور و ڕووناکی لە هەمـووان زیـاتر بـوو، هەموان خۆشیان دەویست، دەتوت بـاوکی هەموومـانە، نزیـک بـوویەوە لە نـورەکە و قسەی لەگەڵ کرد، هەستم کرد دەربارەی ئـێمە دەدوێـت لە خـزمەت ئەو نـورەدا، ئیـتر نازانم چەندەی پێ چوو، چی ڕووی دا، بیرم نەماوە 'بیریان نەهێڵام'.

دوای ئەوە هۆشـم هـاتەوە و هەسـتامەوە، بـۆ بەیـانیەکەی هـیچم بیـر نەمـا، وەک ڕۆژانی ئاسایی بوو، بەڵام هەستم کرد کەسێکی ترم، شتێکم لێ بەسـەر هـاتوە، وتـم: باشە بۆچی و بەچی ئاوا گۆڕاوم!!

ئەم هەموو وزە و تاقەتە چی یە لە مندا دروست بووە.

دەتوت کەسێکی ترم، هەموو شتێک لەلای من مانـایەکی تـری هەبـوو، کلێنسـێکم لەسەر شەقامێک فڕێ نەدەدا، دەستم کرد بە چاک کردنی هەڵەکانم.

ئەگەر هەڵەیەک بکەم دەڵێم: باشە من چ دڵ ڕەشێکم، کەی پەند وەردەگرم!

دەمویست ئازاد بم لە گوناه، لە زیندانی گوناه، لە تاڵی بێئاگایی، لە سـزای دوری لە خوا.

لە ماوەی دوو هەفتەدا تەرکـی گوناهەکـانم کـرد، وام لـێ هـات هەفـتە دەهـات و دەڕۆیشت گوناهم نەدەکرد و زۆر خۆمم دەپاراست.

لە سەرەتادا بـۆ مـاوەی ڕۆژێـک چـاودێری خـۆمم دەکـرد، ئینجـا زیـادم کـرد، کە دەگەیشتمە کردارێک دمپرسی لە خۆم ئایا ئەم کارە بکەم یاخود نا؟!

بەو جۆرە مـامەڵەم لەگەڵ خۆمـدا دەکـرد، ئەم لێپرسـینەوەی دەروونە زۆر بە هێـزی کردوم، وزەی خێری زۆر زیاد کردم، هەست و هـۆش و بیـرم پـاک بـوویەوە، هەسـتم کرد کە دەگەمە شتێک، شەوانە پـێش ئەوەی بـخەوەم دەچـمەوە بەسـەر کـردار و وتە و خەیاڵەتی ئەو ڕۆژەمدا.

چوار قۆناغ کە پێیان دەوترێت 'مەرجدانان، چاودێریکردن، لێپرسینەوە، سزادان' ئەو ئەرکە گرنگەیە کە دەبێت ئەنجام بدرێت.

لە دوای ئەوە دەستم کرد بە وەرگرتنی زانست، لە پێشدا بە فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ دەستم پێ کرد، کاتێ فەرموودەیەکم بە دیوارێکەوە دەخوێندەوە، وام دەزانی کتێبێکم خوێندۆتەوە.

دوای گەشتەکەم وام دەزانی یەکەم جارمە ئەو فەرموودە دەبینم، یاخود دەیبیستم.

زۆر دەرگای بۆ دەکردمەوە، ڕەنگە پەنجا جار پێش ئەو گەشتە ئەو فەرموودەیەم بینیبێت.

کەچی ئێستا زۆر زۆر کارم تێ دەکات، هەستم کرد ڕۆژ بە ڕۆژ کاملتر دەبم، تامەزرۆیم زۆر بو بۆ بەیانی و بۆ ڕۆژێکی تری ژیان، چێژم لە ژیانم دەبینی، کاتێ کێشەیەک دەهاتە ژیانمەوە وانەم لێ وەردەگرت، خوای گەورە زۆر جار لەناو کێشەکاندا چارەسەرت بۆ دەنێرێت، دڵنەوایت بۆ دەنێرێت، بۆ نموونە: ڕۆژێکیان گەشتم کرد بۆ تاران، بۆ چارەسەری کێشەیەک، کەسێک هات و لە ناو پاسەکەدا دانیشت، هەندێ قسەمان کرد لە ڕێگادا، لە دوایدا بیرم کردەوە لەو وتانەی لە نێوانماندا ڕوویدا.

بە ئاگا هاتمەوە و وتم: من زۆر شت لەو پیاوەوە فێر بووم، لە دوایدا زانیم کە هەموو کێشەکەی من لەبەر خاتری ئەوە بووە کە ئەو گەشتە بکەم بۆ تاران و لە ڕێگادا ئەو پیاوە ببینم و، ئەویش ئەو باس و خواسەم بۆ بکات کە بۆی کردم!!

خوای گەورە ئەو ڕووداوانە دەسازێنێت هەتا ئێمە فێر ببین، پێش ڕۆشتن.

ئێمە ئەسیری دەستی قەدەرنین!

قەدەر فێری ئازاد بوونمان دەکات.

دەست بەردارمان نابێت هەتا فێر دەبین!

دراوسێکەمان پێشم کەوت و سەلامی لێ کردم، شەوەکەی لێپرسینەوەم لە خۆم کرد، کە بۆچی ئاگام لە خۆم نەبوو، چوونە دەرەوە پرسیارێکی تاقی کردنەوەی تۆیە، نابێت لە دەستی بدەیت، بۆچی من لە پێشدا سڵاوم لەو نەکرد. ئەمانە زۆر بەختەوەرم دەکەن.

شتێک زۆر ئازاری دەدام، من ڕاهاتبووم هەموو ڕۆژێک دەچووم بۆلای هاوڕێکانم، هەموو ڕۆژەکەم هەتا نۆی شەو لەگەڵ هاوڕێکانمدا بووم، کە دەگەڕامەوەماڵەوەش خەریکی مۆبایل بووم، لە دوای ئەزموونەکەم کە دەچووم بۆلای هاوڕێکانم توشی خەم و خەفەت دەبووم، دەموت ئەمانە بۆچی ئاوا دەژین؟ من چۆن وەکو ئەم هاوڕێیانەم ژیاوم؟

بە غەم و پەژارەوە دەگەڕامەوە ماڵەوە، بە شەوانیشدا دەگریام و غەمم بۆ بەهەدەردانی تەمەنم دەخوارد. دەموت: خودایە! ئێمە نازانین لەناو هەڵەداین بمانبەخشە!

ڕاستمان بکەرەوە!

ڕۆژێکیان من ئاوی گوڵەکانی ماڵەوەم دەدا، لە دوای دوو هەفتە لە ئەزموونەکەم، لەو کاتەدا بەش بەش ئەزموونەکەم بیر کەوتەوە، وتم: ئایا بیرتە فلان ڕۆژ چی ڕووی دا 'بەخۆمم دەوت'!؟

هەموو ئەزموونەکەم بە تەواوەتی بیر کەوتەوە، ئەوەندە کاری تێ کردم هەتا دانیشتمە سەر زەویەکە و واقم وڕما.

وتم: ئەرێ ئەوە من چی بوو بینیم!

بۆچی دوو هەفتەیە بیرم نەکەوتۆتەوە!

بیرم کەوتەوە و وتم: من ئەو شەوە کە دوو هەفتە پێش ئێستا بوو مردم!!

بەهۆی ئەو ئەزموونەوە بوو ئاوا بەو جۆرە من گۆڕاوم!!

هەر هەموویم بیر کەوتەوە، ئەگەر ڕۆژێک دوای ئەزمـوونەکەم بیـرم بکەوتـایەتەوە، لەوانە بوو توشی نۆبە ببومایە، ئەوەندە ئەزموونێکی قوڵی واقعی بوو، لە دوایـدا وتـم: ئەوە چی بوو من بینیم، چۆن بیگێڕمەوە!! چۆن دەتوانم بە وشە و ڕستە دەریببڕم.

هەرگیز وەصفی ئەوە ناکرێت کە بینیومە، کێ منی گێڕایەوە؟!

لە دوایدا زانیم کە من لە ناو لوتفی خوایدا مەلە دەکەم.

دوای ئەزمـــوونەکەم هەســـتم کـــرد کە دور دەکەومەوە لە خەڵکـــی، لە دەوروبەری خـۆم، هەسـتم دەکـرد مـن بەشـێک نـیم لەوان، بـێ تـاقەت دەبـووم لە هاوڕێکـانم، پەیوەنـــدیم لەگەڵ هەموویـــان نەپچڕانـــد، کەم کەم لێیـــان دورکەوتمەوە و پەیوەنـــدیم پێیانەوە نەما، قوتابیەکانی هاوڕێم گاڵتەیان پێ دەکردم و دەیانوت، بۆچی گەڕایتەوە!!

هەتا جارێکیان یەکێک لە مامۆستاکانم ستایشی کردم و لە پێش چـاوی قوتابیەکـان وتی: مەهدی ئێستا هیچ درۆیەک ناکات، جوێنیش نـادات، دوای ئەوە دەسـتم کـرد بە خوێندنی قورئان، دەموت من لە کوێ بووم و قورئان خوێندن لە کوێ بوو؟!

هاوڕێکانم بەسەر سوڕمانەوە وتیان: ئەوە مەهدیە قورئان دەخوێنێت؟!

تەنانەت خێزانەکەشـم، تێکڕایـان سەرسـام بـوون لەوەی کە مـن نـوێژم دەکـرد، کە قورئان دەخوێنمەوە هەسـت بە تـرس و سەرسـام دەبـم، خـوای تعـالا لەگەڵ ئـێمەی مرۆڤ دەدوێت!!

کە لاپەڕەیەک دەخوێنمەوە ناتوانم بچمە سـەر لاپەڕەیەکـی تـر، مـن لەو ئەزمـوونە گەڕامەوە هەتا نوێژ بکەم و قورئان بخوێنم.

قورئان بۆ دونیا و قیامەتە.

دەبێت لە دونیادا بگەینە شتانێک هەتا ئاخیرەتمان دروست بکەین.

چێژ لە وەڵامەکانی قورئان دەبینم، کتێبێکم هێنا هەتا فێری نـوێژ بـبم، کـاتێ دەڵـێم 'الله اکبر' هەست دەکەم ڕۆشتومەتە خزمەتی پەروەردگار.

کە قورئـان دەخـوێنم خـوای گەورە لەگەڵ مـن دەدوێـت کە نـوێژ دەکەم، مـن لە خزمەتی پەروەردگاردا دەدوێم. گەشتمە بەختەوەری، گەیشتومەتە دڵنیاییەک کە خـوای گەورە هەمووومان دەبینێت.

خوامان لەگەڵە لە هەموو شوێنێک، هەست بە بـوونی دەکەم. هەسـتم کـرد هەمـوو شتێک لە ژیاندا پەیوەندی بە یەکەوە هەیە لەبەر من!

بۆچی لەوەو پێش بەو جۆرە حاڵی نەبوو بووم، لەوەوپـێش کە دەگەڕامەوە مـاڵەوە، لەبەر ئەوەی بۆنی جگەرەم لێ دەهات نزیکی دایکم و باوکم نەدەکەوتم.

دەچـوومە ژورەکەی خـۆم، کە وازم لە خـراپە هێنـا ئینجـا لەلای دایکـم و بـاوکم دادەنیشتم.

ناکرێت ڕۆژێک تێپەڕ ببێت و من دەستی دایکم مـاچ نەکەم، لەوەو پـێش ئەو کـارە زۆر ئاستەم بوو بەلامەوە، لە نزیکیان بەختەوەری و بەرەکەتم دەست دەکەوێت.

ئەم ئەزموونە ئیدراکی زۆر باشتر کـردم، مـردن بە گونـاهەوە خەجـاڵەتی گەورە بـۆ مرۆڤ دروست دەکات لە خزمەت پەروەردگاردا.

حەز دەکەم بە شەهیدی بگەڕێمەوە خزمەت پەروەردگـارم، مـن لە کـردەوەی خـۆم دەترسم، لە مردن ناترسم، مردن ئازاد بوونە.



# نوێژە فەوتاوەکانم قەزا کردەوە

  

'فاتمەی نیعمەت ئیلاهی' ماستەری هەیە و ئەندازیاری معماریە، لە شاری شیراز دادەنیشێت، ساڵی (١٩٨٧) لەدایک بووە و ئەزموونەکەی بەم جۆرە گێڕایەوە.

ساڵانی پێش ئەزموونەکەم، بە داخەوەم، لەبەر ئەوەی کچی تاقانەی ماڵەوە بووم و، کۆتا مناڵی خێزانەکەمان بووم، گرنگیەکی زۆر و نازێکی زۆرم دەکێشرا، لە ئاستی ئاسایی چووبوویە دەرەوە، هەتا وام لێ هاتبوو خۆم بڕیاری خۆم دەدا، وام دەزانی نابێت هیچ کەسێک حەقی بە سەرمەوە هەبێت، ئەم جۆرە لە گرنگی پێدان بە کچێکی تاقانەی ناو براکانی وای لێ دەکات کە بە ڕێگەی هەڵەدا بڕوات، قسەی هیچ کەسم قبوڵ نەدەکرد.

خێزانەکەشمان دیندار و وابەستەی شەریعەت بوون، من ئیمانم بە خوا هەبوو، ئیمانم بە پێغەمبەر ﷺ و حەقیقەتەکانی ئیمان هەبوو، هەندێ جاریش لە خەڵوەتدا لە خوای گەورە دەپاڕامەوە، بەڵام نوێژ و ڕۆژ و باڵاپۆشی 'حجاب'م نەبوو، حەزم لە مۆدێل و سفوری بوو، ڕێزم بۆ دایکم و باوکم دانەدەنا، سەرکەش بووم، پێیان دەوتم: کچم نوێژ بکە!

دەموت: چۆن دەتوانن پەیوەستی نوێژ بن بە بەردەوامی، ئەم هەموو قورئان و پەرتوکی ئاینی و زیکر و شتانە چین ماڵەکەتان لێ پڕ کردوە.

من دەموت: تەنها دڵت پاک بێت، ئەوە گرنگە!

ئەوەی لە هاوڕێکانمەوە فێری بووبووم، ئەوەم بەوانیش دەوت.

هاوڕێیەکم وتی: ئەگەر دۆزەخ بۆ کافران بێت، بە دڵنیاییەوە ئێمە شوێنمان بەهەشتە، هەر لە مناڵیەوە خۆمم زۆر بە ڕاست و باش دەبینی، ئینکاری ئیسلام و

باوەڕم نەدەکرد، بەڵام بێ ئاگا و نەزان و لەخۆبایی بووم. کەسێکم ببینیایە وابەستەی عیبادەت و ئیسلامەتی بوایە، بایەخی لەلای من نەبوو، بەهیچ و کەم فام دەمبینی.

دەموت ئەم هەمووە نوێژە چی یە ئەنجامی دەدەن، ئەرێ بەسی نی یە!!

خۆش ئەوە بوو کاتێ دەکەوتمە کێشەیەکەوە، پێم دەوتن فێری نوێژم بکەن، هەتا لەم کێشەیە دەرباز ببم!

جار هەبووە مانگێک نوێژم کردوە، کە کێشەکەم نەماوە وازم لە نوێژ هێناوە.

هەمیشە حەزم لە ڕۆمانی بیانی و ڕۆمانی ڕۆمانسی و عاشقانە بوو، بەڵام واقعی ژیانم ئەوەندەی فکر و بیر کردنەوەم ڕەش نەبوو، خۆڵەمیشی بوو، ئەو کارە خراپانەم نەدەکرد کە زۆربەی کوڕان و کچانی تازە پێ گەیشتوو ئەنجامیان دەدا، قەناعەتم وابوو کە نەبمە غەم و پەژارە بۆ نزیکەکانم و خەڵکی بە گشتی.

هەمیشە بە دایکم دەوت تۆ قەدری من نازانی، ئەگەر دەزانیت هاوتەمەن و هاوڕێکانی من چی دەکەن، ئەگەر یەکێک لە هاوڕێکانم بێت و لەگەڵ تۆ بۆ ماوەی یەک مانگ بژی، ئینجا دەزانیت من چ کچێکی باش و بێ وێنەم!!

هێشتا بەباشی پێ نەگەیشتبووم ڕۆشتمە زانکۆ، لە تەمەنی شانزەساڵیدا ڕۆشتمە زانکۆ، لەبەر ئەوەی ساڵێک پێش هاوڕێکانم چوومە قوتابخانە و، ساڵی تەمهیدیشم نەبوو لە زانکۆ، لەبەر ئەوە هاوڕێکانم بە زۆری دوو ساڵ لەمن گەورەتر بوون.

بڕیاری ئەوەم دا ڕەنگی ئەوان بگرم هەتا بمکەنە هاوڕێی خۆیان، دەستم کرد بە مۆدێل کاری و بۆیەی قژ و جۆرە خۆنواندنێک کە لەگەڵ نەریت و واقعی شانزە ساڵانێکدا نەدەگونجا.

مانتۆی کورتم دەپۆشی، کێشە دروست بوو لە ماڵەوە چونکە قبوڵیان نەبوو من بەو جۆرە ڕەفتار بکەم.

خێزانەکەمان زۆر وابەستەی ئاین و ئایندارى بوون.

ساڵی (٢٠١٠) هەندێک گۆڕان لە مندا ڕووی دا، خزمەکانم گەشتێکی بە کۆمەڵیان ڕێکخست بۆ سەردانی ئیمام حوسین 'خوای لێ ڕازی بێت'، دایکم زۆر سور بوو لەسەر ئەوەی کە بچم لەگەڵیان، ناوی خۆم نوسی، ڕۆشتن بە خۆوبەختی، ناومان دەرچوو.

لە نەورۆزی (٢٠١٢)ی زاینی، نەورۆز بوو، لە مزگەوتی کوفەبووین، لە حەرەمێکەوە بۆ حەرەمێکی تر دەڕۆشتین، کە لە حەرەمی ئیمامی عەلی بووین ' خوای لێ ڕازی بێت' هەستم بە بەختەوەریەکی زۆر دەکرد هەستم کرد لەماڵەوەم، کتێبێکیان پێ دام کە کارە خێر و سونەتەکانی تیابوو، هەرگیز ئەو کتێبەم نەکردەوە و نەمخوێندەوە، لە مزگەوتی کوفە دوو ڕکاعەت نوێژی سونەتیان دەکرد، من نەمکرد و وتم: نازانم نوێژ بکەم.

ڕۆشتم خۆم سەرقاڵ کرد هەتا نوێژ نەکەم!

کە گەیشتینە ئیمام حوسەین، زۆر قەرەبالغ بوو، تورە بووم و بە دایکم وت: بۆچی منت بۆ ئێرە هێناوە، دایکم منی بردە پەنایەکەوە و عەبایەکی کرد بە بەرمدا، بۆ ڕێزی ئەو مەقامە پیرۆزە، لە سوچێکی حەرەمی مزگەوتەکە دانیشتم و هەستم بە خەوێکی زۆر دەکرد و خەو بردمیەوە، لە خەومدا ژنێکم بینی، عەبایەکی ڕەشی عەرەبی پۆشیبوو، پەچەی دابوو بە ڕوخساریدا.

پێی وتم: تۆ بە حیجابەوە جوانی، حجابەکەت لامەبە و خۆت لە گوناه بپارێزە.

هەستم کرد کە دەبێت بە گوێی بکەم، چونکە زۆر پیرۆز و ئیماندار دیاربوو.

کە لە سەفەرەکەم گەڕامەوە حجابم پۆشی بۆ ماوەی یانزە مانگ، زۆرێک لە هاوریکانم لێم دورکەوتنەوە لەبەر ئەوەی بومە باڵاپۆش، پێم دەوتن من لە بەر ڕێزی ئەو ژنە ئیماندارە حجابم پۆشیوە، لەبەر ڕێزی عەباکەم نەمدەتوانی لەگەڵ هاورێکانم بچم بۆ چێشتخانە و گەشتوگوزار، دوای ئەوە دورکەوتمەوە لەو هاوڕێیانەم و جارێکی تر هاوڕێیەتیم نەکردنەوە.

دوای یانزە مانگ وازم لە عەبا و پەچەکەم هێنـا، بەڵام حیجـابی کـامڵم کـرد، بەڵام مکیاجم دەکرد، گوێم لە مۆسـیقا و گـۆرانی دەگـرت بە بەردەوامـی، وازم لە نـوێژیش هێنایەوە، هیچ شتێک لە مندا نەگۆڕا، تەنها داپۆشینی قژ و حجابەکەم مایەوە.

ساڵی (٢٠١٤) ئامادەییم هەبوو بۆ گەشـتێکی تـری شـوێنە پیرۆزەکـان، بەڵام مـن حەزم لێ نەبوو بچم، وتم: یەک جار بەسەو پێویست ناکا.

لە کۆتایدا قەناعەتیـان پـێ کـردم بەڕۆشـتن، لەگەڵ دایکـم و پـورم ڕۆشـتم، بەڵام زۆرباش بوو کە ڕۆشتم، ئەو کاتە خۆشەویسـتی ئـاڵ و بەیتـی پێغەمـبەر ﷺ لە دڵمـدا چەسپا و دەمەزرا.

باڵاپۆشیەکەم زۆر باش بوو، بەڵام مکیاجم دەکـرد، لە بەرچـاوانی دایکـم و بـاوکم مکیاجم کەم دەکرد، بەڵام کە دەچوومە دەرەوە زیاد لە پێویست بوو.

ئەم حاڵەم هەتا ماوەیەک بەردەوام بوو، ژیانم بەو جـۆرە بەردەوام بـوو هەتـا سـاڵی (٢٠١٧)ی زاینی، ئەم ساڵە لە ڕاستیدا وادەی لەدایک بوونم بـوو، لە دوای ئەزمـوونی نزیکبوونەوەم بوو لە مردن.

لەگەڵ خێزانەکەمـان ڕۆشـتم بـۆ چێشـتخانە و نـان خـواردن لە دەرەوە، توشـی ژەهراوی بوون بووم بە خواردن، جۆرێک لە خواردنم داواکرد کە پاک نەبوو، تەنها مـن توشی ژەهراوی بوون بووم، ئەو شەوە هەتـا بەیـانی ئـازارێکی قورسـی سـک ئێشـەم هەبوو، ڕەنگم ڕەش هەڵگەڕا، هەموو جەستەم ئازاری هەبوو، ڕووە و قیـبلە ڕاکشـام و شایەتومانم هێنا، دایکم لە تەنیشتمەوە بوو، دەگریاو، باوکیشم تەلەفـۆنی بـۆ ئیسـعاف دەکرد، منیش دەموت ناچم بۆ نەخۆشخانە.

پورم لە ماڵمان بوو پێی وتم: مکوڕ مەبە، دەبێت بچیت حالت باش نییە.

ڕۆشتم و سۆنەر و پشکنینیان بۆ کردم.

وتیان: زراوت ئیلتیهابی کردوە و گەورە بووە، بووە بە سیانزە سانتیمەتر، زراویشم دوو سانتیمەتر تەقیبوو، کە دەبوو نەشتەرگەریم بۆ بکرێت، سنگیشم تەواو نەبوو، توشی کۆکەیەکی ناوبەناو دەبووم، وتیان: چەند کەسێکت لە پێشەوەیە بۆ نەشتەرگەری، منیش وتم: با بچینەوە بۆ ماڵەوە، هەستێکم بۆ دروست بوو کە با بۆ دواجار دایکم ببینمەوە.

پورم وتی: باش نیە لە نەخۆشخانە دەرچیت، لێرە بمێنەرەوە.

بەڵام من لەسەر بەرپرسیارێتی خۆم دەرچووم و گوێم بۆ قسەی کەس نەگرت و گەڕامەوە ماڵەوە.

دەستم کرد بە وەسیەت کردن، هەتا بەیانی من دەگریام و باوکم و دایکم و نەنکم لە نزیکمەوە بوون و دانیشتبوون.

براکەم سەفەری هەبوو، هات هەتا ماڵئاوایم لێ بکات، من لەو کاتەدا کەوتم، پرسی بووی چی یەتی؟

بۆیان باس کردبوو.

براکەم وتی: ئەگەر نەیەیت بۆ نەخۆشخانە بەزۆر دەتبەم، بڕیاری دا سەفەرەکەی نەکات و منیان بردەوە بۆ نەخۆشخانە، ئەمجارە چووین بۆ نەخۆشخانەی 'کەوسەر' فەحس و ئیشاعەی تازەیان بۆ گرتم، هەستم دەکرد کە کۆتایی ژیانمە، وێنەم لەگەڵ پورم دەگرت، حەزم نەدەکرد بە ڕەنگی بزرکاوەوە وێنەبگرم، بەڵام ویستم کۆتا یادەوەری بۆ دایکم و خێزانەکەمان بنێرم، هەستم دەکرد کە دەمرم، داوام لێ کردن لێم ببورن، دایکم و باوکم دوعا و نەزریان بۆ کردم هەتا ڕزگارم ببێت، دایکم ناساغ بوو، نەیدەتوانی بێت بۆ نەخۆشخانە، باوکیشم زۆر بە ڕەحم و بە بەزەییە نەیدەتوانی ئاوا بە ئازار و کزیەوە بمبینێت.

پەیوەنـدیان پێـوە دەکـردم و دەگریـان، سـەعات یـانزەی شـەو بـوو، پزیشـکی بێهۆشکردن بانگی کردم، وتی: نیوە بەنجـت بـۆ دەکەیـن، چـونکە هەکردنـی سـنگت هەیە و بێهۆشکردنی گشتی ناکرێت.

نەشتەرگەریەکەم بۆ کرا، شەوی دووەمی دوایی نەشتەرگەری توشی تەنگە نەفەسـی و کۆکە بووم، تەنها بـووم لە ژورەکەدا، نەمتـوانی هەناسـە بـدەم و بـانگی پەرسـتارەکە بکەم، پوریشم چەند دەقەیەک پێشتر لە ژورەکەی من دەرچووبوو بۆ پێویستیەک.

براکەشم چووبوویە دەرەوە، کاتێ زانی بـووی نەشـتەرگەریەکە بە سـەلامەتی تەواو بووە.

ئەوەنـدە کـۆکەکەم بەهێـز بـوو کە هێـز و وزەی لـێ بـڕیم، هەسـتم بەوە دەکـرد بارستاییەکی قورس لەسەر سنگمە، ئاگام لەخـۆم نەمـابوو، لە تـاوا پەلەقـاژەم دەکـرد، چاوەکانم کردبوویەوە و کەسیش ئاگـادارم نەبـوو، ئۆکسـجینم لە سـەربوو، ژورەکەش ڕۆشن بوو، ئازاری سەرسنگم زۆر زیادی کرد، درەنگانی شەویش بوو.

وتم: خودایە خۆم تەسلیمی تۆ کرد.

چاوەکانم لێک نا، ئیتر نازانم چۆن بوو کە ڕۆحم لە جەستەم جیابوویەوە.

کەوتم و لە پـڕ چـاوێکی تـرم کـرایەوە، هەمـوو شـتێکم پـێ دەبینـی، ژورەکە زۆر ڕوونـاک بـوو، سـەرەتای لە جەسـتە دەرچـوونم ژورەکە تاریـک بـوو، لە کاتێکـدا گڵۆپەکان کاریان دەکرد!

سەرسام بووم لەوەی کە من چی دەکەم لە نزیکی بنمیچی هۆڵەکە!

بینیم کە جەسـتەم لە حـاڵێکی زۆر خراپـدایە، ڕەنگـی خەسـتەم زەرد هەڵگەڕابـوو، تاریکیەکە ڕێـگەی بینینـی لـێ نەدەگـرتم، بینیـنم زۆر بـاش و ئاسـایی بـوو، هـۆڵ و نەخۆشـخانەکە و دەرەوەشـم دەبینـی، سـیرامیکی سـەرزەوی ژورەکەم زۆر بە ڕوونـی

دەبینی، وەک ئەوەبوو ڕۆحـم بگەڕێـت هەتـا کەسێک لە ژورەکـانی تـر بـدۆزێتەوە و داوای لێ بکات هەتا جەستەم ڕزگار بکات.

پەرۆشـی خـۆم ’ڕۆح‘م بینـی بـۆ ئەو کـاتە، ئەگەر بمویسـتایە ژێـر سـیرامیکی زەویەکەشم دەبینی، دەمزانی دیوار و بەربەسـتی مـادی ڕێگـر نەبـوون لە بینینـی مـن، بەڵام چاوم لەسەر جەستەی خۆم بوو.

دور نەدەکەوتمەوە لە جەستەکەم، نەوەک بە تەواوی بمرم.

زانیم تاریکیەکە سەرچاوەی هەیە، وەک چۆن ڕووناکی سـەرچاوەی هەیە، تـاریکی دونیا و تاریکی قیامەت زۆر جیاوازە، سەرچاوەی بڵاوبوونەوەی تـاریکیەکەم دەبینـی، دوای ئەوە گەنجێکم بینی جلـی ڕەشـی لەبەردابـوو، ڕوخسـاری ڕوون نەبـوو، زۆر بە تـوڕەییەوە سـەیری دەکـردم، لە سـەرەتادا قسـەی لەگەڵ نەدەکـردم، زۆر لێـی ترسـام، هەستم کرد ئەوە کردەوە خراپەکانم بـووە و بەرجەسـتە بـووە و، بـووە بە جەسـتەیەکی زینـدوو، گونـاهو تاوانەکـانم لە گەردنـم ئـاڵابوون، ئەگەر لە دونیـادا بمبینیـایە هەتـا دەمتوانی هەڵدەهاتم لێی، لە ترسانا لە شوێنی خۆم ڕەق ڕاوەستام، یاخود ئەو بـوو بەو جۆرە ڕایوەستاندم، لە پاشان قسەی لەگەڵ کردم، من لە سەرەتادا سـەرنجی پەنـجەرەم نەدا، دەرگایەک هەبوو، لە بەرامبەریەوە پەنجەرەیەک هەبوو، پێی وتـم: لەو دەرگـایەوە بتبەم، یاخود لە پەنجەرەکەوە، بە ویستی خۆتە؟! دەرگـاکە تاریـک بـوو، ڕوونـاکیەکی زۆر جوانی شین و سـپیم بینـی لە پەنـجەرەکەوە دیـاربوو، هەتـا زیـاتر چـاوم لەسـەر ڕووناکیەکە بوایە سەرچاوەی ڕووناکیەکە لێم نزیک دەبوویەوە، هیچ ئـازارێکیٔ نەبـوو، نورێکی نەرم ونیان و شیرین بوو، لەو جیهانە کاری سەرەڕۆیی نیە، هەمـوو شـتێک بە یاسایەکی وردی داڕێژراو و زۆر تایبەتە.

پێی وتم: کامیان شایان بە تۆیە، خۆت هەڵبژێـرە، تەنهـا یەکێـک لەو دوو ڕێگـایە، وتم: ڕێگای دووەم باشتر نیە؟ چونکە ڕووناکە و بەبـێ ئـازار دونیـا بە جـێ دەهـێڵم و زۆریش ڕێگەیەکی پڕ لە میهرەبانی دیارە، ئەو نـورە وەکـو موگنـاتیس کێشـی دەکـردم،

دڵم دەسوتا بە جەستەم و خەمی دایک و باوکم بوو، نەمدەزانی چی بکەم، هەستم دەکرد بەرپرسیارم لەو جەستەیەم کە لە خوارەوەیە، هەتا بەجێی نەهێڵم، ئەو نورە سۆزی لەدایکان زۆر زیاتر بوو، زۆر شیرین و ناسك بوو، هەستم کرد هەمیشە لەگەڵمان بووە و ناسیومانە بەباشی.

هەرچەندە کەسێکی خراپ بیت، کە بژاردەی باش بخرێتە بەردەمت ڕەتی ناکەیتەوە.

لەناکاو ژورەکە پڕبوو لە ڕووناکی، هەر ئەوەندەی بیرم کردەوە بژاردەی نورەکەبکەم، هەموو شتێک ڕووناک بوویەوە، ڕێگری ئەوەم لێکرا لە پەنجەرەکە وردبیمەوە، چونکە ئەو نور و ڕوناکیە ئەوەندە زۆر و جوان بوو، هەموو بژاردە و سەرنجی کێش کردم، تاریکی ڕۆشت، کەسە تاریک پۆشەکەش ڕۆشت!!

نورێکی تر داخل بە ژورەکە بوو، نورە گەورەکەی دەرەوە نەبوو، لە جەستەم نزیک کەوتمەوە و بینیم کە کەسێکی تریش لەلای جەستەم ڕاوەستاوە، سەرچاوەی ئەو ڕووناکیەی ژورەکە ئەو بوو، هێشتا لەسەرەوەی جەستەمەوە بووم، بەڵام نزیک بوو لە جەستەم، ئەو کەسە لای قاچمەوە ڕاوەستابوو، پێستی زۆر جوان بوو، زۆر گەنج و ڕەنگ ڕۆشن و کراوە بوو، قژی خاکی بوو، زۆر خۆشەویست بوو، ڕوناکی لە تاڵ بە تاڵی قژیەوە دەردەچوو، بە ئیلهام پێم گەیشت کە یەکێک بوو لە ئیمامە گەورەکانی ئیسلام، ئەو سەیری منی نەدەکرد، پۆشاکێکی شیری سپی زۆر جوانی لەبەردا بوو، زۆر جدی دیاربوو، زۆر زۆرم خۆش ویست، هەستم دەکرد ڕۆحم لە بونی پیرۆزیدا دەتوایەوە، هاتبوو کۆمەکیم بکات و بە لوتف بوو لەگەڵم، یەکەم کۆمەکی ئەو ئەوە بوو، بە هاتنی نە تاریکی و نە گوناهەکانم نەمان، هەستم دەکرد پێش ئەوەی بێمە دونیاشەوە، من ئەوم ناسیوە.

زۆر شەرمەزاریش دەبووم لە خزمەتیا، سەیری کاغەزەکانی دەکردم، بەڵام ئەو طەبەلە و کاغەزانە نەبوو کە بۆ نەخۆشیەکەم دانرابوو، دۆسیەکان هەندێکی ڕەشن،

هەندێکی سپی و ڕومادی جۆراو جۆر بوون، یەک یەک لاپەڕەکانی هەڵدەدایەوە و سەیری دەکردن، لە هەندێکیاندا پێ دەکەنی و ڕووی خۆش بوو، لە هەندێکیاندا ڕووخساری پیرۆزی دەگۆڕا، کە زانیم سەیری کردەوەکانی دونیام دەکات، زۆر شەرمەزار بووم.

ئاواتم دەخواست سزام بدەن بە ئاگر، بەڵام لەو شەرمەزاریە دەربازم بکەن، هەستی شەرمەزاری قیامەت زۆر زۆر زەحمەتە لە دونیادا هەستی پێ بکرێت، ناتوانیت بە باس کردن ئازارەکەی دەربب‌ڕیت.

بەڵام کاتێك ئەم پیاوە نورانیە هات، نە ئازارم ماو نە برین و شوێنی نەشتەرگەری، نە هەناسە توندی، لە دڵی خۆمدا دەموت: تەنها یەک فرسەتی ترم پێ بدەن هەتا خۆم چاک بکەم و ئامادەی ڕۆژی ڕەستاخێز بم!

سەیری هەرچی دەکرد، دەمزانی چ کردەوەیەکە و بوەتە وێنەیەک و لە پێش چاوم دەمبینی، دەمزانی چ کاتێک و لەکوێ ئەنجامم داوە.

ئەویش خەم دایدەگرت و، هەناسەی سارد و داخی هەڵدەکێشا و سەری ڕادەوەشاند لە بەدی و خراپی کردەوەکانم!

بە هەندێ کردەوەشم دڵخۆش دەبوو.

﴿وَوُضِعَ الكِتابُ فَتَرَى المُجرِمينَ مُشفِقينَ مِمّا فيهِ وَيَقولونَ يا وَيلَتَنا مالِ هذَا الكِتابِ لا يُغادِرُ صَغيرَةً وَلا كَبيرَةً إِلّا أَحصاها وَوَجَدوا ما عَمِلوا حاضِرًا وَلا يَظلِمُ رَبُّكَ أَحَدًا﴾ (الكهف: ٤٩)

دەموت تۆ بڵێی فرسەتێکی ترم پێ بدەنەوە، یاخود تەواو لەگەڵیان دەڕۆم!

ئەو کەسە نورانیە پێی وتم: تۆ باشیت، بگەڕێرەوە بۆ دونیا و، دەست بەجێ گەڕامەوە.

پیاوە نورانیەکە لە پێش چاوانم ون بوو، ئازار و تەنگەنەفەسی و کۆکە زۆرەکەم بۆ گەڕایەوە.

شروبی کۆکەیان بۆ هێنام و خەواندمیان، من بەردەوام دەموت ئەو پیاوە نورانیە چی لێهات.

ئەوان وایان دەزانی من وڕێنە دەکەم، گرنگیان بە قسەکەم نەدا، بەڵام ئەوەم بینی کە مردن پلە و مەقامی جیاوازی هەیە، من ترسم لە مردن نیە، ترسم لە کردەوەکانمە کە کەڵکی ساتێ دوای مردنی نەبێت.

ئێستا ئەگەر بژاردەی جۆری مردن بەمن بدرێت، شەهیدی هەڵدەبژێرم.

سوپاس بۆ خوای گەورە لە دوای ئەوە زۆر باش گۆڕام. ئێستا دەڵێم خودایە ئەگەر زمانم لە یاد و سوپاسگوزاری وەستا ڕۆحم بەرەوە بۆ لای خۆت.

ئێستا گوێ لە قورئان و موناتاجات دەگرم، ئەگەر گوێ لە مۆزیک بگرم دژواری دەروونیم بۆ دروست دەبێت.

زۆر حەزم لە کاری خێریە ئەنجامی بدەم، ئەگەر هەڵە و گوناهێک بکەم خێرا ئەوێم بیر دەکەوێتەوە، کە چۆن خەجاڵەتیەک تووشی خۆم دەکەم.

دەفتەرێکم دانا نوێژە ڕۆشتوەکانم گێڕایەوە.

نوێژی بیست و دوو ساڵی تەمەنم گێڕایەوە.

بێجگە لە ڕۆژوەکان!!

لە دەفتەرێکدا ئاماژەم پێ داو، خشتەیەکم بۆ دروست کرد و، سوپاس بۆ خودا جێ بەجێم کرد.

هەڵەکانی ڕۆژانەی خۆمم یاداشت دەکرد و لێپرسینەوەم لە خۆم کرد، ئەگەر ئەم ئەزموونە خێرداره نەبوایە من دەستم بە نوێژ نەدەکرد، چونکە لە ماڵەوە، لە ڕاگەیاندن، مامۆستاکانی دواناوەندیم، کتێب، ئەمانە کاریان تێ نەکردم بۆ ئەوەی نوێژ بکەم.

بەهـۆی ئەم ئەزمـوونە ڕەحمەتـیەوە، نەک تەنهـا نـوێژ دەکەم، بەڵکـو نـوێژە فەوتاوەکانیشم هەمووی گێڕایەوە و قەزام کردنەوە سوپاس بۆ خودا.

سـی و یەک سـاڵەی تەمەنـم داوە لە بێژنـگ و پیـاچوومەتەوە بـۆ نـوێژ و ڕۆژو و فەرزەکانم!!

ئەوە لوتفی خوایی بوو فریای من کەوت، هەموو کەسێک ئەو فرسـەتی دووهەمەی پێ نادرێتەوە، زۆر زۆر لە خەڵکـی بەرزەخ داوا لە خـوای گەورە دەکەن بگەڕێـنەوە بـۆ دونیا و خۆیان صالح بکەن، بەڵام یەک چرکەیش ناگەڕێنرێنەوە.

ئێسـتا کە تـۆ لە ژیانـدایت، زۆر جێـی خـۆیەتی بیـر بکەیـتەوە و فریـای قیامەتـت بکەویت.

هەیە تەنها ئەوەندەی دەوێت بگەڕێتەوە و بڵێی 'أستغفر الله ربی و أتوب إلـیه' بەڵام ڕێگەی نادەن، فرسەتی ئەم ژیانە لە دەست مەدەن.

ئێستا دەسکاری خۆتان بکەن، خۆتان بگۆڕن.

زۆرێک لە هاوڕێکـانم لەدەسـت داوە، لەبەر ئەوەی ڕازی نەبـووم بە غەیـبەت و بە بوختان و بە تاوان کردن، هاوڕێکانم فـاتمەی نوێیـان ناوێـت و حەزیـان لێـی نـیە! إن شاءالله دەمەوێت واز لە هەموو گوناهێک بێنم، قورسە لە بەرامـبەر گونـاه و خـراپەوە بوەستیتەوە، بەڵام دەبێت بە دەرمانی ئارامگرتن، هێزی شەڕ لە خۆمان دور بخەینەوە.

فرسەتی ئەزموونەکان و گەڕانەوە بۆ دونیا بە هەموو کەسـێک نادرێـت، بەڵام قەدەر بەشداریشی بە ئێوە داوە کاتێ دەیبیستن یاخود دەیخوێننەوە و لە کەناڵەکان دەیبینن.

ئەزموونەکان کە لەم سـەردەمەدا کەوتـونەتە بەرچـاو و بـڵاو دەبـنەوە، ڕەحمەتێکـی ئیلاهین، هەتا مرۆڤایەتی لە لێواری تیاچوون بپارێزن.

ئەگەر من بە حاڵی پێشـومەوە بمردمـایە، حـاڵم زۆر خـراپ دەبـوو، نـازانم چـۆن شوکری خودا بکەم لەسەر ئەو نیعمەتە فراوانەی کە بە منی بەخشی و منی گێڕایەوە بـۆ دونیا، هەتا هۆشێک بکەمەوە و ئاگام لە عاقیبەتم بێت.

خوای گەورە تەوفیقی دام هەتا خۆم چاک بکەم.

ئومێد دەکەم وەفاداریم بە بەڵێن و پەیمانەکەم.

## حەقیقەت لە دوای مردنە



خاتوو 'سامانە موختار زادە' لە تاران لە ساڵی (١٩٨٤) لەدایک بووە و ئەزموونەکەی بەم جۆرە دەگێڕێتەوە:

ئەوەی ڕووی دا، لە ڕۆژانێکی دژواری مندا بوو، کێشەکانم لە نێوان ساڵانی (٢٠١٢- ٢٠١٣) ڕوویان دا بەردەوام بوو هەتا (٢٠١٧)ی زاینی، کێشەی ئابوری و کێشەی تریشم هەبوو، لە دەستدانی ئەزیز و خۆشەویستانیشی چوویە سەر.

لە کۆتایی مانگی سەفەری (٢٠١٧) گەیشتمە خاڵێک لە بەیانیەوە هەتا ئێوارەکەی کەوتمە بەربەرەکانێی خوای گەورە 'خوا پەنامان بدات'، بەیانیان هەڵدەستام و دەموت خودایە: تۆ خودایت لە عەرشی خۆتەوە خوایەتی خۆت دەکەیت!!

کەسێک دەکەیتە ئیمام حوسین و کەسێکیش بکوژی ئیمام، ئێمە هیچمان بەدەست نیە.

'استغفرالله' دونیا یاریەکە و بەدەستی تۆوەیە و هیچی تر!!

هەمیشە ئەم وتە نابەجێیانەم دەوت، کێشە مادیەکانم زۆر زیادیان کرد.

جەنگم لە بەرامبەر خوادا دەکرد، دەموت خودایە ئایا تۆ هەیت؟!

'استغفرالله' هەموو کێشەکانم لە تۆوەیە.

من کەسێکی دیندار نەبووم، دەموت: هەموو مرۆڤێک خاوەنی ژیانی خۆیەتی، خاوەنی بیر کردنەوە و قەناعەتی خۆیەتی.



هەندێ جاریش نوێژم دەکرد!!

مکوڕ بووم، شەڕم لەگەڵ خەڵکی دەکرد.

شەوێکیان پەستانێکی دەروونی زۆرم بۆ دروست بوو.

بە دەنگی بەرز هاوارم دەکرد و دەگریام.

دەستم کردەوە بە ناشکوری کردن و کفر کردن!! هەتا گەیشتمە ئەو کوفرەی کە بڵێم 'استغفرالله' بوونت نیە!

لەبەر ئەوەیە دەڵێن هەیت، هەتا چاودێری کردەوەکانمان بکەین!!

تەنها و بێ دڵسۆز بووم، کوفرم دەکرد و بە دەنگی بەرز دەگریام، وتم: ئەگەر هەیت خۆتم پیشان بدە.

دوای ئەوە هەستم بە نائومێدیەکی زۆر کرد، ڕۆشتم لەسەر چرپاکەم ڕاکشام، خۆم وەکو مناڵ کۆکردەوە و دەستم کردەوە بە قسە و کروزانەوە: ئەگەر تۆ نەشبیت.. تۆ هەیت..

هەستم بە تینوێتیەکی زۆر دەکرد لە قورگمدا.

تینوێتیەکە زۆر زیادی کرد، ئارامم لێ برا.

تینوێتی مادی و ئاسایی ناڵێم، تینوێتیەک بوو جیاواز و لە شوێنێکی ترەوە بوو.

تینوێتیەکە ئەوەندە زیادی کرد، هەتا مێشکم ئاماژەی بۆ کردم کە بڕۆم ئاو بخۆمەوە، هەستام، بەڵام لە جیاتی ئەوەی بڕۆم بۆ چێشتخانەکە، هەستم کرد وەک یەکێک پێم بڵێت سەیربکە، فەرمانێک بوو، دەبوو بەو جۆرە بکەم، بژاردەم نەبوو، دەبووبێت!!

سەیرم کرد... دەبینم جەستەکەم، وەک منداڵێکی خەوتوو خۆم کۆکردۆتەوە، دەستێکم لە چرپاکە کەوتۆتە خوارەوە، ڕوخسارم ڕووە و دەرگای شوقەکە بوو، تینوێتیەکەم زیادی دەکرد و، منیش بە خێراییەکی زۆر و بێ وەستان لە دەرگای شوقەکە ڕۆشتمە دەرەوە.

لە شەقام و کۆڵانەکە خۆم بینی یەوە!

تینوێتیم ئەوەنـدە زیـادبوو، وام دەزانـی ئێسـکەکانم دارێکـی وشـکن، وام دەزانـی دەسوتێم.

زەوی ئەوەندە گەرم بووبوو، نەمدەتوانی قاچی لەسەر دابنێم!

لە کاتێکدا قاچەکانم (١٠- ٢٠)سم لە زەویە گەرمەکەوە دووربوو، ناتوانم و نـازانم وەصـفی ئەو گەرمـی و تینـوێتیەی دەروونـم بـکەم. ژمـارەی خانوەکـان و، سـەیارەی دراوسێکان وەک خۆی بوو، هەموویم دەبینی، دەمزانـی خەڵـکەکە کێیـان خەوتـوە و، کێشیان لە خەو هەستاوە، دەمزانی لە ماڵەکانـدا چـی ڕوودەدات، تەنۆلکەکـانی هەوام دەبینی، تەنۆلکەی خوێن و گڵم دەبینـی لە هەوادا، هەوایەکـی قورسـی خراپـی پێـک دەهێنا!

هەموو شەقام و کۆڵانەکان بەو جۆرە بـوون، تەنهـا شـەقامی گشـتی جیـاواز بـوو، لەوبەر شەقامە گشتیەکە لە جیاتی باڵەخانەکان، دەبینم دیـوارێکی کـۆنکرێتی بـوو، کە دەکەویتە ئاوا جیهانێکی جیاوازەوە، تۆ ئیختیارت نـیە، وەک ئەوەی بڵێیـت مـن لێـرەوە دەڕۆم و، لەوێوە ناڕۆم، تۆ فەرمان جێ بەجێ دەکەیت.

لەو ساتانەدا بونەوەرانی زۆر ترسناک لە هەموو لایەکەوە هێرشیان بۆ هێنام، هەموو یەکێکیان بە ئەندازەی خانویەکی سێ نهۆم دەبوون، دوڕنـدیەکی زۆر ترسـناک بـوون، شێوەیان پێک هاتبوو لە مانگا و بەراز بکەیـت بە یەک و زۆر ترسـناک بێـت، دەتـوانی دەمارەکانی لاشەی ببینیت، ئێسکەکانی ببینیت، چاویان هەمووی سپی بوو، ڕەشی تیا نەبوو، لە هەموو لاکانەوە بەرەو من دەهاتن زۆر بە خێرایـی، هەرچیەکیـان دەکەوتە بەر دەست بۆ منیـان هەڵـدەدا، پەرداخـی زۆر ناشرینیـان پـێ بـوو، هەیـانبوو بەردی زۆر گەورەی هەڵدەگرت و فڕێی دەدا ڕووبەڕووی مـن، ویسـتم ڕووە و دیـوارەکە هەڵـبێم، چونکە زەویەکە داخان بووبوو، لەوێدا گیرم خوارد، نەمدەزانی چی بکەم!

هەر چۆنێک بێت لە دیوارەکە نزیک بوومەوە، منیش بە حاڵێکی زۆر خراپەوە ئاڵابووم، شوێنەکە زۆر زۆر ترسناک بوو، ئێستا کە دەیگێڕمەوە توشی دڵەڕاوکێ و شڵەژانم دەکات.

ئەو گیاندارە دوڕندانە هێرشیان بۆ دەهێنام و دەیانویست بمگرن، ئەوەندە لێم نزیکبوونەوە هەتا خۆم لە نێوان دوو بەردا بینیەوە، لە نزیکی دیوارەکە.

بەردێکیان ڕووە و من هەڵدا، هەندێک لەو دوڕندانە لە دورەوە بوون، تەنها چاویانم دەبینی، هەندێکیان زۆر نزیک بوون، دەتوت گورگن و دوکەڵیان لێ دەردەچێت، دەنگیانم دەبیست و دەمبینین.

دەمزانی هاتوون من ببەن، زۆر دەترسام، هاوارم کرد فریاد ڕەسێک فریام بکەوێت.

وەک کەسێک کە ئۆتۆمبیلێك لێدەخوڕێت و لە خێرایی ڕۆشتندا شتێک دێتە ڕێگەی و لە ترساندا ئیستۆپ دەگرێت و دەڵێت یاالله فریام بکەوە، لە ناخی دڵیەوە ئەو هاوارە دەکات و خوای گەورە دێت بە هانایەوە، بەو جۆرە بوو بۆ من.

یەکسەر تونەیلێکی نورانیم لێ دەرکەوت، دەستێکی لێ هاتە دەرەوە و ڕایکێشام بۆ سەرەوە، دەستێکی زۆر گەورەی نورانی بوو، بەرەو سەرەوە ڕۆشتم.

*پێشکەشکاری بەرنامە 'عەباسی مەوزونی' دەڵێت: 'ثابت الأمیر' یەکێکە لە بریندارەکانی مزگەوتێکی کویت کە بەهۆی کردەوەیەکی خۆکوژی یەکێک لە ئەندامانی داعشەوە بریندار بوو.

'ثابت أمیر' ئەزموونێکی جوانی 'نزیکبوونەوە لە مردنی هەیە'، هەوڵمان دا بیدۆزینەوە، بەڵام نەمانتوانی چاوپێکەوتنێکی تەلەفزیۆنی لەگەڵ ساز بدەین، بەڵام لە گرتە ڤیدۆیەکدا دەگێڕێتەوە و دەڵێت: من شتێکی زۆر سەیرم بینی، بۆ هەندێ لە خەڵکیم باس کردوە، دەمەوێت پرسیارتان لێ بکەم، ئایا کەسی تر ئەم ئەزموونەی بینیوە؟.

ئەوەبوو پێش تەقینەوەکە، کەسێکی کـوڕ هـاتە مـزگەوت و وتـی: ﴿... إِنَّ اللَّهَ مَعَ الصَّابِرِينَ﴾ (البقـرة: ١٥٣) و دوای ئەوە تەقیـنەوە گەورەکەی 'مزگەوتـی ئـیمام صـادق' ڕووی دا لە ساڵی (٢٠١٥)ی زایینی.

لەناکاو لە شێوەی هەورێکی گەردەلولی چڕ، یاخود تونەیلێکدا، کە ڕەنگـی سـور و سەوز و زەردی هەبوو، بینیم ڕۆحەکانمان لە جەسـتەکانمان دەرچـوون و، هەموومـان ڕاکێشراین بۆ ئاسمان.

هەموومان زۆر دڵخۆش بووین و پێدەکەنین.

لە دەرگای ئەو تونەیلە کە دەرگایەکی شەفاف و ڕوونی هەبـوو، وەکـو ئـاو وابـوو، ئیمامی حوسەینی لێ بوو، دەستی گەورە بوو، کۆمەڵێکی هەڵگـرت و بەرزی کـردنەوە بۆ سەرەوە، هەموو هاواریان دەکرد.. من ببە... من ببە.

کاتێک سەرکەوتین بۆ سەرەوە، جەسـتەی خۆمانمـان دەبینـی لە خـوارەوە، هـاوارم کرد 'أبا عبدالله' من ببە لەگەڵ خۆت.

فەرمووی: ئەمڕۆ نا، ئەمڕۆ ڕۆژی هاتنی تۆ نیە، بگەڕێرەوە.

وتـم: 'أبـا عبـدالله' لەبەر خـاتری دایە گەورەمـان حەزرەتـی فـاطمەی زەهـراء بـا نەگەڕێمەوە بۆ دونیا.

فەرمووی: ئەمڕۆ ڕۆژی تۆ نیە بگەڕێرەوە.

ئاماژەی بۆلای خوارەوە کـرد، هێـنرامەوە بـۆ خـوارەوە و خـزێنرامەوە جەسـتەکەی خۆم، من ڕۆحی نوێژ خوێنەکانم بینی، کە لەناو نوێژدا بـوون ڕۆحیـان بە دڵخۆشـی و پێکەنینەوە سەرکەوت.

هیچ کەس نیە پێناسەی تەواوەتی ئەو دەرگا و تـونەیلە بکـات وەکـو خـۆی، مەگەر کەسێک لەوێ سەرکەوتبێت و ڕۆشتبێت، ئەویش بۆ خۆی دەیزانێـت، نـاتوانی مانـای تەواوی بگەیەنێت.

*'خانمی موختار زاده' دەڵێت: تونەیلەکە قوڵ بوو، ملیۆنەها ملیۆن ڕەنگی تیابوو، کە ناتوانین لێرەی دونیا ئەو ڕەنگانە بدۆزینەوە.

من وێنەکێشم، ناتوانم ئەو وێنە و ڕەنگانە بنەخشێنم.

ئۆقیانوسێک ئاو ناکرێتە پەرداخێکەوە.

وەصفی ئەویٚ بۆ ئێرە کورت دەهێنیٚ.

تونەیلەکە پێک دێت لە تەنۆلکەی بچوک بچوک، هەر یەکێک لەو تەنۆلکانە چیرۆکێکە بۆ خۆی.

هەواڵی شتێکت پیٚ دەدات، دەربارەی پەیوەندی تۆ لەگەڵ خوای گەورە و میهرەبان.

پێت دەڵێن تۆ چی بوویت، لە کویٚ بوویت.

هەستم کرد لە تونەیلەکەدا زۆر سوکەڵە بووم، هەستم دەکرد زانیاری فێردەبم، زانیاریەک کە پێشتر نەمدەزانی.

کە لە تونەیلەکەدا بووم، جارێکی تر کەشەکە گۆڕایەوە، نورانیەکە ڕۆشت، جارێکی تر هەموو شت گۆڕا بۆ خاک و خوێن.

دەنگێک دەهات، کە وەکو دەنگی پێی ئەسپەکان بوو، تیرێک لە کەوان دەرچوو، لەلای چەپمەوە و لە پێش چاوم تیٚ پەڕی، کێشای بە گەردنی منالێکی بچوکدا، منالەکە ملی کەوت بەلادا و دەستی بۆ خوارەوە شۆڕ بوویەوە، ئەو خوێنەی لێی چۆڕا بە هەموو ئەو بۆشایەدا بڵاو بوویەوە، من موحیبەتی زۆرم بینیوە لە دونیادا، توشی ستەمی زۆر گەورە بوومەتەوە، هەموو ناسۆرەکانی ژیانم هیچ نەبوون لە بەرامبەر بەڵای عاشورادا، کە من ڕاستیەکەیم بینی.



ئەو تیرەی کە لە پێش چاوم دەرچوو، دەمزانی لە پەڕو داری چ شوێنێک دروست کراوە، تیرەکە لەلای چەپەوە هات و لە گەردنی منداڵەکەی داو، لەلای چەپیەوە دەرچوو، هەموویم بینی.

دوای ئەوە بە خێراییەکی زۆر گەڕێنرامەوە بۆ دواوە، بەسەر جەستەی خۆمەوە ڕاوەستام، لە قوڵایی بونمدا کەسێک قسەی لەگەڵ جەستەکەم دەکرد و بە جەستەمی دەوت: چەندە بێ نرخ و پیسیت!!

تۆ خۆتت بەچی دەزانی؟!

لە قاچەکانمەوە ڕۆشتمەوە جەستەم، زۆر ئازارم پێ گەیشت، ئازارەکە زۆر زیاتر بوو لە ئازاری گورچیلە ئێشە، ئازاری گورچیلە یەکێکە لە بەرامبەر هەزاری، ئازاری گەڕانەوەی ڕۆح بۆ جەستە.

کە نامۆ دەبیت لە جەستەت و دور دەخرێیتەوە لێی و ڕۆح دەچێتە بەرزەخ بە یەکجاری، ئازاری گەڕانەوەی ڕۆح بۆ جەستە هەزاران جار لە ئازاری دەرچوونی زیاترە، ئەوە ڕەحمەتی خوایە بە ملیۆنەها حیکمەتی ترەوە کە مردین ناگەڕێینەوە بۆ دونیا.

کە هەستامەوە حاڵم زۆر خراپ بوو، دەگەڕام بۆ مۆبایلەکەم، نوسیم :'حلت بفنائك'، دەبینم تەعبیرە لە زیارەتی عاشوراء، زیارەتی عاشورام کردوە، ماوەیەکی زۆر بوو قورئانم نەکرد بوویەوە، کە خوێندمەوە مانای هەموو وشەکان تێ گەیشتم.

لەو چرکە ساتەوە هەستم بە ترس کرد لە وجودی خۆم، هەستم بە عیشق و ئیشتیاق کرد بۆ ئیمام حوسین.

وتم: دەبێت بچم بۆ کەربەلا.

صەبرم نەکرد و دەگریام دەموت: خودایە من نەزان بووم لێم خۆش بە، تێ نەگەیشتووبووم، پیشانت دام لە کوێم!!

دوو ساڵم پێ چوو هەتا حەقی خەڵکیم دایەوە، دوو ساڵم پێ چوو هەتا لە کاروانیەکدا ڕۆشتم بۆ کەربەلا.

حاڵی جەستەیم شەکەتی و ماندووبوون بوو.

ڕۆشتینە شوێنی پشوو، هەر ئەوەندەی سەرم کەوتە سەر پشتیەکە، چاوم بڕیە سەرەوە، سەیری بنمیچەکەم دەکرد، هەوا گۆڕکێی باش بوو، هەر ئەوەندەم زانی خۆم لە سەرەوە بینیەوە، گەڕامەوە بۆ ناو حەرەمی ئیمام حوسین کە پێشتر ڕۆشتبوین و قەرەباڵغ بوو، بەڵام زۆر بەرز بوو بەسەر حەرەمی مزگەوتدا، هەموو وردەکاریەکانم لە خوارەوە دەبینی، تەسبیحی دەستی کەسەکانم دەبینی کە زیکر و تەسبیحاتیان دەکرد!! کەچی لە هەمان کاتدا من لە زەویشەوە دوربووم.

ئاسمانەکان زۆر زۆر دورن، ناوی جیاوازیان هەیە، چین چینیشن، خەڵکیش حەوت چینن، من لەوێ ئاوا بینیم!! لە نێوان هۆشیاری و ناهۆشیاریدا حەوت چین هەیە!

بەڵام چینەکان ناسک و تەنک و شەفافن. ناتوانم بە تەواوی وەصفی بکەم، چونکە هەر پێناسەیەکی بۆ بکەم کەم و کورت دەبێت!!

هەموو مرۆڤێک گەوهەر و دوڕێکی گەورەی پرشنگداری تێدایە کە 'ڕۆح'ە.

ڕۆحی مرۆڤ حەوت چینی شەفافە، سپی یاخود ڕەشە.

لەو ساتەی من لە سەرەوە بووم هەستم کرد کە دونیای من گۆڕا، بیر لە هیچ شتێک ناکەیتەوە.

هەست دەکەیت تۆ لە شوێنی ڕاستەقینە و حەقیقەتدایت.

حەقیقەتی پاڵفتە و ڕوت، بێ خەوش، دەمزانی جەستەم لە خوارەوەیە، بەڵام ویستی گەڕانەوەم نەبوو، حەزم دەکرد هەزاران ساڵ ئەو دیمەنانە ببینم، یەکێک لە هاو

سەفەرەکانم لە مزگەوت، جۆرە سەلامێکی کرد، دوایی کە گەڕامەوە پێم وت: وتـی تـۆ لەگەڵمان و لە ماڵمان نەبوویت چۆن دەزانیت؟

وتم: من لەوێ بووم؟

منالّم دەبینی شوکلاتەی بە دەستەوە بـوو دەیخـوارد، کەسـێک لەو لاوە خەوتبـوو، کەسێک بە تەسبیحەکەی زیکری دەکرد!!

زیکـرەکەم دەبینـی، یەعنـی بـێجگە لەوەی کە پیـاوە زیکـر خـوێنەکەم دەبینـی، وا هەست دەکەم ناوی ئاسمانەکان بەم جۆرە بوو، یەکێکیان ناوی بەرەکەت بوو، یەکێـک فەزڵ، یەکێک ڕەحمەت، یەکێکی تریـان ڕەحـمان، وەسـف کردنـی ئاسـمان سـەختە، هەرگیز وەسفی ناکرێت، بەو خێراییەی سـەر خـرام، بە هەمـان خیرایـی گەڕێـنرامەوە خوارەوە، کە هۆشـم هـاتەوە دەبیـنم ژنێـک بە ڕاسـەرمەوەیە و، بە تـرس و دڵەڕاوکێـوە سورەتی فاتحەم بەسەردا دەخوێنێت بە نیەتی شیفا.

هەمان ئازاری یەکەم جاری ئەزموونەکەم بینیەوە، بەڵام کەمتر بوو، ئینجا چاوەکـانم کردەوە.

ژیان واقعە و هەیە، بەڵام ڕاستی ڕەها لە دوای مردنە.

واقع ڕەنگە درۆی تیابێـت، دەتوانرێـت بخەڵەتێنرێـت ڕابکێشرـێت، بەڵام ڕاسـتی فریودانی تیا نیە، لەناو ڕاستیدا هەموو شـتێک دروسـتە، مـن بە درێژایـی ژیـانم خەوم بینیوە، بەڵام خەوێکم بیر نەماوە! بەڵام ئەم ئەزمـوونە لەیـاد ناکرێـت، چـونکە ڕاسـتی دەبینیت.

من نیگـار کێشـم و وێـنە دەکێشـم، زۆر حەزم دەکـرد کە دوو دیـمەن وێـنە بـکەم، یەکێکیان 'ترس' و ئەوی تریشیان 'ئومێد'.

وێنەی دیمەنێک بکەم کە تـرس بەسـەریاندا زاڵە، بەڵام هەرچـیم کـرد نەمتـوانی و، نەشکرا وێنەیەک لە نزیک کەوتنەوەشی بکێشم.

دەیان وێنەم کێشا، هەموویانم فڕێ دا، چونکە نەدەکێشرا.

دەمویست ڕەنگیان بکەم، ئەو ڕەنگانەم دەست نەدەکەوت، ئایا دەکرێت زەریـایەکی گەورە بخزێنرێتە ناو پەرداخێکەوە!؟

وێنەکێشەکان دوو جۆر وێنە دەکێشن: یان وێنەی واقع دەکێشن، یاخود بە ئەندێشـە و بە خەیاڵ دەیکێشن.

بەڵام ئەوەی من بینیم لە ئەزموونەکەمـدا واقـع بـوو، نە خەیـاڵ، بەڵکـو حەقـیقەت بوو، نەمتوانی بیکێشم.

## مردن ترسی ناوێت



'ئەسەد پور' ئەزموونەکەی بەم جۆرە دەگێڕێتەوە.

ساڵی (٢٠٠٦)ی زاینی، ڕۆژی شەممە بو.

من خەڵکی دێی 'موراتمە'م، لە نانەواخـانە کـارم دەکـرد، مـاتۆڕێکم کـڕی لە دێـی 'شاهین دج' و وتم: لەوێـوە دەیهێـنمەوە بـۆ لادێـکەی خۆمـان، نێـوانی ئەو دوو دێـیە نزیکەی سەعات و نیوێک ڕێگە دەبێـت، سـوپاس بـۆ خـوا بە سـەلامەتی گەیشـتم لە یەکەم جاردا، دوای ئەوە خاوەنی ماتۆڕەکە پەیوەندی پێـوە کـردم و وتـی: بیهێـنە هەتـا بۆت توند و تۆڵ بکەمەوە!

گەڕامەوە بۆ 'شاهین دج' لە دێی 'میانداب'ەوە ڕۆشتم، بە هێواشی ڕۆشتم، چـونکە دەترسام و بە قەرز و قۆڵەش کڕیبووم، لەو ڕێـگەیەدا سـەیارەیەکی مـردوو گواسـتنەوە هات، کە گەیشتە پێچەکە، مـن خـودەکەم لەسـەردا بـوو ڕێـم دەکـرد، ئەو سـەیارەش

شەش تەن بوو، دوای ئەوە سەیارەکە لە پێچ کردنەوەکەدا کێشای بە مندا، ئیتر ئاگـام لە هـیچ شـتێک نەمـا، هەسـتم کـرد دەرگـایەکم کـردۆتەوە و چـوومەتە ژوورێکـی تـر، چرکەساتی پیاکدادانەکە بەو جۆرە بوو.

دۆزەخ زۆر زۆر سەختە!

ئەو دۆزەخەی کە مـن بینـیم و، ئەوەنـدەی درکـم پـێ کـرد، زۆر سـەخت بـوو، حەقیقەتی ڕاستەقینەم بینی، هەر وەکو ئەوەی ئێمە بەیەکەوە دادەنیشتین.

ڕون بو بوو وەک خۆری بەر ئاسمان.

مـن خوێنـدەواریم زۆر نـیە، ڕەنـگە نەتـوانم مانـای تەواو بـدەم بە دەسـتەوە، بەڵام هەوڵی خۆم دەدەم، سەرەتای ئەزمـوونەکەم قـورس و نـاڕەحەت بـوو، سـەرەتاکەی کە ڕووداوەکە ڕووی دا، هێواش هێواش سەیری چوار لای خۆمم دەکرد هەتا حاڵی ببم.

خۆم بینیەوە لە دۆزەخدا بووم، وامـدەزانی تـازە لەدایـک بـووم، هـیچ شـتێکم بیـر نەمابوو، دۆزەخ زۆر سەخت بـوو، ئامـادەم لە فڕنەکـانی دونیـادا بمـکەن بە شیشـدا و بمسوتێنن، بەڵام ئەو دۆزەخەی بینیم نا، خـودایە هەرگیـز نەیبیـنم و نەچـمە نـاویەوە، ئومێد دەکەم کەسیش نەیبینێت، خـوا نەناسـی لە دونیـادا هەزاران دۆزەخـی لە خۆیـدا حەشارداوە، هەزار جـار بتکـوژن، هەزار جـار چـاوت بە زینـدوویی دەربێـنن باشـترە لەوەی لەم دونیادا خوات نەناسیبێت.

چەند ساڵێک بەسەر ئەم ئەزموونەدا تێپەڕیوە، حەزم نەدەکرد بۆ کەسی باس بکەم.

چونکە بە گشتی خەڵکی ئەم ئەزموونانەیان نەبیستوە و لێی حاڵی نین.

پیـاوێکی زۆر بە هەیـبەت و جـوان و گەورە ڕاوەسـتابوو لە شـوێنێکی ئێجگـار جواندا، من لە پشتەوە بینیم، ڕوخسـاریم نەبینـی، خـاوەنی جەلال و هەیبەتێکـی زۆر گەورە بوو، ئەو لەو شوێنە بوو سەیری منی نەدەکـرد، ئەو فەرامـۆش کـردنە لە هەزاران

دۆزەخ سەختربوو، دەمویست تەنها سەیرێکم بکات، بەڵام سەیری نەکردم. بەهەشت و دۆزەخ لەوێدا بەرجەستە دەبێت.

دەموت خودایە بمخەرە دۆزەخەوە، بەڵام ئەم زاتە عالی مەقامە سەیرێکم بکات.

پرسیارێک لە حاڵم بکات، ئەو لە شوێنێکی زۆر سەوز و پڕ درەخت و ڕووبار و دڵ ڕفێندابوو، هەنجیری زۆر جوانی لێ بوو، شوتیم بینی، سوێند بەخوا کە گەڕامەوە باوکم شوتی لەت دەکرد، باوکم وتی: ڕۆڵە ئا لەمە دەچوو؟

وتم: نەخێر هەرگیز لە وێنەی ئەوەی جەنەت لە دونیادا نیە، ئەگەر هەزار ساڵ بەسەر یەکەوە بە ڕۆژ و بیت و، یەک قاژ لەو شوتیە بخۆیت تینوێتی و ماندوێتی و برسێتی هەزار ساڵەت بیر دەباتەوە، چونکە من لەو شوتیەی ئەوێم خوارد و پێیان دام.

هەرگیز وەسف ناکرێت، فەرامۆشی ئەو دونیا زۆر زۆر سەختە.

پێش ئەزموونەکەم سەرو ڕیشم هەمووی ڕەش بوو، بەڵام هەمووی سپی بوو، بەهۆی ئەوزمەنەکەمەوە بوو.

تێر نەدەبووم لە بینینی جوانیەکانی ئەوێ.

بەهەشتی من لەو چرکە ساتەدا ئەوە بوو کە گوێم لە دەنگێکی زۆر ناوازە و جوان بوو، پرسیاری لە حاڵی من دەکرد، ئەو دیمەنە بهێنەرە پێش چاوانت کە تۆ لە شوێنێکدایت و کەس لێت ناپرسێتەوە، لە شوێنێکی ئاوا فەرامۆش کراودا بیت و هەواڵی تۆ بپرسێت، گرنگیت پێ بدات، دەنگێک بوو!

مۆڵەتی پێ دام و وتی: بگەڕێرەوە بۆ دونیا.

لە کاتی گەڕانەوەمدا، ئەو پیاوە زۆر جوانەی کە لەلای درەختەکەدا ڕاوەستابوو، هەستم کرد کە وەک پادشایەک بوو فەرمان بە وەزیرەکەی بکات و پێم بڵێت بگەڕێرەوە، ئەو دەنگە بوو پێی وتم: بگەڕێرەوە.

پێش ئەزمـوونەکەم زۆر پرسـیارم هەبـوو، کـاتێ لە یەکـێکم دەپرسـی ئەو وەڵامەی دەدامەوە کە منیش دەمزانی.

بۆ نموونە: ﴿اهدِنَـــا الصِّرَاطَ المُستَقِيمَ﴾ (الفاتحة: ٦)

ئەو مانایەیان پـێ دەوتـم کە خـۆم دەمزانـی، مـن تێـر نەدەبـوم لەو وەڵامە، خـوای پەروەردگـار بردمـی هەتـا لەوێ مانـاکەیم فێـر بکـات، هەتـا پـێم بڵێـت: ئەوەی تـۆ دەتەوێت بیزانیت ئەوەیە. چونکە کاتێ من لە نوێژدا دەگەیشـتمە قنـوت، حەزم دەکـرد ماناکەی بزانم.

لەو ئەزموونەدا ماناکەیم زانی.

ئەوەی شاراوە و نەزانراو بوو لە نوێژ و بوو بویە پرسـیاری مـن، خـوای باڵادەسـت وەک ئاوێنە هەموو ماناکـانی پیشـان دام، بینـیم کە دەبێـت چـی بکەیـن هەتـا بگەیـنە حەقیقەتی نوێژ.

نوێژ واتە پەیوەندی کردن بە خوداوە.

کە تۆ دە خولەکی تر دەچیت و دەخەویت، ئایا دەترسیت؟

نەخێر پشوو دەدەم! مردن لەوە ئاسانترە، لەبەر ئەوە مردن هیچ ترسێکی ناوێت.

## چێژ لە گوناه مەبینن



'هاشـم ئـوتکلی فراهـانی' سـاڵی (١٩٦٥)ی زاینـی لە دایـک بـووە و بەم جـۆرە ئەزموونەکەیمان بۆ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: هاوینی ساڵی (١٩٨٠) بوو، بیست و یەکـی ڕەمەزان بوو، تەمەنم نزیکی (١٥) ساڵان بوو.

لە لادێکەی ئێمە ڕۆژی (٢١)ی ڕەمەزان دەکەنە پشوو بە بە بۆنەی شەهید بوونی ئیمامی عەلیەوە 'خوای لێ ڕازی بێت'.

لە لادێکەمان 'ئورتکلی' ئەو یادانە بە گرنگیەوە دەپارێزن.

دایکم و باوکم شەوەکەی پێیان وتین: بەیانی پشووە و هەستن بۆ پارشێو هەتا بەیانی بەڕۆژوو بین.

وتمان: باشە.

پارشێومان کرد و بەڕۆژوو بووین.

دوای ئەوەی بۆ نیوەڕۆکەی لە کێڵگە گەڕاینەوە عادەتمان وابوو لەلای کانیەکی بچوکی نزیک ڕووبارەکە پشوومان دەدا، ئەو شوێنەش درەختی چڕی لێیە.

دوای ئەوە گوێم لێ بوو باوکم بانگی لێ کردم، یەک یەک براکانیشی بانگ دەکرد، لە باوکم نزیک بوومەوە.

وتم: بابە چیت دەوێت؟.

وتی: کوڕم مەڕ و بزنەکان لە دوێنێوە هێناوتن بۆ ئێرە، برسیانە و تینویانە، خوا قبوڵی ناکات بڕۆ بەلایانەوە و خەمێکیان بخۆ، بڕۆ بیانهێنە هەتا شوێنێکت پێ بڵێم کە لەوێ بیانلەوەڕێنیت.

وتم: باشە، بەڵام قورس بوو بەلامەوە، منالان لە ژێر درەختەکە کۆبووبوونەوە، حەزم نەدەکرد یاریەکە بەجێ بهێڵم و لە منالەکان دور بکەومەوە، بەڵام نەشمدەتوانی فەرمانی باوکم بشکێنم، ڕۆشتم و مەڕ و ماڵاتەکەم هێنا، باوکم لەلای ئاخرین دیواری دێکەمان چاوەڕوانی دەکردم، کە گەیشتمە لای بە یەکەوە ڕۆشتین، باوکم بردمی بۆلای ڕووبارەکە و سەوزاییەکی زۆریشی لێ بوو، لەو شوێنەش پەنا دیوارێکی لێ بوو، باوکم لە ژێر سێبەری دیوارەکەدا دانیشت، لە بەرامبەر سەوزاییەکە.

کە من گەیشتم پێکەوە مەڕ و ماڵاتەکەمان برد و ڕۆشتین.

سەرچاوەی ئاوێکی لێ بوو، باوکم وتی: با مەڕ و ماڵاتەکە لێرە بلەوەڕن، من دەڕۆم.

کە باوکم ڕۆشت من بە خەیاڵەوە سەرقاڵ بووم.

دەموت: خودایە مانگی ڕەمەزان هەتا ڕۆژی قیامەت فەرزە و دەبێت بگیرێت، چۆن دەتوانین؟!

لە ڕۆژوەکە پاداشتت داناوە و، لە نەگرتنی سزا!

هەندێک دەڵێن ئێمەی مرۆڤ خاوەنی گیانین و، هەندێکیش دەڵێن تەنها ئەم گۆشت و خوێنەین!

دوای مردن چیمان بەسەردێت؟

ئەم خەیاڵانە گوزەریان دەکرد بە هەست و دەرونمدا.

ئیتر بڕیارم دا، لە کانیەکە ئاو بخۆمەوە و ڕۆژوەکەم بشکێنم.

تەسلیمی وەسوەسەکانی شەیتان بووم و لاواز بووم، دەمم لە ئاوەکە نزیک خستەوە، گوێم لە بانگێکی نهێنی ناوەکی بوو پێی دەوتم: ئاوەکە مەخۆرەوە، ڕۆژوەکەت مەشکێنە، دەنگێک بوو بە ڕۆح گوێم لێی بوو، دوای ئەوە دڵنیابووم کە خوای گەورە دەمبینێت.

ئیتر ئاوەکەم نەخواردەوە و لە سەرچاوەی ئاوەکە دور کەوتمەوە.

دوای ئەوە نەمدەهێڵا مەڕ و ماڵاتەکە لە دەغڵ و دان و بێستانی خەڵکی نزیک ببنەوە، کە بە ڕێگاکەدا دەڕۆشتم هەست و نەستم سەرقاڵی ئەو دەنگە بوو کە پێی وتم: ڕۆژوەکەت مەشکێنە!

ئەو دەنگە لە کوێوە هات؟!

من سەرقاڵی ئەوە بووم و ڕێم دەکرد، جەستەی خۆمم بینی لەسەر زەویەکە کەوتبوو، ڕۆحم لە لاشەم جیا بۆوە.

من پەیوەندیم بە جەستەمەوە نەمابوو، کەچی پانزە ساڵی ژیانی ڕابردووم هەمـوویم لەبەردەمدا بوو!

هەستم کرد پەیوەنـدیم بە لەوەڕ و گژوگیـا و ناوچەکەمـانەوە نەمـاوە، ئیـتر حەزم لە مانەوە نەما، دەتوت ئەو شوێنەی کە تیاژیاوم دورخراوە بوم.

کاتی تر لە ئێوارانـدا حەزم دەکـرد زوو بگەڕێـمەوە بـۆ لادێکەمـان و بچـم بـۆلای هاوڕێکانم و یاری بکەم، کەچی ئێستا هیچ ویستی گەڕانەوەم نیە!

سەیرێکی ئاسمانم کرد، بیرم کەوتەوە کە شوێنێکی تر هەیە، کە پێشتر ئـێمە لەوێـوە هاتوین بۆ سەر زەوی.

ئەم لادێ و وڵات و سەرزەویە شوێنی ئێمە نیە!

دەمویست بڕۆمەوە بۆ نیشتمانی بنچینەیی خۆم!!

﴿كَيْفَ تَكْفُرُونَ بِٱللَّهِ وَكُنتُمْ أَمْوَٰتًا فَأَحْيَٰكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُـونَ﴾ (البقرة: ٢٨)

چوار قۆناغ...

چۆن بـاوەڕ بـو خـودا نـاهێنن، لە کاتێکـدا ڕابـردوو و داهاتوتـان لە دەسـتی حەق تعالادایە.

ئێوە لە ڕابـردوودا مردوویـوون، ئێـوە هەبـوون بەڵام مـردوو بـوون، لە دوای دونیـا دەمرن و دەگەنە قۆناغی بەرزەخ، زیندوو دەبنەوە و ئامادە دەکرێن بۆ قۆنـاغی قیـامەت و حەشر و ڕۆژی دوایی، ئیتر یان بۆ بەهەشت یاخود بۆ دۆزەخ 'خـوا پەنامـان بـدات' پێش دونیا ژیانی ڕۆح بەبێ جەستەیە، جەستە وەک مردوو ئاماژەی بۆ دەکرێت.

من سـەیری ئاسـمانم دەکـرد، دەمزانـی کە زۆر دورە، بەڵام هەیە و نزیـک دەبمەوە لێی، جیهـانێکی بەرفـراوانم لەپێشـە، ڕۆشـتم، زۆر بە خێرایـی دەڕۆشـتم، هەسـتم بە

بەختەوەریەکی زۆر زۆر دەکرد، دەتوت لە زیندانی هەتا هەتایی ڕزگارم بـووە، هەزاران جار لەو کەسە خۆشحاڵ تربوم کە لەسەر پەتی سێدارە دادەگیرێت و بەردەدرێت!!

کە دەڕۆیت کەس و کار و هەموو سەر زەوی فەرامۆش دەکەیت.

خۆشەویستی خوا و، جوانیەکانی ئەویێ دایانپۆشیم.

لەناکاو هەستم کرد خێراییەکەم کەم بـۆوە و ڕاوەسـتا، ڕۆشـتمە شـوێنێکی ئێجگـار جوان و دڵڕفێن.

زۆر سپی و ڕوناک و هێمن و جوان بوو، هیچ هەستێکی دڵگرانیم نەبوو.

لەو شـوێنەدا حەزێکـم هەبـوو، ئەویـش ئەوە بـوو کە خـۆزگە تەنهـا بە ڕۆح لێـرە نەدەبووم و خاوەنی جەستەیەکی وەك جەستەی دونیا دەبووم، خـورپەیەک گەیشـت بە دڵم، کە بچم بۆ شوێنێکی تر و لەیەک چرکەدا هەستم کرد جەسـتەیەکیان کـرد بە بەری ڕۆحمدا، بووم بە جەستە و ڕۆح!

بەڵام ئەو جەسـتەیە پێویسـتی بە جـل و بەرگ نەبـوو، واتە هەم جەسـتە بـوو، هەم بەرگ و پۆشاك بوو، زۆر جوان و فراوان و پڕ بە بەری خۆم بوو، زۆر باشـتر و نایـابتر و جوانتر بوو لە جەستە دونیاییەکەم، شیاونیە بەراوردی بکەم بە جەستەی دونیاییم!

دوای ئەوە سوپاس و ستایشی پەروەردگارم کرد لەسـەر ئەو هەمـووە نـیعمەتەی کە پێی داوم.

ئیلهامی ئەوە خرایە دڵمەوە کە لە ڕووگەی جیاواز بـۆ خـوا مەگەڕێ، خـوای گەورە لەگەڵ تۆیە لە هەموو شوێنێک.

ئیتر خۆم تەسـلیمی خـوای باڵادەسـت کـرد، زانـیم کە خـوای گەورە میهرەبـان و لەطیف و وەدودە و ئێمەی خۆش دەوێت.

هەموو ئەمانەم پێم وترا.

زۆربەی شتەکانی ئەوێم لەبیر برایەوە، لەوێ دڵنیا بووم کە خوای گەورە هەموو شتێک دەبینێت، هەموو شتێکی لەم گەردونەدا بە خۆشەویستیەوە فەراهەم هێناوە، مەخلوقاتی خۆی خۆش دەوێت، هەست و شعورێکی زۆر نایابی پێ بەخشی بووم، ئەوەش حاڵی بووم کە بوونمان لە دونیادا فەرمانێکی خواییە و پێویستە و خوا بێ ئاگا نیە لە هیچ شتێک.

بە بینینێکی زۆر جیاواز ڕاستی و ناوەڕۆکی دونیام بینی.

دوای ئەوە تێ گەیشتم کە دەبێت بگەڕێمەوە بۆ دونیا، ئەو جەستەیەی لەو دونیایە پێم بەخشرا، لێم سەندرایەوە و نەما.

لە دوایدا دەموت خۆزگە لای کەمیەکەی بیانهێڵایە بەو جەستەیەوە بگەڕامایەتەوە دونیا، بەڵام ئەوە تایبەت بوو بە داواکاریەکی ئەوێم! خوای گەورە بەلای منەوە گرنگ بوو، دور و نزیکی بە لای خوای گەورەوە نیە و، ئەو زاتە زۆر نزیکە بە هەموو شتێک.

گەڕێنرامەوە بۆ دونیای بچوکی و ناتەواوی.

ڕۆحی مرۆڤ نایەوێت لە دونیادا بمێنێتەوە.

بە خێرایی هێنرامەوە و، باوکمم لە ناو خەلەو خەرمانەکەدا بینی، لە دوایدا وتم: خودایە! من وام زانی چەندین ساڵم پێ چووە، کەچی هەمان سەعات و ڕۆژە کە من لە دونیا دەرچووم.

کە گەڕامەوە نزیکی جەستەکەم، دیسانەوە خۆم بینی یەوە کە جەستەکەم لەسەر زەویەکە ڕاکشابوو، چاووم کردەوە و زانیم کە مانگی پیرۆزی ڕەمەزانە، بەڵام بەهیچ جۆرێک قەناعەتی ئەوەم نەمابوو کە ڕۆژوەکەم بشکێنم.

ئەمجارەیان بە دڵنیاییەوە گەڕامەوە ماڵەوە، بەڵێ ڕۆح ڕاستەقینەیەکی حاشا هەڵنەگرە و هەیە، ئاخیرەت و قیامەت حەقیقەت و ڕاستەقینەیە، خوای گەورە هەموو

شتێک دەبینێت و تواناداره بەسەر هەموو شتێکدا و هیچ شتێکی لەدەست دەر ناچێت!! ئیتر دوای ئەوە گەڕامەوە بۆ ماڵەوە!

*ئەزموونی دووەمم: سوپاسی خوای گەورە دەکەم کە ئەزموونەکانم لەبیر نەچۆتەوە.

لە تاران بووم، لە مۆڵی 'بەهارستان' کارم دەکرد، بانگ کرام بۆ خزمەتی سەربازی، ماوەیەک خۆم شاردەوە و نەچووم بۆ خزمەتی سەربازی، هۆکارەکەشی ئەوە بوو کوڕە خاڵێکم لەسەرەتای شۆڕشی ئیسلامیەوە شەهیدبووبوو، بووبە غەم و پەژارەیەکی گەورە بۆ دایکم و نەخۆش کەوت، دەترسام شتێکم لێ بێت، لە کاتێکدا منداڵەکانی ورد بوون و پەرتەوازە دەبوون ئەگەر دایکم بمردایە، باوکم و دایکیشم زۆریان لێ نەکردم کە بچم بۆ خزمەتی سەربازی.

ڕۆشتم بۆ تاران هەتا بیانویەکی تەندروستی بدۆزمەوە و نەچم بۆ سەربازی، پزیشکی تایبەتی سەربازی پێی وتم: کاکە تۆ لە من تەندروستتریت، کاتێ هاتمە سەر شەقامە گشتیەکە لە تورەبوون و ڕق هەستانی خۆمدا خەریک بوو دەفتەر چەی خزمەتی سەربازیەکەم فڕێ بدەمە زێرابێکەوە، لەو کاتەی ویستم ئەو کارە بکەم و دەستم بەرز کردەوە، هەمان حاڵەتی ئەزموونی یەکەمم بۆ دروست بوویەوە "ئەو کاتەی ١٥ ساڵان بووم و بەڕۆژوو بووم".

هەستم کرد دەنگێکی نهێنی زۆر بە ڕوونی پێی وتم: فڕێی مەدە!

وتم: با بڕۆمەوە بۆ ماڵەوە بزانم چی بکەم!

چوومەوە ماڵەوە و دوای نان خواردن، دەستم کرد بە پاڕانەوە لە خوای گەورە: خودایە... من نازانم چی بکەم.

ئیتر دڵم یەک لا بۆوە کە بچم بۆ خزمەتی سەربازی.

باوکم وتی: کوڕم! تۆ خۆت بڕیاری خۆت بدە.

دەستم کرد بە پاڕانەوە لە خوای گەورە، نەمدەزانی لەو دوو ڕێگایە کامیان هەڵبژێرم، خودایە دڵم یەک لای بکەرەوە لەسەر ڕێگایەکیان!

لەو کاتی سەرسامی و حەیرانیەمدا دیسانەوە لە جەستەم چوومە دەرەوە، لەو چرکەیەدا دەست بەجێ هەستم بە پشوو ئارامی و ئاسوودەییەکی حەقیقی گەورە کرد، من کەمێک لەسەر زەویەکە بەرز بووبوومەوە، ئازاد بووم و قاچەکانم لە زەوی بڕابوون، دەمتوانی بڕۆم، بفڕم، هەستم کرد کە دەتوانم دەستەکانم بچن بە ناویەکدا 'واتە ڕۆح بووم' پڕ بووم لە نەرم و نیانی و بارسوکی.

هەستم کرد لەم جیهانە ڕاستەقینەدا دەتوانم زۆر باشتر بیر بکەمەوە، بە ڕوونی و بەبێ خەوش بیر دەکەیتەوە، دەبینیت، دەتوانی بە ئاسانی بچیتە ناو شوێنە تەنگەبەرەکان.

لەودیو دیوارەکەوەماڵێک هەبوو، یەکسەر چوومە حەوشەکەیانەوە، ژنی ماڵەکە پۆشاکی دەشۆرد. خێرا من وتم: اللە... اللە... بینیم ئەو من نابینێت و گوێی لە ئاگادار کردنەکەی من نەبوو.

هێشتا نەریتی جەستەیم بەجێ دەهێنا و تێکەڵم دەکرد!!

چونکە من هەژدە ساڵ لەو جەستەیەدا ژیاوم.

ئیتر وتم: پێویست ناکات من بە ناو ماڵەکاندا بگەڕێم مادام توانای هەموو شوێنێکم هەبێت، با بۆ سەرەوە بچم!! لە چرکەساتێکدا خێرا لە شوێنێکی زۆر دور خۆم بینیەوە ئەوەندە بەرز بوومەوە ماڵەکانم نەدەبینی، وتم: فڕین بەم جۆرە چەند جوانە!

چیا بەرزەکانی 'دەربەندم' بینی، وتم بزانم چەندەم پێ دەچێت هەتا بگەمە ئەوێ، کوت و پڕ لەوێ بووم. هەر کە ویستم گەیشتم.

وتـم: مـادام ئـاوا خێـرا دەڕۆم بـا سـەردانی بەرەکـانی جەنـگ بـکەم، بـزانم چـی ڕوودەدات!

دەشمزانی بۆ چ سنورێک بچم، واتە زۆر زانیاریم فراوان بوو.

ڕۆشتمە سنوری عێراق- ئێران، بە ئاسـانی لەو سـنورە بـووم، بە تەواوی چـاودێری ناوچەکەم دەکرد، چەند بەرزاییەکم بینـی، بینـیم کە لە پشـتی گردۆلکەکـانەوە سـوپای ئێران جێگیرن.

بینیم سەربازێکی ئێرانی ڕادەکات و دەیەوێت بگاتە ئەوبەر شوێنەکەی خـۆی! واتە: سـەربازەکە ڕۆشـتبویە سـنوری عێراقیەکـانەوە و کـاری هەواڵگـری دەکـرد، بەڵام کە ویستی بگەڕێتەوە بۆ ناو سوپای ئێران، عێراقیەکان بینیان، تەقەیەکی زۆریـان لـێ کـرد هەتا نەگاتەوە سەنگەرەکانی خۆیـان، برینـدار کـراو کەوتە سـەر زەویەکە و نەگەیشـتە شوێنی مەبەست.

من زۆر خەمباری بووم، لە تەنیشـتیەوە بـووم، واتە لە سـەرەوە هـاتمە خـوارەوە بـۆ لای سەربازە برینداره‌کە، ویسـتم هەڵـی بگـرم و بـیگەیەنمە نـاو سـوپای ئێـران، مـن دەمزانـی کە ئەو زەویە داگیـر کرابـوو لە لایەن سـوپای سـەدامەوە، لە زەوی ئـێمەدا تەقەیان لە سەربازەکانمان دەکرد.

زانیم کە من ڕۆحم و ناتوانم فریای بکەوم، چەند جارێک هەوڵم دا بێ سوود بـوو، ویسـتم چەکەکەی هەڵبگـرم و تەقە لە عێراقیەکـان بـکەم، ئەوەشـم نەتـوانی. چەنـد جارێک ویستم بە زلە لە سەربازە داگیرکەرە عێراقیەکان بـدەم سـوودی نەبـوو، دەسـتم بەر جەستەیان نەدەکەوت.

دوای ئەوە گەڕامەوە بـۆلای سـەربازەکە و هـیچم پـێ نەکـرا، وتـم: یـا صریـخ المستصرخين، ئەو سەربازەی تەقەیان لێ کردوە و کەوتوە، دایـک و بـاوک و خێزانـی هەیە، نازانن کە بەو جۆرە خەڵتانی خوێن بووە، منیش هیچم پێ ناکرێـت، چـی بـکەم خودایە؟!

وتم: نەخێر دەبێت بە جەستە و ڕۆح بێم بۆ ئێرە، چونکە بەتەنها ڕۆح سودێکی نیە بۆ ئەم گۆڕەپانی جەنگە!

له دوایدا وتم: باشە بۆچی من حەزم نەدەکرد بێم بۆ ئێرە؟!

ئەم سەربازە خەڵکی ئەم نیشتیمانەیە و، منیش بەهەمان جۆرم. ئەو هاتوە خۆی کردوە بە قوربانی، ئیتر بریارم دا بێم بۆ بەرەکانی جەنگ... با بەهەر نرخێکیش بێت.

دەبێت دایک و باوکی منیش ئارام بگرن وەک خەڵکی.

ئیتر دوای ئەوە نازانم ئەو سەربازە چی بەسەر هات.

گەڕامەوە ماڵەوە، دەبینم جەستەم وەک خۆیەتی و پاڵم بە دیوارێکەوە داوە، بینیم وەکو خۆیەتی، ویستم بگەڕێمەوە بۆ ناو جەستەکەم، بەڵام نەمتوانی، خاوەن ماڵەکە لەگەڵ ئافرەتێکی دراوسێشیاندا، لە ژێر سێبەری درەختەکەدا دانیشتبوون، ڕۆشتمە لایانەوە و بە دەنگی بەرز بانگم لێ دەکردن، بینیم نە دەمبینن و نە وتەی من دەبیستن.

وتم: جەستەم مردوە و ناتوانم زاڵ بم بەسەریدا، بریارم دا هەرچۆنێک بووە بچمەوە ناو جەستەکەم.

هەستم دەکرد ناتوانم ئەوە ئەنجام بدەم، وتم: ئێستا هاوڕێکانم دێن و دەبینن کە من مردوم، دەمبەن و دەمنێژن.

وتم: پێش ئەوەی بڕۆم، با بچم ماڵئاوایی لە جەستەکەم بکەم.

دەموت: چۆن ڕووم بێت بەم حاڵەی ئێستامەوە بچمە خزمەتی پەروەردگار!.

نزیک بوومەوە لە جەستەم هەتا ماڵئاوایی لێ بکەم، دەستم برد بۆ جەستەم، دەستم ڕۆشتە ناو جەستەمەوە، هەر کە وام کرد یەکسەر گەڕامەوە ناو جەستەکەم!

ئیتر بەوپەڕی قەناعەتەوە ڕۆشتم بۆ سەربازی و، بەرەکانی جەنگ.

ئێمە لە دونیادا توشی هەڵە دەبین، بەڵام با چێژ لە هەڵە نەبینین، ئەگەر خۆمان تەسلیمی خوا بکەین، خوای گەورە شیرینی خێر لە دڵماندا دەڕوێنێت، گوناه کردن لە نەخۆشی کۆرۆنا زۆر ترسناکترە!.

## ژیانی دونیا زۆر کورتە



'هودا موحەمەد زادە' تەمەنی (٢٨) ساڵە و، شووی کردووە و، شەهادەی 'لیسانسی هەیە لە ئەندازیاری کشتوکاڵی'دا.

دەڵێت : ساڵی (٢٠٠٦) بوو لە 'مەشهەد' بووم، کە ئەو کاتە تەمەنم (١٤) ساڵان بوو، کاتی سەعی و تاقیکردنەوەکان بوو، هەتا شەوانێکی درەنگ نەدەخەوتم، شەوێکیان لە ژووری نوستنی خۆم، بە ڕووناکیەکی کز، سەعیم دەکرد، چاوم لەسەر سەعاتەکە بوو چوار و چل و پێنج دەقەی بەیانی بوو، هەر ئەوەندەی سەرم خستە سەر پشتیەکە، ڕۆحم لە جەستەم جیابوویەوە و، لە بنمیچی ژورەکەدا بووم، جەستەی خۆمم دەبینی.

سەرەتا سەرسام نەبووم لەو حاڵەتەی بەسەرم هاتبوو، زانیم کە ئەوە جەستەی منە لە خوارەوەیە، بەدەر لە ماڵی خۆمان هەستم بە چەندین شوێنی جیاواز دەکرد، باوکم و دایکم خەوتبوون، خانووەکەمان دوو نهۆم بوو، هاتمە نهۆمی خوارەوە، دوای ئەوە سەرم بەزر کردەوە بۆ ئاسمان، ئاسمان ڕەش و بێ گەرد بوو!

دوای ئەوە هەمدیسان خۆم بینیەوە لەسەرو جەستەکەمەوە، ئەو کاتە ئیتر هەستم کرد کە من دەمرم، ئەو هەستە زۆر قورس و گران بوو بەلامەوە، دەترسام چونکە ئامادەی مردن نەبووم، چەند جارێک هەوڵمدا بگەڕێمەوە ناو جەستەکەم، بەڵام

سەرکەوتوو نەبووم، وام دەزانی کە دەتوانم خوشکەکانم و دایکم ئاگادار بکەم و، بە ئاگایان بێنمەوە لە خەوو، بزانن من چیم بەسەر هاتوە، بیرم لەوە دەکردەوە کە بەیانی هەڵدەستن و دەبینن من مردووم، زۆر خەمبار دەبن و ژیانیان تاڵ دەبێت، بەڵام نەتوانیم ئەوان خەبەردار بکەم و نە توانیشم بگەڕێمەوە ناو جەستەکەم.

وام دەزانی کە ئەگەر خوشکەکەم بێت و جەستەم بجوڵێنێت، دەگەڕێمەوە بۆ ژیان؟!

ڕووداوەکانی ژیانی خۆمم بینیەوە، بینیم و هەستیشم پێی کردەوە، هەستم کرد کە شەرمەزارم لە خزمەتی پەروەردگاردا، لە هەمان کاتیشدا هەستم بە ڕازی بوون و بەختەوەری دەکرد، دوای ئەوە هەستی تەسلیم بوونم بۆ دروست بوو.

دوای ئەوە خۆم لە سەوزاییەکی زۆر جواندا بینیەوە، سەرەتای ڕێگایەک بوو ڕاوەستابووم، ڕێگاکە کۆتایی نەبوو.

شوێنێکی زۆر زۆر جوان بوو، جوانیەکەی توشی سەرسامبونی کردم، درەختی زۆر گەورەی سەوز لە هەردوو لای ڕێگاکەدا بوو، زۆر ڕێک و جوان و سەوز بوون، جوانی و ئەندازەگیریەکەی جێگەی سەرنج بوو، هەرگیز لە دونیادا ئەو ڕێکخستنە ئەنجام نادرێت، لە یەک پلەی جێگیری ڕەنگدا بوو، واتە سەوزی کاڵ و تۆخ نەبوو!! ڕەنگەکە ئەوەی پیشان دەدا کە درەختەکان ژیانێکی گەش و ڕۆشنیان هەیە.

درەختەکان زۆر تەڕ و پاراو و نوێ بوون، دەتوت مانات پێ دەبەخشێت، بانگت دەکات.

سەختە بڵێیت دەدوێت و بانگت دەکات، بەڵام ئەوەی من بینیم، وانەبوو کە بڵێیت ئەم دارانە هەزاران ساڵ تەمەنیانە، دەتوت تازە سەوز بوون، ئەوەندە شەفاف و پڕ لە ژیان بوون.

زەمەن نیە، بەڵام زۆر لەوێ مامەوە، تێبینی ئەوەم نەکرد کە ئایا ڕووناکی لەوێ زیاد وکەم دەکات، یاخود نا!!

دەڵێی لەوێ ڕووناکی جێگیر و سابتە.

هەموو لایەک ڕووناک بوو، سەرچاوەیەکی نەبوو، هیچ ئازارێکی چاوی نەدەدا، ڕەنگی ئەو ڕووناکیە نە سپی بوو نە زەرد، ڕووناکی ئەوێ وەک ڕووناکی ئێرە نیە.

زۆر ئاگام لە خۆم بوو، دەمزانی بۆچی دایکم و باوکم لەگەڵ نیە، بەڵام لە هەمان کاتیشدا هەستم بە ئارامی و دڵنیایی دەکرد، دڵنیاییەک کە بە وشە ناوترێت.

لە خەڵوەتێکی بێ سنوردا بووم، کەسم نەبینی، بەڵام زۆر دڵئارام بووم، بە پێچەوانەی دونیاوە کە ئەگەر لە شوێنێکی بێ کەسدا بیت، تووشی دوودڵی و بێ تاقەتی دەبیت، شوێنەکە زۆر گەورە و بێ سنور و، ڕێگەکەش بێ کۆتایی بوو، هەردوو ڕێگەکەش درەختی زۆر گەورە و بەرز و ڕێکی لێ بوو.

کە گەیشتمە ئەو شوێنە زۆر جوان و دڵڕفێنە، قۆناغەکانی پێشوترم بیر چۆوە، کە بەسەریدا تێپەڕی بووم، واتە بیرم چۆوە کە پێشتر دەموت خودایە! داوات لێ دەکەم با نەمرم و، ئامادەی مردن نیم و دەمەوێت بگەڕێمەوە بۆ دونیا!

بیریشم چۆوە کە من مردووم!

لەو شوێنە پڕ لە خۆشی و ئارامیەدا، هەستم کرد کە پیاوێک مەودای مەترێک لە منەوە دورە، من نازانم کە ئایا پێشتریش هەر لەگەڵم بووە یاخود لەوێدا پەیدابوو؟!

ڕەنگە پێشتریش هەبوویێت، بەڵام شوێنەکە ئەوەندە سەرنج ڕاکێش بوو، ڕەنگە هیچ سەرنجم نەچوویێتە سەر ئەو پیاوە و بوونی لە نزیکی منەوە، کاتێ بینیم... وەستابوو پشتی لە منەوە بوو، پیاوێکی باڵا بەرز بوو، جل و بەرگێکی زۆر جوانی پۆشی بوو، قژی زۆر ڕەش بوو، دوای تۆزێک لای کردەوە بەلای ڕاستدا و سەیری کردم، کە

سەیری دەم و چاویم کرد، ئەو هەست و شعورە بەرزەی بۆ ئەو شوێنە هەمبوو سەدان جار زیادیان کرد، هەستی ئارامی و دامەزراویی و دڵخۆشی، سقە و متمانە، هەرچەندە ئەگەر تۆ کەسێکی نەناسراو لە شوێنێکی ئاوادا ببینیت هەست بە ترس و دڵەڕاوکێ دەکەیت، بەڵام نەخێر هەستم بە دڵئارامی یەکی زۆر گەورە دەکرد، دەم و چاو و ڕوخساری سپی بوو، چاوەکانی ڕەش و زۆر جوان بوون، ڕیشێکی درێژی هەبوو، جوانیەکەی هەڵقوڵاوی ڕوکەش و ناخی بوو، لەبەر ئەوە ناتوانرێت وێنەی لە دونیادا بکێشرێت، من ناوەوەیم بینی.

ئەو دڵنیاییەی لەوێ هەیە، لە ڕەگەزی دڵنیایی مناڵە بە دایک و باوکی، بەڵام زۆر زیاتر... وەک ئەوە بوو کە هەزاران ساڵ بێت تۆ ئەو بناسیت، نەک بەهۆی ئەو چرکەساتەی کە تۆ لەوێدا دەبینیت.

بەختەوەری لای من بەردەوامی هەبوو، هەتا پێی وتم با بڕۆین و ڕێمان کرد و پێکەوە قسەمان دەکرد، کە دەڕۆشتین ئەو لە پێشمەوە بوو، من ڕوخساریم نەدەبینی، بەبێ کەلام دەدواین، مانا دەگوازرایەوە، چونکە لێویم نەدەبینی بجوڵێت و لە پێشمەوە بوو، ئەو ڕێ ڕۆشتنەش بە ئیرادە و ویستی خۆم نەبوو، ڕۆشتن وەکو دونیا بە قاچ و هەنگاونان نیە من وام بینی، دەڵێی بەسەر شریتێکی جوڵاوی کارەبایدا دەڕۆیت 'وەک وەرزشی ڕێکردنی کارەبایی'، بەڵام زەوی و ڕاخەری ژێرپێ نەدەجوڵا، ئەو ڕێ کردن و ڕۆشتنە بەمانای بێ ڕێزی نواندن نەبوو، ڕاستە بە ئیرادەی خۆم نەبوو، دەجوڵام و ڕێم دەکرد، بەڵام بەزۆریش نەبوو، وەک ئەوە بوو کە بە ویستی خۆم بڕۆم، ئیتر لە شوێنێکدا بە شێوەیەکی خۆنەویستی وەستاین، یەکەم شتێک کە غەم و پەژارەی پێ دام ئەوەبوو کە بۆچی دوای ئەزموونەکە قسە و وت و وێژەکانم بیر نەمایەوە، چونکە هیچم بیر نەماوە.

کە ڕاوەستاین، لای کردەوە بەلای مندا و، داوای لێ کردم لەو پیلکانانە دابەزم کە لەلای ڕاستەوەیە، پێم وت: دەتوانم لەگەڵت بمێنمەوە،

وتـی: نەخێـر... هێشـتا کاتـت نەهـاتووە، هەر ئەوەنـدەی قـاچم خسـتە سـەر پیلکانەکان، بە خێراییەکی زۆر هاتمە خوارەوە و داخڵ بە جەستەی خـۆم بـوومەوە، بە فشـارێکی زۆرەوە کـرامەوە بە بەری جەسـتەمدا، زۆر بە خێرایـی بـوو، وەک ئەوەی نەهەنگێک بخەیتە تەرمۆزەیەکی بچوکەوە، چەندە گران و زەحـمەت و ئـازار بەخشـە، بەو جۆرە بوو...

کە دەگەڕێیتەوە زۆر بە خێرایی دەچیتەوە جەسـتەت، ئەگەر کـاتەکەی درێژخـایەن بێت، جەستە دەتەقێتەوە و پارچە پارچە دەبێت، چونکە پەستانەکە زۆر زۆرە.

کە هەستامەوە دەبینم کاتژمێر پێنجی بەیانیە، یەکەم هەناسە سوپاسی خـوام کـرد کە گەڕاومەتەوە بۆ دونیـا، گـوێم لە دەنگـی بـانگی بەیـانی بـوو لە مـزگەوتە نـزیکەکەی خۆمانەوە، تێگەیشتم و زانیم کە ئەزموونەکەم پانزە خولەکی پێ چووبوو، ئەو شـوێنەی کە پێی گەیشتم و بینیم، باوەڕم وایە کە ئێستا هەیە و دروست کراوە، زۆرم پـێ خۆشـە ئەو ئەزموونە دوبارە بکەمەوە و بیبینمەوە، واتە پێش مردن و کۆتا ڕۆژم.

یەکێک لەو ئومێدانەی کە منی بە دونیاوە بەستۆتەوە و حەزم دەکـرد بگەڕێـمەوە بـۆ دونیا ئەوەبوو کە هەندێکم مابوو قورئان بە حفظ و لەبەر کـردن تەواو بـکەم، سـوپاس بۆ خوا دەسـتم پـێ کردبـوو، زۆربەیـم لەبەر بـوو، بەڵام تەواوم نەکردبـوو، وا دەزانـم باشترین کارێک کە لە دونیادا کردبێتم ئەم کارەبووە.

پـانزە سـاڵ بەسـەر ئازموونەکەمـدا تێپەڕیـوە و هیچـیم بیـر نەچـۆتەوە، چـونکە ئەزموونێکی ڕاستەقینە و واقعی بـوو، هەرگیـزا و هەرگیـز ئەم ئەزموونـانە خەون نـین، ڕاستەقینەیەکی زیاترە لەم دونیا واقعیەی خۆمان، ناو جەرگەی حەقیقەتن.

هەموو وردەکاریەکانیم لەبیرە بەبێ ئەوەی پێویستی کردبێت بینوسـمەوە، ئەگەر ئەم ئەزموونـانە لە هـزر و مێشـکدا بـوایە بە بێگومـان بیـرم دەچـوویەوە، بەلای کەمەوە وردەکاریەکانیم بیر نەدەما.... بەڵام دەڵێی ئەو چرکە ساتەیە کە ئەزموونەکەم کردوە.

ئەمە یەکێکە لەو هۆکارانەی کە دەیچەسپێنێت ئەم ئەزموونانە خەون نین، حەقیقەتن.

ژیان زۆر کورتە.... لە ڕووی چەندێتی و چۆنێتییەوە، تەمەن زۆر بە خێرایی دەڕوات، ژیانت بە هەزر بەبەرە سەر و بەردەوام بە لەسەری، بەڵام دوارۆژ و قیامەت گەورەترینەکەیە کە چاوەڕوانی دەکەین.

## لە جیهانی بەرزەخ بێ تاقەتی و بێزاربوون نیە

مصطفی سرأفرازی، خەڵکی وڵاتی ئێرانە و لە شاری 'دیزفول' ژیان بەسەر دەبات، ئەزموونەکەیمان بۆ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: پێش چەندساڵێک لەمەوبەر، میوانێکمان هات لە شاری 'شیراز'ەوە پێش ئەوەی کارە تیرۆستیەکەی بەردەم 'نمایشی سەربازی' شاری ئەهواز ڕوویدات، میوانێکی بەڕێز و خۆشەویست بوو، بەباوکم و دایکم وت: دەمەوێت داوەتێکی ئێوارانی بکەم لە دەرەوەی ماڵ، ڕۆشتین بۆ باخی یەکێک لە هاوڕێکانم، کە شەو گەڕاینەوە بۆ ماڵەوە، پێنج ئۆتۆمبیل بووین، براکەم داوای لێ کردم کە لەگەڵ ئۆتۆمبیلەکەی من سەربکەوێت، من ڕازی نەبووم، ئۆتۆمبیلەکە من و خێزانەکەمی تیابووین، دەتوت ئیلهامی ئەوە خراوەتە دڵمەوە کە با بەتەنها خۆم بم، بە براکەم وت: بڕۆ لەگەڵ دایکم و باوکم سەربکەوە.

من کۆتا کەس بووم کە لە باخەکە هاتمە دەرەوە و کلۆمی دەرگای باخەکەم داخست، گەڕاینەوە بۆ 'دیزفول'.

پێشی ئۆتۆمبیلێك کەوتم، ئیتر لەو کاتەدا لە دەستم وەری گرت، زۆر خێرابووم و گەیشتبوومە پێچێک، هەر ئەوەندەم بیرە سێ جار بانگم کرد ئەعزەم.... ئەعزەم.... ئەعزەم.... ئەعزەم ناوی ژنەکەم بوو.

دوای ئەوە ئیتر خۆم لە جیهانێکی تردا بینیەوە.

هەستم بە ئازاری بریندار بـوون و پێکـدادانەکە نەکـرد، یەکەم شـت کە بینـیم کـچە مامێکم بوو، سڵاوی لێ کردم و وتی: مصطفی تۆ چی دەکەیت لێرە؟

وتم: بۆچی ئێرە شوێنێکی خراپە؟!

کچە مامەکەم چەند ساڵێک لەوەو پێش کۆچی دوایی کردبوو.

وتی: نا ئێرە زۆر جوان و خۆشە.

بەڵام تۆ لێرە چی دەکەیت؟

وتم: نازانم بۆچی لێرەم!

نەمدەزانی ڕووداوم بەسەر هاتووە.

کوڕی ئەو ئامۆزایەشم زۆر هاوڕێم بوو.. ئەویـش کـۆچی دوایـی کـردوە، ئەویـش بەهەمان شێوە هاتوو وتی:

مصطفی تۆ چی دەکەیت لێرە؟!

وتم: ڕەزا منیش نازانم چی دەکەم لێرە!

هەموویان هەمان شتیان لێ دەپرسیم.

نەمـدەزانی لە کـوێم، بەڵام زۆرم پـێ خـۆش بـوو، دڵخـۆش بـووم بەو شـوێن و حاڵەتەی خۆم، بیرم لە هیچ شتێکی تر نەدەکردەوە.

بۆ نموونە: وەک ئەوەی ئێستا کاتی ئێوارەیە و با نان بخۆین!!

نەمبینی شەو دابێت!

بەردەوام ڕۆژ و ڕووناک بوو، بۆ نمونە مـن (٣٥- ٤٠) ڕۆژ لە بـێ هۆشـیدا بـووم، پزیشک پێی وتم:

سەید ئەفرازی لە زووەوە بێ هۆشیت و خەوتویت.

وتم: ڕەنگە دوو کاتژمێرێك بێت!

چونکە لەوێ کات و زەمان نیە.

ژنێکی ترم بینی، بەڵام نەمناسی، پێی وتم: تۆ مصطفی نیت؟

وتم: بەڵێ.

وتی: لێرە کێشەیەکت هەیە؟

وتم: من لێرە هیچ کێشەیەکم نیە، بەڵام نازانم بۆ کوێ بچم!

پێی وتم: ئەگەر کێشەیەکت هەبوو، پێم بڵێ!

وتم: باشە، بەڵام دەکرێ پێم بڵێیت کە تۆ کێیت؟

وتی: من دایکی ئامۆژنتم!

'ئامۆژنی تەمەنی هەیە و دەڵێت': کە مصطفی چاک بۆوە وتی: ئامۆژن من دایکتم لەوێ بینی، وتم: مصطفی تۆ دایکمت نەبینیوە.

کاتێ تۆ لەدایک بوویت ئەو کۆچی دوایی کردبوو!

وتی: چۆن زانیت ئەوە دایکی منە؟

مصطفی وتی: خۆی پێی وتم: من دایکی ئامۆژنتم، ژنی مامەکەت.

وتم: بە چ شتێکدا بزانم بەو جۆرەیە و ئەوە دایکم بووە!؟

مصطفی وتی: هەر ئەو شەوە هاتوەتە خەوی تۆ.

وتم: مصطفی ڕاست دەکەیت، ڕۆشتم بۆ سەر گۆڕی دایکم و نزای زۆرم بۆ تۆ کرد کە خوای گەورە شیفات بدات و ڕزگارت ببێت. دوعای دایک و باوکیش گیرایە.

ڕۆشتمە سەر گۆڕی دایکم و وتم: دایە دووعای خێر بۆ مصطفی بکە بەڵکو ئەم جارەش بگەڕێتەوە.

مصطفى دەڵێت: من هەرگیز دایکی ئامۆژنم نەبینیوە، باوکیشم نەیبینیوە، تەنها مامە مالیکم بینیویەتی.

فریشـــتەکان زۆرن لە دونیـــادا، هەر ئەوەنـــدەی دەمـــوت ئەریَ فریشـــتەی خـــودا، وەڵامیان دەدامەوە.

دوای ئەوە پێیان وتم: دەبێت کردەوەکانت کێشانە بکەین!!

بردمیان بۆ شوێنێکی زۆر جوان، پێیان وتم: ئەم جیهانی بەرزەخە، منیش پێم وتـن: ئەم شوێنەم زۆر خۆش دەوێت، وتیان: ڕاست دەکەیت.

مێرگ و هەوارێکی سەوزی زۆر جوان بوو.

پێیان وتم: هیچ کەس لێرە نـامێنێتەوە، دوای ئێـرە دەبرێـت بـۆ بەهەشـت، یـاخود دۆزەخ.

کێشانەیەکی دوولا هەبوو، دەستیان کرد بە کێشانەی کردەوەکانم، یەکێک بـۆ چـاکە و ئەوی تر بۆ خراپە، چاکەکانم تۆزێک لە خراپەکانم زیاتر بوون،

یەکەمین شتێک نوێژ بوو.

من خۆم بینیم کە نوسرابوو: نوێژ لە کردەوە زۆر باشەکانە.

'الحمدلله' تای تـرازووی چاکەکـانم قورسـتر بـوون، کەسـێ کـرداری بـاش بێـت شێوازی قسە لەگەڵ کردنـی جیـاوازە، ئەگەر یەکێـک خـراپ بێـت، ئەوە زۆر خـراپ مامەڵەی لەگەڵ دەکەن.

وتیان: فەرموو بەرەو بەهەشت برۆ، ویستیان ئەو جیهانی بەهەشـتەم پیشـان بـدەن، هەروەها دۆزەخیش، جیهانی بەرزەخیش.

کە ڕۆشتم بەرەو بەهەشت، زۆر جوان بوو.

درەختەکانی زۆر گەورە بوون، هەمووی سەوز بوون.

وتم: به ڕەزا 'كە لەوێ بوو': ڕەزا ئایا مرۆڤ توشی بێزاری و بێ تاقەت بوون دەبێت، لە زۆر دانیشتن و مانەوەی هەتا هەتایی ئێرەی بەهەشت؟! "ڕەزا لەگەڵ ژمارەیەک لە خەڵکی بەهەشت پێکەوە دانیشتبوون".

وتی: لەوەتەی تۆ هاتویت، ئایا توشی بێ تاقەتی و بێزار بوون بوویت؟

وتم: نەخێر... هەرگیز.

وتی: بێزاری و بێتاقەتی بوون و دووبارە بوونەوە لێرە نیە!!

مرۆڤ هەمیشە لێرە سەرقاڵی نیعمەت و خۆشیەكانە.

سەردانی یەكتر دەكەین و گەشتی زۆر ناوازە پێكەوە دەكەین، هەرگیز وەڕەس بوون نیە، بەهەشت زۆر جوانە.

لە بەهەشت چیا و گردۆلكە و شوێنی زۆر دڵڕفێنی لێیە، خەڵكی تیایاندا دادەنیشن و شۆخی و قسەی خۆش دەكەن.

كۆمەڵ كۆمەڵ خەڵكی جیاوازم دەبینی پێكەوە بوون، جۆگەلە و ڕووبار بە تەنیشتیاندا دەڕۆشت، ئاوێكی شیرینی زوڵاڵ و ڕوون و جوان بوو بینیم.

لە چوار لاش چیا و شاخی زۆر جوان بوو، زۆر بەرز و گەورە بوون، نەمدەبینی بڵێن با بچین بۆ چیاكان، هەرگیز بێزاربوون و بێ ئومێدیەک كە لە دونیادا هەیە لەوێ نیە، خەسڵەتەكانی مرۆڤ لەوێ خەسڵەتی دونیایی نین.

مرۆڤ لەوێ نەخۆشی دەروونی و خەم و خەفەت و دوو دڵی و بێزاری نیە، تەنها تۆ بیر لە خۆت و خۆشیەكانی خۆت دەكەیتەوە، لە غەم و پەژارە دەڕەخسێیت، دەڵێیت كاشكی لە دونیادا هەموو كردەوەكانم چاكەبوونایە.

'خێزانەكەی دەڵێت': (٦/٣١) یادی سوپایە لە ئێران، نمایشێكی سوپا هەبوو لە شاری ئەهواز، یەكێک لە بەشداربوانی ئەو نمایشە كەسێک بوو بەناوی 'حسین ولایەتی'، لەو كردە تیرۆرستیەدا شەهید بوو، من نەمزانی بوو، ئەو كەسەم نەدەناسی،

لەو ڕۆژانەی کە ئەو نمایشە هەبوو، من و هێوەر ژنەکەم دەچووین بۆ نەخۆشخانە و دەگەڕاینەوە، چونکە مێردەکەم بێ هۆش بوو.

هەندێ جار بە ڕۆژدا دەڕۆشتین و هەندێ جاریش بەشەودا.

کاتێک گەڕاینەوە بۆ ماڵەوە ژنێک پەیوەندی کرد بە هێوەر ژنەکەمەوە، ژمارەکەش نەناسراو بوو بەڵام هەڵی گرت، وتی: من پوری 'حسین ولایەتی'م، حسین ولایەتیش لەو ماوەیەدا شەهید بوو بوو کە مصطفی بێ هۆش بوو لە بەشی چاودێری چڕ (١٢٤).

وتی: من پوری 'حسین' م، لە دراوسێکانم بیستوە کە کوڕەکەتان توشی ڕووداو هاتوە، منیش زۆرم پێ ناخۆش بووە، لەبەر ئەوە داواتان لێ دەکەم خێری بۆ بکەن، با دایکی یاخود خوشکەکەی دوعا و موناجات و قورئانی زۆری بۆ بخوێنن، با لە دڵەوە بۆی بخوێنن.

وتمان: باشە بەو جۆرە دەکەین، من و دایکی مصطفی جێ بەجێ مان کرد.

هەروەها وتی: پێشنیاری ئەوەتان بۆ دەکەم کە بچن بۆ سەر گۆڕی شەهید 'حسین ویلایەتی'.

وتم: باشە دەچین، سەعات نۆ و نیوی شەو بوو ڕۆشتین بۆ نەخۆشخانە، ڕۆشتین بۆ سەر گۆڕی حسین ولایەتی و دۆزیمانەوە، دە ڕۆژ بوو کۆچی کردبوو، دایکی حسین هەموو شەوێک دەچووە سەر گۆڕەکەی، سەلاممان لە دایکی کرد و پێم وت: من مێردەکەم بێ هۆشە و حاڵی باش نیە، داوات لێ دەکەم نزامان بۆ بکە بەڵکو خوای گەورە هاوسەرەکەم پێ بداتەوە.

مصطفی دەڵێت: من لەو جیهانەدا بووم، کەسێک هات بۆلام و پێی وتم: تۆ مصطفی سرأفراز نیت؟

وتم: بەڵێ ئەوم.

وتی: چی دەکەیت لێرە؟

وتم: نازانم، بەڵام ئەی تۆ چی دەکەیت لێرە؟

تۆ کێیت هاتویت و پرسیار لە من دەکەیت؟

وتی: من ناوم 'حسین ولایەتی'یە.

گوللەیەك لێی دام و شەهید بووم، بەڵام تۆ کاتت نەهاتووە، نابێت لێرە بیت.

وتم: بەڕێز ویلایەتی من نازانم دەبێ لە کوێ بم!! کۆمەکیەکم بکە.

وتی: پێویستە تۆ بگەڕێیتەوە بۆ دونیا.

کاتت ماوە لە دونیادا، دەبێت تەواوی بکەیت، دوای ئەوە چاوەکانم کردەوە و گەڕامەوە بۆ دونیا.

'ژنەکەی مصطفی دەڵێت': مصطفی پێی وتین کەسێک لەوێ یارمەتی دام و پێی وتم دەبێت بگەڕێیتەوە بۆ دونیا، منیش لە مۆبایلەکەدا ڕەسمی حسین ولایەتیم گرتبوو پیشانم دا وتم: مصطفی ئەم وێنەیە دەناسیت؟

وتی: بەڵێ ئەوە حسین ولایەتیە کە یارمەتی منی داو وتی: تۆ کاتت ماوە دەبێت بگەڕێیتەوە، دەڵێت: دوای ئەوەی گەڕامەوە و چاک بوومەوە، ڕۆشتم بۆ ناوچەی 'شەهید ئاباد'، هەتا سەردانی گۆڕی 'حسین ولایەتی' بکەم، هەرچی کاتێک دەدەم بەلای ئەو گۆڕستانەدا فاتحە بۆ ڕوحیانەتی شەهید ولایەتی دەنێرم، ڕۆشتم بۆ سەر گۆڕەکەی و فاتحەم بۆ خوێند و بە دایکی حسین ولایەتیم وت: من چاوم بە کوڕەکەت کەوت، کۆتا کەسی دونیاش، کە حسین ولایەتی بینیبێت من بووم و داوای یارمەتیم لێ کرد یارمەتی دام. ....

# نوێژ گەورەترین دەسمایەی قیامەتە



'نەقی دڵدار' لە پارێزگای گەیلانە و لە شاری 'لنگرود'، لە دێیەک بە ناوی 'پایکیادە' نیشتەجێیە و ئەزموونی نزیکبوونەوە لە مردنی بینی وە و دەڵێت: من لەسەر کردایەتی سوپای شۆڕش زیاتر لە بیست و پێنج ساڵ کارم کردوە.

هاوڕێیەکم هەبوو لە لادێکەی خۆمان کە ناوی 'سید هادی مەهدەوی' بوو، ساڵی (١٩٨٣)بوو هاوڕێیەکی زۆر نزیکم بوو، هەمیشە پێکەوە بووین، وەختێ ئەو ڕۆشت بۆ بەرەکانی جەنگ، هێشتا من دەمخوێند، ئەو تەمەنی پانزە ساڵان بوو ڕۆشتە بەرەکانی جەنگی سەدام، ئەوە بوو لەوێ شەهید بوو، من زۆر خەمباری بووم، پێداگریم کرد و بە ماڵی باوکمم وت دەبێت بچم بۆ بەرەکانی جەنگ و بە خۆبەخشی بڕۆم، بەڵام ڕازی نەبوون.

من زۆر سور بووم لەسەر قەناعەتی خۆم.

ئیتر ڕازی بوون و منیش ڕۆشتم، عەهد و پەیمانم بەخوای خۆم دا، هەتا جەنگ تەواو نەبێت من نەگەڕێمەوە، یاخود لەو ڕێگەیەدا شەهید ببم.

قسەم لەگەڵ هەندێ لە هاوڕێکانم کرد وتیان: تۆ هێشتا تەمەنت کەمە و وەرناگیرێت لە خۆبەخشی، باوکیشم جارێکی تر پێداگری کردەوە کە برایەکت لەوێیە و نابێت تۆ بڕۆیت!

بەڵام من لە ساڵی (١٩٨٢) ڕۆشتم و ناوی خۆمم نوسی، داوای ڕازی بوونی دایک و باوکیان لێ کردم.

ڕۆشتم زۆر پاڕامەوە لە دایکم کە بەڵکو باوکم ڕازی بکات!

باش بوو لە ڕێگەی دایکمەوە باوکم ڕازی بوو.

ڕۆشتم بۆ بەرەکانی جەنگ، چوومە ناو هێزی بەسیجی شاری 'لنگرود' لە سەربازگەی شاری 'مەنجیل' لە 'گەیلان' دەستم بەمەشق کردن کرد.

چل و پێنج ڕۆژ لە ڕاهێنان و مەشق بەشداریم کرد، لە دوایدا ناردینیان بۆ شاری 'ڕامسەر' و کراین بە بەش بەش و بەسەر فەوجەکاندا دابەش کراین، من نێردرام بۆ شاری 'مەریوان'، لە مەریوان ڕۆشتمە دەورەیەکی ترەوە لە فەوجی 'جندالله'دا، مەشقم لەسەر ڕەسەد و چاودێری کرد و چەند ڕۆژێک مەشقەکە بەردەوام بوو، لە دوای ئەوە دابەش کراین بەسەر سنور و چیاکانی سنوری مەریواندا، کە ئەوکاتە بەعسیەکان داگیریان کردبوو.

سەرەی من بوو هەتا چاودێری ناوچەی 'دزلی' بکەم بەسەر چیای بەرزی سنوری 'تەتە'وە بووم، کە پێیان دەوت لوتکەی 'ڕیسالەت'.

کە خۆر ئاوابوو من ڕۆشتم بۆ نۆبەی چاودێری خۆم، لوتکەی چیایەک هەبوو پێیان دەوت لوتکەی 'ئەبوزەڕ' دوژمن هەمیشە ئەو لوتکەیان دەکردە نیشانە و گولەبارانیان دەکرد، من ئامێرێکی پەیوەندیم پێ بوو، بۆ چاودێری هەڵم گرتبوو، کە ئارێلەکەیم بەرز کردەوە، سەربازەکانی بەعس هەستیان پێ کرد، کە کەسێک چاودێریان دەکات، ئیتر ئەو لوتکەیەیان کردە ئامانجیان، گوێم لە دەنگی گولە تۆپێکەوە بوو، منیش لەبەر خۆپارێزی دوربین و ئامێرەکەمم نزم کردەوە بۆ زەویەکە هەتا چەواشەیان بکەم، دوای ئەوە گوێم لە دەنگێکی ترسناك بوو لە نزیکی خۆمەوە، چەند مەترێک لە منەوە دوربوو، ئەوەندە بەهێز بوو منی فڕێ دایە دەرەوە و لەسەر بەفرەکە سەربەرەو خوار کەوتمە خوارەوە.

دەڵێن ئەو لوتکەیە (١٥٠٠) مەتر بەرزە، من تلۆر بوومەوە بۆ خوارەوە، هەموو ئەو نێوەندەش بەفربوو، هەر یەکێکیان کە منی بینی بوو، چاوەڕوانی ئەوەیان نەبوو کە لە ژیاندا مابێتم!

وتبویان: تازە مردوە!

بڕیاریان دابوو بەدوای لاشەکەمدا بگەڕێین، لەبەر ئەوەی شەو داهـاتبوو، ئیـتر بـێ ئومێد بووبوون لە دۆزینەوەم و گەڕابـوونەوە بـۆ سـەرەوە، لە سـەعات نـۆی بەیـانیەوە 'ڕۆژی دواتر' گەڕابوون، شوێنەکەش سەخت و شوێن پێـی کەم بـوو، لێـژ و سـەخت بوو، بە چەند کۆمەڵێکی جیاواز گەڕابوون هەتا دۆزیبومیانەوە، حەڤدە کـاتژمێر لە ژێـر بەفردا بووم!

بە ئەمبولانس برابووم بۆ نەخۆشخانە، دوایی بۆیان گێـڕامەوە کە فاتحەیـان لەسـەر خوێندبووم و ئومێدیان بە ژیانم نەمابوو!.

هەسـتیان بە لێـدانی دڵـم نەکردبـوو، بە ئیسـعاف برابـوم بـۆ تـاران، هەنـدێک لە هاوڕێکانم وتبویان تەواو بووە و مردوە، هەندێکیش لە تاقمی ئامبولانسەکە وتبویـان بە ناونیشانی بریندارێك دەیبەین کە دڵی بەستویەتی!

پەرستیارەکان لیستەکەیان خوێندبۆوە، پێیان وتبون بیبەن بۆ چاودێری ورد (١٢٤).

پزیشکەکان پشکنینیان بۆ کردبووین، بە یەکێکیان وتبـوو ئەمەیـان ببـەن بـۆ بەشـی شکاوی، ئەوە بۆ پزیشکی چاو، ئەمانەش ببەن بۆ ساردکەرەوەی مردوەکان.

ئەو پەرستیارە لەو کاتەدا لەوێ نەبوو بـوو کە منیـان تەسـلیمی کردبـوو بـۆ (١٢٤) نەک بۆ مەیتخانە.

ئیتر لە سەرقاڵیان و زۆری مردوو بریندارەکان منیشیان بردبوو بۆ تەرمگا!

بـۆ ڕۆژی دواتـر شـەهیدەکانیان تەسـلیمی کەس و کاریـان دەکـردەوە، چـونکە شەهیدەکان زۆر بوون!

دوای ئەوان ژمارەیەکی تریـان دەهێنـا بـۆ سـاردکەرەوەکان کە ویستبوویان ئێمە لە تەرمگا دەرکەن بۆلای کەس و کار، سەیری لیستەکەیان کردبـوو، نـاوی منـی تیـانەبوو بوو، ئەو پەرستیارە گەڕابوو، دەبینێت ئەو ژمارەیەی کە لە ملـی دابـوو هـی ئەوە نەبـوو کە مردووە!

وتبووی کێ ئەم کەسەی هێناوە بۆ مەیتخانە؟!

بە هەڵە هێناوتانە، دەبوو ئەم بریندارە ببەن بۆ (١٢٤)؟!

وتبووی: ئەم بریندارە دڵی بەستویەتی و لە لیستی زیندواندایە نەک مردوەکان؟!

وتبویان: باشە تەرمەکانی تر تەسلیم بکەنەوە بە کەس و کاریـان و ئەمەیـان بـبەنەوە بۆ (١٢٤)!

بەڵام ئومێدیان پێم نەبوو بوو، چونکە هیچ نیشانەیەکی ژیانم تیا نەبوو بوو!

تەنها بۆ بەڕێ کردنی کاری ئیداری خۆیان و، بـۆ ئەوەی بەرپرسـیار نەبـن منیـان بردبوویەوە بۆ (١٢٤).

پزیشکەکان بە نائومێدیەوە ئۆکسجینیان بـۆ دانـابوومەوە و دوای چەنـد سـەعاتێک هەناسەم بۆ گەڕابوویەوە!

دوای ئەو ڕۆژە هەشت ڕۆژی تر من بە تەواوی بێ هۆش بووم.

دوای ئەوە هۆشم هاتبوویەوە و گەڕابوومەوە دونیا.

بە پەرستیارەکەم وت: من چی دەکەم لێرە؟

وتی: تۆ لە نەخۆشخانەیت!

ویستم هەستمەوە، بەڵام نەمتوانی!!

لەسـەر لا سـەیری ئـاوێنەم کـرد، ئینجـا زانـیم مـن لە بەرەکـانی جەنـگ نـیم و لە نەخۆشخانەم.

ڕوخسارم هەمووی سوتابوو بە گڕی تۆپەکە و لەبەر ئەوەی هەمـوو گیـانم برینـدار بوو، جەستەم پێچرابوو. دووشت لە مندا ڕوویاندا.

یەکەم: کاتێ لە چیاکە کەوتمە خوارەوە بە برینـداری، شـوێنی زۆرم بینـی، شـوێنی زۆر سەوزی جوانم بینی، کە هەرگیز وێنەیم لە ژیانمدا نەبینیوە، لە دوای ئەوە خـۆم لە ناو خەڵکانێکدا بینییەوە، کە لە ناوچەیەکی شاخاوی سەوزەڵانی زۆر جواندا بوون.

ناوچەکانی  ئێمە لە گەیلان و مازندەران، لە هەموو ئێراندا وەک نموونەی جوانی و سەوزایی و ناوچەی دڵڕفێن دەهێنرێتەوە، بەڵام ئەوەی کە من بینیم لە هیچ شوێنێکی سەر زەویدا جوانی ئاوا نەبینراوە، ناتوانین کێ بەرکێی پێ بکەین لەگەڵ شوێنە جوانەکانی دونیادا، بەبێ سنور جوان بوو.

هەموو ناوچە و شار و شاخ و کەنار دەریاکانی ئێمە لە شیمالی ئێران، دڵۆپێک جوانی نیە لە بەرامبەر ئەوەی کە من  بینیم، لە جوانیەکانی بەهەشت.

خۆم لەناو ڕیزێکی فراوانی خەڵکدا بینیوە، ڕیزێک خەڵکی بێ سنور ڕاوەستابوون.

ئەو خەڵکەشم وا بینی کە ساڵەهای ساڵە دەیانناسم. بەڵام نەمدەزانی لە کوێوە دەیانناسم.

باوەشیان پیا دەکردم، بەخێر هاتنیان دەکردم، زۆر بە نەرم و نیانی لەگەڵم دەدوان، دەیانبردم بۆ شوێنی زۆر جوان.

دەتوت هەموویان خزم و هاورێ و ئازیزی منن.

منیش لە ناویاندا زۆر دڵخۆش بووم، کاتێکم زانی هاوڕێیەکی خۆشەویستم هات، ئەویش شەهید هادی مهدوی بوو، زۆر جوان و دڵخۆش و بەختەوەر بوو.

زۆر بە موحیبەت و دڵخۆشیەوە مامەڵەی لەگەڵ کردم.

وتی: عەزیزم کاکە نەقی، تۆ دەبێت بگەڕێیتەوە!

منیش بێ تاقەت بووم و وتم: هادی بۆچی دەبێت بگەڕێمەوە!

وتی: کاتت نەهاتوە، دەبێت بگەڕێیتەوە.

ئیتر دوای ئەو وتووێژە خێرا گەڕێنرامەوە و دەبینم لە ساردکەرەوەی مردوەکاندام.

کاتێکیش کە برام بۆ ساردکەرەوەی مردوەکان چاوم لێ بوو، 'بەڕۆح' ئاگام لە قسە و باسەکانیان بوو، بانگم کردن و پێم وتن: بۆ کوێم دەبەن، مەمبەن بۆ ساردکەرەوەی مردوەکان من نەمردوم، بەڵام هیچ کەسێک منی نەبینی و گوێی لە هاوارم نەبوو!

منیان پێچابوو بە نایلۆنێکی ئەستورەوە و خۆم و خەڵکەکەشم دەبینی!

دەمەوێت ئەزموونەکەم لە چەند ڕستەکەیدا کۆبکەمەوە:

نوێژ لە سەرەتای کاتی خۆیدا ئەنجام بدەن، دوای مەخەن.

ئەوانەی شەهید بوون لە ڕێگەی نوێژەوە ئەو خەڵاتە کراون، نوێژ گەورەترین دەسمایەی قیامەتە؟!

## گەڕامەوە و مۆڵەتیان دام

'نەفیسە مورادی' شووی کردوە و دوو کچی هەیە، دەرچووی زانکۆی 'علوم القرآن و الحدیث'ە و ئێستا پیشەی مامۆستایە، مامۆستا نەفیسە بەم جۆرە ئەزموونەکەیمان بۆ دەگەڕێتەوە و دەڵێت: لە ساڵی (٢٠١٢)ی زایینی، خەسووم و خەزوورم ڕۆشتبوون بۆ عەمرە، شەوێک پێش ئەوەی بگەڕێنەوە، منداڵەکانیان و زاوا و بوکەکان لە ماڵی خەزورم کۆبوویوووینەوە، بۆ ئەوەی ڕاوێژ بکەین و، بەرنامەی پێشوازی و بەخێرهاتنەوەی ئەوان و میوانەکان دابنێیت.

کە کاتێ گەڕاینەوە ماڵەوە، لە ڕێگە وت و وێژمان دەربارەی شێوازی ئامادەکردنی خواردن و میوان بوو.

من بە شێوەیەکی خراپ و نابەجێ لەسەر هەندێ پرسی لاوەکی بێ ئەدەبیم بەرامبەر هاوسەرەکەم کرد!

لە ماوەی دوانزە ساڵی هاوسەرگیریماندا، ئەوە یەکەم جار بوو بەو ئەندازەیە کێشەمان بۆ دروست ببێت.

من زۆر تورەبووم و دەنگم هەڵبڕی، بە دەم شەڕ و تورە بـوونەوە گەیشـتینە مـاڵەوە، هاوسەرەکەم کەسێکی زۆر لەسەرخۆ و هێمـنە و، خـاترجەمی مـن بـوو، لەبەر ئەوەی من ماوەی ساڵێک دەبوو چارەسەری کیمیاییم تەواو کردبوو.

من ساڵی (٢٠١٠) توشی نەخۆشی شێرپەنجە بووم.

نەشتەرگەری و چارەسەری کیمیاویم وەردەگرت، ئیتر ئەو شـەوەش ئـارامی گـرت لەگەڵم و هیچی نەوت، هاوسـەرەکەم لەو کەسـانەیە کە دەتـوانێ تـورە بـوونی خـۆی بخواتەوە و دەری نەبڕێت!

کە گەیشتینە ماڵەوە، ڕۆشتمە سەر جێگای نوستن و لەلای چەپەوە خەوتـم و ڕووم کردە دیوارەکە و پشتم کردە مێردەکەم.

دیمەنێکم بینی، سەرسام بـووم بە بینینـی ئەو دیـمەنەش، دیمەنـی مێرگێکـی پـڕ لە گیـــای بـــاڵا بەرزم بینـــی، ئەوەی بینـــیم بە تەواوی وەک ئەوەبـــوو لە بەرامـــبەر تەلەفزیۆنێکەوە دانیشتبیت و سەیر بکەیت و کەناڵەکە بگۆڕیت بۆ دیـمەن و کەنـاڵێکی تر، ئەوەی بەسەر مندا تێ پەڕی بەو جۆرەبوو.

کاتێك ئەو دیمەنانەم بینی تەواوی پەیوەندیم بێرەوە نەمـاو کەوتمە نـاو حەقیقەتێـک کە بینیم!

بە ویستی من نەبوو کە بچمە ئەو دیمەنە یاخود ئەوی تریان.

ئاگام لە جەستەم نەما.

کەسایەتی من ڕۆشتە ناو ئەو ڕۆڵەی لەوێ پێم درا.

مـن بە تەواوی داخڵـی ئەوێ بـووم، سەرسـامیش نەبـووم بەوەی کە مـن لەو ژورە نەمام و گوازرامەوە بۆ ئەو جیهانە جوان و بێ وێـنەیە، هەسـتم بە دڵئـارمی و خۆشـی دەکرد، زۆر ئاسایی بووم.

وەک ئەوە بوو کارێکی ڕۆژانەی خۆم جێبەجێ بکەم.

گیای ئەو شوێنە زۆر بەرز و جوان بوو، درەختەکان لەلای ڕاستی من بوون، قەدی درەختەکان زۆر گەورە بوون، پەلوپۆیان زۆر بوو.

من سەیری ئەو درەخت و مێرگە جوان و سەوزەم دەکرد و دەموت: ئەمە چ جوانیەکە!

کاتێ گیایەکە دەجوڵا و شنەیەکی زۆر جوانی دروست دەکرد، لە ژێریاندا باڵندەکان دەجوڵان. کە زۆر وردبومەوە دەبینم، ئەوە باڵندە نیە و،ماری زۆر و زەبەندەیە و سەریان بەرز دەکەنەوە بۆ سەرەوە.

هەمووشیان سەیری منیان دەکرد، کاتێ لام کردەوە.

مارێکی گەورە، بەڵکو هەژدیهایەکی گەورەم بینی دەمی کردبۆوە، بەکراوەیی دەمی بە ئەندازەی سەری من دەبوو، بەڵکو گەورەتر بوو، ددان و کەڵبەی گەورەی هەبوو، پێستی پولەکەی زەرد و ڕەشی پێوە بوو، خۆی ئامادە دەکرد بۆ ئەوەی کە بمخوات.

کە ئەوەم بینی ترسێکی زۆرم لێ نیشت، ڕام کرد، وەکو جەستەش ڕام دەکرد لەسەر جێگای خەوەکەم و لەسەر چرپاکەم، هەتا نوسابووم بە مێردەکەمەوە، هاوارم دەکرد و دەگریام.

مێردەکەم پێکەنی و وتی: هەروا خێرا هەستت بە پەشیمانی کرد، هاوسەرەکەم وا گومانی دەبرد کە من بەهۆی ئەو دەنگە دەنگ و قسانەوە بووە کە کردومە و دەمەوێت داوای لێ بوردنی بکەم!

وتم: هەژدیهایەک خەریکە دەمخوات.

وەصفی مارەکەم بۆکرد، هاوسەرەکەم وتی: هەموو مار و هەژدیهاکان بەو جۆرەن، نەیدەزانی من چی دەڵێم و لەکوێ بووم، من بەردەوام دەلەرزیم و دەگریام. ئەم دیمەنە تەواو بوو، دیمەنێکی نوێ دەستی پێ کرد، هاوسەرەکەم پێی دەوتم: صەڵاوات بدە صەڵاوات.

**دەیویست ئارامم بکاتەوە، منیش دەموت خودایە لێم ببورە، پەنات پـێ دەگـرم لـێم خۆشبە.**

**هاوارم دەکرد و ڕوخساری خۆم دەڕنی لە ترس و بیم و خەمی خۆمدا.**

**مێردەکەم دەستی کرد بە خوێندنی ئایەتەلکورسی و دوعا و صڵاوات و زیکرەکـانی بەسەرمدا خوێند، کاتێ زانی کە من بەڕاستی لە کێشەیەکی گەورەدام.**

**بینیم مارەکە لێم دور کەوتەوە و ئاڵایە درەختـێکەوە و چـوویە سـەر لقێکـی بەرزی درەختەکە، بە هاوسەرەکەم ووت: ڕۆشتن و دیارنەمان.**

**وتم: سوپاس بۆ خوا صڵاوات چەندە کاریگەری گەورەی هەیە.**

**بەڵام هێشتا حاڵم پەرێشان بوو، دوای ئەوە دیمەنێکی ترم بینـی، ئەمجـارە دیمەنـی شەقامێکم بینی کە گۆڕێک لە نزیکی بوو، منـیش خەوتبـووم لە نـاو ئەو گـۆڕەدا و بە پێچەوانەی هاتووچۆی سەیارەکان بـووم، گـۆڕەکە نیـو مەتـر قـوڵ بـوو، دیوارەکـانی چیمەنتۆ بوون، مارەکان لە نزیکی من خەوتبوون، ڕەنگیان زەرد و ڕەش بـوو، دووبـارە توشی ترس بـوومەوە ودەسـتم کـردەوە بە ڕوخسـار ڕنـین، لەو کـاتی تـرس و بـیم دا هەستم کرد دەمبەن، نەمدەبینی کە کێیە دەمبات.**

**ئەوەم زانی کە مـن لە گـۆڕەکە هەسـتامەوە و بە هاوسـەرەکەمم وت: ئەوە دەمـبەن، زانیم ئەم بردنە مردنی منە، داوام دەکرد لێم ببورن و گەردنم ئازاد بکەن، بەبـێ ویسـتی خۆم بردمیان، ئەو کاتە لە شاری 'قوم' پـردی لـێ نەبـوو، کە پایەکـانی زۆر گەورەبـن، واتە پایەکانی چیمەنتۆ بێت و، ئۆتۆمبیل لە ژێریەوە بڕۆن.**

**بینیم منیان لە نزیکی پردێکەوە دەبرد، پایەکـانی لە چیمەنتـۆی زۆر گەورە دروسـت کرابوون، ئەوە سەرنجی ڕاکێشام، کـاتەکەش شـەوێکی تاریـک بـوو، ئەگەر بمەوێـت ئێستا وەصفی بکەم، وەک شـەقامی جمهـوری بـوو، کە دوو پـردی لەو جـۆرەی لێـیە ئێستا، وا هەست دەکەم ئەوەی کە من بینیم، ئەو پـردەیە کە لە بەردەم نەخۆشـخانەدایە! کە من لە بەرزیەوە دەڕۆشتم هەستێکی جوان و خۆشم هەبوو، فڕینەکەم هاوکات بـوو**

لەگەڵ شنەیەکی خۆش و.، لەش سوکیەکی سەیر، بە مێردەکەم دەوت چەندە هەستێکی ناسک و خۆشم هەیە، هیچ وشەیەک نیە بتوانێت ئەو حاڵەتە لە وەصف هەڵکێشێت، وەختێ بەرەو ئاسمان هەڵدەکشام، ئاسمان لەسەرمەوە نەبوو، لە بەرامبەرمەوە بوو.

لە کۆتایی ئاسماندا دەگەیشتیە هەورێک و دوای ئەوە دەرگایەکی بازنەیی شێوە بوو، ئەو دەرگایەش لکابوو بە تونێلەکەوە، ئەو تونێلەش دەبووە دەروازەیەك، ئیتر لەوێدا قاچم خستە سەر لێواری ئەو دەرگایە، دەتوت تۆ لە نزیکی دەرگایەکەوە ڕاوەستاویت و لەوێوە ئامێری فێنکەرەوە رووی لە تۆیە و شنەبایەکی زۆر فێنکم پێ دەگەیشت و لەوێدا هەستم بە دڵئارامی و هێمنی و هێوری کرد، هەرگیزا و هەرگیز لە ژیانمدا ئارامی بەو جۆرەم هەست پێ نەکردوە.

چرکە ساتی خۆشی لەو جۆرە لە ژیانمدا نەبووە و نابینرێت لە دونیادا.

ئەگەر لەو دەرگایە بچوومایەتە ژورەوە نەدەهاتمەوە بۆ دونیا و دەمردم.

کە سەیری ئەم لای خۆیشم دەکرد، دەمبینی مێردەکەم زۆر بە پەرۆشە بۆ من و ترسی مردنی منی هەبوو، لەناو دەرگاکەدا هەستم کرد ڕۆحم وردە وردە لە قاچەکانمەوە دەردەچوو، قاچەکانم قورس دەبوون و سارد دەبوونەوە، تەنانەت ئاگاشم لەم لابوو، بە مێردەکەم وت: قاچت لەسەر قاچم لابە، چونکە هەست بە قورس بوونێکی زۆر دەکەم.

ڕۆحم گەیشتە کەمەرم، ئیتر هەستم بە قاچەکانم نەدەکرد، ئیتر گەڕامەوە جەستەم و گەیشتمەوە دونیا، بەڵام لەو دەرگایەدا پێم وتن: مادەم پێ دەدەن لە دوای کۆتایی ژیانی دونیام بمگێڕنەوە بۆ ئێرە، بۆ ئێرەی جوانی بێ سنور و سەکینەت و خۆشی!

دەمزانی کەسانێک هەن لەگەڵ منن، ئەو کەسانەش تێ دەگەیشتن لە وتەکانی دڵی من!

ئەوە بوو ئەو گرەنتی و گرەنتیەیان پێدام.

به مەرجی ئەوەی کە گەڕامەوە بۆ دونیا، بە خەڵکی ڕابگەیەنم کە لە کۆتایی ژیانی دونیایاندا دێنە جیهانێکی هەتا هەتایی.

دەست بەجێ دوای ئەوە گەڕێنرامەوە ، قاچەکانم گەڕانەوە حاڵەتی سروشتی خۆیان و وتم بە مێردەکەم: هەموو شت تەواو بوو، لەگەڵ خۆیان نەیانبردم و گەڕامەوە و مۆڵەتیان دام!

ئیتر پەیوەندیم بەو جیهانەوە نەما.

ئەم ئەزموونە لە ساڵی (٢٠١٣) بەسەرم هات، ئەزموونداره‌کان کە دەگەڕێنەوە بۆ دونیا، ئەزموونەکەیان تەواو دەبێت، بەڵام ئەوەی من سەرەتای هەبوو، کۆتای و دەرەنجامیشی هەبوو، ڕۆژێک لەدوای ئەو ئەزموونەم، خەسوم و خەزورم لە گەشتی عەمرە گەڕانەوە، کە ڕۆشتین بینیان حاڵی من زۆر تێک چوبوو، حەزم لە تەنهایی دەکرد و دورە پەرێز بووم، بەهۆی ئەو ڕووداو و ئەزموونە گەورەیەی کە شەوی پێشتر بینی بووم.

زیاتر ترسی مارەکان لە ناخ و لە جەستەمدا مابۆوە.

من لە دوای ئەزموونەکەوە پێویستم بە خەڵوەتێک هەبوو، خەڵوەت لەگەڵ خۆمدا!

هەتاوەکو مانگێک سەرسام و مەدهۆش بووم.

چوار مانگ بەو جۆرە مامەوە، هەتا هەموو بەسەرهاتەکەم نوسیەوە و ناردم بۆ یەکێک لە زانایان.

ئەو زانایە ئامۆژگاری کردم بەوەی کە پارێزگاری لە نوێژەکانم بکەم و لە سەرەتای کاتە دیاریکراوەکانیدا ئەنجامی بدەم و دوای نەخەم، هەروەها واز لە هەموو کارێکی گوناه و حەرام بێنم، دە مانگ دوای ئەوە و بگرە ئێستاش کاریگەریەکانی لەسەرم ماوە، ئەزموونەکان ڕەحمەتی خوایە هەتا مرۆڤایەتی لە بێ ئاگایی مادی و دونیا ویستی ڕزگار بکات.

# نەناسراو بوون وەك ناسراوێكی قەدیمی دەردەكەوتن

بەیانیەکی زووبوو کاتژمێری هەشتی سەرلەبەیانی بوو، ڕۆژە گەرمەکانی هاوینی ساڵی (١٩٩٠)ی زاینی بوو، لە شەقامی 'ئافسەریە' ماتۆڕێکی جۆری 'یاماها'م لێ دەخوڕی لە باکوری شەقامەکەوە بۆ باشوری شەقام، شەقامەکە کەسی لێ نەبوو، لەبەر ئەوە زۆر بە خێرایی لێم دەخوڕی.

گەیشتمە چوارڕییانی 'تەختی'، کە پردێکی ڕۆشتنی ئۆتۆمبیلی لێیە و تازە دروست کراوە، لەوێدا ئۆتۆمبیلێکی جۆری 'جێب' ڕووی کردە ناوەڕاستی شەقامەکە و دەیویست بەرەو باشور بڕوات، ئیتر لەوێدا هەموو شت ئارام بۆوە، هیچ دەنگێک نەما، هەموو شتێک گۆڕا، دەتوت فلمێکە بە خاوی ئیش دەکات!!

بە شێوەی وتووێژی دڵ 'التخاطر' سەیری شۆفێری ئۆتۆمبیلەکەم کرد، پێم وت: تۆ منت نەبینی لە شەقامەکە دەپەڕیمەوە؟

وەڵامی دامەوە و وتی: من دەوەستم و تۆ بجوڵێ.

ئیتر دوای ئەوە نازانم چی ڕووی دا، هەمیشە بیری لێ دەکەمەوە و دەڵێم: نۆبەی دڵ لەپێش گەیشتنم بە چوار ڕیانەکە لێی داوم و، دوای ئەوە بەو خێراییە ماتۆڕەکە کێشاویەتی بە سەیارەکەدا و ئەوە ڕووی دا کە ڕوویدا.

پێش پێك دادانەکە من ڕۆحم لە جەستەم جیا بوویۆوە، من لە ئاسمان و نزیکی هەورەکانەوە بووم و سەیری ڕووداوەکەم دەکرد کە ڕووی دا، لە سەرەتادا دڵخۆش بووم و وتم: باشە من چۆن بەم خێراییە گەیشتومەتە ئەم بەرزاییە!

جێپەکە و ماتۆڕەکە و هەموو دیمەنەکەم بینی.

سەرەتا سەرنجم نەچوویە سەر ئەوە کە منم کەوتووم، هێزێکی گەورە، باڵا دەست بوو بەسەر منەوە، فەرمانی بەسەرمندا دەکرد، لەوێوە ڕووە و زەوی منیان برد، لە دڵی خۆمدا وتم: من بەو خێراییە زۆرە، ڕووە و زەوی دەگەڕێمەوە سەرم دەکێشێت بە بەرد و دار و چیمەنتۆی زەویدا و دەشکێت.

وتم بەڵکو بەسەر شاندا بکەوم، هەتا سەرم توشی لێدانێکی توند نەبێت، من هەستی جەستەم مابوو، نەک جەستە، هەتا ئەو کاتەش نەمدەزانی کە ئەوە منم لە خوارەوە و جەستەکەم کەوتوە، پێش ئەوەی بکێشم بە زەویدا، تونەیلێکی نورانی لە زەویدا کرایەوە و، داخڵ بەو تونێلە بووم.

من نور و ڕووناکیەکەیم دەبینی، دەمی تونێلەکە گەورە بوو، دەتتوانی کۆتاییەکەی ببینیت، بەڵام لە ناویشیدا نێوەندێکی دور و درێژ لە تاریکی هەبوو، بەڵام کۆتاییەکەی ڕووناک بوو، کە دەڕۆشتم بە ناو تونێلەکەدا دەنگە دەنگ و هەرایەکی زۆر هەبوو، دەنگی خەڵکی و ئۆتۆمبیل و شتانی تریش! من لەناو تونێلەکەدا دەترسام توشی هێرش ببمەوە، لە توێنەلەکەوە گەیشتمە بەرزاییەک.

ئەو بەرزایە لە کۆمەڵە چیایەکی زۆر بەرز پێکهاتبوو، لوتکە بە لوتکە و بەرزایی بە بەرزایی بەرەو سەرەوە دەڕۆشت.

کۆمەڵە خەڵکێکم بینی کە بەسەر بەرزاییەکانەوە وەستابون یەکەم دیمەن کە بینیمن وام هەست کرد کە ئەمانە کۆمەڵە خەڵکێکن. کە نزیک بوومەوە لێیان دەبینم مرۆڤ نین، سەرتاپا نورانی بوون.

جوانیەکی زۆر تایبەتیان هەبوو، ناتوانرێت وەصف بکرێت.

من شەست ساڵ تەمەنم هەیە، هەتاوەکو ئێستا نور و جوانی بەو جۆرەم نەبینیوە، هەمیشەش ئارەزوومەندی بینینی ئەو نور و ڕوناکیەم!!

هەتا چاو ببینێت 'کە بەردەوامیش دەبینێت' سپی یەکی نورانی بوو، ڕووناکی سەرچاوەی نەبوو، وەک ئەوەی خۆرێک هەبێت و ڕوناکی دروست بکات، ڕووناکی لە هەموو شوێنێک بەیەک ئاست بوو.

بە هۆی شکانەوەی ڕوناکیەکەوە دەتزانی ئەم چیایە بەرزترە لەوی تریان.

نورانیەکان چاوەڕوانی منیان دەکرد، یەکەم کەسیان کە لە پێشەوە ڕاوەستابوو، وا دەردەکەوت کە گەورەیان بێت، چونکە هەموویان دەگەڕانەوە لای ئەو، هاتبوون بۆ بەخێرهاتنی من و لە پێشوازی مندا بوون، لە قوڵایی دەروونمدا وا هەستم دەکرد کە من دەیانناسم.

نەناسراوێك بوون وەک ناسراوێکی قەدیمی دەردەکەوتن، بە جۆرێك هەستم دەکرد کە دەیان ناسم، بەڵام نەمدەزانی لە کوێ بینیومن، ڕوخساریان لە نور بوو، دەمتوانی لەیەک کاتدا لە چەند شوێنی جیاوازبم، دەچوومە سەر چیا بەرزەکانی ئەوێ، نورانیەکان خۆشحاڵ بوون بە ڕۆشتنی من بۆ ئەوێ، ئەو نورانیەی کە گەورەی هەموویان بوو، ئاگاداری کردم کە من مردوم، سەیری سەرەوەی کرد بەو مانایەی کە دوو پاسەوان هاتوون تۆ تەسلیمی ئێمە بکەن.

کە سەیرم کرد دوانی ڕەش بوون لە لای ڕاست و چەپمەوە.

ئەوان منیان تەسلیمی ئەمان کرد و ڕۆشتن!

لەو چرکە ساتەدا ئەوە چوویە دڵمەوە کە ئەمانە هیچیان بە دەست نیە و هەموو شتێک بەدەستی خوای گەورەیە، دەی با من داوا لە خوای گەورە بکەم کە لێم خۆش بێت.

دەستم کرد بە پاڕانەوە لە خوای گەورە و وتم: خودایە من هەڵەم کرد لێم خۆش بە، بینیم لەلای ڕاستمەوە دۆسیەیەکی گەورەی ژیانی ڕابردووم کرایەوە، لە تەمەنی (٨-٩)ساڵیەوە کە هەڵە و ڕاست جیا دەکەمەوە، پیشانم درایەوە، لەو شوێنانەی کە گوناه و

تاوانم تیا کردبوو، به هێواشی و لەسەرخۆ پیشانم دەدرایەوە هەتا زۆر باش پیشانم بدرێتەوە!

ئیتر منیش هاوارم دەکرد و دەموت خودایە لێم خۆش بە، بۆ نموونە: ڕۆژێک من لە قوتابخانە قاچم خستە بەر قاچی هاوڕێیەکم، هاوڕێکەم کەوت و هەموو قوتابیەکان پێی پێکەنین!

ئازاری دەروونی ئەو قوتابیەم بینی، بینیم بۆ شەوەکەی دەگریا و نەیدەتوانی بخەوێت!

واتە کاریگەریە خراپەکانی هەموو گوناهێک دەبینیتەوە کە لە دونیادا نەتبینیوە.

لەو کاتانەدا کە من سەرقاڵی پاڕانەوە و داوای لێ خۆش بوون بووم، کەسێکی نوێ پەیدابوو، لە پشتمەوە بوو، من نەمبینی، پێی وتم: وەرە با هەندێ بە یەکەوە بگەڕێین و کەسێک هەیە بیدۆزینەوە!

ڕۆشتین بۆ تاریکستانێک کە لە دورەوە دیار بوو، ئەو کەسە کە دەبێت بیبینیت لێرە نیە، دەبێت بچین بۆ ناو تاریکی هەتا بیدۆزینەوە.

ڕۆشتینە سەرەتای تاریکیەکە....

لە سەرەتادا نەمدەوێرا بچمە ناویەوە، بەڵام هەر چۆنێک بێت ڕۆشتین، چووینە تونێلێکەوە و لەوێوە ڕۆشتینە شوێنێک کە زۆر زۆر تاریک بوو، لە هەموو شوێنەکان تاریکتربوو، لە هەر ڕوویەکەوە سەیرت دەکرد، تاریکی بەبێ سنور بەردەوام بوو، کۆمەڵێک خەڵکمان لەوێ بینی، جیاواز بوون لەوانەی کە لە شوینە جوان و شایستەکەدا بەخێر هاتنیان کردم، هەستم کرد قژیان هەبوو، تێبینی ئەوەم نەکرد پیاو بوون و یاخود ئافرەت.

جەستە مرۆڤ دەکاتە ژن و پیاو و گەنج و پیر و مناڵ! کە دەبیتەوە بە ڕۆح جیاوازە.

ئەو بونەوەرانەی لە ناو تاریکیەکەدا بینیمن بە قەدەر زەوی و ئاسمان جیاواز بوون لەوانەی پێشتر بینیمن، ئەمانە نورانی نەبوون، جەستەیان خاکی بوو، قودرەت و توانایان کەم بوو!

ئەو شوینە گەرم بوو، وەک ئەوە بوو لەوێدا دادگایی بکرێن، ئەو شوێنەمان بەجێ هێلا. ئەو کەسەی لەگەڵم بوو پێی وتم با بڕۆین، چونکە ئەو لێرە نیە! ڕۆشتینە شوێنێکی خراپتر!

لە خراپەوە بۆ خراپتر دەچووین، هەتا گەیشتینە کۆتایی تاریکایەکە، شوێنەکان پلەی گەرمیان بەرز دەبوویەوە.

بۆ نموونە: حوکمی کەسێک بدرێت بیست ساڵ لە شوێنێکدا بێت کە پلەی گەرمی شەست پلە بێت. ئەوەی من لەوێدا بینیم هیچ کەس سزایەکی دیاری کراوی نەدەدان، بەڵام لە پلەیەکی گەرمی بەرزدا بوون و زیندانی کرابوون و نەیانـدەتوانی ئەو شوێنە بەجێ بهێڵن.

چەند قۆناغێکمان بڕی، هەتا گەیشتینە کۆتاییەکی زۆر تاریک، بەڵام تاریکیەکە ڕێگەی لە بینین نەدەگرت.

کۆتایی بەمانای ئەوەی کە ئێمە هەتا ئەو شوێنە ڕۆشتین و بینیمان، لەوێشدا کۆمەڵە خەڵکێک هەبوون و ڕووبارێکی ڕەشیش هەبوو، هەندێکیانم بینی تەنها سەریان لە دەرەوەی ڕوبارە تاریکەکەدا دیار بوو، هەر کە گەیشتینە ئەوێ، ئەو کەسەی کە لەگەڵم بوو وتی: ئەوە دۆزیمانەوە، کەسەکە شەرمەزار بوو لە سەیرکردنیان!

کاتێ زانی ئەو کەسەی بۆی دەگەڕاین لەوێ بوو زۆری پێ ناخۆش بوو، خەجاڵەت بوو!

هەستم کرد هەردوکیان شەرمەزار بوون!

واتە ئەو کەسەی لە ڕووبارە ڕەشەکەدا بوو لەگەڵ ئەو کەسەی لەگەڵ من بوو خەجاڵەت بوون.

شەرمەزاری بینینی یەکتر بوون.

هەر پێش ئەوەش من زانیم ئەوە ئەو کەسەیە کە ئەو بۆی دەگەڕێت.

دوای ئەوە گەڕاینەوە، کە هاتینە لای دەرگاکە، لێم پرسی ئەوە کێ بوو؟

وتی: ئەوە دایکم بوو، بە خۆکوژی و بە 'ئینتحار' کۆچی دوایی کردوە؟!

ئەو ئافرەتە لەناو ئەو تاریکیە زۆر ترسناکەدا بوو، گوزەرانی زۆر سەخت بوو، کە گەیشتینە لای دەرگاکە ئیتر ئەو کەسەش لەگەڵم هات بوو نەمبینیەوە.

هەستم دەکرد دایکی لە شەرمەزاریدا نەیدەویست بمانبینێت.

لە نێوانی ڕەشایی و سپێتی نوردا دەرگایەک هەبوو، گەیشتینە ئەوێ، ئیتر ڕۆشت و نەشمزانی بۆ کوێ چوو!

لە لوتکەی چیا بەرزەکانی ئەوێ هەستم بە هیچ ترس و دڵەڕاوکێیەک نەدەکرد، دەمتوانی لەوێوە بۆ خوارەوە خۆم فڕێ بدەم بەبێ هیچ گرفت و کێشە و ئازارێک!!

جارێکی تر گەڕامەوە بۆلای ئەو نورانیانەی کە لەلای گەورەکەیان وەستابوون و هەموویان چەپڵە و خۆشحاڵیان دەردەبڕی، منیش دەمزانی لە بەخێرهێنانی مندا ئاوا بەو جۆرە ڕێزم لێ دەگرن.

لەدڵی خۆمدا دەموت: ئومێد دەکەم دوای ئەم ڕێز و تەقدیرە، شوێنەکەم ناو تاریکستانەکە نەبێت کە من بینیم!!

ئەی باشە دوای ئێرە بۆ کوێ دەمبەن؟ باشتر وایە داوای لێ خۆشبون لە خوای گەورە بکەم!

دەموت: خودایە! مۆڵەتێکی ترم پێ ببەخشە، کە من تاریکستانەکەم بینی، هەندێ لە هەڵوێستەکانی ڕابردوومیان پیشان دام، من وام نەزانی بوو کە ئەوانە بە گوناه

لەسەرم بنوسرێت، بەڵام بە گوناه نوسرابوون، ئیتر دەترسام ڕێگەکەم ڕێی تاریکستانەکە بێت، داوای لێخۆشبون و مۆڵەتێکی تری ژیانم دەکرد!

جاری وا هەبووە بە شۆخیەکەوە لەگەڵ کەسێکدا دوابێتم و دوایی بەهۆی ئەو شۆخی کردنەوە کێشەی بۆ دروست بووبێت و من نەمزانیبێت، ئەوە دەبێتە خراپە بۆ من و غەم و پەژارەی پێ داوم.

هەستم کرد پەیوەست بوونم بە دونیاوە ماوە و، ژن و مناڵێکم بەجێ هێڵاوە و تەمەنیشم ماوەتی و هەلی خۆچاکردنم بوونم بدرێت زۆر باشە بۆمن.

ئیتر زۆر پاڕامەوە لە خوای گەورە و دوبارەم دەکردەوە، هەستم کرد زەوی شەقی برد و لە شێوەی تونێلێکی نورانیدا کرایەوە و، بەناو زەویدا سەردەکەوتم و لە جەستەکەم نزیک دەبوومەوە، جەستەیەک لە خوارەوە دەمبینی.

هەستم کرد جەستەم زۆر تەسک و تروسکە و بە ناڕەحەت دەچمەوە جەستەکەم.

وەک ئەوەبوو کراسێک بێت و بە بەرت نەکات!

بە چرکەیەک چوومەوە ناو جەستەکەم!

بەڵام زۆر بە ئاستەم!

هۆشم هاتەوە، یەکەم کەس کە بینیم شۆفێری جێبەکە بوو کە لە پێشمەوە ڕاوەستابوو، دەیدا بە سەری خۆیدا و هاواری دەکرد لە ترس و پەرێشانیدا دەیوت: باشە خۆ وتیان مردوە، ئەوە شوکر زیندوە، بردمیان بە نەخۆشخانە، دیسانەوە لە دەرگای نەخۆشانەکە بێ هۆش کەوتمەوە.

جارێکی تر ڕۆشتمەوە دەرەوەی جەستەم و، ئاگادار بووم پزیشک و کارمەندەکان چیان دەوت و چۆن مامەڵەیان لەگەڵ دەکردم.

پزیشکەکە وتی: هەتا چل و هەشت سەعات بیخەنە سەر ئۆکسجین و جیهاز، ئەگەر هۆشی نەهاتەوە تەواو کۆتاییەتی، بەڵام من هەموویم ئاگا لێ بوو، دەمزانی چی دەڵێن!!

دەموت: لە کۆتاییدا دەمبەنە ساردکەرەوەی مردوەکان و لەوێ دەمرم!

بردمیان بۆ چاودێری ورد (١٢٤)، بە ناخم ئاگام لە هەموویان بوو، تەنانەت هزر و بیرکردنەوەی هەموویانم دەخوێندەوە و دەمزانی بەتەمای چین؟

خێزانەکەم و باوکی و هەموو خزمان هاتن، لە دەرەوەی چاودێری ورد هەرچیەکیان دەوت ئاگام لێ بوو، لە دوایدا هەموویم پێ وتنەوە.

دەمویست دەستێ قاچێکی جەستەم بجوڵێنم هەتا بزانن کە من زیندووم. خەمی گەورەتان کۆکردنەوەی ماڵی دونیانەبێت، فێڵ لە خەڵکی مەکەن، زوڵم مەکەن، چونکە زوڵم لە خۆتان دەکەن و تیادەچن!!

## دونیا شوێنی چاندنە و حسابێکی دورو درێژی لە دوایە

'ئومێد چهرەکشا' لەساڵی (١٩٧٨) لە شاری 'دیزەفول لەدایک بووە و خێزانداره و دوو کوڕی هەیە و بەم جۆرە ئەزموونەکانی دەگێڕێتەوە و دەڵێت: تەمەنم شانزە ساڵان بوو، لە قۆناغی ناوەندیدا بووم، لەگەڵ هاوڕێکانم فرسەتێک هەبوو، لە پارێزگای 'خوزستان' بووین و کەش و هەواش گەرم بوو لە هاویندا، دەچووین بۆ مەلە کردن لە ڕووبارەکەی 'دیزفول'، ڕۆژی یەک شەممە بوو، لە دوای وانەی دووەم لە قوتابخانە ڕۆشتین بۆ ڕووبارەکە، هەمیشە کە دەڕۆشتین بۆ ئەو ڕووبارە، لە شوێنێکی دیاری کراودا مەلەمان دەکرد، چونکە دەمانزانی کوێی ڕووبارەکە قوڵە یاخود تەنکە بوارە.

ئەو شــوێنەش نزیکــی یەکێــک لە هاوڕێکانمــان بــوو، ڕۆشــتین و ویســتمان لە شــوێنێکی بەرزەوە خۆمــان فــڕێ بــدەینە ئــاوەکەوە، کە ئەو شــوێنەش نزیکــی پــردی شەریعەتی بوو.

ئێمە پێنج کەس بووین، ئەو شوێنەی کە هەڵمانبــژارد لە نێـوانی دوو ئاشــدا بــوو کە بەهێزی ئاوەکە کاری دەکرد، لەو شوێنەش ئـاوەکە زۆر خــوڕ و بەهێــز بــوو، مەلەمـان دەکرد، من ڕۆشتمە ئاوەکەوە، هاوڕێکانم گاڵتەوگەپیان دەکرد، ئاگایان لەمن نەبــوو کە چوومە ناو ئاوەکەوە!

کەوتمە ناو خوڕی ئاوەکەوە، لە چرکەساتێکدا هاوارم کرد فریام بــکەون، دوای ئەوە ئاوەکە ڕایماڵیم بەرەو خوار، ڕوبــارەکە لەوێــدا دەبــوو بە گێژاوێــک و لــولی دەکــردی، هەوڵم دا دەربچم بەڵام نەمتــوانی، وتــم بــا ئــارام بگــرم هەتــا ئەو شــوێنەی کە ئــاوەکە ئاسایی دەبێتەوە!

لە دوایــدا وتــم بــا دابەزمە قــوڵایی ئــاوەکەوە و قاچێــک بــدەم لە بنــی ئــاوەکە و سەرکەومەوە و لەو شوێنە دوربــکەومەوە، بەڵام گێــژاوەکە بردمــی بــۆ چەقــی خــۆی و هیچم پێ نەکرا!

قاچم لە بەینی دووبەردا گیــرایەوە و دەستەوســان بــووم، هەرچــیم کــرد قــاچم دەر نەدەهات.

هاوریکــانم کە زانیبویــان دواکەوتــوم لە ژێــر ئــاوەکەدا خۆیــان فــڕێ دابــوویە نــاو ئاوەکەوە هەتا فریام بکەون.

من هەستم کرد کە هەناسەم پێ نەما، ئیتر تەسلیم بووم و خۆم شل کــرد، ئــاوەکەش لەو شوێنەدا (٤ - ٥) مەتر قوڵ بوو، چونکە قاچم گیرابوویەوە نەمدەتوانی خۆم ڕزگــار بکەم، ئاوێکی زۆر ڕۆشتە ناو دەم و سنگمەوە، نازانم ئەو حاڵەتە چەندی خایەنــدووە، بەڵام هەســتم کــرد وەک لە ئاســمان پەردە لەســەر شاشــەیەکی زۆر گەورە لابــدرێت ئاوابوو، پانتایی هەموو ئاسمانی داگیر کردبوو، جوڵەی لە چەپەوە بوو بۆ ڕاست.

هەموو ڕووداو و کار و کردەوەکانی ژیانم بەباش و خراپیەوە پیشان درایەوە، لەو کاتەدا من نەمدەزانی لە کوێم و چۆن بوو کەوتمە ئەو ڕووداوانەوە!

زۆر بە ڕێک و پێکی و بەدوای یەکدا هاتن، ژیانی خۆمم بینیەوە، بیر و هۆش و بیرکردنەوەی من بە هیچ جۆرێک لەناو ئاو و لەناو دونیادا نەما!

بۆ نموونە: من لە سەرەتاییدا یەکەم دەبووم و دیاریان پێ دەدام، هەموویم بینیەوە!

منداڵ بووم و لە شەقامێک دەپەڕیمەوە و دەستم بە پەنجەیەکی باوکمەوە گرتبوو... بینیمەوە!

منداڵ بووم و کێڵگە و دارستانێک لە نزیکی ماڵەکەمانەوە بوو، لەگەڵ چەند منداڵێک ئاگرمان بەو ناوچەیەوە نا هەموویم بینیەوە!

هەتا گەیشتەوە بەوەی کە من لە ناو ئاوەکەدا توانای جوڵەم نەمابوو، هەستم کرد کە زۆر سوکەڵە بووم و دەچمە دەرەوەی ئاوەکە، هاوڕێکانم بینی قسەیان دەکرد و بانگیان دەکرد... ئومێد... ئومێد.... شپرزە بووبوون، من لە سەرووی ڕووبارەکەوە بووم و ئاگام لە هەموویان بوو، لەو کاتەی هاوڕێکانم دەبینی لە ژێر ئاوەکەدا بووم و ئەوان بۆ من دەگەڕان.

لە هەمان کاتدا لە پشتەوەش پردی شەریعەتیم دەبینی، واتە هەموو لایەکم لەیەک کاتدا دەبینی، بەلامەوە سەیر بوو، کە من چۆن لە سەرەوەم و لە هەمان کاتیشدا لە ژێر ئاوەکە جەستەی من بوو!

هاوڕێکانم هاتبوونە ژێر ئاوەکەوە و منیان دەرهێنا بوو، لە دەرەوە سەکۆی لێ بوو، من یەکێک لە هاوڕێکانمم دەبینی کە ئەو نەیدەتوانی بێتە ژێر ئاوەکە و، لە دەرەوە بوو دەگریا بۆ من، بەڵام من بۆ خۆم هیچ نیگەران نەبووم، هیچ ئازار و ناخۆشیەکم هەست پێ نەدەکرد.

له دوای ئەوەی هاوڕێکـانم مەسـاجیان بـۆ کردبـووم و دوای (١٥ - ٣٠) خـولەك گەڕابوومەوە هۆشی خۆم و بەئاگا هاتمەوە.

هاوڕێکانم وتیان: بۆچی هاوارت نەکرد، بۆچی ئاگادارت نەکردین!

دوای ئەوە گەڕاینەوە ماڵەوە.

بە هاوڕێکانم وت کە چیان کردوە و چیشیان وتوە!

پێم وتن: کێ لە پێش کێوە هەوڵی ڕزگارکردنی منی داوە.

لە سـەرەتادا باوەڕیـان نەدەکـرد، بەڵام کە هەمـوو نیشـانە و بەڵگەکـانم پـێ وتـن، قەناعەتیان کرد.

زۆر سەرسام بوون لەوەی بەسەرم هاتبوو!

ئەوکـاتە تـازە پـێ دەگەیشـتم، دوای ئەو ئەزمـوونە جۆرێـک لە داچڵەکانـدنم بـۆ دروسـت بـوو دەربـارەی ئاکـار و کـاری ڕۆژانەم، هەسـتیارتر بـووم، بیـرم لە نـیەت دەکردەوە کاتێک کارێکم دەکرد.

مەعریفەیەکـی تەواوەتـیم بـۆ دروسـت بـوو، کە جیهـانێکی بەرفـراوان هەیە دوای مـردن، کە دەبێـت مـرۆڤ هەڕەمەکـی ژیـان نەداتە بەرو ئاگـای لە کـار و کـردەوە و نیەتەکانی بێت.

هەوڵم ئەدا هەرگیز ئازاری هیچ کەسێک نەدەم.



# ئەزموونی دووەمم



نیەتی خۆکوژی و 'ئینتحار'م نەبوو، پلانی پێشینەم بۆ دانەنابوو، لە گەنجێتیدا سەرکەش بووم، بەڵام ڕێزی دایکمم دەگرت، تەنانەت لە ئیش و کاری ناوماڵدا کۆمەکیم دەکرد، ئێمە کۆمەڵە هاوڕێیەک بووین لە شوێنێ کۆدەبووینەوە، خەڵکی دەیناسینەوە بە هۆی ئاکاری تایبەتیمانەوە، هاوڕێ بووین و کۆدەبووینەوە...

خەڵکی دەیانوت ئەوە گەنجە بێ کارەکان کۆبوونەوە!

خێزانەکان بێزار دەبوون لە ئێمە، کاتێ ئاستەنگەکان بۆ هاتوچۆکاران دروست دەکرد، بەتاڵ بووین و، بووبووینە مایەی بێزاری ئەو ناوچەیە، شتێکی ئەو تۆشمان نەدەکرد، بەڵام لەبەردەم دوکانێکدا کۆدەبووینەوە و دەبوینە هۆکاری ئازار بۆ خەڵکی.

کاتەکە ئێوارە بوو، برا گەورەکەم گەڕایەوە بۆ ماڵەوە، بە دایکمی وتبوو کوڕەکەت 'مەبەستی من بوو' لەگەڵ کۆمەڵێک گەنج بوون بە مایەی سەرئێشە لە شەقام و گەڕەکەکەمان.

خەڵکی گلەیی دەکەن و پێیان ناخۆشە و.... هتد... لە دوایدا دایکم و برا گەورەکەم کەوتنە لۆمە کردنی من، کە بۆچی کارێک ناکەیت و ئەم بەتاڵیە تووشی شتێکت دەکات.

لەگەڵیان دەنگ بەرز کردنەوە و توڕەبوون دروست بوو.

هەستی ئەوەم بۆ دروست بوو کە دایکم لێم توڕەیە! توشی بێ ئومێدی کردم...

بە شێوەیەکی نەخوازراو کە پلانم بۆ دانەڕشتبوو...

چـونکە مـن لەو جـۆرە کەسـانە نەبـووم کە بیـر لە خۆکـوژی بـکەمەوە... چـونکە دەمزانی ئەو کارە زۆر زۆر خراپ و گوناهە و ناکرێت ئەنجام بدرێت.

وە هەمیشە من بە ئومێدەوە ژیاوم.

من ویستم بەو جۆرە هەڕەشەیان لێ بکەم و بیانترسێنم.

چەقۆیەکم هەڵگرت لە چێشتخانەکە و، نەمدەویست بەکاری بهێـنم، خسـتمە سـەر دەماری دەستم هەتا بترسن و وازم لێ بێنن...

من وام دەزانی چەقۆکە کولە و ئاوا خێرا ئەو قەدەرە ڕوونادات!!

نیەتی ئەو کارەم نەبوو!

کە چەقۆکەم جوڵاند، سـەرەتا ئـازارم نەبـوو، وەختـێ بینـیم دایکـم دەیزریکانـد و براکەشم هاواری دەکرد، خوێن فوارەی کرد و دیوار و دەرگاکەش خوێناوی بوون.

مـن لە کـاتی ئەو کـارەدا توشـی توڕەبـوون و هەڵچونێـک بووبـووم، بیـرم لەوە نەدەکردەوە کە ئەنجامم دەدا، نەمدەزانی کە ئەوە کارێکی ترسناکە و ڕەنـگە بمگەیەنێـتە مردن، چەقۆکەم گـرت بە دەسـتمەوە و وتـم کەس بە دوامـدا نەیەت و ڕۆشـتمە قـاتی خوارەوە، خوێنێکی زۆرم لەبەر ڕۆیـی، ڕۆشـتمە حەوشـەی ماڵەکەمـان، هەسـتم کـرد جەستەم ساردەبوویەوە، لێوو ددانەکانم دەلەرزین و بێ هێز بـووم، دەسـتم وەک بەفـر سپی بوو بوو، ئیتر لە باخچەکەماندا دانیشـتم، دایکـم و بـاوکم شـپرزە بوویـوون و بە براکەمیان دەوت فریاکەوە با بیگەیەنینە نەخۆشخانە، ئاگام لێیان بـوو بەڵام لە دەرەوەی جەستەم بووم، نەمدەزانی بۆچی ئاوا دەکەن و ئاوا شپرزە بـوون، هەسـتم کـرد کە زۆر سوکەڵە بووم و هیچ ئازارێکیشم نیە، تووشی ڕێگا و مەنزلەیەکی زۆر سەخت و ئـازار بەخش بوومەوە، کە نامەوێت لێرەدا باسی بکەم و تەنها ئەوەنـدە کـافیە، چـونکە ئـازار بەخشە و کاتێ باسی دەکەم مووی سەرم لە تاوا ڕاست دەبێتەوە.

براکەمم بینی، من لە شوێنێکی بەرز بووم و سەیرم دەکرد، هات و دەستی گرتم و بردمی بۆ شەقامەکە، ئۆتۆمبیلێك لە سەرەتای شەقامەکە دەرکەوت.... براکەم ڕێگەی پێ گرت، منیان سەرخستە ناو ئۆتۆبیلەکە، من پێش سەیارەکە گەیشتمە نەخۆشخانەکە.

جەستەکەمیان خستەسەر گوازەرەوەیەك و بردمیانە ژوری نەخۆشخانەکە، خێرا تیمی نەخۆشخانەکە کۆبوونەوە و بردمیان بۆ هۆڵی نەشتەرگەری، خوێنێکی زۆرم لێ ڕۆشتبوو، دوای ئەوە بە براکەمیان وت: بڕۆ بۆ دەرمانخانە ئەو دەرمانانەی بۆ بێنە!

ڕۆشت دەرمانەکانی هێنا و من ئاگام لە هەمووی بوو، لە ژوری نەشتەرگەری دەمبینی چۆن چارەسەر و برین پێچی دەستم دەکەن، دوای ئەوە داوای خوێنیان کرد، چونکە خوێن بەربوونم زۆربوو، لەیەک کاتدا ئاگاداری نەشتەرگەیەکە و تیمی نەشتەرگەری بووم و لەگەڵ دەرەوەش کە براکەم پەیوەندی تەلەفۆنی دەکرد لەگەڵ ماڵەوەدا!!

ئاگاداریش بووم کە براکەم لە وەڵامی پرسیاری پزیشکەکان دا وتی: بەسینی ناو لەپی دەستی براوە، پزیشک و کارمەندانی نەخۆشخانەش وتیان بە سینی چۆن ئاوا دەستی بە قوڵی دەبڕێت؟! ئەوە کاری چەقۆیەکی تیژە!!

دوایی یەکێکیان هاتە دەرەوەی نەشتەرگەری و پرسیاری جۆری خوێنەکەمی لە براکەم کرد!

وتی: نازانم.

وتیان خوێنی خۆت ج جۆرێکە هەتا بە پەلە خوێنی بۆ بێنن، چونکە لە نەشتەرگەری پێویستیەتی!

من ئاگام لە هەمووی بوو.

دوای ئەوە براکەم بە تەلەفۆنی دەرەوە پەیوەندی بە ماڵەوەمان کرد بۆ ئەوەی خوێن پەیدا بکەن.

من له هەموو ڕووداوەکان، له یەک کاتدا بینەر و بیسەر بووم!

دونیا شوێنی چاندن و کرداره، حسابێکی دورودرێژ له دوایه.

پێویسته ئێرەی دونیا بەکاری خێر و موحیبەت و ئولفەت و ڕێزی خەڵکی و یارمەتی دانی خەڵکی و کردەوەی چاك ببەینه سەر، بەم کارانه دەتوانین بەر لێشاوی ڕەحمی خوایی بکەوین و ئەنجامێکی باشی دوای مردنمان هەبێت، زۆرێک هەن که ئیمانیان به قیامەت نیه، یاخود ئیمانیان لاوازه و بێ باکن بەرامبەری، بەڵام ئەوەی ئەم ئەزموونەی وەک منی بینیبێت دڵنیایی و یەقینی بۆ دروست دەبێت.

دەزانێت له قیامەت چی چاوەڕوانی دەکات.

بەبێ هیچ گومانێک زیندووبوونەوه هەیه.

مردن تەنها بلیتی ئەو سەفەره هەمیشەیەیه، مەرگ واته مەرگی جەسته، نەک مەرگی ڕۆح، پێویسته کەمتەرخەم نەبین بەرامبەر قیامەتمان.

## هەستم کرد من مرۆڤه جەستەدارەکەی زەوی نیم

'برستو نظیفی ئارانی' کچه خوێندکارێکه و، خەریکی بەدەست هێنانی دکتۆرایه و له ساڵی (١٩٩٣) له 'کاشان' لەدایک بووه.

'برستو' بەم جۆره ئەزموونەکەیمان بۆ دەگێڕێتەوه:

ساڵی (٢٠١٤)ی زاینی بوو که ناومان دەرچوو بچین بۆ سەفەری موبارەکی حەج، لەو کاتەدا تەندروستیم باش نەبوو، کۆکه و ئەنفلۆنزام هەبوو، دکتۆر چارەسەری بۆ نوسیم و وتی واباشتره بمێنیتەوه و گەشت نەکەیت، منیش بەگوێم نەکرد، وتم ئەم فرسەته له دەست نادەم، ساڵانێکه چاوەڕوانم کردوه هەتا ناوم

دەربچێت، ڕۆشتم بۆ مەکەی پیرۆز و دەرمانەکانیشم لەگەڵ خۆم برد، لە پێشدا ڕۆشتین بۆ مەدینە، کێشەم نەبوو، نزیکی هەفتەیەک لە مەدینە ماینەوە، لە دوای خۆرئاوا بوونی ئێوارە بەرەو شاری مەکە کەوتینە ڕێ، کاتێ دەگەیتە مەکە دەبێت کۆمەڵە مەناسکێک ئەنجام بدەیت، ئێمەش ماوەیەکی زۆر بوو لەناو پاصدا بووین و بەڕێوە بووین، درەنگانێکی شەو گەیشتینە مەکە، چووینە ناو حەرەمی کەعبەوە، وەختێ یەکەم جار بوو کەعبەمان بینی لە شادمانیدا سوژدەمان برد، ئەو شەوە هەستم بە ماندوێتی یەکی زۆر دەکرد، دەوروبەری یانزەی بەیانی بوو گەیشتینەوە ئوتێلەکە، هەندێک پشوومان دا، من دەمویست فرسەت لە دەست نەدەم، ڕۆشتینەوە بۆ حەرەم، بەڵام زۆرم لەخۆم دەکرد.

بەڵام من بە خێزانەکەمانم وت: من ناتوانم ڕێبکەم، زۆر ماندووم، تەکسیەکمان گرت و گەڕاینەوە ئوتێل.

کاتێ لە مزگەوتی حەرام هاتمە دەرەوە ڕووم لە کەعبە کرد و وتم: ئومێدەوارم ئەمە کۆتا جار نەبێت کە سەیری جوانی تۆ دەکەم ئەی کەعبەی موعەزەم!

چونکە هەستێکم هەبوو کە ئیتر ناتوانم بێمەوە بۆ ئێرە و بە بینینی شاد ببم!

کە گەڕامەوە ئوتێلەکە جێگایەکم لەسەر زەویەکە ڕاخست و خەوتم، ئیتر نەمتوانی هەستمەوە، دایکم و باوکم لەگەڵ بوو، زانیان کە من توشی پەتایەکی قورس بووم، زۆر بە زەحمەت هەناسەم بۆ دەدرا، پێشتریش سیەکانم باش نەبوون، دەرمانی تەنگەنەفەسیم نەبردبوو لەگەڵ خۆم، ئیتر ماندوو تری کردم، بڕیاربوو جارێکی تر بچین بۆ کەعبە و بۆ عەمرە کردن و نیەتی مردوەکانمانیان لێ بێنین، من نیەتم هێنا بۆ نەنکم و باپیرمی بکەم، کە پانزەساڵێک دەبوو کۆچی دواییان کردبوو.

بەڵام من نەمتوانی لە شوێنی خۆم بجوڵێم.

کاتژمێر دەی شەو ئیمامی کاروانەکە و گروپەکەمان ڕۆشتنەوە بۆ طەواف، بەڵام من ڕاکشابووم، بە دایکم و باوکمم وت: ئێوە بڕۆن، خەمی منتان نەبێت، من لێرە پشو دەدەم، باوکم ڕۆشت بەڵام دایکم لەلای من مایەوە.

چەرچەفەکەم دا بەسەر خۆمدا و دەستم کرد بە گریان بەبێ ئەوەی دایکم پێم بزانێت.

دەگریام و دەموت خودایە من نەمدەویست بەم جۆرە لە جێگادابم و لەم شوێنە پیرۆزەدا بم، خودایە من تەنها ئەم فرسەتەم لەم تەمەنەدا دەست کەوتوە.

خودایە ئەوە نیەت و دڵی من نیە ئاوا دور بم لە ماڵەکەت!

ئیتر دوای ئەوە نازانم چی ڕووی دا!

هەستم کرد هەموو شتێک گۆڕا، زۆر سوکەڵە بووم.

لە کاتێکدا شاری مەکە گەرم، کەچی من هەستم بە شنەیەکی زۆر فێنکی دڵخۆشکەر دەکرد، هەرگیز لە کەناری دەریا و لە جەنگەڵ و ژێر باران و قەدپاڵی چیا فێنکەکان ئەو فێنکی و خۆشیەم نەبینی وە!

لە ناو نوورێکی زۆر شیریندا بووم، گەرمی تیا نەبوو، ناتوانیت بە وشە وەصفی بکەیت، هەستم کرد لە ئوتێلەکە نەماووم، لەناو پارچە هەورێک دا بووم لە ئاستێکی بەرزی زەویدا بووم، بەڵام بیری ئەوەم نەما کە غەمم بەوەوە دەخوارد کە بۆچی لە تەواف نیم! لە کوت و پڕێکدا خۆم لە دەرگای سەرەکی حەرەمی مەکە بینیەوە، لە گۆڕەپانی طەوافی کەعبەبووم بە بەرزیەوە، هەست و نەست و فیکرم زۆر خاوێن و بێ خەوش بوو.

لە دونیادا هەرچەندە هەوڵ بدەین ناخمان ڕۆشن و خاوێن بکەینەوە ناتوانین.

من لەو کاتەدا بیرم لە هیچ شتێک نەدەکردەوە.

زۆر زۆر خۆش و شیرین بوو، ئومێد دەکەم پێی بگەمەوە.

دڵنیاییەک لەوێ دەست دەکەوێت زۆر شیرینە و لێرە بە هیچ جۆرێک دەستگیر نابێت، لە سەروو حەوشی کەعبە بووم و لەناکاو حاڵەکە گۆڕا!

بەرزبـوونەوەم هـاتە ئاسـتی کەعـبە، مەترێـک یـاخود مەتـر و نیوێـک لە خـوار سەربانەکەی ماڵی خواوە بووم.

واتە نزیک بووم لەوانەی کە طەوافیان دەکرد و بە ڕاسەریانەوە بووم.

سەیری هەموو لایەکم دەکرد و بەخۆمم دوت: دەبوو من ئێسـتا لە ئوتێـل بوومـایە، هەست و هۆش و یادەوەری پێشووم بۆ گەڕایەوە، خەڵکـی و کەعبەشـم دەبینـی و دڵ خۆش بووم بەو بینینە.

زۆر بە وردی هەموو شتەکانم دەبینی، مرۆڤ کاتێك خەونێک دەبینێت، ناتوانرێـت بە وردی شتەکان ببینێت و بیانگێڕێتەوە.

دوو کەس لە پشتمەوە هاتن و وەستان، نازانم فریشتە بوون یاخود نا!

ڕوخساریان بەجۆرێک بوو کە ناتوانم پێناسەیان بکەم.

تەنها دەتوانم بڵێم هەستی ئەوەم هەبوو کە دوو کەسن و لەگەڵ منن.

پێیان وتم: تۆ حەزت نەدەکرد بێیت بۆ طەوافی کەعبە؟

هەندێ بیرم کردەوە و وتم: چۆن بە بیرکردنەوە و خەیاڵی منیان زانیوە؟

ئەمانە کێن، ئاوا نهێنیەکانی من دەزانن؟!

وتیان: باشە ئێستا چاوەڕوانی چی دەکەیت؟!

بچۆ نیەتی طەواف بێنە و دەست پێ بکە وەک هاوڕێکانت.

من سەیرم دەکـردن و گومـانم هەبـوو، ئایـا بەم حـاڵەی مـن، کە مـن لەسـەرەوەم طەواف دروستە یاخود نا؟!

هەردوکیان هاتن و کۆمەکیان کردم بۆ طەواف و مەناسکەکان.

هەسـتم کـرد مـن مـرۆڤە جەسـتەدارەکەی زەوی نـیم، وەک باڵـدارێک دەفـڕیم و دەگەڕام، دەستم کرد بە طەواف و 'لبیـک اللهـم لبیـک'، بیـرم بـۆ ئەوە چـوو سـەیری خوارەوە بکەم و بزانم چی دەگوزەرێت!

باوکمم بینی لەگەڵ مورشیدەکەمان و تەواوی گەشتەکانم کە لەگەڵمان هاتبوون، هەموویانم دەناسی.

دەمزانی کات چەندەیە، دەمزانی کە ئەوە (٢٠- ٣٠)ساڵی داهاتوو نیە، بەڵکو ئەو چرکە و ساتەیە.

دەمزانی هەمان کاتە کە من لە ئوتێلەکە بووم و ئەوان ڕۆشتوون بۆ طەواف و ئێستا منیش لەوێم!

ڕێک نیوە شەو بوو، پێشتر لە ئوتێلەکە وتیان لەبەر ئەوە ئێستا دەڕۆین چونکە حەرەم قەرەباڵغ نیە، بەڵام کە من لە سەرەوە بینیم و دەستم بە طەواف کرد زۆر قەرەباڵغ بوو، باوکمم بینی و دڵم بۆی سوتا، چونکە حەزم دەکرد یارمەتی بدەم و نەمدەتوانی، دەیشمزانی چ کەسێک لە کاروانەکەمان بۆخۆی طەواف دەکات یاخود بۆ مردویەکی نزیکی؟!

باوکم و دایکم و کاروانەکەمان زۆر سەریان سوڕما لەو هەموو زانیاریانەی کە دەربارەیان وتم.

پێم وتن لە کوێدا بوون لە طەوافدا و نیەتی کێیان هێناوە و چیان وتوە!

کاتێ وەک فڕین بە دەوری کەعبەدا دەسوڕامەوە، لە پڕ تونەیلێکی سەوزم بینی، باپیرەمم بینی لەو تونەیلەدا، تونەیلەکەش زۆر بەرز نەبوو، هەمان ئاستی کەعبەی هەبوو، باپیرەم پۆشاکی سپی لەبەردا بوو، ڕازی بوون و دڵخۆشی پێوە دیاربوو، ڕوخساری بەتەواوی لە منەوە دیار بوو، چوومە ناو تونەیلەکە و شەوق و موحیبەتم بۆ باپیرم دەربڕی و دەستیم گرت و، من دەمزانی کە زۆر لە پێشترەوە مردوە، دەشمزانی 'برستو' کە منم، بە بێ گیان جەستەکەی لە ئوتێلەکەدایە، وە ئێستا من هێزە گەورەکەی مرۆڤم کە ڕۆحم و لە حەوشی کەعبەدا دەگەڕێم.

باپیرەم پرسیاری لە حاڵی من کرد و ڕازی بوونی خۆی لە من دەربڕی پێی وتم: حەز دەکەیت پێکەوە بڕۆین؟!

من زۆر حەزم دەکرد، خێرا وتم: بەڵێ. نەمپرسی بۆ کوێ؟ یان بۆچی؟!

پەیژە و پێ پلیکانەیەک دەرکەوت بۆ سەرەوە هەتا سەربکەوین.

پلیکانەکە لە جنسی بەردبوو، شین بوو، ڕەنگی زۆ زۆر جوان بوو، کە ویستم سەربکەوم سەیرێکی خوارەوەم کرد کە کەعبە بوو، بۆ دواجار بە کەعبەی پیرۆزم وت: وا من دەڕۆم و دواین جارمە، بیرت دەکەم.

وتم باپیرم تەمەنی هەیە و دەبێت من کۆمەکی بکەم هەتا سەربکەوێت.

کەچی ئەو لە پێشەوە بوو، دەستی منی دەگرت و یارمەتی دەدام.

واهەست دەکەم چەندین کیلۆمەتر بە ئاسمانی کەعبەدا سەرکەوتین!

ئەوەندە بەرز بووینەوە شاری مەکە زۆر بە بچوکی دەردەکەوت، ئەوە چوویە بیر و هۆشم کە من دڵنیابووم لە باپیرم، بەڵام خۆ دایکم و باوکم زۆر نیگەرانی من دەبن، کە لە ئوتێلەکە نەمابم و گیانم ڕۆشتبێت جەرگ سوتاو دەبن، من دەبمە هۆی خەمباریان، من دەستم لەدەستی باپیرەم دابوو کاتێ ئەم بیر کردنەوەیەم بە بیرداهات، دەست بەجێ باپیرەم لەسەرکەوتن ڕاوەستا و وتی: کچم دەتەوێت بگەڕێیتەوە؟!

دەی ئێستا بگەڕێرەوە.

ئیتر هیچ شتێکی تری نەوت و، دەستی بەردام و سەرکەوت هەتا لە چاو ون بوو.

من ڕاوەستابووم.

وتم: دەی با خۆم سەربکەوم، لەوێ باپیرەم دەدۆزمەوە.

حەزم بە گەڕانەوە بۆ دونیا نەبوو، دەمزانی لەوێ ئەمان و ڕزگار بوونم دەست دەکەوێت.

من هزر و بیرکردنەوە و جۆرە ژیانی خەڵکی سەرزەویم حەز لێ نەمابوو، وتی وتیەکانی دونیا و، دڵە ڕاوکێکانی سەر زەوی زۆر بێزراو بوون لەلام، دەموت دیسان جارێکی تر ئەزموونی دونیا سازی بکەمەوە!

زۆر سەختە کە دەگەڕێیتەوە!

دڵم بە دایکم و باوکم دەسوتا، بەڵام نەمدەتوانی ئەو قوربانیە بدەم و بگەڕێمەوە.

نەمدەویست ئەو فرسەتە لەدەست بدەم، دەبێت لە کۆتاییدا دایکم و باوکم قبوڵی مردنی من بکەن و لەگەڵی ڕابێن.

من بیرم لەوە دەکردەوە کە پێ پلیکانەکان زۆرن و چۆن دەست بە سەرکەوتن بکەم، کەچی کە سەیرم کرد دەبینم وردە وردە کەمیان کرد و ڕێگای سەرکەوتنم نەما، تێ گەیشتم سەرکەوتن بۆ سەرەوە نەماوە و کۆتایی هاتووە بە نسبەت منەوە!!

توند دەستم بە پێ پلیکانەکەوە گرت!!

کەچی ئەو دوانەی کە پێشتر لەگەڵم بوون هاتن و منیان برد و دوریان خستمەوە لەو پێ پلیکانانە! ئازاریان نەدام، بەڵام دوریان خستمەوە!

وتیان: طەواف و ئەرکەکانت تەواو بکە.

هەستم کرد چرکە بە چرکە لە کەعبە دوردەکەومەوە، هەتا شەقام و کۆڵانەکانم لێ دەرکەوتن و لە ناوەڕاستی ڕێگاکەدا هەستم کرد کە گوریسێك لەناو قەدم بەستراوە، گوریسەکە لەسەر شێوەی هی دونیا نەبوو، وەک کێبڵێکی ڕووناکی بوو، دەمویست بیپچڕێنم، بەڵام نور بوو دەستم دەچوویە ناویەوە و پچڕاندنی بۆ ئەو کاتەی من مەحاڵ بوو!

دەمویست ئەو گوریسە نورانیە بپچڕێنم و بگەڕێمەوە بۆ کەعبە، بەڵام وا دیاربوو ئەو گوریسە نورانیە کاری لەسەر گەڕانەوەی من دەکرد بۆ دونیا، بەو جۆرەش بوو.

دەمزانی ئەمڕۆش نەبێت سبەینێ من دەمرم دەگەڕێمەوە بۆلای خودا بۆ جیهانی نادیار، ئەی بۆچی ئێستا نەبێت و ڕزگارم بێت لە دونیای پڕ لە سزا و نادادی.

ڕەنگە لە تێڕوانینی دونیاییەوە، من خۆپەرست بووبم کە ویستی گەڕانەوەی دونیام نەبووە.

بەو مانایەی کە گوێم لە خەمی دایکم و باوکم نەبووە بۆ من!! مانـای ئەم تێـڕوانینە لێرە مانا ناکرێت هەتا مرۆڤ خودی خۆی دەگاتە ئەوێ و حاڵی دەبێت!

دایکم لەلای سەرم دانیشتبوو لە تونێلەکە و صڵاواتی لە حەزرەت دەدا ﷺ و ئەجـر و پاداشتەکەی دەنارد بۆ من هەتا چاک ببمەوە!!

وا دەزانم گەورەتـرین حـیکمەت لە گەڕانەوەی ئەزموونـداران بـۆ دونیـا، ئەوەیە کە ئەزموونەکانیان بگێڕنەوە!

پەلە مەکەن لە حوکم دان بەسەر خەڵکیدا، چونکە بەرپرسیارێتیەکی گەورەیە.

## دەستم بەربدە وا گەورەی ڕێزدار هات



'ڕەزا مالیکی' ئەزموونەکەی بەم جۆرە دەگێڕێتەوە و دەڵێت: ژیانێکی سـەختم بەڕێ کرد، خەمـی ژنێکـی نەخۆشـیش ئەوەنـدەی تـر خەمبـاری کردبـوم، شـەش سـاڵم لە سەردانی دکتۆر و نەخۆشخانەکان تەواو کرد، قەدەرێکی سەیر، چەندین هەفـتە منـیش گیانم دەدا کاتێ خێزانم لە گیاندانا بوو، کەسمان نەبوو جگە لە خوا، ڕۆژەکانم بەسـەر برد لە نەخۆشخانەکان بە گریانەوە، دوعام بـۆ خێـزانم دەکـرد، موناجـانم لە خـزمەت خـوادا دەکـرد، ئـێمە لە ئەصـفەهان بـووین، بـردم بـۆ نەخۆشـخانەی 'زەهـراء' وتیـان گورچیلەکانی لەکار کەوتون، کەش و هەوای ئەصفەهانیش خراپە و باش نـیە، وتیـان: ئێوە خەڵکی کوێن؟

وتم: خەڵکی شیمالین 'شیمالی ئێران'.

وتیان: بیبە بۆ شیمال با لەوێ بمرێت!

سەیرێکی دکتۆرەکەم کرد و وتم: ئەبێت ئاوا بوترێت بە نەخۆش!

وتی: کوڕی من ئاوا باشترە بۆ نەخۆشەکە، من شەست ساڵە پزیشکم.

ڕۆشتینە شیمال، لەم شوێن بۆ ئەو شوێن، زۆر بە سەختی ژیاین.

هەتا حاڵی خراپتر بوو، کاتژمێر یەکی شەو بوو بردم بۆ نەخۆشخانە.

دکتۆر وتی: بە تەواوی گورچیلەکانی لە کارکەوتون، دەبێت بە زوترین کات شتنی گورچیلەی بۆ بکرێت، کاتژمێر دووی شەو بوو کە بردیان بۆ غەسل، خێزانم بێ هۆش کەوت، نزیکەی دوو کاتژمێرێك لە بێ هۆشیدا بوو، خەڵکی لەلای ژوری شتنی گورچیلەکە کۆبووبوونەوە، من حەپەسام و بێ تاقەت بووم، ژنێکی پیرهات و وتی: خوای گەورە گەڕاندیەوە، من باوەڕم نەدەکرد کە خێزانم جارێکی تر بگەڕێتەوە.

کە حاڵی باش بوو، ڕۆشتم بۆلای و وتم: حاڵت باشە؟

خێزانم وتی: بۆچی من گەڕامەوە؟

تۆ زۆر گریایت و هاوارت کرد!

وتم: ئاخر من خۆشم دەوێیت، من عاشقی تۆم، ئەگەر تۆ بڕۆیت دەبێت منیش بێم!

وتی: ڕەزا تۆ باشت نەکرد، من لە شوێنێکی زۆر جواندا بووم، شوێنێکی سەوز بوو، شوێنێکی زۆر نایاب بوو، هەتا سەیرت بکردایە جوانیت دەبینی، تەنها جوانیت دەبینی، بۆچی منت گێڕایەوە بۆ ئێرە؟!

وتم: من هیچم نەکردوە، جگە لە گریان و پاڕانەوە لە خودا.

لەو کاتەدا بانگی فەرموو، وتی: خودایە ئەگەر من دەبەیتەوە بۆلای خۆت با لەکاتی بانگدابێت، لەگەڵ دووەم جاری وتنی 'الله اکبر'ی بانگی نیوەڕۆدا گیانی بەخشی.

زۆر جار بێ هۆش دەکەوت و بە منی دەوت: بۆچی دەگەڕێمەوە بۆ دونیا، من لە جوانترین شوێن بووم.

وتم: ئەو شوێنە جوان و سەوزە کە دەیبینیت لە کوێیە؟

چ شتێکت بینی وە ئا بەو جۆرە عاشقی ئەوێ بوویت.... سوێندی بە خوای گەورە خوارد... کە وتی بێجگە لە حەقیقەت و ڕاستی شتێکی تر نالێم.

وتی: ڕەزا... عەزیزم... تۆ نازانیت ئەو جیهانە چی یە!!

من بینیومە!

بەهەشت لەوێیە... هەرچی شتێک کە دەستی لێ دەدەیت نوری لێ بەرز دەبێتەوە، ژنێکی زۆر جوان هات بۆلام، کە نەمدەتوانی سەیری ڕوخساری بکەم، ئەوەندە جوان بوو، پێی وتم: هەستە لەو جێگایە دەربچۆ.

دەستی گرتم، تکاتان لێ دەکەم لە ڕێگاکەمدا ڕامەوەستن لێگەڕێن با بڕۆم.

لەکاتی شتنی گورچیلەدا بوو تەواو حاڵی شپرزە بوو، پزیشکەکان وتیان تۆ بڕۆرە دەرەوە، وتم: بهێڵن تەنها ئەم چەند ساتەی ماوە با لەلای بم، سوێند بەخوا هیچ نالێم و، بهێڵن لەم کۆتاییەدا جێی نەهێڵم.

دەستی خێزانم گرت و وتی: سوێندت دەدەم نزای گەڕانەوەم بۆ مەکە و وازم لێ بێنە بابڕۆم.

دەستیم بەردا، وتم: دکتۆر وازی لێ بێنە با بڕوات، با پشو بدات بکات و ڕزگاری ببێت لە دونیا. ئیتر کۆچی دوایی کرد.

لە شەوی سێهەمی کۆچی دواییدا، لە خەودا بینیم و پێی وتم ڕەزا شوێنەکەم زۆر جوانە، زۆر شیرین و ناوازەیە، ڕەزا من لێت ڕازیم، داوا لە خوای گەورە دەکەم لێت ڕازی بێت، زۆر سوپاست دەکەم کە وازت لێ هێنام و گەیشتمە شوێنی هەمیشەیی، گەیشتمە جوانی ئەبەدی، دڵت خۆش بێت من ڕزگارم بووە.

سێ شەو لەسەر یەک بینیمەوە، ئێمە لە ژیانماندا زۆر سەختی و ئازارمان بینی، بەڵام چونکە پێکەوە بووین و عاشقی یەکتر بووین، هیچ سەختیەک نەبوو، حەماڵیم دەکرد، بارم گران بوو، بەڵام ئەوە سێ ساڵە بەبێ ئەوم، ژیانم زۆر سەخت و بێ ئومێدیە!

نە ماڵ نە پارە هیچ ئەرزشێکی نیە لە لام، من لە گەیلان ماومەتەوە لەبەر عیشقی گڵی سەر گۆڕی ئازیزەکەم. ئەگەر ئەو لێرە نەبوایە نەدەمامەوە.

ئەگەر شەوانی پێنج شەممە نەچمە سەر گۆڕەکەی وا دەزانم بێ وەفاییم کردوە، شەوانی پێنج شەممە دەچمە سەر گۆڕەکەی و هەتا کاژمێر (١ - ٢)ی شەو لەلای دەمێنمەوە، من لە دوای ئەو ناتوانم بژیم، هەرچیەکم بە حەماڵی دەست دەکەوت بۆ شتنی گورچیلەی سەرفم دەکرد، ئێستا پارەم بۆ چیە!!

ئێستا کە پارەیەکم دەست دەکەوێت دەیدەم بەو نەخۆشانەی کە ناتوانن چارەسەری خۆیان بکەن، من کاری حەماڵیەکەی خۆمم خۆش دەوێت چونکە یادەوری خێزانم بیر دەخاتەوە..

ڕۆژێکیان.. بە یەکەوە لەگەڵ خێزانم ڕۆشتین بۆ نەخۆشخانەی 'حشمت'، دکتۆر بەخێزانمی وت: دوو دەماری گەورەی دڵی خێزانت گیراوە، دەبێت قەستەرەی بۆ بکەین، ئەوەش ساڵی (٢٠١٥)ی زاینی بوو، وتم: چەندە پارەی دەوێت؟

وتیان: نزیکەی (٢٧٠) هەزار تمەن.

من تەنها (٢٠٠) دوو سەد هەزار تمەنم هەبوو، من هەمیشە کە بانگی خێزانمم دەکرد بە خۆشەویستم بانگم لێ دەکرد، هەرگیز ناویم نەدەهێنا.

بیست و نۆ ساڵ پێکەوە ژیایین، هەموو کات پێم دەوت عەزیزم... هەناسەکەم... خۆشەویستم.

وتم: خۆشەویستم تۆ لێرەبە... من دەچمەماڵەوە و پارەکە دێنم، هەتا قەستەرەکەت بۆ بکەین و باش ببیت.

وتی: باشە، نزیکەی سەعاتێکم پێ چوو هاتمەوە، کە گەڕامەوە خێزانم وتی: قسەم لەگەڵ دکتۆرەکە کردوە، دەڵێت ئەمڕۆ ئامێرەکەمان تێک چووە، ئەمڕۆ ناکرێت، هەفتەی داهاتوو بێنەوە.

وتم: باشە با بڕۆین.

خێزانم پارەکەی لەلای خۆی هەڵگرت و سواری تەکسی بووین، لە نیوەی ڕێگا پێی وتم: ڕەزا با شتێکت پێ بڵێم.

وتم: بەڵێ چی دەڵێیت؟

وتی: من و تۆ ژیانێکی دورودرێژ پێکەوە ژیاوین و درۆمان لەگەڵ یەکتر نەکردوە، ناپاکیمان لەیەکتر نەکردوە.. وایە؟

وتم: بەڵێ وایە.

وتی: ئەو ژنەت بینی کە دەگریا!؟

وتم: بەڵێ بینیم.

وتی: کچەکەیت بینی کە لە تەمەنی (١٦) ساڵیدا بوو؟.

وتم: ئەو کچە چی بوو؟

وتی: ئەوان نەناسراون، لە دەوری 'ڕودسەر'ەوە هاتبوون بۆ ئێرە، پارەی تەواویان نەبوو، کاتێ هاتینە دەرەوە پارەی قەستەرەکەم لە پەنایەکەوە دا بەو ژنە بۆ کچەکەی!!

وتم: ئەی ئێمە چی بکەین بۆ قەستەرەکە!

وتی: ئەو کچە لە سەرەتای ژیاندایە، ئەگەر من بشمرم ژیانم کردوە.

وتم: خودایە شوکر بۆتۆ، فەرامۆشمان نەکەیت، با بڕۆین....

که گەڕاینەوەماڵەوە، زانیم دەبێت بۆ بەیانی پارەکە ئامادە بکەم، هەفتەی داهـاتووی نەدەویسـت، پـارەکەم ئامـادەکرد و بـۆ بەیـانی چـووینەوە بـۆ نەخۆشـخانەکە، دکتـۆر سەیری ڕاپۆرتەکانی کرد و وتی: تۆ هیچ دەمارێکت نەگیراوە!

وتم: دکتۆر تۆ دڵنیابیت، سەیری ڕاپـۆرت و وێـنە و ئەشـعەکان بـکە، ئـێمە دوێنـێ هاتین و وتیان قەستەرەی پێویستە و دوو دەماری گیراوە!

وتی: ئەوە فەحس و شتەکانی هیچی تیا نیە.

کێ پێی وتوون قەستەرەی دەوێت، وتمان دکتۆرێکی تری لێ بوو پێی وتین.

دکتۆرەکە وتی: ڕەنگە موعجیزەیەک بێت، من نـازانم... بەڵام گرنـگ ئەوەیە ئەم ژنە هیچ کێشەیەکی دڵی نیە.

ئیتر ئەوە بوو هەتا کۆچی دوایی کرد کێشەی دڵ و گیرانی بۆریەکـانی دڵـی نەبـوو، پێویستی بە قەستەرە نەبوو!

خێزانم باسی بارانێکی ڕەنگـاو ڕەنگـی دەکـرد کە بـاریبوو لە ئەزموونەکەیـدا بینـی بووی، کە بەسەر ناوچەیەکی زۆر جوان و سەوزا داباریبوو.

بارانێک کە پروشەی وەک دڵۆپی فرمێسـک بـوو، ڕوخسـاری دەکـردە ئـاوێنەیەکی ڕوت.

جوانیەکی دەبەخشی کە لە وەسف کردن نایەت.

دەتوت دەنکی هەنارە و دێتە خوارەوە.

هەمـوو نەخۆشـخانەکە و، سـتافی گـورچیلە و شـتنی گـورچیلە و کارمەنـدەکان، بەسـەرهاتی ئەزمـوونەکەی خێزانمیـان دەزانـی وبـۆی گێڕابـوونەوە، هەتـا ئەوەبـوو پزیشکێک بەمنی وت: بە خێزانت بڵێ با ئیتر لێرە باسی نەکات!

خێزانم دەیوت من ڕاستیتان بۆ باس دەکەم، چۆن دەتوانم بیشـارمەوە لە خەڵکـی و دونیای لێ ئاگادار نەکەم!!

له ماڵەوەش خەڵکی دەهاتن و بەسەرهاتەکە بە تەواوی بڵاوبویەوە بە ناوچەکەدا.

خێزانم لەبەر ئەوەی نەخۆش بوو، بە ناڕەحەت قسەی بـۆ دەکـرا، بەڵام وەک ئەوەی ئەوە ئەرکێک بێت لەسەر شانی دەیگێڕایەوە.

کە کاتێ نزیکی مەرگ بوویەوە وتی: دەستم بەردە، ئەوە گەورەی ڕێزدار هات.

وا بەرەو من دێت، سەیر بکە ئەو بارانە نەرمە چەند جوان دەبارێت!

مـن نابینـای جیهـانە نـوێکەی ئەویـووم، بەڵام دڵنیـابووم لە ڕاسـتگۆیی و بینیـنە شهودیەکانی ئەو، تۆزێـک بە ئـاو دەمـی تەڕکـرد و چـوویە بـێ هۆشـیەکی قـوڵەوە و دەستی شل بوو...

پزیشکێک هات و وتی: خۆش بەختی بۆ خێزانـت ئەو هەمـوو شـتێک دەبینێـت و ئێمە نابیناین.

خێزانم دەیوت ڕۆحم قوربانی ئەسپی بێ وێنەت بێت گەورەم وا هاتیت.

شەش نەخۆشی تر لەو ژورەدا بوون گوێیان لێ بوو دەیوت: خـودایە بمـبەرەوە بـۆ لای خۆت !! پەنجەرەکە بکەنەوە با گەورەکەم بێتە ژورەوە!

سـوێند بە قورئـان ئەوە لە بەرامـبەرم ڕاوەسـتاوە و پـێم دەڵـێن وەرە.... بهـێڵن بـا بڕۆم....

دەرگا و پەنجەرەکان بکەنەوە با ئەو عەزیزانە بێن.

وتم بە دکتۆرەکە دەستی بۆ مەبەن، هیچی پـێ مەدەن... بـابە ئـارامی بـڕوات، ئەو کەوتۆتە سەر ڕێگای ڕۆشتن، وازی لێ بێنن.

# ئەزموونەکەم بە تەواوی منی گۆڕی

'حەسەن تەحەقومی' لە شاری 'مەشـهەد' دەژی و ئەزموونـداره و بەم جـۆره بۆمـان دەگێڕێتەوه لە مانگی ڕەمەزانی (٢٠٠٧) تەمەنم (٢٦) ساڵان بوو، لە شاری 'نیشـاپور' کارێکم هەبوو، سەیارەکە ئیشی نەدەکرد، ویستم بچم فیتەرێک بێنم، لە ماڵ دەرچـووم و ڕووم لە ئاسـمان بـوو وتـم: خـودایە مـن کەسـێکی سەرسـەخت و عینـادم، ئێسـتا سەیارەکە کار پێ دەکەم، ڕۆشتمە ناو سەیارەکە و کاری کرد....

هەمـوو کەس لە گەنجێتیـدا توشـی بـێ ئاگـایی و هەڵە دەبێـت، مـن زۆر نەزان و لەخۆبایی بووم، ئەگەر ڕۆژی (٤ - ٥) جار توشی شەڕ نەهاتمایە، شـەوەکەی بەباشـی خەوم لێ نەدەکەوت، دڵم بەوە ئاوی دەخواردەوه لە چەند کەسێک بدەم.

'موحەمەد رضا' کوڕە پوری 'تحققی'یە و دەڵێت: بـراکەم کە کـۆچی دوایـی کـردوه لەگەڵ تحققی پورزامدا لە خەودا بینیمن، بۆ بەیانیەکەی بە ئاگا هـاتمەوه و وتـم: ئەوه چ خەونێک بوو!

من ماوەیەکی زۆره براکەمم لە خەودا نەبینیوه، ڕۆژی دواتـر خەوەکەم بیـر کەوتەوه، کە براکەمم لەگەڵ حەسەن تەحەقوقی بینـی، شـتێکیان بەیەکەوه دەخـوارد و دەگەڕان، هەردوکمان لە مەشهەد بووین و ماوەیەک بوو نێوانمـان بـاش نەبـوو، ڕۆشـتم بـۆلای هەتا لە حاڵی دڵنیا ببم، لێم پرسی: حاڵت چۆنە؟

شتێك ڕووی نەداوه؟!

وتی: نەخێر هەموو شتێك ئاساییە.

منیش خەوەکەم بۆ نەگێڕایەوه.

ئەگەر لەگەڵ کەسێک نێوانتان باش نەبێت و لە هەفتەیەکدا سێ جار سەری لێ بدەیت بۆ ئەوەی دڵنیا ببیت لێی، من نەمدەزانی ڕاڤەی خەونەکە چی یە؟

گومانم بۆ ئەوە دەچوو کە ڕەنگە بیەوێت کارێک بکات و ئەو کارەش خراپ بێت و دەبێت نەهێڵم ئەو کارە ئەنجام بدات!!

لە سێهەم جاردا پێم وت: حەسەن خەونێکم بە تۆوە بینیوە، ئەگەر دەتەوێت کارێک بکەیت ڕەنگە خێری تیانەبێت و ئەنجامی مەدە، نەوەک شتێکی خراپت بەسەر بێت!

حەسەن دەڵێت: من پێکەنینم بە وتەکانی دەهات، وتم: واز لەو وتانە بێنە.

سوپاس بۆ خودا لە ژیانمدا بۆ مەسەلەی ناموس و شەرەف و حەیا زۆر باش بووم، نوێژ و ڕۆژو و دین و ئیمانم باش بوو، بەڵام شەڕەنگێز بووم، بە هۆی ئەوەی کە بە جەستە و لاشە بەهێز بووم، یاری بۆکسێنم دەکرد و لەخۆم بایی بووبووم! لەگەڵ هەندێ گەنج تێکەڵیم هەبوو کە سەرکەشیان کردبووم.

ئۆتۆمبیلەکەم ئیش پێ کرد و ڕۆشتمە سەر ڕێگای 'نیشابور'، کەسێکم بینی لەسەر ڕێگاکە ڕاوەستابوو، وتم: با ئەم بەندەی خوایەش لەگەڵ خۆم سەر بخەم.

وتی: برام بە چەند دەمگەیەنیتە مەشهەد!

وتم: هیچم ناوێت، با پێکەوە بین و منیش تەنهام، لەگەڵ تۆ بم بێ تاقەت نابم.

ماوەیەکی تریش ڕۆشتین و کەسێکی تریشمان سەرخست، هەتا گەیشتینە ناوچەی 'باخچە' کە لە نێوان مەشهەد و شاری 'نیشاپور'دایە.

لەو کاتەدا بەنزین کەم بوو، ویستم لە ڕێگایەکی کورتەوە بڕۆم، ڕێگایەکی کۆن هەبوو نزیکتربوو، لەو ڕێگایەوە ڕۆشتم.

کاتێ لە ڕێگا پێچاو پێچەکانەوە دەهاتمە خوارەوە، شاری مەشهەد دیاربوو، شەوێکی تاریک بوو، وەختێکم زانی سەیارەکە لە ڕێگاکە دەرچوو خۆم بۆ نەگیرایەوە

ئەو کەسەی لە تەنیشتم بوو خەوتبوو، بە ئاگا هـاتمەوە، بەڵام ئەوەی دواوە خەوتبـوو، لە ئاوێنەکەوە بینیم.

لە چرکە ساتێکدا!! ئۆتۆبیلەکە بە ئاسـمانەوە بـوو، بەرەو شـیوەکە دەڕۆشـت، شـیوو دۆڵەکەش'٤٠ مەتـر' قـووڵ بـوو، بینـیم کە بەرەو خـوار دەڕۆشـتین، لە تاریکاییـدا وەرگەڕاین و کەوتینە ئەو شیوەوە.

کە کەوتیـنە خـوارەوە، مـن خـۆم بینـیەوە لەگەڵ دوو کەسـی تـردا و هەسـتاومەتە سەرپێ و ڕاوەستاوم.

یەکێکیان پیاوێکی پیر بوو کە لە تەنیشـتم دانیشـتبوو، ئەویـش وەکـو مـن هەسـتایە سەر پێ و ئاسایی بوو، هیچ گرنگ نەبوو بەلامەوە کە سـەیارەکە چـی بەسـەرهاتووە؟ کەسی سێهەم لەناو ئۆتۆبیلەکە خەوتبوو، خامۆش بـوو، ئەو لە نـاو ئۆتـۆمبیلەکە وەک پێشتر بوو، خەوتبوو!

من و پیرە پیاوەکە سەیری یەکترمان دەکرد و سەیری خۆمانمان دەکرد، دەمزانی مـن 'حسن'م، دەمزانی ئەوە جەستەی منە لەناو ئۆتۆمبیلەکە، هیچ ترس و دڵە ڕاوکێـیەکمان نەبوو 'من و ئەو پیاوەی لەگەڵم بوو'، باکمان لەوە نەبوو کە وەرگەڕاوین و لاشـەکەمان بەجێ ماوە! تەنانەت لە یەکتریشمان نەپرسی، کە چی ڕوویداوە؟!

وتم: با بڕۆین، بیریشمان لە کەسی سێهەم نەدەکردەوە هەتا لەگەڵ خۆمـان بیـبەین، یاخود بەخەبەری بێنین!

بەردەوام دەڕۆشتین نەدەگەیشتینە کۆتایی!! لای چەپمان هەمووی تاریکایی بوو.

بەڵام لە تاریکایدا دەمبینی، کە دەڕۆشتین نە دەترساین و هیچ دڕکێک، بەرزایـیەک، بەردێک ئازاری نەدەداین و باکمان لە هیچی نەبوو.

سەیری دەوروبەری ئۆتۆبیلەکەشم دەکرد و خـۆم دەبینـی چاوەکـانم داخسـتبوون، وەک خەوتویەک وابووم و بێ باک بووم لە جەستەکەم!

هەر چەندێک دەڕۆشتین ماندوو نەدەبووین..

کوڕە پورێکم هەبوو بە ڕەحمەتی خوا چوو لە ساڵی (٢٠٠٦) لەو شوێنەدا بینیم وەستا بوو، بە لامەوە سەیر نەبوو وەختێ بینیم، چەندین ساڵ بوو مردبوو ئاسایی بوو بەلامەوە کە بینیم.

وتم: عەلی ئێمە لە کوێین؟!

وتی: مەپرسە و وەرە!

چەندین کیلۆمەتر لە جەستەکەم دورکەوتبووینەوە، کەچی زۆر بە ئاسانی و زۆریش بە نزیکی جەستەکەمم دەبینی، لەوێ دوری نابێتە هۆکاری کەمتر بینین و ناڕوونی!!

وەختێ ماوەیەکی زۆر ڕۆشتین، وتم: عەلی ئەم دوانەی کە لەگەڵمن و لە فریشتە دەچن لێیان دەپرسم بۆ کوێ دەڕۆین، بەڵام وەڵامم نادەنەوە.

وتم: عەلی تۆ لێرە چاوەڕوانم بکە هەتا دەچم بە خێزان و منداڵەکانم دەڵێم و دوایی دێمەوە بۆ لات! تۆزێک پێکەنی و وتی: باشە بڕۆ!

دەیزانی هیچ ویست و بژاردەیەکم نەماوە، ئەگەر بە فەرمانێکی خوایی ڕۆحێک بڕیاری گەڕانەوەی بۆ دونیا نەدرێت، هەرگیز بە هیچ کەس ناکرێت و مەیسەر نابێت!

لەم کۆتاییەدا دەمویست خۆم بگەیەنمەوە جەستەکەم و هەڵسمەوە و بچمەوە بۆ ماڵەوە!!

عەلی حاڵی بوو بوو کە من دەمەوێت چی بکەم! لەبەر ئەوە پێکەنی!

(٣٠- ٤٠) مەترێکم مابوو بگەمە جەستەکەم، لە تاریکایی شەودا بووم و دەمبینی، گەیشتمە (٢٠) مەترێک سێ کەسم بینی، خاوەنی قامەت و هەیبەتێکی گەورە بوون، وێنای ئەوە بکە کە منداڵێک لە تەمەنی دوو ساڵاندا بێت و سەیری پیاوێک بکات کامڵ و خاوەنی هەیبەتێکی گەورەبێت.

هێشتا بیست مەترێکم مابوو، سەرم بەرز کردەوە بۆ ئاسمان هەتا قامەتیان ببینم!!

نەمدەتوانی سەیری ڕوخساریان بکەم، یەک پارچە نور و ڕووناکی بوون!

ویستم بچمە پێشەوە، سەیر دەکەم ناتوانم زیاتر بڕۆم!

گوێم لێ بوو یەکێک پێی وتم: بۆ کوێ؟

وتم: دەمەوێت بچمەوە ناو ماڵ و مناڵەکەم، چاوەڕوانی من دەکەن.

وتیان: هەموو شت تەواو بوو.

وتی: جارێ ڕابوەستە.

لە دڵی خۆمدا وتم: یانی چی؟

یانی چی هەموو شت تەواو بوو.

ئەمانە کێن؟ من نەمدەزانی کە مردوم.

دەموت تەنها ڕێگەم بدەن نزیکی جەستەم ببمەوە و بگەڕێمەوە بۆ ماڵەوە.

من لەوە و پێش بەهێز و توانا و پاڵەوانێتیدا دەمنازی، حەزی شەڕ و حەزی لێدانی خەڵکی لاوازی کەسایەتیە.

لە لاوازی خۆم بوو ڕۆژانە لە چەند کەسێکم دەدا، ئەو کەسەی کە وەڵامی نەدەدامەوە و خۆی لە شەڕم لادەدا ئەوە بەهێز بوو.

سێ مەردم بینی کە ڕاوەستابوون، پێم وتن: مۆڵەتم بدەن، هاوژینم هەیە، مناڵم هەیە، چاوەڕوانم دەکەن، یەکێکیان وتی: لەبەر ئەوەی لە پێناوی ئێمەدا چەند دڵۆپە فرمێسکێکی ڕشتوە مۆڵەی دەدرێت!

هەوڵم دا سەرم هەڵبڕم هەتا ڕوخساری پیرۆزیان ببینم، بەڵام نەمتوانی بیانبینم.

هەموو کردەوەکانی ژیانم لەو چرکە ساتەدا پیشان درایەوە، لێپرسینەوەیان لەگەڵ نەکردم لەسەر کردەوەکانم، لەسەر خراپەکانم، بەڵام دەبوو خۆم بۆ خۆم وەڵامی خۆم بدەمەوە.

من توشی شەرمەزاری بووم، سەرەڕای ئەو هەمووە گوناهەم شـەفاعەتیان بـۆ کـردم و مۆڵەتی گەڕانەوەم درا، توشی سـزای ویژدانـی بـووم، ئەوان زۆر بە لوتـف و نەرم و نیان بوون لەگەڵم، تەمەنای ئەوەم دەکرد زەوی قوتم بدات، بەڵام ئاوا شـەرمەزار نەبـم لە بەردەم خوای گەورە و مەردانی خوادا.

وا دەزانم ژن و منداڵەکانم بیانویەک بوون، ئەگینا ترسی ڕۆشتن بە گوناهباریەوە ئاوا منی خستە بەردەم تکای گەڕانەوە.

من پێنەگەیشتبووم بۆ گەیشتن بە مەردانی خودا، مـن شایسـتە بە بەرائەتـی ئەهلـی بەهەشت نەبووم، مەرحەمەتی خوایی منـی هێنـایەوە هەتـا دان بە هەڵەکـانم دا بنـێم و ئاوسی گوناهباری نەبم.

خودا شاهیدە ئێستا هیچ ترسێکم لە مردن نیە، ئامادەم بڕۆم، ئەوێ حەقـیقەتە، کـێ لە حەقیقەت هەڵدێ!

من بەم وتانەم نامەوێت خەڵکی باوەڕم پێ بکەن، مەکانەتی کۆمەڵایەتی و سیاسـیم مەطلەب نیە، ناوبانگ و شۆرەت و پلە و پایەی پێ ناکرم!

هیچی هیچم لەم گێڕانەوەیە ناوێت، تەنها گێـڕانەوەی حەقیەتێکـی بـێ سـنورە لەو دیو مردن، دادپەروەری ڕەها لەودیو بەرزەخە، ڕاستی لەوێیە!!

زانیم ئەو سێ مەردەی خودا کـێ بـوون، حەزرەتـی ڕەسـول الـلە ﷺ و حەزرەتـی ئیمامی حوسین و حەزرەتی عەباس کوڕی حەزرەتی عەلی کوڕی ئەبـی طالـب بـوون 'خوایان لێ ڕازی بێت'.

لە خەجاڵەتی خۆمدا سوجدەم بۆ خوای گەورە برد، خوایە شـوکر بـۆ تـۆ کە وەرت گرتم و لێم خۆش بوویت و مۆڵەتت پێ دامەوە!

چەند دڵۆپە فرمێسکێک شەفاعەت بکات، هیچ کردارێک ون نابێت، وەختـێ ئـێمە بیرمان دەچێتەوە پشت ئەستوری بیر نەچـوونەوەی ئەوێـین، مـن لەوە و پـێش دەسـتی

باوکیشم ماچ نەدەکرد، لەخۆبایی بووم، ئێستا لوتفی ئیلاهـی دایپۆشـیوم، کە سـەرم لە سوجدەکەدا هەڵبڕی ئەو سێ مەردە موبارەکەم نەبینی یەوە و ڕۆشتبون.

گوێم لێ بوو دەیانوت: حەسەن هاتەوە هۆش خۆی، حەسەن گەڕایەوە بۆ ژیان.

کە سـەیرم کـرد، کۆمەڵێـک خەڵکـم لە دەوری خـۆم بینـی یەوە، دەبیـنم بـراوم بـۆ نەخۆشـخانە و، لە سـاردکەرەوەی مردوەکانـدا بـووم و لە دوایـدا گەڕاومەتەوە، ئینجـا ئازاری هەموو جەستەم بـێ زاری کردبـووم، وتـم خـۆزگە نەدەگەڕامەوە، لەوێ هـیچ ئازارێکم نەبوو، دوایی زانیم، کاتێ لە ساردکەرەوەی مردوەکـان دەریـان هێنـاوم، یەک مانگ لە چاودێری ورد (١٢٤) بێ هۆش بووم.

پیاوە پیرەکە کۆچی دوایی کرد و لەگەڵ عەلی پورزامدا ڕۆشت، خوای گەورە لێیـان خۆش بێت، کەسی سێهەم کە لە ئۆتۆبیلەکەدا لەگەڵمان بـوو دەسـت و قـاچی شـکا، خوای تەعالا بیپارێزێت، ئێستا نازانم لە کوێیە!!

مەرگ مانای کۆتایی ژیان نیە، مەرگ دۆزیـنەوەی ژیـانە ڕاسـتەقینەکەیە، مـرۆڤ لە مەرگەوە دەگاتە قۆناغێک کە خۆی بناسێت، گوناە و تاوان بـۆ شـاییەکی ترسـناک لە مرۆڤدا دروست دەکـات! مردنـی جەسـتەی مـرۆڤ، مردنـی مـرۆڤ ناگەیەنێـت! ئەو ئارامیە دەروونیەی لە دوای گەشـتی بەرزەخ دەسـتم کەوتـووە، نـایگۆڕمەوە بە هەمـوو خۆشیەکانی دونیا.

من و تۆو هەموو کەسێک خەون دەبینین، بەڵام من تەنانەت کـاریگەر نەبـووم بەو خەونانەش کە ڕوویان لەو حەقیقەت و ڕاستی بووە!!

بەڵام ئەم ئەزموونانە خەون نیە، ڕاستیەکە ناتوانیت لێی هەڵبێیت.

پێش ئەزموونەکەم زۆر ئامۆژگاری دەکرام، کتێب و نامیلکە و وتـارم زۆر دەبینـی و دەبیست، بەڵام هیچیان کاریگەریەکی ئەوتۆیان بەجـێ نەهـێلا، بەڵام ئەزمـوونەکەم بە تەواوی منی گۆڕی.

ژمارەیەك لەو كەسانەی
ئەزموونی نزیكبوونەوە لە
مردن'یان بینیوە لە
كوردستان.

# ئەزموونی حاجی ئاواتی چەمچەماڵ

دیدارێکی تایبەتم لەگەڵ ناوچەی سەنگاو چەمچەماڵ بەڕێز حـاجی ئـاوات حسین تۆفیقە لە بەرنامەی شیرین چا.

کە سەرقاڵی چارەسەری کێشە کۆمەڵایەتیەکانە و، خاوەنی متمانە و ڕێزی ناو خەڵکیە.

بۆی گێڕاینەوە و وتی: مـن لە سـاڵی (١٩٧٧) کە بـاوکم لە پێشـمەرگایەتیدا شەهید بوو، نازی باوکمان بەسەرەوە نەما، دەگریام و دەموت چـونکە بـاوکمان نەماوە خزمەکانمان نایەن بـۆ مـاڵمان، هەر بە منـاڵی خەیـاڵی ئەوەم دەکـرد کە خۆزگە تەمەنم دەگەیشتە هەشتا ساڵان و سـەرقاڵی ئاشـتەوایی و بەیـن خـۆش کردنی خەڵکی دەبووم!

باوکم کاتێ شەهید بوو پێشمەرگە بوو، بەرپرسی هەرێمی گەرمیان بوو. ئەو واقعەی کە بینیم 'ئەزموونەکەم' منی زیاتر کرد بە کەسێکی کۆمەڵایەتی و، زیاتر حەزی خێر و چاکەی تیا ڕوواندم.

باپیرەم ناوی فارس بووە و، وا دەزانـم ساڵی (١٩٥٠) بووە کە کۆچی دوایـی کردوە پیاوێکی زۆر موسوڵمان و حەڵاڵ خۆر و دیندار دەبێت، وەسیەتی کردوە بۆ کوڕی کوڕیشی کە حەرام نەخۆن و هەرگیز حەرام خواردن خێـری بـۆ هـیچ کەس نەداوەتەوە، هەتا بۆ ئێمەی بداتەوە، ئەگەر قەلێکـی حەرام بخـۆن هەر لە دونیادا مەڕێکمان مردار دەبێتەوە، ئەگەر مەڕێکی حەرام بخۆن گایەکمان مردار دەبێتەوە و بەو جۆرە.

ئەگەر زیاتر بێت کوڕێکتان دەمرێت!

لە ساڵی (١٩٥٠) گەردن ئازادی کردوە لە ئاوایەکەمان و خزمان و، وتویەتی من دەچم بۆ بەغا بۆ خزمەتی شێخ عبدالقادری گەیلانی و بە زاهیری من لەوێ دەمرم، دوعاشم بۆ بکەن کە لەوێ بمنێژن، تەنانەت کۆمەڵێ ئامۆزا و خزممان هەن لە 'کانی شایەر' چووە بۆ ماڵی حاجی ئەحمەدی گوڵناز و ماڵئاوایی و گەردن ئازادی کردوە، کە دەچێتە بەغا، لەوێ ئۆتۆمبیل لێی دەدات، ئەو کاتە بنەماڵەی حاجی موحەمەدی کۆڵەک لە سلێمانی زۆر دۆستایەتی و محبەتیان لەگەڵ باپیرە فارسمدا هەبووە، پێی دەزانن لە بەغا و بە دیاریەوە دەبن و، ئەوان وەڵام دەنێرن بۆ کوڕەکەی کە 'تۆفیق' ی باپیرمە، واتە باوکی باوکم دەچێت بۆ شاری بەغا. لە نەخۆشخانە بە زمانا پێی دەگەن و دەڵێت بە زاهیری من دەمرم، پێش ئەوەی بێم بۆ ئێرەش پێم وتون و هەر لە ئاوایی پێم وتون کە ماڵئاوایی یەکجاریم لێ کردون و وتومە والله أعلم ناگەڕێمەوە، ئێستاش بە وەك دیارە من دەمرم، خوێن لە شۆفێرەکە وەرمەگرن و گەردنی ئازاد بکەن، باپیرە تۆفیقیشم دەڵێت: نەو الله بابە گیان تۆ هەموو شتێکت لە ئاوایی پێ وتوین و گەردن ئازایت کردوە و، ئێمەش هیچ لە شۆفێرەکە ناسەنین و گەردنی ئازاد دەکەین. بەو جۆرە کۆچی دوایی دەکات و لە گۆڕستانەکەی شێخ عبدالقادر نێژراوە و لەسەری نوسراوە 'فارسی وەیسی جاف'.

با بێینەوە بۆ باسی ئەزموونەکەم، کە من مردنم بینی، وانەیەکی دادام کە قۆناغە سەختەکانم بینی و منی گێڕایەوە لە هەڵە و خۆ بەشت زانین و حەرام و گوناهەکان، بیر دەکەمەوە کە چی بکەین بۆ ئەو کاتەی کە مردین هەتا خوای گەورە لێمان ڕازی بێت.

من كە ئەو ئەزموونەم كرد واقعەكەی دوای مـردنم بینـی، خەوبینـین شـتێكی ترە، من بۆیە دەڵێم ئەوەی بینیم خەو نیە، چونكە هەرگیز نە شتی وام بینی وە، نە ئازاری بەو جۆرەش بەرجەستە بووە لە ژیانی واقعیمدا، ئەوەی بینیم واقع بـوو، بەڵام بۆیە ناویشی دەبەم بە خەون نازانم چ ناوێكی تری لێ بنێم، ئەگینـا خەون نەبوو!

من لە ساڵی (١٩٨٧) دا واتە نزیكەی سی و پێنج سـاڵە هـیچ خـاڵێكی ئەو ئەزموونەم بە ورد و درشتیەوە بیر نەچۆتەوە!

من سی ملیار ساڵی تریش تەمەنم بێت، قەناعەتم وایە بیرم ناچێتەوە، ئەوەندە واقعێكی ترسناک و توندم بینی.

هەتا ساڵێ دوای ئەو ئەزموونەم بە زۆر پڕوشەیەک نانم دەخوارد.

هەتـا مـاوەیەک دوای ئەوە ڕەنگـم زەرد بـوو، زۆر زۆر دەترسـام خزمەكـانم دەیانوت تۆ نەخۆشی ڕەنگت زەرد بووە بچۆ بۆ لای دكتۆر!

دەموت: نا نەخۆش نیم، پێم نە دەوتن كە بەهۆی ئەو ئەزموونەوە توشـی ئەم حاڵەتە بووم.

نە تێر دەخەوتم، نە تێر نانم دەخوارد.

تەمەنم حەڤدە ساڵ بوو، دوو ساڵ بوو نوێژم لەسەر بـوو، دەمویسـت فێـری نوێژ ببم، چونكە ئایەت و دوعاكان عەرەبی بوون فێری نەدەبـووم، ئەو كـاتەش خوێنەواریم نەبوو، لەم دوایانەدا خوێندم و خوێندەواری فێربووم.

دەمزانی كە نوێژم نەدەكرد ستەمم لە خۆم دەكرد و خۆم بە تاوانبار دەزانی.

ئەو كـاتەی كە ئەو ئەزمـوونەم بینـی نەخـۆش بـووم، گرانەتـام بـوو، كـاتێ خەوتبووم، وەک خەو دەیگێڕمەوە، بەڵام خەو نەبوو.

وەختێکم زانی کەسێک وەک پیاوێکی پیر وابوو، ڕیشی سپی بوو، ئەگەر تاڵە تاڵەیەک ڕیشی ڕەش لە سیمایا مابێت، قەمسەڵەیەکی لەبەردا بوو هـات، واشـە هەیە لە ئاسـمانەوە بە خێرایـی دابەزێـت و دەدات لە چـۆلەکەی پاسـاری و دەیڕفێنێت و دەیبـات، بەو جـۆرە دای لەمـن و زۆر بە خێرایـی بەرەو ئاسـمانی بردم، لەو ماوە کورتەیا من هاوارم دەکرد، کورە مەهێڵن بمبات، بۆ خـاتری خـوا ئەوا بردمی مەهێڵن....؟

کەس نە گوێی لەمن بوو، نە دەیانبینیم.

کە بردمی هەستم کرد لە خوارەوە هێشتا هەستم تیامابوو سەیری خۆمم دەکرد لە سەرەوە، وەختێ کەسێ دەمرێت لە سەرە مەرگا بۆ ڕۆحی خۆی دەڕوانێت کە دەڕوات.

بەڵام ئەوەی واقعی و مـن بوویێـت، ئەوەی سـەرەوە بـووم، نەک لاشـەکەی خوارەوەم.

خوارەوە تەنها وەک پەیکەرێک بوو لەلام.

ئەم پیاوە 'فریشتەکە' بە دەستێک منی گرت و بردمـی بـۆ ئاسـمان مـن هـیچ نەبووم لەناو دەستیدا، بەقەد چۆلەکەیەک دەسەڵاتم نەبوو، بەقەد پەڕە مریشکێک دەسەڵاتم نەبوو.

هەرچەنـد خـۆم ڕادەوەشـاند و هەوڵـم دەدا، هەتـا بەر بـبم لە دەسـتی هەر سەیریشی نە دەکـردم، زۆر ئاسـایی بـوو بەلایەوە کە بەو جـۆرەم دەکـرد، وەک تەزبیحێک چەندە تۆ بەلاتەوە گرنگە ئەویـش بـۆ مـن بەو جـۆە بـوو، چـاوم لە خوارەوە بوو کە چـی دەگوزەرێـت، بەڵام بە خێراییەکـی لە ئەنـداز بەدەر منـی گەیاندە ئاسمان، خێراییەکەی لە گولەی گڕدار بە هەزاران هەزار جار خێراتر بوو

که منی گەیاندە باڵاترین شوێن لە ئاسمان. ڕەنگە بڵێم لە نیو چرکە کەمتر منی گەیاندە ئاسمان.

بەڵام ئەو بردنە ئەوەندە پڕ ئازار بوو بۆمن بە ملیار ساڵ لە من ڕۆیشت، لە ئاسمان شتێک وەک هەوا لێی دەدام، ئەگەر هەموو ئاسمان کورەیەکی ئاگر بێت بەناویا بمبەن لەوە زیاتر ئازارم هەبوو، هەر کە بردمی بوم بە دوو کەس لاشەیەکی بێ گیان لە خوارەوە و ڕۆح و جەوهەر کە لە سەرەوە بووم و ئەوە من بووم.

لە هەموو ژیانمدا ئازاری ئەوەندە بەهێزم نەبینیوە!

ناشزانم چۆن باسی بکەم و بیگەیەنم و تەعبیری لێ بدەم، چونکە ئەو ئازارە ناوترێت و نازانرێت هەتا نەیبینی.

ئەگەر لەسەر زەویەکی تەخت پاڵت بخەن و بە ڕۆڵەیەک بێن بە سەرتا هێشتا ئەوە ئازاری کەمترە، ئەگەر کورەیەکی ئاگرت بۆ بکەنەوە بتخەنە ناوی هێشتا کەمە.

کاتێ ئێستاش تەنیا دەبم و بیری لێ دەکەمەوە دەمگریەنێت، چونکە لەو کاتی گیان دەرچوونەدا بێ کەسیت، توشی بارێکی نەبینراو دەبیت، کەسێک نیە هاواری بۆ بەریت.

هاوار بۆ کەس و کارت دەبەیت، چاوت لێیانە بۆت دەگرین، بەڵام ئەوان نە دەتبینن و نە هیچی تۆ دەبیستن، زۆر بێ کەسیت، ئەو فریشتەیەش نە پرسیارت لێ دەکات نە پرست پێ دەکات، نە گوێی لە ترس و هاواری تۆیە، نە توڕەبوونی تۆ، نە گریانت، نە پاڕانەوەت ئەو ناجوڵێنێت، باکی لێت نیە!

ئەو ئەرکی سەرشانی خۆی جێ بەجێ دەکات!

هیچ ئازاری نەدام، تورەنەبوو لێم، هیچ پێکەنینێک و ناسۆرێکم لێ نەبینی.

کە بەرێ کەوتین بۆ ئاسمان، وەک پەڵەیەکی سپی دیار بـوو، کە بەرەو ئەوێ دەچووین، وەک بڵێی پانزە مەتر بە پانزە مەتر دەبوو، کە گەیشـتمە پەڵە هەورەکە دەبینم دووان دانیشتوون، یەکێکیان پشتی لە قیـبلەیە و یەکێکیـان لەم بەر ڕووی لە قیبلە بوو، چوار پاسەوانی هەبوو، مێزێکـی لە بەردەسـتابوو، مەتـر و نیـو بە مەتر دەبوو، دوو پاسەوانیان لای دەسـتە چەپ و دوانیـان لای دەسـتە ڕاسـت بوون.

یەکی کتێبڵێکیان پێ بوو لە دەستیاندا ئەڵقەیان دابوو. ئەوەشـیان کە پشـتی لە قیبلە بـوو سـێ پاسـەوانی هەبـوو زۆر بە وردی بینـیمن کە وەسـف و شـێوە و هەڵسوکەوتیانم هەرگیز بیر ناچێتەوە. منی برد بـۆلای ئەوەی کە ڕووی لە قیـبلە بوو، ئێستا لێی تێ دەگەم و دڵم پێی خۆشە، ئەگینا ئەو کـاتە ترسـەکە و ئـازاری ڕۆشتنەکە ئەوەندە زاڵ بوو هەستم بە دڵخۆشی نەکرد. ئێسـتا دڵـم پێـی خۆشـە دەڵێم إن شاالله ڕەنگە ئەوەی کە براوم بۆ ئەوێ، ڕووی لە قیبلە بوو بەرەو باشی برابم.

کە بردمی بۆلای وتی: ناوت چی یە؟

وتم: ناوات حسین تۆفیق.

بەڵام زۆر زۆر دەترسام، ترسێکی نەبینراو، هەرچی ترسـی دونیـا هەیە کـۆی بکەیتەوە ناگاتە ئەو ترسە.

وتی: بەڵێ ناوی لێرە هەیە.

ناوی نوسیم و وتی بە فریشتەکەی کە بردبوومی بیبەرەوە خـوارەوە کە وتـی: بیبەرەوە خوارەوە، من زۆر ترسام، چونکە زانیم لە هاتنە خوارەوەمـدا بـۆ زەوی توشی هەمان ئازار و ناڕەحەتی دەبمەوە.

بە هەمان خێرایی پێشوو گەڕێنرامەوە!

گەیشتمەوە سەر جەنازەکەم، بەڵام بە ڕاسـەری جەنـازەکەمەوە وەسـتامەوە و نەخزامەوە ناوی.

بە بەرزی پێنج مەتر لە سەروی جەنازەکەمەوە، وەستا بووم و هەمان شـێوەی جەنازەکە بووم قاچم لە خوارەوە و سەرم لە سەرەوە!

ڕێک لە سەرەوە لە ئاستی جەنازەکەم بووم!

ترسێکی زۆر دایگرتم، هەرچەند هاوار لە کەس و کـارم دەکەم کەس گـوێی لێ نیە، دوو کۆڵان پشت ماڵی خۆمانیشم دەبینی، کە قەرەباڵغی بوو، دەیـانوت چی یە؟

دەیانوت: ئاوات مردوە!

چاوم لە هەموو لایەک بوو، گوێشم لێیان بوو.

هەبوو کە دەهاتە سەر تەرمەکەم بێ تاقەت بوو، هەبوو ئاسایی بوو، ئاگـام لە هەمووی بوو!

لەم چەند ڕۆژەدا ئافرەتێکمان برد بۆ گۆڕسـتان، سـەیری سـەرەوە 'ئاسـمانم' دەکرد و دەموت بزانم نایبینم، چـونکە بە حەتمـی و دڵنیـام کە ئاگـاداری ئـێمە بووە.

هەچ کەسێکیس بمرێت، لەبەرئەوەی مامۆستای ئایینی لەگەڵە، ئەگینا حەزدەکەم من تەڵقینی بکەم و پێی بڵێم کە ئێستا بەرەو کوێ دەبرێت.

بەڵام لەناو قەرەباڵغیەکدا و شتێکیش کاری تۆ نەبێت و ڕاتنەسپێرن ناکرێت هیچ بڵێیت.

کێ زۆر بۆم دەگریا، کێ کەمتر، برا و خوشکەکانم و کەس و کاری نزیکم زۆر بە پەرۆش بوون، هەموو لایەکم دەبینی.

هەستم کرد کەس هاوار و تکای من نابیستێ و ناشمبینێت، کە قەرەباڵغیەکە زیادی کرد، وتیان ئاوی بۆ گەرم بکەن، لەو پێنج مەتریەکدا نە دەمتوانی بڕۆم، نە بچمەوە ناو جەستەکەم، ڕاگیرابووم، لەو پێنج مەتریەدا قوفڵ کرابووم، پیاوێک ئاوەکەی تاقی کردەوە کە بزانێت گەرمە یاخود نا، خزمی خۆم بوو ئەویش ئێستا کۆچی دوایی کردوە، وتی: بیهێنن ئاو گەرمە.

کە دەستیان دایە تەرمەکەم و بەرزیان کردمەوە، من لەسەرەوە بە ئەندازەی بەرزکردنەوەکە بەرز بوومەوە، لە تەنیشتی ماڵی خۆمان زەویەکی چۆڵی لێ بوو، پەردەیان گێڕایەوە و لەوێدا دەستیان کرد بە شۆردنم و ڕۆشتن لە مزگەوت دارەشۆر هێنا و دایانا.

تەنافێکیان لێدا و پەردەیان گێڕایەوە و منیان ڕوت کردەوە بۆ شۆردن، من پێم ناخۆش بوو لاشەم دەربکەوێت شتێکیان دا بە گیانمدا، پێم خۆش بوو کە دەرنەکەوم، تەرمەکەم تەنها وەک سێبەرێک بوو، خۆمی ڕاستەقینە لەسەرەوە بووم.

کە لەسەر دارە تەرمەکە دایاننام، لەسەرەوەش بەیەک ئاستی بەرزی لە جوڵە کەوتم، دەیانجوڵاندم دەجوڵام.

کفنیان هێنا، پیاوێکی خزممان هەبوو دەستی کرد بە بڕینی کفنەکە، لە سەرەوە دەزانم ئەو کفنە بۆمنی دەبڕن، وتی: تەواو بووە، وتیان: بەڵێ.

وتی: بیهێنن.

منیان لە کفنەکەوە ئاڵاند. بردمیان بۆ ژوورەوە، دەبینم سەقفی ماڵەکەمان نەبووەتە ڕێگر لە بینین و بە ئاگا بوونی من لە جەستەکەم.

چۆن کفنم کرایە بەر و گریان لێ دا هەموویم بینی لە سەرەوە لە مزگەوتەکەی ملا لەتیف دارە مردویان بۆ هێنام.

ئیتر بە دارە تەرمەکەوە منیان خستە ناو تویتایەکی (٨٥) ەوە دوو ساڵ بوو ئەو جۆرە تویتایە دەرچوو بوو، کەس و کارم بە گریان و ناڕەحەتی دەوریان لە تەرمەکە و تویتاکە داو، تویتا کەوتە ڕێ بۆ گۆڕستان، نزیکەی بیست و نۆ سەیارەیەک دوای جەنازەکەم کەوت، وتیان: لەکوێ دەینێژن؟

وتیان: لە گۆڕستانی 'شێخ سەعید' لە چەمچەماڵ.

کە جەنازەکەم گەیشتە ناوبازاڕ، ئاستی قەسابەکان، کەس سەلامی لە جەنازەکەم نەکرد، من لەسەرەوە لەگەڵ تەرمەکەم بە بەرزی پێنج مەتر لەگەڵی دەڕۆم.

بەڵام کە گەیشتمە قەیسەری 'جەلال قەساب'، ئەو کاتە ئەوە یەکەم قەیسەری بوو لە چەمچەماڵدا، پیاوێک لای کردەوە و تەرمەکەمی بینی وەستا و بەجوانی سەلامی لێ کردم، هەستم بەوەکرد کە ئەو سەلامە لە منی دەکات و پێم خۆش بوو، پیاوەکەشم نەدەناسی، کاتێ کە ئاوەکەیان گەرم دەکرد و دەیانشۆردم، هەستم کرد پەستانێکی غەیبی هەبوو کە پەلەی دەکرد لە زوو شۆردن و بەڕێ کردنی جەنازەکەم!

له پەله کردنەکەش دەترسام، بەڵام هیچ دەسەڵاتێکم نەبوو، بێ کەس، بێ باوک، بێ برا، بێ عەشرەت و پاسەوان و قەرەباڵغی، کەسێک بێجگە لە خوا نیە، پێی بڵێیت بارم سوک بکە، بێ بە فریامەوە.

بە ڕاستی ئا لەوێدا لێت دەقەومێت، لێ قەومانی ڕاستەقینە لەوێدایە. هەست دەکەیت کە هیچ نیت.

کە کەوتینە ناو جەرگەی بازاڕ، خەڵکی زۆر سەلامیان لە جەنازەکەم دەکرد، هەبوو دانیشتبوو هەڵدەستایە سەر پێ و سەلامی دەکرد، هەستم بە هەستە جیاوازەکانی خەڵکی دەکرد بەبێ ئەوەی لێم تێک بچێت.

هەست نیە لە هەستی ڕۆح بەهێزتر بێت.

هیچی لێ ون نابێت، ڕاستە بازاڕەکە تەواو بوو، گەیشتینە 'شێخ سەعید'، سەرقەبران قەرەباڵغ بوو، وتیان: گۆڕەکە تەواو نەبووە.

وتیان: بەردی ئەلحەدەکەی ماوە.

وتیان: تەرمەکە دانێن.

بە دارە مردوەکەوە داییاننام بە دیار گۆڕەکەوە.

خۆشم لەسەرەوە، لەسەر گۆڕەکەم ڕاوەستاوم. دەزانم ئەوە منم دەمنێژن، منیش هیچ دەسەڵاتێکم نیە، پەستانێکی زۆر و ترسێکی زۆریشم لەسەرە، دوو کەس ڕۆشتنە ناو گۆڕەکە چاکیان کرد و تەواویان کرد، پیاوێکیش لەولاوە قوڕ دەگرێتەوە، سور دەزانم بۆ کون بڕی گۆڕەکەی منێتی.

کە وتیان: تەواو بوو، ڕێک لە بەتانیەکە دەریانهێنام خستیانمە ناو گۆڕەکە و لەسەر لا ڕووە و قیبلە داییانام.

وتیان: بەردبێنن، بەردیان هێنا و، لە دوایدا بە قوڕەکە کون بڕی بەردەکانیان کرد، هەموویم بە ورد و درشتیەوە دەبینی، زۆر دەترسام، چونکە نەمدەزانی ئایا بەهەشتیم، یاخود دۆزەخیم.

هیچ دەسەڵاتێکیشم نیە و هیچم بۆ ناکرێت.

تا ئەو شوێنەش پێم نەوتراوە بەرەو کام لایان دەچیت، گڵیان کرد بە سەرمدا و دوای ئەوە بە مامۆستا مـلا أسـعدی چەمچەماڵیـان وت 'بەڕەحـمەت بێـت': مامۆستا فەرموو تەڵقینی بکە. تەڵقیـنەکەی کـرد و کە گەیشـتە ئەو شـوێنەی کە وتی: موسوڵمانەکان ڕەحمەتی خواتان لێ بێت گەردنی ئازاد بکەن.

کە وتی گەردنی ئازاد بکەن، تەواوی کرد و تەواوی نەکرد.

زۆر زۆر بە خێرایی یەک گوشپەم کـرد بـۆ نـاو قەبـرەکەم، "واتە ڕۆحەکەم لە سەرەوە مۆڵەت دراو بە خێرایی نێرامە ناو گۆڕەکە".

لە خێراییدا وەک هاژەیەکی زۆر خێرا ڕۆشتمە ناو گۆڕەکەم.

لەو پێنج مەتردا ئەوەندە بە خێرایی داخڵ بووم هاژەم هات.

لە دەسەڵاتی منیشدا نەبوو، کە داخڵ بووم.

کە چوومە خوارەوە هیچ پەیوەندیەکم بەم دونیاوە نەما، نە ئاگام لە قەرەباڵغی دەرەوە ما، نە کەس، نە قەبر و گۆڕستان.

خوارەوە دونیایەکی تر بوو، گۆڕم نەبینی.

ئەو دونیایەی کە من بینیم، وەکو ناوچەی گۆخڵانی لای پێنجوێن بـوو، دۆڵ و شاخێک بوو، سێسەد کەسێک دەبووین، سـەرباز دەوری لـێ دابـوین، وەک تەزبیح ڕیزیان کردبوین.

که من چوومە ناو گۆڕەکەم، کەوتمە ناو سێسەد کەس وەک خۆم بوون و لەو جیهانەدا بوون.

هەموومانیان ڕێک کردبوو دەیانبردین بۆ سەرەوە.

هەر سێسەدیشمان دەزانین کە مردوین.

دەشزانین وا دەمانبەن بەرەو لێپێچینەوەی بەرزەخ، بەرەو دۆڵ و بەرزاییەکیان دەبردین سەربازەکان هەمان کێبڵیان لە دەستدابوو، وەک ئەوانەی لە ئاسمان بینیمن.

ئەم سەربازانەش زۆر ترسناک بوون، ئێمە ئەمانزانی کە مردوین، کەسیش لە نێوانماندا نەبوو، بە ڕیز دەبراین، سەربازیش هەردوو دیویان لێ گرتبوین.

ئەوەندە دەترساین، ئەوەندە دەترساین، ئەگەر ئەو سەربازانە 'فریشتانە' نەبوونایە دەکەوتین و قەڵەمی ئەژنۆمان دەشکا، بەڵام لە ترسی ئەوان دەڕۆشتین و وەک شەق شەقە دەلەرزین.

ئەگەر فشاری سەربازەکان نەبوایە دەکەوتینە سەر زەوی، ترسەکە لەوان لە لەرزینەکەی ئێمە زاڵتر بوو.

ئەم سێسەد کەسە هەچ کەسەمان لە ئاستی خۆمان دەگریاین و هاوارمان دەکرد و دەمانوت: خودایە تەوبە بێت، خودایە بەڵێن بێت بگەڕێینەوە دونیا گوناه ناکەین، خوایە نەمانزانی ئەم دونیایە ئاوایە، خودایە لێمان خۆشبە، خوایە زیندوومان کەرەوە و جارێکی تر تاقیمان بکەرەوە، بەڵێن بێت ڕاست بکەین لەگەڵت.

ئەگەر بچینەوە دونیا وەعد بێت باسی سزا و ئەشکەنجەکانی ئەم دونیایەیان بۆ بکەین.

هەتا ماوین گوناه ناکەین، ستەم ناکەین، خوایە تو گەورەیت بەس ئەم جارە زیندوومان بکەرەوە بەندایەتی تۆ دەکەین. کەس وەڵامی نەداینەوە و، بێ باک بوون بەرامبەرمان. من لەکۆتایدا وتم: خوایە تەنها بۆ پێنج خولەك زیندووم بکەرەوە، هەتا بە دایکم و حەسەن و ئاسۆی برام بڵێم خانویەکمان هەیە بیفرۆشن و بیکەن بەخێر بەڵکو ڕزگارم ببێت لە ئاگری دۆزەخ.

کە گەیشتینە نیوەی ڕێگا زیاتری، سەیرم کرد وەک دیمەنەکەی ئاسمان، پیاوێک لەمبەرەوە دانیشتوە مێزی لە بەردەستایە چەند پاسەوانێکی هەیە، یەکێکیان پشتی لە قیبلەیە و دەرگایەکی سور لە پشتیەوەیەتی، لێراوە چاومان لێیە هەر کەسێک دەبەن بۆلای چەپ و داخڵ بە دەرگا سورەکەی دەکەن لەدوای لێپرسینەوەی، دۆسیەیەك دەدەن بە دەستیەوە، کە دیار بوو باش و خراپی ئەو کەسە لەوێدا نوسرابوو، دەرگا سورەکە سێ مەتر بەرزبوو نزیکەی (٥-٦) مەتر پان بوو، کە دەیدەنە دەستی نوسراوێکی لەبەر دەستایە، لەسەر مێزەکە سەرەتاکەی دەدەنە دەستی، کە نامەی کردەوەکانتە، تۆش وەری دەگریت و ناشتوانی وەری نەگریت، یەکێک دەیکرد بە باڵیا و دەرگاکەی بەحاڵ بۆ دەکرایەوە و دەخرایە ئەودیوی دەرگاکە و، دەرگا دادەخرایەوە.

دڵنیا بوین کە ئەودیوی دەرگاکەیان بەهەشتە، یاخود دۆزەخ.

ئا لێرەدا زۆر زۆر ترسناکە.

من بە سووری دەرگا سورەکەدا دەترسام دۆزەخ بێت گومانم وا دەبرد کە ئەوەیان دۆزەخ بێت و پشتی لە قیبلەش بوو، دەرگای بەرامبەریشی بەهەمان شێوە لێپرسینەوەی دەکرد و نامەی کردەوەکانی دەدایە دەستی و ڕووی لە قیبلە بوو دەرگاکەیان دەکردەوە و دەیانکردە پشتی دەرگاکە و، دەرگاکە دادەخرایەوە.

هێشتا نەگەیشتبوومە ئەوان، دەنگێکی زۆر بەهێز و بە شیدەتی تورە، کە نازانم دەنگی خوای گەورە بوو، یان فریشتە بوو، وتی: ئەوانە کێن کە خەڵکیان کوشتوە؟

ئەوانە کێن کە داوێن پیسیان کردوە؟

وە ئەوانە کێن کە دزیان کردوە؟

هەموو ئەوانەمان کە مابووین لەوێدا لەگەڵ زەویەکەیدا کەوتینە لەرزە و ترسێکی زۆر بێ ئامانمان توش بوو، ئەوەندە هاتمە زمان و بە گریانەوە وتم: خودایە لە تۆ بەزیاد بێت، هەر هەمووی بە دەنگی بەرز دەگریا...

وتم: خوایە سوپاس بۆ تۆ هیچیانم نەکردوە.

بووین بە دوو تاقم هەندێ دەبران بۆ ئەم لاو، هەندێکیش بۆ ئەولا.

لەناو ئەم سێسەد کەسەدا سێ خزمی خۆمی تیابوو، لەگەڵ مندا چوار بوون، ئەو خەڵکەی تر گشتی بوون، خەڵکی کوێ بوون نەمدەزانی، بەڵام ئەو سێ خزمەم یەکێکیان عوسمانی فەقێ حسین بوو پیاوێکی صاڵح و باش بوو، ئەو رۆژەش کە فەرمانی خوای بەجێ گەیاندبو، یەکێکی تریان مصطفی ی مامە صاڵح بوو، ئامۆزای باوکم بوو کۆچی دوایی کرد، یەکێ تریان خاڵۆیەکی باوکم بوو کەریمی ناو بوو ئەویش کۆچی دوایی کرد، ئەم سیانەم لەگەڵدا بوون.

منیان برد بۆلای ئەوەی کە رووی لە قیبلە بوو، دوو کەس لە پێشمەوە بوون، دۆسیەکەیان دایە دەستی دوو کەسەکە، هات بیداتە دەستی منیش لە تاوا بەئاگا هاتمەوە و هۆشم هاتەوە.

ویستم هەستمە سەر پێ و رابکەمە دەرەوە، بەڵام تومەز هێزی ئەژنۆم نیە رابکەم، کەوتم، هەمدیسان هەستام و لە ترس و بیمی خۆم رابکەمەوە،

کەوتمەوە، سێ جار قاچم ئەرزی نەدەگرت و دەکەوتم، بۆیە دەڵێم خەو نەبووە و واقع بووە، چونکە نەمدەتوانی هیچ بکەم، دەلەرزیم و دەکەوتم، نزیکەی نیـو کاتژمێر گریـام و سوپاسـی خـوام کـرد کە گەڕاومەتەوە و بەم جـۆرە کە تـوانیم هەستمە سەر پێ ڕامکردە دەرەوە.

لە ماوەی شەش مانگ دوای ئەو ئەزموونەم، ئەو سێ خـزمەم بەدوای یەکـدا کۆچی دواییان کرد، یەکەم کە مرد بە ئەندازەی مردنەکە ترسام، چونکە دەترسـام دوای ئەو سەرەی من بێت، دووهەم مرد زیـاتر ترسـام، سێهەم مـرد وتـم تەواو چوارەم سەرەی منە. نانم دەخوارد دەکەوتە بیرم، شەو دەخەوتم دەکەوتەوە بیـرم و خەوم نەبوو، لاواز و زەرد و زەبـوون بوویـووم، شەرمیشـم دەکـرد بە خـزم و کەسم بڵێم من ترس و لەرزی ئەم حاڵەتە گرتوومی.

خزمەکانم پێیان دەوتم: ئاوات تـۆ نەخۆشـیت بـڕۆ خەمێکـی خـۆت بخـۆ، دەمـوت نەخـۆش نـیم، بەڵام نەمـدەوت کە چـیمە، هەمیشـە دەترسـام بمـرم، نەمدەوێرا تێر نان بخۆم و بخەوم، کە یەکێ دەمـرد مـن نیـوە مـردوو دەبـووم لە ترسانا، خۆم بۆ ئامادە دەکرد.

ئەوە تا ئێرەش تەمەنمان هاتووە، هیوادارم خەڵکی بە هەنـد وەری بگرێـت و بە گرنگیەوە بۆ ئەم چارەنوسە بڕوانێت و بە خەو لێکی نەداتەوە. واقعە و خـۆمم بۆ ئامادە کردوە و ئەو گەشتە دەکەمەوە و دەگەمە ئەنجـامیش إن شـاءالله، مـن حەجم کردوە و لەخوا دەترسم، والله ئەوەی بۆم گێڕانەوە هیچ پێچ کـاری و نـا ڕاستیەکی تیانیە، والله واقعیش بـوو خەو نەبـوو، بەڵام دەبـێ بڵـێم خەو بـوو، هیوادارم هەچ کەسەمان لە ئاستی خۆی ڕۆژێ زوتر تەوبە بکات و بگەڕێتەوە بۆ خزمەت پەروەردگار، هەتا لە قیامەت ڕزگاری ببێت إن شاءالله.

# ئەزموونی کاك حمه جلالی بانگوێژ

نەشتەرگەریم بۆ کرا، لەکاتی بێهۆشکردنەکەدا بەردەوام خەیاڵم لەلای خـودا بوو، ئەم شتەی بینیم لەکاتی بێ هۆشیەکەدا بینیم، خەو نەبـوو، واقـع و ڕاسـتی بوو، زۆر سەیر بو، بەرپرسم بەرامبەر ئەم واقعەی بینیومە، لە دونیا و لە قیامەتدا.

هەچ کەسێک باوەڕ دەکات با بیکات، کێ نایکات با نەیکات، لەو کاتەیا ئەم شتەم بینی.

دوو فریشتەی نورانی سپی وەک پەڵەی هەور بوون، هەردوو بن باڵیان گرتم، بەرزیان کردمەوە و بە خێرایی ڕۆشتین بۆ ئاسمان و وتیان ئەمە ئاسمانی یەکەم، ئەوە ئاسـمانی دووەم و گەیشـتین، ئاسـمان بە ئاسـمان خۆشـتر دەبـوو، کە گەیشتینە ئاسمانی حەوتەم و وتی ئەمە ئاسمانی حەوتەمە، زۆر عەجایب بـوو، زۆر زۆر خـۆش و فێنـک و سـازگار بـوو، لە ڕۆژێکـی زۆر گەرمـادا کە زۆر گەرمات دەبێـت و تینـوتە و بەرۆژویـت و سـەری بەفرگـرەکە هەڵـدەدەیتەوە و فێنکیەک ڕوت تێ دەکات، لەگەڵ گەیشتمە ئاسمانی حەوتەم، یەک فێنکایی بە ڕوخسـار و گیانمـدا هـات و وتیـان ئەمە ئاسـمانی حەوتەم و ئەوەش 'بیـت المعمورە'، لە کاتێکدا وا مەشهورە 'بیت المعمور' لە ئاسمانی چوارهەمە، بەڵام من لە حەوتەم بینیم.

ڕێک وەکو ئەم کەعبەیەی سەر زەوی بوو، بەڵام دار و دیوارەکەی زۆر جوانتر بوو، کاشیەکەی بەردێکی زۆرر جوان بوو، تەنهـا سـەیری بەردەکەت دەکـرد لە جوانیا شایگەشکە دەبوویت، وتیان: ئەم شوێنە شایستەیە بە حەزرەتی ئیبراهـیم "سەلامی خوای لێ بێت" کە لە سێبەری دیواری 'بیت المعمور' دا دابنیشـێت،

منیش حەزرەتی ئیبراهیمم بینی بە چیچکانەوە لەلای شـوێنی الـلە اکـبر کـردن 'تکبیر' کردن بۆ طەواف لە کەعبەی پیرۆزی دونیـادا، لە هەمـان شـوێن بـوو لە 'بیت المعمور' ی ئاسمانی حەوتەم و پاڵی دابـوویەوە، ئیـتر دوای ئەوە هۆشـم هاتەوە لە بێهۆشکردنەکە.

من کاتێک کە بێهۆشکرام جەسـتەی خـۆمم بینـی، بەڵام سـەرنجم نەچـووە سەری و گرنگ نەبوو بەلامەوە. بەڵام ڕۆحم زۆر ئاسـوودە و ئـارام و دڵخـۆش بوو. شتێک نیە پێوانەی خۆشی ئەو کاتەمی پێ بکەم، زۆر زۆر خۆش بوو.

بەڵام ئەو کەعبەی ئاسمان کە بینیم زۆر لە کەعبەی زەوی جـوانتر بـوو، زۆر زۆر بەختەوەریش بووم، کاشیەکانی ڕەساسیەکی بریقەدار بوون، لە دونیـا هەیە لەو جۆرە، بەڵام ناچێتەوە سەر ئەوە، ئەوەی ئەوێ وێـنەی نـیە لە دونیـادا، بەڵام من خۆم کە دیومە دەزانـم چـی یە، خەریـک بـوو لە ئاسـمانی حەوتەم بەرزتـر ببمەوە، بەڵام ئیتر لەوێدا هۆشم هاتەوە و گەڕامەوە.

## پیاوێك لە شاری سلێمانی



پیاوێك لە شاری سلێمانی گێڕایەوە کە کەسێك بـێ هـۆش بـوو، کاتێـك گەڕایەوە هۆشی هاتەوە، هیچ کەسێك بەتەمای نەمابوو، هۆشی هاتەوە و دەستی کرد بە گریـان و وتی: تکاتان لێ دەکەم نوێژ بـکەن، مـن ئەو دونیـام بینـی، تکاتـان لـێ دەکەم نـوێژ بکەن. "لەناو جەرگەی بازاڕی دۆلارەکەی سلێمانی چاوپێکەوتنم لەگەڵ کرد".

زۆر ئاگاداری نوێژەکانتان بن.

## لە هەولێر

  

پیاوێکی بەتەمەنی زۆر صاڵح و ئیماندار لە نزیکی قەڵا بوون، خاوەنی بەصیرەت و کەرامەت بوو، ورد بوو لە خوێندنەوەی نامە خواییەکان و، چاو کراوە بوو لە تێگەیشتن لە ئیلهامی فریشتەکان.

ڕۆژێکیان کۆمەڵێ میوانی زۆریان هات، منداڵێکی هەبوو تازە پێدەگەیشت، ئەم منداڵە خۆی سەرقاڵ کردبوو بە ڕێك کردنی پێڵاوی میوانەکانەوە.

بەڵام ڕێک کردنێکی سەیر!

بە دوو ڕیز پێڵاوەکانی جیا کردەوە و لە دوری یەکتر دایدەنان، واتە کۆمەڵێکیانی لە شوێنێکدا ڕیز کرد و، کۆمەڵێکی تریشیان لە شوێنێکی جیاواز! ئەم پیاوە بەتەمەنە نورانیە هاتە بەردەمی دەرگاکە و بە خێزانەکەی وت: ئەم پێڵاوانە بۆچی ئاوا بە جیا لە یەکتر دانراون و ڕیز کراون.

خێزانیشی وتی من نازانم، چونکە کوڕە بچوکەکەمان ئاوا ڕێکی کردون!

باوکی کوڕەکەی بانگ کرد و پێی وت: کوڕم! بۆچی بەم شێوەیە پێڵاوەکانت داناوە؟!

منداڵەکەش وتی: بابە، ئەمانەیان بەهەشتین و ئەوانەشیان دۆزەخین.

پیاوی بە ئیمان و کەرامەت دار تێ گەیشت کە کوڕەکەی شت دەبینێت و بەرچاوی ڕووناك کراوەتەوە!

بانگی لە خێزانەکەی کرد و وتی: ئافرەت ئاو گەرم بکە کوڕەکەمان دەمرێت!!

بەبێ ئەوەی کوڕەکەیان نەخۆش بێت پاش ئەم حاڵەتەی کە بینی، کوت و پڕ منداڵەکەیان کۆچی دوایی کرد.

## 'صەفیە خان' 'صەفیە سید گوڵ ماوەتی'



صەفیە خان گێڕایەوە و وتی: چونە دەرەوەیەکی خێزانیمان هەبوو، مـن و هاوسـەرم و دایکم و خوشکەکانم بووین، ڕووبارێك و ئاوێك لە شوێنی سەیرانەکەماندا هەبـوو، ئاوەکە بەرز و نزمی تیابوو، دایکم کەوتە ناو چاڵاییەك لەنـاو ئـاوەکەدا، لە تـاو دایکـم خۆم فڕێ دایە ئەو شوێنەی دایکمی تیا بوو، هاوسەرەکەشم هات هەردووکمان ڕزگـار بکات، لە پێشدا دایکمی دەرباز کرد، وەختێکی پێ چوو هەتا هاتەوە بەدەم مـنەوە، لەو کاتەدا من دابڕام، دابڕانێکی سەیر، هەستم کرد بەرەو جیهانێکی تر ڕۆشتم.

مردنێکی زۆر خۆشم بینی، زۆر هێواش و پڕ مەغز و مانا، خوشکەکانم دەیـان وت چەنـد جارێـك ڕۆشـتوویتەتە بنـی گـۆمەکە و هـاتویتەتە دەرەوە، بەڵام مـن یەك جـار هەستم کرد خوشکەکانم دەقیژێنن.

ئیتر من ئاگاداری هیچی دەوروبەرم نەبووم و بە تەواوی دابڕام، ئەو جیهـانەی بـۆی چـووم زۆر زۆر خـۆش بـوو، هەسـتێکی ئەوەنـدە خـۆش بـوو، کە ئێسـتاش و لەوەو پێشیش ئەو هەستە خۆشەم نەبووە.

هەستم کرد کە مردن بێ ئازار بوو، تەنانەت زۆر چێژدار بوو.

هاوسـەرەکەم ڕزگـاری کـردم، خوشـکەکانم وتیـان: تـۆ لە نێـوان مەرگ و ژیانـدا بوویت، وتم: من لە ژیانێکی ئەوەندە خۆشدابووم، ئەگەر ئێـوە هەسـتان پـێ بکـردایە نەدەگریان، ئەو هەست و چێژەی لە چرکەساتی مردندا بینیم، نەمـدەتوانی ئەوانـی لـێ حاڵی بکەم.

# حاجی هیوای شێخ جمالی تەکیەی قەرەداغ

  

وەك پێیان وتمەوە: من سێ جار تەواو بووم و گەڕاومەتەوە بۆ ژیـانی دونیـا، مـردن بەلای منەوە زۆر خۆشە، کاتێ پێغەمبەر ﷺ گەشتی ئیسرا و معـراج و ئاسـمانەکانی کردوە، بەلای منەوە زۆر ئاساییە بۆ فەخری کائینات ﷺ ئەو خەڵاتە بکرێـت و بە ڕۆح و لاشە ئەوەی بۆ ئەنجام بدرێت.

چونکە منێکی بەندەی ئاسایی، بە کاتێکی کەم گەشتی ئاسمانەکانم کرد و بینیم.

ئەم ئەزموونانە باوەڕ و ڕێنمویی خوایی زیاد دەکەن.

من لەوەو پێش نـوێژم نەدەکـرد، چـوار سـاڵ تووشـی ئـازار و نەخۆشـی پشـت و فەقەرات بووم، دوای ئەزموونەکەم دەستم کرد بە قەزای نوێژی پانزە سـاڵ، هەمـوو ئەو نوێژانەی قەرزار بووم هەموویم قەزا کردەوە، ئەو نوێژانە بوویە هۆی شیفا بۆ پشـتم، لە کاتێکدا چوار ساڵ بوو گیرۆدە بووم پێیەوە.

'حاجی جمال'ی باوکم، پـێش ئەوەی کـۆچی دوایـی بکـات، شـەو بـوو لە لای دانیشتبووین، لە گیـانی دەدا، کۆمەڵێـك لە خزمـان لەلای بـوون، قورئانیـان بەسـەردا دەخوێند، چـاوی هەڵبـڕی و وتـی: کـاکە گیـان ئێسـتا منیـان بـرد بـۆ نەخۆشـخانەی 'جمهوري' لە سلێمانی، لەوێ ئیزنیان دام و وتیان بڕۆ کاتت نەهاتوە، تا مـاوەیەکی تـر مۆڵەتت دراوە، بەڵام ئەویان برد!

ئەو پیاوەی کە بردیان ئەگەر ناودار بێت، یاخود دەوڵەمەند بێت دەزانن کێیە.

منیان ئیزن داوە بۆ چەند ڕۆژێکی تر.

کـاك عبـداللەی فەقـێ مـوحەمەد وتـی: لەو چـرکە سـاتەی کە وتـویەتی، مـن لە نەخۆشخانەی 'جمهوري' بووم یەکێك کۆچی دوایی کرد!

  

باوكم وتی: خزمان بڕۆنەوە من ئەمڕۆ نـامرم، ئیـتر ڕۆشـتن و یـانزە ڕۆژ دوای ئەو بەروارە، من لە بازاڕ بووم و هاتمەوە، وتیان باوكم وتویەتی ئەمشەو دەمرم!

بە برا و خوشكەكانی وتبوو من ئەمشەو دەمرم.

منیش ڕۆشتم و وتم باوكە چیت بینیووە ئاوا دڵنیایت؟!

وتی: 'لەسەر قەرەوێڵەكە بوو' دەستی درێژ كرد و وتی: هاتن بۆ لام، بـاوكم و كەس و كارم كۆچی دواییان كردوە' هاتن بۆ لام، من ئەمشەو دەمرم.

وتم: بابە چیان پێ وتیت؟

وتی: تۆ حەقی ئەوەت نەبێت!

من ئەمشەو دەمرم.

بەڵێ بەو جۆرە بوو ئەو شەوە سەعات (٢:٢٠) خولەكی شەو كۆچی دوایی كرد.

ساڵی (١٩٩٣ - ١٩٩٤) شەڕی ناوخۆ بـوو، لە نزیكـی 'حسـین'یەكە، لای تـراییە كـۆنەكە، هاوەنێـك دای لە زەوی و چەنـد پـارچەیەكی بەر مـن كەوت، بردمیـان بـۆ نەخۆشخانەی چوارباخی ئەهلی، نەشتەرگەریان بۆ كردم، لە سـاتی بێهۆشـكردنەكەدا هەستم كرد وەك چۆن ئەستێرە دەكشێت ئاوا ڕۆحم بە خێرایی دەرچوو كشا، ڕۆحـم لە جەسـتەكەم دور كەوتەوە، ڕۆشـتمە یەكێـك لە ئاسـمانەكان، زۆر زۆر بەرز كـرامەوە، تـێكەڵ بە ڕۆحیـانەتی كەس و كـارم بـووم، لەو ئاسـمانە بەرز و بەریـنەدا دەهـاتین و دەچووین و دەمانوت 'أشهد أن لا إله الا الله'، دەتـوت هەزاران سـاڵە بەو ئاسـمانەوەم حەزم نەدەكرد بگەڕێمەوە نـاو جەسـتەكەم و بـێمەوە بـۆ سـەر زەوی، قەدەری ئیلاهـی گەڕامەوە بۆ دونیا پێش ئەوەی بگەمەوە بە جەسـتەكەم دەمزانـی چ كەسـێك لە كەس و كار و خزمان لە لای منن و پەرۆشی منن!!

یەكێك لە هۆكارەكانی هیدایەتی من ئەم ئەزموونە بوو!!

## ئەزموونی دادە زەینەب موحەممەد لە بەڵخەی قەرەداغ

زەینەب خان دەیگێڕێتەوە و دەڵێت: نەخۆشی کاری لە جەستەم کردوو نۆبە لێی دام، لە نەخۆشخانە بووم و بێ هۆش بووم، کفنیان کردم، خۆم دەبینی دەیان بردم بۆ گۆڕستان، نزیکی گۆڕستانەکەی بەڵخەی قەرەداغ کرامەوە، تەسلیمی ناو گۆڕیان کردم، ئەوانەی لەسەر گۆڕستان لە دەورم بوون کەسیانم نەدەناسی، نازانم ڕۆحیانەتی ئەهلی ئەو گۆڕستانە بوون ئامادەبوون، یاخود ڕۆحیانەتی تر بوون!

کە منیان خستە گۆڕەکەوە، گڵیان دا بەسەرمدا و دایانپۆشیم، کە خەلکەکە وتیان یا الله.

منیش وتم: یا الله فریام بکەوە.

گۆڕەکە گرتمی و ئاگام لە خۆم نەما، وتم: ئەمە ئەو ڕۆژەیە کە چاوەڕوانم دەکرد، کوڕێك بەرەو ڕووم هات و پێی وتم: ناوت چییە؟

وتم: ئەی تۆ ناوت چی‌یە؟

وتی: من کوڕی حەمیدی حاجی ڕەووفم، پەرداخێ ئاوی بەدەستەوە بوو.

وتی: ئەم ئاوە بخۆرەوە.

منیش خواردمەوە، دوای ئەوە پورزایەکم هەیە مردوە دای بەلامدا و زۆر جوان بوو، ئەمزانی کە مردووە، پێی وتم: ئەوە هاتی!!

لە دوای ئەوە دیار نەما لەبەر چاوانم.

مار لە گۆڕێك دەردەچوو، زمانی دەهێنا بە ڕوومەتمدا، بەڵام ئازاریان نەدەدام.

ئەو کوڕەی کە پەرداخە ئاوەکەی پێ دام، سەنگەری ناو بوو، کارەبا گرتی و کۆچی دوایی کرد.

کە من ڕۆشتم یەکسەر هات بە دەممەوە، هەرگیز لە بیرم ناچێتەوە، من خەوم زۆر بینیوە، بیرم نەماوە، بەڵام ئەم ئەزموونەی کە بینیم ئەوە سێ ساڵە لە دوای کاریگەریەکانی ئەو نۆبەی مێشکەیش هەر بیرم نەچۆتەوە!!

## 'ئەزموونێکی نموونەیی'

لەگەڵ مامۆستا قادر دەرەشیشی ڕۆشتین بۆ لای مامۆستایەکت بەڕێز "کە پێی خۆش نەبوو ناوی ببەین" هەموو ئەزموونەکەی بۆ گێڕاینەوە، لە دوایدا لە بەرنامەی 'شیرین چا' لە 'کەناڵی ئاسمانی پەیام' مامۆستا قادر دەرەشیشی بەم جۆرە بۆ من و جەماوەری کوردستانی گێڕایەوە.

ئەو برا بەڕێزە لە ساڵی (١٩٧٧)ەوە دەیناسم، ئەو کاتە ئەو 'سوپاس بۆ خوا ئێستاش' کەسێکی دیندار و خەم خۆری دین و ئیمانە.

لە 'سەریاس'ی ئێران هات بۆ لام و بانگی کردم، پێی وتم: دەمەوێت شتێکت بۆ بگێڕمەوە!

بەڵام بۆچی بۆ منی گێڕایەوە؟!

لەبەر ئەوەی بۆ هەر کەسێکی گێڕابوویەوە گاڵتەی پێ کردبوو، یاخود بە خەون و خەیاڵ بۆی لێك دابوویەوە!

پێیان وتبوو لێت تێك چووە، لای کەس باسی مەکە!

ئەویش هاتبوو بۆ لای من هەتا بزانێت پشتگیری دەکەم یاخود نا!

لە ڕاستیدا زۆر زۆری بینیبوو، بەڵام کەمێکی گێڕایەوە، ئەوەشی کە گێڕایەوە تەنها بۆ ئەوە بوو هەتا بزانێت ڕای من لەسەر ئەو بابەتە چییە؟

ئەگەر نا هیچی نەدەگێڕایەوە!

کاتێك بۆ منـی گێـڕایەوە، زۆرم پـێ وت کە بینوسـێتەوە، چـونکە ڕووداو گەلێکـی زۆری لە ئەزموونەکەیدا بینی بوو، بەڵام کاتێك من و تۆ 'فاتح' دوێنێ شەو ڕۆشتین بـۆ لای و بۆی گێڕاینەوە، زۆری لە بیر چووبوویەوە و، لە کاتی خۆیشیدا کەمێکی بۆ مـن گێڕایەوە. ئەزموونەکەی بەم جۆرە بوو، دەڵێت: من سەرباز بووم لە بەعقـوبە، تووشـی نەخۆشیەکی قورس و ناڕەحەت بووم، کە وتیان گرانەتایە.

لە نەخۆشخانە خەواندمیان، حاڵم زیاتر خراپ بـوو، پـلەی گەرمـی جەسـتەم زۆر بەرز بـوو، لە نزیکـی مەرگەوە بـووم. پزیشـکەکان ئومێـدی مانیـان بە مـن نەبـوو، جارێکیان دکتۆر وتبووی خواردنی پێ مەدەن هەتا پشـکنینی بـۆ دەکەیـن، پزیشـکەکە بیری چووبوویەوە پێیان بڵێت خواردنی پێ بدەن!

وزەیەکـی زیـاتری لەدەسـت دابـوو، زیـاتر بێهێـز و زەبـوون بـوو بـوو، حـاڵەتی نزیکبوونەوە لە مردنی بەسەردا دێت، ئەو مامۆستایە دەڵێت: ئەو ماوەیە دەسـتم کـرد بە زیکر و تەسبیحاتی خودا.

چەندێك لە نەخۆشخانەدا مامەوە بەردەوام خەریکی زیکری خوا بووم، سەرم نـا بە دیوارەکەوە و خەریکی زیکر کردن بـووم، هەسـتم کـرد لە سـەقفەکەوە درێلێـك هـاتە خـوارەوە و سـەقفەکەی کـون کـرد، بە تەواوی بە ئاگـا بـووم، خەون نەبـوو، لەسـەر قەرەوێڵـکەم پـاڵم دابـوویەوە، ئەمـلا و ئەولام نەخۆشـی تـر بـوون کە لە قاوشـەکە کەوتبوون.

کە درێلەکە هاتە خوارەوە، کێشای بە نێو چاوانی مندا و کـونی کـردە سـەری مـن و ڕۆشـت، دوای ئەوە مـن بەرەو سـەرەوە سـەر کەوتـم و ڕۆشـتم 'ڕۆحەکەم' زۆر زۆر ڕۆشـتم، گەیشـتمە درەختێکـی گەورە، بردمیـانە ژێـر درەخـتەکە، درەخـتەکە زۆر زۆر گەورە بوو، درەختەکە هەموو گەڵایەکی ناوی کەسێکی پێـوە بـوو، نـاوی مرۆڤەکـانی

سـەر زەوی لەسـەر نووسرابـوو، هەر گەڵایەك دەكەوتە خـوارەوە، چ نـاوێكی لەسـەر نووسرابوو، ئەو كەسە لەسەر زەوی دەمرد و دەگەیشتە بەرزەخ.

كەسێكم لەگەڵدا بوو، پێی وتم: دانیشە! پیاوێكی سـیما جـوانی زۆر نـورانی بـوو، دەسـتێ جلـی سـپی لەبەردا بـوو، ڕیشـێكی ڕەشـی جـوانی هەبـوو، لەسـەر مێزێـك دانیشتبوو، وتی: بەرامبەرم دابنیشە، بە بینینی دڵخۆش بووم، بەو حاڵ و وەزعەوە تێـی كەوتبووم زۆر شادمان بووم.

وتی پێم: چ پرسیارێكت هەیە بیكە؟

پرسیاری زۆرم كرد، پرسیارم كرد دەربارەی خاڵم، خـاڵم مامۆسـتا بـوو دەروێـش و ئەهلی تەریقەت بوو، زۆر خەمخۆری دین و ئیمان بـوو، زانـا بـوو، وتـی: الحمـدلله زۆر باشە و بەختەوەرە.

پرسیاری كەسێكی ترم كرد، وتی: ئەو كابرایە دەمارگیری و نەتەوە پەرستی زاڵ بـوو بەسەریدا!

وتم: ئەی مامۆستا ناصری سوبحانی.

وتی: بەندەیەك بوو لە بەندەكانی خودا و، لە ژێـر ڕەحمەتـی خـودایە و زانسـتی لە دونیا پێ بەخشرا بوو.

كە پرسیارم نەما، وەك ئەوەی فەرشێك لە ژێر پێمدا بێت و بفڕێـت بە ئاسـماندا، ئـا بەو جۆرە بەرز بوومەوە و وتی بڕۆ!

سـەركەوتم، لە ئاسـمان ژمـارەیەكی زۆر موشـەكی سـەیرم بینـی دانرابـوون و چەسپێنراو بوون، ئەمەش پێش جەنگی ئەمریكا و عێراق و كویت بوو.

سەرتاپا نورانیەكە پێی وتم: ئێستا پـێم بڵـێ خـوا پەروەردگـاری سـەر زەویە یـاخود ئەمریكا؟!

چونکە ئەوە نەخۆشی و چاولێکەری و بێگانە پەرستیەکی دواکەوتوانەیە کە زۆرێك لە خەڵکی لای ئێمە کە ئەمریکا و ڕۆژئاوا بە فریاد ڕەس و ڕوگە و هەموو شتێك دەزانن؟!

نورانیەکە تێی گەیاندم کە ئەمریکا و ڕووسیا و فەرەنسا و ڕۆژئاوا و کوێ و کوێ هیچ نین.

خوایەك پەروەردگار و دەسەڵاتدارە کە خاوەنی گەردیلە و گەردونە، ئەم بەناو زل هێزانە تەنها داشی شەطرنجن و هیچیان بەدەست نیە.

﴿وَلَا تَحْسَبَنَّ اللَّهَ غَافِلًا عَمَّا يَعْمَلُ الظَّالِمُونَ ۚ إِنَّمَا يُؤَخِّرُهُمْ... ﴾ (إبراهيم: ٤٢)

خوای گەورە ئاگادارە بەوەی کە ستەمکار و بەد ڕەوشتەکان چی دەکەن، سزا و لێپێچینەوە و لەناو بردنیان دوا دەخات لەبەر چەندین دانایی...

پاشان ڕۆشتین، گەیشتینە کۆشکێك کە دەرگایەکی هەبوو.

وتیان: بچنە ژورەوە!

وتم: کلیلەکەی لە کوێیە؟

وتیان: کلیلی لای خۆتانە.

وتم: چۆن؟

وتیان: بڵێن 'یارحمن' دەرگا دەکرێتەوە.

منیش دەستم پێ کرد 'یارحمن... یارحمن... یارحمن' ئیتر دەرگا کرایەوە.

ئینجا بانگیان کردم بۆ لێپرسینەوە و دادگایی.

منیش وەستام و وتم: بە مەرجێك قورئان و سونەت ناوبژیوانی نێوانمان بێت.

دوو سەرتاپا سپی نورانی هاتن، لای چەپ و لای ڕاستم وەستاون و، وتیان ئەوە قورئان و ئەوەش سونەتی ڕەسوڵ الله ﷺ.

وتم: من عەرەبی نازانم.

وتیان: بە چ زمانێك قسە دەكەیت بیكە، ئێمە لە هەموو حاڵ و زمانێك تێ دەگەین.

وتم: ئەم پرسیارانە بۆ كەسێكی وەك كاك ناصری سوبحانی باشە لێی بكەن!

وتیان: تۆ حەقی ئەوەت نیە تەزكیەی كەس بكەیت؟!

دوای ئەوە سەیرم كرد ڕەفەكان پڕ بوون لە ئەرشیفی ڕەنگ و دەنگی خەڵكی، نـاوی خاوەنەكانیان لەسەر بوو.

وتم: ئەوە چییە؟

وتیان: ئەوە فایلی تۆماری كردەوەی مرۆڤەكانە.

یەكێك لە كاسێتە تۆماریەكانیان ئیش پێ كرد، تەواوی جوڵەی ژیانی مرۆڤێكـی تیـا بوو.

وەك ئەوە بوو خۆت ببینیت و ببیت بەو كەسە، وەك ئەوە نەبوو سەیری شاشـەیەكی سینەمایی یان فیلمێك بكەیت!!

كردەوەی كەسێكی مەعقول و بێ ناونیشانی كۆمەڵایەتیان دەرهێنـا و پیشـانیان دام، وتیان: ئەم پیاوە كەسێكی ئاسایی بووە و بەناوبانگ نەبووە.

بەڵام لە ناڕەحەتی و قورسی ژیانـدا گـوزەرانی كـردووە، خـراپە زۆر هـاتوەتە ڕێـی هەتا ئەنجامی بدات، بەڵام لەبەر خاتری خوا خراپەكانی نەكردوە و خـۆی لـێ لاداوە، لەبەر ئەوە لەلای خوای تەعالا پلەی بەرز و باشە.

دوای ئەوە دیمەنێكـی تـرم پیشــان درا، كە وتیـان لەمەو دوا لە نـاوچەكەی ئێـوەدا گۆڕانكاریەك ڕوودەدات، ڕووداو گەلێكی زۆریان پێوتم كردم، پێیـان وتـم: صـەدام و حوكومەتی بەعس دەڕوخێت.

ئەو كاتەش حزبی بەعس و صەدام لەوپەڕی دەسەڵات و سەركەشیدا بوو.

پێش شەڕی كوەیت بوو.

کاتێ گەڕامەوە بۆ دونیا و هۆشم هاتەوە، برایانی موسوڵمانم لە ئاوارەیی و لە ئێران ئاگادار کردەوە کە ئاگاداربن و خۆتان ڕێك بخەنەوە و ئامادەی گۆڕەپانی ئاڵۆزی کوردستان بن، چونکە حزبی بەعس دەڕوخێت.

ئامادەکاری بکەن بە پەتەوی بگەڕێنەوە بۆ کوردستان، هەندێك لەو برایانە قەناعەتیان بە قسەکەم کرد و ئیش و کاری خۆیان ڕێکخستەوە و ئامادەکاریان دەست پێ کرد، زۆرینەشیان نە لێی حاڵی بوون و نە باکیشیان پێی هەبوو!

با بچینەوە دەرگاکەی بەهەشت، وتیان با بڕۆین، کاتێك لەوێش ڕۆشتین، بەرەو ئاسمان و جیهانێکی تر کەوتینە ڕێ.

لە بەرزاییەکەوە خوارەوەم بینی، سەوزاییەکی سەرسام کەر مەدهۆش و سەرسامی دەکردی، زۆر جوان و نەبینراو بوو، ناتوانم جوانیەکەی بە وتن دەرببڕم، دەستەواژەکان کۆڵن لە دەربڕین، هەرگیز مرۆڤایەتی لە بونی ئەم دونیادا هەستیان بە جوانی بەو جۆرە نەکردوە.

کاتێك هێواش هێواش دابەزین، لەگەڵ هەموو جوڵەیەکیش من بەسەر فەرشە جوڵاوەکەوە یارحمن یارحمنم دەوت، فریشتەکەش دەیوتەوە.

سەیر دەکەم ئەم شوێنە چیا و دۆڵ و ڕووبار و جوانیەکی بێ وێنەیە، دەتوت فەرشێکی سەوزت ڕاخستوە، کە زیاتر نزیك بووینەوە دەبینم حەشاماتێکی زۆر زۆر لە خەڵکیم بینی.

دەبینم ئەمە هەمووی خەڵکی بەرزەخن و بەهەشتین، کە ڕۆشتینە ناویان، هەموویان لە دەورم کۆبوونەوە، وتم: ئەمە چیە دەیبینم؟

وتی: ئەمانە مردوەکانی لای ئێوە و زیندوەکانی بەرزەخن.

وتم: ئەمانە کەی مردوون؟ ئەمانە جوان و باڵا بەرز و سەر سوڕ هێنەرن، کەی لە مردوو دەچن؟!

ئەم ڕوخسارە جوان و شیرینانە، لەم شوێنە خۆشەدا، کەی لە مردوو دەچن، مـردوو دەخرێتە چاڵێکەوە، ئەی بۆچی ئەمانە لێرەن؟!

وتی: گۆڕ و قەبر تەنها جل و بەرگێکی کاتیە بۆ جەستەیەکی کـاتی، گـۆڕ مەنزڵـی مردوەکان نیە!

ڕۆحەکان لێرەن. وەختێك خەڵکەکە هاتن هەواڵی کەس و کار و خزمی خۆیان لـێ دەپرسیم، فریشتەکەش منی دەناساند بەوان و، ئەوانیش بە من.

وتی ئەم نەمردوە و خەڵکی دونیایە، چ پرسیارێکتان هەیە لێـی بـکەن، ئیـتر منـیش دڵنیا بووم کە ئەمانە ئەهلی بەرزەخن و بەهەشتین و پەیوەندیان بە دونیاوە نەماوە.

وتم: ئێوە خەڵکی کوێن؟

یەکێکیان وتی: من خورماڵیم، یەکێکیان سەیدسادقی و، خەڵکی شوێنی جیـاوازی تیابوو!

هەنـدێکیان لە دوایـدا کە گەڕامەوە هەواڵـم دا بە کەس و کاریـان، لە فریشـتەکەم پرسی هاوڕێیەکم هەبوو، دەمەوێت ببینم، چۆن بیدۆزمەوە؟!

وتنی زۆر ئاسـانە، ئیـتر بڕیـارم دا بچـم بـۆ لای ئەو خۆشەویسـتەم کە زۆرێـك لە قورئان و چەند هەزار فەرموودەی لەبەر بوو، لە کیمیابارانی هەڵەبجە شەهید بوو بـوو، ویستم بچم بۆ لای، بەڵام لام کردەوە، شوێنێکی زۆر پڕ زەحـمەت و ئـازارم بینـی لەو کاتەدا دوکەڵێکی خەستی سپیم بینی، خەڵکیم بینی بە توندی بەسترابوونەوە و شـەتەك درابـوون و سـزا دەدران، کە چـاوم چـوویە سـەر ڕەشـایی و دوکەڵەکە، چـاوم وەك ئامێرێکی نزیـك خسـتنەوەی لێهـات و، شـوێنەکە بە تەواوی نزیـك بـوویەوە لە مـن، سەدان کەسم بینی سزا دەدران، دەسوتێنران...

وتم: ئەمە چییە؟

وتیان: ئەمەش هەیە بۆ تاوانباران و بێ باوەڕان!!

# داستانی قڕگەی سلێمانی و ئەزموونەکەی کاك عمر



لە مانگی ٦ی ساڵی (١٩٨٣) کاك عمر قادر کـریم لەنـاو ئەو پـۆلە پێشـمەرگەیەدا بوو کە بەناوبانگن بە حەڤدە شەهیدەکەی قڕگە.

بە کاك عمریش دەوترێت شەهید عمر، کە لەو کاتەدا یەکێك بـوو لە پێشـمەرگەکان کە بە دوو تراکتۆر هاتبوون بۆ چالاکی لەنـاو شـاری سـلێمانی و کەوتبـوونە کەمینـی جەیش و جاشی حزبی بەعس و حوکومەتی ئەو کاتەی عێراقی.

بەشێك کە تایبەتە بە باسەکەی ئێمە 'نزیکبوونەوە لە مردن' لەسەر زمانی کـاك عمـر خۆی دەیگێڕینەوە.

کاك عمر دەڵێت: من لەو کاتەدا لەناو عەرەبانەی تراکتۆرەکەدا بـووم، هەسـتم کـرد کە شتێك ڕوو دەدات، زۆر بە خەستی بریندار بووم و، بەردەوامـیش گـوللە و ئـاڕ بـی جی و چەکی جۆراو جۆر ئاڕاسـتەی نـاو تراکتـۆرەکە دەکـرا و ڕۆح لەبەری تیـا نەبـوو هەمووی یان مردبوون و کوژرابوون، یاخود لە ئان و سـاتی گیـان دەرچوونـدا بـوون، من هەستم کرد شـتێك لە پـڕ لەنـاو گیـانمەوە 'جەسـتەم' هـاتە دەرەوە، وەك ئەوەی لە جەستەمەوە ڕاکێشرێ و هەڵوشرێ، شتێك لە لوتمەوە هاتە دەرەوە، ڕەنـگە بڵـێم وەکـو پەپولەیەك وابوو، بەرەو ئاسمان سەرکەوت، مـن بـووم و سـەرکەوتم، هەسـتم کـرد کە ئەوە خودی منە، من خۆم ئاسمانم دەبینی، بەرەو ئاسمان ڕۆشـتم و سـەرکەوتم زۆر بە ئاسانی.

پـێش ئەوەی لە دێـی قـڕگە بەڕێ بکەویـن، دڵـم خەبەری دا کە کارەسـاتێك ڕوودەدات، بەڵام بـۆ ئەوەی پـێم نەڵـێن ترسـنۆکە قسـەم نەکـرد، خـۆ ئەگەر قسەشـم بکردایە دڵنیام بە قسەم نەدەکرا، لەبەر ئەوە لەگەڵ پێشمەرگەکانی هـاوڕێم کە پەنجـا و

حەوت کەس بووین، بە دوو تراکتۆر کەوتینە ڕێ، کە مەودای تراکتۆرەکانیش جیاواز بوون.

لە ڕێگادا بۆسەمان بۆ دانرابوو، لە سەعات (٢:١٥) دوو پانزە خولەکی شەو کەوتینە بەر دەستڕێژی گوللەی دوژمن، لە هەموو لایەکەوە، لە هەر چرکەیەکدا سەدان گوللە و ئاڕ بی جی ڕووە و تراکتۆرەکە دەهات، لەبەر ئەوەی کە من لە ژیانمدا هەرگیز بریندار نەبووبووم لەو کاتەدا وام هەست کرد کە سێ چوار سۆتەی جگەرەیان بە پشتمەوە نا، پاشان گوللەیەك بەر دەستم کەوت و، لە پاشان بەهۆی گوللە ئاڕ بی جیەکانەوە تراکتۆرەکە ئاگری گرت، هەندێك لە هاوڕێکانم خۆیان فڕێ دا و منیش لەناو تراکتۆرەکە مامەوە و درێژ بووم، لەو ماوەیەدا سێ جار بێ هۆش کەوتم و بە ئاگا هاتمەوە، چاوم کردبوویەوە سەیری تراکتۆرەکەم دەکرد کە ئاگری گرتبوو، بەڵام نەمدەزانی مەسەلە چیە، بۆچی ئەمە ڕوودەدات؟!

ئیتر لە جەستەم چوومە دەرەوە، لەو کاتەدا، من هەستی ئەوەم نەدەکرد کە کوردم، پێشمەرگەم، مرۆڤی دونیاییم، من لە جیهانێکی نوێ و ژیانێکی زۆر جیاوازدا بووم، تەنانەت ناوی خۆشم نەدەزانی، هەستێکی زۆر سەیرم هەبوو، زۆر خۆش بوو، ئازارم نەبوو، پاشان بە خێراییەکی زۆر هاتمەوە ناو جەستەکەم و خێرا هۆشم هاتەوە و ئازار دەستی پێ کردەوە.

ئەم حاڵەت و ئەزموونە شتێکی زۆر سەیر بوو لە ژیانمدا و هەتاکو ئێستاش بیری لێ دەکەمەوە!!

بەهۆی ئەم ڕووداو و ئەزموونەی کە بینیم لە مردن ناترسم!!

پاشان بە شێوەی موعجیزە ئاسا ڕزگاری بوو، ئێستا لە وڵاتی سوید ژیان بەسەر دەبات.

## 'مامۆستا ملا عبداللەی سەنگاوی'

مامۆستا ملا عبدالله بۆمـان بـاس دەكـات و دەفەرمووێـت: مـرۆڤ لە كـاتی گیـان كێشـانی، لە لایەكەوە چـاوی لە فریشـتەكانە دێـنە لای و، لە لایەكیشـەوە چـاوی لە كەس و كار و خێزانیەتی كە بۆی دەگرین.

ئەوانەی دامەزراوی و ئیستقامەتیان هەبووە لەسەر ئیمان، ﴿إِنَّ الَّذِينَ قَـالُوا رَبُّنَـا اللَّهُ ثُمَّ اسْتَقَامُوا تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ الْمَلَائِكَةُ أَلَّا تَخَافُوا وَلَا تَحْزَنُـوا وَأَبْشِرُوا بِالْجَنَّـةِ الَّتِـي كُنـتُمْ تُوعَدُونَ (٣٠) نَحْنُ أَوْلِيَاؤُكُمْ فِي الْحَيَـاةِ الـدُّنْيَا وَفِي الْآخِـرَةِ وَلَكُـمْ فِيهَـا مَـا تَشْـتَهِي أَنفُسُكُمْ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَدَّعُونَ (٣١) نُزُلًا مِّنْ غَفُورٍ رَّحِيمٍ﴾ (فصلت: ٣٠-٣١)

من بەسەرهات و واقـعەكەم بە چـاوی خـۆم بینـی، سـەید ئەحـمەد زاوامـان بـوو، كەمێك نەخۆش بوو، لەبەر ئەوە بەدیـاریەوە بـووین، پیـاوێكی زۆر موسـوڵمان بـوو، شەو بوو، وتی كاكە ئەمشەو جێم مەهێڵە!!

وتم: بەسەرچاو!

دوای نوێژی عیشا كەمێكی پێچوو، هەڵدەسـتا و دادەنیشـت و ڕادەكشـا و بەچـوار مشقی دادەنیشت، ئۆقرەی نەبوو!

كەمێكی تری پێ چوو، هەڵسایەوە و لە پاشـان دانیشـت و وتـی: وعلـيكم السـلام ورحمـة الله وبركـاتە، بە زمـانێكی ڕەوان وەڵامـی سـەلامێكی نادیـاری دایەوە ئـێمەش سەرمان سوڕما، ئەوە چی بوو.

نە میوانێك دیارە و نە كەس هاتووە، بۆچی بەو جۆرە دەڵێـت؟! وتمـان ڕەنـگە ئەمە كاریگەری نەخۆشیەكەی بێت و ئەم حاڵەتەی بۆ دروست كردبێت، هەندێكی تری پـێ چوو وتی: باشە ئێوە بۆچی هەڵناسن لە بەریان، ئەوە میوانن هاتن، ئەوەتـا، دەفتەریـان پێیە و قەڵەمیان پێیە و كتێبیان پێیە.

دوای ئەوە تۆزێکی تری پێ چوو بەم شێوەیە وتی: سەگە 'مەبەستی پێی شەیتان بووە' من ئومەتی پێغەمبەرم ﷺ بە تۆ سەلبی ئیمانم ناکرێت.

والله دوای ئەوە وتی: أشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أن محمدا رسول الله و گیانی سپارد.

## عەودالّی گەیشتن بە خودا



مامۆستا ملا عبدالله دەگێڕێتەوە و دەفەرمووێت: فەقێ بووین لە خزمەت جەنابی مامۆستا ملا أحمدی شەرەف بەیانی لە پێنج ئەنگوستە، پیاوێك هەبوو بە ناوی دەروێش سلێمان، پیاوێکی زۆر خوا پەرست و عابد و دین دار بوو، لە عەشیرەتی ئالّی بەگی بوو، پێشتر خەڵکی دێیەك بوو پێیان دەوت 'جام ڕێس'، ئەم پیاوە ئیماندارە دوو شەممان و پێنج شەممان بەڕۆژوو دەبوو، کاتەکانی لەناو تول و بەردەکانی پێنجە ئەنگوستا بەسەر دەبرد، حەزی بەناو خەڵکی و ئاوەدانی نەبوو، لەوە دەچێت زیاتر خەریکی زیکر و عیبادەت و طاعەت بووبێت.

بەرماڵێکی بە شانەوە بوو، ئێمە لە هەیوانی مزگەوتەکەدا بووین، لە ناکاتێکدا 'کە عادەتی بەو جۆرە نەبوو' لە شاخەکەوە هات و سەلامی لە ئێمە کرد و وتی: فەقێینە بچن مەلا ئەحمەدم بۆ بانگ بکەن!

ئێمەش یەکێکمان ڕۆشتین هەتا مامۆستا مەلا ئەحمەد بانگ بکەین، مامۆستا هات بۆ مزگەوت!

دەروێش سلێمان وتی: مەلا ئەحمەد من دەمرم، وەرە یاسینێکم بەسەردا بخوێنە، مامۆستا مەلا ئەحمەد زۆری بەلاوە سەیر بوو، تەنانەت گاڵتەشی لێ دەهات، وتی: دەروێش سلێمان تۆ خەریکی چیت؟! ئەوە تۆ باسی چی دەکەیت؟!

تۆ بە پێوە ڕاوەستاویت و دەڵێیت وەرە یاسینێک بخوێنە؟!

یەکێکیشمانی نارد بە دوای شێخ نوری پێنج ئەنگوستدا هەتا ئەویش بانگ بکەین، بە شێخ نوریشی وت: شێخ نوری من دەمرم، کە مردم مەمبەنەوە بۆ ئاواییەکەی خۆمان، هەر لێرە لە ئیمام موحەممەد بمنێژن، لە دوای ئەوە ئێمە سەرمان سوڕ مابوو، دەروێش سلێمانیش بە پێوە ڕاوەستابوو! ئینجا ڕاکشا و وتی ماموستا مەلا ئەحمەد یاسینەکەم بخوێنە.

مامۆستاش یاسینی بەسەردا دەخوێند و، باوەڕی وا نەبوو کە دەروێش سلێمان لە حاڵی مردندا بێت!

لە دوای تەواو بوونی سورەتی 'یس'ەکە، ئەم پیاوە دامەزراو و بە ئیمانە وتی: أشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أن محمدا رسول الله و گیانی سپارد.

لەسەر وەسیەتی خۆی لە گۆڕستانی ئیمام محمد ئەسپەر دەکرا.

## لە بەرزەخەوە هەواڵی نارد



مامۆستا ملا عبداللهی سەنگاوی دەفەرمووێت: پیاوێکی ئیمانداری پاك و ڕاست هەبوو لە لای ئێمە، ناوی مام محمود بوو، ئەهلی عیبادەت بوو، زۆربەی ئەو خەڵکانە ماون کە ئەم ڕووداوەیان بینیوە، کە کۆچی دوایی کرد و ناشتیان لە گۆڕستانی دێ.

لە دوای ساڵێك لە کۆچی دوایی هاتە خەونی حاجی موحەممەدی کوڕی خۆی، کە حاجی موحەممەد پیاوێکی ناوداری لادێکەمانە، بە حاجی موحەممەدی وتبوو: گۆڕەکەم جەنازەکەم 'لاشەکەم' کەوتۆتە سەر ئاو، وەرن جەنازەکەم بگوازنەوە بۆ شوێنێکی تر!

حاجی موحەمەدیش ڕۆشتبوو بۆ لای مامۆستا مەلا مجید 'بە ڕەحمەت بێت' کە ئەو کاتە مەلای دێکەمان بوو، مامۆستا مەلا مجیدیش فەرمووبووی: خەو حوکمی لێ وەناگیرێ و، ڕەنگە ئەوە تەنها خەونێك بێت و هیچی تر.

هەتا سێ جار ڕۆشتبووە خەونی حاجی موحەمەد.

ئیتر دوای ئەوە خەڵکەکە ڕۆشتن لەگەڵ مامۆستا مەلا مەجیدیش، تەرمەکەیان دەرهێنایەوە.

سەیر دەکەن لاشەکەی وەك خۆی ماوەتەوە، ئەم پیاوە موبارەك و ئیماندارە لە خەونەکەیدا چۆنی وتبوو بەو جۆرە بوو!

تەرمەکەی هیچی لێ نەهاتبوو، هەڵیان گرتبوو لە شوێنێکی تر ناشتیانەوە!!

## 'ئەجەل'



مامۆستا مەلا ئەحمەدی شەریعە گێڕایەوە کە مامۆستا حمە یوسف گێڕایەوە،ماڵێك لە شاری مەریوان دوو لۆری هەبوو، ماڵەکەیان لە شوێنێکی لێژی دا بوو، خەڵکی ئەو گەڕەك و کۆڵانە زۆریان پێ دەوت کە لۆریەکان لەو بەرەو خوارگە ڕانەگرێت!!

بە گوێی کەسی نەدەکرد و لە سەیارەکەی و برێك و ئوستۆپی ئەمین بوو!

بەیانیەك زوو لۆریەکیان بەبێ شۆفێر ئستۆپی دەپچڕێت و سەر بەرەو خوار بە خێرایی دێتە خوارەوە، خۆی دەکێشێت بە ماڵێکدا و دەیڕوخێنێت و وێرانی دەکات، خەڵکی گەڕەکەکە بە دەنگ وناڵەی پیاکێشان و ڕوخانی خانوەکە دێنە دەرەوە!

دراوسـێکان هەواڵ دەدەن بە خـاوەنی لـۆری، شـۆفێری لـۆریەکە بە هەڵە داوان و ترس و شڵەژانەوە دێت، خەڵکی دەڵێن ئەو ماڵە بە دڵنیاییەوە کەسیان نەماون و مـردون لە ژێر دار و بەردی خانوەکەدا، ڕەنگە لە شیرینی خەودا بوویێتن و هەموویان مردبن!!

دراوسێیەکی ئەم ماڵە ڕوخاوە دێتە دەرەوە و دەڵێت بە خاوەنی لۆریەکە: کاکە گیـان خوای گەورە تۆش و ئەم خاوەن ماڵەشـی پاراسـت، پـێش سـەعاتێك ئەم خـانەوادەیە ڕۆشتن و سەفەریان کرد!!

ئیتر خاوەنی لۆریەکە زۆر دڵخۆش بوو وتـی: خـانوو گرنـگ نـیە چـاکی دەکەمەوە بۆیان، لۆریەکەشم بەجێ دێڵم، لۆریەکەی ترم دەبەم لە شارێکی تر کارم هەیە!!

لـۆری دووەمـی بـرد و ئەویـش ڕۆشـت بەلای کـاریەوە، لە ڕێـگەی شـارێکی تـر ئۆتۆمبیلێـك ویسـتی پێشـی لـۆریەکە بکەوێـت، بەڵام لـۆریەکە لێـی دا و کەوتە ژێـر لۆریەکەوە، وەختێ دابەزین و خەڵکی کۆبوونەوە دەبینن ئەو خێزانەیە کە پێشـتر، پـێش چەند سەعاتێك خانوەکەیان ڕووخا!!

بە لۆری یەکەم نەمردن بە دووەم گیانیان سپارد، لە ماڵەوە تیـا نەچـوون لە شـوێن و مەکانێکی تر تیاچوون، ڕۆژ و کات و شوێن و وادەی دیاری کـراو و بڕیـار بـۆ دراوی خۆی هەیە!!

## لە ڕێگەی موصڵ



کاك ڕزگار وتی: هاوڕێیەکم لە موصڵ هەبوو ڕۆشـتم بـۆ سـەردانی، ڕۆژی دواتـر وتـم دەگەڕێـمەوە، زۆر هەوڵـی لەگەڵـم دا، بەڵام وتـم دەڕۆمەوە، هـاتمە گەراج و لە سەیارەیەك سەرکەوتم، پێشـی تەکسـیەکەم گـرت و دانیشـتم، چـاوەڕوانی دەرچـوون بووم، سێ نەفەری تریش لە دواوە سەرکەوتن!

خەریك بوو سەیارەکە بڕوات، ئافرەتێك پەیدا بـوو! زۆر پـاڕایەوە و وتـی جـێگەم بـکەنەوە، ئەوانەی دواوە وتیـان ئـێمە هەر سـێکمان پـێکەوەین، ژنەکە زۆر پـاڕایەوە و وتی: کوڕێکم هەیە زۆر نەخۆشە و خێرتان دەگات، با چاوم پێی بکەوێت.

ئیتر من بڕیارم دا دابەزم و ئەو ئافرەتە بێتە شـوێنەکەی مـن، هەرچەنـدە ئێـوارە بـوو منـیش بەپەلە بـووم، دابەزیـم و تەکسـیەکە ڕۆشـت و ئـافرەتەکە ڕۆشـتە پێشـەوە و لە شوێنەکەی مندا سەرکەوت!

کەمێکی برد چەند نەفەرێکی تر هاتن و تەکسیەکی ترمان پڕ کرد و ڕۆشتین!

لە ڕێگا گەیشتین بە قەرەباڵغییەك، دەبینن هەمان تەکسـی پێشـی ئـێمە بـوو کە مـن دابەزیم!

تەنها ئەو ژنە مردبوو کە لە شوێنەکەی من سەرکەوت!

## سیانزە پێشمەرگە بووین

مامۆستا مەلا ئەحمەدی شەریعە گێڕایەوە وتی: کاك ئەحـمەد دراوسـێی مـزگەوت بوو وەفاتی کردبوو، لەگەڵ جەنازەکەی ڕۆشتین بۆ سەر قەبران!

دوای وتار و تەلقین، دوو پیاوی لێ بوو، یەکێکیان ناوی کـاك کـمال بـوو، وتیـان: خەمی مامۆستاتان نەبێت ئێمە لە خزمەتیا دەبین و دەیگەیەنین.

کاك کمال لە ڕێگا بۆی گێڕامەوە وتی: مامۆستا بە پێویسـتی دەزانـم بەسـەرهاتێکی زۆر گرنگی ژیانی خۆمت بۆ بـاس بـکەم، هەمـوو بیـرو بـاوەڕ و ڕەوتـی ژیـانی مـن گۆڕی!

ئێمه سیانزه پێشمەرگه بووین لەناو کارەساتی ئەنفالی گەرمیاندا بووین و له گێژاوێکی زۆر سەختدا بووین، سیانزه پێشمەرگه بووین و چوار لامان لێ گیرابوو، لەناو جەرگەی گەرمیانی ئەنفال کراوا بووین.

دەرچونمان نەبوو، بەدەم شەڕ و بەرگریەوە خزاینه ناو یەکێك له دێ سوتاو و وێران کراوەکانی دەشتی کاکی بە کاکی گەرمیان، نزیکی خۆرئاوابوون بوو، جەیش و جاشی بەعس چواردەوەری دێیەکەی گرتبوو.

دوژمن تەڵقە تەنورەی هەڵدەدا و تۆپ و هاوەن و جۆرەها گوللەیان تێ دەگرتین، ئێمەش تەنها ئەم سیانزه پێشمەرگەیە بووین و کەس له هەموو ناوچەکەدا نەمابوو!

لەم بن بەرد بۆ ئەو بن بەرد بەرگریمان دەکرد و له پەنا دیواری ماڵەکاندا یەك یەك دابەش بووبووین.

شەو تاریکی کرد هێرش و تۆپ باران وەستا.

زانیمان لەگەڵ شەبەقی بەیانی هێرشی کۆتایمان بۆ دەکەن، بڕیارمان دا به برسێتی و تینوێتی و ماندوێتی لەوێدا هەر کەسەمان له پەنایەکدا پشویەك بدەین و بۆ بەیانی شەڕی دەسته و یەخەی سوپایەکی زەبەلاح بکەین و خۆمان بە دەستەوە نەدەین هەتا تیا دەچین.

له ماندوێتی و برسێتیدا له پاڵ دیواری ماڵێکی چۆڵدا خەوم لێ کەوت، له خەومدا سوپا و جاش هێرشیان کردەوە، دەستمان کرد بە بەرگری، یەکە یەکە پێشمەرگەکانی هاوڕێم کەوتن و شەهید بوون، بینیم هەر یەکەیان له کوێدا پێکرا و یەکە یەکە کوژران.

منیش چاوەڕوانی کوژرانی خۆم بووم، لەبەر ئەوەی تەنها من مابووم و هەموو هاوڕێکانم هەر یەکەیان له شوێنێکدا کە دەمزانی له کوێدا بوو کەوتن و شەهید بوون، چرکەکانم دەژمارد بۆ وەستانی کلاشنکۆفەکەی دەستی خۆم که تەنها چەکێك بوو بەرگری دەکرد و هێشتا نوزەی لێ نەبڕابوو!

لە پڕ مەڕێکی ڕەشم لێ پەیدا بوو، دەبینم قسەم لەگەڵ دەکات و دەڵێت وەرە دەست بگرە بە منەوە ڕزگارت دەبێت و لەم شەڕەدا ناکوژرێیت، بەناو سوپا و جاشەکەدا پەنایەك و شیوێك هەبوو لەوێوە منی برد و ڕزگارم بوو نەیانبینیم!! لە خەو بەئاگا هاتمەوە دەبینم وا خەریکە دونیا ڕووناك دەبێتەوە!

تەقە و هێرشی دوژمن بە توندی دەستی پێ کردەوە، یەکە یەکە پێشمەرگەکانی هاوڕێم لەو شوێنانەی کە لە خەوەکەدا بینیم وەکو خۆی لە هەمان شوێن و بە دوای یەکدا شەهید بوون و کەوتن!!

تەنها من مامەوە و ئابلۆقەیان دام، وەك چۆن لە خەونەکەمدا بینیم کەلێنێك دروست بوو، پێیان نەزانیم پاشەکشەم کرد و ڕۆشتمە شیوێکەوە و هەڵهاتم و گەرمیان و سەنگاو و بازیانم بڕی و پێیان نەزانیم!

بە چەند ڕۆژێك گەیشتمەوە ناوچەکەی خۆمان لە ناوچەی گەلاڵە و سەفرە و زەروون و ڕۆشتمە لادێکەمان کە هێشتا دەستی هێرشی بەعسی پێ نەگەیشتبوو!

دایکم لە دوورەوە چاوی پێم کەوت، بە هەڵەداوان و گریانی شادمانیەوە ئامێزی بۆ کردمەوە و بەرەو ڕووم هات و هاواری کرد ڕۆڵە بەخوا مەڕە ڕەشی ڕزگاری کردی!

بە یەکتر شاد بووینەوە و دایکم بەردەوام دەیوت بەخوا مەڕە ڕەش و خێرەکە خوا وەری گرت ڕزگاری کردی!

وتم: دایە مەڕە ڕەشی چییە و تۆ باسی چی دەکەیت؟

وتی: کوڕم چەند شەوێك لەمەوبەر لە خەونمدا "هەمان شەو کە من لە ئان و ساتی تیاچووندا بووم" لە شەڕێکی زۆر ترسناکدا بوویت و خەریك بوو بکوژرێیت، منیش لە ترسانا خەبەرم بوویەوە و خێرا ئەو مەڕە ڕەشەی ماڵەوەم بۆ کردی بە خێر و صەدەقە خوای تەعالا بتپارێزێت و ڕزگارت بکات!

سەیرکە ئەوە پێستەی مەڕەکەیە هێشتا لە ماڵەوەیە! کە پێستەی مەڕەکەم بینی داچڵەکیم، بینیم هەمان مەڕ بوو کە وتی وەرە بەدوای مندا ‘لە خەوەکەمدا‘! تەوبەم کرد و ڕووم کردە ئەو خوایەی کە ڕزگاری کردم و ڕێی هیدایەت و عیبادەتی بۆ ئاسان کردم.

## مامۆستا مەلا ڕەزای تەکیە لە بەرنامەی ‘شیرین چا‘ باسی ئەجەلی کرد و پاش دوو مانگ وەفاتی کرد!!

١٤٤٠ ـــ ١٣٣٠

جەنابی مامۆستا مەلا ڕەزای تەکیەی قەرەداغ، مامۆستا یەکی ڕێزدار و دین دار و مەجلیسی تەکیە و ناوچەی قەرەداغ بوو، چەند ساڵێك بوو دەمویست بۆ بەرنامەی ‘شیرین چا‘ لە کەناڵی ئاسمانی ‘پەیام‘ میوانداری بکەم و باسی چەند نموونەیەکی ئەجەل و کوت و پڕی مردنم بۆ بکات، ‘سبحان الله‘ قەدەر ڕێکی نەدەخست و دوا دەکەوت هەتا، لە کۆتاییدا ڕۆژێکیان دیاری کرد و چەند نموونەیەکی ئەجەل و مردنی بۆ گێڕاینەوە و لە بەرنامەکانی ‘شیرین چا‘ لە ‘Youtube‘ پارێزراوە، تەنها دوو مانگ دوای بەرنامەکەمان، مامۆستا و دادە حەبیبەی خێزانی بە پەتای ‘کۆرۆنا‘ بە دوای یەکدا کۆچی دواییان کرد.

مامۆستا بەم جۆرە بەسەرهاتەکانی ئەجەلی گێڕایەوە: تەمەنم لە دەوری (١٠ - ١١) ساڵاندا بوو، ڕۆشتم بۆ ماڵی پورم و لە دوایدا گەڕامەوە بۆ ماڵی خۆمان، ژنێك بانگی کردم و وتی: وەرە ملبوانەکەی، ئەم گوێرەکەیەم بۆ بگرە هەتا مانگاکە دەدۆشم!

منیش ڕۆشتم ملیوانەکەی گوێرەکەکەم گرت، ئەویش دەستی کرد بە مانگا دۆشین، ڕەنگە پیاڵەیەك دوو پیاڵە شیر چووبێتە جامەکەیەوە، ژنەکە ناوی داسافە بوو،

وەختێکم زانی داسافە هات بە لایا و شیرەکە ڕژا بە سەریدا، منیش وتم: نەوەك بڵێن ئەوە خەتای ئەم بووە و، بوویە هۆی ڕژانی شیرەکە، ڕام کرد و بۆ دایکم گێڕایەوە.

دایکم وتی: ئەوە بۆچی هەناسەت توند بووە!

فریا نەکەوتم وەڵامی بدەمەوە.

وتیان: ئەریَ واللە داسافەی مامە شێخ موحەمەد کۆچی دوایی کرد، مەرگی موجافاتی کرد.

## دکتۆر عوسمان هەڵەبجەیی



دکتۆر عوسمان هەڵەبجەیی لە 'شیرین چا' بۆی گێڕاینەوە، وتی: دایکم لەماڵی ئێمە بوو لە هەولێر، نیوەڕۆ بوو سەر خەوێکی شکاند و پاشان ڕاچڵەکی و بەدەم گریانەوە خەبەری بوویەوە! منیش وتم: دایە گیان هیچ نیە، هیچ نیە مەترسە! وتی: ئۆیی ڕۆڵە گیان، هەر ئێستا لە خەومدا دایکم هاتبوو بۆ ماڵمان 'دایکی کاتی خۆی کۆچی دوایی کردووە'، هاتبوو پرسەمان هەبوو، جەمیلی برام مردبوو، بۆ تەعزیەی ئەو هاتبوو! وتم: دایە گیان خاڵۆ جەمیلم ساغ و سەلیمە و دەنگ و باسی هیچی خراپی نیە.

قسەکانم تەواو نەکرد، کاکە علی برام 'کە لە من بچوکترە' تەلەفۆنی کرد و وتی: کاکە بەڵکو دایکم بێنیتەوە خاڵۆ جەمیلم کۆچی دوایی کردوە!

ئێمە لە هەولێر و براکەم و خاڵۆ جەمیلم ماڵیان لە هەڵەبجە بوو! هەمان ئەو کاتەی دایکم خەونی بینی بوو، خاڵۆ جەمیلم کۆچی دوایی کردبوو! واقیع لە زانست و عەقڵ فراوانتر و گەورەترە، واقعێك هەیە نە عەقڵ لێی تێ دەگات و نە زانستیش پەیی پێ دەبات.

# دكتۆر هەڵوان عبدالرحمن/پسپۆڕی نەشتەرگەری گشتی



دكتۆر هەڵوان گێڕایەوە و وتی: ڕۆژێكیان نەخۆشێك هات بۆ عەیادە، ژنێك بوو تەمەنی (٥٥) ساڵ دەبوو، سروشتی پیشەیی ئێمەش ئەوەیە كە پرسیار لە نەخۆشەكە دەكەیت، بۆچی هاتوویت؟!

وتی: خەوم بینیوە؟!

منیش وەكو گاڵتە و شۆخیەك وتم: بۆچی خەو دەبێتە بەڵگە لەسەر نەخۆشی؟!

وتی: بەڵێ من خەوم بینیوە دكتۆر، لەبەر ئەوە هاتووم، وا دەزانم كەسەكەشی دیاری كرد كە پێی وتبوو تۆ ئەو نەخۆشیەت هەیە و بڕۆ نەشتەرگەری خۆت بكە!!

وتی: دكتۆر لە خەوەكەمدا پێیان وتم گرێی مەمكت هەیە!

وتم: باشە، هیچ شتێكت هەیە، ئازارت هەیە، هەست بە گرێكە دەكەیت؟

وتی: نەخێر هیچیانم نیە، تەنها خەوم بینیوە و لە خەودا ئاگاداریان كردووم!!

منیش لەبەر ئەوەی كە ئەو قەناعەتی پێی هەبوو، پشكنینم بۆ مەمكی كرد، بەڕاستی هیچم هەست پێ نەكرد و هیچم نەدۆزیەوە!

بە دەست لێ دان هەستم بە هیچ نەكرد و، بە چاویش هیچ دیاردەیەكی نامۆم نەبینی!

مەوعیدی تیشك 'ئەشعە' بۆ ئەو نەخۆشانەی كە هیچیان نەبێت و هیچ دەرنەكەوێت دورە!

تەنانەت كە من پشكنینم بۆ كرد، بە شۆخی و سوعبەتەوە پێم وت: ئەوەتا خەوەكەت ڕاست نەبوو، هیچ شتێك دەرنەكەوت!

مەوعیدی ئەشیعەی دورم بۆ نوسی، چونکە لەو خەستەخانە تایبەتەی مەمك، مەوعید دورە، بە تایبەتی بۆ ئەوانەی کە هیچیان نیە، یاخود دەرناکەوێت!

من لە دڵمدا شتێك دروست بوو[1]، چونکە ژنەکە زۆر سوور بوو لەسەر ئەوەی کە خەونەکەی ڕاستە.

وتم: باشە با قسەی تۆ بێت، سۆنەرێکیش بکە!

خۆی مەفروزە تەنها ئەشعەکەی بۆ بنوسم، پێویست بە سۆنەر ناکات.

لەبەر ئەوەی لە چل ساڵ بەرەو سەر تەنها وەك پشکنینێکی گشتی ئەشعەی بۆ دەگیرێت.

ژنەکە سۆنەرەکەی کرد و، ڕۆژی دواتر هاتەوە بۆ لام و هەر خۆشم لەوێ بووم، کە سۆنەرەکەم بینی دەبینم شتێکی تیایە، بەڵام زۆر بچوکە!

ئەوەندە بچوك بوو بە دەست هەستی پێ نەدەکرا.

بە چاویش نەدەبینرا، بەڵام لە سۆنەردا دەرچوو!

وتم: با ئەشعەکە گرین، ئەشعەکەمان پێش خست و بۆمان کرد، ئەشعەکە دەڵێت: بەڵێ شتێك هەیە و لە خراپیش دەچێت و سەرەتایەتی!

ئێمەش زەرعەمان بۆ کرد، بەڵێ بەو جۆرە دەرچوو کە لە خەودا پێیان وتبوو!

هەرگیز ئەوەم بیر ناچێتەوە!

---

[1] ئەو خورپەی دڵە هەندێکی لە خواوەیە و هەندێکی لی فریشتەکانەوەیە و، عارف و سۆفیەکان بە هاتفی غەیبی ناوی دەبەن!

# ساڵێکت ماوە

بەڕێز ئەندازیار عوسمان بۆی گێڕامەوە کە کاك جەمالی ئەندازیار کوڕی کاك بکری قەصاب کە ئێستا کۆچی دوایی کردوە، کاك جمال ئەندازیاری تەلارسازی بوو، دایکی ئافرەتێکی باوەڕدار و بە تەقوا بوو، بەیانیەکیان لە خەو هەڵدەستێت و بە خێزانەکەی کاك جمال دەڵێت: سروە ئەمشەو لە خەومدا مردم و بردیانم بۆ سەر قەبران بەڵام پێیان وتم: تۆ بگەڕێرەوە هێشتا ئەجەلت نەهاتووە و ساڵێکت ماوە بۆ ئەوەی دونیا بەجێ بێلیت.

سروە بڕۆ دەفتەرێك، لاپەڕەیەك بێنە ئەم ڕۆژ و سەعاتە بنوسە، بەڵام توخوا بە جەمالی کوڕم مەڵێ، ڕێك لە دوای نزیکبوونەوە لە تەواوبوونی ساڵەکە نەخۆش دەکەوێت، دەیبەنە نەخۆشخانە و چەند ڕۆژێك لە نەخۆشخانە دەمێنێتەوە، دوای ئەوە پێیان دەڵێت بمبەنەوە بۆ ماڵەوە، دەیبەنەوە ماڵەوە و لە بەلەکۆنەکە کورسیەکی بۆ دادەنێن و دادەنیشێت، دەڵێت: توخوا سروە پار ئەم کاتە ڕۆژ و مانگێکت نووسی، بڕۆ بیهێنە!

کە سروە خان دەچێت و دەیهێنێت و سەیری دەکات، دەبینێت بە تەواوی یەك ساڵی تەواو لەوەو پێش نوسراوە و هەمان ڕۆژ و مانگە و ساڵێکی بەسەردا تێ پەڕیوە.

سروە خان نووسراوە کە دێنێت بۆ بەلە کۆنەکە هەتا پیشانی خەسووی بدات، دەبینێت خەسووی لەسەر کورسیەکە کەوتوە بە لادا و گیانی سپاردوە!

## فریشتەی مەرگ لە سنوری پێنجوێن پێی وتم:

ئەندازیار عوسمان بۆی گێڕامەوە و وتی: کاك جەمال مەردۆخ نامەی زاوایەکیانی بۆ هێنام 'نامەکە بڵاو کراوەتەوە و ماوە'، کە لە سەرەتای ساڵەکانی (١٩٩٠)ی زاینی زاواکەیان لە سنور لە ناوچەی پێنجوێن کاری کردووە، ناو بە ناو هاتۆتەوە بۆ ماڵی خۆیان لە شاری سلێمانی و خواردن و نان و پێویستی چەند ڕۆژێکی تری بردووە و گەڕاوەتەوە بۆ کار و کاسبیەکەی لە سنوری ئێران، بەڵام کوت و پڕ جارێکیان ڕۆژێکی پێ دەچێت و خێرا دەگەڕێتەوە بۆ سلێمانی و ماڵی خۆیان.

بەسەرهاتی کوت و پڕی گەڕانەوەکەی بۆ خێزانی دەگێڕێتەوە، چەند ڕۆژێك لە ماڵەوە دەمێنێتەوە و لە لای ئەمنە سورەکە لە شەڕ و هەراکەی ئەو کاتە بە ڕووداوێك کۆچی دوایی دەکات!

لە دوایدا سەیر دەکەن وەسیەت نامەیەکی بە درێژی نووسیوە و لە بەشێکیدا دەڵێت: ئەوەی من بینیم یاخوا هیچ کەسێك نەیبینێت!

لەسەر سنور لە ناوچەی پێنجوێن مەلائیکەی مەرگم بینی و فەرمووی تۆ چوار ڕۆژت لە ژیانی دونیا ماوە خێرا بکە و بڕۆرەوە بۆ سلێمانی و وەسیەت بکە!

نامەکەی ئێستا پارێزراوە و ئەندازیار عوسمانیش بڵاوی کردەوە.



# نیشانەی مردنت خۆر هەڵهاتنی بەیانیە!

ئەندازیار عوسمان بۆی گێڕامەوە:

کاك طارق دراوسێمانە و، ئێستا لە کەنەدا دادەنیشێت وتی باوکم بەیانیەك زوو بە تەلوفۆنی نۆرماڵ من و برا و خوشکەکانمی ئاگادار کردەوە کە وتی: هەموتان بێن بۆ ماڵی خۆمان، ماڵی باوکیشم لە پشتی نەخۆشخانەی جمهوری بوو لە سلێمانی!

هەمووماان بە سەرسووڕمان و حەپەسانەوە بەو بەیانیە زووە لە ماڵی باوکم کۆبووینەوە.

کە ڕۆشتینە حەوشەی ماڵی باوکم دەبینین باوکم لەسەر قەرەوێڵەکەی لە حەوشەکەدا ڕاکشاوە و دایکیشم سەماوەری گەرم کردبوو چای بۆ باوکم تێ دەکرد و باوکیشم دەیخواردەوە.

باوکم زۆر حەزی لە چا بوو، بە شۆخیەوە بە دایکمی دەوت، ژنەکە زوو زوو چام بدەرێ، نەوەك لەولا 'بەرزەخ و قیامەت' چا نەبێت؟!

وتمان: بابە چیە؟

وتی: واللە ڕۆڵە چیتان لێ بشارمەوە، من دەمرم! نیشانەی مردنەکەشم ئەوەیە کە ئەمڕۆ، ئەم بەیانیە زووە هەر کە خۆر هەڵهات و تیشکی خۆرەکە دای لە دیوارە بەرزەکەی نەخۆشخانەی جمهوری من دەمرم!

وتمان: بابە هیچ ئازارێك، نەخۆشیەکت هەیە؟!

وتی: نەواللە هیچ ئازار و ناڕەحەتیەکیشم نیە! بەڵام زۆر کەمم ماوە و دەمرم!

کاك طارق دەڵێت: ئیتر هەموومان حەپەسابووین و دانیشتین، باوکم هەندێ ئامۆژگاری کردین و زوو زووش دەیوت خۆر هەڵنەهات؟! نەیدا لە دیواری نەخۆشخانەی جمهوری؟!

خوا شاهیدە خۆر هەڵهات و دای لە دیواری خەستەخانەی جمهوری، باوکم دانیشتبوو نۆبەی دەماغ لێی دا و، ئێمەش خێرا بردمان بۆ نەخۆشخانە دکتۆر نیهادی لێ بوو سەیری کرد و پاشان گیانی سپارد و کۆچی دوایی کرد!!

## سورەتی 'یس' فریاد ڕەسە بۆ بەرزەخ و قیامەت



کاکە سامانی میرزا صدیقی جنگیانی بۆی گێڕامەوە و وتی: پێش جەنگی جیهانی یەکەم باپیرانمان بەهۆی کێشەیەکی کۆمەڵایەتیەوە لە جنگیانەوە کۆچیان کردووە بەرەو کوردستانی ئێران، لە نزیکی 'بانە' لە گوندی 'هەوارە خۆڵ' نیشتەجێ بوون، لە نزیکی ماڵی باپیرانم لەوێ ماڵ و خانوو دروست دەکەن.

باپیرەم کە فەقێ محمود بووە، پیاوێکی خوێندەوار و سوارچاك و کۆمەڵایەتی بووە، هەروەها تفەنگچیەکی بەتواناش بووە، باپیرەی دایکیشم بەناو بانگ بووە بەسەر تیپی بەیان دەرە، ناوی عبداللە بەگی بووە. یەکێك بووە لەو کەسایەتیانەی لە کاتی خۆیدا دەسەڵاتێکی زۆری هەبووە، ئەمانیش کە چوونەتە ئەوێ وەکو ڕاکردوویەك ئەو پەنای داون و زانیویەتی سوار چاك و تفەنگ چی و خوێندەوارن، زۆر لە خۆی نزیکی خستونەتەوە و خزمایەتی لەگەڵ کردون و، خزمایەتیەکی قەدیمیشی نوێ کردۆتەوە.

باپیرەم لەو ساڵانەدا نەخۆش دەکەوێت و وا پێشبینی دەکرێت کە گرانەتای بوویێت، بۆ ماوەی چل ڕۆژ بێ هۆش دەبێت و مەلا و شێخ و خەڵکی شارەزا و حەکیمی ئەو ناوە دێنن، هەموویان دەڵێن مردووە، ئیتر بیر لە ناشتن و تەعزیەکەی

دەکەنەوە، لەو ئان و ساتەدا پژمەیەك دەکات و چاو دەکاتەوە و دەڵێت: ئەوە من لە کوێم؟ ئەوانیش حاڵ و مەسەلەی تێ دەگەیەنن.

دەڵێت: واللە من مردبووم، بردمیان بۆ ئەو دونیا و فریشتە پرسیاریان لێ کردم و، کردەوەکانی ژیانی دونیایان پیشان دامەوە، لە یەکێك لە کردەوەکانمدا لێپرسینەوەیەکیان لەگەڵ کردم کە بەڕاستی دانم بەو کردەوەیەی خۆمدا نەنا، بەڵام فریشتەکان نیەتی ناو دڵمیان لەو کردەوەیە پیشان دام 'ئەو کاتە تەلەفزیۆن و هیچ هۆکارێکی ڕەنگ و بینین و سینەما و تەنانەت ڕادیۆش نەبووە، بەڵام ئەم باسی پیشان دانەوەی کردەوەکانی کردوە لەسەر شاشەیەکی گەورە، وەك ئەوەی کردارەکان جارێکی تر ئەنجام بدەیتەوە، نەك پیشان دان بە تەنها!'

ئەوەیان پیشان دام کە من چیم کردوە، یەکێکیان ئەو کردەوە و نیەتە بووە، کە باپیرەم یەکەم جار هاتووە بۆ ئەم دێیە، ژنی باپیرەم لە دایکمەوە زۆر جوان بووە، خەتەرەیەکی خراپ بە دڵیدا هاتووە، نانی ئەو ماڵەشی خواردوە و خزمایەتیشی لەگەڵ کردون، پێیان وتوە: ئەم پیاوە ئەم هەموو چاکەیەی لەگەڵ کردوویت بۆچی ئاوا خەیاڵی خراپ و نیەتی خراپت لە بەرامبەر ژنەکەی کرد لەو ساتە وەختەدا!

بە واتای ئەوە: وەك ئەوەی پێی بڵێن خەیاڵێکیش لە بەرزەخ و قیامەت ون نابێت و دەنوسرێت لەسەرت.

باپیرەم هەموو ڕۆژێ جارێك یان چەند جارێك سورەتی 'یس'ی خوێندوە و لەبەری بووە. وتویەتی سورەتی 'یس' بوو بە شەفاعەت کارم و فریام کەوت و لە سزا و مەینەتی بەرزەخ ڕزگاری کردم، وەسیەتی کردبوو بۆ نەوەکانی هەموو ڕۆژێك بیخوێنن.

لەوێ پێیان دەوتم: سورەتی 'یس' زۆر بەرگریت لێ دەکات، دەهاتە ئەم لام و ئەولام و دۆستایەتی و هاوڕێیەتی و هاودەمی دەکردم، فریاد ڕەسم بوو.

لە دوای ئەم ئەزموونە باپیرەم نزیکەی چل و پێنج ساڵ ژیا و لە پاشان کۆچی دوایی کرد!!

# ده ڕۆژ پێش وەفاتی پێیان وتبوو!

فاتمە خانی سەید جەعفەری سەید موحەمەد سعید جوانرۆیی کە لە سەیدەکانی 'کۆرێین' لە بەرنامەی 'شیرین چا' بۆی گێڕامەوە و وتی: باوکم ساڵی (١٣٨٠)ی ئێرانی فەرانی خودای بەجێ هێناوە، دە ڕۆژ پێش کۆچی دوایی شتێکی دیوە، کاتی خۆی تەمەنی هەژدە ساڵان بووە گۆڕی بۆ خۆی هەڵکەندوە، هەموو هەینیەك دەچووە سەر گۆڕەکەی خۆی و فاتحەی دەخوێند، 'کاکە جانێ' کە دێیەکە لە ئوستانی 'کرماشان' لە نزیکی شاری جوانڕۆ.

'کاکە جانێ' مەرقەدە و برازای ئیمام ڕەزایە. ئێمەش نیسبەتی سەیدیمان دەگەڕێتەوە بۆ ئیمام ڕەزا و بە چل پشت دەگەڕێینەوە سەر حەزرەتی موحەمەد ﷺ.

باوکم ئاخرین هەینی تەمەنی خۆی بوو، چوو بوویە سەر گۆڕەکەی خۆی و گەڵا و شتەکانی لادابوو، ئینجا دەچێتە سەر مەرقەدی 'کاکە جانێ' و دادەنیشێت و خەوی لێ دەکەوێت، لە دوای خوێندنی قورئانی پیرۆز.

لە خەودا دەبینێت کەسێکی بەرز و بڵندی پایەی دۆستایەتی خوا دێتە خەوی و پێی دەڵێت بۆچی هاتوویت؟

ئێمە خۆمان دە ڕۆژی تر دێین بە شوێنتدا و تۆ دە ڕۆژت لە ژیانی دونیا ماوە و دونیا بەجێ دێڵیت، هەفتەی دواتر جومعەکەی ناتوانێت بێتەوە بۆ زیارەتی ئەو گۆڕستانە، جەڵتەی مێشك لێی دەدا، سێ ڕۆژ لە نەخۆشخانە دەمێنێتەوە و لە کرماشان لە بیمارستانی 'فارابی' دەهەم ڕۆژ کە شەوی یەك شەممە دەکات کۆچی دوایی دەکات و لە گۆڕەکەی خۆی "کە خۆی چەندین ساڵ بوو ئامادەی کردبوو" وەك ئەو قەرارەی پێیان ڕاگەیاندبوو، دەگاتە مەنزڵی حەقیقەتی خۆی.

کاك عەزیزی چوپانی کە هاوڕێی باوکم بوو لە مزگەوت هەمیشە پێکەوە بوون، باوکم پێی وتبوو: عەزیز بە کەس نەڵێیت، با خێزانەکەشم نەزانن، من تەنها دە ڕۆژم لە

ژیاندا ماوە، ئەو کاتەی ئەوەی بە کاك عزیز وتبوو هیچی نەبوو، نەخۆش نەبوو، کاتێ کە کۆچی دوایی کرد تەمەنی (٥٩) ساڵان بوو.

لە دوایدا زانیمان، وەسیەت نامەی نووسیبوو، ئەم وادە و بەڵێنەی جیهانی نادیاری تیا نوسی بوو، بەڵام بە وتن بە ئێمەی نەوتبوو، حەزی نەکردبوو ئێمە پێشتر پێی بزانین، هەتا ئۆغری بەرزەخ دەکات.

## دوو فریشتە بوون هاتنە ژوورەوە



کاك عەزیز جزا لە ناحیەی شۆڕش لە چەمچەماڵ بۆی گێڕامەوە و وتی: ساڵی (١٩٩٩) بوو، شەوێکی زستان بوو، ژنم نەهێنا بوو، لەگەڵ دایکمدا بووم، دایکم خەوتبوو، من نەخەوتبووم، هەیوانەکەمان دەرگایەکی دوو دەری تیابوو، سەیری تەلەفزیۆنم دەکرد، لە دوای سەعات دوانزەی شەو کارەبا بڕا، خەوم لێ نەدەکەوت، بە شەودا خەوم نیە، دوای نوێژی بەیانی کەمێك دەخەوم و دوای ئەوە دەچم بۆ دەوام.

لەو نیوە شەوەدا تەقەی دەرگاکە هات، من وام زانی دزە، هەڵوێستەیەکم کرد و پاشان وتم هیچ نیە، دیسان تەقەی ناو ماڵ و حەوشەکە زیادیان کرد، زۆر ترسام، چونکە چەکم لەلا نەبوو هەتا بەرگری لە خۆم بکەم.

دوای ئەوە تەقە تەق نزیك بوویەوە، تەقەی دەرگای ژوورەکەمان بوو، دەرگایان کردەوە، منیش دایکم خەبەر نەکردەوە، هاتنە ژورەوە، دەبینم دوو فریشتەن هاتن، یەکێکیان لە پێشەوە بوو ئەوی تریشیان لە دوای ئەوەوە بوو.

هەردوکیان نورانی بوون، لە نوری خۆیاندا پرشنگیان دەدایەوە، باڵایان بەرز بوو، جلی سپی و پشتوێنی سەوزیان لە پشتدا بوو، یەکێکیان تۆزێك ئەسمەر بوو دۆسیەیەکی پێ بوو، ویستم لە بەریان هەڵسم، یەکێکیان وتی: هەڵمەسە!

من دانیشتمەوە و سەیرم دەکردن، سەلامیان کرد. نورانیەکەیان هاتە لای ڕاستم و ئەوەشیان کە هەندێ ئەسمەر بوو لە لای جەپم و لە پشتمەوە بوو!

نورانیەکە وتی: عزیز جزا میدحەتە، ئەم نیە.

ئینجا وتی: دەتەوێت قەبرەکەی خۆتت پیشان بدەین.

وتم: بەڵێ، من زۆر دەترسام، بەڵام نەشمتوانی پرسیاری ئەوە بکەم کە بۆچی هاتوون بۆ لای من، لە کاتێکدا من نیم دەمرم!!

من لەو کاتەدا مامەشم هاتەوە بیر کە بەم جۆرەی من هاتبوون بۆ لای و، وتبوویان پێی لە تەمەنی (٧٠ - ٨٠)ساڵیدا تۆ دەمریت، هێشتا نەگەیشتۆتە ئەو تەمەنە و لە ژیاندا ماوە.

وتیان: عزیز وەرە لەگەڵمان بۆ گۆڕستان، هەتا گۆڕەکەی خۆتت پیشان بدەین.

وتم: با بە دایکم بڵێم و ئاگادار بێت.

وتیان: نا بەئاگای مەهێنەوە.

ڕۆشتم لەگەڵیان، لەو کاتەی ڕۆشتین هێشتا سەعات و چارەکێك زیاتری مابوو بۆ نوێژی بەیانی، یەکەم جار کە ڕۆشتم لەگەڵیان دەترسام و دەموت بەڵکو یەکێك لە خزم، ناسراو ببینم، هەتا هیچ نەبێت بەیانی پێیان بڵێم ئەمشەو منتان بینی لەگەڵ ئەو فریشتەکاندا، بەڵام کەسم نەبینی.

وا دەزانم ئەگەر کەسیشم ببینیایە، ئەوان ئەو دوو مەلائیکەتەیان نەدەبینی، چونکە ئەوە تایبەتمەندیەك بوو لەو چەند کاژێرەدا بە من درا.

من لە نێوان دوو فریشتەکەدا دەڕۆشتم، بە پێ دەڕۆشتین، هەروەکو عادەتیش گەیشتین!!

تێبینی ئەوەشم کرد ئەوە نەبوو خێرا بگەینە ئەوێ.

نورانیەکەیان دەستی هێنا بەسەر شوێنی گۆڕەکەیا و وتی ئەمە گۆڕەکەتە، بینیم بوو بە شوشە و شوێنێکی زۆر جوان بوو لە ناوەوە.

دوای ئەوە وتیان با بگەڕێینەوە، هەستاین و لە شوێنی خۆمانەوە گەڕاینەوە، هاتینەوە ماڵی خۆمان، دۆسیەکەیان ناوی هەرچی بونەوەرانی خوا هەیە تیایدا بوو.

لە ژورەوە دانیشتین و بانگی بەیانی فەرموو، دایکم خەبەری نەبوویەوە، پێش ئەوەی بڕۆن وتی: عەزیز ناوێکی تر لەوبەرە، ئەوە بوو بە هەمان شێوە لەوبەر یەکێك کۆچی دوایی کرد!

بە منیان وت: هەڵمەسە، ڕۆشتن دەرگاکەیان داخست لە دوای خۆیان.

بۆ بەیانی لە کۆڵانی بەرامبەرمان کە دەشتاییەك لە نێوانماندایە تەرمێکیان برد بۆ سەرقەبران.

فریشتەکان هەڵە ناکەن و لێیان تێك ناچێت، بۆ ئاگادار کردنەوەی من و ئێوەش هاتن و دوایی ڕۆشتن.

ئەم ڕووداوە دینداری زۆر بەهێز کردم.

لە دوای ئەوە نوێژی بەکۆمەڵم تەرك نەکردووە، هەرگیز بیرم ناچێتەوە.

من و خێزانم هەفتەی جارێك، دە ڕۆژ جارێك دەچین بۆ سەر گۆڕەکە کە پیشانیان دام.

بە زۆر کەسیشم وتوە کە ئەم شوێنە گۆڕی منە و وەسیەت بێت لێرە بمنێژن.

هەتا ئێستاش ئەو شوێن گۆڕە بە خاڵیتی ماوەتەوە و کەسیان تیا نەناشتوە، جێگای سێ گۆڕێك لەوێدا ماوەتەوە.

فریشتەکان ڕوویان خۆش بوو، نورانیەکەیان زیاتر، باڵایان زۆر بەرز بوو، من لە پشتوێنەی ئەواندا بووم.

ئەوەش کە بینیم واقیع و ڕاستەقینەیەك بوو، خەو نەبوو، لە ژیانمدا من خەو ناگێڕمەوە، ئینجا من بە تەواوی بە ئاگا بووم، کاریگەری ئەو ڕووداو و ئەزموونە هەرگیز لەسەرم کەم ناکات.

من خۆم لەگەڵ ستافی ئاسمانی پەیام، کاتێك لە ماڵی کاك عزیز دیدار و چاوپێکەوتنمان لەگەڵ کرد و بڵاومان کردەوە، لە دوایدا بۆ تەواوکاری بەرنامەکە ڕۆشتین بۆ گۆڕستانەکەی شۆڕش و ئەو گۆڕەشمان بینی، کە هەر چوار لای گۆڕی خەلکیە، بەڵام جێگەی سێ گۆڕ لەوێدا ماوەتەوە. 'فاتح شێخ موحەمەد'

## جەستەی مرۆڤ قەبری ڕۆحە

مامۆستا سوعاد عبدالقادر لە بەرنامەی 'شیرین چا' دا بۆی گێڕامەوە و وتی: تووشی نەخۆشی دڵ بووم، بەڵام بۆی نەدەکەوتم و، دەوامی قوتابخانەشم دەکرد، سنگم پڕ بوو لە ئاو، تووشی لاواز بوونی دڵ بوو بووم، لە بوژانەوە کەوتم، بەڵام ورەم بەرز بوو هەر بۆی نەکەوتم، شەوێکیان پاڵم دابوویەوە و دانیشتبووم، دوو دانە سال بەو جۆرە پشوم دەدا، لەبەر ئەوەی سنگم پڕ بوو بوو لە ئاو نەمدەتوانی هەناسە بە باشی بدەم، ئەگەر پاڵ بکەوتمایە و ڕابکشامایە دەخنکام!

دوو ساڵی تەواو ڕانەکشاوم، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کارەکانی خۆمم دەکرد، کتێبێکی زۆر زۆرم خوێندەوە لەو ماوەیەدا، زۆرترینیان لە بواری عەقیدەی ئیسلامیدا بوو، لەو قۆناغەدا بە تەواوی بۆی دابڕام، جارێکیان ئازارێکی زۆرم هەبوو، کە بە زۆری دادەنیشتم و نەمدەتوانی پاڵ بکەوم، خوێن بە کەمی دەچوو بۆ مێشکم و زیاتر ماندوو دەبووم.

له مردن نەدەترسام، دەموت خودایە ئەگەر مردن خێری تێدایە بۆ قیامەتم با بمرم، ئەگەر نا با ژیانم بەردەوام بێت، لەو کاتەدا لە پڕ قۆناغێك هاتە پێشەوە، دانیشتبووم، خەو نەبوو، بینین بوو.

بە تەواوی بە ئاگاییەوە بینیم و بەسەرم هات، وتم: لەوانەیە ئەمە مردن بێت.

دوای ئەوە هەستم بە خۆشیەك کرد و هیچ ئازارم نەما، تەمەنا دەکەم بچمەوە ئەو حاڵەتە، ئەوەندە مردنێکی خۆش بوو، هەچ کەسێك نەگاتە ئەو حاڵەتە نازانێ چی یەو چۆنە!!

دەتوانیت بیگێڕیتەوە، بەڵام کەس نازانێت ئەوە چ چێژێکە هەتا خۆت نەیبینی نازانیت.

ئینجا سەیری جەستەی خۆمم کرد، لە سەرەوە لە دەوری سەرم بووم، خۆمم 'جەستەم' بە جوانی دەبینی.

وتم: باشە ئەوە چی یە، خۆ پێویستم بە هەناسەدان نەماوە؟!

پەستانی قورسی سەر سەرم نەما، بانگی خوشك و براکانم دەکرد، ئەوان لە ژوورەکانی تر بوون، کەسیان وەڵامیان نەدامەوە، ئیتر زانیم من بووم بە ڕۆح و لە جەستەی مادی دەرچووم، ئا لەو کاتەدا وتم: مردن زۆر خۆشە، باشە خەڵکی بۆ ئاوا لێی دەترسن، حەزم بە گەڕانەوە بۆ دونیا نەدەکرد، تەمەننا دەکەم ئەو ئەزموونە ببینمەوە.

زەمەن و کات لەوێدا نیە، ئەوە بوو بە هۆکاری هیدایەتی تەواوەتیم بۆ ئیمان و ئیسلام.

والله ئەوەی بیەوێت خۆی بناسێت، خوا بناسێت، مردنە کە دەیگەیەنێتە ناسینی هەموو شتێك.

بە دەست خۆم بوایە دەگەڕامەوە، وەرن هەوڵ بدەن بۆ ئەم جیابوونە ڕۆحیە عەزیم و گەورەیە، هەوڵ دان بە مانای حاڵی بوون پێش پێ گەیشتنی!

ئەگەر لە حەقیقەتی دوای مردن حاڵی ببیت، چرکەیەك لە ژیانـت بە فیـڕۆ نادەیـت، هەرگیز ئەوەم بیر ناچێتەوە، وەختێك لە جەستەی قورس و بارگران نەجـاتم بـوو بـوو، ئەگەر بە دەستی خۆم بوایە هەرگیز نەدەگەڕامەوە بۆ دونیـا، جەسـتەی مـرۆڤ گـۆڕی ڕۆحە، وەرە ئەو ڕۆحە لەو گۆڕە دەربێنە بە سەلامەتی.

ئیسلام و ئیمان فێرت دەکات تەعبیر بۆ ئەم ئەزموونە بکەیت.

مادەکـانی جەسـتەمان لە گـڵ و زەوی دروسـت بـووە و ڕۆحـمان لە ئاسـمانەوە هاتووە، خوای تەعالا یەکی پێ گرتووە و مرۆڤی لێ دروست کردوە، کە دەمرین مـادە و جەستەکە دەچێتەوە زەوی و ڕۆحیش بۆ غەیب و ئاسمان.

پێـی وتـین دەبێـت بچـن لە زەوی تـاقیکردنەوەیەك بـکەن و پاشـان بگەڕێـنەوە بـۆ ئاسمان و بەهەشت.

ئێمە لە بەرزیەوە هاتوین بۆ نزمی 'زەوی'، دەبێت لە زەویەوە بگەڕێـنەوە بـۆ بەرزی و بەهەشت.

## حاجی خاتوون

حاجی خاتوون ئەزموونێکی گرنگی بـۆ گێـڕاینەوە و وتـی: منـاڵێکم لە سـکا بـوو هەشت مانگان بوو 'کچەکەم'، نەخەوتبووم و سـەیرم دەکـرد، بەهـار بـوو، مـاڵمان لە لای مزگەوتی 'حاجی حان' بوو لە سلێمانی، ئەم بە سەرهاتە بە ئاگـایمەوە بـوو، خەو نەبوو!

جیڕەی دەرگاکە هـات، دوو کەس هـاتنە ژورەوە و بەری پێم، یەکێکیـان زۆر بـاڵا بەرز بوو، سەری لە ئاسمان توند دەبـوو، ئەوەنـدە بـاڵای بەرز بـوو، ئەوی تریـان بـێ دەنگ بوو!

زمانم شکاو هیچم بۆ نەوترا، بە نارەحەت ڕۆحم دەرچوو، چـۆن دڕکێـك دەدەیـت بەسەر سەرپۆشێکی تەنکدا، ئاوا بە ئازار بوو بۆ من.

له قاچمەوە ڕۆحم دەستی کرد بە دەرچوون، هەتا ئەژنۆم هات.

کە ڕۆحم گەیشتە سەر سنگم، ئەو مەلائکە بـاڵا بەرزەکەیـان دەسـتێکی ڕاوەشـاند، ڕۆحم بە خێرایی لە جەستەم دەرچوو، ئیتر لەو کاتەدا هـیچ ئـازار و ناخۆشـیەك نەمـا، ترسیشم هیچ نەبوو، واللە مردن زۆر خۆشە و ترسی ناوێت.

بینیم خەڵك و خوا هاتن و باوەشیان پیا کردم و منـیش لاشـەکەم لە شـوێنی خـۆی وشك بووە و وەك مردوم، بەڵام خەڵکەکە ڕۆحەکەیـان بـردم، دەسـتیان کـرد بە شـتنم، کفنەکەیان هێنا و کردیانە بەرم و بردیانم بـۆ مـزگەوتەکە، بردیـانم بـۆ سـەر گۆڕسـتان، خەڵکێکی زۆری لێ بوو، نەشـم دەزانـی چ گۆڕسـتانێکە هـیچ کەسیشـم لەو خەڵـکە نەدەناسی، ڕایانکێشام لەنـاو گـۆڕەکەدا و دایانپۆشـیم و کوتایـانەوە و، گـوێم لە زرمە زرمی کوتانەوەی گۆڕەکەم بـوو، گـوێم لە تەڵقیـنەکە بـوو، وتیـان بە ئیزنـی خـوا دوو مەلائیکەت دێنە لات و وەڵامیـان بـدەرەوە بە زمـانێکی ڕەوان و هـیچ نەترسـیت، مـن لەناو گۆڕەکەمدام و گوێشم لە هەموو ئەمانەیە، هیچ بێ تـاقەت نەبـووم، دەتگـوت لە ناو شایی دام!

خەڵکەکە ڕۆشتن و فریشتە باڵا بەرزەکە هات بۆ لام و پەیدا بوویەوە.

وتی: خوات کێیە؟

وتم: خوام ئەو خوایە، کە تۆش و منیشی هێناوەتە بوب.

وتم: خوام اللەیە.

قیبلەم کەعبەت و اللەیە، باوەڕیشم بە قورئانی کلام و اللەیە.

هەزار جار أشهد أن لا إله الا الله و أشهد أن موحەمەدا رسول الله.

وتی: واللە گوناهت هەیە.

گوناهەکەشـم ئەوە بـوو پـارێزم لە حەرام خـواردن نەدەکـرد و خـواردنی مـاڵی ئەو ماڵەی خاوەن ماڵەکەم دەخوارد کە منالی بێ باوکیان هەبوو!

فریشتەکە شتێکی پێ بوو وەك وایەری کارەبا وابوو، زۆر درێـژ بـوو، پزیسـکی لـێ دەبوویەوە، وتی: زمانتم بۆ دەربێنە!

منیش زمانم دەرهێنا، سێ جار هێنای بە زمانمـدا، یـارەبی هـیچ کەس ئەو ئـازار و سزایە نەبینێت، وەکو کارەبـای دونیـایی بـوو، هێنـای بەلای ملیشـمدا، وا دەزانـم لەم لاکەشی دا.

ئینجا نەنکم 'دایکی باوکم' پەیدا بوو، وتم: نەنە گیان ئەوە تۆ لێرە چی دەکەیت؟

'نەنکم کۆچی دوایی کردبوو'، وتی: نەنە بەساقەت بێت، تـۆ تـۆڵەی گونـاە تەنهـا ئەو چوار گورزەت لەسەر بوو، تەواو پاك بوویتەوە. ڕزگارت بووە.

ئەو شوێنە کە منی لێ بووم دەتوت بەهەشتە ئەوەندە خۆش بوو.

دوای ئەوە ڕۆحم گەڕایەوە بۆ نـاو لاشـەکەم، ورده ورده قاچەکـانم گەرم بـوون، بە تەواوی ڕۆحم تێ هاتەوە، شـەقەم لە دەرگـا هەسـتاند و بـانگی بـاجی ڕەحـمەم کـرد 'خاوەن خانووەکە بوو'.

وتم: ئەوە تۆ لە کوێیت؟

وتی: واتە چی لە کوێم!!

وتم: ئەوە تۆ نازانی چیم بەسەر هاتووە!

وتی: ئەوە بۆچی ئاوا ڕەنگت تێك چووە؟!

ئیتر منیش هەر چۆنێك بێت حاڵی خۆم بۆ گێڕایەوە.

مێردەکەم بردمی بۆ لای مەلاکەی مزگەوتی 'حاجی جان'، وەختـێ بـۆم گێـڕایەوە، مـل و زمـانمم پیشـان دا کە سـوتا بـوو، بە نـاڕەحەت قسـەم بـۆ دەکـرا، مانگێـك چارەسەریان کردم و چارەسەرم وەرگرت هەتا چاك بوومەوە، دوای ئەوە ترسـی مـردنم بە هیچ جۆرێك نەماوە!

# کاك ئامانج موحەممەد أمین ئەردەڵانی

برا و خزمێکم کە حەزی نەکرد ناوی بنوسم بۆی گێرامەوە و وتی: باپیرم حاجی شێخ عوسمانی نێرگزە جاڕی 'بەرگ سپی'، لە ساڵەکانی شەستەکاندا دەچێتە ناوچەی فەیدان، دەڕواتە دێیەکەوە، کە خەڵکەکە بە زۆری خەریکی بەخێو کردنی گامێش بوون.

درەنگانێکی ئێوارە دەگاتە بەرایی ئاوایی.

ئەم ڕووداوە باپیرەم و نەنکیشم کە خێزانی حاجی شێخ عوسمان بوو بۆیان گێڕاومەتەوە.

ئەو کەسەی کە ڕووداوەکەشی بەسەرهاتوە، ناوی کاك منصور بوو 'بە ڕەحمەت بێت' من خۆم بینیومە.

دایکی و باوکیشم بینیوە، هەتا ئێستاش باوکیان ماوە، بەڵام دایکیان 'غەنیە خان' کۆچی دوایی کردوە.

باپیرم ئێوارەیەك قەدەری خوا ڕێی دەکەوێتە ئەو ئاواییە و دەچێتە ئەم ماڵە بەڕێزە.

ماڵەکەش کە دەبینن ئەم پیاوە دەم و نفوس پاك دیارە و، عیبادەت و هەڵس و کەوتی دەبینن.

غەنیە خان بە مێردەکەی دەڵێت: پیاوەکە ئەم پیاوە زۆر دەم و نفوس پاك دیارە و، ئیماندارێکی ساغ دیارە، پێی بڵێ با دوعایەکی خێرمان بۆ بکات، مێشوولە خەریکە ماڵ و حاڵمان وێران دەکات.

بووەتە هۆی ئەوەش شیری گامێشەکانیش کەمیان کردوە، با پێی بڵێین دوعایەکمان بۆ بکات.

مێردەکەشی دەڵێت: باشە ئێستا ماندووە، بەیانی پێی دەڵێین.

کاتێ باپیرم بۆ سبەینێ بەیانیەکەی لە خەو هەڵدەستێت بۆ بەر چـایی دادەنیشـێت و پێیان دەڵێت: واللە ئەم شەو زۆر هەوڵم دا لە خـزمەت حەزرەتـی رسـول اللە ﷺ، کە لە خەومدا لە خزمەتیا بووم!

عەرزیـم کـرد، ئەوەی کە پێـی ڕاسـپاردم بە ئێـوەی نەڵـێم، ئەوەی کە فەرمـووی لە داهاتوودا ڕوودەدات و تایبەتە بەم خێزانەی ئێوەوە.

وتم: یا رسول اللە ﷺ ئەم ماڵە من ناناسن، زۆر ڕێزیان لە مـن گرتـووە، بـا مـن ئەم هەواڵە ناخۆشەیان پێ نەڵێم!

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوە فەرمانی خواییە و دەبێت بێتە دی و پێشیان بڵێیت!

ئەوانیش وتبوویان قوربان پێمان بڵێ!

باپیرم فەرموو بووی: حەزرەتی ڕەسول اللە ﷺ فەرمووی ئەهلی ئەم ماڵە، ئـافرەتەکە 'غەنیە خان' ماوەیەکی تر دووگیان دەبێت، مناڵەکەی دەبێت و کوڕیش دەبێـت، کـاتێ کوڕەکەیان دەبێت با ناوی لێ بنێن 'منصور'.

مەنصور کە تەمەنی دەگاتە (٧ – ٨) ساڵان دەبێتە قورئان خوێنێکی زۆر زیـرەك و بە توانا و دەنگ خۆش.

زانستە شەرعیەکانیش دەخوێنێت.

ئەو برا و خزمەم دەڵێت: من خۆم مەنصورم بینی لە ساڵەکانی (١٩٨٣ - ١٩٨٤).

بـاپیرەم وتبـووی: لە دوایـدا گەورە دەبێـت و لە شـەڕێکی گەورەی بەناوبانگـدا دەکوژرێت.

ئەم خەونە دایك و باوکی مەنصور زۆر متمانەیان پێی هەبووە!

دوعای بۆ کردن کە مێشوولە لەو دێیە نەمێنێت، سبحان اللە هەتا ئێسـتا ئەوە زیـاد لە پەنجـا سـاڵە، لەو دێـیەدا مێشـوولە نەمـاوە و زیـانی نەمـاوە، دێهاتەکـانی دەوروبەری

ماویـانە، ئێسـتا لە نزیکـی مزگەوتـی خانەقـای سـلێمانی کوڕەزاکـانی ئەو بنەمـاڵەیە دوکانی قەیماغ و شیرەمەنیان هەیە و، بەم بەسەرهاتە دەزانن و ئاگادارن.

پاش ماوەیەك غەنیە خان دوو گیـان دەبێـت، پاشـان کوڕێکیـان دەبێـت و، لەسـەر وەسیەتی شێخ عوسمان ناوی دەنێن مەنصـور، گەورە دەبێـت و دەیـخەنە بەر قورئـان خوێندن و فێری ئادابی ئیسلامەتی دەکەن و پاشان زانستی شەرعی فێـر دەبێـت و زۆر دەنگی خۆش دەبێت و گەورە دەبێت، لە سەرەتای ساڵەکانی (١٩٨٠) جەنگی عێـراق - ئێران دەست پێ دەکات.

ئەم بنەماڵەیە زۆر دەترسـن و دەزانـن کە ڕەنـگە ئەمە ئەو جەنـگە بێـت کە مەنصـور تیادا دەکوژرێت!

غەنیە خان بە مێردەکەی دەڵێت: پیاوەکە با مەنصور نەنێرین بۆ سەربازی.

پیاوەکەشی دەڵێت: ژنەکە ئێمە قەدەری خوامـان پـێ ناگۆڕێـت، پشـت بە خـوا بـا بڕوات و، خوای گەورە بیپارێزێت.

هەموو نیشانەکان کە شێخ عوسمان فەرمووی هاتونەتە دی، ئیـتر دەکرێـت خۆمـان لە قەدەر لا بدەین؟!

ئیتر ئەوە بـوو لەو جەنـگەدا شـەهید بـوو، جەنازەکەیـان هێنـایەوە و، کۆمەڵێـك لە خزمان ڕۆشتن بۆ تەعزیەکەی کاك مەنصوری ڕەحمەتی!



# دکتۆر عدنان عبدالقادر هەورامانی

برای بەڕێزم دکتۆر عدنان هەورامانی بۆی گێڕامەوە و وتی: واللە علی ما أقول شهید.

ئەم دیاردەی 'نزیکبوونەوە لە مردن'ەی کە من بینیم، هەست دەکەیت ئەم دونیایە بەجێ دەهێڵیت، هەندێ حاڵەتت بۆ دروست دەبێت، ئامارژە گەلێکی خوایە هەتا ڕاتچڵەکێنێت، سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە ئەم جۆرە داچڵەکینەمان بۆ دەنێرێت، هەتا لەناو بێ ئاگایدا نەژین.

لە قۆناغی سێهەمی کۆلێژدا بووم، قوتابی زانکۆی دهۆك بووم، ئاوی دهۆك لە بەنداوی 'باجلۆ' دابین دەکرێت، ئەوانەی ئاگادار و شاهیدی حاڵەتەکەی من بوون بریتی بوون لە مامۆستا موحەمەدی بالیسانی و دکتۆر ئومێد سورچی و دکتۆر موحەمەد خالد کە ئێستا لێپرسراوی خوێندنی باڵای زانکۆی 'صلاح الدین'ە لە کۆلێژی زانستە ئیسلامیەکان.

لە سلێمانیش گێلاس خانی دایکم و مامۆستا مەلا عبدالقادری تەوێڵەیی باوکم، هەردوکیان سوپاس بۆ خوا ماون.

لە چرکە ساتێکدا هات بەسەرمدا کە لەمسەری بەنداوەکە بە مەلە بڕۆم بۆ ئەو سەری بانداوەکە، ئاوەکەش سارد بوو، ماوەیەکی زۆریش بوو مەلەم نەکردبوو، لیاقەم کەم بوبۆوە.

وتیان مەڕۆ!

وتم: حەزم لێیە با بڕۆم!

دەستم کرد بە مەلە کـردن هەتـا بـگەمە ئەوبەر، لە ناوەڕاسـتی ئـاوەکەدا وزەم نەمـا، جەستەم ڕەق بوو، هەندێ هەوڵی جۆرەکـانی تـری مەلەم دا، هەتـا ورەم نەڕوخێـت و بێ ئومێد نەبم.

بەڵام کە سەیرم دەکرد ماوەی پەڕینەوەم نیوەی ماوە و، گەڕانەوەش ئەوەنـدە دەبـوو، پەشۆکام و ورەم ڕووخا.

یەك دوو جـار نـوقم بـووم و سـەرم دەرهێنـایەوە، هەوڵـی هـاتنە دەرەوەم دەدا و نەمتوانی بێمە دەرەوە، ئاخرین جار کە هۆشم مابوو هەتا سەر و دەم و لوتم ئاو هـات، منیش ئاو و قەوزەیەکی زۆرم خواردبوویەوە و قـورس بـوو بـووم، ئەو ئـاخرین جـارە ویستم هەناسە بدەم نەمتوانی، کەوتمەوە ناو ئاوەکە، لەناو ئاوەکەدا ئەمەم بەسـەرهات، کە ڕەنگە بەشێکی زۆر بچوکی چرکەیەك بێت، ئەو هەمووەم تیا بینـی، هەرچـیم کـردوە لەو سێ ساڵەی کە لە دهۆك بووم، هەروەها کار و کردەوە و شۆخی و قسـەکانی کە لە سەردەمی دوا ناوەندی کردومە، هەمویم بینیەوە.

زۆر سەیر بوو بەلامەوە، قۆناغەکـانی تەمەنـی خـۆمم بینـیەوە، لە هەمـان کاتیشـدا هاوڕێکانیشم دەبینی کە لە دەرەوەی ئاوەکەوە دەگریان.

ئێستا ئەو مامۆستا بەڕێزانە ماون و شاهیدن، بەڵام نازانم چۆن ئەوانم دەبینی؟!

یەکسەر زانیم کە ئەمە حاڵەتی مەرگ و مردنە و هاتوەتە پێشەوە.

هەوڵم دا بێمەوە دەرەوە هەتا شایەتومانێك بێنم و کۆتایی بە ژیانم بێت.

زۆر بە زەحمەت هەوڵم دا لە ئاوەکە سـەر دەربێـنم، وتـم: أشـهد أن لا إله الا الله و هەوڵی موحەمەدەکەم کرد نەمتوانی.

ئا لەو چرکە ساتەدا سەرم هەڵبـڕی دایکـم لە ئاسـمان بـانگی دەکـردم، دایکمـم بە جوانی لە ئاسمان بینی، دوای ئەوە کەوتمەوە ناو قوڵایی ئاوەکە و ئیتر ئاگـام لە خـۆم نەما.

هاوڕێکانم دەبەیان پـێ بـوو، دەبەی بیسـت لیـتری هەتـا ئـاو ببەیـنەوە بـۆ بەشـی ناوخۆییەکەیـان، هـاتبوون منیـان ڕاکێشـابوو چەناکەمیـان خسـتۆتە سـەرە دەبەکـان و دەریان هێنابووم، هەموو ئاوەکەم هەڵهێناوەتەوە و بردبومیان بۆ نەخۆشخانە.

وتم بە هاوڕێکانم با دایکم و باوکم نەزانن و خەفەت بخۆن!

بەڵام کاتێ هاتمەوە بۆ سلێمانی و دراوسێکان هاتن بۆ لام و پێیان وتـم کەفارەتـت بێت و خوا ڕەحمی پێ کردی!!

چونکە دراوسێکانمان لە ڕێگەی ترەوە بیستبوویان.

باوکم وتی: ڕۆڵە چیت بەسەر هاتووە؟!

منیش بۆم گێڕایەوە.

باوکم وتی: ڕۆڵە بەروارەکەیت بیر ماوە؟!

وتـم: بەڵـێ بـاوکە، خـۆت دەزانیـت مـن دەفـتەری یـادەوەریم هەیە و هەمـوویم نووسیوەتەوە.

باوکم وتی: گێلاس وەرە ئەوە ئەو ڕۆژەیە کە نیوەڕۆ بوو لە مـاڵەوە بـووین، دایکـت خەوتبوو، بەدەم خەوەوە هەسـتا و ڕاچڵەکـی و هـاواری دەکـرد و دەیـوت عەدنـان لە بیابانێکدا بانگم دەکات.

ئەو هاوار کردنەی دایکم، لەگەڵ ئەم هـاوار و بینیـنەی مـن بـۆ دایکـم لە دهـۆك و لەناو ئاوەکەدا بەیەکەوە بووە، یەك چرکە و خولەك جیاوازیان نەبووە!

دایکم لە خەودا بووە و پەیوەندی ڕۆحی بۆ دروست دەبێت لەگەڵ منێك کە نزیـك دەبمەوە لە زاڵ بوونی ڕۆح بەسەر جەستەدا و لە ساتێکدا دیداری ڕۆحەکـان دروسـت دەبێت!!!

# شێخ أكرم شێخ حمه صاڵحی سەنگاوی

شێخ اکرم بۆی گێڕامەوە و خۆشم شاهیدی حاڵەتەکەی بووم لەبەر ئەوەی پـورزامە و ئاگاداری ڕووداوەکەی بووم، وتی: چەند ساڵێك لەمەو پێش وەستای بیـر بـووم، لە ٢٠١٦/١٠/٩ بیرم بۆ ماڵێك هەڵدەکەند لە دێـی 'بەردەکەڕ' چەنـد ڕۆژێـك پـێش ئەوە دڵم زۆر تەنگ بوو، لای خێزانیشم باسم کرد و وتم: لە ئیشی ئەم بیرە دوو دڵـم و حەز ناکەم کاری تیا بکەم.

خێزانیشم وتی: ئەگەر دەزانیت دەڕووخێت، یان شـتێکی ناسروشـتی تیـایە کـاری تێدا مەکە.

وتم: تەوەکول بە خوا دەچم و تەواوی دەکەم. من پانزە ساڵە ئەوە کارمە.

کات پێش حەوتی بەیانی بوو، بیسـت و چـوار مەتـرم هەڵکەنـدبوو، وتـم: بەڵکـو بگاتە سی مەتر و ئاوێکی باشی هەبێت، هەتا دوو ماڵ زیاتر سوودی لێ ببینن.

ئەو بەیانیە ڕۆژی بیست و نۆهەم بوو کە کارم لەو بیـرەدا دەکـرد و ئەو قەدەرە ڕووی دا.

ڕۆشتمە ناو بیرەکەوە، لە یادمە سەتڵێکیان هەڵکێشا، دووەم سەتڵ کە هەڵـی کێشـا، لە ئـاخرین پـلەدا کە سـەتڵەکە خـاڵی دەکـاتەوە، دەسـتی بەر ئیسـتۆپی جیهـازەکە نەکەوتــووە، سـەتڵەکە بە سـکەیەك دور دەکەوتەوە، واتە بە دەسـت لا نەدەبـرا، ئەو کەسەی هەڵی دەکێشا بیری چووبوو، قەدەری خـوا دەسـتی بە دوگـمەی دابەزینەکەدا نابوو.

وتی: بەس ئەوەندە فریا کەوتم بڵێم وەستا ئەکرەم هات.

سەتڵەکە پڕ بـوو لە تـاوێر و ئـاو، کـاتێ سـەتڵەکەی بە پـڕی و بەو هێـزە زۆرەوە کە دابەزیوە کێشاوێتی بە سەرو سنگمدا، هەتا ئێستاش نازانم چۆن بووە!

ئیتر من بێ هۆش کەوتبووم لەناو بیرەکەدا.

دراوسێیەکی ئەو ماڵە کاکە زانای ناوە وتی: مـن پـانزە خولەکێـك دەبـوو سـلفم لە سەیارەکەم دەدا بڕۆم، سەیارە ئیشی نەدەکرد، بەبێ ئەوەی سـەیارەکە هـیچ کێشـەیەکی هەبووبێت.

وتی: دوای ئەوە هاوار هەستا کە فریامان بکەون، ئیتر کاك زاناش هـاتبوو بـۆ سـەر بیرەکە و وتبووی شپرزە مەبن تازە ئەم مردووە، با یەکێکی تریش تیـا نەچێـت، بوەسـتن بزانین چی بکەین باشە، وتـی: سـەرم نـا بە بیـرەکەوە و وتـم: وەسـتا اکـرم... وەسـتا اکرم... دەنگ نەبـوو، بە جیهـازەکە هـاتبوویە خـوارەوە و دەبینێـت دەسـت و سـەر و پەراسوو شکاوە.

وەستا ئەکرەم دەڵێت: ئەوەم لە یادە کە سیمەکەی پێوە ئاڵاندم، هاواری دەکـرد وردە وردە سەری بخەن بە جیهازەکە، ئیتر سەریان خستم.

بەو جیهازە نەبووایە سەر نەدەخرام.

ئەوەندەم لە یادە وتم: کاکە مردم.

وتی: بە قوربانی غیرەتت بم، ئێستا دەچین بۆ نەخۆشخانە، هیچ نیە تۆزێ دەسـتت شکاوە، ئیتر دوای ئەوە بێ هۆش بووم، نۆ ڕۆژ بە تەواوی بێ هۆش بـووم، لە مـاوەی ئەو نۆ ڕۆژەدا شتێکم بینی، لە ژێر کۆمەڵێك لاشەی مردودا، کەوتبووم، ئەوەی کە مـن بینیم لە خەو نەدەچوو، دەمویست لە ژێر ئەو تەرمـانەدا هەسـتم، یەك دەشـتی فـراوان بوو، هەمووی تەرمی مردوو بوو، لە ژن و مناڵ و پیاو، هەسـتام، دەمویسـت بـڕۆم، لە خەیاڵی خۆمدا دەمـوت نـا ئـازاری ئەم تەرمـانە نـادەم، شـوێنی بەتـاڵ زۆر کەم بـوو، ڕۆشتم لە دوور ڕووناکیەکم بینی، ئەو شوێنە تاریك بـوو، ڕووم لە ڕوونـاکیەکە کـرد و کەوتمە ڕێ و ڕۆشتم، خانوویەك پەیدا بوو، وەك ژوورێك وابوو، دوو کەسـی گەنجـی پۆشاك سپی، ڕیش ڕەشی زۆر جوانم بینی، غەریـب بـوون، بەڵام زۆر جـوان بـوون، شتێکیان وەك پشتوێن پێوە بوو، ڕۆشتم بۆ لایان و پێم وتن بۆ کوێ بچم؟!

لەوێدا تەنها ئەو چەند نورانیەم بینی، بە تایبەتی دوانیانم بە ڕوونی بینی، یەکێکیان دەستی ڕاکێشا زنجیرە چیایەك هەبوو، خەڵکێکی زۆرم بینی بە دوای یەکدا دەڕۆشتن و پێیان پەتی بوو، یەکی چرایەکیشیان بە دەستەوە بوو دەڕۆشتن.

پێی وتم: تۆش ئەم چرایە بگرە و بە دوای ئەواندا بڕۆ.

خەڵکەکە جۆرەها خەڵك بوون لە ژن و منداڵ و پیاو. ڕەنگە ڕۆحی ئەو خەڵکە بووبێت کە من تەرمەکانیانم بینی و ئەو دەشتەیان پڕ کردبوو، هەموو ئەوانە بەرەو بەرزی و بەرەو ئاسمان دەڕۆشتن، کۆتاییەکەی دیار نەبوو...

## داده 'مریم'ی تەکیەی قەرەداغ



داده مریم ئەو ژنە موسوڵمانەی کە خەڵکی گوندی تەکیە بوو، کە لە سەرەتای ساڵەکانی 'نەوەدەکان' مامۆستا عادل شاسواری چاوپێکەوتنی لەگەڵ ئەنجام دابوو، بە تیمێك ڕۆشتبوون بۆ ماڵیان، کە یەکێك لەوانە خوشکە ڕووپاك مصطفی بوو کە بەرنامەیەکی تەندروستی هەبوو لە ڕادیۆ، کاتێ بەسەرهاتی سوتانی بە ئاگری دۆزەخ گێڕابوویەوە، مامۆستا عادل وتی، ڕووپاك خان لە ژورێك سەیری سنگ و پشتی ملی داده مریمی کردبوو، لە دوای زیاتر لە سێ ساڵ هێشتا شوێنی سوتانەکەی بە جەستەیەوە مابوو!

لە دوای ئەوەی مامۆستا عادل ئەم بەسەرهاتە سەرسوڕهێنەرەی لە ڕادیۆ گێڕایەوە، منیش بۆ بارنامەکەم لە ڕادیۆ، ڕۆشتم بۆ ماڵی داده مریم و بە هۆکاری پەیوەندی خزمایەتیشەوە زیاترم لێ وەرگرت، لەگەڵ ئامۆژنە ئامینەم کە خێزانی مامە عبداللەمە ڕۆشتین بۆ ماڵی داده مریم و زۆر بەسەرهاتی سەیری بۆ گێڕامەوە کە بینیویەتی.

ئەزموونی نزیکبوونەوەی لە مەرگ و حاڵەتێکی سەیر کە بینیویەتی بەم جۆرە بوو.

داده مەریەمەم وتی: گەنج بووم و زۆر نەبوو کە شـووم کردبـوو، تەنهـا دوو منـاڵم هەبوو، ماڵمان لە تەکیەی قەرەداغ بوو، دوو منـاڵەکەم لەم لاو لام خەوتبـوون، لە ژێـر کەپرا بووین، هاوین بوو، مێردەکەم لەنـاو بـاخ و بێسـتانەکە ئیشـی دەکـرد و لە خـوار ئێمەوە بوو، منیش خەو بردمیەوە و لە نێوان منداڵەکانمدا خەوم لێ کەوت!!

لە ژێـر کەپـرا بـووین لە شـوێنی مەزرای خۆمـان، هـیچ ئاگرێـك نەکرابـۆوە و، شوێنەواری ئاگریش لەو شوێنە نەبوو.

لە خەونمـدا دوای ئەوەی لە گۆڕەپـانێکی گەورەوە بـرام بـۆ نزیکـی ئـاگرێکی زۆر گەورە و بێ ئامان، کە خەڵکێکی زۆری تیـا دەسـوتێنرا، منیشـیان لەو ئـاگرە دۆزەخـیە نزیك کردەوە، هەتا شاڵاوی ئاگرەکەم لێ نزیك بوویەوە و سـنگ و پشـتمی سـوتاند، هـاوارم کـرد خـودایە تەنهـا ئەم جـارە ڕزگـارم بـکە، یـارەبی فریـام بـکەوە، دوای پـاڕانەوەیەکی زۆر دوریـان خسـتمەوە لە ئـاگرەکە و ڕۆشـتمە شـوێنێکی خـۆش لە گۆڕەپانێکی زۆر گەورەدا، یەکێك لە خزمەکانی خۆمانم بینـی، کە لە زووەوە مردبـوو، پێم وت: بۆچی فریام نەکەوتی؟! من لە نزیکی ئاگردا بووم!!

وتی: دادە مریم ئەوەی بینیوتە ئاگری دۆزەخ بووە، هیچ کەس ناتوانێت فریای هیچ کەسێك بکەوێت، مەگەر خوای گەورە بیەوێت، خوای تەعالا ڕەحمی پێ کردویـت و ڕزگاری کردویت!!

ئیتر دوای ئەوە بەئاگا هـاتمەوە، هەسـتم بە ئـازاری سـوتان و سـوتانەوەی پشـتم و سنگم دەکرد، کە سـەیری خـۆمم کـرد، دەبیـنم بەبـێ ئەوەی کراسـەکەی بەرم هیچـی بسوتێت و هیچی لێ بێت، لە ژێر کراسەکەمەوە جەستەم سوتاوە!

سوتانێك کە زیاتر لە مانگێکی پێچوو، بە چارەسەر و تەداوی ئینجا چاك بـوومەوە، لە دوای دەیان ساڵیش هێشتا شوێنەواری ئەو سوتانە بە جەستەمەوە دیارە!!

# گۆڕستانی شێخ أحمدی هیندی



هاوینی ساڵی (٢٠١٩) بوو، لە ناوچەی پیشەسازی گەڕامەوە بچمەوە بۆ ماڵەوە، زۆر ماندوو بووم، سەیارەکەم چاك کردبوویەوە، گەیشتمە نزیکی پردی 'کۆبانێ'، نیەتم هێنا بچم بۆ گۆڕستانی 'شێخ أحمدی هیندی'، چوار مانگێك بوو دایکم حاجی 'زوهرە'ی مامۆستا شێخ جمیلی موفتی وەفاتی کردبوو 'بە ڕەحمەت بێت'، پێشتر نیەتی ڕۆشتنم نەبوو، بە چەند چرکەیەك پێش پردی 'کۆبانێ' بڕیارم دا.

کاژێرێك دوای نوێژی عەسر بوو، زۆر گەرم بوو، گۆڕستانی 'شێخ أحمدی هیندی'یش، بە زۆری چۆڵە و هامۆشۆکەرانی زۆر کەمە، بە تایبەتیش ڕۆژێك بێت هەینی نەبێت و پاش عەسر و زۆر گەرمیش بێت!!

گۆڕستانەکە هیچ کەسێکی لێ نەبوو، منیش لەسەر گۆڕی دایکم ماوەیەك دانیشتم و، قورئان و فاتحەم خوێند و، پاشان کەوتمە قسە و باس لەگەڵ دایکم، هەندێ گلەیشم لێ کرد و، وتم: دایە بۆچی نایەیتە خەوی کوڕ و کچەکانت؟!

زۆرت بیر دەکەین، هەواڵێکمان پێ بدە!!

بۆچی هەموو شەوێك دەچیتە خەونی 'دایکی سیما'، بەڵام ئێمە ڕۆڵە و نەوەی تۆین نایەیتە خەوی ئێمە!!

ئەو ڕستەیەی کۆتاییم وت و ویستم هەستم و بگەڕێمەوە بۆ ماڵەوە، مۆبایلەکەم دەست بەجێ لێی دا!

دەبینم دایکی سیمایە، کە زۆر دەچووە خەوی ئەو خوشکە و زۆر شتی بەو دەوت و، ئەویش بە ئێمەی ڕادەگەیاند!

یەك دەقیقەی پێ نەچوو کە مۆبایلەکەم لێی دا و دایکی سیما وتی: مامۆستا تۆ لە کوێیت؟

وتم: بۆچی؟

وتـی: مامۆسـتا مـن عیلاجـی نەخۆشـیەکەم نیـوەڕۆ خـواردوە 'کە نەخۆشـی نەخۆشخانەی هیوا بوو' لەبەر قورس و گرانی عیلاجەکانم خەوم لـێ کەوت و، ئێسـتا دایکـت هـاتە خەوم و پێـی وتـم: دایکـی سـیما زوو هەسـتە نـوێژی عەسرت بـکە و درەنگە، ئێستا 'فاتح' لە لای منە!!

مامۆستا تۆ لەسەر گۆڕی دایکتیت؟!

وتم: 'سبحان الله' بەڵێ، من لە گۆڕستانم و هەر ئێسـتا گلەیـم لـێ کـرد کە بـۆچی نایەتە خەوی ئێمەوە؟

ئەوە دایکم وەڵامی دامەوە لە ڕێگەی تۆوە، دیـارە خەو بینـین لە جیهـانی بەرزەخ بە زیندووەکانی دونیاوە بە دەستی خۆیان نیە و مۆڵەتی ئێمەی نیە، بەڵام چـونکە مـۆڵەتی تۆی هەیە، دەقیقەیەکی نەبرد لە ڕێگەی تۆوە وەڵامی دامەوە!

ئەم خوشکە بەڕێزە لە دوای چەند مانگێك وەفاتی کرد و 'خوای گەورە لێـی خـۆش بێت' ئەویش گەیشتە بەرزەخ.

## شێخ وەهابی قەرەداغی



شێخ وەهاب بۆی گێڕامەوە کە دوای ئەوەی نوێژی بەیانیم کـرد و بە زۆریـش دوای نوێژ دەخەومەوە، دوای ئەوەی کە هەڵدەستم و دەچم دەست نوێژێـك دەگـرم و ئەگەر خوای گەورە کۆمەکیم بکات چەند ڕکاعەتێك نوێژ دەکەم.

ڕۆشـتمە دەستشـۆرەکەی دەرەوە و دەسـت نـوێژم دەگـرت، هەسـتم کـرد دەسـتم گرفتێکی هەیە، تەزوو دەهـات بە گیانمـدا دەسـتم کـرد بە لا حـول ولا قـوة إلا بـالله، استغفرالله و، سبحان الله و دەستم گرت بە دەستشۆرەکەوە هەتا دەستم بشـۆم، هەسـتم

کرد لایەکم خەریکە سڕ دەبێت، وتم بەخوا باری تەندروستیم باشنیە، بەڵام هەر بەردەوام بووم لەسەر دەست نوێژەکە، هەردوو قۆڵیشم شۆرد و ئیتر هەستم کرد شتێك لە جەستەم دەردەچێت، بە دڵنیایی و یەقینیشەوە دەمزانی کە ئەمە فراق و جیابوونەوەی ڕۆحە لە جەستەم، هەستم کرد کە دەمرم، وتم خۆزگە دەگەیشتمە ناو دەروازەکە و منداڵەکانم دەبینی!

وتم بەشکوم فریا کەوم بچمە دەرگای دەروازەکە و بانگی یەکێکیان بکەم، چونکە دەزانم ئەمە ئاخرین جارە دەیان بینم.

دەرگاکەم کردەوە خێزانم بوو، بانگێکم کرد، زانیم وردە وردە قاچم لە ئیش دەکەوێت.

هەستم کرد هێزێك شتێك لە جەستەم دەردەچێت، سەیری ئاسمانم دەکرد، چاوم بە دوای شتێکدا دەگێڕا، گەیشتمە مەدخەلەکە وتم: ئاشتی وەرە دەمرم.

ئیتر کەوتم و هەستم کرد شتێکی سپی لە لەشم دەردەچێت و دەمبینی کە دەڕۆم، وەکو تەرزەیەکی سپی بووم، خێزانم دەستی گرتم، من هەر دەموت والله دەمرم، شایەتومانم دەهێنا.

کە قاچم ڕاکێشا ئەو تارماییە سپیە جارێکی تر هاتەوە ناو لاشەم و هەستم پێ کرد، لە کاتێکدا کە تارماییە سپەیەکەم 'ڕۆح' خەریك بوو لە بنمیچیماڵەکە دەردەچوو، ئیتر گەڕایەوە ناو جەستەم.



# خاڵۆ شێخ ئەو ڕەحمانی خەرپانی

مامۆستا شێخ موحسینی موفتی بۆی گێڕامەوە لە بەرنامەی 'شیرین چا'دا فەرموویان: شێخ ئەو ڕەحمانی کوڕی شخ ڕەسوڵی خەرپانی کە خزممانە، من لە خزمەت جەنابی باوکمدا بووم 'مامۆستا شێخ خالیدی موفتی'، ڕۆشتین بۆ نەخۆشخانەی 'جمهوری' لە سلێمانی، باری نائاسایی بوو، چاوی هەڵبڕی و وتی بە من و باوکمی وت یاسینم بخوێنن، باوکیشم فەرمووی با هەردوکمان یاسینی بخوێنین، ئێمەش بە کوڵ یاسینمان خوێند، چونکە پیاوێکی دین دار و پیاوانە و خزم دۆست بوو، دوای ئەوە بێ هۆشیەکی درێژ خایەن هات بەسەریدا، وەختی ئەوە بوو کە ئێمە بەجێی بهێڵین.

دوای ماوەیەك باری ئاسایی بوبۆوە، بردبویانەوە بۆ هەڵەبجە،ماڵیان لە کۆمەڵگەی عەنەب بوو، ڕۆشتین بۆ لای و بە تامەزرۆییەکی زۆرەوە بەخێرهاتنی جەنابی باوکمی کردوو، پاشان خاڵۆ شێخ ئەو ڕەحمان وتی: کە جەنابتان ڕۆشتن، من ئاگام لە خۆم بوو 'لە کاتێکدا بێ هۆش بووە، واتە بە ڕۆح ئاگادار بووە'، نەم ئەتوانی چاو هەڵبڕم، بەڵام ئاگام لێتان بوو، ئاگام لێ بوو کە دکتۆر هاتە سەرم حسابی منیان بە مردوو کرد یان چەند ساتێکی زۆر کەمم ماوە لە ژیاندا!

دکتۆرەکە وتی: لەبەر ئەوەی دوا نەکەون و جەنازەکەی ببەنەوە، ئیش و کارەکانیتان بۆ ئاسان دەکەم!

دوای ئەوە شتێك هاتە سەر سنگم، وەك ئەوەی لەناو دڵمدا بە چوار مشقی دانیشت، ئەوەم هەموو لە بیر چوویەوە کە من نەخۆش بووم و حاڵم خراپ بوو، زۆر زۆر ئاسایی بووم، ئەو کەسە بە تەواوی نزیك بوویەوە لە من، تەنها قسەم لەگەڵ ئەو دەکرد، زۆر زۆر قسەمان پێکەوە کرد، زۆر دۆستایەتی پیشان دا، دەیزانی من زۆر

حەزم لە باخ و بێستان و کشتیاری و زەوی و زار و ئاو بوو، 'دیارە شەیتان ڕێگە دەدۆزێتەوە بۆ لای تۆ، ئیمامی غەزالی دەفەرمووێت: سەیری مرۆڤ دەکات لە دونیا حەزی لە چیە، لەو ڕێگەیەوە دێت بۆ لای، ئافرەت، بازرگانی، زەوی و زرا و ئاو، کورسی و پلەوپایە'.

خۆیشم زەوی بەراوم زۆر بوو، کە ئێمە زەویەکانی 'کۆلیژمان' هەبوو دەیڕوانی بەسەر هەموو شارەزووردا، ئەو کەسە دەشت و دەری شارەزووری پیشان دام، زۆر جوان و سەرسوڕهێنەر بوو، هەمووی زەوی کشتوکاڵی و بەراو بوو، زۆر جوان بوو، پێمی وت: شێخ ئەو ڕەحمان، حەزت لە چیە؟ هەتا چاو بڕ بکات موڵکی منە و تاپۆیە!

منیش دەتوانم حەزت لە هەرکامێکیانە پێتی ببەخشم!

منیش چەند شوێنێکم دیاری کرد و ئەویش وتی ئەوانە هەمووی بە موڵکیەت بۆ تۆ...

ئینجا دوای ئەوە پێی وتم: کێ هەیە ئاوا بە بێ منەت ئەم هەموو موڵك و سامانەت پێ بدات!

وتی: من ئەم هەمووەت پێ دەدەم، ئایا حەق نیە فەرمانبەرداریت ئاشکرا بکەیت!!

بەوەی کە بە من بڵێ من سوپاسی تۆ دەکەم و مەمنونی هیچ کەسێکی تر نیم!

لە کۆتایدا پێی وتم: کۆتا شت کە دەمەوێت پێت بڵێم، دەمەوێت پەشیمان بیت لەوەی کە لە پێشدا منەت باری خەڵکی تر بوویت 'واتە منەت باری خوا بوویت'

وتم: ئاخر چۆن شتی وا دەبێت؟!

وتی: ئادەی تۆ سوپاس گوزاری هیچ کەسێك بوو بیت، بزانە ئێستا دێت بە هاناتەوە و، هیچت بۆ دەکات؟!

ووردە وردە هاتە سەر ئەوەی کە من پەشیمان بکاتەوە لەوەی کە نوێژم بۆ خوا کردوە، ئەوەندە بە فێڵ و سیاسەت و ساختە و شارەزاییەوە دەیویست فریوم بدات، والله کاریگەری تەواوی لەسەرم هەبوو!

خەریك بوو بە تەواوی ملکەچی بم.

لەرزەیەکی ئیمانی دای لە دڵم.

بیرم کردەوە وتم: باشە من ماوەیەك لەمەو پێش لە کەعبە بووم و دەستم بە قوڵفی کەعبەوە بووە و لە 'باب الألتزام' دا تەوبەم کردووە و، من چەندین ساڵە نوێژ و ڕۆژوو دەگرم و، ئێستا بۆچی بۆ ئەم باخ و باخاتە واز لەم هەموو دین و ئیمانە بێنم.

یەکسەر بیرم کەوتەوە کە ئەمە شەیتانە.

پێم وت: نەفرەت لێ کراو سوێند بەخوا هەموو دونیام پێ بدەیت واز لە دین و ئیمان و ئیسلام ناهێنم.

کە وام وت: خێرا منی بەجێ هێڵا و، الحمدلله دوای ماوەیەك گەڕامەوە و هۆشم هاتەوە.

ئەوەتا ئێستا هاتومەتەوە بۆ هەڵەبجە و هەتا ئێستاش نەمردووم!

مامۆستا شێخ موحسین دەڵێت: یەك دوو مانگێکی تر ژیا و پاشان خاڵۆ شێخ ئەو ڕەحمان وەفاتی کرد 'خوای گەورە لێی خۆش بێت'.

# وەفاتی 'مامۆستا شێخ مصطفی'ی قەرەداغی

# (١٨٨٩ - ١٩٧١ زاینی)

مامۆستا ملا عمر نظامی لە کتێبی 'ئەستێرەکانی ئاسمانی زانست'[١] دەڵێت: شێخ بەر لە چوار ڕۆژ پێش مردنی دڵی هەواڵ دەدات و دەزانێت وادەی مەرگی نزیک بووەتەوە، لە کاتێکدا کە باری تەندروستی ڕێک و پێک بووە، ئەم هەواڵە بە کەس و کاری دەگەیەنێت و، وەسیەت نامە و ئامۆژگاریەکانی خۆی ئاڕاستەیان دەکات و داوای خوا پەرستی و کردەوەی خێریان لێ دەکات، لە پێش نیوەڕۆی ڕۆژی چوارەم هەندێ تای لێ دێت و لەشی قورس دەبێت و دەپرسێت؟ سەعات چەندەیە؟

من سەعات دوانزەی نیوەڕۆ ماڵئاوایی لە ئێوە و لە دونیایی فانی دەکەم و دەڕۆمەوە بۆ بارەگای خوایی!

لەو کاتەدا کابرایەك خۆی دەکات بە ماڵدا و هەواڵی شێخ دەپرسێت، کەس و کاری دەیانەوێت ئیزنی بدەن، چونکە باری تەندروستی باش نەبووە.

کاتێک شێخ بەم مشت و مڕەیان دەزانێت، دەست نانێت بە ڕووی کابراوە و دەفەرمووێت: کارەکەت چیە؟

کابرا لە وەڵامدا دەڵێت نامەیەکی مامۆستا 'شێخ تۆفیقی بەرزنجەم'م پێیە لە بارەی تەلاقەوە، شێخ دەڵێت نامەکەم بۆ بخوێنەرەوە، لە نامەکە حاڵی دەبێت، ئەمر دەکات کاغەز و قەڵەم بێنن، وەڵامی کێشەکەیان پێ دەڵێت، دوای نوسینەوەی خۆی ئیمزای دەکات و دەیدەنەوە دەست کابرا، پاش نیو سەعات، لە کاتژمێر دوانزەی نیوەڕۆی ڕۆژی ١٣٩٣/٤/١٤ کۆچی، کە بەرامبەرە بە ١٩٧١/٥/١٧ی زایینی گیانی سپارد بە خوای گەورە.

---

[١] کتێبی 'ئەستێرەکانی ئاسمانی زانست' لاپەڕە (١٦٣).

## کاك مصطفی حاجی فاتح لە چەمچەماڵ

لەگەڵ نوێژ و عیبادەتەدا بـاش نەبـووم، بـێ ئـیمان نەبـووم، بەڵام دەمـوت هێشـتا گەنجم، لە (٢٠١٦/٢/٢) دا بوو، بە تەنها ڕۆشتم و سەیارەکەم بـرد بـۆ گـۆپتەپە، بیـرم دێت لەم سەر ڕۆشتم بەڵام خەیاڵم نیە کە چۆن ڕووداوەکە هات بەسەرمدا!!!

سـەیارەکەم لە شـوێنێکی بەرزیەوە بـوو، ڕێـگەکە لەو شـوێنەدا تەسـك دەبێـتەوە، شاخێکە و بەر بووبوومەوە!!

لەو شـوێنەدا بەبـێ سـەیارە بەرت بـدەنەوە لەوانەیە بمریـت، بە تەقـلە کەوتبـووە خوارەوە، ماڵێکی کەزەلانی لەو شوێنەدا هەبوو کە خەریکی کشتوکاڵ بون، فریای مـن کەوتبوون، دەیانوت تەنها قاچـت لە سـەیارەکەدا مـابوو، بەشـەکەی تـری لاشـەت لە دەرەوە بووە و، بەردێکی بچوك سەنتەری سەیارەکەی گرتبوو نەکەوتبوو بەسـەرمدا، کە خوای گەورە نەیەوێت بمریت نامریت!

منیان هێنابوویە ئاغجەلەر و لە دوایدا چەمچەماڵ و پاشان سلێمانی، مـن ئاگـام لە هیچ نەبووە!

چل و سێ ڕۆژ بەبێ هۆشی و لە ژێر ئۆکسجین و ئامێری بوژانەوەدا بووم!

چەند جارێك دکتۆرەکان جیهازەکانیان لێ کردبوویەوە و بێ ئومێد بوون لە مـانەوەم و هەستانەوەم.

وتبوویان مردووە و وەرن واژوی بکەن و بیبەنەوە!

بۆ ئەوەش کە شوێنی نەخۆشێکی تر چۆڵ بێت، کـوڕێکی زاوامـان بە دکتۆرەکـانی وتبوو یەك جاری تر کارەباکەی لێ بدەن ئەگەر هەر وەکو خۆی بوو ئیتر دەیبەینەوە!

کە کارەباکەیان لێ دابووم 'الحمدلله' گەڕابوومەوە و هۆشم هاتبوویەوە!

ئەوەی لەو جیهانەدا بینیم بە خەوی نازانم و بە واقعی دەزانم و هەستم بە هەموو شتێك دەكرد.

لەشم سوك بوو، هیچ كێشە و ناخۆشیەكم نەبوو! نەمدەزانی كە لە سەیارە وەرگەڕاوم، بەڵام ئەوەم دەزانی كە ڕابردووم خراپ بووە!

دەمزانی كە نوێژم نەبووە و توێشووی ئەو سەفەرم خاڵیە!

لەگەڵ چاوم كردەوە، لەگەڵ دوو مەلائیكەتدا بووم، پێیان وتم تۆ ناوت لە ئەهلی بەهەشتدا نیە، وەرە لەگەڵمان بۆ جەهەنم. لێیان تێدەگەیشتم باڵایان بەرز بوو، بەڵام دەم و چاویانم نەبینی، نوور بوو.

قۆڵیان نەگەرتم و بە زۆر بمبەن، لەگەڵیاندا دەڕۆشتم!

لە ڕێگادا گەیشتینە خزمە مردووەكانم!

فریشتەیەكیان پێی وتم: مصطفی ئەوە جەباری مامتە، لە شوێنێكدا وەستابوون، وا دەبینم كە ئاگاداری هاتنی منیش نەبوون، بۆ ئەوانیش لەناكاو بو، بۆ لای ئەوان نەدەچووم، بەڵام دام بە لایاندا، سەلامم لێیان كرد، مەلائیكەكە پێی وتم: ئەوەیان جەباری مامتە كە پێش تۆ هاتووە، بەڵام تۆ بۆ ئەوێ ناچیت!

جەباری مامم نەبینیوە لە ژیانمدا و، باوكیشم ژنی نەهێناوە كاتێك ئەو مردوە لە ساڵی (١٩٦٣)دا، وێنەی نیە، لەوێ بە جوانی بینیم، لە مامێكم دەچێت كە ئێستا ماوە و جوانتریش بوو، كە پرسیاریشم بۆ كرد وتیان بەڵێ بەو جۆرە بووە، مردووەكانی خۆمان هەموویان لەوێ بوون.

ئەوانەی بینیمن بیانناسم تەنها باوكم بوو، دوو مامەم بوو، كاك حسین بوو، باپیرم بوو، باوكی خەزرووم بوو، هەروەها مردووی دێیەكەمان!

بەڵام لە دێیەکەمان خەڵکی ئەنفال کراومـان هەیە، کە برایەکـی خۆیشـمی تیـا بـوو لەگەڵ ئامۆزایەکم، بەڵام ئەوانی تیا نەبوو! لەوێ وام دەزانی کە ئەوان شـەهیدن و پـلە و مەقامیان بەرزتر بوو بۆیە نەمبینین.

گەنجـی تیـا بـوو لە دوای ئەنفـال مـردوە، لەنـاو خزمەکانمـدا بـوو بینـیمن، بەڵام ئەنفالەکانم نەبینی.

مردووەکان ڕووشیان خۆش بوو، شۆخیان دەکرد لەناو خۆیاندا.

بەڵام مامە عارفێکم هەیە زۆر موسوڵمان بوو، وەڵامی سـەلامەکەی نەدامەوە، کـاك حسین پێـی وت عـارف ئەوە مصـطفی یە خـۆ تـۆ لە دونیـا لە مناڵەکانـت خۆشـترت دەویست ئەی بۆ وەڵامی نادەیتەوە!!

ئینجا مامە عارفم بە توڕەییەوە سەلامێکی ساردی لێ کردم.

ئەمزانی لەسەر چی لێم توڕەیە، لەسەر کـارە خراپەکـانی دونیـام لـێم تـوڕە و زویـر بوو، وەك ئەوەی پێم بڵێت بۆچی بەبێ توێشوو هاتیت؟!

منیان بەرەو دۆزەخ دەبرد، ئەو وەکو ئەوە بزانێت!!

شتەکانی ئەوێـم زۆر بـاش لە بیـرە، بیـرم نـاچێتەوە، بردمیـانە بەر دەرگـای دۆزەخ، دەرگاوانی دۆزەخ فریشتەیەك بوو دەم و چاوی دیـاربوو، بەڵام زۆر بـاڵا بەرز و ڕیـش سپی و ترسناك و تـوڕە بـوو، حەزم دەکـرد بمـبەنە دۆزەخ بەڵام لەو فریشـتەیە ڕزگـارم ببێت.

نەتەوێرا سەیری نێو چاوانی بکەیت!

سەیری لیستی دۆزەخیەکانی کرد، وتی ناوی ئەمی تیا نییە ببیەنەوە! دیسانەوە پیایـدا گەڕایەوە و وتیەوە ناوی تیا نیە! من هەر دەگریام!!

دەموت خوایە تەنها ئەم جارە ڕزگارم ببێت، ئیتر ئەوەی تۆ فەرمانت پـێ نەکردبێـت ئەنجامی نەدەم.

ئەو دەرگایەی دۆزەخ کونێکی گەورە بوو، ئۆتۆمبیلی پیا دەچوو، وەك چۆن ئاوی ڕووبارێك دەڕوات، ئاوا ئاگر دەڕۆشت بەناو دۆزەخدا!!

بەڵام من لەو شوێنەدا کەسم تیا نەبینی.

من هەر دەگریام، سێهەم جار دوو فریشتەکە بە دەرگاوانی دۆزەخیان وتەوە، ئەویش بە تووڕە بوونەوە وتی ناوی مصطفای تیا نیە بیبەنەوە و تەواو، وتم بمبەن بۆ بەهەشت نەیانبردم و نەمبینی، ئیتر گەڕامەوە بۆ دونیا.

کاریگەری ئەو ئەزموونە زۆر زۆرە لەسەرم، دڵم زۆر پێی خۆشە، دڵم زۆر بە خوای گەورە خۆشە، تەوبەی یەکجارەکیم کرد 'الحمدلله'، دڵنیام خوای گەورە خۆشی ویستوم، چونکە زیندووی کردمەوە و ڕێی هیدایەتی پیشان دام، ئێستا قاچم نیە بڕۆم، لەسەر عەرەبانەم، شەش ساڵە بەهۆی ئەو ڕووداوەوە فەقەراتم شکاوە، سوێند بەخوا لە جاران دڵم خۆشترە، دوو ژنیشم هەیە و هەردووکیشیان 'شێرپەنجەیان'ە هاتوچۆی نەخۆشخانەی 'هیوا' دەکەن، دوو کوڕیشم لەلا ماوە نەشتەرگەری کراون و لە هەمان کاتیشدا زۆر شوکرم بە قەدەرەکانی خوای گەورە و دڵخۆشم.

پێش ئەزموونەکەم لە مردن دەترسام، بەڵام ئێستا لە مردن ناترسم، سوپاس بۆ خوا عیبادەت و زیکر و قورئان خوێندنم هەیە، جاران دەیانوت تامی عیبادەت زۆرە، دەموت: دەبێت تامی لە چیدا بێت!!

ئێستا دەزانم تام و چێژی زۆر زۆرە.

تامی نەکەیت ناتوانیت شەو هەستیت شەو نوێژ بکەیت. خوای گەورە لێمانی قبوڵ بکات.

# مامۆستا مەلا عەلی سید سادقی لە پێنجوێن

سالّی (٢٠٠٩) ڕۆشتم بۆ خوێندنی فەقێیەتی بۆ بیارە، لە سالّی (٢٠١١) قەدەری خوا تووشی ئەنفلۆنزایەکی توند بووم، سنگم تووشی ئیلتیهابات بوو، زستان بوو، زۆر سارد بوو، بێ تاقەت بووم بە نەخۆشیەکە، قەدەری خوا چارەسەرم وەردەگرت و چاك دەبووم، هاوڕێکانم پێیان وتم ئەنفلۆنزا بە تایبەتی ئەگەر خۆت بە ئاوی سارد بشۆیت زوتر چاك دەبیتەوە، منیش بە گوێم کردن، هەتا دەهات نەخۆشیەکە قورستر دەبوو لەسەرم، دیارە ئەمەش قەدەرێکی خوایی بوو هەتا من ئەو ئەزموونە ببینم، ڕۆژێکیان لە حوجرەکەمدا کە تیا دەژیام بەبێ تاقەتی دانیشتبوم، دوو پەنجەرەی تیا بوو، پەنجەرەیەکیان لە لای ڕاستی قیبلەوە بوو، پەنجەرەیەکیشیان لە پشتەوە بوو، منیش سەیری ئەو پەنجەرەیەم دەکرد کە پشتی کردبووە قیبلە، دەستم بەرز کردەوە بۆ خوای گەورە، وتم: خودایە زۆر نارەحەتم و بێ تاقەتم، لەم نەخۆشیە چاك نابمەوە بەڵکو ڕۆحم بکێشیت و بمبەیتەوە بۆ خزمەتی خۆت!!

لەگەڵ چەند دوعایەکی تردا. تۆزێك دوای ئەوە لە پەنجەرەکەوە تۆپەڵێکی نورانی هاتە ژورەوە، من بە تەواوی بە ئاگا بووم و نەخەوتبووم و چاوم کردبوویەوە و سەیرم دەکرد، تۆپەڵەکە وەکو تۆزێك بوو، منیش کە ئەوەندە حەزم لە مردن دەکرد و ئاواتە خوازی مردن بووم، زۆرم پێ خۆش بوو، کە لەگەڵ هاتە ژوورەوە یەکسەر زانیم کە ئەمە فریشتەی گیان کێشانە، پەنجەرەکەش نەکرا بۆوە و ڕاستەوخۆ هاتە ژوورەوە، من زانیم 'ملك الموت'ە، لە پاڵمدا ڕاوەستا، سێچوار فریشتەی تریش بە چوار دەوریدا حازر بوون، ئەوانەی هاتنە ژورەوە، لە هالاوی گەرما دەچوون، ئەوانی تریش بە پێوە لە چوار دەوری وەستابوون.

بەڵام دەمزانی کە ئەمە 'ملـك المـوت'ە و گیـانم دەکێشـێت، ئەوانەی چـواردەوری فریشتەن.

کە سـەیرم کـردن جـوڵەم لـێ بـڕا و نەمـدەتوانی جـوڵە بـکەم، قەدەری خـوای پەروەردگار و بەبێ ویستی خۆم وام دەزانی کە دەمم کرایەوە، 'ملـك المـوت' شـتێکی وەکو داسی بە دەستەوە بوو، هەستم کرد دەستی و داسەکەی کرد بەناو قوڕگی منـدا و وردە وردە لە نـوکی پێکـانمەوە ڕۆحـم دەردەکێشـێت، بەو داسـە ڕایدەکێشـا، منـیش سـەیری 'ملـك المـوت' دەکەم و سـەیری ئەوان دەکەم و بـێ تـاقەتیش نەبـووم، زۆر خۆش بوو بەلامەوە، نە دەترسام، نە ئـازارم هەبـوو، نە خەم و خەفەتـم پـێ دەخـوارد، زۆر زۆر سروشتی بوو بەلامەوە، دەستی کرد بە گیان کێشـانم، هەتـا هـاتە ئەژنۆکـانم، بیرم لەوە دەکردەوە تا ئەژنۆم ڕۆحـی تیـا نەمـاوە، سـارد بوبـۆوە، وردە وردە سـەرکەوتە سەرەوە هەتا گەیشتە لای ناوکم، منـیش بیـری فەرمـوودەیەکی پێغەمـبەرم ﷺ کەوتەوە کە دەفەرموێت:"مَنْ كَانَ آخِرُ كَلَامِهِ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ دَخَـلَ الْجَنَّـةَ"هەچ کەسـێك ئـاخرین وتەی 'لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ' بێت خوای پەروەردگار دەیخاتە بەهەشتەوە.

منیش دەستم کرد بە 'لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ' کردن... لَا إِلَـهَ إِلَّا اللَّهُ... لَا إِلَـهَ إِلَّا اللَّهُ... ئینجـا دوای ئەوە شایەتومانێکم هێنا

أشهد أن لا إله الا الله و أشهد أن موحەمەد رسول الله... لە دڵـی خۆمـدا چـاوەڕێی ڕەحمـی پەروەردگـار بـووم، زۆرم پـێ خـۆش بـوو کە ئەگەڕێـمەوە بـۆ خزمەتـی پەروەردگارم، هیچ ئازار و خەمێکم نەبوو، گەیشتە سەر سنگم و پاشان قـوڕگم، تەواو خۆم ئامادە کرد کە ئیتر من دەمرم، بەردەوام 'لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ' دەکەم، هەتا هـاتە قوڕگیشـم هەستم کرد کە گیانم سەرکەوت، چاوم بەردەوام کراوە بوو، یەکێکیـان دۆسـیەیەکی بە دەستەوە بوو، منیش نەمدەزانی ئەو دۆسیە چیە؟

نەمدەزانی ئەو فریشتانە لە چواردەوری 'ملك الموت'ن چ کارێکیان هەیە.

ڕۆحی بەردام، منیش سەیری ‹ملك الموت›م کرد و پێی وتم: مادام تۆ ئەو ‹لَا إِلَـهَ إِلَّا اللَّهُ›یەت کرد خوای پەروەردگار تەمەنی درێژ کردیتەوە.

بە تەواوی نەمدەزانی بە کاتی دونیایی چەندی پێ چووە! منیش سەیری ‹ملك الموت›م کرد و زۆر حەزم دەکرد بگەڕێمەوە بۆ خزمەتی پەروەردگار، زۆر بێ تاقەت بووم بەوەی ‹ملك الموت› ڕۆیشت.

ئیتر ‹ملك الموت› و فریشتەکانی تر بەجێیان هێڵام و، دوای ئەوە دیار نەمان، ڕۆح گەڕایەوە بۆ جەستەم و هاتمەوە سەر خۆم و هەستم بە تۆزێ ماندویی دەکرد، هەناسە برکێیەکم پێ کەوتبوو، دوای ئەوە دەستم کردەوە بە دوعا کردن و وتم: خوایە گیان زۆر حەز دەکەم بگەڕێمەوە بۆ خزمەتی تۆ و ئەم دنیایە بەجێ بهێڵم، ئینجا دوای ئەوە خەوم لێ کەوت، ‹سبحان الله› ئەم جارەیان لە خەونمدا ‹ملك الموت› هاتەوە بۆ لام، پێی وتم: بۆچی دوعا لە خۆت دەکەیت؟

وتم: بەخوا زۆر بێ زار بووم، زۆریش دەترسم تووشی گوناه ببم، لەبەر ئەوە دەمەوێت بگەڕێمەوە خزمەتی پەروەدرگار، ‹ملك الموت› وتی: دە، بیست، سی، چل، پەنجا ساڵی تر تۆ تەمەنت درێژ بوویەوە، ئەگەر ئەم جارە داوای مردن بکەیت لە خوای گەورە دەست دەکەم بە هەردوو چاوتدا و دەری دێنم، ئیتر بەو هەڕەشەیەی زۆر ترسام!

دوای ئەوە بەئاگا هاتمەوە و وتم: خوایە سوپاس بۆ تۆ مانەوە و مردن لە لای تۆیە و، چی خێر و باشە ئەوە دەکەیت خوایە گیان تۆش دەفەرموویت داخوازی مردن مەکەن، ئیتر منیش داوای مردن ناکەم هەرگیز، لە دوای ئەوە فێر بووم کە مانەوەی مرۆڤ لە دونیادا خێرە، ئەگەر چاکە بکەیت خێرت دەست دەکەوێت، ئەگەر تووشی هەڵە و گوناهیش بیت، لە دوای ئەوە ‹استغفرالله› دەکەیت خوای تعالا لێت خۆش دەبێت و خێری ‹استغفرالله›کەشت بۆ دەنوسرێت.

مردن بۆ مرۆڤی موسوڵمان زۆر ئاسانە، لەناو کتریەکدا ئاو هەبێت و ڕۆی بکەیتە خوارەوە چەند بە ئاسانی دێتە خوارەوە، ڕۆحیش بەو ئاسانیە دێتە دەرەوە و ڕزگاری دەبێت لە زیندانی جەستە.

من هیچ لە مردن ناترسم و زۆر خۆشە و هیچ ناڕەحەت نیە.

## قیامەتی بچووك و قیامەتی گەورە

* شێخی 'ابن العربي' دەفەرمووێت: خوای تبارك وتعالی لە بووندا دوو قیامەتی داناوە، قیامەتی بچوك و قیامەتی گەورە، قیامەتی بچوك ڕۆشتن و گواستنەوەی بەندەیە لە ژیانی دونیاوە بۆ ژیانی بەرزەخ.

ژیان: بریتی یە لە ماوەی ژیانی ئادەمیزاد، لە دایك بوونەوە هەتا ڕۆژی مردنی، مرۆڤەکان لە نێوان عیبادەت و سەرپێچی پەروەردگاردا ژیان بەسەر دەبەن، باشەکان گوێ ڕایەڵی و عیبادەت و چاکەیان زاڵە و، خراپەکانیش بە پێچەوانەوە. مرۆڤەکان بەهۆی شەیتان و نەفسی بەدکارەوە کەمەندکێشی خۆشی و حەرامەکان دەبن.

خودی ژیان بریتیە لە دەرچوون لە دۆخی بێ گیانەکان.

بەرزەخیش نێوەندی نێوان دوو شتە.

خوای تعالی دەفەرمووێت ﴿...وَمِن وَرَائِهِم بَرْزَخٌ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ﴾ (المؤمنون: ١٠٠)

واتە: ڕۆژێك زیندوو دەکرێنەوە، لەمپەرێکی زۆر گەورەیان لە پێشدایە و ناتوانن بگەڕێنەوە بۆ دونیا.

موجاهید دەفەرموێت: بەرزەخ نێوەندێکە لە نێوان دونیا و قیامەتدا.

# ڕۆح کێشان

مانای ڕۆح لە زمانەوانیدا: واتە فراوانی و زۆری...

پێناسەی ڕۆحی مرۆڤ: بریتی یە لە لەتیفەیەکی زانای خاوەن دەرك و لێهاتوو شارەزا کە لە مرۆڤدایە خاوەنەکەی خودایە و، لە جیهانی فەرمانەوە دابەزیوە و ئاوەز و ژیری دەستەوسانە لە کونهو ناسینی.

﴿وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الرُّوحِ ...﴾ لە بابەتی ڕۆحەوە لێت دەپرسن و دەڵێن: باشە ئەو ڕۆحەی کە هۆی ژین و زیندوێتی ئادەمیزادە چیە؟

﴿... قُلِ الرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي ...﴾ پێیان بڵێ ڕۆح لە فەرمانە نهێنیەکانی پەروەردگارمە.

﴿... وَمَا أُوتِيتُم مِّنَ الْعِلْمِ إِلاَّ قَلِيلاً﴾ ئێوە بە تایبەتی لە بابەت ڕۆحەوە بەشێکی کەم زانیاریتان پێ دراوە. (سورەتی اسراء: ٨٥)

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ الْمَوْتِ ...﴾ (ال عمران: ١٨٥)

هەموو کەسێك بەبێ جیاوازی تامی مردن دەچێژێت.

کەواتە مردن چەشتنە، مەرج نیە ناخۆش و نارەحەت بێت!!

ئیمامی موسلیم لە صەحیحەکەیدا لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕێتەوە 'خوای لێ ڕازی بێت' کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: نابینن ئادەمیزاد کە دەمرێت چاو دەبڕێتە شوێنێك، وتیان بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: ئەوە ئەو کاتەیە کە چاوی دەبڕێتە ڕۆحی کە دەردەچێت.

**'سەربەخۆیی ڕۆح و گیان لە جەستە'**

ئیمامی ئیبین قەیم ‹ڕەحمەتی خوای لێ بێت› دەربارەی ڕۆح ڕای یەکلا کەرەوەی هەیە و دەڵێت: ڕۆح تەنێکی پێچەوانەی جەستەیە لە ڕووی ماهیەت و ناوەڕۆکەوە و زۆر جیاوازە لە جەستەی مادی و فیزیکی، تاپۆیەکی نورانی باڵایە و زۆر سوکەڵە و زیندوە و دەجوڵێت و زۆر بە توانایە، لەناو ئەندامەکانی جەستەدا دەجوڵێت، هەر وەکو چۆن ئاو بەناو پەڕەی گوڵەکاندا گوزەر دەکات.

وەختێك ئەندامەکانی جەستە خراپ دەبن و مادە قورس و زیان بەخشەکان زاڵ دەبن بەسەر جەستەدا، ڕۆح لە جەستە دەردەچێت و دەڕوات بۆ جیهانی ڕۆحەکان، ئەمەش قورئان و سوننەتی پێغەمبەر ﷺ و کۆ دەنگی هاوەڵان و بەڵگەی ژیری و خۆڕسکی تەندروستی لەسەرە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿اللَّهُ يَتَوَفَّى الأَنْفُسَ حِينَ مَوْتِهَا وَالَّتِي لَمْ تَمُتْ فِي مَنَامِهَا فَيُمْسِكُ الَّتِي قَضَى عَلَيْهَا الْمَوْتَ وَيُرْسِلُ الأُخْرَى إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾ (الزمر: ٤٢)

واتە: هەر خوایە کە گیانەکانی خەڵکی دەکێشێ لە کاتی مردنی خاوەنەکانیاندا ئەو گیانانەش کە خاوەنەکانیان مردوون و لە خەودان، هەر بۆ خۆی گیانیان دەکێشێ، ئینجا ئەو گیانانە ڕادەگرێت بڕیاری مەرگی خاوەنەکانیانی داو، ئیدی ناگەڕێتەوە جەستەکانیان، گیانەکانی دیکەش بەرەڵا دەکا و نایان مرێنێ تا کاتێکی دیاری کراو دەژین، بەڕاستی لەوەدا بەڵگە و نیشانەی بەهێز هەیە بۆ خەڵکێك بیربکاتەوە و بیر لە دەسەڵات و توانای خوا بکاتەوە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ افْتَرَىٰ عَلَى اللَّهِ كَذِبًا أَوْ قَالَ أُوحِيَ إِلَيَّ وَلَمْ يُوحَ إِلَيْهِ شَيْءٌ وَمَن قَالَ سَأُنزِلُ مِثْلَ مَا أَنزَلَ اللَّهُ ۗ وَلَوْ تَرَىٰ إِذِ الظَّالِمُونَ فِي غَمَرَاتِ الْمَوْتِ وَالْمَلَائِكَةُ بَاسِطُو أَيْدِيهِمْ أَخْرِجُوا أَنفُسَكُمُ ۖ الْيَوْمَ تُجْزَوْنَ عَذَابَ الْهُونِ بِمَا كُنتُمْ تَقُولُونَ عَلَى اللَّهِ غَيْرَ الْحَقِّ وَكُنتُمْ عَنْ آيَاتِهِ تَسْتَكْبِرُونَ﴾ (أنعام: ٩٣)

واتە: دەبێ چ کەسێك لەوە ستەمکارتر بێت کە درۆ بۆ خودا هەڵبەستێ و بڵێ: خوا هیچ شتێکی بە سروش نەناردۆتە خوارەوە، نە تەورات، نە قورئان، یان بڵێت: من لە لای خواوە سروش و سروشم بۆ هاتوە وەکو 'موسەیلەمەی ئەسوەدی عەنسی' کە بێ شەرمانە داوای پێغەمبەرێتی دەکرد، لە ڕاستیدا هیچ شتێکی بۆ سروش نەکراوە، وە یان بڵێ: منیش دەتوانم وەکو ئەو کتێبانە بنێرم، خوا ناردونی؟ وە ئەگەر لەو کاتەدا کە ستەمکاران لە ناڕەحەتی و پەلەقاژەی مەرگدان ببینی چۆن گرفتار بوون، فریشتەی گیان کێشانیش دەستیان لێ دەکەنەوە و لێیان دەدەن و پێیان دەڵێن: دە گیانی خۆتان لە جەستەتان دەربهێنن و بینێرنە لای خەشم و تووڕەیی خوای گەورە، دیارە ئەوانیش بۆیان دەرنایە و، فریشتەکانیش لە پشتەوە تێیان دەسرەوێنن، پێشیان دەڵێن: وا ئەمڕۆش بە ئەو پەڕی سەر شۆڕیی و ڕیسواییەوە تۆڵەکان لێدەکرێت، چونکە لە دونیادا درۆتان بەدەم خواوە هەڵدەبەست و قسەی نا بەجێتان دەکرد و لە بەرامبەر ئایەتەکانیشەوە خۆتان بە گەورەتر دەزانی، لە ڕۆژی دوایدا خوا بە بێ باوەڕەکان دەفەرموێت: وا ئەمڕۆ بێ ماڵ و حاڵ و ڕوت و قوت و تاك و تەنیا هاتنەوە لامان، هەروەك چۆن لە سەرەتاوە بێ ماڵ و حاڵ و ڕوت و قوت دروستمان کردن و هەر چیشمان پێ دابوون لە ماڵ و سامانی دونیا، لە دوای خۆتان گشتتان جێهێشت، ئەوانەیش نابینین بە هاناتانەوە بێن کە پێتان وابوو هاوبەشی و هاوتایی خوان، هەتا تکا و شەفاعەتتان بکەن، ئەوا هەرچی ئەسباب و هۆی پەیوەندی نێوانتان بوو پچڕا و نەما، ئەو شتانەش ئێوە بە خەیاڵ واتان دەزانی تکاتان بۆ ئەکەن، هەموو تیاچوون و بە هیچ دەرچوون.

﴿يَا أَيَّتُهَا النَّفْسُ الْمُطْمَئِنَّةُ ارْجِعِي إِلَى رَبِّكِ رَاضِيَةً مَرْضِيَّةً فَادْخُلِي فِي عِبَادِي وَادْخُلِي جَنَّتِي﴾ (الفجر: ٢٧-٣٠)

لە سەرە مەرگدا بە نەفسی ئیماندار دەوترێت: ئەی گیان و ڕۆحی ئارام بە یاد و زیکری خوا، بگەڕێرەوە بۆ لای پەروەردگارت، ئاوا کە ڕازی کردبوویت بە پاداشتی خۆی و لێت ڕازی بووە بە هۆی ئەوەی پێشی خۆتت خستووە لە کردەوەی چاك، دە

بچۆره ناو گیـانی بەنـدە صـاڵحەکانمەوە و بچـۆرە بەهەشـتە ڕازاوەکەمەوە کە ئامـادەم کردوە بۆت، جا کە ئەم ئایەتە هـاتە خـوارەوە 'ئەبـو بەکـری صـدیق' دانیشـتبوو وتـی: ماشاء الله چەندە جوانە!

پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: دڵنیابە ئەمە بە تۆش دەوترێت.

لە 'بیلالی کوڕی ڕەباح'ەوە خوای لێ ڕازی بێـت دەگێـڕێتەوە لە پـێغەبەرەوە ﷺ کە فەرموویەتی: خوای تعالا ڕۆحتـان لـێ وەردەگـرێتەوە هەر کاتێـك ویسـتی و دەشـی گێڕێتەوە بۆتان هەر کاتێك بیەوێت 'لە کاتی خەوتندا'[1].

لێرەشدا پێغەمبەر ﷺ لە بەرائی کوڕی عازبەوە دەگێڕێتەوە 'خـوای لـێ ڕازی بێـت' کە دەفەرموێت: لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ ڕۆشـتین بـۆ بەڕێ کردنـی جەنـازەیەك کە پیاوێکی یاریدەدەری بـوو، گەیشـتینە سـەر کێلـی گـۆڕەکە و داپـۆشرا، پێغەمـبەر ﷺ دانیشت و ئێمەش لە دەوری بووین، دەتوت باڵنـدە بەسـەر سـەرمانەوەیە ئەوەنـدە بـێ دەنگ بووین، پێغەمبەر ﷺ دارێکی بە دەستەوە بوو دەیژەندە زەویەکە و پاشـان سـەری هەڵبڕی و فەرمووی: پەنا بگرن بە خوای تعالی لە سزای نـاو گـۆڕ 'دوو جـار یـاخود سێ جار فەرمووی' لە پاشان فەرمووی: بەندەی ئیمانـدار کاتێـك لە دونیـا دادەبڕێـت ڕوو لە کۆتـابون و قیـامەتی خـۆی دەکـات، فریشـتە لە ئاسـمانەوە دادەبەزنە سـەری، فریشتەکان ڕووخساریان سـپی و نـورانیە، ڕووخسـاریان وەك خـۆر پرشـنگ دەدات، کفنی بەهەشتیان پێیە و، بۆن خۆشیەکیش وەك کافور کە مـردوەکەی پـێ بـۆن خـۆش دەکەن، هەتا چاو بڕ بکـات شـوێنێکی فراوانـی بـۆ ڕا دەخەن، هەتـا فریشـتەی مەرگ 'سەلامی خوای لـێ بێـت' دێـت و لە لای سـەریەوە بـانگی لـێ دەکـات: ئەی ڕۆحە پاکەکە وەرە دەرەوە بۆ لێخۆشبوونی خوایی و ڕازی بوونی خوا لێت.

---

١ - ئیمامی بوخاری.

دەفەرمووێت: ئەو ڕۆحە دێتە دەرەوە وەك چۆن دڵۆپە ئاوێك دەڕژێت لە ئاسمانەوە بۆ زەوی، ئیتر فریشتەکان ڕۆحەکە لە ئامێز دەگرن و لە چاو تروکانێکدا دەیپێچن لە کفنی ئامادە کراوی لای خۆیان و بۆن خۆش کردنی و، لە باشترین میسکی سەر زەوی زیاتر بۆنی خۆش دەبێت و سەری دەخەن بۆ ئاسمان، دەگەنە هەر کۆمەڵە فریشتەیەك دەڵێن: ئەم ڕۆحە پاکە هی کێیە؟

فریشتەکان دەڵێن: فڵانی کوڕی فڵانە، بە باشترین ناوێك کە لە دونیادا ناوی براوە بانگی لێ دەکەن، هەتا دەگەنە ئاسمانی دونیا، دەرگای ئاسمانی یەکەمی بۆ دەکەنەوە، بەڕێز و خۆشەویستیەوە لەو ئاسمانەوە بە ڕێی دەکەن بۆ ئاسمانی دواتر، هەتا دەیگەیەننە ئاسمانی حەوتەم.

خوای تعالی دەفەرمووێت: نامەی بەندەکەم لە پلە هەرە باڵاکان (علی علیین) بنووسن و بیگێڕنەوە بۆ زەوی، من لە گڵ و زەوی دروستم کردون و دەیان گێڕمەوە بۆ ئەوێ و پاشان لە زەویەوە جارێکی تر زیندوویان دەکەمەوە.

دەفەرمووێت: ئیتر ڕۆحەکەی دەگێڕنەوە بۆ لای جەستەکەی و دوو فریشتە دێنە لای و، دایدەنیشێنن و پێی دەڵێن: کێ پەروەردگارتە؟

دەڵێن: الله پەروەردگارمە.

پێی دەڵێن: هەڵگری چی ئاینێکیت؟

دەڵێت: ئیسلام ئاینمە.

پێی دەڵێن: ئەو پیاوە چیە و کێیە کە نێراوە بۆتان؟

دەڵێت: پێغەمبەری خوایە ﷺ.

پێی دەڵێن: ئەی زانست چی‌یە؟

دەڵێت: پەیامی خوام خوێندۆتەوە و ئیمانم هێناوە پێی باوەڕم پێیەتی.

بانگ کەرێك لە ئاسمانەوە بانـگ دەکـات: بەنـدەکەم ڕاسـتی کـرد، بەهەشـتی بـۆ ڕاخەن و بەرگی بەهەشتی لەبەر بکەن، دەرگایەکی لەسەر بەهەشت بۆ بکەنەوە.

دەفەرموێت: فێنکی و شەماڵ بۆنی خۆشی بەهەشتی پێ دەگـات و هەتـا چـاو بـڕ بکات گۆڕەکەی بە خۆشی و بەهەشتێکی تایبەتی بۆ فراوان دەکەن.

ئینجا پیاوێکی ڕووخسار جوانی جل و بەرگ جوان و بۆن خۆش دێـت بـۆ لای و پێی دەڵێت: مژدە بێت لە تۆ، ئەمە ئەو ڕۆژەیە کە مژدەت پێ دراو وادەت پێ درا.

ئەویش دەڵێت: تۆ کێیت؟

ڕوخسارت زۆر شیرینە و خێر بەخشە.

ئەویش دەڵێت: من کردارە باشەکانی تۆم.

ئەویش دەڵێت: یارەبی قیامەت زوو بێنە هەتا بگەڕێمەوە بۆ ناو ماڵ و مناڵەکەم.

دەفەرمووێت: بەندەی بێ باوەڕی کافریش کاتێك دەسـتی لە دونیـا دەبێـتەوە و ڕوو بە قیامەتە، کۆمەڵە فریشتەیەکی ڕووخسار ڕەش دێـنە لای و بەرگەکانیشـیان ڕەشـە و، هەتا چاو بڕ بکات دەبینێت و لە پاش ئەوە فریشـتەی مەرگ دێـت و لە لای سـەریەوە پێی دەڵێت: ئەی ڕۆحە پیسەکە وەرە دەرەوە بۆ توڕەیی و خەشمی خـوا، پـارچە پـارچە دەبێت لە جەسـتەیدا و، بە شـێوەیەك ڕۆحـی دەردەهێنرێـت کە سـزا و عەزابێکـی زۆر دەچێژێت و بە دەست بەسراوی دەپێچرێت لە خـوریەکی تەڕەوە و بە چـاو تروکانێـك دەپێچرێتەوە و دەخرێتە ناو بەرگی ڕەشـەوە و بـۆنێکی زۆر خـراپ و پیسـی لـێ بەرز دەبێتەوە، وەك خراپترین بۆنی مردارەوە بووی سەر زەوی و پاشـان بەرز دەکـرێتەوە بـۆ ئاسمان، کە دەدەن بە لای هەر پۆلە فریشتەیەکدا دەڵێن ئەم ڕۆحە پیسە چی‌یە؟

دەڵێن: ئەوە ڕۆحی فڵانی کوڕی فڵانە، بە خراپترین ناوێك نـاوی دەبەن کە لەسـەر زەویدا ناوی برا بێت.

دەبـرێتە بەردەم ئاسـمانی یەکەم و بـۆی نـاکرێتەوە، لە دوای ئەمە پێغەمـبەر ﷺ ئەم ئایەتەی خوێندەوە ﴿إِنَّ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا وَاسْتَكْبَرُوا عَنْهَا لَا تُفَتَّحُ لَهُمْ أَبْوَابُ السَّمَاءِ

﴿وَلَا يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ حَتَّىٰ يَلِجَ الْجَمَلُ فِي سَمِّ الْخِيَاطِ ۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِي الْمُجْرِمِينَ﴾ (الأعراف : ٤٠)

واته/ ئەو کەسانەش کە ئایەتەکانی ئێمەیان بە درۆ دانا و، باوەڕیان پێ نەکردن و، لە ئاستیاندا خۆیان بە گەورە گرت، هەرگیز دەروازەکانی ئاسمان بۆ ڕۆحیان و، بۆ کار و کردەوەکانیان ناکرێتەوە و ناشچنە بەهەشتەوە، هەتا وشتر نەچێ بە کونی دەرزی دووړماندا، واتە: خۆ هەرگیز ئەمە دەست نادات، کەواتە دەست نادات ئەمانیش بچنە بەهەشت، وە هەر بەو شێوەیە تۆڵە لە گشت تاوان باران دەکەینەوە لە ڕۆژی قیامەتدا.

ڕاخەریان ئاگرە لە دۆزەخدا، وە لێفەی سەریشیان هاڵاوی ئاگرە.

دیارە هەموو ستەم کاران ئا بەو شێوە سەختەیە تۆڵەیان لێ دەکەینەوە.

خوای گەورەش دەفەرموێت: نامەکەی و کتابەکەی لە زیندانێکی بچوکی ژێر زەویدا بنوسن، ئیتر ڕۆحی فڕێ دەدرێتەوە بۆ سەر زەوی، پاشان پێغەمبەر ﷺ ئەم ئایەتەی خوێندەوە ﴿...وَمَن يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَكَأَنَّمَا خَرَّ مِنَ السَّمَاءِ فَتَخْطَفُهُ الطَّيْرُ أَوْ تَهْوِي بِهِ الرِّيحُ فِي مَكَانٍ سَحِيقٍ﴾ (الحج: ٣١)

دوای ئەوە ڕۆحەکەی دەگەڕێنرێتەوە بۆ لای جەستەکەی دوو فریشتە دایدەنیشێنن و پێی دەڵێن: کێ پەروەردگارتە؟

دەڵێت: ها... ها... نازانم.

پێی دەڵێن: چ دینێکت هەیە؟

دەڵێت: ها... ها... نازانم.

پێی دەڵێن: دەربارەی ئەو پیاوە چی دەڵێیت کە نێرا بۆ ناوتان؟

دەڵێت: ها... ها... نازانم.

بانگکەرێك لە ئاسمانەوە بانگ دەکات: درۆ دەکات ئاگری بۆ ڕاخەن، دەرگایەکی دۆزەخی لێ بکەنەوە، ئیتر گەرمی و سزای ئاگری دۆزەخی بۆ دێت.

گۆڕەکەی بۆ تەسك دەبێتەوە هەتا پەراسوەکانی دەشکێن بەسەر یەکتردا، پیاوێکی زۆر ناشرینی جل و بەرگ قێزەون و بۆن ناخۆش دێت بۆ لای، پێی دەڵێت: با هەواڵێکی زۆر شوم و خراپت پێ بڵێم، ئەمە ئەو ڕۆژەیە کە وادەی هاتنی درا بە تۆ، بەڵام تۆ گوێت پێ نەدا، دەڵێت: تۆ کێیت؟

ڕووخسارت شەڕ و خراپەی پێوەیە.

دەڵێت: من کردەوە خراپەکانی تۆم.

پیاوەکە دەڵێت: خوایە ڕۆژی قیامەت نەیەت[1].

## گومانی باش بە خوای گەورە ببەن

خوای تەعالا دەفەرموێت: ﴿حَتَّى إِذَا جَاءَ أَحَدَهُمُ الْمَوْتُ قَالَ رَبِّ ارْجِعُونِ * لَعَلِّي أَعْمَلُ صَالِحًا فِيمَا تَرَكْتُ كَلا إِنَّهَا كَلِمَةٌ هُوَ قَائِلُهَا وَمِنْ وَرَائِهِمْ بَرْزَخٌ إِلَى يَوْمِ يُبْعَثُونَ﴾ (المؤمنون: ١٠٠)

واتە: خوا نەناسان هەر درێژە بە کاری خراپ و بێ بڕوایی خۆیان دەدەن هەتا کاتێك مردن یەخەی یەکە بە یەکەیان دەگرێت و ئەحواڵی ئاخیرەتی بۆ ئاشکرا دەبێت، ئەوسا دەڵێت: پەروەرگارم! بمگێڕەرەوە بۆ دونیا، بەڵکو ئەو کارە چاکەی کاتی خۆی لە دەستم چووە بیکەم. نەخێر!

هەرگیز ئەو داخوازیە جێ بەجێ نابێت، ئەوەیش هەر قسەیە و -ئەو بە ناچاری- دەیکات، وە هەرگیز ناگەڕێنەوە و هەر لە سزادا دەبن.

---

١- 'بوخاری و موسلم و سونەتی ئەبو داود'.

لە جابری کوڕی عبداللەوە خوایان لـێ ڕازی بێـت دەگێـڕنەوە کە گـوێی لـێ بـووە پێغەمـبەر ﷺ پـێش وەفـاتی بە سـێ ڕۆژ فەرمـوویەتی: هـیچ کەس لە ئێـوە نامرێـت، مەگەر گومانی باشی بە خوای گەورە بردبێت[1].

هەروەهـا لە عوبـادەی کـوڕی صـامیتەوە دەگێـڕنەوە 'خـوای لـێ ڕازی بێـت' لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرمـوویەتی: هەر کەسـێك حەز بە لیقـا و گەیشـتن بە خـوای گەورە بکات، خوای تعالاش لیقای ئەوی پـێ خۆشـە، وە هەر کەسـێك پێـی نـاخۆش بێـت بگاتەوە بە خوای گەورە، خوای گەورەش گەیشتن بەو کەسەی پێ خۆش نـیە. خـاتوو عائیشە یان هەندێ لە خێزانەکانی تری پێغەمـبەر ﷺ فەرموویـان: ئـێمە مردنمـان پـێ خۆش نیە، پێغەمـبەر ﷺ فەرمـووی: بەو جـۆرە نـیە، ئیمانـدار کاتێـك مردنـی نزیـك دەبێتەوە مژدەی ڕازی بوونی خوا و بەخشندەیی خوای پێ دەدرێـت، ئیـتر ئەوەی کە لە پێشیەتی زۆر بە لایەوە خۆش و شیرینە و خوای گەورەش چـاوپێکەوتن و پێگەیشـتنی ئەو کەسەی پێ خۆشە، بەڵام کافر و بێ باوەڕ کاتێك دەکەوێتە گیـانەڵا مـژدەی سـزای خواو سزای سـەختی دۆزەخـی پـێ دەدرێـت، ئەو کەسـەش مـردن و نزیکبـوونەوە لە خوای پێ ناخۆشە و، خوای گەورەش چاوپێکەوتن و پێگەیشتنی ئەوی پێ ناخۆشە[2].

---

١- صحيح مسلم.

٢-'صحيح مسلم و بخاري'.

# فریشتەی ڕەحمەت مژدە دەدەن بە باوەڕدار لە کاتی سەرە مەرگدا

ئیماندار لە کاتی سەرە مەرگـدا مژدەکـان دەبینێـت، یەکێـك لە مژدەکـان دابەزینـی فریشتەی ڕەحمەتە لە کاتی گیانەڵادا.

مژدەی دەدەنێ کە هیچ نەترسێت و ئەوەی لە پێشیەتی خۆشی و بەختـەوەریە و غەم و پەژارەی نامێنێت.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ الَّذِينَ قَالُوا رَبُّنَا اللَّهُ ثُمَّ اسْتَقَامُوا تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ الْمَلَائِكَةُ أَلَّا تَخَافُوا وَلَا تَحْزَنُوا وَأَبْشِرُوا بِالْجَنَّةِ الَّتِي كُنتُمْ تُوعَدُونَ﴾ (فصلت: ٣٠)

واتە/ ئەو کەسانەی وتیان پەروەردگارمان خوایە و پاشان خۆیان ڕاسـتکردبوویەوە بە توندوتۆڵی لەسەر یەکتا پەرستی بوون و بە هیچ لایەکـدا لایـان نەدا، کـاتێ مـردن، لە گۆڕدا، لە کاتی زیندوو بـوونەوەدا فریشـتە دادەبەزنە لایـان و، پێیـان دەڵـێن: لە پاشـە ڕۆژتان مەترسن و، بۆ ماڵ و منداڵیشتان -پاش خۆتان- زویـر مەبـن- ئـێمە چاودێریـان دەبین، مژدەتان لێ بێت بەو بەهەشتەی بەڵێنتان پێ دەدرا لە دونیادا، مزگێنی بێ ئەمـڕۆ دەکەونە خۆشی و شـادییەوە، ئـێمە لە ژیـانی دونیـادا دۆسـتان بـووین و، وە لە پاشـە ڕۆژیشدا دۆستان دەبین، وە لەوێ حەزەکانتان چـی بخوازێـت ئامـادەیە بۆتـان وە هەر چیش بخوازن لە بەهەشتدا بۆتان هەیە، ئەم میـوان داریەش میوانـداری و پەزێـراییە کە لەلایەن پەروەردگارێکی گوناهپۆشی بە بەزەییەوەیە.

شەهیدەکان لە کەناری دەریا و ڕووبارەکانی بەهەشـتدا لەنـاو گـومەزی سـەوزدان، بەیانیان و ئێواران خواردنیان بۆ ئامادەیە. 'مەسنەدی ئیمام أحمد'.

هەر وەکـو چـۆن سـزا دەگـاتە ئـالی فـرعەون بەیانیـان و ئێـواران، خۆشـی و نیعمەتەکانیش دەگاتە باوەڕداران.

تەواوی کۆ دەنگی ڕای زانایانی ئیسلام لەسەر ئەم بابەتەیە.

# ڕۆحی منالآن لە ژیانی بەرزەخدا



ڕۆحـــی منـــاڵی بـــاوەڕداران، بە لای زۆریـــنەی زانایـــانەوە لە بەهەشـــتدایە، ئەوەی سەرپەرشتیان دەکات حەزرەتی ئیبراهیمە 'سەلامی خوای لێ بێت' ئیمامی بوخـاری لە صەحیحەکەیدا لە 'سەمرەی کوڕی جوندوب'ەوە دەگێـڕێتەوە 'خـوای لـێ ڕازی بێـت' کە دەفەرموێـت: کـاتێ پێغەمـبەر ﷺ نـوێژی تەواو دەکـرد، ڕووی تـێ دەکـردین و دەیفەرموو: کێ لە ئێوە ئەمشەو خەوێکـی بینیـوە بـا بۆمـان بگێـڕێتەوە، ئەگەر یەکێـك خەوێکی ببینیایە دەیگێڕایەوە، پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو ماشاء الله، ڕۆژێکیان پرسی کـێ لە ئێوە خەوێکی بینیوە؟

وتم: خەومان نەبینیوە یارسول الله ﷺ.

فەرمووی: بەڵام ئەمشەو من لە خەونمدا دوو پیاو هاتن بۆ لام و دەسـتیان گـرتم و، منیان برد بۆ زەوی پیـرۆز، بینیـم پیاوێـك دانیشـبوو، پیـاوێکیش بە پێـوە ڕاوەسـتابوو، ئاسنێکی سەر خـڕی بەدەسـتەوە بـوو، ئەو ئاسـنە سـەر خـڕەی دەکێشـا بەنـاو دەمـی پیـاوەکەدا و دەم و قـوڕگ و ڕووخسـاری هەڵدەوەشـاند، هەتـا لە پشـتی سـەریەوە دەردەچوو، لە دوای ئەوە خێرا چاك دەبوویەوە و هەمدیسان پیایـدا دەکێشـایەوە، وتـم: ئەمە چیە؟

وتیان: جارێ با بڕۆین.

هەتا گەیشتینە پیاوێك لەسەر پشت ڕاکشابوو، پیـاوێکیش بە ڕاسـەریەوە بەردێکـی پـێ بـوو دەیکێشـا بەسـەریدا و، دووبـارە دەیکێشـا بە دەم و ڕووخسـاریدا و چـاك دەبوویەوە و دیسانەوە لێی دەدرایەوە وەکو خۆی لـێ دەهـاتەوە و سـزاکەی بەو جـۆرە بەردەوام بوو.

وتم: ئەمە چیە؟

وتیان: با بڕۆین، دەرچووین، هەتا گەیشتینە کونێك وەك تەنورێك بـوو، سـەرەوەی تەسك بوو، خوارەوەی فراوان بوو، ژێرەکەی ئاگر بـوو، مرۆڤـی تیـابوو سـەردەکەوتن هەتا بێنە دەرەوە، خەریك بوو دەهاتنە دەرەوە و دەبرانەوە بنی تەنـورە گەورەکە، ژنـان و پیاوانی ڕوت و ڕەجال بوون، وتم ئەمە چیە؟

وتیـان: بـا بـڕۆین، هەتـا گەیشـتینە ڕوویـارێکی خـوێن، پیاوێـك لە ناوەڕاسـتی ڕووبارەکە وەستا بوو، پیاوێك بەردێکی پێ بـوو، دەیکێشـا بە دەمـی ئەم پیـاوەدا، هەر چەندێك بیویستایە لە ڕووبارە خوێنەکە بێتە دەرەوە دەیکێشا بە ناو دەمیـدا دەیگێـڕایەوە بۆ شوێنی خۆی، وتم: ئەمە چیە؟

وتی: با بڕۆین.

ڕۆشـتین هەتـا گەیشـتینە ڕوویـارێکی خـوێن، پیاوێـك لە ناوەڕاسـتی ڕووبـارەکە ڕاوەستابوو، لە قەراغی ڕووبارەکەش پیاوێك بەردێکـی بەدەسـتەوە بـوو، هەر کاتێـك پیاوەکە لەناو دەریای خوێندا بوو دەیویست بێـتە دەرەوە، ئەم پیـاوەی دەرەوە بەردێکـی دەدا بە دەمیدا و دەیگێڕایەوە بۆ ناو ڕووبارە خوێنەکە.

وتم: ئەمە چیە؟

وتی: با بڕۆین.

هەتـا گەیشـتینە بـاخێکی سـەوزی جـوان، درەختێکـی گەورەی لـێ بـوو، لە بنـی درەختەکەدا پیاوێکی بە تەمەنی لـێ بـوو، منـاڵان لە دەوری بـوون، پیاوێکیشـم بینـی ئاگرێکی بە دەستەوە بوو، منیان سەر خستە سەر درەختەکە و ڕۆشتینە خـانویەکەوە کە زۆر خۆش بوو وێنەیم نەبینی بوو، گەنج و پیری لێ بوو، ژنان و مناڵانێکی زۆری لـێ بوو.

لە دوایدا لەوێ دەرچووین و سەرکەوتین بە درەختێکی تردا خانوویەکی زۆر نایـابی لێ بوو، باشترینی گەنج و پیرم لەوێ بینی.

لە دوایدا وتم: ئەمشەو منتان زۆر سوڕانەوە پێم بڵێن ئەمانە چی بوون کە بینیمان.

پێیان وتم: ئەوەی کە بینیت ئاسنەکەیان کێشا بە ڕوخسار و دەمیدا ئەوە درۆزن بوو، کە ئەوانەن هەمیشە بە درۆ دەدوێن، هەتا ڕۆژی قیامەت بەو جۆرە لێیان دەدرێت، ئەوەش کە پێستی سەریان دامالْی ئەوە پیاوێکە خوای گەورە قورئانی فێر کردوە، دەخەوێت و بە ڕۆژدا کاری پێ ناکات، هەتا ڕۆژی قیامەت خوای گەورە بەو جۆرەی لەگەڵ دەکات، ئەوەی لە کونە گەورەکەی کە وەك تەنورێکی گەورەدا بوو بینیت، ئەوە داوێن پیسەکانن، ئەوەش لە ڕووبارە خوێنەکەدا بینیت سوو خۆرانن، ئەو پیاوەش لە لای بنی درەختەکە بوو حەزرەتی 'ئیبراهیم' بوو 'علیه السلام'، ئەو منالانەش کە لە دەوری بوون، منالْی خەڵکن کە بە منالْی مردوون ، ئەوەش ئاگرەکەی کردبوویەوە و ئاگرێکی بە دەستەوە بوو، ئەوە فریشتەی ئاگری دۆزەخە، خانووی یەکەم کە ڕۆشتیت مالْی باوەڕداران، بەڵام خانووی دووەم خانووی شەهیدانە و منیش جوبرەئیلم و ئەمەش میکائیلە، سەرت بەرز بکەرەوە، کە سەرم بەرز کردەوە لە سەرەوە وەك پەڵەیەکی هەورم بینی.

وتیان: ئەوە ماڵ و خانووی تۆیە.

وتم: مۆڵەتم بدەن هەتا بچمە ناویەوە.

وتیان: هێشتا تەمەنی دونیات تەواو نەکردوە و کاتت نەهاتوە، هەر کاتێك ژیانی دونیات تەواو کرد دێیت بۆ شوێن و مەنزڵی خۆت[1].

ابن قیم دەڵێت: بەڵگە هەیە لەسەر ئەوەی کە ڕۆحی زیندوو مردوەکان لە ڕێگەی خەونەوە دەگەن بە یەکتر. شتانێك بە زیندوەکان دەڵێن کە نایزانن.

لە ڕابردوو لە داهاتوو شتانێك دەڵێن کە بەو جۆرە ڕوودەدات یاخود ڕووی داوە، ئەگەر مردوەکە قەرزێکی لەسەر بوویێت ناوی کەسەکە دەبات کە بچن بۆ لای و بیدەنەوە، بەو جۆرەش دەبێت و بە تەواوی ڕاست دەردەچێت.

---

١- 'صحیحی بوخاری'.

یاخود بە زیندوەکە دەڵێین کە فلان کات تۆش دێیت بۆ لامان.

لە ئەنەسی کوڕی مالکەوە دەگێڕنەوە 'خوای لێ ڕازی بێت' کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: شەوی ئیسرا و میعراج ڕۆشتم بەسەر گۆڕی 'موسی'دا لە شوێنێك کە پێی دەوترێت 'الكثيب الأحمر' کە شوێنێکە نزیکە لە قودسی پیرۆزەوە، موسام بینی بە پێوە بوو لەناو گۆڕەکەیدا و نوێژی دەکرد[1].

عبداللەی کوڕی عباس لە پێغەمبەرەوە دەگێڕێتەوە ﷺ: کە پیاوێك کۆچی دوایی دەکات، کاتێك دەیخەنە گۆڕەکەیەوە، فریشتەکان دێنە سەری و پێی دەڵێن ئێمە سەد شەلاقە و قامچیت لێ دەدەین، کە سزای خوایە لەسەر تۆ.

فەرمووی: پیاوەکەش باسی نوێژ و ڕۆژو و جیهادی خۆی کرد و بوو بە شەفاعەت کاری.

ئیتر سزاکەیان بۆ سوك کرد، هەتا گەیشتە دوانزە شەلاق.

تکام کرد، بۆیان کەم کردەوە بۆ یەك شەلاقە، وەختێ لێیان دا ئاگر بەربوویە ناو گۆڕەکەی و لە هۆش خۆی چوو، وەختێ هۆشی هاتەوە، وتی: لەبەرچی ئەو شەلاقەیەتان لێ دام؟

وتیان: جارێکیان دەست نوێژت نەبوو نوێژت کرد، دەست نوێژت نەگرتەوە، هەروەها ئاگات لە هاوار و ستەملێکراویی پیاوێکەوە بوو بەڵام فریای نەکەوتیت[2].

لە ئەنەسەوە 'خوای لێ ڕازی بێت' دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بەندەی خوا کاتێك دەخرێتە ناو گۆڕەوە، کاتێك خەڵکەکە لەسەر گۆڕەکەی دەڕۆن و بەجێی دەهێڵن، ئەو گوێی لە تەقەی نەعلەکانیانە[3].

---

١- صحیحی موسلم.

٢-'صحيح الترغيب والترهيب'.

٣-'صحيح البخاري'.

شەعەبی دەگێڕێتەوە کە باسی پیاوێك دەکات کە بە پێغەمبەری فەرموو ﷺ: یا رسول الله من دام بە لای ناوچەی بەدردا، پیاوێکم بینی هاتبووە دەرەوە و لە پیاوێکی تری دەدا بە ئاسنێکی سەر خڕی گرنج گرنجاوی لار، دەیکێشا بە پیاوەکەدا و ون دەبوو نەدەما و هەمدیسان دروست دەبوویەوە و پەیدا دەبوویەوە و بەو جۆرە لێدانی بەردەوام بوو، پێغەبەر ﷺ فەرمووی ئەو پیاوەی کە لێی دراوە ئەبو جەهلی کوڕی هیشام بووە هەتا ڕۆژی قیامەت بەو جۆرە سزا دەدرێت[1].

عەزیم ئابادی دەفەرموێت: کۆمەڵێك لە لێکۆڵەران گەیشتوون بەوەی کە پێغەمبەر ﷺلە دوای وەفاتیشی زیندووە، پێغەمبەران جەستەکانیشیان تیا ناچێت و نارزێت، بە تەواوی ئاگایی و هەست کردن و گوێ لێ بوون ئاگاداری هەموو شتێکن و، تەواوی مردوانی تریش سابتە کە وتە و شتی ئێمەیان پێ دەگات و دەیبیستن[2].

لە عبداللەی کوڕی عباسەوە دەگێڕنەوە 'خوایان لێ ڕازی بێت' کە دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: "هەر کەسێك سەردانی برایەکی 'کەسێك' دەکات لەلای دادەنیشێت، خوای گەورە ئەو کەسە ئاگادار دەکات و زۆر دڵی بەو سەردانە خۆش دەبێت و وەڵامیشی دەداتەوە[3]."

'واتە کەسی مردوو لە گۆڕستان'.

سوفیانی سەوری دەفەرموێت(٤): کاتێك دڵنیایی و یەقین لە دڵێکدا جێگیر دەبێت وەکو پێویست، لە خۆشیاندا دەبێت بفرێت و لە هەمان کاتیشدا زۆر خەمباریش بێت، شەوقی بۆ بەهەشت هەیە و دەشترسێت لە دۆزەخ.

---

١- 'مصنف ابن أبي شيبة الطبراني'.

٢- 'العظيم آبادي/ عون المعبود'.

٣- 'إبن رجب'.

٤- کتێبی 'ليلى بين الجنة والنار' د.خالد أبو شادي.

موسوڵمان نەزانیەکەی هەندێك پەردە پۆشی بـۆ دەکـات، بەڵام کاتێـك زانـی، زۆر شتی لەسەر کەڵەکە دەبێت.

ئەم کتێب و بابەتانەی باسی دەکەین هەڵهاتن نـیە لە واقـع و ڕۆشـتن بەرەو خەیـاڵ کردن، ئەم حەقیقەتانە دورت ناخەنەوە لە دونیا، بەڵکو چارەسەری کێشـەکانی دونیـات بۆ دەکەن بە ڕێگای ئاخیرەت و قیامەت ناسی.

دونیا ئەو بازاڕەیە کە بەهەشتی پێ دەکڕیت، لەنـاو ڕۆژ و لاپەڕەکانیـدا ڕازی بـوون بەدەست دێنیت.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُـوا اللَّهَ حَـقَّ تُقَاتِـهِ وَلَا تَمُـوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ﴾ (آل عمران: ١٠٢)

واتە/ ئەی باوەڕداران! دەبـێ هەر چـۆنێ پێویسـتە، ئـاوا لە سـنورەکانی خـوا پـارێز بکەن...، هەمیشە گوێ ڕایەڵ بـن، هەرگیـز سـەرپێچی نەکەن، هەردەم خواتـان لەیـاد بێت، هیچ کات لە بیـری نەکەن، سـوپاس گـوزار بـن، سـپڵە مەبـن، وە دەبـێ هەر بە موسوڵمانێتی بمرن، واتە: هەتـا زینـدوون تونـد دەسـت بە ئیسـلامەکەتانەوە بگـرن و، دەستی لێ بەرمەدەن، هەتا ڕۆژێ کە مردن با بە ئاینەوە بچنەوە لای خودا.

باسەکانی بەهەشت و دۆزەخ لە گرنگترین پرسە گرنگەکـانی مـرۆڤە کە سـەرقاڵیان بێت لە گەشتی ژیانی دونیـادا و گەیشـتنی بە خـوای باڵادەسـت، باشـترین دەرمـان و چارەسەریشە بۆ باش کردنی دڵ و دەروون، ئەو دڵ و دەروونەی کە ماندووە بە ئـاگری گوناه و چڵك و ناشرینیەکانی شەهوەت و ئارەزووی خراپ.

ئەی هاوار! دۆستانی خوا و چاکانی لای خوا چۆن نزیکبوونەوە و، ئـێمەش چـۆن دور کەوتینەوە!

ئایا ئێمە دەست دەدەین بۆ ئەوەی لە ئەهلی بەهەشت بین!

قورسترین جۆری نابینایی، ئەو نابینایەیە کە لە دوای چاو ساغی دێت!

وە قورسترین بەجێ هێڵان، بەجێ هێڵانێکە لە دوای ویصاڵ و بە یەک گەیشتن هاتبێت.

ئەی گرۆهی تاوانباران! ئێوە پشت هەڵدەکەن، لە کاتێکدا خوای گەورە تەوبەتان لێ قبوڵ دەکات ئێوە گوناهەکانتان بەرز دەکەنەوە، بەڵام زاتی خوای تەعالا، خراپەکانتان دەپۆشێت!

ئاسنی سارد کوتان سوودی نیە، بە ئاگری شەو و ئاسنەکان سور بکەنەوە.

عیشق گەرمی لێدانی دڵە، هەرگیز جوڵەی خاو نابێتەوە، کاتێ دڵ خاو دەبێتەوە و دەوەستێت نیشانەی مردنیەتی.

تۆ یان عاشقیت یان مردوو!!

تۆ یەکێکیت لەم دوانە:

یان کەسێکیت لە ڕووناکیدا دەخەویت؟!

یاخود لە تارکیدا هەڵدەستیت، تۆ لە کامیانیت؟!

هەموو گەردنێك ملوانکەی لێ جوان نیە، ئەوەی هەڵامەتی بوو نێرگزی پێ مەدە، بەڵگە هێنانەوە بۆ کاڵ فام بێ مانایە.

قەیس لەیلا کوشتی! ئەی تۆ کوژراوی دەستی کێیت؟

دونیا دەریایە و بەهەشتیش کەنارە و تەقواش کەشتیە و هەموو ئێمەش موسافیرین.

من لاپەڕەیەکی تامەزرۆبونتان پێشکەش دەکەم، بە خامەی ئارەزو بۆتان دەنوسم، دڵ دەخوازم هەتا عیشقی مانەوەی تیا بڕوێنم.

باڵندەیەکی ناو لەپی دەستان، لە هەزاری ناو دەرستان باشترە، بیر کردنەوە لە ڕابردوو، با ئەمڕۆت لەناو نەبات نەکات.

تەواوی ئەم کارە بۆ بە ئاگا هاتنەوە و چاك بوونی تەواو و چاك بوونەوەی یەکجاریە.

فەزڵی ڕەقاشی دەڵێت: ئێمە سوێند بە خوا ئاشناتان نـاکەین بە نەزانراوێـك، بەڵکـو ئەوەتان بیر دەهێنینەوە کە دەیزانن.

## جیاوازی نێوان خۆشەویستی و عیشق



هەموو عیشقێك ناو دەبرێت بە خۆشەویستی، بەڵام هەموو خۆشەویستیەك عیشـق نیە، گەنجینەیەکی فیـتری لە سـۆز وعـاطفە و خۆشەویسـتی لە دڵـی هەر یەکێکمانـدا هەیە، ئەگەر ڕووی نەکەیـنە چـاکە و خێـر، تووشـی داچـۆڕانێکی خـراپ دێـت و وابەستەی عیشـقی ئـافرەت یـاخود پـارە و سـامان، یـاخود کـار و پیشـەیەك دەبێـت، پێشبڕکێی بەهەشت لەم ویست و ئیـرادەیە دایە، لەنـاو کرۆکـی دەروون و دڵـدا هەوا و ئارەزوەکـان کـێ بەر کـێ دەکەن هەتـا دڵ داگیـر بـکەن و لە عیبـادەت و حەق ناسـی دوری بخەنەوە.

یەکێك لە پاشاکان بە عابد و خواناسێکی وت: ئایا یادی من دەکەیت؟!

وتی: هەر کاتێك خوام بیر بچێتەوە بەڵێ!!

## بەهەشت بۆچی؟



پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێـت: لە دونیـادا بمێـنەرەوە وەکـو ئەوەی نـامۆ بیـت یـاخود ڕێبوار.

ئێمە دەرکراوین و هەوڵی گەڕانەوە دەدەین.

دانا و ژیرەکان هەر زوو دەرکیان بەم ڕاستیە کردووە. ئیبین قەیم دەفەرموێت:

فحيَّ على جنات عدنٍ فإنها *** منازلك الأولى وفيها المخيّمُ

ولكننا سبى العدو فهل ترى *** نعود إلى أوطاننا ونسلم

سڵاو لەو بەهەشتە و باخ و شوێنە بێ وێنەکانی *** ماڵ و شوێنی یەکەمینی ئێمەیە

ئێمە کراینە دیلی دوژمن و کردینی بە بەندە و کەنیزەك *** ڕۆژێ دێتە پێشەوە لە دیلی شەیتان سەرباز دەبیت و دەگەڕێتەوە نیشتیمان.

## پێویستیەکانی گەشت

### ١) تامەزرۆبون و حەزی گەڕانەوە:

پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت: شوێنی قامچیەك لە بەهەشت باشتر و چاکترە لە دونیا و ئەوەی لە دونیا دایە[1].

ئەزانن بۆچی پێغەمبەر ﷺ نموونەی قامچی هێنایەوە؟ چونکە سوارچاك کاتێك لە بیابان دەیەوێت لە شوێنێك بمێنێتەوە پشوویەك بدات، قامچیەکەی فڕێ دەداتە خوارەوە، بە مانای مانەوەی لەو شوێنە دێت، کاتێك شوێن قامچیەك لە بەهەشت لە دونیا و ئەوەی لە دونیادا هەیە جوانتر و خێردارتر بێت، لە کاتێکدا هێشتا تۆ دانەبەزیبیت بۆ بەهەشتی حەق تعالا و، ئەبێت کاتێك دادەبەزیت و دەچیتە بەهەشت بۆ هەتا هەتایی تیایدا دەمێنیتەوە چۆن بێت!!

ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم دەفەرمۆێت: ئێمە ڕەچەڵەك و نەوەی بەهەشتین، ئیبلیس بە هۆکاری گوناهمانەوە ئێمەی کردە دیلی خۆی، حەق وایە دیلیش هەتا ئازاد نەبێت و نەگەڕێتەوە نیشتیمانی خۆی دڵی خۆش نەبێت.

---

١- صحيح البخاري و الترمذي و ابن ماجة.

**دەست لە گۆچانەکەت بەر مەدە هەتا دەگەیتەوە نیشتیمان و شوێنی مەبەست.**

**وتیان بە ئیمامی شافعی بۆچی داردەست و گۆچان دەگریت بە دەستەوە لە کاتێکدا پێویستت پێی نیە و هێشتا تەمەنت نەکردوە؟**

فەرمووی: هەتا بیرم نەچێت کە ڕێبوارم.

**٢) کەمی ئومێد بە دونیا:** ئایا شیاوتر ئەوە نیە کە ماڵ و داهاتێك کۆت کردۆتەوە، کە گەڕایتەوە نیشتیمانی ڕاستەقینە خۆشی لێ ببینیت و لەوێ سودی لێ ببینیت؟

**گەشتی یەکەم: (٦٠ - ٧٠) ساڵ**

گەشتی دووەم: لە دونیاوە بۆ ناو گۆڕ، کە ڕەنگە هەزاران ساڵی دونیا بێت و بێ سنوری ئەوێی بێت!

**گەشتی سێیەم:** لە گۆڕەوە بۆ حەشر و مەحشەر، تەنها لە مەحشەر پەنجا هەزار ساڵ دەوەستێنرێن.

**گەشتی هەتا هەتایی و کۆتایی:** لە حەشرەوە بۆ هەتا هەتایی بەهەشت، یاخود پەنا بەخوا بۆ دۆزەخ.

ئەو بەشەی دونیا کورترین و نزمترین بەشی ژیانە، بەڵام زۆر زۆر گرنگە.

بیلالی کوڕی سەعد فەرمووی: ئەی ئەهلی هەتا هەتایی و مانەوەی بێ سنور، ئەی **ئەهلی بەقا و مانەوە:** ئێوە بۆ فەنا و تیاچوون دروست نەکراون، تەنها ئەوەندەیە ئێوە لە ماڵ و خانویەکەوە دەگوازنەوە بۆ ماڵ و خانویەکی تر.

**٣) ناسینەوەی نیشتیمان:** دەبێت ئیماندارى ڕاست زۆر باش نیشتیمانی ڕاستەقینەی بناسێتەوە و شارەزای بێت.

﴿وَيُدْخِلُهُمُ الْجَنَّةَ عَرَّفَهَا لَهُمْ﴾ (محمد: ٦)

دەیانباتە بەهەشتەوە بە جۆرێك کە هەموو کەسێك جێگـای خـۆی دەزانێـت و لێـی ون نابێت.

**پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت:** سوێند بەو زاتەی نەفسی موحەمەدی بەدەستە، هـیچ یەکێـك لە ئێـوە زیـاتر لەوەی شـارەزای ڕێـگەی مـاڵی خـۆیەتی، زۆر شـارەزاتری ماڵەکەیەتی لە بەهەشتدا[1].

**پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت:** بۆنی خۆشی بەهەشت لە دوری پێـنج سـەد سـاڵەوە هەستی پێ دەکرێت[2].

ئیمانـداران و موسـلمانان پـێش ئەوەی بچـنە بەهەشـت سـوود لە بـۆن و بەرامەی دەبینن.

لە دونیادا کرداری باشە و بە ئیخلاصەوە بکرێت بۆنی بەهەشـت دەدات، هەروەهـا ئیمانداران پێش پردی سیراطیش بۆنی بەهەشت دەکەن.



---

١- صحيح البخاري.

٢- صحيح البيهقي.

# لە نێوان عیشقێك و عیشقێكی تردا

کاتێك لەیلا كۆچی دوایی كرد و قەیس بە مردنەكەی زانی، وەك شـێت ڕایـدەكرد و كەوتبوویە بیابان هەتا بچێتە سەر گـۆڕی لەیـلا، گـۆڕ بە گـۆڕ بـۆنی پێـوە دەكـرد و بە دوای خۆشەویستەكەیدا دەگەڕا، هەتا گۆڕەكەی لەیلای دۆزیەوە، بەسـەر گـۆڕەكەیەوە كزۆڵەی كرد و دەگریا.

پێیان وت: چۆن زانیت ئەوە گۆڕی لەیلایە؟ كێ پێی وتیت؟!

قەیس بەم پارچە شیعرە وەڵامی دانەوە:

أرادوا ليخفوا قبرهُ عن مُحبّهِ.. وطيبُ ترابِ القبر دلَّ على القبرِ

واتە/ ویستیان گۆڕەكەی لە خۆشەویستەكەی بشارنەوە، بەڵام بۆنی گڵی گـۆڕەكەی چاوساغم بوو هەتا بیدۆزمەوە.

٤) **غەریبی:** غەریب و ڕێبوار و هاوڕێ و پشتیوان بەكەمی دەدۆزرێـتەوە، بە زۆری تەنهــایە، لەبەر ئەوە پێغەمــبەر ﷺ مــژدەی پــێ دەدات و وەصــفی حــاڵی دەكــات و دەفەرموێـت: طوبـا و خۆشـبەختی بـۆ غەریبەكـان، خەلكـانێكی پیاوچـاكن، لەنـاو خەڵكـانێكی زۆری خراپـدا، ئەوانەی سـەرپێچیان دەكەن زیـاترن لەوانەی بە گوێیـان دەكەن[1].

پرسیاریان كرد لە عبداللەی كوڕی ئەبی مریم: تەواوی نیعمەت كامەیە؟

وتی: قاچێكت لەسەر پردی سیراط مابێت و قاچەكەی ترت گەیشتبێتە بەهەشت.

---

١-'صحيح امام أحمد'.

# باشترین بردنەوە



عبداللەی کوڕی عەمر و عورووەی کوڕی زوبەیر و موصعەبی کوڕی زوبەیر و عبدالملکی کوڕی مەروان لەناو کەعبەدا دانیشتبوون.

مصعب پێی وتن: ئومێد و ئاواتەکانتان بڵێن!

وتیان: با لە تۆوە دەست پێ بکەین.

مصعب وتی: ببمە والی عێراق و سەکینەی کچی حوسەین و عائیشەی کچی طەلحەی کوڕی عوبەید بخوازم، ئەوانەی ئاواتی بوو دەست گیری بوو.

تەمەناو ئومێدی عورووەی کوڕی زوبەیر ئەوە بوو ببێتە فەقیهو زانا و شارەزا و خەڵکی سودی لێ ببینن.

عبدالملك ئومێدی خەلیفایەتی خواست و دەسگیری بوو، عبداللەی کوڕی عومەر ئاواتی بەهەشتی خواست.

ئەوەی هیوا و ئاواتی حەوانەوە بخوازێت بە خۆشی و نۆشی باش، بێ بەشی حەوانەوە دەبێت.

خۆت لە نەفست بپارێزە، مۆڵگەی بەڵاکانە، نەرمی لەگەڵ مەنوێنە، سوێند بە خوا هەتا سوکایەتی پێ نەکەیت ڕێزت نەگرتووە، عیزەتی دەسگیر ناکەیت هەتا زەلیلی نەکەیت، نەیشکێنیت چاك نابێتەوە، ماندووی نەکەیت پشوو نادات، هەتا نەیترسێنی هێمنی بە خۆیەوە نابینێت، ئەگەر دەتەوێ ڕزگاری بێت مەیلاوێنە!!

## پێوانەیەکی ورد و سەرنج ڕاکێش

پێغەمبەرمان ﷺ ڕۆژێکیان سوێندی خوارد و فەرمووی: سوێند بە خوا دونیا لە چاو قیامەت و ئاخیرەتدا، وەك ئەوەیە پەنجەیەکت بکەیت بە دەریایەکدا چەند ئاو هەڵدەگرێت لە بەرامبەر گەورەیی و زۆری دەریاکەدا، هەر ئەوەندەیە[1].

پێغەمبەر ﷺ ئاماژە بەوە دەکات کە ئەگەر بە ئەندازەی سەرە نینۆکێکی بەهەشت لە جیهان و گەردون و دونیادا بەدەر بکەوێت، ئاسمانەکان و زەوی و گەردون دەڕازێتەوە، ئەگەر پیاوێکی بەهەشتی بازنەیەکی بەهەشت پیشانی دونیا بدات، ڕووناکی خۆر دیار نامێنێت، هەر وەکو چۆن ئەستێرەکان بە بینینی خۆر ون دەبن.

## تامەزرۆبون بە ئەندازەی سوتانە

ئەگەر بە مەجنون بوترێت لەیلا و پێگەیشتنی لەیلات دەوێت، یاخود دونیا و هەموو جوانیەکانی دونیا.

مەجنون دەڵێت: تۆزی بەردەرگای لەیلام لا خۆشەویسترە لە هەموو شتێك.

ئەمە بۆ عیشقی ئافرەتێك وتراوە کە مردووە و نەماوە، کەچی قوربانی دەدات بە هەموو دونیا لە پێناوی شوێنەوارەکانیشیدا؟!

ئەبێ چی بوترێت بەرامبەر بەهەشتێك نە تەواو دەبێت و نە کۆتایی دێت و، خۆشی هەمیشەیی دەست بەهەشتیەکان دەخات.

---

١-'صحيح/ أحمد ومسلم و ابن ماجة'.

پێغەمبەر ﷺ دەبینێت خێزان وماڵی یاسر لەلایەن کافرەکانی مەکەوە سزا دەدرێن، پێیان دەفەرموێت: ئارام بگرن ئالی یاسر، وادە و مەوعیدی ئێوە بەهەشتە.

بەهەشتێك وەك پێغەمبەر ﷺ دەربارەی دەفەرموێت: شتانێکی تیایە کە نە چاو بینیویەتی، نە گوێ بیستویەتی، نە بە خەیاڵ و دڵی هیچ مرۆڤێکدا هاتووە.

کاتێ قورئانی پیرۆز و فەرمودەکانی پێغەمبەر ﷺ باسی خۆشی و نیعمەتەکانی بەهەشتمان بۆ دەکەن، تەنها بۆ نزیك خستنەوەیە لە تێ گەیشتنی ئێمە، ئەگینا گواستنەوە ناکرێت.

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿مَّثَلُ الْجَنَّةِ الَّتِي وُعِدَ الْمُتَّقُونَ ۖ فِيهَا أَنْهَارٌ مِّن مَّاءٍ غَيْرِ آسِنٍ وَأَنْهَارٌ مِّن لَّبَنٍ لَّمْ يَتَغَيَّرْ طَعْمُهُ وَأَنْهَارٌ مِّنْ خَمْرٍ لَّذَّةٍ لِّلشَّارِبِينَ وَأَنْهَارٌ مِّنْ عَسَلٍ مُّصَفًّى ۖ وَلَهُمْ فِيهَا مِن كُلِّ الثَّمَرَاتِ وَمَغْفِرَةٌ مِّن رَّبِّهِمْ ۖ كَمَنْ هُوَ خَالِدٌ فِي النَّارِ وَسُقُوا مَاءً حَمِيمًا فَقَطَّعَ أَمْعَاءَهُمْ﴾ (موحەمەد: ١٥)

واتە/ نموونە و سیفەتی ئەو بەهەشتەی بە خۆ پارێزان بەڵێن دراوە لە پاشە ڕۆژدا پێیان بدرێت بەم شێوەیەیە.

ڕووباری زۆری لە ئاوی خاوێن و نەگۆڕاو و بێ بۆنی تێدایە.

زۆر ڕووباری تێدایە، لە شیری سپی و جوان، کە بەهۆی مانەوە وەك شیری دونیا تامی نەگۆڕاوە، چونکە لە گوانی ئاژەڵ نایەتە دەر.

چەندین چەم و ڕووباری تێدایە، لە شەراب و عارەقێك -کە بۆ ئەوانەی دەیخۆنەوە- زۆر خۆش و بە مەزەیە، واتە: دوورە لە هەر وەسفێکی عارەقی دونیا.

چەندان چەم و ڕووباری تێدایە، لە هەنگوینی پاڵاوتە و بێگەرد، لەوێ جۆرا و جۆری میوەیان بۆ هەیە.

لێبوردن و لێخۆشبوونی پەروەردگاریان بۆ هەیە، کە ئەوە چاکترین شتە.

ئایــا ئەوانەی کە ئەو نــاز و نیعمەتەیــان هەیە، وەك ئەو کەســە وایە کە هەمیشــە لە ئاگری دۆزەخدا بێت؟

وە ئاوی کوڵ بە کوڵیان پێ دەخۆنەوە کاتێك کە تینویان دەبێت، جا ڕیخۆڵەیان پــارە پارە دەکات، ئایا ئەو دوو دەستەیە وەك یەك وان؟!

ئەبو بەکری نەقاش لێوەکانی دەجوڵاند و بە دەنگی بەرز وتی: ﴿لِمِثْلِ هَٰذَا فَلْيَعْمَلِ الْعَامِلُونَ﴾ (الصافات: ٦١) سێ جار وتیەوە.

واتە/ ئەوانەی کــار بــۆ خــودا دەکەن و ســاغ لەبەر ڕەزای خــوا ئەنجــامی دەدەن بــۆ ئەئەمە کار دەکەن. دوای ئەوە وەفاتی کرد.

## نیعمەت و خۆشیەکانی بەهەشت جۆراو جۆرن



١) چێژە جەستەیی و ئەو شـێوازانەی لە دونیــا نمونەکانیــان هەیە، وەك خــواردن بە جۆرەکــانیەوە، خــواردنەوە، جــل و بەرگــی جــۆراو جــۆر و ئــاڵتون و زیــو و گەوهەرە نایابەکان و ژنان و ئافرەتان و حۆری بەهەشت و هەموو خۆشی و جوانیەکانی تر.

٢) نەمری و مانەوەی هەتا هەتایی، مانەوەیەك کە کۆتایی نایەت و تەواو نابێت.

هەر لەبەر ئەوەیە بە بەهەشت وتراوە 'دار الخلود' واتە:شوێنی نەمری.

بە دونیاش وتراوە 'دار الغرور' ماڵ و شوێنی لە خشتە بردن.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت: مــردن دەهێنرێــت، هەروەکــو ئەوەی مەڕێــك بێــت و لە نێوان بەهەشت و دۆزەخدا دادەنرێت. دەوترێت: ئەی ئەهلــی بەهەشــت! ئەی ئەهلــی دۆزەخ، هەردوو لایان هەڵوێستە دەکەن، پێیان دەوترێت: ئایا ئەمە دەناسن؟

دەڵێن: بەڵێ. ئەوە مردنە.

پـاڵ دەخـرێن و سـەر دەبڕێـت، ئەگەر خـوای گەورە بڕیـار و وادەی ژیـانی هەتـا هەتایی و نەمری نەدایە لە خۆشـی ئەو هەواڵە دەمـردن، بە هەمـان شـێوە ئەگەر وادە و بڕیاری نەمری بە ئەهلی دۆزەخ نەدایە لە خۆشیاندا دەمردن کە نەجاتیـان دەبێـت، بەڵام ئەهلی بەهەشت و دۆزەخ دڵنیا دەبنەوە کە هەتا هەتایە مردن نیە[1].

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: بانگی ئەهلی بەهەشت دەکرێت، هەتـا هەتـایە دەژیـن و هەرگیزا و هەرگیز نامرن، هەتا هەتایە لەش ساغ دەبن و هەرگیز نەخۆش ناکەون، هەتـا هەتایە بە گەنجی دەمێننەوە و هەرگیز پیر نابن، هەتا هەتایە لە نـاز و نیعمەتـدا دەبـن و هەرگیز لە نیعمەتەکان بێزار نابن.

ژیانی ڕاستەقینە بریتیە لە ژیانی قیامەت و بەهەشت.

خوا گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَا هَٰذِهِ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا إِلَّا لَهْوٌ وَلَعِبٌ ۚ وَإِنَّ الدَّارَ الْآخِرَةَ لَهِيَ الْحَيَوَانُ ۚ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ﴾ (العنكبوت: ٦٤)

ووشەی 'حیوان' بەڵـگەیە لەسـەر زیـادە مانـا، واتە ژیـانێکی زۆر بەر فراوانـی بـێ سنوری پڕ لە ژیانەوە.

**٣)** نەمانی ماندوێتی: خوای گەورە دەفەرموێـت: 'وجنـی الجنـین دان' عبـداللەی کوڕی عبـاس 'خـوای لـێ ڕازی بێـت' لە تەفسـیری ئەم ئـایەتەدا دەفەرموێـت: پەلـی درەختەکان نزم دەبێتەوە هەتا بەرویـوم و میوەکانیـان نـزم دەکەنەوە بـۆ نـاو دەسـتان و، دۆستی خوا ئەگەر بیەوێت بە پێوە یاخود بە دانیشتنەوە یاخود بە ڕاکشانەوە دەستی پـێ دەگات و هیچ عەزیەت و دڕك و داڵێکی نیە. تەفسیری قورتوبی ١٥٥/١٧.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: خەو برای مردنە، خەڵکی بەهەشت مردن نابینن.

لە ڕیوایەتێکی تردا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ئەهلی بەهەشت ناخەون[2].

---

١- صحيح الجامع.

٢- صحيح/ ئیمامی بەیهەقی لە جابرەوە گێڕاویەتیەوە.

مادام خەوی زۆر نیشانەی کات بەفیڕۆدان بێت و خەسارەتی زیاتر بێت، نابێتە نیعمەتی بەهەشت بەم جۆرەی دونیا.

٤) نزمترین پاداشتی بەهەشت: پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: لای کەمترینی پاداشتی بەهەشت هی پیاوێکە کە خوای گەورە ڕووی لە ئاگر وەچەرخاند و ڕووە و بەهەشتی برد، درەختێکی لە دەرەوەی دۆزەخ بینی، کە سێبەرێکی گەورەی هەبوو، وتی: پەروەردگارا بمگەڕێنەوە ئەو درەختە هەتا لە ژێر سێبەرەکەیدا بم، خوای گەورە فەرمووی: داوای هیچی تر ناکەیت؟

وتی: بە عیزەتی تۆ قەسەم خوایە هیچی ترم ناوێت.

خوای گەورە بردیە ژێر سێبەری ئەو درەختە پڕ لە بەرهەم و سێبەرە، هەتا پشوو بدەم و لە بەرەکەشی بخۆم.

فەرمووی: هیچی ترت ناوێت؟

وتی: نەخێر بە عیزەتی تۆ یارەبی.

خوای باڵادەست پێی بەخشی، دوای ئەوە درەختێکی تری بینی کە سێبەر و بەر و ئاو و ڕووباری لە بەردەم بوو، پیاوەکە وتی: خودایە ئەوەیانم پێ ببەخشە هەتا لە ژێر سێبەرەکەی بم و لە بەرەکەشی بخۆم و لە ئاوەکەش بخۆمەوە.

خوای گەورە فەرمووی: داوای زیاتر ناکەیت؟

وتی: نەخێر بە عیزەتت قەسەم یارەبی.

ئەوەشی پێ دەدات و پاشان لەو درەختەوە دەرگای بەهەشت دەردەکەوێت، دەڵێت: پەروەردگارم بمگەیەنەرەوە دەرگای بەهەشت هەتا لەوێوە خەڵکی بەهەشت ببینم، خوای گەورە دەیباتە لای دەرگای بەهەشت و ئەهلی بەهەشت و بەهەشت دەبینێت، دەڵێت: یارەبی بمخەرە بەهەشتەوە، خوای گەورە دەیخاتە بەهەشتەوە، دەڵێت: خوایە ئەمە هی منە؟!

خوای گەورە دەفەرموێت پێی: ئومێد و ئاوات و داوات چی هەیە بیانڵێ هەتا پێت بدەم، خوای گەورە دەفەرموێت ئەوە و ئەوەش داوا بکە، هەتا ئیتر ئاوات و داوا نامێنێت بیکات، خوای گەورە دەفەرموێت: ئەوەی داوات کردوە و دە ئەوەندەش زیاترت پێ دەدەم.

پاشان خوای گەورە داخڵ بە بەهەشتی دەکات، دوو ئافرەت لە حۆریەکان کە خێزانی ئەم پیاوەن دێن بۆ لای و پێی دەڵێن: سوپاس بۆ ئەو خوایەی ئێمەی بۆ تۆ زیندوو کردەوە و تۆش بۆ ئێمە، پیاوەکەش دەڵێت: هیچ کەس وەك منی پێ نەدراوە[1].

لە ڕیوایەتی عبداللەی کوڕی مسعودا هاتووە 'خوای لێ ڕازی بێت' کە ئەم پیاوە بەردەوام داوا دەکات و پێی دەوترێت هەتا ئیتر لە شەرمدا بێ دەنگ دەبێت، ئەوەندە کەرەم و بەخشندەیی خوا زۆر و بێ سنورە.

خوای گەورە دەفەرموێت: چیە بۆچی داوای تر ناکەیت؟

پیاوەکە دەڵێت: یارەبی ئەوەندەم داوا کرد هەتا شەرمت لێ دەکەم کە زیاتر داوا بکەم!

خوای گەورە دەفەرموێت: ئایا بەوەندە ڕازی دەبیت بەقەدەر هەموو دونیات پێ بدەم، لەو ڕۆژەوە کە دروستم کردوە هەتا ئەو ڕۆژەی لە ناوم بردوە و دە ئەوەندەشی بۆ زیاد بکە.

پیاوەکەش دەڵێت: یارەبی تۆ خوایەکی گەورە و بە عیزەتیت و گاڵتەم پێ دەکەیت؟!

خوای گەورە پێکەنی لە وتەکەی، 'عبداللەی کوڕی مسعودیش' خوای لێ ڕازی بێت کاتێك لەم فەرمودەیە و دەگەیشتە ئەم شوێنە پێ دەکەنی، پیاوێك پێی وت: ئەی ئەبا عبدالرحمن، گوێم لێ بووە هەر چەند جارێك لەم فەرمودەیەدا گەیشتبیتە ئەم شوێنە پێکەنیویت بۆچی؟

---

١- صحيح مسلم و احمد.

عبدالله فەرمووی: گوێم لێ بووە پێغەمبەر ﷺ ئەم فەرمودەیەی چەندین جار بۆ هاوەڵان باس کردوە، هەر چەندێك گەیشتبێتە ئەم شوێنە ئەوەندە پێکەنیوە هەتا دانی دواوەی دەرکەوتون.

خوای گەورە بە پیاوەکە دەفەرموێت: من قادرم و دەتوانم بۆت جێ بەجێ بکەم.

پیاوەکە دەڵێت: با بچمە ناو خەڵکی بەهەشت.

خوای تعالا دەفەرموێت: بڕۆرە ناویان.

پیاوەکە بە ڕاکردن دەڕوات، ڕادەمێنێ لە بەهەشت، لە خەڵکی نزیك دەبێتەوە، دەگاتە کۆشکێکی ناوازە کە لە دوڕ دروست کراوە، دەکەوێت بە ڕووداو سوژدە دەبات، پێی دەڵێن: سەر هەڵبڕە، ئەوە چیتە؟ دەڵێت: خوای گەورەم بینی، یاخود لێم دەرکەوت!!

پێی دەڵێن: ئەوە تەنها خانو و کۆشکێکە لە کۆشکەکانت دەفەرموێت: دوای ئەوە پیاوێك دێت، کە ئەم پیاوە دەیبینێت، خۆی ئامادە دەکات بۆ سوجدە بردن پێی دەڵێن: ئەوە چی دەکەیت؟

دەڵێت: وا دەبینم تۆ یەکێکیت لە فریشتەکان.

ئەویش دەڵێت: من تەنها دەرگاوانێکم لە دەرگاوانەکانت بەندەیەکم لە بەندەکانت کە هەزار قاهرەمانی وەك من بەندەی تۆن.

ئیتر ئەم دەرگاوانە لە پێشیەوە ڕادەکات هەتا دەرگای کۆشکەکەی بۆ بکاتەوە، بەڵام چ کۆشکێك کە لە دوڕ و یاقوت دروست کراوە، بۆشی ناوی و سەقف و دەرگا و بەرگەکان و کلیلەکانیش لە یاقوت دروست کراون، گەوهەری سەوز کە ناوەکەی سورە دەدرەوشێتەوە، حەفتا دەرگای هەیە، هەموو دەرگایەك ئاماژەیە بۆ گەوهەرێك کە جیاوازە لە ڕەنگی گەوهەرەکەی تر، لە هەچ شوێنێك لەو شوێنانە تەخت و هاوسەر و خزمەتکاری لێیە، کەمترینیان حۆریەکە کە حەفتا بەرگی لەبەردایە، مۆخی ناو ئێسکەکانی دیارە لە کاتێکدا حەفتا بەرگی لەبەردایە، ئەم دیو و ئەو دیوی دەبینێت.

تەنها چاو هەڵبڕین و ڕوو تێ کردنێکی حەفتا ئەوەندە جوانتر دەبێت، پێـی دەڵێـت: حەفتا ئەوەندەی تۆزێ پێش ئێستا جوانتر بوویت، ئەویش بە مێردەکەی دەڵێـت: تـۆش بە هەمان شێوە حەفتا ئەوەندە ڕازاوە و جوانتر بوویت.

پێی دەڵێت: فەرموو...

موڵك و ماڵ و باخ و باخاتی تۆ سەد ساڵە ڕێیەکە چاو بڕی بکات[1].

## فراوانی دەرگاکانی بەهەشت



پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: نێوانی دوو دەرگای بەهەشت چل سـاڵە، پـڕاو پـڕی ئەو دەرگایەش خەڵکی دەچنە ژورەوە[2].

خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿جَنَّاتِ عَدْنٍ مُفَتَّحَةً لَهُمُ الْأَبْوَابُ﴾ (ص: ٥٠)

واتە/ چەند بەهەشـتێکی دەرگـا واڵا و لەسـەر پشـتە بۆیـان، ئامـادە و چـاوەڕوانی هاتنیانە.

ئەو قەرەباڵغیە لەسـەر ئەو دەرگـایە کە دروسـت دەبێـت، بەڵـگەیە لەسـەر زۆری و قەرەباڵغی ئەو خەڵکەی دەچنە بەهەشت.

دەرگاکانی بەهەشت بە بەردەوامی کراوەن.

عبـدالرحمنی کـوڕی سـاعدە 'خـوای لـێ ڕازی بێـت' دەفەرموێـت: مـن حەزم لە ئەسپ بوو، وتم یا رسول الله ﷺ ئایا لە بەهەشتدا ئەسپ هەیە؟

---

١- صحیح/ عبداللەی کوڕی مسعود ڕیوایەتی کردوە. لە صحیح الترغیب و الترهیب'دا هاتوە.

٢- صحیح/ أحمد.

فەرمووی: ئەگەر بچیتە بەهەشت و، خوای گەورە داخڵ بە بەهەشتت بکات، ئەسپت دەبێت لە یاقوتە دوو باڵی هەیە و دەفڕێت و دەتبات بۆ هەچ شوێنێك کە بتەوێت[1].

لە فەرمودەیەکی تردا، لە وەڵامی کەسێك کە فەرمووی: ئەگەر خوای تعالا بتخاتە بەهەشتەوە، ئەوە حەزی لێ بکەیت لەوێ دەستت دەکەوێت و ئەوەی چاوت ڕوون بکاتەوە پێت دەدرێت[2].

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: موسوڵمان ئەگەر لە بەهەشتدا حەزی لە منداڵ بوون بێت، خوای گەورە پێی دەدات، سك کردن و منداڵ بوون بە سەعاتێك دەبێت و وەك ئەوەی کە ویستی خۆی لەسەرە[3].

کاتێك پرسیار کرا لە عبداللەی کوڕی عباس: ئایا لە بەهەشتدا منداڵ دەبێت؟

فەرمووی: ئەگەر بیانەوێت ئەی بۆ نا[4]!!

لە ئەبو هورەیرەوە خوای لێ ڕازی بێت دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: کەمترین بەشێك کە بە دواینەکان دەدرێت کە دێنە بەهەشت، کەسێکە کە پێی دەوترێت: ئومێد و ئاوات بخوازە، ئەویش تەمەنا و ئومێد دەخوازێت، پێی دەوترێت: ئومێد و ئاواتەکانت خواست؟

دەڵێت: بەڵێ.

پێی دەوترێت: دوو چەندانەی ئەوەی ئاوات و ئومێدت بۆ خواستوە بۆ تۆیە و پێت دەدرێت[5].

---

١-'رواه الطبراني ورواته ثقات كما في 'صحيح الترغيب'.

٢- صحيح/ الترغيب و الترهيب.

٣- صحيح/ أحمد والترمذي و ابن ماجة.

٤- مسند أبي شيبة.

٥- صحيح مسلم.

## چێژەکانی جیهانی بینین

سێ جۆر هەن خەم و خەفەت لا دەبەن

ئاو و سەوزی و ڕوخساری جوان و شیرین

ئەمە وتەکەی ئەم شاعیرەیە:

ثلاثة تذهب عنا الحزن

الماء و الخضرة و الشكل الحسن

ئەمە بۆ دونیا بەم جۆرەیە، دەبێت بۆ بەهەشت چۆن بێت.

لە کاتێکدا لە بەهەشت هیچ خەم و خەفەتێکی تیا نیە، بەڵام مەبەست ئەوەیە کە لە بەهەشت باڵاترین پلەکانی بەهجەت و دڵخۆشی و سرور دەستی خاوەن و نیشتەجێکانی بەهەشت دەکەوێت.

باڵاترینیان بینین و چوونە خزمەتی پەروەردگارە.

با تەنها دوو نموونەی جوانیەکانی بەهەشت بهێنینەوە.

## حۆریەکانی بەهەشت

خوای گەورە دەفەرموێت: 'وحور عين كأمثال اللؤلؤء المكنون'.

بۆچی دەوترێت 'الحور'/ حور بە مانای ئەوەی چاو موحەیەر و سەرسام و مەدهۆش دەبێت.

'اللؤلـؤ الكنـون' واته وەك گەوهەر و نایـابێکی پـارێزراون کە هەرگیـز لە پێشـتر دەستیان لـێ نەدراوە و چـاوی کەسـیش نەیبینیـوون، دەسـتیان بەرنەکەوتـوە، چـاویش برینداری نەکردون، ئەو چێژ لە تۆ دەبینێت و تۆش لەو.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ئەگەر ژنێکـی ئەهلـی بەهەشـت ڕوخسـاری لە دونیـادا دەربکەوێت، نێوان زەوی و بەهەشت هەمووی دەبێـتە بۆنخۆشـی و ڕوونـاکی، لە نـاو قەدیەوە هەتا سەری باشترە لە دونیا و هەرچی لە دونیادایە[1].

جوانیەك نیە جێگیر بێت، هەینی بۆ هەینی زیاد دەکات، چاوەکان مەسـت دەکـات، وەك ئەوەی کە هەرگیز نەتبینیبێت!!

حۆریەکان لە هاتنی دونیا ئاخر و قیامەتیشـدا نـامرن، نە لە نەفـخەی یەکەم و دوای ئەوەش بۆ هەتا هەتایە دەژین لە بەهەشـتدا، چـونکە خـوای گەورە بـۆ مـانەوەی هەتـا هەتایی دروستی کردون نەك بۆ فەنا و تیا چوون، مردنی لەسەر نەنوسیون[2].

## بینینی خوای گەورە



خـوای گەورە هێزێکـی بـێ وێـنە و زۆر دەبەخشـێتە ئەهلـی بەهەشـت، شـێوە و سیفەتیان بە تەواوەتی دەگۆڕێت، هەتا بەرگەی بینینی خوای تەعـالا بگـرن، چێژێکـی بێ سنور لە بینینی حەق تەعالا دەبینن، باڵاترین نیعمەتەکانی بەهەشتە، ئەو زیـادەیەیە کە خوای گەورە لە قورئاندا باسـی کـردوە و دەفەرموێـت: ﴿لِلَّـذِينَ أَحْسَـنُوا الْحُسْـنَىٰ وَزِيَادَةٌ ...﴾ (یونس: ٢٦)

---

١- صحيح مسلم والبخاري و احمد والترمذي و ابن ماجة.

٢- کتێبی 'حادي الأرواح' ل٢٩.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: کاتێك ئەهلی بەهەشت ڕۆشتنە بەهەشت و ئەهلی دۆزەخیش بۆ دۆزەخ، بانگ کەرێك بانگ دەکات: ئەی ئەهلی بەهەشت وادە و پەیمانێکتان هەیە لە خزمەت پەروەردگارا، دەڵێن چی‌یە؟

ئایا شتێك ماوە پێمان نەدا، چاکەکانی بۆ زیاد کردین و ڕووخساری شیرین و سپی و جوان کردین و داخڵ بە بەهەشتی کردین و لە ئاگری دۆزەخ دەربازی کردین، ئیتر دەبێ چی ترمان پێ بدات؟!

ئیتر پەردە لا دەبرێت و سەیری خوای گەورە دەکەن، سوێند بەخوا بەخششێ کە خوای گەورە پێی داون هیچیان لەو بینینە شیرینتر نیە، دڵ و چاویان ڕۆشن دەبێتەوە و ئۆقرە دەگرن[1].

شێخ حەسەنی بەصری دەفەرموێت: وەختێ خوای تەعالا تەجەلی دەکات بۆ ئەهلی بەهەشت، ئەهلی بەهەشت هەموو نیعمەت و خۆشیەکانی بەهەشتیان بیر دەچێتەوە!!

هەموان لە بەهەشتدا خوای گەورە دەبینن و کەسی لێ بێ بەش ناکرێت، بەڵام بینینی کەسێ بۆ کەسێکی تر جیاوازە وەك جیاوازی نێوان زەوی و ئاسمانەکان.

بینین و چێژ بینین لە خزمەت پەروەردگاردا پەیوەستە بە چێژی ناسین و خۆشەویستی بەندە لە دونیا بۆ خودای گەورە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ الْأَبْرَارَ لَفِي نَعِيمٍ (٢٢) عَلَى الْأَرَائِكِ يَنْظُرُونَ (٢٣) تَعْرِفُ فِي وُجُوهِهِمْ نَضْرَةَ النَّعِيمِ (٢٤) يُسْقَوْنَ مِنْ رَحِيقٍ مَخْتُومٍ (٢٥) خِتَامُهُ مِسْكٌ وَفِي ذَلِكَ فليتنا في المتنفسون﴾ (لانفطار: ٢٢-٢٦)

واتە/ بەڕاستی چاکان لەناو خۆشی و بەهرەیەکی ئێجگار زۆردان لە بەهەشتدا، لەسەر کورسی و قەنەفە ڕازاوەکانی بەهەشتدا دانیشتون و تەماشای ئەو هەموو ناز و

---

١- صحيح/ أحمد وابن ماجة.

نیعمەت و بەهرەی بەهەشتە ئەکەن کە بۆیان ئامادە کراوە. لە ڕوخسـاریاندا ڕووگەشـی و خۆشی بەهەشت دەبینی و دەزانیت. لە شەرابێکی پـاك و صـاف و سـەرمۆریان پـێ دەنۆشێ "واتە دەستی هـیچ کەسێکی لـێ نەکەوتـوە و چاکـان خۆیـان سـەرەکەی لا دەبەن".

دوا قومی بۆنی میسکی لێ دێـت. جـا ئەوانەی پێشـبڕکێی و پێشدەسـتی دەکەن بـا لەوەدا پێش دەستی و کێبەڕکێ بکەن و هەوڵ بدەن بۆ کار و کردەوەی چاك.

ئەم پاداشتە گەورەیە لە پای ئەوەی ئەمانە لە دونیادا چاویـان لە حەرامەکـان گـرتەوە و، نەفسیان پاراست لە ئارەزوو بازی و، هەمیشە خەڵوەتیـان دەویسـت هەتـا زیـاتر لە خزمەتی پەروەردگاردا بن، بە تایبەتی لە شەوە تاریکەکاندا چرای دڵیان دادەگیرسـاند بە نوری شەو نوێژ و موناجات.

## چێژە دەروونی و ڕۆحیەکان



دیوێکی شارەوەیە و زۆر تیشکی ناخرێتە سەر، کە چێـژە دەروونیەکـانە و ئـاوی دڵ دەدات.

خوای گەورە لەسەر زوبانی ئەهلی بەهەشت دەفەرموێت: ﴿وَقَالُوا الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَذْهَبَ عَنَّا الْحَزَنَ...﴾ (فاطر: ٣٤)

سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە خەم و خەفەتی نەهێڵاین.

ئیـتر خەمـی ڕزق و خەمـی هەژاری و خەمـی موسـیبەت و نەخۆشـی و خەمـی جێهڵان و نەمان ناخۆن.

ئیبراهیمی تەیمی دەفەرموێت: ئەوانەی بێ خەمن لە دونیا دەبێت بترسن لەوەی ئەهلی ئاگر بن، چونکە ئەهلی بەهەشت وتیان: ﴿وَقَالُوا الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَذْهَبَ عَنَّا الْحَزَنَ...﴾ (فاطر: ٣٤)

وە پێویستە ئەوانەی کە شەفەقەت و بەزەییان نیە زۆر بترسن کە لە ئەهلی بەهەشت نەبن چونکە ئەهلی بەهەشت دەڵێن: ﴿قَالُوا إِنَّا كُنَّا قَبْلُ فِي أَهْلِنَا مُشْفِقِينَ﴾ (الطور: ٢٦)

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: لە ڕۆژی قیامەت ئەو کەسە دێنن کە قورسترین و خراپترین نارەحەتی و عەزیەتی لە دونیادا بینیوە و، کالاّ و ڕەنگی بەهەشتی لێ دەنیشێت، پێی دەوترێت: ئەی نەوەی ئادەم!!

ئایا هەرگیز ناخۆشی و نارەحەتیت لە دونیادا بینیوە؟!

دەڵێت: نەخێر واللە هیچ نارەحەتیەکم نەبینیوە[1].

## بەهەشت ڕق و ئیرەیی بردنی تیا نیە



خوای گەورە باسی ئەهلی بەهەشت دەکات و دەفەرموێت: ﴿وَنَزَعْنَا مَا فِي صُدُورِهِمْ مِنْ غِلٍّ إِخْوَانًا عَلَىٰ سُرُرٍ مُتَقَابِلِينَ﴾ (الحجر: ٤٧)

واتە/ هەر قین و ڕق و دژایەتیەك هەبێت کە بەهۆی ژیان و ژیواری دونیاوە پەیدا بووبێ لەوێ لە سنگیانی لا دەبەین، لە بەرامبەر یەکتر بە برایانە لەسەر تەخت دادەنیشن، کە شێوەی دانیشتنی ئاوا باشترین ڕێز و حورمەتە بۆ یەکتر.

---

١- صحيح مسلم.

'ونزعنا' تەعبیرە لە داهاتوو بە لەفزی ڕابردوو دێت بـۆ بە ئاگـا هـاتنەوە لەوەی کە بە دڵنیاییەوە ڕوودەدات.

پێغەمبەر ﷺ لە وەسفی ئەهلی بەهەشتدا دەفەرموێت: دڵیان لەسەر دڵی یەك کەسـە و هیچ جیاوازیەکیان نیە و هیچ ڕق و حەسادەتێکیان نیە[1].

ئەم پـاك بـوونەوە و پـاڵفتە لە 'قەنـتەرە' ڕوودەدات، 'قنطـرة' شـوێنێکە لە نێـوان بەهەشت و دۆزەخ.

پردێکە کە زانایان ناوی دەنـێن بە پـردی سـیراطی دووەم، کە ئەم پـردی 'قەنـتەرە'یە دواین قۆناغە پێش چوونە بەهەشت دانراوە.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ئیمانداران لە دۆزەخ دەربازیان دەبێت، بەڵام لە 'قەنـتەرە' ڕادەگیرێن، کە قەنتەرە لە نێوانی بەهەشت و دۆزەخدایە، موسوڵمانان مـافی یەکتریـان لەسەرە، واتە لە دونیادا مافی یەکتریان پێشێل کـردووە، ئیـتر لەوێـدا پـاك دەکـرێنەوە و گەردن ئازادی و ماف دان بە یەکتری ڕێی بۆ دەکرێتەوە و ڕێك دەبنەوە، ئیـتر مۆڵەتیـان دەدرێت کە بچنە بەهەشتەوە[2].

بەهەشت ترس و بیمی تێدا نیە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿... وَهُمْ مِنْ فَزَعٍ يَوْمَئِذٍ آمِنُونَ﴾ (النمل: ٨٩)

واتە/ ئیتر لە ترس و بیم پارێزراو دەبن.

لە بەهەشت ڕازامەندی تەواوی خوایی بەدەست دێنن و هەرگیز لێتان تورە نابێت.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێـت: خـوای تەعـالا بە ئەهلـی بەهەشـت دەفەرموێـت: ئەی خەڵکی بەهەشت!!

---

١- صحیح البخاري و مسلم.

٢-'صحیح البخاري'.

دەڵێن: "لبيك ربنا وَسَعَدَيكَ وَالخير فی يديك"

خوای گەورە دەفەرموێت: ئایا ڕازی بوون؟

دەڵێن: یارەبی ئەی چۆن ڕازی نەبین؟! تۆ هەموو شتێکت پێ داوین، کە نەتداوە بە هیچ کەسێکی تر، خوای تەعالا دەفەرموێت: ئایا باشتر لەوەتان پێ بدەم؟

دەڵێن: یارەبی! چ شتێك لەوەی پێت داوین باشترە؟!

خوای تەعالا دەفەرموێت: من ڕازیم لێتان و هەرگیزا و هەرگیز لێتان زویر نابم[1].

خوای تەعالا دەفەرموێت: ﴿وَعَدَ اللَّهُ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَمَسَاكِنَ طَيِّبَةً فِي جَنَّاتِ عَدْنٍ ۚ وَرِضْوَانٌ مِّنَ اللَّهِ أَكْبَرُ ۚ ذَٰلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ﴾ (التوبة: ٧٢)

واتە/ خوای تەعالا بەڵێنی بە پیاو و ژنە باوەڕدارەکان داوە بە باخ گەلێك لە بەهەشتدا، لە ژێر کۆشك و تەلار و دار و درەختەکانیاندا ڕووبار گەلێك دێن و دەچێت، بە هەتا هەتایش لەوێ دەمێننەوە، بێ لەوەش چەندین خانوو بەرەی پاك و خاوێنی لەناو بەهەشتە هەتا هەتاییەکاندا بۆ ئامادە کردوون، سەرەڕای ئەوانە، ڕەزامەندی خوا لە هەمووی گەورەترە و خۆشترە، ئەوە بەختیاری و سەرفرازی گەورە و مەزنە.

عبداللەی کوڕی عباس دەفەرموێت: گەورەترە لەوەی لە وەسف کردن بێت و بتوانرێت وەسف و ستایش بکرێت!!

قليل منك يكفيني ولكن

قليلك لا يقال له قليل

**************************

---

١- صحيح مسلم و البخاري و أحمد الترمذي.

کەمێکی تۆم بەسە بەڵام

کەمی تۆ پێی ناوترێت کەم!

گەورەتـرین فریشـتەی بەهەشـت نـاوی 'رضـوان'ە، ڕیضـوان لە ڕازی بـوونەوە دەرهێنراوە و هاتووە، بۆ ئەوەی یەکەم پێشوازی ئەهلی بەهەشت: داباریني ڕازی بـوون بێت بە مانا و ناوەڕۆك و بەبێ سنور.

## ئەوەی شاراوەیە و باس نەکراو گەورەترو زیاترە



جۆرە فراوان و گەورەکەی نیعمەتەکانی بەهەشت لێمان شاراوەیە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فلاَ تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّا أُخْفِيَ لَهُم مِّن قُـرَّةِ أَعْـيُنٍ جَـزَاءً بِمَـا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ (السجدة: ١٧)

هیچ کەسـێك نـازانێ خـوای گەورە چـی لە نـاز و نیعمەتـی شـاراوەی بـۆ ئامـادە کردوە... پاداشتی ئەو کارە باشانەی کە لە دونیادا کردیان.

هەتا پاداشتیش باڵاتر بێت، زیاتر نادیار و شـاراوەیە لە لای ئـێمەی ئەهلـی دونیـا، چونکە نە لێی حاڵی دەبین نە دەزانین چیە؟

کەعب وەڵامی حەزرەتی عومەری کوڕی خەتابی دایەوە 'خوایان لێ ڕازی بێـت' لە کاتێکدا پرسیاری پلە جیاوازەکانی ئەهلی بەهەشتی لێ کـرد، کەعـب فەرمـووی: ئەی ئەمیری ئیمانداران!!

شتانێکی تێدایە نە چاو بینیـویەتی، نە کەس بیسـتویەتی. خـوای تەعـالا کۆشـك و ناوچەی زۆر بەرفراوانی لە بەهەشـت دروسـت کـردوە کە پـڕن لە نـاز و نیعمەتەکـانی خوا، ئەو شوێنانە شاراوەن بۆ ئیمانداره پلە بەرزەکان، کە تەنانەت حەزرەتی جوبرەئیـل

و بێجگە لەویش لە فریشتەکان نەیان بینیوە، پاشـان کەعـب ئەم ئـایەتەی خوێنـدەوە: ﴿فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّا أُخْفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾[1] (السجدة: ١٧)

## چۆن بگەینە بردنەوە گەورەکە و بەهەشتی هەتا هەتایی؟!



**١) بە کردەوەیە نەك بە وتە و دروشم!** پێغەمـبەر ﷺ دەفەرموێـت: سـوێند بەو خوایەی گیانی منی بەدەستە، هەموتان دەچنە بەهەشتەوە، تەنهـا ئەوانە نەبێـت کە لێـی هەڵدێن، وەك وشترێك کە بەلەسە دەبێت و هەڵدێت، وتیـان: یـا رسـول الله ﷺ کەس هەیە لە بەهەشت هەڵبێت؟

فەرمـووی: ئەوەی فەرمانەکـانم جـێ بەجـێ بکـات دەچێـتە بەهەشـت، ئەوەش سەرپێچیم بکات ئەوە هەڵهاتوە[2].

شێخ حەسنی بەصری و بێجگە لەویش فەرموویان: هەندێ لە خەڵکی وتیـان ئـێمە خوامان خۆش دەوێت، خوای تەعالا تاقی کردنەوە بەم ئـایەتە ﴿قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ ...﴾ (آل عمران: ٣١)

واتە/ ئەگەر ئێوە خواتان خۆش دەوێت، شوێن کەوتەی مـن بـن پێغەمـبەر ﷺ ئەوە خوا خۆشی دەوێن، خراپترین هەورە بروسکە ئەوەیە کە بـارانی لەگەڵ نیە، وتەی بـێ کردار مەڵێ!

---

١- صحيح رواه الطبراني.

٢- صحيح.

درەختی بێ بەر مەبە، دەگونجێت ڕووناکی و جوانی بەهەشت ببینیت و شوێن کەوتەی حەق نەبیت؟!

﴿... وَتَرَاهُمْ يَنظُرُونَ إِلَيْكَ وَهُمْ لاَ يُبْصِرُونَ﴾ (الأعراف: ١٩٨)

## ٢) چرکە ساتێك گرنگە!

ڕەنگە بەهەشت لە دەست بدەیت بە هۆی چرکە ساتی گوناهێکەوە!

عیسای بە ستامی دەفەرموێت: بۆ هەموو بازرگانەکانی ئاخیرەت و قیامەت و عاشقەکانی داهاتوویەکی نزیك!

"شەو و ڕۆژ سەرمایە گرنگەکەی ئیماندارن، بردنەوە و قازانج بەهەشتە و، دۆڕان و خەسارەت مەندیش دۆزەخە".

## ٣) سەیرە .... سەیر

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: نەمبینیوە وەك ئاگری دۆزەخ ترسناك کەچی لە جیاتی ئەوەی لێی هەڵبێت دەخەوێت و گوێی ناداتێ، هەروەها وەکو بەهەشت ئەوانەی دەبوو بە هەڵە داوان داوایان بکردایە، کەچی خەوتوون و بێ باکن لێی[1].

یەحیای کوڕی مەعاز دەفەرموێت: بەنی ئادەم هەژارە!

ئەگەر وەك چۆن لە هەژاری و کەم دەرامەتی دەترسێت، ئاوا لە ئاگری دۆزەخ بترسایە، دەچووە بەهەشتەوە.

---

١- ئیمامی ترمذي.

## ٤) ئارامگرتنێکی ناوازە!

ئارام گرتن کلیلێکی پێویستە بۆ کردنەوەی دەرگاکانی بەهەشـت، هەر وەکـو ئەوەی لە دەرگـای بەهەشــت نوسرابێــت 'ئەوەی ئـارام بگرێـت دەپەڕێـتەوە' پێغەمـبەر ﷺ دەفەرموێت: ئەگەر ئێوە خشڵ و حەریری بەهەشتان دەوێت، لە دونیادا مەیپۆشن[1].

## ٥) شوێنەکان دیاری کراون

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ئامادەی وتار و نوێژی هەینـی بـن و لە ئـیمامەوە نزیـك بن، کەسی وا هەیە بەردەوام دور دەکەوێتەوە هەتا دوا دەخرێت لە بەهەشتدا با بشـچێتە ناویەوە[2].

کێبەڕکـێ لە شـتە بەنرخەکانـدایە، لە بەهەشـت پـڕ کێشـتر و بە بەهـاتر نـیە، ئەگەر تەواوی هەوڵی بۆ نەدەیت و گران بەهـا تـری پێشـکەش نەکەیـت، لە ڕۆژی قیـامەت دەبێتە هۆکاری پەشیمانی و مایە پوچ بوون.

## ٦) یان بەهەشت یاخود ئاگری دۆزەخ

یەزیدی ڕەقاشی ڕۆیشت بۆ لای عومەری کوڕی عبدالعزیز و پرسیاری لێ کـرد کە ئامۆژگاری بکات و وتی: ئەی ئەمیری ئیمانداران! تۆ یەکەم خەلیفە نیت کە دەمریت!

حەزرەتی عومەر دەستی کرد بە گریان و وتی: زیاترم پێ بڵێ ئەی یەزید.

وتی: ئەی ئەمیری ئیمانداران!

لە نێوان تۆ و حەزرەتی ئادەمدا باوکێك هەیە کە مردوە!

---

١- صحيح أحمد النسائي و الحاكم.

٢- مسلم و بخاري.. صحيح.

دەستی کرد بە گریان و وتی زیاترم پێ بڵێ ئەی یەزید، وتی: ئەی ئەمیری ئیمانداران! لە نێوان تۆ و مردندا وادەیەکی دیاری کراو نیە!

وتی: زیاترم پێ بڵێ!

وتی: ئەی پێشەوای باوەڕدارانە!

لە نێوان بەهەشت و دۆزەخدا پلە و مەنزلەیەکی تر نیە!

ئیتر دوای ئەوە بێ هۆش کەوت.

## ٧) داوای فیردەوس بکەن

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ئەگەر داواتان لە خوای گەورە کرد، داوای فیردەوس بکەن، چونکە فیردەوس ناوەڕاست و لا سەرووی بەهەشتە، لای سەرەوی عەرشی خوای گەورەیە، لە فیردەوسەوە ڕووبارەکانی بەهەشت هەڵدەقوڵێن[١].

## ٨) ڕێگرەکان

ئەبو حازم سەلمەی کوڕی دینار دەڵێت: "ئیبلیس چیە!! سوێند بەخوا ئەگەر سەرپێچی بکەیت هیچ زیانێکت پێ ناگات، فەرمانەکانی جێ بەجێ کرا هیچ سودێکی نەبوو".

ئەبو سولەیمانی دارانی دەڵێت: "بچوکترین دروستکراو بەلای منەوە ئیبلیسە، ئەگەر خوای گەورە فەرمانی پێ نەکردینایە کە پەنا بگرین پێی لە فێڵ و خراپیەکانی شەیتان، ئەوە باکم لێی نەبوو، شەیتانی جن و شاراوە ئاسایتر و ئەهوەنترە بە لامەوە لە شەیتانەکانی مرۆڤ، کە مرۆڤە شەیتانەکان پەیوەست دەبن پێمەوە دەمخزێننە ناو

---

١- صحيح رواه أحمد و البخاري.

گوناه و تاوانەوە، بەڵام شەیتانەکانی جین ئەگەر پەنـام گـرت بەخـوا دور دەکەونەوە و ناوەستن لە لات".

## ٩) فەزڵ و چاکەی خوایە نەك هی تۆ!

ئەبـو سـەعیدی خـودری 'خـوای لـێ ڕازی بێـت' دەفەرموێـت: پێغەمـبەر ﷺ دەفەرموێت: هیچ کەس ناچێتە بەهەشتەوە ئیلا بە ڕەحمی خوا نەبێت وتیـان: تەنـانەت تۆش یا رسول الله ﷺ؟!

فەرمـووی: تەنـانەت منـیش، ئـیلا دەبێـت خـوای گەورە بە ڕەحمەتـی خـۆی دامپۆشێت[١].

## ١٠) خۆت پلەی خۆت دیاری بکە

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: بەهەشت سەد پلەیە، لە نێوان دوو پلەدا، نێوانی ئاسـمان و زەویە[٢].

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ئەهلی بەهەشـت ئەهلـی ژور و غورفەکـانی سـەرەوەیان دەبینن، هەر وەکو چۆن ئەستێرەی ئاسمان دەبینن، کە چەندە نێوانیان جیاوازە[٣].

هەنـدێ لە ژنە صـاڵحەکان ڕۆژە زۆر گەرمەکـان بە ڕۆژوو دەبـوون، پێیـان دەوتـن بۆچی؟

دەیانوت: کاتێك کە نرخ دابەزی هەموو کەسێك دەیکڕێ!

---

١- رواه أحمد بأسناد حسن.

٢- صحيح.

٣- صحيح مسلم والبخاري.

مەبەستیان لەوە بـوو، بەشـداری جـۆرە کـارێکی خێـری بـن کە کەم کەس توانـای هەبێت بەسەریاندا.

### ١١) کاروانی یەکەمینەکان.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: من یەکەم کەسم کە مۆڵەتی سـوجدە بـردنم دەدرێـت لە ڕۆژی قیامەتدا، وە من یەکەم کەسم کە مۆڵەتی سەر بەرز کردنەوەم دەدرێت[١].

## شەیدایانی بەهەشت



'بەهەشت لە لاستیکی نەعلەکانتان لێتان نزیك ترە'[٢].

بەهەشت داخوازی کردارە

١) زیکری خوا: زیکر خۆشەویسترین عیبادەتە لە لای خـوا، تەنهـا عیبادەتیشـە کە ئەهلی بەهەشتی لەسەر بەردەوام دەبێت لە دوای چوونە بەهەشت.

لە جابری کوڕی عبداللەوە 'خوای لێ ڕازی بێت' دەفەرموێت: بیسـتم لە پێغەمـبەر ﷺ دەفەرموێت: ئیلهامی تەسـبیحات و سـوپاس گـوزاری خـوای گەورە دەکرێـت لە بەهەشتدا هەر وەکو چۆن ئیلهامی هەناسە دان دەکرێت[٣].

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: لە شەوی ئیسرا و میعراجدا گەیشتم بە ئیبراهـیم و وتـی: ئەی موحەمەد سەلامی من بگەیەنە بە ئومەتەکەت، پێیـان بڵـێ بەهەشـت و زەویەکەی

---

١- صحیح ئیمامی أحمد.

٢- صحیح البخاري و أحمد.

٣- صحیح أحمد.

پاك و جوانە، ئاوەكەی شـیرینە، زەویەكەی سـافە، نەمامەكـانی كە دەیچێـنن بـریتیە لە وتنی: "سبحان الله والحمدلله و لا إله الا الله والله أكبر"[1].

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: هەموو درەختێكی بەهەشت قەد و لقەكانی پێكهـاتووە لە ئاڵتون.

پێغەمــبەر ﷺ دەفەرموێــت: لە بەهەشــتدا درەختێــك هەیە ئەســپ ســوارێك بە خێرایەكی زۆر بڕوات بە ژێر سێبەرەكەیدا، بە سەد ساڵ دەیبڕێت[2].

## جۆرەكانی زیكر دابەش دەبن بۆ دوو جۆر



١) زیكرە دیاری كراوەكان

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: گەورەی ئیستیغفار یـاخود گەورەتـرین ئیسـتیغفار ئەوەیە كە بڵێیت: "اللهم أنت ربي لا إله إلا أنت، خلقتني وأنا عبدك، وأنا على عهدك وعـدك ما استطعت، أعوذ بك من شر ما صنعت، أبوء لك بنعمتك علي، وأبـوء لـك بـذنبي، فاغفر لي فإنه لا يغفر الذنوب إلا أنت"، هەچ كەسـێک بە ڕۆژدا بیڵێـت و بە یەقیـنەوە بیخوێنێت و بمرێت لەو ڕۆژەدا پێش ئێـوارە دەچێـتە بەهەشـتەوە، وە هەچ كەسـێک لە شەودا بیخوێنێـت و بە یەقـین و دڵنیـایی بیڵێـت و بمرێـت پـێش ئەوەی ڕۆژ ببێـتەوە، ئەهلی بەهەشتە[3].

ئەم فەرموودەیە كۆكەرەوەی هەموو ماناكانی تەوبەیە مەترسـی گونـاه زۆر گەورەیە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَكُلًّا أَخَذْنَا بِذَنبِهِ ...﴾ (العنكبوت: ٤٠)

---

١- حسن/ الترمذي.

٢- مسلم و بخاري صحيح.

٣-'صحيح البخارى و احمد و النسائى'.

هه‌ چ كه‌س به‌ گوناهی خۆیه‌وه‌ گیرۆده‌ ده‌بێت.

وه‌ختێک دڵ بێ ئاگابوو له‌وه‌ی دان بنێت به‌ نیعمه‌ته‌كاندا، سه‌رقاڵی نیعمه‌ته‌كان ده‌بێت و نیعمه‌ت به‌خشی له‌بیر ده‌كات، كه‌ غافڵ بوو گوناهه‌كانی زیاد ده‌بن، هه‌تا دڵی ڕۆشن ده‌بێت، یاخود عوجب و خۆ به‌زل زانی ده‌یگرێت و تیا ده‌چێت.

## ئایه‌تێكی زۆر گه‌وره‌



پێغه‌مبه‌ر ﷺ ده‌فه‌رموێت: هه‌چ كه‌سێک 'آیة الكرسی' بخوێنێت له‌ دوای هه‌موو نوێژێكی فه‌رز، هیچ شتێک ڕێگر نابێت له‌به‌رده‌میدا بۆ چوونه‌ به‌هه‌شت ئیلا ئه‌وه‌ نه‌بێت كه‌ بمرێت[1].

زه‌نونی میسری ده‌فه‌رموێت: ئه‌وه‌ی ده‌یه‌وێت فێری مل كه‌چی و ته‌وازوع ببێت، با نه‌فسی ڕووبكاته‌ گه‌وره‌یی و عه‌زه‌مه‌تی خوای گه‌وره‌ ئه‌و كاته‌ پاک ده‌بێته‌وه‌ و ڕێک ده‌بێته‌وه‌، ئه‌وه‌ی سه‌یری سوڵتان و ده‌سه‌ڵاتی خوای گه‌وره‌ بكات، سوڵتان و ده‌سه‌ڵاتی نه‌فسی خراپه‌كاری ده‌ڕوات، چونكه‌ هه‌موو ده‌رونه‌كان هه‌ژارن له‌ به‌رده‌م هه‌یبه‌تی خوای تعالادا.

## دوعای چوونه‌ ناو بازاڕ



پێغه‌مبه‌ر ﷺ ده‌فه‌رموێت: هه‌چ كه‌سێک ڕۆشته‌ بازاڕه‌وه‌ با بڵێت: "لا إلـهَ إلاَّ اللَّهُ وحْدهُ لاَ شَرِيكَ لهُ، لَـهُ المُلْكُ، ولَهُ الحمْدُ، وَهُو عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ"، خوای گه‌وره‌

---

١- صحیح النسائی.

هەزار هەزار 'ملیۆنێـک' چـاکەی بـۆ دەنوسـێت، هەزار هەزار گونـاهی لەسـەر دەسڕێتەوە، هەزار هەزاریش پلەی بەرز دەکرێتەوە لەلای خوا و، مـاڵ و خانویەکیشـی لە بەهەشتدا بۆ دروست دەکرێت[1].

موسای کوڕی موغەیرە دەفەرموێـت: مـوحەمەدی کـوڕی سـیرینم بینـی دەچـووە بازاڕەوە بە نیوەڕوان، الله اکبر و سبحان اللهی دەکرد و زیکری خوای دەکرد، پیاوێـک پێی وت: ئەی ئەبوبەکر!!

ذیکری خوا لەم کاتەدا؟!

فەرمووی: ئەم سەعاتە و ئەم شوێنە شوێنی بێ ئاگایی و غەفڵەتە.

موحەمەدی کوڕی سیرین بوو بە خاوەنی ئیمانێکی ئەوەندە بەهێز و کاریگەر، هەتـا خەڵکی ئیمانیان لێ وەردەگرت بە ئاگـا دەهـاتنەوە، ئەبـو عەوانە دەڵێـت: مـوحەمەدی کوڕی سیرینم بینی لە بازاڕ، هەچ کەسێک دەیبینی زیکری خوای دەکرد.

نهێنی ئەو پاداشتە گەورەیە بریتی یە لەوەی زیکری خوا بکەیـت لە ناوەڕاسـتی بـێ ئاگایی و غەفڵەتدا.

چونکە عیبادەت و زیکر لە ناو بازاڕدا زۆر قورس و گرانە لەسەر نەفس و دەروون.

ڕۆژووی پێغەمبەر ﷺ لە مانگی شەعبان دا لەبەر ئەوە بـووە، چـونکە خەڵکـی بـێ ئاگـا دەبـن لێـی و فەرامۆشـی دەکەن، چـونکە شـەعبان کەوتـۆتە نێـوانی ڕەجەب و ڕەمەزانەوە.

شەو نوێژ خەڵکی لێی بێ ئاگـان: پێغەمـبەر ﷺ دەفەرموێـت: نـزیکترین کـات کە پەروەردگار لە بەندەکانیەوە نزیکە کۆتایی نیوە شـەوە، ئەگەر توانیـت لەو کەسـانەبە کە زیکری خوا دەکەن لەو سەعاتەدا[1].

---

١ - حسن رواه احمد و الترمزی و ابن ماجه و الحاكم عن عبدالله بن عمر.

پێغەمبەر علی الله علیه وسلم دەربارەی عیبادەت و گەورەیی زیکر و عیبادەت لە کاتی بێ ئاگایی و غەفڵەتدا دەفەرموێت: عیبادەتێک لە کاتی هەرەج و فیتنەدا وەکو هیجرەت وایە بۆ لای من[٢].

## پرسیار و داوای بەهەشت



پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: هەر کەسێک داوای بەهەشت لە خوای گەورە بکات سێ جار، بەهەشت دەڵێت: خودایە بیخەرە بەهەشتەوە، وە هەر کەسێک سێ جار پەنا بگرێت بە خوا لە ئاگری دۆزەخ، ئاگری دۆزەخ دەڵێت: خودایە پەنای بدە لە ئاگر[٣].

٢-زیکری زۆر زۆر....

'سبحان الله و بحمده، عدد خلقه، ورضا نفسِهِ وزِنَةَ عَرْشِهِ، و مداد کلماته'.

مەعازی کوڕی جەبەل دەفەرموێت: کۆتا وشەکان کە پێغەمبەر ﷺ دوای ئەوە وەفاتی کرد، ئەوە بوو وتم: یارسول الله ﷺ کام کردارە لەلای خوا خۆشەویستە؟

فەرمووی: بمریت و زوبانت پاراوبێت بە زیکری خوا[٤].

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: هەر کەسێک کۆتا وشەی 'لا إله إلا الله' بێت، دەچێتە بەهەشتەوە[٥].

---

١- صحیح ترمزی و نسائی وحاکم.

٢-'صحیح/ الطبراني'.

٣-'صحیح الترمزی و النسائی و الحاکم'.

٤-'حسن صحیح'.

٥- صحیح/ احمد و ابوداود و حاکم.

# نوێژ



پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: پێنج فەرزەی نوێژ کە خوای تەعالا نوسینی لەسەر بەندەکانی، هەر کەسێک جێبەجێیان بکات و نەیانفەوتێنێت و کەمتەرخەمی نەکات بەرامبەریان، خوای گەورە پەیمانێکی پێ دەدات کە بیخاتە بەهەشتەوە، ئەوەی جێ بەجێیان نەکات خوای باڵادەست پەیمانیان پێ نادات، ئەگەر ویستی سزایان دەدات و ئەگەر ویستیشی دەیانخاتە بەهەشتەوە[1].

# ڕۆژوو



پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: هەر کەسێک بە ڕۆژوو بێت و کۆتایی بکات دەچێتە بەهەشتەوە[2].

پەیوەندی نێوان بەهەشت و بەخشین لە ڕێی خوادا، بەخشین تەنها لەبەر خوا زۆر ڕوونە، خوای گەورە نەفس و ماڵی لە ئێمە دەوێت هەتا بیبەخشین بەخوا، پاداشتەکەشی بەهەشتە.

ڕەخنەیان لە سەهلی کوڕی عبداللەی مەروزی گرت لەوەی کە زۆر زۆر دەبەخشێت، ئەویش نموونەیەکی واقعی جوانی فەرموو کە وتی: ئەگەر کەسێک ماڵەکەی بگوازێتەوە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر، ئایا لە خانووی یەکەمدا هیچ شتێک بەجێ دەهێڵێت؟!.

---

١-'صحيح احمد و ابوداود و النسائي و ابن ماجه و ابن حبان و الحاكم'.

٢-'صحيح'.

حەکیمی کوڕی حیزام، 'دار الندوة' وەک شەرافەتێک موڵکی ئەو بـوو، فرۆشـتی بە سەد هەزار دینار، لە ڕیوایەتێکی تردا هاتوە بە چـل هەزار دینـار، زوبیـر پێـی وت: تـۆ ڕێزی قوڕەیشت فرۆشت، حەکیم وتی: 'کوڕی برام!'

ڕێز و گەورەیی ڕۆشت و نەما، ڕێز و گەورەیی بە تەقوا و لەخوا ترسـیە، مـن کـاتی خۆی لە نەفامیدا 'دار الندوة'م کڕی بە مەشکە و کوپەیەک عارەق، ئێستا تـۆ بە شـاهید بە ئەو پارەیە کە دەیبەخشم لە ڕێی خوادا خانویەکی لە بەهەشت پێ دەکڕم.

## (جهاد) لە ڕێگەی خوادا



لە جەنگی بەدردا، پێغەمبەر ﷺ هـانی خەڵـکەکەی دەدا لەسـەر جەنـگ لە پێنـاوی خوادا و فەرمووی: بەو خوایەی گیانی منی بەدەستە! هەچ کەسێک ئەمـڕۆ بجەنگێـت و ئارام بگرێت و بکوژێت خوای گەورە دەیخاتە بەهەشتەوە، عومەیری کوڕی حەمـام 'خوای لێ ڕازی بێت' چەند دەنکە خورمایەکی لەدەسـتدا بـوو دەیوسـیت بیـانخوات، فەرمووی: بخ بخ! ئایا نێوانی من و ڕۆشتنە بەهەشت و کـوژران بەدەسـتی ئەوانە، ئەم خورمایانەیە، دەنکە خورماکانی فڕێ دا و جەنگی کرد هەتا شەهید بوو.

## دایک



لە مەعاویەی کوڕی جەهەمی ئەسلەمیەوە دەفەرموێت: ڕۆشـتمە خزمەتـی ڕەسـول الله ﷺ و وتم: یا ڕەسول الله ﷺ: من دەمەوێت لە خزمەتـدا بـێم بـۆ جیهـاد و تەنهـا لەبەر خاتری خوا و ڕۆژەکانی قیامەت ئەم کارە دەکەم.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ماڵ وێران ئەی تۆ دایکت لە ژیاندا نیە؟!

وتم: بەڵێ لە ژیاندایە.

فەرمووی: بگەڕێرەوە و چاکە بکە لەگەڵ ئەو.

دەڵێت لە ڕێگەیەکی ترەوە هاتمەوە خزمەتی و وتم: یا رسول الله ﷺ، من لەبەر ئەوە لە خزمەتدا دێم بۆ جیهاد تەنها لەبەر خاتری خوا و دواڕۆژ و قیامەتم.

فەرمووی: ماڵ وێران دایکت نەماوە؟

وتم: بەڵێ یارسول الله ﷺ ماوە.

فەرمووی: بڕۆ چاکە لەگەڵ ئەو بکە و لە خزمەتیدابە.

ئەمجارەیان لە پێشەوە هاتمەوە و وتم یارسول الله ﷺ من دەمەوێت لە خزمەتدا بێم و جیهاد بکەم لە پێناوی خوا و ڕۆژی دوایدا، فەرمووی: ماڵ وێران دایکت نەماوە؟!

وتم: بەڵێ ماوە یارسول الله ﷺ.

فەرمووی: ماڵ وێران بگەڕێرەوە خۆت بدە بەسەر قاچەکانیدا ئەوە ڕێگای بەهەشتە[1].

'بەخێوکردن و پەروەردەکردنی کچان'

لە جابرەوە خوای لێ ڕازی بێت دەگێڕنەوە و دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هە چ کەسێک سێ کچی هەبێت و بەخێویان بکات و بە بەزەیی و بە ڕەحم بێت بەرامبەریان و خەمیان بخوات، بەهەشتی بۆ واجب دەبێت بە تەواوەتی، وتیان: یا رسول الله ﷺ! ئەی ئەگەر دو کچ بێت؟ فەرمووی: ئەگەر دوانیش بێت بەهەمان شێوە.

هەندێک وایان دەبینی ئەگەر یەکێک بیوتایە یەک کچیش هەمان شتی دەفەرموو[1].

---

١-'صحیح ابن ماجة'.

## چاك بوون لەگەڵ مێرد



پێغەمبەر ﷺ بە پوری حوصەینی کوڕی موحصینی فەرموو خوای لێ ڕازی بێت: بڕوانە چۆنی لەگەڵ مێردەکەت؟! ئەو بەهەشت و ئاگری تۆیە[2].

کەواتە مێردەکەت و باش بوون لەگەڵی هۆکارێکە بۆ چوونە بەهەشت.

## ڕەووشت جوانی



لە ئەبو هورەیرەوە خوای لێ ڕازی بێت دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی:" پرسیار لە پێغەمبەر ﷺ کرا دەربارەی زۆرترینی شتێک کە خەڵکی بخاتە بەهەشتەوە، فەرمووی: لەخوا ترسی تەواو و ڕەوشت جوانی"[3].

ئیمامی حەسەن دەفەرموێت: حەقیقەتی ڕەووشت جوانی بریتیە لە چاکەکردن و نەبوون بە عەزیەت و سەرئێشە بۆ خەڵکی و، ڕووخۆشی. ئیمامی غەزالی دەفەرموێت: ڕەووشت خوانی بریتیە لە هەڵگرتنی عەزیەت و زەحمەت لە ڕێی خەڵکیدا.

ئیمامی غەزالی لە 'إحياء علوم الدين'دا دە نیشانەی ڕەووشتی جوان و ئاکاری بەرز باس دەکات و دەفەرموێت: دروست نەکردنی جیاوازی و زیاتر نەرم و نیانی و دووری لە دوبەرەکی، خاوەنی ئینصاف و ویژدان بیت، بە دوای ناتەواوی و عەیبەی

---

١-'صحيح لغيره/ احمد بأسناد جيد'.

٢-'حسن ابن سعد و طبراني'.

٣-'حسن الترمزی و ابن ماجه فی صحیحه و البيهقی فی الزهد'.

خەڵکیدا نەگەڕێیت، تەنانەت بە چاوی چاکەوە سەیری خراپەی خەڵکـی بکەیـت، ئەو خراپانەی دەکرێت ڕوویەکی چاکەیان هەبێت، بەهانە و عـوزر هێنـانەوە بـۆ خەڵکـی، هەڵگرتنی ناڕەحەتی و ئـازاری خەڵکـی، لـۆمەکردنی خـۆت و موحاسـەبەی خـۆت، هەمیشە بەدوای ناتەواویەکانی خۆتەوە بیت چاکیـان بکەیـت نەک نـاتەواوی خەڵکـی، ڕووخۆشی بۆ گەورە و بچووک، نەرم ونیانی لە وت و وێژدا بۆ گەورە و بچووک[1].

## بازاڕ و دادگا

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت:پیاوێک لە کڕین و فرۆشتندا ئاسانکار بێت و، پیـاوێکیش لە دادگا و قازێتیدا بڕیاری باش بدات و حەق سێن بێت دەخاتە بەهەشتەوە[2].

## باوەڕداری ئاخرزەمان

پێغەمـبەر ﷺ دەفەرمووێـت: یەک جـار گەورەیـی و پـاکی و ڕزگـاری 'طوبـا' بـۆ کەسێک دەمبینێـت و ئـیمانم پـێ دەهێنێـت، بەڵام حەوت جـار گەورەیـی و پـاکی و ڕزگاری 'طوبا' بۆ کەسێک نەیبینیوم و ئیمانی پێ هێناوم[3].

---

١-'إحياء علوم الدين' ٧١/٣.

٢- حسن/ احمد و النسائی و ابن ماجة و البيهقی.

٣-'صحيح/ احمد وابن حبان و الحاكم'.

سوفیای کوڕی عەیینە دەفەرموێت: تەفسیری ئەم فەرموودەیەی نموونەکانی لە قورئاندا، فەرمایشتی خوای گەورەیە کە دەفەرموێت: ﴿وَكَيْفَ تَكْفُرُونَ وَأَنتُمْ تُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ آيَاتُ اللَّهِ وَفِيكُمْ رَسُولُهُ وَمَن يَعْتَصِم بِاللَّهِ فَقَدْ هُدِيَ إِلَىٰ صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ (آل عمران : ١٠١)

واتە: ئێوە چۆن بێ باوەڕ دەبن! خۆ هەمیشە ئایەتەکانی خوا بە نیگا بۆتان دێن و، لەلایەن پێغەمبەرەوە ﷺ بەسەرتاندا دەخوێنرێنەوە و، خۆیشی هەر لەناوتانـدایە، دڵنیابن هەرکەسێک دەست بە دین و ئایینی خواوە بگرێت، بەڕاستی بۆ ڕێگا ڕاستەکەی ئیسلام هیدایەت دراوە و ڕێنمایی کراوە.

سالمی کوڕی ابی ئومەیە، کە یەکێکە لە تابعین و خەڵکی مەدینەیە دەفەرموێت: حەزرەتی ئادەم کە باوکە گەورەی هەموومانە بەیەک گوناه و سەرپێچی لە بەهەشت دەرکرا، کەچی ئێمەش بەم هەمووە گوناهەوە دەمانەوێت بچینە بەهەشتەوە؟!.

## نیمچەڕوت بۆ قیامەت ترسناکە



پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: خراپترینی ئافرەتان ئەوانەن کە خۆیان ڕوت دەکەنەوە لە جل و بەرگی شەرعی و لە ڕۆشتنیشدا بەلار و لەنجە دەڕۆن، ئەوانە دووڕوون، ناچنە بەهەشت و لە قیامەت وەکو داڵی ڕەش و سور دەناسرێنەوە کە کەسانێکی باش نەبوون[1].

نەبوونی جل و بەرگی شەرعی زۆر ترسناکە بۆ ئافرەتان و چەند هۆکارێکیش هەیە، کە ئەم سزایە ئەوەندە قورس و گرانە دەربارەی ئەو ئافرەتە موسوڵمانانەی کە سفورن و جل و بەرگی شەرعی ناپۆشن.

---

١-'صحيح'.

١-هەموو ئەو گوناهانەش بۆخۆی کۆدەکاتەوە کە نەزەری خەڵکی دەچێتە سەری.

٢- سوور بوون لەسەر گوناهو سفوری و تەوبە نەکردن لێی.

٣- کەسێک کە سفورە گوناهەکەی خۆی بەکەم دەبینێت و شانازی بە جوانی و مکیاج و زیادە سفوریەکەیەوە دەکات.

٤- سفوری بانگەوازێکی بێ دەنگە بۆ جوڵاندنی غەریزەی گوناه و تاوان لە خەڵکیدا.

ئاشکرا کردنی گوناهە، دیارە جیاوازی زۆر لە نێوان گوناهی ئاشکرا و گوناهی نهێنیدا هەیە لەلای خوا.

چونکە ئاشکرا کردنی گوناه و شانازی کردن پێیەوە کوفر کردنە بە نیعمەتی داپۆشینی گوناه و شاردنەوەی.

ئیبن قەیم دەفەرموێت: ئەوەی گوناهێک دەکات و دەیشارێتەوە گوناهی کەمترە لەوەی ئاشکرای دەکات.

بەداخەوە باڵاپۆشی شەرعی کەم بوەتەوە، تەنانەت لەناو باڵاپۆشەکاندا، هەندێکیان لەسەرەتادا زۆر باش هێنایان و پاشان بە پاڵنەری دونیا ویستی و بەرژەوەندی و نوێ خوازی و ڕاهاتن لەگەڵ گوناه کاڵ بوونەوەی دین و ئیمان و حزبایەتی و نەرم بوون لەگەڵ واقعدا بۆ دونیا ویستی و زەلیل بوون بەدەست شەیتانەوە تەناوزولیان لە شەرع و حەقیقەت کرد و، دونیایەک لە بیانووی نابەجێ وەک فەلسەفەی واقع و کۆکردنەوەی خەڵک و خۆشەویست کردنی خۆ، دەستیان دایە زۆرێک لە گۆڕانکاری بێ بنەما بە ناوی ئیسلام و چاکسازیەوە، یەکێک لەو خراپیانەی کە بەناو چاکسازیەوە ئەنجامیان دا دەستبەردار بوون بوو لە حجابی شەرعی و ڕازی بوون بە ڕواڵەتێکی حجاب و مکیاج و جۆرەها مۆدێلی بێ بنەما و بێ شەرعی جیاواز.

ئەمەش بابەتێکی زۆر بەرفراوانە و ئێرە شوێنی ئەم بابەتانە نیە.

## دراوسێی خراپ



پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: نـاچێتە بەهەشـتەوە هە چ کەسـێک دراوسـێکەی ئەمـین نەبێت لە شەڕ و خراپەی[1].

## دڵ نەخۆشەکان



لە سەلمانی فارسیەوە خوای لێ ڕازی بێـت دەگێـڕنەوە کە فەرمـوویەتی: پێغەمـبەر ﷺ فەرمـوویەتی: سـێ کەس نـاچنە بەهەشـتەوە: پیـری زینـاکەر، ئیمام و پێشـەوای درۆزن، هەژاری خۆبەزل زان[2].

## خۆبەگەورەزان



پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت:٠ ناچێتە بەهەشتەوە هەچ کەسـێک بە ئەنـدازەی میسـقالە زەڕەیەک لەخۆبەزل زانی تێدابێت[3].

پرسیاریان لە سەلمانی فارسی کـرد، کە ئایـا ئەو چـاکەیە چـی یە کە شـتێکی پێـوە بلکێت لە چاکەی دەخات؟!

---

١- صحيح مسلم.

٢- صحيح مسلم و النسائى.

٣- صحيح مسلم.

فەرمووی: خۆ بەگەورەزانی.

حەکیم دەفەرموێت خۆ بە گەورە زانی زیادە کاڵفامیەکە، خاوەنەکەی نازانێ لەکوێ دایبنێت.

نموونە و وێنەکانی خۆبەگەورە زانی:

١-گوێ بۆ حەق نەگرتن، کە دەبێت مرۆڤ گوێ بۆ حەق بگرێت، لە بچوکتر لە خۆیەوە و تەنانەت لە نەزانیشەوە حەق وەربگرێت.

٢- حەزکردن لەوەی خەڵکی لەدواتەوە بڕۆن و دەورت قەرەباڵغ بێت و خەڵکی زۆر بتناسن.

٣- دورە پەرێزی کردن لە خەڵکی ئاسایی و هەژار و دانەنیشتن لەگەڵیان.

٤- گوێ نەدان بە پێویستی خەڵکی.

٥- دان نەنان بە هەڵەی خۆتدا و، خۆ بەرز ڕاگرتن لە خەڵکی.

٦- خۆت وابببینیت کە فەزڵت هەیە بەسەر خەڵکیدا، هەر کەسێک ببینیت وای دەبینیت لە خوار خۆتەوەیە.

'هەموو ئەم خاڵانە لە حزبایەتی و سیاسەتی حزبایەتی نەگریسدا هەیە و پلە دارەکان و لێپرسراوەکان زۆرینەیان گیرۆدەی ئەم دەرد و نەخۆشیەن'.



# قسەهێنان و قسەبردن



پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ئەوەی قسە بهێنێت و قسە ببات ناچێتە بەهەشتەوە[1].

# پارە و سامانی حەرام



لە حەزرەتی ئەبوبەکری صدیقەوە خوای لێ ڕازی بێت دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ناچێتە بەهەشتەوە جەستەیەک بە پارە و خواردنی حەرام گەورە بووبێت[2].

لە جابری کوڕی عبداللە وە دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی بەیەکێک لە هاوەڵانی: ئەی کەعبی کوڕی عەجەزە! جەستە و لاشەیەک بە حەرام گەورە بووبێت ناچێتە بەهەشتەوە[3].

ئیبن جەوزی دەفەرموێت: ئەوەی پارەی حەرام بخوات و جەستەی پێ قەڵەو بکات و کاسبی و داهاتی حەرام بێت، ئەو مرۆڤە دەکرێتە سوتەمەنی و گۆگرد و گڕسەندی ئاگری دۆزەخ، دۆزەخی پێ خۆش دەکرێت.

ئیمامی غەزالی دەفەرموێت عیبادەت لەگەڵ حەرام خۆریدا، وەک ئەوەیە بینا و خانوو بەسەر شەپۆلی دەریاوە دروست بکەیت.

---

١- مسلم و البخاري.

٢- 'صحيح لغيره/ ابو يعلى و البزار الطبراني'.

٣- رواه ابن حبان في صحيحه.

یوسفی کوڕی ئەسباط دەفەرموێت: خەڵکی کە عیبادەتی خوا دەکەن، شەیتان بەدەست و پێوەندەکەی خۆی دەڵێت: سەیری بکەن بزانن خواردن و ماڵەکەی حەڵاڵە؟ ئەگەر حەرام و خراپ بوو دەڵێت: وازی لێ بێنن باخۆی ماندوو بکات، ئێوەی ناوێت، هیچی بەهیچ نابێت، چونکە خۆ ماندووکردنی بە عیبادەتەوە لەگەڵ پارەو خواردنی حەرام هیچ سودێکی پێ ناگەیەنێت.

## پێشەوا و ئیمامی فێڵ باز و ساختەکار



پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: هەر پێشەوا و سەرکردەیەک فێڵ و ساختە لەگەڵ میلەتەکەیدا بکات خوای تەعالا بەهەشتی لێ حەرام دەکات[1].

فێڵی گەورەی بەرپرسەکان واتە: دزینی سەروەت و سامانی گشتی، خۆ دەوڵەمەندکردن و موچەی گەورە و قەبە و زۆر بۆخۆت و ماڵ و منداڵت و ئەوەش بە ئاسایی و یاسایی بزانیت و پێت حەرام نەبێت، نهێنی لە خەڵکی بشاریتەوە، بەرژەوەندی خۆت و دەست و پێوەندت بدەیت بەسەر بەرژەوەندی گشتی دا و درۆ لەگەڵ خەڵکی بکەی.



---

١- 'الطبرانی'.

# دەبێت کاری یەکەمی دونیامان قیامەت و بەهەشت بێت



حەزرەتی شێخ عبدالقادری گەیلانی ’ڕەحمەتی خوای لێ بێت‘ دەفەرموێت: قیامەت بکەرە سەرمایەی دونیات قازانج دەکەیت و دەیبەیتەوە، کاتەکانت لە بەدەست هێنانی ڕەزامەندی خوا و قیامەتدا بێت براوەیت.

ئەگەر شتێک مایەوە لە قیامەت ویستت بیدە بە دونیات و هۆکاری دەست کەوتنی ڕزق و ڕۆزی، هەرگیز سەرمایەی خۆت نەکەیت بە دونیات و وابزانی لە قیامەتیش براوەیت؟! ئەگەر شتێکیش لەو کاتە کەمەی داوتە بە دونیات مایەوە بیدە بە قیامەتت.

ئەی گرۆهی لادان و تازە پێگەیشتوان! قیامەت ویست بن، داوای بردنەوەی قیامەتتان داواتان بێت، ئێمە بینیمان کە خەڵکێک ئاخیرەت و قیامەتی ویست دونیاشی لەدەست نەچوو!

بەڵام هەرگیز کەسێکمان نەبینی دونیا ویست بێت و قیامەتی دەست کەوتبێت لەگەڵ دونیادا.

١- لە بنچینەوە دەست پێ بکە

فەرز لەدەست بدەیت و خەریکی سونەت بیت، شەیتان دڵخۆش دەکەیت و ئەو هەمان کاری دەوێت.

حەزرەتی شێخ عبدالقادری گەیلانی ’ڕەحمەتی خوای لێ بێت‘ دەفەرموێت: پێویستە موسوڵمان سەرەتا لە فەرزەکانەوە دەست پێ بکات و بەباشی ئەنجامیان بدات، هەچ کاتێک تەواو بوو لە فەرزەکان ئینجا سونەتەکان ئەنجام بدات، ئینجا فەزائل و چاکەککاری دوای سونەتەکان دێت.

ئەگەر سەرقاڵی فەرز نەبێت و سەرقاڵی سونەت بێت بێ عەقڵیە و، لێی وەرناگیرێت و سوکایەتی پێ دەکرێت.

وەک ئەوەیە پادشا داوای تۆ بکات، بەڵام تۆ لەبەردەم نێراوی پادشادا بوەستیت و پادشا فەرامۆش بکەیت.

٢- سەرەتایەکی سەنگین و قورس.

سەرەتای باران پرِوشەیە، ئینجا دادەکاتە باران، گرنگ ئەوەیە دەست پێ بکات.

*بەردەوامی کلیلی نهێنی و لوغزەکانە و سەرچاوەی بابەتە گرنگەکەیە.

افلاطون دەڵێت.: فەزیلەت و چاکەکاری سەرەتاکەی تاڵ و قورس و گرانە، بەڵام عاقیبەت و کۆتاییەکەی شیرینە، بەڵام ڕەزیلەت و خراپەکاری سەرەتاکەی شیرینە و کۆتاییەکەی تاڵ و نشستیە.

*ئیمامی ترمزی دەفەرموێت: ئایا نابینیت منداڵ کە ڕاهاتوە لەسەر شیر و مەمکی دایکی، چۆن هێمن دەبێتەوە و تێر دەبێت، کە ماوەیەک دوردەبێت، عەوداڵ و تامەزرۆیی شیری دایکی دەبێت و بیانوو دەگرێت، نەفس و ئارەزووی شەهواتیش بەو جۆرەیە، بەڵام کە منداڵ لە شیر بڕایەوە، ئیتر لاناکاتەوە بۆ شیر و مەمکی دایکی، چونکە جۆرەها خواردنی بینیوە و خواردویەتی.

دەروونی مرۆڤیش بەو جۆرەیە، کاتێک دەگاتە یەقین و دڵنیایی و نزیکی لە حەق تعالا و شیرینیەکانی ئیمان، ئیتر هیچ حەز و حەنانێکی بۆ شەهوەت و خراپەکاری نامێنێت.

ئیبن و جەوزی دەفەرموێت: چەندە سەیرە بازرگانێک دڵخۆش ئەبێت بەوەی لەپای ماندوو بوونی مانگێک، قازانجی ساڵێک وەربگرێت؟! ئەی چۆنە مرۆڤ ئارام ناگرێت و بۆ چەند ڕۆژێکی کەمی دونیا بەختەوەری و چێژی هەتاهەتایی لە دەست دەدات.

## هەشت ڕێگا



پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت هەر کەسێک دوانەیەک لە خێر و چاکە ئەنجام بدات و ببەخشێت، لە دەرگاکانی بەهەشتەوە بانگی لێ دەکرێت، ئەی بەندەی خوا، ئەوە دەرەنجامی چاکەیە، ئەوەی ئەهلی نوێژ بێت، لە دەرگای نوێژەوە بانگی لێ دەکرێت، هەر کەسێکیش ئەهلی جیهاد بێت، لە دەرگای جیهادەوە بانگی لێ دەکرێت، هەر کەسێکیش ئەهلی ڕۆژوو بێت، لە دەرگای ڕەیانەوە بانگی لێ دەکرێت، هەر کەسێکیش ئەهلی خێر و چاکە و بەخشین بێت، لە دەرگای بەخشین و صەدەقەوە بانگی لێ دەکرێت، حەزرەتی ئەبوبەکر فەرمووی 'خوای لێ ڕازی بێت': ئایا کەس هەیە لە هەموو ئەو دەرگایانەوە بانگی لێ بکرێت؟

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڵێ، ئومێدیش دەکەم کە تۆ ئەهلی ئەوەبیت.

ئەگەر کوڕ و کچ و خێزان و براو خوشک و دایک و باوک و کەس و کاری خۆتت خۆش دەوێت، بانگیان بکە بۆ ڕێگای بەهەشت و ڕەزامەندی خودا.

کاتەکانتان بە فیڕۆ مەدەن، چونکە چێژی کات کوشتن و بەتاڵی زوو دەڕوات و ئازار و پەشیمانی دەمێنێتەوە.

## گوناهەکانت بکەرە پیلکانەی سەرکەوتنت.



ئەگەر گوناهت زۆرە بێ ئومێد مەبە و، شەیتان فریوت نەدات، لە گوناهەکانتەوە فێرببە، ڕەنگە گوناهێک بتگێڕێتەوە بۆ ڕێگای تەوبە و خواناسیەکی ڕاستەقینە و ڕێک کردنەوەی ژیانت.

# خێری دوای مردن



پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: حەوت کار هەیە خێری بەردەوامە لە دوای ئەوەی خاوەنەکەی مردوە و لە بەرزەخە.

ئەوەی زانستێک فێری کەسێکی بکات، یاخود ڕووبارێک چاک بکات و خەڵکی سوودی لێ ببینن، یاخود بیرێک بۆ خێر لێ بدات، یاخود دار خورمایەک بروێنێت ڕوەکی جۆرا و جۆری بەردار' یاخود مزگەوتێک دروست بکات، یاخود قورئانێک هەدیە بکات بۆ کەسێ پێویستێتی، یاخود کوڕ و کچێک لە دوای خۆ بەجێ بهێڵێت داوای لێ خۆشبونی بۆ بکەن.[1]

هیمەت بەرزی وگەرم و گوڕی لە چاکە و عیبادەت و طاعەتی خوادا، دەبێتە دینەمۆی گەشانەوەی گەورە کە مرۆڤدا.

ئاگاتان لە هاوڕێیەتی خراپەکاران بێت، دۆستی دونیایی بەکەڵکت نایەت، چونکە نەخۆشیەکانی فەسادەت و خراپە زوو بڵاو دەبێتەوە و دەگاتە تۆش.

کە پشکۆ دەخەیتە ناو خۆڵەمێش، پشکۆکەکەش دەکوژێتەوە و خامۆش دەبێت.

ئایا هەرگیز دڵتەنگ بوویت لەبەر ئەوەی دراوسێکەت پێش تۆ ڕۆشتوە بۆ نوێژی بەیانی، یاخود دڵتەنگ بوویت لەبەر ئەوەی مۆدێلی سەیارەکەی گۆڕیوە و تۆ نیتە بیگۆڕیت؟!

کە بەهەشتت لەدەست دا، هەموو شتێکت دۆڕاندوە، هیچ هیچێکت نەبردۆتەوە، وەڵامی ئەو زاتە بدەرەوە کە بانگت دەکات بۆ بەهەشت.

---

١- حسن.

# بانەبینە سوتەمەنی دۆزەخ



سوفیانی کوڕی عەیینە دەفەرموێت:خوای گەورە بە ڕەحمەتی خۆی ئاگری دۆزەخی دروست کردوە، هەتا بەندەکانی بترسن و خۆیانی لێ بپارێزن.

'هۆکاری دروستکردنی دۆزەخ'

١ -ترسان لە خوا.

دۆزەخ بەڵگەیە لەسەر گەورەیی و دەسەڵاتی بێ سنوری خوای تەعالا، بەڵگەیە لەسەر توڕەیی و خەشمی خوا و تۆڵەی خوایی بۆ کافر و ستەمکاران.

٢- گۆڕان و باش بوون: سەر لەنوێ دارِشتنەوەی کەسایەتی خۆت، هەتا ڕووە و بەرزاییەکانی ئیمان بڕۆیت، بە عەماری کوڕی حەربیان دەوت: حاڵ و وەزعت چۆنە؟

دەیفەرموو: ئەگەر لە ئاگری دۆزەخ دەربازبیم، ئەوە من لە خێر و خۆشیدام.

ئیمامی عەلی کوڕی ئەبی طالب 'خوای لێ ڕازی بێت' دەفەرموێت: مرۆڤ ئەو شتەی کە بۆی نوسراوە و لەدەستی دەرناچێت دڵ خۆشی دەکات وەختێ پێی دەگات، وە پێی ناخۆشە کاتێک شتێکی لە چارە نەنوسراوە و لەدەستی دەردەچێت، با دڵخۆشیت بەو بەشەت بێت کە خێرە و بۆ قیامەتە و، دڵ تەنگ بە بە لەدەست چوونە زۆرەکانت کە پەشمانین بۆ قیامەتت، هەچ شتێکی دونیا کە بە دەستی دێنیت دڵخۆشت نەکات، ئەوەش کە دونیاییە و لەدەستت دەچێت هیچ خەمی بۆ مەخۆ، هەرچی بیر کردنەوە و خەم و خەیاڵت هەیە با بۆ دوای مردنت بێت، بزانە بۆکوێ دەچیت.

## دورخستنەوەی شەڕ و خراپە



ئیمامی غەزالی دەفەرموێت: خێر و شەڕ بە یەکەوە شێلراون، لەناو بەنی ئادەمدا شێلراون و تەنها یەکێک لەو دوو ئاگرە لە یەکتریان جیادەکاتەوە: یان ئاگری ترسان لە خوا، یاخود ئاگری دۆزەخ.

ئاگری دۆزەخ زۆر پێویستە هەتا گەوهەری مرۆڤ لە پیسیەکانی شەیتان پاک ببێتەوە!

ئیتر مرۆڤ سەرپشکە لەوەی کە کام لەو دوو ئاگرە هەڵدەبژێرێت!

هەتا ویست و ئیرادە و ئیختیار لە دەستدایە و نەگەیشتویتە ئەو دونیایی چارەنوس ساز، ڕێگای بەهەشت لەبەر بگرە و لە ڕێگەی دۆزەخ دوربکەوەرەوە.

## چارەسەری دڵڕەقی



دڵ ڕەشی و دڵ ڕەقی ڕێگەیە بۆ گوناهباری و دورکەوتنەوە لە خوای گەورە، باشترین چارەسەریش ترسانە لە خوا و ترسی سزای خوایی، هیچ سزایەکیش لە ئاگری دۆزەخ سەختر نیە.

ناوتان لە قوتابخانەی ترسی خوا تۆمار بکەن، کە ناوتان لە ڕیزی خەوف لە خوایان تۆمارکرد، دەبنە چاونەترس و بە ئیرادەکانی مێژوو، دۆزەخیش ناتانترسێنێت.

که ساردی ڕووی له دڵ کرد، گەرمی ئاگر و پزیشکی سوتێنەری ساردی له دڵ هەڵدەگرێت!

ئیتر پێویستی بوونی دۆزەخ ئاشکراو حەتمی دەبێت.

بینایی پێش بینین دەکەوێت لە زەبرەکانی دۆزەخ بینی و تەرکی گوناه دەکاتە دیاری!

شاڵاوی دۆزەخ ترسێنەرێکی وایە تەرکی گوناهت پێ دەکات، خوای تەعالا دەفەرموێت: ﴿إِنِّيٓ أَخَافُ إِنْ عَصَيْتُ رَبِّي عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ﴾ (الأنعام: ١٥)

من دەترسم ئەگەر سەرپێچی خوای تەعالا بکەم توشی سزایەکی زۆر سەخت ببم.

زاهیدی کوفە ئیسحاقی کوڕی خەلەف دەفەرموێت: ترساو ئەو کەسە نیە کە لە دوای گوناه چاوەکانی دەسڕێت. بەڵکو ترساو لە خوا، ئەو کەسەیە تەرکی گوناه دەکات لە پێناوی خوای گەورە.!

شەقیقی بەڵخی دەفەرموێت: گۆڕ باخچەیەکە لە باخچەکانی بەهەشت بۆ کەسێک بیری بێت و چاڵێکە لە چاڵەکانی دۆزەخ بۆ کەسێک بیری چووبێت!

## دۆزەخ چی دەکات؟



ئەبو هورەیرە خوای لێ ڕازی بێت دەفەرموێت: لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ دانیشتبووین گوێمان لە ناڵە و زرمەیەکی گەورە بوو، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەزانن ئەوە چی بوو؟

وتمان: خواو پێغەمبەر دەزانن.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوە بەردێک بوو خوای گەورە ناردویەتی بۆ دۆزەخ و حەفتا پایزە بەڕێوەیە، ئێستا گەیشتۆتە بنی دۆزەخ.

دۆزەخ ئەوەندە گەورەیە کە دروست کراوی زۆر گەورە دەگرێت.

عبداللەی کوڕی مسعود خوای لێ ڕازی بێت دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە دەفەرموێت: • خۆر و مانگ دوو تۆپەڵەن و گرمۆڵەی ناو ئاگری دۆزەخن لە ڕۆژی قیامەتدا[1].

ئیسماعیلی دەفەرموێت: مەبەست بەم فەرمووده ئەوە پێویست ناکات کە خۆر و مانگ سزابدرێن، چونکە خوای گەورە فریشتەی تایبەتی لەناو دۆزەخ دیاری کردوە بۆ سزای دۆزەخیەکان، بەرد دەبێتە سزایان، مەبەست ئەوەنیە فریشتە و بەرد سزابدرێن[2].

## دۆزەخ دروستکراوێکی زیندوە



پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: • گەردنێک لە ئاگر سەر دەردێنێت و قسە دەکات و دەڵێت: ئەمڕۆ تایبەت کراوم بە سێ کۆمەڵەوە: بە هەموو زاڵم و ستەمکارێکی مل هوڕ، بۆ کەسێک شەریکی بۆ خوا بڕیار دابێت، بۆ ئەو کەسەی بەبێ تاوان کەسێک بکوژێت، شاڵاویان بۆ دێنێت و ڕاپێچی قوڵایی و لیتاوی دۆزەخیان دەکات[3].

خوای تەعالا دەفەرموێت: ﴿ٱلَّتِي تَطَّلِعُ عَلَى ٱلۡأَفۡـِٔدَةِ﴾ (الهمزة: ٧)

ئاگری دۆزەخ ناوکڕۆکی دڵانیش دەگرێتەوە.

---

١- رواه مسلم و الترمزی.

٢- فتح الباری. ٣٠/٦.

٣- صحیح مسلم و بخاری.

# هەتا هەتایی دۆزەخ و کافران و دۆزەخیەکان

حەزرەتی عومەری کوڕی خەتاب 'خوای لێ ڕازی بێت' ڕۆشت بەلای بەرزاییەکی لمیندا و دەستی کرد بە گریان، پێیان وت: ٠ ئەی ئەمیری ئیمانداران بۆچی دەگریت؟

فەرمووی: بیری ئەهلی دۆزەخم کەوتەوە، ئەوانەیان کە هەمیشەین لە ئاگری دۆزەخدا، ئەگەر بە ژمارەی دەنکۆڵەی لمەکان ساڵ بوایە و دوای ئەوە لە ئاگر دەربهێنرانایە گەردنیان بەرز دەکردەوە و ئومێدێکیان پەیدا دەکرد، بەڵام هەتا هەتاییە بۆ ئەوان و هیچ ئومێدێکیان نامێنێت بە دەرچوون.

سکاڵایان لە یەکێک لە کاربەدەستانی ژێر دەستی حەزرەتی عومەری کوڕی عبدالعزیز کرد 'خوای لێی ڕازی بێت'، حەزرەتی عومەری بۆی نوسی: 'براکەم'!

تاریکی و کاتە زۆرەکانی ئەهلی ئاگرت 'دۆزەخ' بیردەخەمەوە، بیرت دەخەمەوە بۆ هەندێک دۆزەخ هەتاهەتاییە و نابڕێتەوە.

ئاگادارت دەکەمەوە ئەم دوو ڕۆژەی دەسەڵات و دونیا ویستی قیامەتت بیر نەباتەوە، نەوەک وەختێ ئەم نامەت پێ دەگات ئاخرین ڕۆژەکانت بێت و ئومێدت نەمێنێت.

وەختێ بەرپرسەکە نامەکەی خوێندەوە، ئاگر لە هەناوی بەربوو، خۆی کۆکردەوە و، گەڕایەوە بۆ خزمەتی عومەری کوڕی عبدالعزیز و، حەزرەتی عومەر فەرمووی بۆچی هاتویت؟

وتی: دڵت دەرهێنام بەو نامەیەی بۆت ناردووم. ئیتر من ناگەڕێمەوە سەر بەرپرسیارێتی هەتا دەمرم و دەگەڕێمەوە خزمەتی پەروەردگار.

# گەرمی ئاگری دۆزەخ



لە صەحیحی ئیمامی موسلەمدا هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەو ئاگرەی ئادەمیزاد هەڵیدەگیرسێنێت بەشێکە لە حەفتا بەشی ئاگری دۆزەخ.....

کە ئەمە بەشێکی فەرموودەکەیە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا بِآيَاتِنَا سَوْفَ نُصْلِيهِمْ نَارًا كُلَّمَا نَضِجَتْ جُلُودُهُمْ بَدَّلْنَاهُمْ جُلُودًا غَيْرَهَا لِيَذُوقُوا الْعَذَابَ ۗ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَزِيزًا حَكِيمًا﴾ (النساء: ٥٦)

واتە: بەبێ گومان ئەوانەی کافر و بێ باوەڕن بە ئایەتەکانی ئێمە، لەمەودوا دەیانخەینە ئاگر و دەیانسوتێنین، کاتێ پێستیان پیشا وسوتا، شوێنەواری سوتانەکە لادەبەین و سەرلەنوێ پێستی ناسکیان بۆ دروست دەبێتەوە و دەسوتێتەوە هەتا زیاتر سزا بچێژن...

پێغەمبەر ﷺ ئاماژە دەکات بەوەی کە پێستی کافر چل و دوو باڵ ئەستور دەبێت، دانی بە قەد کێوی ئوحودی لێ دێت، شوێنی دانیشتنی بەقەد نێوانی مەککە و مەدینەی لێ دێت[1].

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ئەگەر لەم مزگەوتەدا سەد هەزار یان زیاتر لە خەڵکی تیابێت و پیاوێکی جەهەنمی لەناویاندابێت و هەناسە بدات هەرچی لەم مزگەوتەدایە یاخود زیاتر دەسوتێنێت[2].

---

١- صحيح ترمزی و حاكم.

٢- صحيح.

وەختێ سوکترینی ئەهلی دۆزەخ کەسێک بێت جوتێ نەعلی لەپێدا بێت و مێشک و دەماغی بکوڵێنێت وەک چۆن مەنجەڵ دەکوڵێت، دەبێت سزای قورسی خراپترین کەس چۆن بێت؟!.

## خەو و پشوو نیە لە دۆزەخ



هەروەکو چۆن خەوتن لە بەهەشت نیە، لە دۆزەخیش بەهەمان شێوەیە، خەون لە شوێنێک نیە کە شوێن بە خۆت نەگریت و فرمێسک و خەمت کەم نەکات!

ئەی ئەوانەی نوێژی بەیانی نوستون و هەڵناسن، لە دۆزەخ خەوتن نیە!

خوای تعالا دەفەرموێت: ﴿لَهُمْ مِنْ جَهَنَّمَ مِهَادٌ وَمِنْ فَوْقِهِمْ غَوَاشٍ ۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِي الظَّالِمِينَ﴾ (الأعراف:٤١)

واتە: کافرەکان ڕایەخیان دۆزەخە و، نوێنیان دۆزەخە و سەر و خواریان بە ئاگر گیراوە، ئا بەو جۆرە پڕ سزایە پاداشتی ستەمکاران ئەدەینەوە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَالَّذِينَ كَفَرُوا قُطِّعَتْ لَهُمْ ثِيَابٌ مِّن نَّارٍ يُصَبُّ مِن فَوْقِ رُءُوسِهِمُ الْحَمِيمُ (١٩) يُصْهَرُ بِهِ مَا فِي بُطُونِهِمْ وَالْجُلُودُ (٢٠) وَلَهُم مَّقَامِعُ مِنْ حَدِيدٍ (٢١) كُلَّمَا أَرَادُوا أَن يَخْرُجُوا مِنْهَا مِنْ غَمٍّ أُعِيدُوا فِيهَا وَذُوقُوا عَذَابَ الْحَرِيقِ (٢٢)﴾ (الحج: ١٩-٢٢)

واتە: کافران جلی لە ئاگر دروست کراویان بە باڵا بڕاوە، لە دۆزەخدا ئەکرێتە بەریان و ئاوی کوڵ بە کوڵیان بەسەردا ئەکرێت، هەرچی لەناو سکیاندایە و پێستەکەی بەریشیان بەو ئاوە کوڵ بە کوڵە ئەتوێنرێتەوە.

گورزی ئاسنینیان بۆ هەیە بۆ سزادانیان، بەدەست مەئموری سزادانیانەوەن.

هەر چەند بیانەوێت لەبەر نـاڕەحەتی و داخ و خەفەتـی دڵیـان لەو ئـاگرە دەرچـن، ئەگەڕێنرێنەوە بۆ ناوی و پێیان دەوترێت: دەبخۆن ئاگری لەش سوتێن بچێژن.

وەهبی کوڕی مونەبیە دەفەرموێت: ئەهلی ئاگری دۆزەخ بەرگیـان هەیە، لە کاتێکـدا ڕوت بونایە باشتر بوو بۆیان، ژیانیان پێ دراوە لە کاتێکدا مردن باشتر بوو بۆیان.

عەطائی سەلەمی دەفەرموێت: ئەگەر مرۆڤێک ئاگرێکی بۆ بکرێتەوە، پێی بوترێـت ئەوەی بچیتە ئەم ئاگرەوە ئەوە ڕزگاری دەبێت لە ئاگری دۆزەخ.

عطاء وتی: ئەگەر ئەوە بە من بڵێن ئەوە لە خۆشیاندا ڕەنگە ڕۆحم دەربچێـت پـێش ئەوەی بکەومە ئاگرەکەوە.

## دۆزەخ هیچ دڵخۆشیەکی تیانیە

خوای باڵادەسـت دەفەرموێـت: ﴿وَلَـنْ يـنفعَكُمُ اليـومَ ظَّلَمْـتُمْ أَنَّكُـمْ فِي الْعَـذَابِ مُشْتَرِكُونَ﴾ (الزخرف: ٣٩)

خوای باڵادەسـت لەسـەر دۆزەخیەکـان حەرامـی کـردوە ئەنـدازەیەکی زۆر کەم لە خۆشی، بەو واتایەی کە دڵنەوایی یەکتر بکەن.

## تینوێتی

قورسـترین سـزای دۆزەخیەکـان تینـوێتیە، خـوای تەعـالا دەفەرموێـت: ﴿وَنَسُـوقُ الْمُجْرِمِينَ إِلَىٰ جَهَنَّمَ وِرْدًا﴾ (مريم: ٨٦)

ضحاک دەفەرموێت: دەبرێن بەرەو دۆزەخ بە تینوێتی. موجاهیدیش دەفەرموێت: گەرو و قورگیان لە تینواندا دەپچڕێت.

خوای باڵادەست دەفەرموێت: ﴿وَنَادَىٰ أَصْحَابُ النَّارِ أَصْحَابَ الْجَنَّةِ أَنْ أَفِيضُوا عَلَيْنَا مِنَ الْمَاءِ أَوْ مِمَّا رَزَقَكُمُ اللَّهُ ۚ قَالُوا إِنَّ اللَّهَ حَرَّمَهُمَا عَلَى الْكَافِرِينَ﴾ (الأعراف: ٥٠)

واتە: دۆزەخیەکان هاوار ئەکەنە بەهەشتیەکان، لەو ئاو و ڕۆزیەی خودا پێی داون، بڕژێنن بەسەرماندا و بەشمان بدەن، بەهەشتیەکان لە وەڵامدا دەڵێن: بەڕاستی خودا ئەمانەی لە کافران مەنع کردوە و نایاندرێتێ.

عبداللەی کوڕی حەزرەتی عومەر بە قورئانەوە دەژیان و لە ژیانی کرداریدا قورئان زۆر زیندوو بوو تیایاندا، ڕۆژێکیان ئاوێکی ساردی خواردەوە و دەستی کرد بە گریان و گریانەکەی زۆر زیادی کرد، پێیان وت: چ شتێکە دەتگریێنێت؟

فەرمووی ئایەتێکی قورئان کە دەفەرموێت: ﴿وَحِيلَ بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ مَا يَشْتَهُونَ...﴾ (سبأ: ٥٤)

نێوەندێک هەیە لە نێوان ئەهلی دۆزەخ و ئەو شتانەی حەزی لێ دەکەن و دەستیان پێی ناگات.

ئیتر زانیم ئەهلی دۆزەخ هیچ حەزێکیان بۆ جێبەجێ ناکرێت، حەزیان لە ئاوی ساردە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿... إِنَّ اللَّهَ حَرَّمَهُمَا عَلَى الْكَافِرِينَ﴾ (الأعراف: ٥٠) خوای گەورە نایانداتێ.

## خواردنەوەی دۆزەخیەکان



خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿هَٰذِهِ جَهَنَّمُ الَّتِي يُكَذِّبُ بِهَا الْمُجْرِمُونَ (٤٣) يَطُوفُونَ بَيْنَهَا وَبَيْنَ حَمِيمٍ آنٍ(٤٤)﴾ (الرحمن: ٤٣-٤٤)

واته: ئەمە کەوا لە بەرچاوتاندایە ئەو دۆزەخەیە کەوا تاوانباران، بە درۆی دادەنێن و باوەڕی پێ ناکەن، لە نێوان ئاگری ئەو و ئاوێکی زۆر گەرمی کوڵ بە کوڵدا دێن و دەچن.

.......... دەفەرموێت: لە حاڵی کوڵاندایە لەو ڕۆژەوە کە خوای گەورە ئاسمانەکان و زەوی دروست کردوە هەتا ئەو ڕۆژژەی کە دەرخواردیان دەدرێت و دەکرێت بە سەریاندا.

ئیتر ناوسک و ڕیخۆڵە و پێستیان دەتوێنێتەوە و جارێکی تر دروست دەکرێنەوە و سزا دەدرێنەوە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿.... كَمَنْ هُوَ خَالِدٌ فِي النَّارِ وَسُقُوا مَاءً حَمِيمًا فَقَطَّعَ أَمْعَاءَهُمْ﴾ (موحەمەد: ١٥)

## غەساق/ شوێنێکی زۆر سارد

سزاکانی خوای گەورە زۆر زۆرن و، جوار جۆرن، عبداللەی کوڕی عباس دەفەرموێت: غەساق/ بریتیە لە زەمهەریر کە زۆر زۆر ساردە و، لەسەرماندا دەسوتێن.

کێمو جەراعەت و پیسی دەخۆنەوە

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لا يَذُوقُونَ فِيهَا بَرْدًا وَلا شَرَابًا (٢٤) إِلَّا حَمِيمًا وَغَسَّاقًا (٢٥)﴾ (النبأ: ٢٤-٢٥)

واتە: نە ئاوی ساردی تیا دەچێژن و نە شەربەتی شیرین، ئاوی گەرم و کێم و زوخاو نەبێت.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿مِنْ وَرَائِهِ جَهَنَّمُ وَيُسْقَى مِنْ مَاءٍ صَدِيدٍ (١٦) يَتَجَرَّعُهُ وَلَا يَكَادُ يُسِيغُهُ وَيَأْتِيهِ الْمَوْتُ مِنْ كُلِّ مَكَانٍ وَمَا هُوَ بِمَيِّتٍ ۖ وَمِنْ وَرَائِهِ عَذَابٌ غَلِيظٌ (١٧)﴾ (أبراهيم: ١٦-١٧)

واتە: ستەمكار ئەنجامیشی لەوەو پاش دۆزەخە و لە ئاوی كێم و زووخاوی دەرخوارد دەدرێت.

ئەیەوێت بیخواتەوە،ئەگیرێتە قورگی و بەزەحمەت بۆی قوت دەچێت و، لە هەموو لایەكەوە مەرگی بۆ دێت كەچی ناشمرێت تا بحەسێتەوە و ڕزگاری ببێت، هەموو كاتێكیش سزایەكی سەختی لەبەر دەمدایە.

ئەم ئایەتە بوو دەوڵەمەندترین و گەورەترین خەلیفەی هێنایە گریان.

عبدالملكی كوڕی مەروان ڕۆژێكیان ئاوێكی ساردی خواردەوە، وازی لە ئاوەكە هێنا و دەستی كرد بە گریان، پێیان وت: ئەمیری ئیمانداران بۆچی دەگریت؟

وتی: بیری وینوێتی ڕۆژی قیامەتم كەوتەوە و بیری ئەهلی دۆزەخ، كە ڕێگریان لێ دەكرێت و ئاوی ساررد و نیعمەتەكانیان لێ قەدەغە دەكرێت و پاشان ئەم ئایەتەی سەرەوەی خوێندەوە.

هەر بۆیە قەتادە دەفەرموێت: بەرگەی ئەو سزا گەورەیە ناگرن، ئەی خەڵكینە ئیتاعەی خوا و پێغەمبەرەكەی بكەن.



# لێپرسینەوەی تاکە کەسی

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: کەسێک لە دۆزەخ دێنن پێی دەڵێن: ئەی نەوەی ئادەم! ماڵ و حاڵ و ژیانی دونیات چۆن بوو؟

دەڵێت: خراپترین شوێن و مەنزل بوو.

پێی دەڵێن: ئایا بە ئەندازەی ماڵەکەت ئاڵتون بێت، دەیبەخشیت هەتا ڕزگارت بێت.

دەڵێت: بەڵێ ئەی پەروەردگارم.

دەڵێن پێی: درۆ دەکەیت، ئێمە زۆر کەمترمان لێ داوا کردی ئەنجامت نەدا، دواى ئەوە دەیگێڕنەوە بۆ ناو ئاگری دۆزەخ[1].

ئەوانەی جەراعەت و کێمی دۆزەخ دەرخواردیان دەدرێت ئارەق و شەراب خۆرەکانن، کە فەرموودەی پێغەمبەری لەسەرە ﷺ.

سزای جۆراو جۆر 'المهل'

عبدالله کوڕی عومر خوایان لێ ڕازی بێت دەفەرموێت: ئایا دەزانن مهل چیە؟

'مهل الزیت' واتە گەرمترینیان، دوو جۆر سزایە کە جۆرێکیان بە بەرچاوەوەیە و لە شێوەی زۆر ناشرین و بێزراودایە و جۆرەکەی تری هەست پێ کراوە و سوتانەکەی زۆر پڕ ئازارە.

---

١- صحیح مسلم و احمد و النسائی.

# زەقووم



درەختێکی بەناوبـانگی دۆزەخە، کە لە قورئـانی پیـرۆزدا لە چەنـدین شـوێن باسـی هاتوە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَالشَّجَرَةَ الْمَلْعُونَةَ فِي الْقُـرْآنِ وَنُخَـوِّفُهُمْ فَـمَا يَزِيـدُهُمْ إِلاَّ طُغْيَانًا كَبِيراً﴾ (الاسراء: ٦٠)

واتە: باسی دارە لەعنەتیەکە ’زەقووم‘ بوو بەهـی تـاقی کردنەوەیـان، ئـێمە بەهەمـوو جۆرێـک ئەو کـافرانە دەترسـێنین، بەڵام ئەو ترسـاندنە هەر سەرکەشـی و لەخۆبـایی بوونیان زیاد دەکات.

کافرەکانی مەککە بە ئیسرا و معـراج باوەڕیـان نەدەکـرد، کە هەنـدێ موسـوڵمانیش توشی هەڵگەڕانەوە بوون لە کاتێکدا باوەڕیان پێی نەکرد.

تاقی کردنەوەی دووهەم زەقوم بـوو کە کافرەکـان دەیـانوت: مـوحەمەد بانگەشـەی ئەوە دەکـات لە ئـاگری دۆزەخـدا درەختێـک هەیە، لە کاتێکـدا ئـاگر درەخـت دەسوتێنێت!!

خوای گەورە دەربارەی درەختی زەقوم دەفەرموێت: ﴿إِنَّهَا شَـجَرَةٌ تَخْـرُجُ فِي أَصْـلِ الْجَحِيمِ﴾ (الصافات: ٦٤)

زەقووم درەختێکە لە بێخی دۆزەخەوە ئەڕوێت و سەر دەردێنێت.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ئەگەر دڵۆپێک لە زەقوم بتکێتە ناو دونیا، ژیـانی خەڵکـی دونیا تێک دەچێت! ئەی چۆنە ببێتە خواردن[١]؟!

---

١- صحيح احمد و الترمزي و النسائي و ابن ماجة و ابن حبان و الحاكم.

## سزای زیندانی و فەرامۆشکردن



خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّهَا عَلَيْهِم مُّؤْصَدَةٌ (٨) فِي عَمَدٍ مُّمَدَّدَةٍ (٩)﴾ (الهمـزة: ٨-٩)

واتە: کـافران لە ژوری تـایبەتی داخـراودان، کە مـاڵی ئەو کەسـانە وایە بەسـتراون بەستونی ڕاکێشراوەوە.

بەســەریاندا دادەخرێــت و چەســپ دەبێــت، نە ڕوونــاکی تێــدایە، نەخۆشــی و نەدەرچوون لێی هەتا هەتایە.

ضەحاک دەفەرمووێت: 'مؤصدة' دیواری بێ دەرگایە. جەهەنم دادەخرێـت بەسـەر خاوەنەکانیاندا.

ئیبن و جەوزی دەفەرمووێت: ئەی خەڵکینە!

خـۆت بێـنەرە پـێش چـاوی خـۆت! لە کونجـوڵێکی دۆزەخـدا بیـت و بگریـت و گریانەکەش هەتا هەتایی بێت و دەرگاکانی دۆزەخـیش بـۆ هەتـا هەتـایە داخرابێـت و سەقفەکەی زیندان و دۆزەخەکەت بەسەردا چەسپی بێت و لەناو تاریکاییەکی نوتەکـدا بیت، بەبێ هاوڕێ و خزمێک، نەخەوی تیابێت و نە خواردن و نە پشوو.

## تاریکیی دۆزەخ



تـاریکی لە دونیـادا، نادیـاری و، تـرس و، ونـی داهـاتوو، ڕوداو و کارەسـاتی لـێ چاوەڕوان دەکرێت.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَتَجَرَّعُهُ وَلَا يَكَادُ يُسِيغُهُ وَيَأْتِيهِ الْمَوْتُ مِنْ كُلِّ مَكَانٍ وَمَا هُوَ بِمَيِّتٍ وَمِنْ وَرَائِهِ عَذَابٌ غَلِيظٌ﴾ (أبراهيم: ١٧)

خوای گەورە دەفەرموێت ﴿وَظِلٍّ مِنْ يَحْمُومٍ﴾ (الواقعة: ٤٣)

واتە: لە سێبەری دوکەڵێکی ڕەشی دۆزەخدان.

دۆزەخ زۆر زۆر ڕەش و تاریکە.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: خۆتان بپارێزن لە زوڵم کردن، چونکە زوڵم تاریکیە بۆ ڕۆژی قیامەت[1].

ئیمامی غەزالی دەفەرموێت: وەختێ بەندەیەک گوناهێک دەکات ڕوخساری و دڵی ڕەش دەبێت، ئەگەر ئەهلی چاکە و ئیمان بێت ڕەشیەکە سەردەکات بۆ دەرەوە هەتا تەمێ ببیت، ئەگەر نا دەشارێتەوە هەتا بە سزای دۆزەخ دەگات.

## مرۆڤ سوتەمەنی دۆزەخە

خوای تەعالا دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قُوا أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ عَلَيْهَا مَلَائِكَةٌ غِلَاظٌ شِدَادٌ لَّا يَعْصُونَ اللَّهَ مَا أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ﴾ (التحريم: ٦)

واتە: ئەی ئەوانەی کە خاوەن باوەڕن! خۆتان و ژن و منداڵتان لە ئاگرێ بپارێزن کە سوتەمەنیەکەی ئادەمیزادە و بەردە و، فریشتەی بەزەبر و توند و تووڕەی بەسەرەوەیە، خوا هەر فەرمانێکیان بداتێ بێ فەرمانی ناکەن و هەرچیان ئەمر پێ بکرێت ئەیکەن.

---

١- صحيح احمد و الطبراني و البيهقي.

بلالی کوڕی سەعد دەفەرموێت: ڕەنگە کەسێک زۆر خۆش خۆری دونیا و داهاتی دونیا بێت و پێبکەنێت و سەیران و سەفا بکات و لە هیچی کەم نەبێت، کەچی یەکێک بێت لە سوتەمەنیەکانی ئاگری دۆزەخ.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: هەندێک لەناو دۆزەخدا ئاگر دەگاتە قولەپێکانیان، هەندێک هەتا ئەژنۆیان هەندێک هەتا قورِ قوراگەیان ئاگرە، هەندیکیش گەردنیان[1].

سزای دۆزەخ وەک یەک نیە و جیاوازی هەیە.

جۆری سزا جیاوازە و، ئەو ئەندامەی تاوانت پێ کردوە جۆری تایبەتی سزای هەیە و زۆری و کەمی گوناه سزاکان دەگۆڕێت.

هەندێک ساڵێکی قیامەت سزا دەدرێت، یاخود مانگێک یاخود زیاتر و کەمتر، هەیشە هەتا هەتاییە.

## سزای ڕۆحی

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا يُنَادَوْنَ لَمَقْتُ اللَّهِ أَكْبَرُ مِن مَّقْتِكُمْ أَنفُسَكُمْ إِذْ تُدْعَوْنَ إِلَى الْإِيمَانِ فَتَكْفُرُونَ﴾ (غافر: ١٠)

'مەقت' قورسترین سزایە، غەزەب و توڕەیی و خەشمی خوایی قورسترین سزایە لە قیامەتدا، مەقتیش هەموو سزاکان نیە و لەوە گەورەتر بانگەوازی فریشتەکانە کە دەفەرمون توڕەیی خوا زۆر گەورەیە و بەراورد ناکرێت بە توڕەیی مرۆڤەکان لەناو

---

١- صحيح احمد و مسلم.

یەکتردا، سزای خـوا گریـان و پـاڕانەوە سـودی نـیە و هـیچ فـڕ و فێڵێـک لە قیـامەت ناکرێت.

پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: انذرتكم النار.... أنذرتكم النار.. ئاگادارتـان دەکەمەوە لە ئاگری دۆزەخ... ئاگادارتان دەکەمەوە لە ئاگری دۆزەخ.... هەتا ئەوەنـدە دەیـوتەوە کە خەڵکی بازاڕ دەیانبیست.

لە سەرەتای دابەزینی وەحیدا بۆ حەزرەتـی مـوحەمەد المصـطفی ﷺ دەیفەرمـوو: ئەی گرۆهی قورەیش. خۆتان لە ئاگری دۆزەخ ڕزگار بکەن من ناتوانم هیچتـان لەلای خوا بۆ بکەم، نەدەتوانم سوودتان پێ بگەیەنم و نە زیانتان لێ دور بخەمەوە...

بەم جۆرە بانگی بەنی عەبدول مەناف و بەنـی عبـدالمطلب و حەزرەتـی فـاطمەی کرد کە خۆتان خۆتان لە ئاگری دۆزەخ ڕزگار بکەن و خۆتان بپارێزن....

هەروەها دەفەرموێت ﷺ خۆتان لە ئاگری دۆزەخ بپارێزن ئەگەر بەلەتـێ خورمـاش بووە، ئەگەر نەتان بوو بە وتەی باش.

خوای گەورە هەموو دیاریەکی تۆ وەردەگرێت، ڕەنگە تۆ ئەوە وەرنەگرێـت کە خـوا لێتی وەردەگرێت.

ئایا کەسێک تۆ بچیت لەتێ خورمان بۆ ببەیت لێت وەردەگرێت؟!



# دوعای بەردەوامتان



ئەنەسی کوڕی مالک دەفەرموێت: زۆرترینی دوعای پێغەمبەر ﷺ کە پێی دەپاڕایەوە دەیفەرموو: ﴿... رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ﴾[1] (البقرة: ٢٠١)

حەسەنەی دونیا عیبادەت و لەش ساغیە، حەسەنی ئاخیرەت بەهەشت و لێخۆشبوونی خوایە و پەنا گرتنیشی بە خوا لە ئاگری دۆزەخ.

یەحیای کوڕی مەعاز دەفەرموێت: ئەی ناوەی ئادەم! ئاگاداری شەیتان بە، چونکە ئەو ئازادکراوە بۆ گیانی تۆ و زۆر کۆنە و شارەزایە لە خەڵەتاندنی تۆدا، بەڵام تۆ نوێ و بێ ئەزموونیت، ئەو دەست بەتاڵە بۆتۆ بەڵام تۆ سەرقاڵیت، شەیتان یەک خەمی هەیە کە جێبەجێی بکات ئەویش تیابردنی تۆیە، بەڵام تۆ خەم و گرنگیت زۆرە، تۆ ئەوت بیر دەچێت بەڵام ئەو تۆی بیر ناچێت، دەروونی بەدخوازیشت یارمەتی دەری شەیتانە، لەبەر ئەوە زۆر زۆر ئاگاداری خۆت بە.

یەکێک لە دوعاکانی پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: "اللهم رب جبریل و میکائیل ورب إسرائیل أعوذبک من حرّ النار و من عذاب القبر"[2].

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: کاتێک لە تەحیاتی کۆتایی نوێژدا بوون، پەنا بگرن بە خوا لە چوار شت: لە سزای دۆزەخ و سزای گۆڕ و بەرزەخ و فیتنەی ژیان و مردن و دوای مردن، هەروەها لە فیتنەی دەجال[3].

---

١- 'صحیح الشیخان و احمد و ابوداود'.

٢- حسن.

٣- رواح الجماعة لاالبخاری و الترمذي.

ئەم دوعایە لە نوێژدا بۆ پێنج فەرزەیە بەلای کەمەوە، کە موسوڵمان پەنا دەگرێـت بە خوا لە سزای قەبر و بەرزەخ و دۆزەخ.

پێغەمبەر ﷺ زۆر سور بوو لەسـەر ئەوەی کە هاوەڵەکـانی فێـر بکـات ئەم دوعـایە بکەن و لەبەری بکەن وەکو سورەتێکی قورئان!!

لە عبداللەی کوڕی عباسەوە خوا لێیان ڕازی بێت دەفەرموێت: پێغەمـبەر ﷺ فێـری ئەم دوعایەی دەکردین هەروەکو چـۆن فێـری سـورەتێکی قورئـانی دەکـردین، ئەویـش ئەوەیە کە بڵێین: 'اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ جَهَنَّمَ ، وَمِنْ عَذَابِ الْقَـبْرِ ، وَمِـنْ فِتْنَـةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ ، وَمِنْ شَرِّ فِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ'[1].

## ئاڵتوونێکی فڕێدراو



پێغەمبەر ﷺ ئەڵقەیەکی ئاڵتونی لە دەسـتی پیاوێکـدا بینـی، لە پەنـجەی کـردەوە و فڕێی دا، لە دوایدا فەرمووی: بە دەستی خۆتان پشکۆی ئاگر دەکەنە دەستان.

دوای ئەوەی پێغەمــبەر ﷺ ڕۆشـــت بە پیـــاوەکەی وت ئەڵــقەکەت هەڵبگـــرەوە سوودێکی لێ ببینـەوە، پیـاوەکە وتـی: نـا سـوێند بەخـوا هەرگیـز هەڵـی نـاگرمەوە لە کاتێکدا پێغەمبەر ﷺ فڕێی دابێت.

پێغەمبەر ﷺ دوو کەس هاتنە لای کە کێشەیان هەبوو فەرمـووی: منـیش مـرۆڤم و ئێوەش کێشەکانتان دێننە لای من، ڕەنگە یەکێکتان نەرمبڕ تر بێت و زمـانی گێـڕانەوەی پاراوتربێت لەوی تریان، ئیـتر بەو بـۆنەیەوە دادوەری بـکەم بەلای ئەوەتانـدا کە زمـان

---

١- صحيح/ رواه مالک و مسلم و ابوداود و الترمذي و النسائي.

پاراوتر و حەقیش نەبوو بێت و بە قازانجی شکابێتەوە، ئەوە پارچەیەکە لە ئاگر بە ویستی خۆی دەیبات یاخود نایبات[1].

'پارچەیەکە لە ئاگر' تەشبیهە بۆ قورسی سزاکەی.

ئەم فەرموودەیە چەند سوودێکی باس دەکەین.

*کەسێک پارەیەک یاخود داهاتێک و سامانێک بە حەرام بۆخۆی دەپچڕێت، لەلای خوا بە حەرام خۆر دەنوسرێت.

*زمان پاراوی و سیاسەت بازی لە پچڕاندنی حەرامدا سزاکەی ئاگری دۆزەخە.

قازانج و سەرمایەیەک بە ماڵی حەرام بنیات بنرێت هیچ کێشێکی نیە و لە کۆتاییدا بە سەر و ماڵەوە بۆ دۆزەخ دەچن، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت:• هەچ کەس داوا و سواڵ و ئەو شتانە بکات بۆ ئەوەی پارەی زۆر ببێت، ئەوە داوای پشکۆی ئاگر دەکات[2].

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: سوێند بەو زاتەی کە نەفسی منی بەدەستە ئەوەی من بینیومە بتانبینیایە کەم پێدەکەنین و زۆر دەگریان، وتیان: یارسول اللە ﷺ چیت بینی وە، فەرمووی: بەهەشت و دۆزەخم بینیوە[3]...



---

١- صحيح مسلم و بخاري.

٢- صحيح احمد ومسلم و ابوداود.

٣- صحيح مسلم و ابويعلى.

## گەرمیی دۆزەخ

  

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ئـاگری دۆزەخ شـکاتی خـۆی بـردە لای پەروەردگـار و وتی: بەشێکم بەشێکی خوارد، خوای گەورە دوو هەناسە و نەفەسی پێ دا، نەفەسـێک لە هاویندا و نەفەسێکیش لە زستاندا، نەفەسی زستانی زەمهەریـرە و نەفسـی هـاوینیش سەمومە[1].

## زیرەکیی ژنێکی باوەڕدار

  

کەنیزەیەکی عبداللەی کوڕی مەرزوق هەبوو، زۆر لە خوا ترس و زیـرەک و بەتوانـا بوو، ڕۆژێکیان عبداللە هەر خەریکی یاری و شـۆخی کـردن بـوو لەگەڵ هاورێکـانی هەتا نوێژەکانی نیوەڕۆ و عەسر و مەغریبی فەوتا، کاتێك نـوێژی عیشـا هـاتە پێشـەوە، کەنیزەکەی پشکۆیەکی ئاگری هێنا و خستیە سەر قاچی عبـداللە، ئەویـش هـاواری لێ هەستا و وتی: ئەوە چیت کرد؟

ژنە باوەڕدارەکە وتـی: لەسـەر پشـکۆیەکی دونیـا خـۆت ڕاناگریـت، ئەی چـۆن لە قیامەت خۆت ڕادەگریت؟!

عبداللە دەستی کرد بە گریـان، زۆر بە کـوڵ دەگریـا، هەسـتا بـۆ نـوێژ و لە دوایـدا ویسـتی خەڵاتێکـی ئەو ژنە بکـات، هەمـوو کەنیزەکەکـانی ئـازاد کـرد و سـەروەت و سامانەکەشی کرد بە خێـر و چـاکە، هەتـا وای لێهـات پـاقلەی دەفرۆشـت، سـوفیانی سەوری و فوزەیلی کوڕی عەیاز هاتن بۆ لای و لە ژێر سەریدا تەنها خشتێکیان بینـی،

---

[1] - صحیح.

سوفیان پێی وت: هەر کەسێک لەبەر خاتری خوا واز لە شتێک بهێنێت خوای گەورە قەرەبووی هەر لە دونیادا بۆ دەنێرێت، چی بۆتۆ ناردوە وەختێ وازت لە دونیا هێناوە؟!

فەرمووی: ڕازی بوونی پێ داوم، ڕازیم بەوەی کە ئێستا تیایدام.

عبدالله لە دوای ئەوە بوویە یەکێک لە دۆستانی خوا و کاتێك ڕۆشت بۆ مەککە و نزیکی کەعبە بوویەوە پرسیاریان لێ کرد کە ئایا بە سواری هاتووە یاخود بەپێ؟

وتی: حەقی بەندەی تاوانبار ئەوەیە کاتێ دەگەڕێتەوە دەرگای گەورەکەی بە کەشخە و سواری نەیەت، ئەگەر بۆم بکرایە بە تەقی سەرم دەهاتم!!

هەموو ئەمانەش لە کێشانەی کردەوە چاکەکانی ئەو ئافرەتە ئیمانـدارەدا دەنوسرێت کە بە پشکۆیەک بەئاگای هێنایەوە.

## ئەو پەرستشانەی ئاگری دۆزەخت لەسەر لادەبەن



حەزرەتی عائیشە دەربارەی حەزرەتی ئەبوبەکر دەگێڕێتەوە 'خوایان لێ ڕازی بێت' کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: "تۆ بەخشراو و ئازادکراوی لە ئاگری دۆزەخ، ئیتر دوای ئەوە ناونرا بە 'عتیق'[1]."

ڕێگای ئازادبوونی گەردنەکانیش لە ئاگری دۆزەخ بەم جۆرەی خوارەوەیە:

١-فرمێسکی پەشیمانی و خۆشەویستی خوا

فەرموودەی حەزرەتی ڕەسول اللهیە ﷺ کە دەفەرموێت دوو چاو کە لە ترسی خوا فرمێسک بڕێژن ئاگری دۆزەخیان بەرناکەوێت.

---

١- صحیح المشکاة.

یەزیدی کوڕی مەرسەد پرسیاریان لێ کرد کە بۆچی چاوی وشک نابێتەوە و هەمیشە دەگری؟!

وتی: بۆچی دەپرسیت؟

وتی: بەڵکو منیش سودێک ببینم!

یەزید وتی: برای خۆم!

خوای تەعالا پەیمانی پێ داین ئەگەر گوناه و تاوان بکەین لە ئاگری دۆزەخدا زیندانیمان دەکات.

سوێند بە خوا ئەگەر وەعدەی زیندانی کردنمان پێ بدات لە حەمامێکیشدا، دەبوو فرمێسکمان وشکی نەکردایە، گریان لە پێناوی خوادا بەرهەمی ترسانە لە خوای تەعالا، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَيَخِرُّونَ لِلْأَذْقَانِ يَبْكُونَ وَيَزِيدُهُمْ خُشُوعًا﴾ (الأسراء: ١٠٩)، واتە: بە ڕوودا دەکەون و دەگرین و بە بیستنی قورئان ترسیان لەخوا زیاد دەکات.

## چاکە بە کەم مەزانن هەرچەندێك بێت

سەعدی کوڕی أبی وەقاصی بە دەنکە خورمایەک خێرو چاکەی کرد، چونکە لە قورئانەوە وەریان گرتبوو کە دەفەرموێت: ﴿فَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُ (٧) وَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُ (٨)﴾ (الزلزلة: ٧-٨)

یەک مسقاڵە زەرە لە خوای گەورە ون نابێت لە خێر و شەڕ.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: هیچ چاکەیەک بە سوک و کەم مەزانن.

لە گۆڕەپانی مەحشەردا حەزرەتی ڕەسول الله ﷺ دەفەرموێت: هەمـوو کەسـێک لە ژێر سێبەری صەدەقە و بەخشین و چاکەکانی خۆیدا دەبێت هەتـا ئەو کـاتەی دادگـای مەحشەر دادەنرێت.[1]

عامری دەفەرموێت: مەبەست لە سێبەر تەنها بۆ تیشکی گەرمـی خـۆری مەحشـەر نیە، بەڵکو لە هەموو ناڕەحەتی و ناخۆشی و ئازارێک دەیپارێزێت.

**٢- نوێژی فەرز و نوێژی سونەت**

حەنزەڵە کە کـاتبی پێغەمـبەر بـوو ﷺ دەفەرموێـت: گـوێم لـێ بـوو پێغەمـبەر ﷺ دەیفەرمـوو: هەچ کەسـێک پێـنج فەرزەی نـوێژ بپارێزێـت بە رکـوع و سـوجدەکانی و کاتەکانیەوە، بزانێت کە ئەم نوێژانە حەقی خواین بەسەریەوە، ئەوە دەچێتە بەهەشـتەوە، یاخود فەرمووی: بەهەشتی لەسەر واجـب دەبێـت، یـان فەرمـووی ئـاگری دۆزەخـی لەسەر حەرام دەبێت[2]، یان فەرمووی ئاگری دۆزەخی لەسەر حەرام دەبێت.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ئاگری دۆزەخ نابینێت کەسێک نوێژی پـێش خـۆرکەوتن و پێش خۆرئاوابوون ئەنجام بدات، واتە نوێژی بەیانی و نوێژی عەسر[3].

## نوێژی بەیانی



پێغەمبەر ﷺ ئامۆژگاریمان دەکات کە ئەوەی نوێژی بەیـانی ئەنجـام بـدات لە ژێـر سایەی خوادایە و خوا دەیپارێزێـت، چـونکە ئەگەر لە ژێـر سـایەی خـوا دەربچـین بە ڕوودا دەمانبەنە ناو ئاگری دۆزەخ.

---

١- صحيح رواه احمد و الحاكم.

٢- رواه احمد بإسناد جيد.

٣- 'صحيح مسلم'.

## نوێژی سوونەت

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: هەر کەسێک پارێزگاری لە چوار ڕکاعەتی پێش نوێژی نیوەڕۆ بکات و ئەنجامیان بدات. لەگەڵ چوار ڕکاعەتی دوای نیوەڕۆ، خوای گەورە ئاگری دۆزەخی لەسەر حەرام دەکات[1].

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ئاگری دۆزەخ بەنی ئادەم دەسوتێنێ، بەڵام شوێنەواری سوجدە ناسوتێنێت[2].

## جیهاد لە ڕێگەی خوادا

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: تەپ و تۆزی جیهاد و غەزا لە ڕێگەی خواو، دوکەڵی دۆزەخ بەیەکەوە کۆنابنەوە[3]!!

## بەرگریکردن لە موسوڵمانێك بە حەق

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: هەچ کەسێک پارێزگاری لە ئابڕو و ناوبانگی موسوڵمانێک بکات کاتێک باسی دەکرێت، خوای گەورە پاداشتی دەداتەوە بەوەی لە ئاگری دۆزەخ دەربازی دەکات و دەیپارێزێت[1].

---

١- صحيح ابوداود.

٢- 'صحيح البخاري و مسلم'.

٣- 'صحيح النسائي و الحاكم'.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: • هە چ کەسێک پشتی برایەکی موسوڵمانی بگرێت بە نادیاری و بەبێ ئەوەی خۆی ئاگای لێ بێت، خوای گەورە پشت و پەنای دەبێت لە دونیا و قیامەت دا[٢].

## نەرم و نیانی

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ئایا پێیتان بڵێم سبەینێ لە قیامەت ئاگری دۆزەخ لەسەر کێ حەرام دەبێت و نایبینێت؟!

لەسەر هەموو کەسێک کە نەرم و نیانە و ئاسانکارە[٣].

نەرم و نیان وەکو: نەرم و نیانی لە وتە و ڕستە و دەربڕین، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: وتەی نەرم و نیان صەدەقە و چاکەیە[٤].

نەرم و نیانی لە خزمەت پەروەردگاردا

نەرم ونیانی مامەڵە لەگەڵ خەڵکیدا: کاتێک خراپەیان بەرامبەر کردیت بەهانە و عوزریان قبوڵ بکەیت.

دادوەری بە دادپەروەرانە: یەکێکە لە ئاکار و ڕەوشتەکانی نەرم و نیانی و مامەڵە جوانی.

لەکاتی کڕین و فرۆشتندا ئاسان کار و نەرم و نیان بیت.

---

١- صحيح احمد الطبراني.

٢- 'حسن/ البيهقي'.

٣- 'صحيح الترمذي و الطبراني'.

٤- صحيح احمد.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: خـوای گەورە ئاسـان کـاری و نەرم و نیـانی لە کـڕین و فرۆشتن و داد و دادوەریدا پێ خۆشە[1].

هەچ کەسێکیش قورئان ناس و دۆستی قورئان بێت، هەموو کاتێک بچێتە خزمەتـی قورئان و بیخوێنێتەوە و لە خزمەتی قورئاندا بێت ئاگری قیامەت نایسوتێنێت.

چـونکە پێغەمـبەر ﷺ دەفەرموێـت: قورئـان شـەفاعەت بـۆ خـاوەنەکەی دەکـات، ئەوەی قورئان بکاتە پێشەوای خۆی بەرەو بەهەشتی دەبات.

ئوم فەزڵ 'دایکی عبداللەی کوڕی عباس' خوایـان لـێ ڕازی بێـت لە پێغەمـبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە حەزرەت ﷺ لە مەکـکە شـەوێکیان هەسـتا سـێ جـار فەرمـووی: یاڕەبی ئایا گەیاندم، عومەری کوڕی خەتـاب هەسـتا لە کاتێکـدا دەپـاڕایەوە لە خـوای گەورە و فەرمووی: بەڵێ سوێند بەخوا گەیاندت و هـانی خەڵکیـدا و هەوڵـی خۆتـت دا، ئامۆژگـاری خەڵکیـت کـرد، پێغەمـبەر ﷺ فەرمـووی: ئـیمان زاڵ دەبێـت و بـڵاو دەبێتەوە هەتا کوفر و بێ دینی دەچێتەوە کونی خۆی، ئیسلام لە ڕێـگەی دەریـاوە بـڵاو دەبێتەوە، ئیمان و ئیسلامەتی دەریاکـانیش دەبڕێـت، زەمانێـک دێـتە پێشـەوە خەڵکـی فێری قورئان دەبن، فێـری دەبـن و دەیخـوێننەوە و لە دوایـدا ئەو خەڵـکە دەڵـێن: ئەوە ئێمەین قورئان فێر بووین و قورئان خوێنین و ئەهلی قورئانین، کێ هەیە لە ئێمە باشـتر بێت؟! پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئایا خێر لەوانەدا هەیە؟

وتیان: یارسول الله ئەوانە کێن؟

فەرمـــووی: ئەوانە لە خۆتـــانن و لەنـــاو خۆتانـــدان و ئەوانە ســـوتەمەنی ئـــاگری دۆزەخن[2].

---

١- صحيح الترمذی و الحاكم.

٢- رواه الطبرانی.

## عاشقانی دۆزەخ



پیاوێک بە شێخ حەسەنی بەصری دەفەرموێت: ئامۆژگاریم بکە!!

شێخ حەسەن فەرمووی: تاوان مەکە، هەتا بەهۆێ تاوانەوە خۆت فڕێ نەدەیتە ئاگری دۆزەخەوە، لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەگەر یەکێک کێچ و ئەسپێیەک بخاتە ئاگرەوە تۆ بەرپەرچی دەدەیتەوە و ڕەخنەی لێ دەگریت، کەچی تۆ ڕۆژانە چەندین جار خۆت فڕێ دەدەیتە ئاگرەوە باکیشت لە خۆت نیە.

یونسی کوڕی عەبید دەفەرموێت: بە حوکمی شەریعەت لەسەر دزینی پێنج درهەم دەست دەبڕێت، گومانی تێدا نیە کە کەمترینی گوناهت خراپترە لە دزینی پێنج درهەم، بە هەموو گوناهێکت ئەندامێکت دەبڕێت لە قیامەتدا.

## ئەوانەی زەکاتی ماڵەکانیان دەرناکەن.



وەک حەزرەتی رسول الله ﷺ دەفەرموێت: ئەوانەی زەکات نادەن پارە و سامانەکانیان دەبێتە هۆکاری سزادانیان و بەو پارە و سامانە تەنیشتەکانیان و نێوچاوان و پشتیان پێ دەسوتێنرێت و داخ دەکرێن و سزا دەدرێن.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ئەوەی زەکات دەرنەکات لە ڕۆژی قیامەتدا لە ئاگردا دەبێت[1].

پێغەمبەر ﷺ وێنەی ئەو سزایەمان پێ دەفەرموێت کە توشی ئەو کەسانە دەبێت زەکات نادەن کە دەفەرموێت: هەچ کەسێک خوای گەورە ماڵ و سامانێکی پێ بەخشی بەڵام زەکاتەکەی لێ نەدا، خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەت دا مارێکی گەورەی ژەهراوی سەر سپی "کە بەهۆی زۆری ژەهرەکەیەوە سەری سپی بووە و کەڵبەدارە و زۆر ترسناکە" دێتە گەردنی ئەو کەسە و لێوەی دەئاڵێت، لێواری دەمی ئەم مرۆڤە دەگەزێت و پێوەی دەدات و ژارەکەی تێ دەکات و پێی دەڵێت: من ماڵەکەی تۆم، من گەنجینە و ئاڵتونەکەی تۆم، ئینجا پێغەمبەر ﷺ ئەم ئایەتەی خوێندەوە کە دەفەرموێت: ﴿وَلَا يَحْسَبَنَّ الَّذِينَ يَبْخَلُونَ بِمَا آتَاهُمُ اللَّهُ مِن فَضْلِهِ هُوَ خَيْرًا لَّهُم بَلْ هُوَ شَرٌّ لَّهُمْ سَيُطَوَّقُونَ مَا بَخِلُوا بِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾ (آل عمران:١٨٠)

واتە: ئەو کەسانەی ڕژدی و ڕەزیلی دەکەن لەو خێر و بێرەی خوا پێی داون بە لوتفی خۆی، با وا نەزانن ئەو ڕژدیە چاکە بۆیان، نەخێر شەڕ و مایەی نەگبەتیە بۆیان و، لە قیامەت دا ئەو ماڵەی لە ڕێگەی خوادا سەرفیان نەکردوە، واتە: ئەو حەقەی لەسەریانە و جێ بەجێیان نەکردوە، واتە ئەو زەکاتی ماڵەی کە نەیانداوە، دەبێتە تەوق و ئەخرێتە گەردنیان، میرات و سامانی ئەرز و ئاسمان هەر بۆ خودایە خودا ئاگای لە هەموو کردوەیەکتانە.



---

١- 'طبرانی'.

# له وتەکانمان بەرپرسیارین!



له ئەبو هورەیرەوه خوای لێ ڕازی بێت دەگێڕنەوه که پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: بەندەی وا هەیه وتەیەک دەردەبڕێت که ڕازی بوونی خوای تێدایه و، کەسەکەش وتەکەی بەلاوە گرنگ نیه، کەچی خوای گەورە چەندین پله بەهۆی ئەو وتەیەوە لەلای خۆی بەرزی دەکاتەوە، بەندەی واش هەیه وشه و وتەیەک دێت بە زوبانیدا، گرنگ نیه بەلایەوه کەچی دەڵێت، بەڵام خوای گەورە توڕەیه لەو وته و خاوەنەکەی و، ئەو وتەیه خاوەنەکەی ڕاپێچی دۆزەخ دەکات[1].

چونکه وەک له فەرموودەدا هاتووە، مرۆڤ بەهۆی بەرچینەی وتەکانیەوە لەسەر ڕوو ڕوخسار ڕادەکێشرێت بۆ دۆزەخ، وە مرۆڤ هەتا بێ دەنگ بێت سەلامەته بۆ قیامەتی، له دوا ڕۆژدا یان به خراپه لەسەری دەنوسرێت یاخود به چاکه. جاری وا هەیه بەهۆی یەک وتەو وشەوه حەفتا پایز تلۆری دۆزەخ دەبێتەوه 'پەنا بەخوا'.

لەبەر ئەوە هەموو وتەیەک پێویستی بەوەیه له سەرەتادا ئاگاداری نیەت و باش وتن و تەقواداری بین، دوای ئەوە خوای گەورە دەرگای خێرت لەسەر دەکاتەوە.



---

١ - رواه البخاري.

# زاڵم و ستەمکاران



ئەبا مەسعودی بەدری خوای لێ ڕازی بێـت دەگێـڕێتەوە کە دەڵێـت: بە قـامچی لە بەندەیەکی خۆمم دەدا، گوێم لە دەنگێک بوو لە پشتمەوە وتی: ئەبا مسعود!!

لەبەر توڕە بوونی خۆم تێ نەگەیشتم.

کە نزیک بوویەوە لێم دەبینم پێغەمـبەری خـودایە ﷺ و دەفەرموێـت: ئەبـا مسـعود بزانە کە خوای گەورە زۆر بە دەسەڵاتە و بەتوانایە بەسـەر تـۆدا و، زیـاتر لەوەی کە تـۆ توانات هەیە بەسەر ئەو بەندەیەدا، وتـم: ئیـتر لەمەو دوا هەرگیـز لە بەنـدە و ژێردەسـتە نادەم، لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە: وتم: یارسول الـلە ﷺ ئەوە لە پێنـاوی خـوادا ئـازاد بێت، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەگەر بەو جۆرە ئازادت نەکردایە ئـاگری دۆزەخـت تـێ بەردەبوو[1].

پێغەمـبەر ﷺ دەفەرموێـت: خـوای گەورە تـۆڵە لە سـتەمکاران دەکـاتەوە، ئیـتر ستەملێکراوان ئیماندارین یاخود کافر و بێ بـڕوابن، چـونکە مـرۆڤ خـوا ژیـانی پـێ بەخشـیوە، پێغەمـبەر ﷺ دەفەرموێـت: خـوای تەبـارەک و تعـالی سـزای ئەو کەسـانە دەدات کە سزای خەڵکیان داوە لە دونیادا[2].

چی بچێنیـت ئەوە دەدوریـتەوە، پێغەمـبەر ﷺ دەفەرموێـت: ئەو کەسـانەی سـزای قورسی خەڵکیان داوە لە دونیادا، هەر ئەوانە قورسترین سزایان هەیە لە ڕۆژی قیـامەت دا.

---

١- صحيح مسلم و ابوداود و الترمزي.

٢- صحيح مسلم و احمد و ابوداود.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ئەوەی زلەیەک، عەزیەتێکی ژێر دەستە و بەندە و کەنیزەکێکی بدات، سڕینەوەی ئەو تاوانە و کەفارەتەکەی ئازاد کردنیەتی[1].

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: هەچ کەسێک بستێک زەوی کەسێک بەناحەق داگیر بکات، خوای گەورە حەوت چینی زەوی دەیباتە خوارەوە و دەچێتە گەردنی لە ڕۆژی قیامەت دا.

## حەقی خەڵکی ترسناکە



فەرموودەی پێغەمبەرە ﷺ کە هەچ کەسێک حەقی برایەک کەسێکی لەلایە، ئیتر ئەو حەقە زوڵمی لێ کردووە، پارەی خواردوە با بیداتەوە و داوای گەردن ئازادی لێ بکات، پێش ئەوەی ڕۆژێ بێتە پێشەوە کە نە دینار و نە درهەم ی پێ نیە و هیچی پێ ناکرێت.

ئەگەر حەقی لەلابوو، لە قیامەت دا ئەگەر کردوەیە باشی هەبوو بە ئەندازەی زوڵمەکەی یان ناحەقیەکەی چاکەکانی دەدرێت بە ستەم لێکراوەکە، ئەگەر چاکەی نەبوو گوناهی هەڵدەگیرێت و دەدرێت بەسەر ئەمدا.

ئەگەر زاڵمەکان ئەم چارەنوسەیان لە پێش چاو بێت دەچن دەستی ستەملێکراوەکان ماچ دەکەن هەتا لێیان خۆش بن.

بەڵام زاڵمەکان بینایان کوێرە و نابینن، ئەو هەمووە ئایەت و فەرموودەیە نابینن کە باسی سزا و لێدان و تۆڵە سەختەکانی قیامەت دەکات بۆ ئەوانەی مافی خەڵکی دەخۆن.

---

١ - 'صحیح ابوداود'.

'علی صالح المرئی' دەربارەی ئەم ئایەتە قورئانیەی کە دەفەرموێت: ﴿وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ الْآزِفَةِ إِذِ الْقُلُوبُ لَدَى الْحَنَاجِرِ كَاظِمِينَ مَا لِلظَّالِمِينَ مِنْ حَمِيمٍ وَلَا شَفِيعٍ يُطَاعُ﴾ (غافر: ١٨)

واتە: تۆ ئەی موحەمەد ئەو کافرانە بترسێنە لە ڕۆژی قیامەت کە هاتنی نزیکە، لەو کاتەدا کە دڵ ئەکەویتە تەپە تەپ و بەرز دەبێتەوە بۆلای گەروو، خەڵکەکەش لەناو خەم و خەفەت کپ و مات و بێ دەنگن و ستەمکاران نە خزم و کەسێکیان هەیە و بەزەییان پیایاندا بێتەوە و، نە تکاکارێکیان هەیە تکایان بۆ بکات و بە گوێی تکاکەی بکرێت.

پیاوێک ئایەتەکەی دەخوێندەوە، 'علی صالح' پێی بڕی و وتی: زاڵم کێ دەتوانێت ببێتە شەفاعەتکاری لە کاتێکدا خوای گەورە لێی دەپرسێتەوە؟

واللە ئەگەر زاڵمەکان و گوناهباران ببینیت چۆن زنجیر دەکرێن و کێش دەکرێن بەرەو دۆزەخ، بە ڕووی ڕەش و سەری شۆڕ و پێی پەتی، چاوەکانیان زەق و ترسا و هاوار دەکەن: خۆمان ڕۆ! وا وەیلا بۆ ئێمە چیمان کرد بە خۆمان ئەمە چی بوو هاتە ڕێگەمان؟ بۆ کوێمان دەبەن؟

فریشتەکان بە ئاسن و شیشی ئاگرین لێیان دەدەن و دەیانبەن، لەسەر دەم ڕایان دەکێشن و سزای قورسیان دەدەن هەتا ناو دۆزەخ، هاوار دەکەن و دەگرین، ئەگەر لە دونیادا بونایە دڵیان لە جەستەیان دەهاتە دەرەوە، هەرگیز خەڵکی دونیا بەرگەی ئەو دیمەنە ترسێنەرە ناگرێت کە بەسەر تاوانبار و زاڵمەکاندا دێت.

# کوشتنی مرۆڤ



وەک فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ ئامـاژەی پـێ دەکـات، کـوژراوی بەنـاحەق سـەری دەگـرێ بە دەسـتیەوە و دەیبـاتە بەردەم عەرشـی خـوا دەڵێـت یـارەبی ئەم کەسـە منـی کوشـت لە دونیـادا، خـوای گەورە بە قـاتڵەکە دەفەرموێـت: چـارەڕەش چیـت کـرد بە خۆت، دەیبەن بۆ دۆزەخ[1].

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَاؤُهُ جَهَنَّمُ خَالِدًا فِيهَا وَغَضِبَ اللَّهُ عَلَيْهِ وَلَعَنَهُ وَأَعَدَّ لَهُ عَذَابًا عَظِيمًا﴾ (النساء: ٩٣)

واتە: هەر کەسێک بە عەمـدی و دەسـت ئەنقەسـت موسـوڵمانێک بکوژێـت، ئەوا جەزاکەی دۆزەخێکە هەتا هەتایە تیایدا دەمێنێتەوە، خوای گەورە ڕقی لێـی هەڵدەسـتێ و نەفرەتی لێ دەکا و سزایەکی گەورەی بۆ ئامادە کردوە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَرْكَنُوا إِلَى الَّذِينَ ظَلَمُوا فَتَمَسَّكُمُ النَّارُ ...﴾ (هـود: ١١٣)

پشتگیری و مەیلتان نەبێت بۆ ئەوانەی زوڵم و ستەم دەکەن، ئەگینـا دەچـنە ئـاگری دۆزەخەوە و دەیچێژن.

ئەگەر تەنها بە پشتگیری و مەیل بۆ زاڵمەکان ئەو سەرەنجامە دروسـت ببێـت، ئەی دەبێت زاڵم خۆی سزاکەی چۆن بێت؟!

دەگێڕنەوە 'موەفەق' نـوێژی بە دوای ئیمامـێکەوە کـرد و، ئـیمامەکەش ئەم ئـایەتەی خوێندەوە، ئیتر موەفەق بێ هۆش کەوت، کاتێک هۆشی هاتەوە، وتیـان: بـۆچی ئـاوا بێ هۆش کەوتی؟!

---

١- 'صحيح'.

وتی: ئەگەر ئەوە سزای پشتگیری زاڵم بێت، ئەی دەبێت حـاڵی زاڵـم خـۆی چـۆن بێت؟!.

## دادوەری و مەسئولیەت و قەزاوەت



پێغەمـبەر ﷺ دەفەرموێـت قازیەکـان سـیانن، دوانیـان لە ئـاگردان و یەکێکیـان لە بەهەشـتدایە، قـازی و دادوەرێـک بە هەوا و ئـارەزوو حـوکم دەکـات لە ئـاگردایە، یەکێکیش بەبێ زانست و زانیاری قەزاوەت دەکات لە ئـاگردایە، قـازیەکیش بە حەق و ڕاستی حوکم دەکات لە بەهەشتدایە[1].

لەبەر ئەوە پیـاو چاکـان هەمیشـە خۆیـان بە دور گرتـوە لەو پـلە و پایـانەی کە لێپرسینەوەی لەسەرە.

فوزەیلی کوڕی عەیاضی دەفەرموێت: پێویستە دادوەر و قازیەکـان ڕۆژێـک لەسـەر کاری قازیەتی بن و ڕۆژی دووەم بگرین بۆ حاڵی خۆیان.

موحەمەدی کوڕی واسع دەفەرموێت: یەکەم کەس بانگ دەکرێت بـۆ لێپرسـینەوەی ڕۆژی قیامەت قازی و دادوەرەکانن.

مەکحول دەفەرموێت: ئەگەر ئیختیارم بـدرێتێ لە نێـوان دادوەری و مەسـئولیەت و لە نێوان مل پەڕاندنم، ئەوە کوشتن و مل پەڕاندن هەڵدەبژێرم.

ئەیوبی سەختیانی دەفەرموێت: هەچ کەسێک زیاتر زانا و عالم بێت، زۆرتر و زیاتر هەڵدێت لە پلە و پایە و مەنصەب!!!

وتیان بە ئیمام سـەوری: شـۆرەیح دادوەری قبـوڵ کـردوە، سـەوری فەرمـووی: چ پیاوێک خەڵەتاندویەتی و لە خشتەی بردوە!

---

١- 'صحيح الطبراني'.

عەمری کوڕی هەبیرە ویستی ئیمام ئەبو حەنیفە ببێتە دادوەر و قـازی، ئیمامـی ئەبـو حەنیفە ڕەتی کردەوە و قبوڵی نەکرد، عەمر سوێندی خوارد کە دەبێـت ابـو حنـیفە سـزا بدات و دارکاری و زیندانی بکات!

توشی سزا و زیندانی بوویەوە، هەتا ڕووخساری ئەبـو حەنـیفە ئاوسـا لە ئەنجـامی لێدان و سـزا، ئیمامـی ئەعـزەم 'ئەبـو حەنـیفە' فەرمـووی: لێـدان بە قـاچی لە دونیـادا ئەهوەنتر و ئاسانترە بۆ من، لەوەی لە قیامەت بەشیشی سورەکراو سزا بدرێم..

## سزای دزی



پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: کەسـانێک دەسـت دەخەنە مـاڵی خـواوە بەبـێ حەق و ڕاستی، ئەوانە لە ڕۆژی قیامەت دا ئاگری دۆزەخ شوێن و مەئوایانە[1].

ئەم فەرموودەیە ئەوانە دەگرێتەوە کە بەرتیل دەخۆن، فێڵ دەکەن و پـارەی مـیلەت بە هەدەر دەدەن، معاشی زەبەلاح بەسەر پارەی میلەتەوە بۆ خۆیان دەبەن و لـوقمەی دز و جەردەکـانیش دەکەن، ئەوانەی خیـانەت لە مـاڵ و سـامانی خەڵکـی دەکەن، یـاخود لەسەرو خۆیانەوە هەرچی پارە و عەرزە و داهاتێکیان پـێ درا وەکـو غەنـیمەت وەری دەگرن و خۆیشیان بە بەرپرسیار نازانن!!

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَـأْكُلُوا أَمْـوَالَكُم بَيْـنَكُم بِالْبَاطِـلِ وَتُـدْلُوا بِهَـا إِلَى الْحُكَّامِ لِتَأْكُلُوا فَرِيقًا مِّنْ أَمْوَالِ النَّاسِ بِالْإِثْمِ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ (البقرة: ١٨٨)

واتە: ئەی خەڵکینە لەناو خۆتاندا ماڵ و دارایی خۆتان بە نـاڕەواو حەرام مەخـۆن و ماڵتان مەدەن بە فەرمانڕەوا و کاربەدەستەکان بۆ ئەوەی لایەنتان بگـرن و ناحەقتـان بـۆ

---

١ - 'صحيح البخاري'.

بکەنە حەق وماڵی خەڵک بە نـاحەق بخـۆن و گوناهبـارین، کە زۆر باشـیش ئەزانـن ناحەقە.

## بانگخوازە خراپ و بێ کەڵکەکان



لە ئەنەسـی کـوڕی مـالکەوە 'خـوای لـێ ڕازی بێـت' دەفەرموێـت: پێغەمـبەر ﷺ دەفەرموێت: شەوی ئیسراء پیاوانێکم بینی لێویان بە مقەستی ئاگرین دەبڕین!

وتم: جوبرەئیل ئەمانە کێن ئاوا سزا دەدرێن؟

وتی: ئەمانە خەطیب و وتاربێژەکانی ئومەتی تۆن، کە هانی خەڵکـی دەدەن لەسـەر چاکە کردن و خۆیانیان بیر چۆتەوە کە بە گوێی خۆیان بکەن، لە کاتێکدا ئەمانە دەچـنە خزمەتی قورئان و دەیخوێننەوە، ئایا وەختی ئەوە نەهاتوە ژیر و عاقڵ بین[1].

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: تەنها هاوڕێیەتی ئیمانـدار بـکە، بـا خەڵکـی بە تەقـواش نانت بخۆن.

پێغەمبەر ﷺ فێرمان دەکات کە دوعا بکەین و بڵێین خـوایە پەنـات پـێ دەگـرین لە ڕۆژ و شەوی خراپ و لە سـەعاتی خـراپ و هـاوڕێ و دراوسـێی خـراپ لە شـوێنی مانەوەمان 'اللَّهُمَّ إني أعُوذُ بكَ مِنْ يَوْمِ السُّوءِ، وَمِنْ لَيْلَـةِ السُّـوءِ، وَمِـنْ سَـاعَةِ السُّـوءِ، وَمِنْ صَاحِبِ السُّوءِ، وَمِنْ جَارِ السُّوءِ في دَارِ الْمُقامَةِ'[2].

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿الأَخِـلاَّءُ يَوْمَئِـذٍ بَعْضُـهُمْ لِـبَعْضٍ عَـدُوٌّ إِلاَّ الْمُتَّقِـينَ﴾ (الزخرف: ٦٧)

---

١- رواه ابن ابی الدنیا ابن حبان فی صحیحه.

٢- حسن/ الطبرانی.

واتە: دۆست و هاورێ و برادەران لەو ڕۆژەدا 'قیامەت' هەندێککیان دوژمنی هەندێکیانن، چونکە تێ دەگەن کە ئەوان بوون بە هۆی گومڕا بوونیان، تەنها دۆست و هاوڕێی وانەبێ لە دونیادا لەخوا ترس بووبن، ئەوانە هەر لەسەر دۆستایەتی خۆیان ئەمێننەوە.

بۆیە حەزرەتی عمر و عبداللەی کوڕی عباد و نعمانی کوڕی بەشیر و موجاهید و بێجگە لەوانیش کە ڕیوایەت دەکەن لە حەزرەتی عومەرەوە کە فەرموویەتی: حەشری سووخۆر لەگەڵ سوو خۆردایە، زیناکەر لەگەڵ زیناکەر، عارەق خۆر لەگەڵ عارەق خۆر.

## خۆپارێزی لە داوێن پیسی و بەدڕەوشتی

خواردنەوەی مەی حەرامە با کەمیش بێت، هەر لەبەر ئەوەشە تەماشای نامەحرەم مرۆڤ دەبات بەرەو داوێن پیسی، تەماشای نامەحرەمیش حەرام و گوناهە، پێویستە گوناه ئابڵۆقە بدرێت هەتا ڕێگە لە بڵاو بوونەوەی بگیرێت.

عیشق بازی و دڵداری

عشق و دڵداری دڵ و ئەندامەکان وێران دەکات، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: چاو زینا دەکات، دەست زینا دەکات، قاچەکان زینا دەکەن، عەورەت زینا دەکات[1].

---

١- صحيح احمد و الطبراني.

عیشق دەچێتە ناو هەموو ئەندامەکان، زینای چاو ئەوەیە سەیری دیمەنی حەرامی پێ دەکەیت، زینای زوبان وشە حەرامەکانی عیشق و غەرامیاتە، زینای بیستن گوێ گرتنە لە غەزەلەکانی بەرامبەر، زینای قاچ ڕۆشتنە بۆ مەوعیدی تاوان و هەڵخلیسکان و بازارە ناشیرینەکەی شەیتان، زینای دەست بەرکەوتەی حەرامەکان، یەکێک لەمانە بەسە بۆ ئەوەی مرۆڤ بباتە ناو دۆزەخەوە، ئەی چۆنە کاتێک هەموویان لە داوێن پیسی کۆدەبنەوە و عەورەت کارەکە بە پایان دەگەیەنێت تێکەڵ بە گوناهە گەورەکەت دەکات!!

سەرەتای عیشق و دڵداری سەیر کردن و نەزەرێکە و کۆتاییەکەی وێران بوونی دڵە و تیا چوونێتی لە زەلکاوی تاوانباریدا.

لە قیامەتیش بەدڵی ساغ ڕزگارت دەبێت، کە دڵ کێم و پیسی تاوانی زینای لێ بتکێت چۆن ڕزگارت دەبێت؟!

عاشقەکان لە دونیادا چێژ لە عیشقەکەیان نابینن، هەموو خەم و خەفەتێک دڵیان داگیر دەکات، چ جای ئەوەی لە قیامەت خەجاڵەتی و سەر شۆڕیان دەرخوارد دەدرێت و دەبێتە هۆی ئازارێک کە بەرگەی ناگرن.

باشترین ڕێگە خۆپارێزیە لەو فیتنە و داوە شەیتانیەی کە زۆرێک لە مرۆڤەکانی گیرۆدە کردوە.

مەعازی کوڕی جەبەل دەفەرموێت: باوەڕدار ترس و بیمی نارەوێتەوە هەتا لە پردی سەر دۆزەخ 'پردی سراط' نەپەڕێتەوە.

سوفیان دەفەرموێت: ئیبن ئەبجەر ئەوەندە بە تەنگ کاتەکانیەوە بوو، دەیوت چەند سەعاتمان لە حەمامدا بەفیرۆ چوو!!.

# ڕووبەڕووی خۆت ببەرەوە

• ٧٧٠  ٧٧٠ •

ئیمامی غەزالی دەفەرموێت: ئەوە بۆچی سەیرێکی خۆت و ژیانی خۆت ناکەیت، ڕەنگە کوفرێکی شاراوە ناو دەروونی داگیر کردبێت کە ئەویش لاوازی باوەڕبونتە بە ڕۆژی قیامەت، مەحشەر و پردی سراط و پاداشت و سزای دواڕۆژ، زۆر کەم فامیە ئەگەر گوێ بە عیبادەت و ترسی خودا نەدەیت و وابزانیت لێبوردنی خوایی هەموو کەسێک دەگرێتەوە بەبێ کردەوەی باش و جوانی تۆ بە هەڕەمەکی دەچیتە بەهەشتەوە.

لەسەر سێ درهەم دەستی دز دەبڕێت لە شەریعەتی ئیسلامدا، بەقەد سەرە دەرزیەک ئارەق دارکاری و جەلدی لەسەرە، ژنێ فڕێ درایە دۆزەخەوە لەسەر ئەوەی سزای پشیلەیەکی دا، حسابی ڕۆژی قیامەت زۆر نزیکە و، خوای گەورە کردەوەکانمان بۆ هەڵدەگرێت و تۆماریان دەکات و ڕەقیب و ئاگادارە، ... ﴿وَمَا كَانَ رَبُّكَ نَسِيًّا﴾ (مريم: ٦٤)

هیچ شتێک لە خوای گەورە ون نابێت.

ئەوانەی دورن لە غورور و خۆ بە گەورە زانی زۆر نزیکن لە خوای گەورە، چونکە هەرچی گوێڕایەڵیەکیان هەبێت بە هی خوای دەزانن نەک هی خۆیان، خۆیان بە سفری سفر دەزانن، وەختێک حەزرەتی فاروق 'عمری کوڕی خطاب' خوای لێ ڕازی بێت، بە خەنجەر لێی درا و بەهۆیەوە شەهید بوو، ئازاری هەبوو، عبداللەی کوڕی عباس دڵخۆشی دەدایەوە و وتی: ئەی ئەمیری ئیمانداران: تۆ هاوەڵێتی پێغەمبەرت کردوە ﷺ زۆر هاوەڵێکی باشی بوویت، وەختێ حەزرەت ﷺ کۆچی دوایی کردوە لێت ڕازی بووە، لە پاشان هاوەڵێتی حەزرەتی ئەبو بەکرت کردوە خوای لێ ڕازی بێت، کاتێ کۆچی دوایی کردوە لە تۆ ڕازی بووە، لە پاشان هاوەڵێتی هاوەڵانت کردوە لێت ڕازی بوون، ئەگەر لێشیان جیابیبیتەوە و بمریت بکەیت، موسوڵمانان لەتۆ ڕازین، حەزرەتی عومەر فەرمووی: ئەوەی کە باست کرد لە

هاوەڵیتی پێغەمبەر ﷺ و ڕازی بوونی، ئەوە منەت و فەزڵی خوایە بەسەر منەوە، ڕازی بوونی حەزرەتی ابوبکریش منەت و فەزڵی خوایە بەسەر منەوە و هیچی هی من نیە، ئەوەش کە دەیبینی لە ئازار و ناڕەحەتیم، ئەوە لەبەر تۆ و هاوەڵانتە، واللە ئەگەر بەقەد هەموو سەر زەوی ئاڵتونم هەبێت و بیبەخشم لە ترسی سزای قیامەت و دوارۆژێک کە لێم نزیک بووەتەوە، پێش ئەوەی بیبینم ئەوە دەمبەخشی.

پارێزگاری لە گەنجینەکانی عیبادەت و چاکەکانتان بکەن بەوەی بۆ خوای بکەن، نەک بۆ ڕوپامایی و بۆ حزب و گروپ و بەرچاوی و پیاهەڵدان و پارە و پار و پلەی دونیایی!!

کردەوە باشەکانتان، عیبادەتتان چەندە بۆتان دەکرێت لەپێش چاوی خەڵکی دایمەنێن و بانگەشەی بۆ مەکەن، ئەگینا دەدزرێت و هەرگیز وەک چاکەیەک بۆ ئێوە نامێنێتەوە!

ئاگاتان لەم گەنجینانە بێت، هەرگیز قەرەبوو ناکرێتەوە، ڕۆژانە گەنجینەکانی نوێژ و دوعا و زیکر و چاکە و خێرکردن و چاکە جیاوازەکان فەرامۆش مەکەن.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: نوێژ نور و ڕووناکیە، زەکات بورهان و بەڵگەیە، ئارام گرتن چرای ڕێیە، قورئان یان شەفاعەتت بۆ دەکات یاخود سکاڵات لە دەست دەکات.

ئیمامی ناوازە 'سیری سەقطي' ئەم هەنگاوانەی پێغەمبەری ﷺ پاراست و جێ بەجێی کرد، کاتێک باشترین و نەجیبترین قوتابی خۆی کە 'شێخ جونەید' ی بەغدادی بوو پێ وت: خەزێنە و گەنجینەت با گۆڕەکەت بێت، پڕی بکە لە خێر و چاکە، هەتا کاتێک دەچیتە ناویەوە دڵت خۆش بێت بەو چاکانەی کە پێش خۆت ناردوتە...

## مژدەكانی نەبیی ئەكرەم ﷺ

ئەنەس خوای لێ ڕازی بێت دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: چـوار كەس لە دۆزەخ دەردێنن دەبرێنە خزمەتی پەروەردگار، فەرمـان دەكـات كە بیـانبەنەوە بـۆ نـاو دۆزەخ، یەكێكیان لادەكاتەوە و دەڵێت: یاربي مـن ئومێـدم دەكـرد كە لە ئـاگری دۆزەخ دەرتهێنام، ئیتر نەمگێڕیتەوە بۆ ناو دۆزەخ، خوای گەورە دەفەرموێت ناتگێڕینەوە بۆ نـاو دۆزەخ[1].

## سوێند بە خودا، حەق تەعالا خۆشەویستی خۆی ناخاتە ئاگری دۆزەخەوە

ئەنەسی كوڕی مالـك بۆمـان دەگێـڕێتەوە و دەفەرموێـت: پێغەمـبەر ﷺ تـێ پەڕی بەلای هەندێ لە هاوەڵانیـدا، مناڵێـك لە ناوەڕاسـتی ڕێگـاكەدا بـوو، كاتێـك دایكـی منـاڵەكە ئەسـپ و وشـترەكانی بینـی ترسـا لەوەی منـاڵەكەی بشـێلن بەدەم هـاوارەوە پەلاماری مناڵەكەی دا دوری خستەوە، ژنەكە هاواری دەكرد: كوڕەكەم... كوڕەكەم!

ئیتر مناڵەكەی دورخستەوە، ئەوانەی لە خزمەتی پێغەمـبەردا بـوون ﷺ وتیـان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو ژنە مناڵەكەی ناخاتە ئـاگرەوە، پێغەمـبەر ﷺ فەرمـووی "دەی سوێند بە خوا، خوای تعالا خۆشەویستی خۆی ناخاتە ئاگرەوە".

---

١- 'صحيح رواه أحمد'.

با گومانی باش به خوای گەورە ببەین، خوایەکی رحیم و وەدود و لەطیف. پیاوێکی عەرەبی دەشتەکی جەنازەیەکی بینی کە بەرەو ڕوویان دەهات، وتی: بەخ بەخ بۆ تۆ... بەخ بەخ بۆ تۆ 'بە مردوەکەی وت' وتیان پێی: ئەی کابرا! ئایا دەیناسیت؟!

وتی: نەخێر، بەڵام دەزانم بۆ خزمەت خوایەکی بەڕەحم دەچێت، دەچێتە خزمەتی 'أرحم الراحمین'.

## دەترسم لەوەی کە نەترسیت لە قیامەت

موغیرەی کوڕی مەخادش ڕۆشت بۆلای شێخ حەسەنی بەصری و پێی وت: ئێمە چی بکەین! کۆمەڵێک لە موسوڵمانان ئەوەندە بە قیامەت دەمانترسێنن، کە خەریکە دڵمان دێتە دەرەوە!

شێخ حەسەنی بەصری فەرمووی: واللە هاوەڵێتی خەڵکانێک بکەیت کە دەترسێنن باشترە، چونکە ئەو ترس و ئاگاداربوونە دەتگەیەنێتە ئەمانی و سەلامەتی لە قیامەت، ئەوە زۆر باشترە لەوەی هاوەڵێتی کۆمەڵێک بکەیت، پێت بڵێن ئەو ترس و ئاگاداربوونەی ناوێت و سەرەنجام بکەویتە ترس و بیمێکەوە کە کۆتایی نایەت!

## خۆشەویستی خوا بێ سنورە!

خوای باڵادەست هەمووانی خۆش دەوێت، بە جۆرێک لە سەروو تێگەیشتنی ئێمەوەیە، بەڵام ئێمە بەناوی خواوە پێداگری لەسەر کەم پیشاندانی ئەو خۆشەویستیە دەکەین، هەتا بەرژەوەندیەکی ساختە بەدەست بهێنین.

## پێڕست


پێشەکی ........................................ ٣
سەرە قەڵەمێک لە چڵە پۆپەی جیهانی هەمیشەییەوە! ........ ٩
مردووەکان دەدوێن .................................... ٢٨
لێکۆڵینەوە زانستیەکان ................................ ٣٧
شێخ ڕازی ............................................ ٤٥
گەنجینەی گەیلانی .................................... ٥٤
مامۆستا جمال گەیلانی گێڕایەوە ........................ ٥٤
تۆ خۆشەویستی ........................................ ٥٧
دکتۆر ئیبین ئەلیکسەندەر() ............................ ٥٨
چل هەزار بەسەرهاتی ئەزموونەکان ....................... ٨٣
دوو مامۆستا .......................................... ٨٤
یا غفور .............................................. ٨٧
زانست و زانیاریم کەمتر بوو لە یاری مناڵان............... ٩٠
دوو بڵێسەی ڕەشم بینی ................................. ٩٢
یەکەم دان کەوتنی مناڵی خۆمم لەوێ بینیەوە............... ٩٤
لەسەر گەڵای درەختەکە ناوی زیندوان نوسرابوو ............ ٩٨
چارەسەر نوێژکردنە ..................................... ٩٩
بینیم کە بچووکترین کرداری خراپ زۆرترین کاریگەری لەسەر خەڵکی بەجێ دێڵێت.. ١٠٠
ڕۆژەکانی ژیانمان دیاری خوایین.......................... ١٠٣
ئەزموونی ئافرەتێکی جولەکە .............................. ١٠٤
لەوێ لێت دەپرسن چۆن پارەت پەیدا کرد؟! .................. ١٠٥
قەناعەت پێکردن بە زۆر نییە، بە بەشداریە.................. ١٠٧
لە نیشتیمانی ڕاستەقینە شارێکی بێ وێنەم بینی............... ١٠٨
پێش تەقینەوەکە بە چەند چرکەیەك لە جەستەم چوومە دەرەوە ........ ١١٠
ئاگرێکی گەورەم بینی..................................... ١١٢

نێوان ئاسمانەکان و زەوی چۆڵ و خاڵی نیە ........................ ١١٤
تێگەیشتم لەوێوە دەست بە چارەسەر کرا ........................ ١١٤
غایفەر، ئەو پیاوەی خەڵکێکی زۆری بینی ........................ ١١٦
چواردەورم چیای زۆر بەرز و جوان بوو........................ ١١٧
کچی مێردەکەمم لەوێ بینی ........................ ١١٨
چەند جارێك ئەزموونەکەم بینی ........................ ١٢٠
ئەزموونی ((کارل غورتز))........................ ١٢١
ئەزموونە گرنگەکەی ((ئیهاب))........................ ١٢٢
جێگەی بایەخی هەموو جیهانە ........................ ١٢٩
پرۆفیسۆر ((هوارد ستورم)) بەرەو نوری ئیمان بە خوا ........................ ١٣١
یەکەم جار بوو هاوار لە خوای گەورە بکەم........................ ١٤٠
پزیشکێکی رووسی و ئەزموونەکەی ........................ ١٤٣
نۆ دەقەی ئێرەی خایەند، بەڵام زۆری بەرزەخ بوو........................ ١٤٦
مێشك تەنها وەرگرێکە ........................ ١٤٨
ئەزموونەکەم خۆشەویستی بێ مەرج بوو ........................ ١٥٠
پیاوێك لە ساڵی (١٩٩٧) ئەم ئەزموونە گرنگە دەبینێت ........................ ١٥١
ئەزموونداران ........................ ١٥٣
مردوویەك پێنج جار هاواری بۆ هاورێکەی برد ........................ ١٥٤
جیهانی خوارووم بینی ........................ ١٥٦
ئەم ئەزموونەی خەڵاتی خوایە ........................ ١٥٨
هەرگیز لە ژیانی دونیادا ئەو جۆرە خۆشەویستیەم نەبینیوە........................ ١٥٩
ئافرەتێکی نابینا ئاخیرەتی بینی ........................ ١٦٢
عەبلە لە بەلجیکا........................ ١٦٤
چاکە و قورئان و سوورەتی فاتیحە بە مردووەکان دەگات ........................ ١٦٥
وتیان پێم: نابێت هەموو شتێك باس بکەیت ........................ ١٦٨
یادی مردن وامان لێ دەکات نوسخەیەکی باشتری خۆمان بین ........................ ١٧٠
ئەزموونی پزیشکێکی شارەزا لە ئەزموونەکان ........................ ١٧٢

هەموو چرکەیەك ئامادەی مردنم ........................ ١٧٥
من دڵخۆشم کە ئێستا لێرەم ........................ ١٧٧
ترسم لە مردن نەماوە ........................ ١٧٩
ئەزموونەکان لەسەرو زانستی مرۆڤەوەن ........................ ١٨١
ستەمی لە ژنەکەی کرد دۆزەخی بینی ........................ ١٨٥
لەوێ گەیشتم بە خزمەتی حەزرەتی موحەممەد مصطفی ﷺ ........................ ١٨٩
طۆنی........................ ١٩٢
ئەو ژنەی لە ژێر چل مەتر ئاودا ئەزموونەکەی بینی ........................ ١٩٤
ڕابردوو و داهاتووم وەك یەك دەبینی ........................ ١٩٦
دایکم لە ئاگر ڕزگار بکە ........................ ١٩٧
مێژووی گەڕانەوەی بۆ نیشتیمان نووسی بوو........................ ١٩٩
ئەزموونی ڕانیڵ زۆر سەیرە!! ........................ ٢٠٠
لە دیوارەکە نوسرابوو هاری لە دۆزەخە........................ ٢٠٥
لەباربردن زۆر ترسناکە ........................ ٢٠٧
کوتوپڕ هەموو شتێك گۆڕا ........................ ٢٠٨
ماجیدة خەطیب ........................ ٢١٢
بۆ ئیماندار مردن ئاستەنگێك نیە ........................ ٢١٥
زۆربەی ڕاستیەکان ئێمەی مرۆڤ هیچیان لە بارەوە نازانین........................ ٢١٦
(بام بارت) سەرۆکی حزبی دیموکراتیە لە (ئیدمانتن) ئەزموونەکەی بینی........................ ٢١٧
ژیانی دونیا تەنها چاو تروکانێکە لە چاو بەرزەخ و قیامەتدا........................ ٢١٨
((نیکۆڵ)) ئافرەتێکە ((٤٥)) چرکە ئەزموونەکەی بینیوە ........................ ٢٢٠
خۆکوشتن ((ئینتحار)) مەترسیەکی گەورەیە بۆ قیامەت ........................ ٢٢٣
منداڵان و ئەزموونی نزیکبوونەوە لە مردن ........................ ٢٢٦
عەمیدی خانەنشینی عێراق فهد سەعدون ئەزموونەکەی بینی ........................ ٢٢٧
ڕووناکی هەموو ژوورەکەی داپۆشی........................ ٢٣٣
فریشتەی مەرگم زۆر خۆش دەوێت ........................ ٢٣٦
ئەزموونی (موحەممەد زەمانی) ........................ ٢٤٣

پویا باجەلانی.......................................................٢٥٦
دیداری ئاشناکان.......................................................٢٦٢
لەویَ دڵتەنگی نامێنێت..................................................٢٧٠
زانیم لە قەدیمەوە ئاشنای دوو فریشتەکەم.............................٢٧٥
٧خزمەتی خێزان و مناڵەکانت، زەمینەیەکی بە پیتە بۆ پاداشتی قیامەت...............٢٧٨
تونەیلێکی پڕ شەپۆل.......................................................٢٨٦
مناڵی کۆچ کردوو شەفاعەت کاری قیامەتە..................................٢٨٩
هەفتەیەك لەو دونیا بووم.................................................٢٩٣
گەردەلولێکی ترسناکم بینی..............................................٣٠١
ژیان بەخششی خوایە.......................................................٣٠٨
دوای ئەزموونەکەم، زۆر باش بووم بۆ خێزانم............................٣١٢
قەیتان بەستنی پێڵاوی دونیای خۆمم بینیەوە..............................٣١٦
دوعای دایکێك بۆ گەڕانەوەی کوڕەکەی...................................٣٢٠
ئەزموونی دوای کەوتنە خوارەوەم........................................٣٢٥
ئەزموونی دووەمی ((ڕەزا ئێران شاهی))..................................٣٢٦
خێراتر لەوەی بیێورێت گەڕێنرامەوە.....................................٣٢٨
دورگەی "کیش".............................................................٣٣٤
لە مەیتخانە زیندوو بوومەوە.............................................٣٤٠
دوای مردن ژیان بەردەوامە، بەڵام بۆ قۆناغێکی زۆر باڵاتر....................٣٤٦
پارەی حەرام لە دونیا ماڵ وێرانت دەکات..................................٣٥٢
ئەزموونی "سەعیدخانی"....................................................٣٥٧
دیمەنی سەرەتای دروستبوونی گەردوونم بینی.............................٣٦٣
لەو دونیا خەبەرم بوویەوە.................................................٣٧٢
ئەوەی نەیبینێت نازانێت...................................................٣٨٥
مێردەکەم دەزانێت کە من هەرگیز درۆ ناکەم.............................٣٩٥
ئەزموونەکان پڕن لە نهێنی و پەنهانی ورد...............................٤٠٠
جارێکی تر غەرقی ناو جەستە بوومەوە....................................٤٠٤

من ئازاری ڕۆح دەرچوونم هەبوو.......................................٤١٠
نزیکبوونەوە لە مردن .............................................٤٢٢
خۆشیەکانی ئەوێ هەستی دایکایەتی لێ گرتمەوە......................٤٢٢
عبدالأمین لورستانی ..............................................٤٢٧
مەعصومەی شەفیعی................................................٤٥٢
ئەزموونەکەی ئاوایی "ئاب سەرد" ..................................٤٥٨
سەید صادقی ......................................................٤٧١
لە ئەصلدا من ئەمە بووم کە پێی گەیشتم ............................٤٧٤
نوێژە فەوتاوەکانم قەزا کردەوە ......................................٤٨٩
حەقیقەت لە دوای مردنە ..........................................٥٠٠
مردن ترسی ناوێت .................................................٥٠٩
چێژ لە گوناهـ مەبینن ..............................................٥١٢
ژیانی دونیا زۆر کورتە...............................................٥٢٢
لە جیهانی بەرزەخ بێ تاقەتی و وەرس بوون نیە ......................٥٢٧
نوێژ گەورەترین دەسمایەی قیامەتە...................................٥٣٤
گەڕامەوە و مۆڵەتیان دام............................................٥٣٩
غەریبەیەک بوون وەک ناسراوێکی قەدیمی دەردەکەوتن ...................٥٤٥
دونیا شوێنی چاندنە و حسابێکی طولانی لە دوایە.......................٥٥٢
ئەزموونی دووەمم...................................................٥٥٦
هەستم کرد من مرۆڤە جەستەدارەکەی زەوی نیم.........................٥٥٩
دەستم بەربدە وا گەورەی ڕێزدار هات .................................٥٦٦
ئەزموونەکەم بە تەواوی منی گۆڕی ...................................٥٧٣
ئەزموونی حاجی ئاواتی چەمچەماڵ.....................................٥٨٢
ئەزموونی کاک حمە جلالی بانگوێژ....................................٥٩٨
پیاوێك لە شاری سلێمانی............................................٥٩٩
لە هەولێر ..........................................................٦٠٠
((صەفیە خان)) (صەفیە سید گوڵ ماوەتی) ...............................٦٠١

حاجی هیوای شێخ جمالی تەکیەی قەرەداغ........................٦٠٢
ئەزموونی دادە زەینەب موحەممەد لە بەڵخەی قەرەداغ..................٦٠٤
((ئەزموونێکی نموونەیی)) ...............................................٦٠٥
داستانی قرگەی سلێمانی و ئەزموونەکەی کاك عمر ...........................٦١٢
((مامۆستا ملا عبداللەی سەنگاوی)).........................................٦١٤
عەوداڵی لیقای خوا..........................................................٦١٥
لە بەرزەخەوە هەواڵی نارد ...................................................٦١٦
((ئەجەل))..........................................................................٦١٧
لە ڕێگەی موصڵ ...................................................................٦١٨
سیانزە پێشمەرگە بووین .........................................................٦١٩
مامۆستا مەلا ڕەزای تەکیە لە بەرنامەی (شیرین چا) باسی ئەجەلی کرد و پاش دوو مانگ
وەفاتی کرد!! ....................................................................٦٢٢
دکتۆر عوسمان هەڵەبجەیی .......................................................٦٢٣
دکتۆر هەڵوان عبدالرحمن/پسپۆڕی نەشتەرگەری گشتی...........................٦٢٤
ساڵێکت ماوە.......................................................................٦٢٦
فریشتەی مەرگ لە سنوری پێنجوێن پێی وتم:...................................٦٢٧
نیشانەی مردنت خۆر هەڵهاتنی بەیانیە! ........................................٦٢٨
سورەتی (یس) فریاد ڕەسە بۆ بەرزەخ و قیامەت ..................................٦٢٩
دە ڕۆژ پێش وەفاتی پێیان وتبوو! ..............................................٦٣١
دوو مەلائیکە بوون هاتنە ژوورەوە ..............................................٦٣٢
جەستەی  مرۆڤ قەبری ڕۆحە....................................................٦٣٥
حاجی خاتوون ......................................................................٦٣٧
کاك ئامانج موحەممەد أمین ئەردەڵانی .........................................٦٤٠
دکتۆر عدنان عبدالقادر هەورامانی..............................................٦٤٣
شێخ أکرم شێخ حمە صاڵحی سەنگاوی .........................................٦٤٦
دادە ((مریم))ی تەکیەی قەرەداغ ...............................................٦٤٨
گۆڕستانی شێخ أحمدی هیندی ...................................................٦٥٠

شێخ وەهابی قەرەداغی........................ ٦٥١
خاڵۆ شێخ ئەو ڕەحمانی خەرپانی ........................ ٦٥٣
وەفاتی مامۆستا شێخ مصطفی)ی قەرەداغی ........................ ٦٥٦
کاك مصطفی حاجی فاتح لە چەمچەماڵ ........................ ٦٥٧
مامۆستا مەلا عەلی سید سادقی لە پێنجوێن........................ ٦٦١
قیامەتی بچووك و قیامەتی گەورە........................ ٦٦٤
ڕۆح کێشان........................ ٦٦٥
گومانی باش بە خوای گەورە ببەن........................ ٦٧٢
فریشتەی ڕەحمەت مژدە دەدەن بە ئیماندار لە کاتی سەرە مەرگدا........................ ٦٧٤
ڕۆحی مناڵان لە ژیانی بەرزەخدا ........................ ٦٧٥
جیاوازی نێوان خۆشەویستی و عیشق ........................ ٦٨٢
بەهەشت بۆچی؟ ........................ ٦٨٢
پێویستیەکانی سەفەر ........................ ٦٨٣
لە نێوان عیشقێك و عیشقێکی تردا........................ ٦٨٦
باشترین بردنەوە........................ ٦٨٧
پێوانەیەکی ورد و سەرنج ڕاکێش........................ ٦٨٨
شەوق بە ئەندازەی سوتانە........................ ٦٨٨
نیعمەت و خۆشیەکانی بەهەشت جۆراو جۆرن ........................ ٦٩٠
فراوانی دەرگاکانی بەهەشت ........................ ٦٩٥
چێژەکانی جیهانی بینین ........................ ٦٩٧
حۆریەکانی بەهەشت ........................ ٦٩٧
بینینی خوای گەورە ........................ ٦٩٨
چێژە دەروونی و ڕۆحیەکان........................ ٧٠٠
بەهەشت ڕق و حەسادەتی تیا نیە ........................ ٧٠١
ئەوەی شاراوەیە و باس نەکراو گەورەترو زیاترە........................ ٧٠٤
چۆن بگەینە بردنەوە گەورەکە و بەهەشتی هەتا هەتایی؟! ........................ ٧٠٥
شەیدایانی بەهەشت........................ ٧١٠

جۆرەکانی زیکر دابەش دەبن بۆ دوو جۆر ........................ ٧١١
ئایەتێکی زۆر گەورە................................................... ٧١٢
دوعای چوونە ناو بازاڕ.................................................. ٧١٢
پرسیار و داوای بەهەشت................................................ ٧١٤
نوێژ ............................................................... ٧١٥
ڕۆژوو............................................................... ٧١٥
جهاد لە ڕێگەی خوادا.................................................. ٧١٦
دایک ............................................................... ٧١٦
چاک بوون لەگەڵ مێرد................................................. ٧١٨
ڕەووشت جوانی ....................................................... ٧١٨
بازاڕ و دادگا......................................................... ٧١٩
ئیمانداری ئاخرزەمان.................................................. ٧١٩
سفوری بۆ قیامەت ترسناکە............................................. ٧٢٠
دراوسێی خراپ......................................................... ٧٢٢
دڵ نەخۆشەکان ........................................................ ٧٢٢
خۆبەزلزان ........................................................... ٧٢٢
قسە هێنان و قسە بردن ................................................ ٧٢٣
پارە و سامانی حەرام ................................................. ٧٢٤
پێشەوا و ئیمامی فێڵ باز و ساختەکار .................................. ٧٢٥
دەبێت کاری یەکەمی دونیامان قیامەت و بەهەشت بێت ..................... ٧٢٦
هەشت ڕێگا ........................................................... ٧٢٨
گوناهەکانت بکەرە پیلکانەی سەرکەوتنت.................................. ٧٢٨
خێری دوای مردن....................................................... ٧٢٩
بانەبینە سوتەمەنی دۆزەخ............................................... ٧٢٩
دورخستنەوەی شەڕ و خراپە.............................................. ٧٣١
چارەسەری دڵڕەقی...................................................... ٧٣١
دۆزەخ چی دەکات؟ ..................................................... ٧٣٢

دۆزەخ دروستکراوێکی زیندوە.................................................. ٧٣٣
هەتا هەتایی دۆزەخ و کافران و دۆزەخیەکان.................................. ٧٣٤
گەرمی ئاگری دۆزەخ ............................................................ ٧٣٥
خەو و پشوو نیە لە دۆزەخ.................................................... ٧٣٦
دۆزەخ هیچ دڵخۆشیەکی تیانیە ............................................... ٧٣٧
تینوێتی ........................................................................... ٧٣٧
خواردنەوەی ئەهلی دۆزەخ ..................................................... ٧٣٨
غەساق/ شوێنێکی زۆر سارد .................................................. ٧٣٩
لێپرسینەوەی تاکە کەسی ....................................................... ٧٤٠
زەقووم............................................................................ ٧٤٢
سزای زیندانی و فەرامۆش کردن............................................... ٧٤٣
تاریکیی دۆزەخ ................................................................... ٧٤٣
مرۆڤ سوتەمەنی دۆزەخە ....................................................... ٧٤٤
سزای ڕۆحی ...................................................................... ٧٤٥
دوعای بەردەوامتان ............................................................. ٧٤٦
ئاڵتوونێکی فڕێدراو ............................................................. ٧٤٨
گەرمیی دۆزەخ.................................................................. ٧٥٠
زیرەکیی ئافرەتێکی ئیماندار .................................................. ٧٥٠
ئەو عیبادەتانەی ئاگری دۆزەخت لەسەر لادەبەن .......................... ٧٥١
چاکە بە کەم مەزانن هەرچەندێک بێت ........................................ ٧٥٢
نوێژی بەیانی .................................................................... ٧٥٣
نوێژی سوونەت.................................................................. ٧٥٤
جیهاد لە ڕێگەی خوادا........................................................... ٧٥٤
بەرگری کردن لە موسوڵمانێک بە حەق ....................................... ٧٥٤
نەرم و نیانی..................................................................... ٧٥٥
عاشقانی دۆزەخ ................................................................. ٧٥٧
ئەوانەی زەکاتی ماڵەکانیان دەرناکەن. ........................................ ٧٥٧

له وتەکانمان بەرپرسیارین! ............................................ ٧٥٩
زاڵم و ستەمکاران ............................................ ٧٦٠
حەقی خەڵکی ترسناکە ............................................ ٧٦١
کوشتنی مرۆڤ ............................................ ٧٦٣
دادوەری و مەسئولیەت و قەزاوەت ............................................ ٧٦٤
سزای دزی ............................................ ٧٦٥
بانگخوازە خراپ و بێ کەڵکەکان ............................................ ٧٦٦
خۆپارێزی لە زینا و بەدڕەوشتی ............................................ ٧٦٧
ڕووبەڕووی خۆت ببەرەوە ............................................ ٧٦٩
مژدەکانی نەبیی ئەکرەم صلى الله علیه و سلم ............................................ ٧٧١
سوێند بەخوا، حەق تەعالا خۆشەویستی خۆی ناخاتە ئاگری دۆزەخەوە ............................................ ٧٧١
دەترسم لەوەی کە نەترسیت لە قیامەت ............................................ ٧٧٢
خۆشەویستی خوا بێ سنورە! ............................................ ٧٧٢

# ئەزمونەکانی
# نزیکبوونەوە لە مردن

ئەزموونەکانی نزیک بوونەوە لە مردن، دیاردەیەکی دێرینی مرۆڤایەتیە، لەوەتەی مرۆڤ لەم هەسارەیە دەژی، ئەزموونەکانی نزیک بوونەوە لە مردن بوونەتە کۆمەکی کارێکی بە سۆزو میهرەبان بۆ حاڵی بوونێکی باشتر لە جیهانی غەیب و بەرزەخ و قیامەت.

ئەزموونداران پێمان دەڵێن : وەرن هەوڵ بدەن لەم دیاردە گەورەیەی جیا بوونەوەی ڕۆح لە جەستە حاڵی بن ، تێی بگەین پێش ئەوەی بە حەتمی هەموومان پێی بگەین .

ئەزموونەکان قوڵ قوڵ دەسکاری ئاکارو بیر کردنەوەو هەستەکانی مرۆڤ دەکەن ، پێمان دەڵێت لە دەرەوەی زەوی و مادەو فیزک چی دەکوزەرێت.

ئاشنای گرنگترین و باڵاترین جۆری ژیانمان دەکات ، کە دوای مردن دەست پێ دەکات و هەمیشەییەو کۆتایی نایەت .

وەختێ خوێندنەوەی کتێبەکەت بە پایان گەیاند ، هەست و نەست و بیر کردنەوەت بۆ مردن زۆر جیاواز دەبێت .